٣٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ ٱلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: لَمَّا قَضَى ٱللهُ عَزَّ وَجَلَّ ٱلْخَلْقَ كَتَبَ فِي كِتَابٍ فَهُوَ عِنْدَهُ فَوْقَ ٱلْعَرْشِ إِنَّ رَحْمَتِي سَبَقَتْ غَضَبِي. رواهُ ٱلشَّيخانِ وَالتِّرْمِذِيُّ[١].

**ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (درودی خوای لەسەربێ) کاتێ خودای گەورەو بەشکۆ بڕیاریدا ئەم خەڵك و جیهان و بوونەوەرە دروست بکا، لەنامەیەکا نووسی: رەحمەت و میهرەبانی من پێش رق و خەشمم دەکەوێ، بەحری رەحمەتم هەرکاتێ هاتە جۆش و خرۆش، ئاگرو بڵێسەی کوورەی رق و غەضەبم دەکوژێنێتەوە، وە ئەو نامەیەش (کە ئەمەی تیا نووسراوە) لەلای خودا خۆیەتی لە سەروو تەخت و بارەگا (عەرش)ەوە داینراوە! (ش/ت).**

٣٨- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلاَّ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يُمَجِّسَانِهِ، كَمَا تُنْتَجُ الْبَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ هَلْ تُحِسُّونَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ. ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) وَأَقْرَأُوا إِنْ شِئْتُمْ ( فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللهِ ذلِكَ الدِّين الْقَيِّمُ- رَوَاهُ الأَرْبَعَةُ[٢].

**واتە: دیسان ئەو گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەموو منداڵی کاتێ لەدایك دەبێ بە سروشت، بەخوداکرد، ئامادەیە بۆ خودا ناسین، بەڵام لەوە دوا باوك و دایکی و نەریت و دەستوورو باوی ناو کۆمەڵ دەیگۆڕن و لەڕێ دەری دەکەن، جا یا دەیکەن بە جوولەکە یا بەگاور یا بە ئاگر پەرست، بەڵێ هەموو منداڵێ لە سەرەتاوە بە خوداکرد لەسەر ئایینی راست و دروست لەدایك دەبێ هەروەك چۆن بەچکەی ئاژەڵ و ماڵات بە تەواوی و بەبێ کەموکوڕی لەسەرەتاوە لەدایك دەبن: ئەوەتانێ نابینن کە بەچکەیێ لەو بەچکانە لەکاتی لەدایك بووندا لووتی بڕابێ، یا گوێی قرتابێ، یا کەمی و کووڕی و ناتەواییەکی هەبێ!**

---

(١) بخاري. بدأ الخلق: ٣١٩٤ ، ٧٤٠٤ ، ٧٤٢٢ ، ٧٤٥٧ ، ٧٥٥٣ ، ٧٥٥٤. مسلم. توبة: ٦٩٠٣ ، ٦٩٠٤ ، ٦٩٠٥.

(٢) بخاري. جنائز: ١٣٥٩ ، ١٣٥٨ ، ٤٧٧٥ ، ٦٥٩٩ مسلم. قدر: ٦٦٩٧ ، ٦٦٩٩ ، ٦٧٠٠.

ئینجا ئەبو هورەیرە گوتی: ئەگەرحەزیش دەکەن بۆ پشتیوانی ئەم باسە ئەم ئایەتە بخوێننەوە:
{فِطْرَةَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ ٣٠/٢٠}.

واتە: ئەو سیفەتو سروشتە خودا کردە بگرن کە خودای گەورە لە سەرەتاوە بەرەی ئادەمیزای لەسەر دروست کرووە، ئەوە ئایینی راستی دەستکردی خودا خۆیەتی، بۆیە هەرگیزاو هەرگیز گۆڕانی بۆ نیە.(ش/د/ ت).

٣٩- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَى عَلَيْهِمَا السَّلَامُ عِنْدَ رَبِّهِمَا فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى قَالَ: مُوسَى أَنْتَ آدَمُ الَّذِي خَلَقَكَ اللَّهُ بِيَدِهِ وَنَفَخَ فِيكَ مِنْ رُوحِهِ وَأَسْجَدَ لَكَ مَلَائِكَتَهُ وَأَسْكَنَكَ فِي جَنَّتِهِ ثُمَّ أَهْبَطْتَ النَّاسَ بِخَطِيئَتِكَ إِلَى الأَرْضِ فَقَالَ: آدَمُ أَنْتَ مُوسَى الَّذِي اصْطَفَاكَ اللَّهُ بِرِسَالَتِهِ وَبِكَلَامِهِ وَأَعْطَاكَ الأَلْوَاحَ فِيهَا تِبْيَانُ كُلِّ شَيْءٍ وَقَرَّبَكَ نَجِيًّا فَبِكَمْ وَجَدْتَ اللَّهَ كَتَبَ التَّوْرَاةَ قَبْلَ أَنْ أُخْلَقَ قَالَ: مُوسَى بِأَرْبَعِينَ عَامًا. قَالَ: آدَمُ فَهَلْ وَجَدْتَ فِيهَا (وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَى) قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: أَفَتَلُومُنِي عَلَى أَنْ عَمِلْتُ عَمَلاً كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيَّ أَنْ أَعْمَلَهُ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَنِي بِأَرْبَعِينَ سَنَةً؟ قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ[٣].

واتە: دیسانەوە گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئادەمو مووسا (درودی خوایان لێبێ) لە خزمەتی پەروەردگاریاندا بوو بەدەمە قاڵیان، لە ئەنجامدا ئامادەم مووسای بۆڕدا، مووسا فەرمووی: تۆ ئەو ئادەمەی کە خودای گەورە بەدەستی خۆی دروستی کردیو لە گیانو رەحمەتی خۆی گیانی کرد بە بەرتاو بەفریشتەکانی خۆی فەرموو کورنووشیان بۆ بردیولە بەهەشتی خۆیا داینای، کەچی بە تاقە گوناهێ ئەم خەڵکەت لە بەهەشت دەرکردو داتپەڕاندن بۆ سەر زەوی! ئادەمیش فەرمووی: تۆش ئەو

(٣) بخاري. قدر: ٦٦١٤. مسلم. قدر: ٦٦٨٤ ، ٦٦٨٥ ، ٦٦٨٦. أبو داود: السنة: ٤٧٠١. ابن ماجه. قدر: ٨٠.

مووسایەی کە خودا پەسەندی کردیو کردیتی بە پێغەمبەرو قسەی لەگەڵ کردیو لەچەن تەختە لەوحێکا تەوراتی بۆ ناردی، کە باسو خواسی هەموو شتێکیان تیابوو، سەرەڕای ئەمانەش نزیکی کردیتەوە لە خۆیەوەو رازو گوفتوگۆی لەگەڵ کردی، ئادەم وتی: باشە، ئەدی وەك لە تەوراتا دیوتە بەچەند ساڵ لەپێش دروستکردنی مندا خودا تەوڕاتی نووسیوە؟ مووسا فەرمووی: بە چل ساڵ ئادەم، فەرمووی: باشە ئەم ئایەتەت لە تەوڕاتا دیوە کە دەفەرموێ: {وَعَصَى آدَمُ رَبَّهُ فَغَوَى – ٢٠/١٢١} واتە: ئادەم لە فەرمانی خودا دەرچوو، وە ئەو ئاواتە جوانەکەمانەوە بوو لە بەهەشتا لە دەستی دەرچوو، فەرمووی: بەڵێ فەرمووی: دە ئیتر چۆن سەرزەنشتم دەکەی لەسەر کردنی کارێ کە خودا بەر لەوە کە من دروست بکا بەچل ساڵ لەسەری نووسیوم کە ئەوکارە بکەم؟ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: جا ئاوا ئادەم مووسای بەزاند (ش/د/ت/ن).

٤٠– عَنْ عَبْدُ اللّٰهِ قالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ الصَّادِقُ الْمَصْدُوقُ قالَ: إنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا، نُطْفَةً ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يُنْفَخُ فِيهِ الرُّوحُ وَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ، بِكَتْبِ رِزْقَهُ وَأَجَلَهُ وَعَمَلِهِ وَشَقِيٌّ أَوْ سَعِيدٌ. فَوَاللّٰهِ الَّذِي لا إلهَ غَيْرُهُ إنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ، حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إلاَّ ذِرَاعٌ فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الْكِتَابُ، فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ فَيَدْخُلُهَا وَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ حَتَّى مَا يَكُونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا إلاَّ ذِرَاعٌ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الكِتَابُ، فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَيَدْخُلُهَا. رِوَاهُ الْأَرْبَعَة[٤].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەری راستگۆ کە فەرمایشتی جێگەی باوەڕە دەفەرموێ (درودی خوای لەسەربێ): هەریەکێ لەئێوە کە خودا دروستی دەکا چل ڕۆژ بە تۆمەیی (نوطفەیی) لە سکی

(٤) بخاري. بدء الخلق: ٣٢٠٨ ، ٣٣٣٢ ، ٦٥٩٤ ، ٧٤٥٤. مسلم. قدر: ٦٥ – ٦٨. أبو داود. قدر: ٤٧٠٨. ترمذي. قدر: ٢١٣٧.

دایکیا کۆ دەکرێتەوەو دەمێنێتەوە، ئینجا بە چل ڕۆژی تریش دەبێ بە پارچە خوێنێکی مەییو، ئینجا بە چل ڕۆژی تریش دەبێ بە پارچە گۆشتێ بەقەد پارووییێ، ئینجا گیانی بە بەرا دەکرێ، جا خودای گەورە فەرمان دەکا بەو فریشتەیە کە گیان دەکا بە بەریا ئەم چوار وشەیە بنووسێ:

یەکەم: رزقو ڕۆزی چییەو چی نیە.

دووەم: ئەجەڵو ئاکامی کەیەو کەی نیە.

سێیەم: کارو کردەوەی.

چوارەم: بەدبەختو بەدکار دەبێ یا کامەرانو بەختیار دەبێ. دەسا بەو تاقە خودایە کە هەر خۆی خودایە کەسی واهەیە کردارو ڕەفتاری وەك کردارو ڕەفتاری بەهەشتی وایە، لە خەڵك وایە کە بەهەشتییە، بەڵام نامەی چارەنووسی دەست پێشکەری لێ دەکاو دەست دەکا بە کردنی کاری خەڵکی دۆزەخو دەچێتە دۆزەخەوە، کەسی واشتان هەیە بە کردارو ڕەفتار بێ لە دۆزەخی دەچێ، لە خەڵك وایە جەهەننەمییە، بەڵام نامەی چارەنووسی پێش دەستی لێ دەکاو خاتیمەی بە خێر دەگەڕێو دەست دەکا بە کردنی کردەوەی باشو دەچێتە ناو بەهەشتو دەبێ بە بەهەشتی! (ش/د/ت/).

٤١- عَنْ ابْنِ عُمَرَ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: كُلُّ شَيْءٍ بِقَضَاءٍ وَقَدَرٍ حَتَّى الْعَجْزُ وَالْكَيْسُ. رَوَاهُ الشيخان وَمالك[٥].

واتە: ئیبنو عومەر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەموو شتێ بەسەر نقیشتو خوداکردو قەزاو قەدەرە، تەنانەت گێلیو ژیریش! (ش/مالك).

٤٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قالَ: جَاءَ مُشْرِكُو قُرَيْشٍ يُخَاصِمُونَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الْقَدَرِ فَنَزَلَتْ (يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ[٦].

---

(٥) مسلم. قدر: ٦٦٩٣.

واتــە: ئـەبو هـورەیرە (خـوای لێ ڕازی بێ) گـوتی: بتپەرسـتەکانی قـوڕەیش دەهـاتن لـە بابـەت سەرنقێشتەوە ملـە ملێیـان لەگـەڵ پێغەمبـەردا دەکـرد (درودی خوای لەسەربێ) وە دەیان گوت: چارەنووسو سەرنقیشتو قەزاو قەدەر نیەو شت هەتا روونەدا خودا نایزانێ جا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە:

{يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ٥٤/٤٨-٤٩}.

واتـــە: لـــەو ڕۆژەدا کـــە لـــەناو ئـــاگری دۆزەخ دا، لەپـــەو ڕوو بەســـەر دەموچاودا ڕادەکێشرێنو بەکێش دەکرێن، بەتەوسەوە پێیـان دەڵێن: بـچێژن پیاچزانی ئاگری سوور، بێگومان ئێمە هەموو شتێکمان بەپێی سەرنقیشتو قەزاو قەدەر دروست کردووە. (م/ت).

٤٣- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ عَنِ ألنَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: كَتَبَ اللّٰهُ مَقَادِيرَ الْخَلَائِقِ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ بِخَمْسِينَ أَلْـفَ سَـنَةٍ. رَوَاهُمَا مُسْلِمُ وَالتِرمِذِيْ[٧].

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسـەربێ) دەفـــەرموێ: خـــودا پـــەنجا هـــەزار ســـاڵ لـــەپێش دروســـتکردنی ئاسمانەکانو زەویدا سەرنقیشتی هەموو شتێکی نووسی. (م/ ت).

٤٤- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللهُ عَنـهُ) قَالَ: قِيلَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَعْلِمَ أَهْـلُ الْجَنَّةِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ؟ قَالَ: نَعَمْ قِيلَ فَفِيمَ يَعْمَلُ الْعَامِلُونَ؟ قَالَ: كُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ. رِوَاهُ ألْأَرْبَعَة[٨].

واتــە: عیمرانــی کــوڕی حوصــەین (خـوای لێ ڕازی بێ) گــوتی: گــوترا: ئــەی پێغەمبەری خودا! ئایا کێ بەهەشتییەو کێ دۆزەخییە، دیاری کراون یانا؟ فـەرمووی: بـەڵێ دیـاری کـراون گوتیـان: جـا کـەوابێ ئـەم خەڵکـە بـۆ خۆیـان

---

(٦) ملسم. قدر: ٦٦٩٤. ترمذي. قدر: ٢١٥٧.

(٧) مسلم. قدر: ٦٦٩٠. ترمذي. قدر: ٢١٥٦.

(٨) بخاري. قدر: ٦٥٩٦ ، ٧٥٥١. مسلم. قدر: ٦٦٧٩. أبو داود. قدر: ٤٧٠٩.

ماندوو دەكەن، لەپای چی كار دەكەن بیكەن‌و نەی كەن جێگەیان لەوە پێش دیاری كراوە؟ فەرمووی: هەركەسێ لە ئەزەلدا، لە عیلمی خودادا بۆ كۆی دروست كرابێ ڕێگەی ئەو شوێنە دەگرێ‌و لەسەر ئەم بنیاتە بەختیار ڕێگەی چاكە دەگرێ‌و بەدكار ڕێگەی خراپە دەگرێ، بەم پێیە كاری باش نیشانەی بەهەشتەو كاری خراپ نیشانەی دۆزەخە (ش/د/ت).

٤٥– عَنْ أَنَسٍ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: ثَلاَثَةٌ مِنْ أَصْلِ الإِيْمَانِ: الْكَفُّ عَمَّنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَلاَ تُكَفِّرْهُ بِذَنْبٍ وَلاَ تُخْرِجْهُ مِنَ الإِسْلاَمِ بِعَمَلٍ وَالْجِهَادُ مَاضٍ مُنْذُ بَعَثَنِيَ اللَّهُ إِلَى أَنْ يُقَاتِلَ آخِرُ هذِهِ الْأُمَّةِ الدَّجَّالَ لاَ يُبْطِلُهُ جَوْرُ جَائِرٍ وَلاَ عَدْلُ عَادِلٍ وَالإِيْمَانُ بِالأَقْدَارِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُد[٩].

واتە: ئەنەس لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (درودی خوای لەسەربێ): ئەم سێ یاسایە لە بنیات‌و بناغەی باوەڕو ئیمانن:

یەكەم: ئەوەی گوتی (لا الـه الا الله)، ئیتر وازی لێ دێنین‌و بەهیچ گوناهێ بەكافری دانانێین‌و بەكردنی هیچ كردەوەیەكی ناپەسەندیش لە ئیسلامەتی دەری ناكەین.

دووەم: غەزاو خەبات‌و تێكۆشانیش بۆ بەرزكردنەوەی ئالأی ئیسلام هەر دەمێنێ‌و هەر بەردەوام دەبێ، لەو دەمەوە كە خودا منی ڕەوانە كردووە بۆ سەر ئەم خەڵكە، تا ئەو حەلە كە دوا دوایی ئەم ئۆمەتە دەجەنگن‌و غەزا دەكەن لەگەڵ جەجاڵدا، نەستەمی ستەمكارو نە زۆری زۆردارو نە دادی دادپەروەرو نە عەدڵی عادڵ، پووچ‌و بەتاڵی ناكاتەوە.

سێهەم: باوەڕ بە چارەنووس‌و سەرنڤیشت. (د/ س).

٤٦– وَقَالَ: عُبَادَةُ بنُ الصَّامِتِ لاِبْنِهِ: يَا بُنَيَّ إِنَّكَ لَنْ تَجِدَ طَعْمَ حَقِيقَةِ الإِيْمَانِ حَتَّى تَعْلَمَ أَنَّ مَا أَصَابَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَكَ وَمَا أَخْطَأَكَ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَكَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ إِنَّ أَوَّلَ مَا خَلَقَ اللَّهُ الْقَلَمَ فَقَالَ: لَهُ

---

(٩) رواه أبو داود بسَنَدٍ صحيح. (شرحه)

اكْتُبْ. قَالَ: رَبِّي وَمَاذَا أَكْتُبُ قَالَ: اكْتُبْ مَقَادِيرَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ". يَا بُنَيَّ إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ مَنْ مَاتَ عَلَى غَيْرِ هَـذَا فَلَيْسَ مِنِّي. رَوَاهُ أَبُو داودَ وَالتِّرْمِذِي[10].

**واتە: عوادەی کوڕی صامیت بە کوڕەکەی خۆی گوت: کوڕی شیرینم! هەرگیزاو هەرگیز تامی جەوهەری باوەڕ ناچێژی هەتا ئەمە نەزانی: کە هەرچی تووشت دەبێ نەدەبوو کە نەیەتە ڕێتو ئەوەشی تووشت نابێ ناگونجێ کەبێتە ڕێت! بەگوێی خۆم لە دەمی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ژنەوتم دەیفەرموو: یەکەم شت کە خوا دروستی کرد قەڵەم (پێنووس: خامە) بوو، فەرمووی پێی: بنووسە، قەڵەم گوتی: ئەی پەروەردگارم! چی بنووسم، فەرمووی: سەرنڤیشتو بەسەرهاتی هەموو شتێ بە دوورو درێژی بنووسە، لە بنەڕەتەوە تا ئەودەمەی کۆتایی جیهان دێ! کوڕەکەم! من بۆخۆم لە پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرمو: هەر کەسێ لەسەر ئەم باوەڕە نەمرێ لە (ئۆمەتی) من نیە (د/ت — س/غ).**

٤٧— عَنْ عَلِي (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ يُؤْمِنُ عَبْدٌ حَتَّى يُؤْمِنَ بِأَرْبَعٍ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ بَعَثَنِي بِالْحَقِّ وَيُؤْمِنُ بِالْمَوْتِ وَيُؤْمِنَ بِالْبَعْثِ بَعْدَ الْمَوْتِ وَيُؤْمِنُ بِالْقَدَرِ[11].

**واتە: عەلی (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هیچ یەندەیێ باوەڕی دانامەزرێ تا باوەڕ بەم چوارشتە نەکا:**

**یەکەم: شایەتی بدا کە هەر خودا خودایەو خودای ترنیە، وە من پێغەمبەری خودامو خودا ڕەوانەی کردووم لەگەڵ ئاییني ڕاستو دروستا.**

**دووەم: باوەڕ بکا بە مردن.**

**سێیەم: باوەڕ بکا بە زیندوبوونەوە لە پاش مرن.**

---

(١٠) بَسَندٍ غريب ولكن يؤيده ما في الباب (شرحه)

(١١) بسند صحيح (شرحه).

چوارەم: باوەڕ بكا بە چارەنووسی خودایی و سەرنقیشت! (ت-س/ص).

٤٨- عَنْ أَبِي عَزَّةَ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا قَضَى اللَّهُ لِعَبْدٍ أَنْ يَمُوتَ بِأَرْضٍ جَعَلَ لَهُ إِلَيْهَا حَاجَةً. رَوَاهُمَا التِّرْمِذِيّ[١٢].

واتە: ئەبو عەززە لە پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: كە خوا لە چارەی بەندەیەكی نووسی كە لەخاكێ بمرێ، لەوخاكە كارێكی بۆ دەسازێنێ (جا ئەو بەندەیە بۆ ئەو كارە دەچێ بۆ ئەوێ وە لەوێ دەمرێ!) (ت-س/ص).

## ٧) دەستەی بیدعەتكارەكان وەك قەدەرییەو مورجیئە أصحاب البدع كالقدرية والمرجئة

٤٩- عَنْ ابْنِ عُمَرَ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْقَدَرِيَّةُ مَجُوسُ هَذِهِ الأُمَّةِ إِنْ مَرِضُوا فَلاَ تَعُودُوهُمْ وَإِنْ مَاتُوا فَلاَ تَشْهَدُوهُمْ[١].

واتە: ئیبنو عومەر لە پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: قەدەرییەكان واتە: ئەوانەی كە نەفی قەدەر دەكەنو دەڵێن: سەرنقیشتو چارەنووس نیە مەجووسیی ئەم ئۆمەتەن، ئەگەر نەخۆش كەوتن سەریان لێ مەدەنو ئەگەر مردیشن مەچنە سەریان (د-س/ص).

٥٠- عَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ تُجَالِسُوا أَهْلَ الْقَدَرِ وَلاَ تُفَاتِحُوهُمْ رَوَاهُمَا أَبُو دَاودَ[٢].

واتە: عومەر لە پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: لەگەڵ قەدەرییەكان دامەنیشنو قەسەوباسیان بۆ دامە مەزرێنن (د).

---

(١٢) بسند صحيح (شرحه).

(١) بسند صحيح (شرحه).

(٢) سكت عنه الشارح (مترجم).

٥١- وَقِيلَ لا بْنُ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهُمَا) إِنَّهُ قَدْ ظَهَرَ قِبَلَنَا نَاسٌ يَقْرَءُونَ الْقُرْآنَ وَيَتَقَفَّرُونَ الْعِلْمَ - وَذَكَرَ مِنْ شَأْنِهِمْ - وَأَنَّهُمْ يَزْعُمُونَ أَنْ لاَ قَدَرَ وَأَنَّ الأَمْرَ أُنُفٌ. قالَ: فَإِذَا لَقِيتَ أُولَئِكَ فَأَخْبِرْهُمْ أَنِّي بَرِيءٌ مِنْهُمْ وَأَنَّهُمْ بُرَآءُ مِنِّي وَالَّذِي يَحْلِفُ بِهِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ لَوْ أَنَّ لأَحَدِهِمْ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا فَأَنْفَقَهُ مَا قَبِلَ اللَّهُ مِنْهُ حَتَّى يُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ. رَوَاهُ مُسْلِمْ وَأَبُو دَاوُد[٣].

واتە: گوترا بە ئیبنو عەمەر: دەستەیێ لەلای ئێمە پەیدابوون، قورئان دەخوێنن‌و عەودالی خوێندن‌و شەیدای عیلم‌و زانستن‌و حالیان وا وایە، کەچی دەڵێن: گوایە چارە نووس‌و سەرنڤیشت نیەو کاروبار تاروونەدا کەس لەوە پێش نایزانێ؟ گوتی: کاتێ دەگەیت بەوانە پێیان بڵێ: کە من لەو کەسانە بەریم‌و ئەوانیش لەمن بەرین، دەسا بەو خودایە (کە عەبدوڵلای کوڕی عومەر سوێندی پێ دەخوا) گریمان هەریەکێ لەمانە بەقەد چیای ئوحد زێڕ ببەخشێتەوە لە ڕێگەی خودادا خودا لێی گیراناکا هەتا باوەڕ بە سەرنڤیشت نەکا (م/د).

٥٢- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: فِي هَذِهِ الأُمَّةِ أَوْ فِي أُمَّتِي خَسْفٌ وَمَسْخٌ أَوْ قَذْفٌ فِي أَهْلِ الْقَدَرِ[٤].

واتە: دیسان لەوەوە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: لەم ئۆمەتەدا یا فەرمووی: لەم ئۆمەتەی مندا دەستەیێ لە قەدەرییەکان بەناخی زەویدا ڕۆ دەچن‌و دەستەیەکی تریان دەبن بە بەرازو مەیموون یا فەرمووی: دەستەیەکی تریان لە ئاسمانەوە بەردەباران دەکرێن! (ت-س/ص).

٥٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: صِنْفَانِ مِنْ أُمَّتِي لَيْسَ لَهُمَا فِي الإِسْلاَمِ نَصِيبٌ الْمُرْجِئَةُ وَالْقَدَرِيَّةُ. رَوَاهُمَا الترمذي[٥].

---

(٣) مسلم. إيمان: ٩٣. أبو داود. قدر: ٤٦٩٥.

(٤) رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

(٥) بسند صحيح (شرحه).

واتە: ئیبنو عەباس (ڕەزای خودایان لێبێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: دوو تاقمە – لەم ئۆمەتەی من – بەشیان بەئیسلامەتییەوە نیە: یەك مورجیئە (مورجیئە: بەرە فیرقە یەكن لە بەرەكانی ئیسلام، دەڵێن: تاوان لەگەڵ ئیمانا زیانی نیە) دوو: قەدەرییە (ت–س/ص).

٥٤– وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: أَبَى اللهُ أَنْ يَقْبَلَ عَمَلَ صَاحِبِ بْدِعَةٍ حَتىٌّ يَدَعَ بِدْعَتَهُ. رَوَاهُ أبنُ ماجَهْ[٦].

واتە: دیسان لەوە، وە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: خودا كردەوەی هیچ بیدعاتكارێ گیرا ناكا هەتا واز لە بیدعەتكارییەكەی نەهێنێ (ئیبنو ماجە – س/ض = ڕشتەی لاوان).

## ٨) باسی پێنجەم: باسی پەیمان بەستن (بەیعەت)
## الباب الخامس: في البيعة

قَالَ اللهُ تَعالى: {إِنَّ الَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ اللَّهَ يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْـدِيهِمْ – ٤٨/١٠}.

واتە: بێگومان ئەو كەسانە كە دەست دەنێنە ناو دەستی تۆو پەیمانت لەگەڵ دەبەستن ئەوە پەیمان لەگەڵ خودادا دەبەستن، دەستی خودا لەسەروو دەستی ئەوانەوەیە.

٥٥– عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: وَحَوْلَهُ عِصَابَةٌ مِنْ أَصْحَابِهِ بَايِعُونِي عَلَى أَنْ لاَ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئًا، وَلاَ تَسْرِقُوا، وَلاَ تَزْنُوا، وَلاَ تَقْتُلُوا أَوْلاَدَكُمْ، وَلاَ تَأْتُوا بِبُهْتَانٍ تَفْتَرُونَهُ بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَأَرْجُلِكُمْ، وَلاَ تَعْصُوا فِي مَعْرُوفٍ، فَمَنْ وَفَى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَعُوقِبَ فِي الدُّنْيَا فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا ثُمَّ سَتَرَهُ اللَّهُ، فَهُوَ إِلَى اللَّهِ إِنْ شَاءَ عَفَا عَنْهُ، وَإِنْ شَاءَ عَاقَبَهُ. فَبَايَعْنَاهُ عَلَى ذَلِكَ. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ إِلاَّ أَبا دَاوُدْ[١].

---

(٦) بسند ضعيف ولكنه من باب الترهيب (شرحه).

(١) بخاري. إيمان:١٨ ، ٣٨٩٢ ، ٣٨٩٣ ، ٣٩٩٩ ، ٤٨٩٤ ، ٦٧٨٤ ، ٦٨٠١ ، ٦٨٧٣ ، ٧٠٥٥ ، ٧١٩٩ ، ٧٢١٣ ، ٧٤٦٨. مسلم. حدود: ٤٤٣٦. ترمذي. حدود: ١٤٣٩. نسائي. بيعة: ٤١٨٩ ، ٤٢٢١ ، ٥٠١٧.

**واتە: عوبادەی کوڕی صامیت** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: دەستەیێ — لە یارانی پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **لە دەوری بوون، فەرمووی پێیان: بەڵێن‌و پەیمانم لەگەڵ بکەن لەسەر ئەوە: کە هاوبەش شەریك بۆخوا دائەنێن‌و دزی وحیزی نەکەن‌و دەست پاك‌و داوێن پاکبن‌و منداڵی خۆتان لەبەر نەبوونی نەکوژن‌و لە خۆتانەوە لە خۆت‌و خۆڕایی بوختانیان بۆ هەڵ نەبەستن، وە لە کردنی چاکەو پیاوەتی سەرپێچی مەکەن‌و لاریتان نەبێ لەکاری خێر، جا هەر کەسێکیان ئەم پەیمانەی هەتا سەر بردەسەر ئەوە پاداشی باشی دەکەوێتە سەر خودا، وە ئەوەیشی تووشی شتێ بوو لە مانە، و لەم جیهانەدا تۆڵەی ئەوەی لێ سەندرائەوە دەبێ بە کەفرەت بۆی‌و ئەو تۆڵەیەی بریتیی تاوانەکەی دەکەوێ، وە ئەوەیشی تووشی شتێ بوو لەمانە بەڵام لە جیهاندا خودا بۆی پۆشی ئەوە کاری دەکەوێتە لای خودا، جا ئەگەر خوداحەزبکا ئەوا لێی دەبووڕێ ئەگینا تۆڵەی ئەوەی لەو جیهاندا لێ دەسنێ عوبادە گوتی: جا ئێمەیش لەسەر ئەوە پەیمانمان پێدا (ش/ت/ن).**

٥٦- وَفِي رَوَايَةٍ للشَيْخَين: بَايَعْنَا رَسُولَ اللهِ عَلى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فِي الْعُسْرِ وَالْيُسْرِ وَالْمَنْشَطِ وَالْمَكْرَهِ وَعَلَى أَثَرَةٍ عَلَيْنَا وَعَلَى أَنْ لاَ نُنَازِعَ الأَمْرَ أَهْلَهُ وَعَلَى أَنْ نَقُولَ بِالْحَقِّ أَيْنَمَا كُنَّا لاَ نَخَافُ فِي اللَّهِ لَوْمَةَ لاَئِمٍ[٢].

**واتە: لە گێڕانەوە (ڕیوایەت)ێکی شەیخەیندا: بەیعەت‌و پەیمانمان دا بە پێغەمبەری خودا لەسەر گوێ ڕایەڵی‌و فەرمانبەری لەکاتی خۆشی‌و ناخۆشییداو لە حاڵی ئاسوودەیی‌و تەنگانەدا، ئەگەرچی فەرمانڕەواکانمان خۆخۆییشمان لەگەڵدا بکەن‌و نازی ئەم‌و ئەو بدەن بەسەر ئێمەدا، وە لەسەر ئەوەیش کە گەڕو گێچەڵ نەکەین بەو کەسانە کە بوون بە سەرەو کارو فەرمانڕەوای موسوڵمانان (مەگەر لە حاڵێکا کە بە تەواوی لە ڕێی ڕاست لادەن‌و بە بەرچاوەوە بێ کە خودا حەز بەرەفتارو کرداریان ناکا) وە لەسەر**

---

(٢) بخاري. أحكام: ٧١٩٩ ، ٧٢٠٠ ، مسلم. إمارة: ٤٧٤٥. نسائي. بيعة: ٤١٦٠ ، ٤١٦١ ، ٤١٦٢ ، ٤١٦٣ ، ٤١٦٤ ، ٤١٦٥. ابن ماجه. جهاد: ٢٨٦٦.

ئەوەیش کە هەمیشە راست بڕۆینو لەبەر خودا لەسەر قسەی هەق لە لۆمەو سەرزەنشتی کەس نەترسین.

٥٧- وَفِي رَوَايَةٍ أُخرى: وَأَنْ لاَ نُنَازِعَ الأَمْرَ أَهْلَهُ، قَالَ: إِلاَّ أَنْ تَرَوْا كُفْرًا بَوَاحًا، عِنْدَكُمْ مِنَ اللّٰهِ فِيهِ بُرْهَانٌ(٣).

واتە: لە گێڕانەوەیەکی تردا: وە لەسەر ئەوە کە گەڕو گێچەڵ نەکەین بەسەردارو فەرمانڕەوای موسوڵمانان. فەرمووی (درودی خوای لەسەربێ): مەگەر کوفرێکی پەتیو بێ باوەڕییەکی ئاشکرایان بەچاوی خۆتان لێ بینن، کەببێ بە بەڵگەیەکی رۆشنو بە مەهانەیەکی رەوا بۆتان لەلای خودا (ئەوجا هەقتان هەیە بەزەبری شیرو تیر بایان پێ بدەنەوە بۆ سەر شەقامەڕێی ئیسلام).

٥٨- عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى إِقَامِ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ. رَوَاهُ الشيخان والترميذي(٤).

واتە جەریری کوڕی عەبدوڵڵا (خوای لێ رازی بێ) گوتی: بەڵێنو پەیمانم دا بە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەسەر ئەوە کە نوێژ بکەمو زەکات بدەمو ئامۆژگاری خێری هەموو موسوڵمانێکیش بکەم (ش/ت).

٥٩- عَنْ ابْنَ عُمَرَ قَالَ: كُنَّا إِذَا بَايَعْنَا رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ يَقُولُ لَنَا فِيمَا اسْتَطَعْتَ(٥).

واتە: ئیبنو عومەر گوتی: جاران کە پەیمانمان دەبەست لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەربێ) لەسەر ئەوە بە گوێی بکەینو لە فەرمانی دەرنەچین، دەیفەرموو: (ئەوەندە کە لەتواناتانا هەیەو دەتوانن) (ش).

٦٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُبَايِعُ النِّسَاءَ بِالْكَلاَمِ بِهَذِهِ الآيَةِ (لاَ يُشْرِكْنَ بِاللّٰهِ شَيْئًا) قَالَتْ: وَمَا مَسَّتْ يَدُ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَدَ امْرَأَةٍ، إِلاَّ امْرَأَةً يَمْلِكُهَا. رَوَاهُما الشَّيْخانْ(٦).

---

(٣) بخاري. فتن: ٧٠٥٥ ، ٧٠٥٦. مسلم. إمارة: ٤٧٤٨. ابن ماجه. جهاد: ٢٨٦٦.

(٤) بخاري. إيمان: ٥٧ ، ٥٨ ، ٥٢٤ ، ١٤٠١ ، ٢١٥٧ ، ٢٧١٤ ، ٢٧٥١ ، ٧٢٠٤. مسلم. إيمان: ١٩٧ ، ١٩٨.

(٥) بخاري. أحكام: ٧٢٠٢. مسلم. إمارة: ٤٨١٣.

واتە: عائیشە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: جاران پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کە پەیمان و بەیعەتی وەردەگرت لە ئافرەتان تەنیا بەدەم و بەقسە (نەك بەتەوقەکردن) پەیمانی لێ وەردەگرتن لەسەر ڕەفتارکردن بەم ئایەتە:

{يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُنَّ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ - ١٢/٦٠}.

واتە: ئەی پێغەمبەر! کاتێ ئافرەتە موسوڵمانەکان هاتن بۆلات کە پەیمان و بەیعەتت بدەنێ، لەسەر ئەوە پەیمانیان لێ وەربگرە کە: بە هیچ جۆرێ هاوبەش بۆ خودا بڕیار نەدەن و دزی نەکەن و حیزی نەکەن و منداڵی خۆیان نەکوژن و کچی خۆیان زیندە بەچاڵ نەکەن و بوختانی درۆ لە نێوان دەست و پێی خۆیاندا نەکەن، واتە: منداڵی بێگانە نەهێنن لە بەینی دەست و پێی خۆیان دایبنێن و بە درۆو ناهەق بیکەن بە منداڵی مێردەکەیان، وە لە کردنی کاری خێردا نافەرمانی تۆ نەکەن و سەرپێچی لە فەرمانی تۆ نەکەن جا لەپاش ئەمە لەخودا بپاڕێرەوە بۆیان کەلێیان خۆش بێ، بەڕاستی خودا تاوانبەخش و میهرەبانە. عائیشە دەیگوت: قەت نەبووە دەستی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لە دەستی هیچ ئافرەتێ بکەوێ، مەگەر ئافرەتێ کە حەڵاڵی خۆی بووبێ! (ش).

## ٩) باسی شەشەم: باسی ڕەفتارکردن بە قورئان و بەسوننەتی پێغەمبەر (درودی خوای لێبێ)

## الباب السادس: في الاعتصام بالكتاب والسن

قَالَ الله جل شأنُهُ: {وَاعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعًا وَلاَ تَفَرَّقُواْ - ١٠٣/٣}.

واتە: خودای گەورەو شکۆمەند دەفەرموێ: هەمووتان دەستبگرن بە کەمەندی پەیمانی خوداوە کە ئایینی پاکی ئیسلامە وە لەیەك جوێ مەبنەوەو لە خزمەتی حەق جیامەبنەوە.

---

(٦) بخاري. طلاق: ٥٢٨٨. مسلم. إمارة: ٤٨١١.

وَقَالَ تَعَالَى: {وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا – ١–٥٩/٧}.

**واتە: خودای گەورە دەفەرمویٚ: ئەوەی پیٚغەمبەر پیٚتان ئەدا لەماڵو لە ئەمرو فەرمانو ئەحكام، بەرەزامەندی وەری بگرنو ئەوەیش كە قەدەغەی دەكا لیٚتان، وە نەهی دەكا لە كردنی، مەی كەنو وازی لیٚ بیٚنن.**

وَقَالَ تَعَالَى: {قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ٣١/٣}.

**خودای گەورە دەفەرمویٚ: بلٚیٚ ئەگەر ئیٚوە بەراستی خوداتان خۆش دەویٚ دەبیٚ پەیڕەوی من بكەنو شویٚنی من بكەون، لە بیرو باوەڕو رەفتار، كردارو وتاردا، وە لە خوو رەوشتا، جا ئەوسا خودایش ئیٚوەی خۆش دەویٚو لە تاوانەكانتان خۆش دەبیٚ.**

٦١– عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّمَا مَثَلِي وَمَثَلُ مَا بَعَثَنِي اللَّهُ بِهِ كَمَثَلِ رَجُلٍ أَتَى قَوْمًا فَقَالَ: يَا قَوْمِ إِنِّي رَأَيْتُ الْجَيْشَ بِعَيْنَيَّ، وَإِنِّي أَنَا النَّذِيرُ الْعُرْيَانُ فَالنَّجَاءَ. فَأَطَاعَهُ طَائِفَةٌ مِنْ قَوْمِهِ فَأَدْلَجُوا، فَانْطَلَقُوا عَلَى مُهْلَتِهِمْ وَكَذَّبَتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ فَأَصْبَحُوا مَكَانَهُمْ، فَصَبَّحَهُمُ الْجَيْشُ، فَأَهْلَكَهُمْ وَاجْتَاحَهُمْ، فَذَلِكَ مَثَلُ مَنْ أَطَاعَنِي، فَاتَّبَعَ مَا جِئْتُ بِهِ، وَمَثَلُ مَنْ عَصَانِي وَكَذَّبَ مَا جِئْتُ بِهِ مِنَ الْحَقِّ[1].

**واتە: ئەبو مووسا** (خوای لیٚ رازی بیٚ) **گوتی: پیٚغەمبەر** (درودی خوای لەسەربیٚ) **فەرمووی: داستانی منو داستانی ئەو ئایینەی خودا بەمنا ناردویەتی وەك داستانی پیاویٚ وایە بچیٚتە ناو هۆزەكەی بلٚیٚ: ئەی خزمینە! من بەهەردوو چاوی خۆم لەشكرەكەی دوژمنم دی (هاكا داباریـن بەسەرتانا) ئەوا من وەك ترسیٚنەریٚكی راستو دلٚسۆز ئاگادارم كردنەوەو ئەركی سەرشانی خۆم بەجیٚ هیٚنا، دەی فریاكەونو خۆتان قورتاركەن. جا تاقمەیٚ لە هۆزەكەی بە گویٚی بكەنو بەزوویی شەوڕەوی بۆ بكەنو بەشیٚنەیی دەربازبن، بەلاٚم تاقمەیەكی**

---

(١) بخاري. رقاق: ٦٤٨٢ ، ٧٢٨٣. مسلم. فضائل: ٥٩١٣.

تریان باوەڕ نەکەنو لە شوێنی خۆیان تا بەیانی بمێننەوە، جا لەگەڵ بەیانا لەشکرەکە بدەن بەسەریاناو تەفرو توونایان بکەنو قەڵاچۆیان تێ بخەن، جا ئەم داستانە پەندو نمونەیە هەم بۆ ئەو کەسانە کە بەگوێی من بکەنو پەیڕەوی ئایینی من بکەن، وە هەم بۆ ئەو کەسانەش کە لەمن یاخی دەبنو ئەو ئایینە راستو دروستەی کە من هێناومە بە درۆی دەزانن (ش).

٦٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: لَتَتَّبِعُنَّ سَنَنَ ألَّذِينَ مَنْ قَبْلَكُمْ شِبْرًا بِشِبْرٍ، وَذِرَاعًا بِذِرَاعٍ، حَتَّى لَوْ دَخَلُوا فِي جُحْرِ ضَبٍ لَاتَّبَعْتُمُوهُمْ، قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللّهِ، الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى؟ قالَ: فَمَنْ. وفي رَوَايَةٍ، قِيلَ: يارَسُولَ اللهِ كَفَارِسَ وَالّرومِ؟ قالَ: وَمَنِ النَّاسُ إِلاَّ أُولئِكَ. رَوَاهُما الشَّيخَانْ[٢].

واتە: ئەبو سەعید (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بست بە بستو هەنگاو بە هەنگاو لاسایی میللەتەکانی پێش خۆتان دەکەنەوەو چاو لەخوو و رەوشتە نالەبارەکانیان دەکەن، بە رادەیەکی وا ئەگەربێتو ئەوان خۆیان بترنجێننە ناوکونی بزن مژەوە ئێوەش چاویان لێ دەکەنو خۆتانی تێ دەترنجێننو دەڵێ: دیارە سودێکی هەر هەیە!!

گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا! مەبەست لە میللەتەکانی پێش ئێمە کێیە، مەبەست لێیان جوولەکەکانو گاورەکانە؟ فەرمووی: ئەی کێ؟ لە گێڕانەوەیەکا: گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! واتە: چاو لە میللەتی فارسو میللەتی روم دەکەین؟ فەرمووی: بەڵێ مەبەست لە خەڵك ئەوانەن ئەگینا مەبەست کێی ترە؟ (ش).

٦٣- عَنْ عائِشة (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) عَنِ النَّبِي (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) قالَ: مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنا هذَا مَا لَيْسَ مِنْهُ فَهُوَ رَدٌّ. وفي رِوايَةٍ: مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ، رَوَاهُ الثَّلاثَةُ[٣].

---

(٢) بخاري. أحاديث الأنبياء: ٣٤٥٦ ، ٧٣٢٠. مسلم. علم: ٦٧٢٣.

(٣) بخاري. صلح: ٢٦٩٧. مسلم. أقضية: ٤٤٦٧ ، ٤٤٦٨. أبو داود. السنة: ٤٦٠٦.

**واتە: لە عائیشەوە** (خوای لێ ڕازی بێ) **پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **دەفەرموێ:** هەرکەسێ شتێکی ناشایستە لەم ئایینەی ئێمە زیاد بکا کە پەیوەندی پێوە نەبێ ئەوشتە قەبووڵ نیەو دەدرێتەوە دواوە. لە گێڕانەوەیەکا:- هەرکەسێ کارێ بکاکە فەرمانو ڕەزای ئێمەی لەسەر نەبێ ئەو کارە قەبووڵ نیەو دەدرێتە دواوە (ش/د).

٦٤- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّ أَصْدَقَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللَّهِ وَأَحْسَنَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ وَشَرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّارِ. رَوَاهُ الشيخانِ وَالنَّسائيُّ واللفظ له[٤].

**واتە: جابیر لە پێغەمبەرەوە** (درودی خوای لەسەربێ) **دەفەرموێ:** ڕاستترین فەرمایشت فەموودەی خوایە (کە قورئانی پیرۆزە)و جوانترین هیدایەتو ڕێنموونیش هیدایەتو ڕێنمایی موحەمەدە، وە خراپترین کاروباریش ئەو کاروبارانەن کە تازە قەڵاڵنو لە سەردەمی مندا نەبوونو لەپاش من زانایانی ئیسلام ڕەزایان لەسەریان نەبووە، وە هەموو تازە قەڵاڵیەکیش کارێکی ناشایستەیە، وە هەموو شتێکی ناشایستەش سەرگەردانیو گومڕاییە، دیارە کە هەموو گومڕاییەکیش ئەنجامی ناو ئاگری دۆزەخە (ن/ش).

٦٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا نَهَيْتُكُمْ عَنْهُ فَاجْتَنِبُوهُ وَمَا أَمَرْتُكُمْ بِهِ فَافْعَلُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ فَإِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ كَثْرَةُ مَسَائِلِهِمْ وَاخْتِلاَفُهُمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ[٥].

**واتە: ئەبو هورەیرەلە پێغەمبەرەوە** (درودی خوای لەسەربێ) **دەفەرموێ:** ئەوەی گوتم مەیکەن توخنی مەکەون، وە ئەوەی گوتم بیکەن چەند لە تواناتانا هەیە بیکەن زۆر لێی مەکۆڵنەوەو چەندو چۆنی لەسەر مەکەن چونکە نەتەوەکانی پێش ئێوە لەبەر ئەوە لەناوچوون چونکە پرسیاری زۆریان لە پێغەمبەرەکانیان دەکردوو لە دژیان دەوەستان. (ش/ت).

---

(٤) بخاري. اعتصام بالكتاب والسنة: ٧٢٧٧ مسلم. جمعة:٢٠٠٢. نسائي. عيدين: ١٥٧٧.

(٥) بخاري. اعتصام بالكتاب والسنة: ٧٢٨٨ مسلم. فضائل: ٦٠٦٦.

٦٦- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّمَا مَثَلِي وَمَثَلُ أُمَّتِي كَمَثَلِ رَجُلٍ اسْتَوْقَدَ نَارًا فَجَعَلَتِ الدَّوَابُّ وَالْفَرَاشُ يَقَعْنَ فِيهَا، فَأَنَا آخُذُ بِحُجَزِكُمْ وَأَنْتُمْ تَقَحَّمُونَ فِيهَا. رَوَاهُمَا الشَّيْخَان وَالتِّرمِذِيُّ(٦).

واتە: دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: وێنەی منو وێنەی ئۆمەتم وەك وێنەی پیاوێ وایە، ئاگرێكی كردبێتەوە جانەوەرو پەپوولەییێكی زۆری تێ وروكابنو پەیتا پەیتا تێی بكەونو بسووتێن ئەوەتانێ من كەمەرم گرتوونو بەزۆر دورتان دەخەمەوە لە ئاگرەكە، كەچی ئێوە بەزۆر خۆتان لە دەستم رادەپسكێننو خۆتانی تێ فڕی دەدەن! (ش/ت).

٦٧- وَعَنْهُ عَنِ النبي (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: كُلُّ أُمَّتِي يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ إلاَّ مَنْ أَبى، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ وَمَنْ يَأْبى؟ قالَ: مَنْ أَطَاعَنِي دَخَلَ الْجَنَّةَ وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ أَبى. رَوَاهُ البخاري(٧).

واتە: دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئۆمەتم هەموویان دەچنە بەهەشت مەگەر ئەوانە كە مل نادەن گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوانە كامانەن كە مل نادەن!؟ فەرمووی: ئەوەی بەگوێی من بكا دەچێتە بەهەشت، وە ئەوەی بەگوێی من نەكا بەمەعنا مل بەفەرمانی من نادا و لە فەرمانی من دەردەچێ (ب).

٦٨- عَنْ جَابِرَ يَقُولُ: جَاءَتْ مَلاَئِكَةٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ نَائِمٌ فَقَالَ: بَعْضُهُمْ: إِنَّهُ نَائِمٌ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: إِنَّ الْعَيْنَ نَائِمَةٌ وَالْقَلْبَ يَقْظَانُ. فَقَالُوا: إِنَّ لِصَاحِبِكُمْ هذَا مَثَلاً فَاضْرِبُوا لَهُ مَثَلاً، فَقالَ بَعْضُهُمْ: إِنَّهُ نَائِمٌ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: إِنَّ الْعَيْنَ نَائِمَةٌ وَالْقَلْبَ يَقْظَانُ فَقَالُوا مَثَلُهُ كَمَثَلِ رَجُلٍ بَنَىَ دَاراً وَجَعَلَ فِهَا مَأْدُبَةً وَبَعَثَ دَاعِياً فَمَنْ أَجَابَ الدَّاعِي دَخَلَ الْدارَ وَأَكَلَ مِنَ الْمَأْدُبَةِ وَمَنْ لَمْ يُجِبِ الْداعِيَ لَمْ يَدْخُلِ الْدارَ وَلَمْ يَأْكُلْ مِنَ الْمَأْدُبَةِ، فَقَالُوا: أَو لُوهَا لَهُ يَفْقَهْهاَ، فَقَالَ: بَعْضُهُمْ: إِنَّهُ نَائِمٌ، وَقَالَ: بَعْضُهُمْ: إِنَّ الْعَيْنَ نائِمةٌ وَالْقَلْبَ يَقْظَانُ، فَقَالُوا: فَالْدارُ الْجَنَّةُ وَالدَّاعِي

(٦) بخاري. علم: ٧٩. مسلم. فضائل: ٥٩١٢ ، ٥٩١٤.

(٧) بخاري. اعتصام بالكتاب والسنة: ٧٢٨٠.

مُحَمَّدٌ (صَلى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) فَمَنْ أَطَاعَ مُحَمَّداً فَقَدْ أَطَاعَ اللهَ وَمَنْ عَصى مُحَمَّداً فَقَدْ عَصى اللهَ، وَمُحَمَّدٌ (صَلَى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم) فَرْقٌ بَيْنَ النَّاسِ. رَوَاهُ البخاري والتِرْمِذِي[٨].

واتە: جابیر (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەخەوێ، فریشە دێنە دیاری هەندێکیان دەڵێن: ئەمە نووستووە، هەندێکی تریشیان دەڵێن: بەچاو نووستووە بەڵام بە دڵ وریایە چونکە پێغەمبەران دڵیان نانوێ جا گوتیان: ئەم برادەرەی ئێوە مەثەڵو وێنەیەکی هەیە، ئەو مەثەڵو وێنەیەی خۆیی بۆ روون بکەنەوە. هەندێکیان گوتیانەوە: ئاخر خەوتووە، هەندێکی تریشیان گوتیانەوە: بەچاو نووستووە بەڵام بەدڵ وریایە، ئینجا گوتیان مەثەڵو وێنەی ئەم پیاوە وەك پیاوێ وایە، کەوا خانوویێ دروست بکاو شاییەکی بۆ بکاو بانگکەر بنێرێ کە خەڵك خوڵك بکا بۆ سەرشایی ئیتر ئەوەی بە دەنگی بانگکەرەکەوە بچێت دەچێتە ناو خانووەکەوە لە نانی شاییەکە دەخوا، ئەوەشی نەچێ بە دەنگی بانگکەرەکەوە نەدەچێتە ناو خانوکەوەو نە لەنانی شاییەکەش دەخوا. ئینجا فریشتەکان گوتیان: ئادەی ئەم مەثەلەی بۆ لێك بدەنەوە با باش تێی بگا، جا دیسان هەندێکیان گوتیان: ئاخر خەوتووە، وە هەندێکی تریشیان گوتیان: چاو خەوتووە، دڵ خەبەردارە! ئینجا گوتیان: خانووەکە بەهەشتە، بانگەکەرەکەش موحەمەدە (درودی خوای لێبێ) ئیتر ئەوەی فەرمانی موحەمەد لەگوێ بگرێ لە ڕاستیدا فەرمانی خودا لەگوێ دەگرێ، وە ئەوەی لە موحەمەدیاخی بێ و لە فەرمانی ئەو دەرچێ ئەوە بەڕاستی لەخودا یاخی دەبێ و لە فەرمانی خودا دەردەچێ، وە موحەمەد (درودی خوای لێبێ) پاك و پیسی ئەو خەڵکە لەیەك جوێ دەکاتەوە چونکی ئەوەی پەیڕەوی ئەوە پەیڕەوی خودای میهرەبانە، وە ئەوەی لە دژی ئەوە ئەوە لە حیزبو پارتی شەیتانە (ب/ت).

(٨) بخاري. أعتصام بالكتاب والسنة: ٧٢٨١.

٦٩– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَتَى الْمَقْبُرَةَ فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِكُمْ لاَحِقُونَ وَدِدْتُ أَنَّا قَدْ رَأَيْنَا إِخْوَانَنَا". قَالُوا: أَوَلَسْنَا إِخْوَانَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ: أَنْتُمْ أَصْحَابِي وَإِخْوَانُنَا الَّذِينَ لَمْ يَأْتُوا بَعْدُ فَقَالُوا كَيْفَ تَعْرِفُ مَنْ لَمْ يَأْتِ بَعْدُ مِنْ أُمَّتِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ: أَرَأَيْتَ لَوْ أَنَّ رَجُلاً لَهُ خَيْلٌ غُرٌّ مُحَجَّلَةٌ بَيْنَ ظَهْرَىْ خَيْلٍ دُهْمٍ بُهْمٍ أَلاَ يَعْرِفُ خَيْلَهُ؟ قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قالَ: فَإِنَّهُمْ يَأْتُونَ غُرًّا مُحَجَّلِينَ مِنَ الْوُضُوءِ وَأَنَا فَرَطُهُمْ عَلَى الْحَوْضِ أَلاَ لَيُذَادَنَّ رِجَالٌ عَنْ حَوْضِي كَمَا يُذَادُ الْبَعِيرُ الضَّالُّ أُنَادِيهِمْ أَلاَ هَلُمَّ. فَيُقَالُ: إِنَّهُمْ قَدْ بَدَّلُوا بَعْدَكَ. فَأَقُولُ: سُحْقًا سُحْقًا. رَوَاهُ مُسْلِمْ وَالنَّسائِيُّ وَلِلْبِخُارِي بَعْضه[٩].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) چوو بۆ سەر گۆڕستانەکە، فەرمووی:

(أَلسَّلاَمُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ وَإِنَّا إِن شَاءِ اللهُ بِكُمْ لاَحِقُونَ}:

سڵاوتان لێ بێ، مەبەستم لەو موسوڵمانانەیە کە ئەم گۆڕستانە بووە بەماڵی دوارۆژیان (دروودو سڵاوتان لێبێ) ئەی دانیشتوانی شاری خامۆشان! ئێمەیش (خوا حەزکا) دەگەینەوە پێتان. ئینجا حەزرەت فەرمووی: خۆزگەم براکانی خۆشمان دەبینی یارانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆچی براکانت زیاد لە ئێمە کێی ترن؟ فەرمووی: ئێوە براو هاوڕێ و یارانی منن، بەڵام براکانمان ئەو موسوڵمانانەن کە هێشتا نەهاتوون و جارێ لە دایك نەبوون گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە چۆن ئەوانە دەناسیتەوە لە ئۆمەتت کە هێشتا لەدایك نەبوون و لە جیهانا نایان بینی؟ فەرمووی: پێم بڵێن ئەگەر پیاوێ ڕەوگە ماینێکی مارۆی چوارپەل سپی هەبێ وە لەناو ڕەوگە ماینێکی ڕەشی پەتی دابێ ئایا ڕەوگەکەی خۆی ناناسێتەوە؟

گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: دەسا ئۆمەتی منیش لە قیامەتا کە دێن بۆلام خۆم لەسەر حەوزی کەوثەر چاوەنواڕیان دەکەم،

---

(٩) مسلم. طهارة: ٥٨٣. نسائي. طهارة: ١٥٠.

هەموویان قەشو مارۆو چوارپەل سپینو ئەو شوێنانەی ئەندامیان كە ئاوی دەسنوێژ دەیانگرێتەوە سپیو گەشو جوانن: ئاگادار بن گەلێ كەس لەسەر حەوزی كەوثەر گوڕێیان لێ دەكرێو دەردەكرێن لەوێ وەك چۆن وشتری بزری ئاوەكی دەردەكرێ، خۆم لەوێ بانگیان لێ دەكەم وەرن بۆ سەر حەوزەكەم، خۆ ئێوە لە ئۆمەتی من بوون فریشتە دەڵێت: ئەوانە لەپاش تۆ وەرگەڕابوون! جا منیش دەڵێم: كەوایە دەچش لە چارەیان لەوە ئەولاتر بڕۆن! (م/ن).

٧٠- عَنِ الْعِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ قَالَ: وَعَظَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمًا بَعْدَ صَلَاةِ الْغَدَاةِ مَوْعِظَةً بَلِيغَةً ذَرَفَتْ مِنْهَا الْعُيُونُ وَوَجِلَتْ مِنْهَا الْقُلُوبُ فَقَالَ رَجُلٌ إِنَّ هَذِهِ مَوْعِظَةُ مُوَدِّعٍ فَمَاذَا تَعْهَدُ إِلَيْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ: أُوصِيكُمْ بِتَقْوَى اللَّهِ وَالسَّمْعِ وَالطَّاعَةِ وَإِنْ عَبْدٌ حَبَشِيٌّ فَإِنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ يَرَى اخْتِلَافًا كَثِيرًا وَإِيَّاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الأُمُورِ فَإِنَّهَا ضَلَالَةٌ فَمَنْ أَدْرَكَ ذَلِكَ مِنْكُمْ فَعَلَيْهِ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ عَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ[١٠].

واتە: عیرباضی كوڕی ساریە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: ڕۆژێ، لەپاش نوێژی بەیانی، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئامۆژگارییەكی شیرینو تەمبێیەكی دڵگیری كردین، چاویهێنایە گریانو دڵی خستە ترسو لەرزین، تا پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمایشتەكانت لەقسەی كەسێ دەچێ كە لەسەر ئۆغربێو ماڵ ئاواییو خودا حافیزی بكا، كەوایە فەرمانت بەچییە پێمان، ئامۆژگارییەكمان بفەرموو. فەرمووی: ئامۆژگاری ئەوەتان دەكەم كە لەخودا بترسنو تەقوای خودا بكەنو گوێی رایەڵو فەرمانبەر بنو لە فەرمانی سەركارو فەرمانڕەوای خۆتان دەرمەچن، ئەگەر چی قولە رەشێكی حەبەشەییش بوە بە فەرماندارتان، چونكە ئەوەی لە ئێوە بمێنێ ناكۆكییەكی زۆر دەبینێ، وە خۆتان بپارێزن لە كارو باری تازە قەڵلا، چونكە ئەوانە هۆی سەرلێ شێوانو هەوێنی گومڕایین، جا ئەگەر كەسێ لە ئێوە كەوتە ئەو رۆژانەو شتێ لەوانەی تووش بوو با دەست بگرێ بە سوننەتو یاسای خۆمو

---

(١٠) رواه أبو داود والترمذي بسندين صحيحين (شرحه).

پەیڕەوی ڕەووشت و ڕەفتاری جێ نشینە باشە شارەزاكانم بكا، وە بەدەم و دەست یاسای خۆم و جێ نشینە باشەكانم بگرن و بە پێڵووی چاو بی پارێزن! (د/ت-س/ص).

٧١- عَنْ أَبِي رَافِعٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ ٱلنَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ مُتَّكِئًا عَلَى أَرِيكَتِهِ يَأْتِيهِ الأَمْرُ مِمَّا أَمَرْتُ بِهِ أَوْ نَهَيْتُ عَنْهُ فَيَقُولُ لاَ أَدْرِى مَا وَجَدْنَا فِي كِتَابِ اللّٰهِ اتَّبَعْنَاهُ[١١].

واتە: ئەبو رافیع (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: نامەوێ پێم بگاتەوە كە: یەكێ لە ئێوە لەسەر قەنەفەی كشخە بەكەش و فش دابنیشێ، وەكاتێ فەرمانێ لەو فەرمانانەی منی پێ بگات كە من فەرمانم كردووەبە كردنیان یا بە نەكردنیان.. بڵێ: ئێمە ئەمانە نازانین هەرچی لە قورئانابێ پەیڕەوی ئەوە دەكەین ڕەفت بە هیچی ترناكەین!.

٧٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ ٱلنَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: افْتَرَقَتِ الْيَهُودُ عَلَى إِحْدَى أَوْ ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً وَتَفَرَّقَتِ النَّصَارَى عَلَى إِحْدَى أَوْ ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً وَتَفْتَرِقُ أُمَّتِي عَلَى ثَلاَثٍ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً. زَادَ فِي رِوَايَةٍ: ثِنْتَانِ وَسَبْعُونَ فِي ٱلنَّارِ وَوَاحِدَةٌ فِي ٱلْجَنَّةِ وَهِيَ ٱلْجَمَاعَةُ. روى الثلاثة أَبُو دَاوُدَ والترمذي[١٢].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: جوولەكە بوون بەحەفتاو یەك تیپ یا فەرمووی: بوون بە حەفتاو دوو تیپ، وە گاوربوون بە حەفتاو یەك تیپ یا فەرمووی: بوون بە حەفتاو دوو تیپ، وە ئۆمەتی من دەبن بە حەفتاو سێ تیپ لە گێڕانەوەیەكا ئەمەی زیادە: حەفتاو دوو تیپیان لە دۆزەخدان، تاقە تیپێكیان لە بەهەشتدان كە تیپی جەماعەت و كۆمەڵی موسوڵمانانن (د/ت – س/ص).

٧٣- وَعَنْهُ عَنِ ٱلنَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: تَرَكْتُ فِيكُمْ أَمْرَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا مَا تَمَسَّكْتُمْ بِهِمَا: كِتَابَ اللّٰهِ وَسُنَّةَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رَوَاهُ الإمام مالك[١٣].

---

(١١) رواه أبو داود والترمذي: بسندين صحيحين (شرحه).

(١٢) رواه أبو داود والترمذي بسندين صحيحين (شرحه).

(١٣) لم ينسب الشارح درجته (مترجم).

دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: دوو شتم لەناودا بەجێ هێشتوون هەرگیز سەرتان لێ ناشێوێ بە مەرجێ دەست بەو دووە بگرن: یەك قورئان كە نامەی خودایە، یەك ڕێبازو فرمایشتی پێغەمبەری خودا (درودی خوای لەسەربێ) (ئیمامی مالیك).

٧٤- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ ٱلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنِّي تَارِكٌ فِيكُمْ مَا إِنْ تَمَسَّكْتُمْ بِهِ لَنْ تَضِلُّوا بَعْدِي أَحَدُهُمَا أَعْظَمُ مِنَ الآخَرِ كِتَابُ اللَّهِ حَبْلٌ مَمْدُودٌ مِنَ السَّمَاءِ إِلَى الأَرْضِ وَعِتْرَتِي أَهْلُ بَيْتِي وَلَنْ يَتَفَرَّقَا حَتَّى يَرِدَا عَلَيَّ الْحَوْضَ فَانْظُرُوا كَيْفَ تَخْلُفُونِي فِيهِمَا. رَوَاهُ التِّرْمِذِي وَمُسْلِمٌ(١٤).

واتە: زەیدی كوڕی ئەرقەم (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: دوو شتتان لەناودا بەجێ دەهێڵم هەتا دەست بە كەمەندی ئەو دووە بگرن لەپاش خۆم قەت گومڕا نابن، یەكێیان كە لەوی تریان گەورەترە قورئانە، كە نامەی خودایە، كە كەمەندی پەیمانی خودایە لە ئاسمانەوە خودا ئەم كەمەندەی داهێشتووە بۆ بەندەكانی خۆی لەسەر ڕووی زەوی خۆشی لەو كەسە كە دەس دەگرێ بەو كەمەندو گوریسەو خۆی ڕزگار دەكا لە زیندانی ئەم جیهانە پیسە ئەوەكەی تریشیان كەسوكارەكەی خۆمە، ئەم دووەیش هەرگیز لە یەكتری دانابڕێن تا پێكەوە بە جووت دێنەوە بۆلای خۆم بۆ سەر حەوزی كەوثەر، دەسا كەوایە ئێوەیش لەپاش خۆم لەباتی من چاوی خێرتان لێیان بێ‌و لەبەر خاتری من ڕێزێكی باشیان لێ بگرن (ت/م).

٧٥- عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ: يَا بُنَيَّ إِنْ قَدَرْتَ أَنْ تُصْبِحَ وَتُمْسِيَ لَيْسَ فِي قَلْبِكَ غِشٌّ لِأَحَدٍ فَافْعَلْ، ثُمَّ قَالَ: لِي: يَا بُنَيَّ وَذلِكَ مِنْ سُنَّتِي وَمَنْ أَحْيَا سُنَّتِي فَقَدْ أَحَبَّنِي وَمَنْ أَحَبَّنِي كَانَ مَعِي فِي ٱلْجَنَّةِ. رَوَاهُ ٱلتِّرْمِذِيُّ(١٥).

واتە: ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پێی فەرمووم: كوڕی خۆشەویستم! تا دەتوانی نیازی گزی‌و ناپاكیكردن لە خەڵك لە دڵی خۆت

---

(١٤) مسلم. فضائل: ٦١٧٥ ، ٦١٧٧ ، ٦١٧٨.

(١٥) في العلم بسند حسن (شرحه).

دەرکە وە بزانە سینەی بێ کینە سفرەی یەزدانە ئینجا فەرمووی پێم: کوڕی شیرینم! سینەی سافو بێ کینە رەوشتو یاسای منە، وە ئەو کەسەی کە یاساو رەوشتی من زیندوو دەکاتەوە ئەوە بە راستی منی خۆش دەوێ وە ئەو کەسەی منی خۆش دەوێ ئەوە لە بەهەشتا لەگەڵما دەبێ.(ت-س/ح).

## ١٠) باسی حەوتەم: ئیقتیصادو میانەڕەو لە هەموو کارێکا (بەمەرجی بەردەوامی لەسەری) لەلای خودا زۆر باشو پەسەندە:

## الباب السابع: الاقتصاد في العمل والدوام عليه أحب إلى الله

٧٦- عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دَخَلَ عَلَيْهَا وَعِنْدَهَا امْرَأَةٌ فَقَالَ: مَنْ هَذِهِ قَالَتْ: فُلاَنَةُ. تَذْكُرُ مِنْ صَلاَتِهَا. قَالَ: مَهْ، عَلَيْكُمْ بِمَا تُطِيقُونَ، فَوَاللَّهِ لاَ يَمَلُّ اللَّهُ حَتَّى تَمَلُّوا وَكَانَ أَحَبَّ الدِّينِ إِلَى اللهِ مَا دَاوَمَ عَلَيْهِ صَاحِبُهُ. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ إِلاَّ التِرْمِذِيُّ[1].

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی جارێ کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هات بۆلام ئافرەتێکم لە لابوو، فەرمووی: ئەم ژنە کێیە؟ گوتم: ئەمە فیسارە ئافرەتە لە نوێژکردنو خودا پەرستیدا مانەندی نیە! فەرمووی: وسبە! ئەوەندە خوا پەرستی بکەن کە لەتواناتانابێ، چونکە بەخودا هەتا ئێوە وەڕس نەبن خودا وەڕس نابێ، وە باشترین ئایینداری لەلای خودا ئەوەیە کە خاوەنەکەی بەردەوام بێ لەسەری (ش/د/ن).

٧٧- عَنْ أَنَسٍ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: أَمَا وَاللهِ إِنِّي لأَخْشَاكُمْ لِلَّهِ وَأَتْقَاكُمْ لَهُ، وَلَكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ، وَأُصَلِّي وَأَرْقُدُ وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي. رَوَاهُ الشيخان والنسائي[2].

---

(١) بخاري. إيمان: ٤٣ ، ١١٥١. مسلم. صلاة المسافرين: ١٨٢٤.

(٢) مسلم. نكاح: ٣٣٨٩. نسائي. نكاح: ٣٢١٧

**واتــه: ئەنــەس** (خـوای لێ رازی بـێ) **لــه پێغەمبــەرەوە** (دروودی خـوای لەسـەربێ) **دەفەرموێ: (ئەدی بەخودا خۆ من لە هەموویشتان زۆرتر لە خودا دەترسمو زۆرتـر خـۆم دەپـارێزم لـه نافـەرمانیو بـێ گـوێیی ئـەو بـەڵام لەگـەڵ ئەمەشـا بەڕۆژووش دەبمو بەڕۆژووش نابم شەو نوێژ دەكەمو بەشی خۆشم دەخەومو ژنیـشم هێنـاوەو بـەپێی یاسـای خـودا لەگـەڵی رادەبوێرم، جـا ئەمـە رەفتـارو یاساو ئایینی منە، ئەوەی لاری لێی بێ لەمن نیه** (ش/ن).

٧٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو (رَضيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) قالَ: قَالَ: لِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَلَمْ أُخبَرْ أَنَّكَ تَقُومُ اللَّيْلَ وَتَصُومُ النَّهَارَ؟ قُلْتُ إِنِّي أَفْعَلُ ذَلِكَ. قَالَ: فَإِنَّكَ إِذَا فَعَلْتَ ذَلِكَ هَجَمَتْ عَيْنُكَ وَنَفِهَتْ نَفْسُكَ، وَإِنَّ لِنَفْسِكَ حَقٌّ، وَلأَهْلِكَ حَقٌّ، فَصُمْ وَأَفْطِرْ، وَقُمْ وَنَمْ. رَوَاهُ الشَّيْخَانِ[٣].

**واتە: عەبدوڵلای كوڕی عەمر** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی پێم: دەڵێن: تۆ بەشـەو هـەر شـەونوێژ دەكـەیتو بە رۆژیـش هەر بەرۆژوو دەبیـت! گـوتم: بـەڵێ وا دەكـەم، فـەرمووی: ئـاخر ئەگـەر وابكـەی چاوت كز دەبێو دڵت جاڕس دەبێو لە ئەنجاما كول دەبیتو كۆڵ دەدەیت! لە راستیدا تۆ بەش بـە حـاڵی خـۆت مـافی حەسانەوەو حەوانـەوەت هەیـە، وە خێزانەكەت بەشی خۆی مافی هەیە لە سەرت، كە وابوو تۆ دەبێ مافی هەموو خـاوەن مافـێ بـدەی، جـا كەواتـە نـاو بـەناو بـەرۆژوو بـەو، نـاو بـەناو بـەرۆژوو مەبە، وە بەشەو شەونوێژیش بكەو بەشی خۆتیش بخەوە!** (ش).

٧٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: إِنَّ الدِّينَ يُسْرٌ، وَلَنْ يُشَادَّ الدِّينَ أَحَدٌ إِلاَّ غَلَبَهُ، فَسَدِّدُوا وَقَارِبُوا وَأَبْشِرُوا، وَاسْتَعِينُوا بِالْغَدْوَةِ وَالرَّوْحَةِ وَشَيْءٍ مِنَ الدُّلْجَةِ[٤].

---

(٣) بخاري. صوم: ١٩٧٥ ، ١٩٧٩ ، ٣٤١٩. مسلم. صيام: ٢٧٣٠.

(٤) بخاري. إيمان: ٣٩ ، ٥٦٧٣ ، ٦٤٦٣ ، ٧٢٣٥.

واتــە: ئـەبو هـورەیرە لـە پێغەمبـەرەوە (دروودی خوای لەسەربێ) دەفـەرموێ: ئـایین ئاسانە ئەگەر كەسێ لەخۆی گران نەكا، هەرگیز نەبووە یەكێ ئایین لە خۆی گران بكاو بەتوندی باوەشی پیا بكاو تاسەر بیباتەسەر! بەڵكوو ئەو كەسانە لە ئەنجامدا ئایین بەزاندوونیو كوڵی پێ داون، جا كەواتە هەر لەسەرەتاوە ملی ڕێگەی ڕاست بگرنو ئەوەندەی بۆتان دەلوێ درێغی لە كردنی كاری باش مەكەنو مزگێنی خۆتان وەربگرن، ئێوەیش وەك ڕێبواری چالاك لەم سێ كاتەدا تێكۆشنو خودا پەرستیو بەندەگی خۆتان بكەنو بیكەن بە دەسمایەی خۆتان: سەر لە بەیانیانو سەر لە ئێوارانو دەمەو پارشێو (ب).

٨٠- عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا أَمَرَهُمْ أَمَرَهُمْ مِنَ الأَعْمَالِ بِمَا يُطِيقُونَ قَالُوا: إِنَّا لَسْنَا كَهَيْئَتِكَ يَا رَسُولَ اللّٰهِ، إِنَّ اللّٰهَ قَدْ غَفَرَ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ. فَيَغْضَبُ حَتَّى يُعْرَفَ الْغَضَبُ فِي وَجْهِهِ ثُمَّ يَقُولُ: إِنَّ أَتْقَاكُمْ وَأَعْلَمَكُمْ بِاللّٰهِ أَنَا. رَوَاهُمَا أَلْبُخَارِي(٥).

عائیشە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەستووری وا بـوو كاتـێ فـەرمانی بـەیارانی دەكـرد بـۆ كردنـی كـارێ، داوای شـتێكی لێ نەدەكردن كە لە تاقەتو تەوانایانا نەبوایە. گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئاخر ئێمە وەك تۆ نین، تۆ لەكوێو ئێمە لە كوێ، تۆ خودای گەورە لە گوناهی بەرو دوات خۆش بووە، پێغەمبەریش تووڕە دەبوو بەڕەنگێكی وا لە ڕووی دیاربوو، وە دەیفەرموو: من لە هەمووتان باشتر لە خودا دەترسم وە لە هەمووشتان باشتر دەیناسم (ب).

(٥) بخاري. نكاح: ٥٠٦٣ + إيمان: ٢٠.

٨١- وَسُئِلَتْ عَائِشَةُ: (رَضيَ اللهُ عَنهَا) هَلْ كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَخُصُّ شَيْئًا مِنَ الأَيامِ؟ قَالَتْ: لاَ، كَانَ عَمَلُهُ دِيمَةً، وَأَيُّكُمْ يُطِيقُ مَا كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَسْتَطِيعُ. رَوَاهُ الثَّلاثَةُ[٦].

**واتە: پرسییان لە عائیشە: ئایا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) هیچ ڕۆژێكی هەڵدەبژراد بۆ كردنی كارە باشەكان بە تایبەتی؟ گوتی: نەء، ئەوەی دەیكرد هەمیشە دەیكرد (وەلای ئەو پێنج شەمەو هەینی و ڕۆژەكانی تر جیاوازی نەبوو) لەگەڵ ئەوەشا كێتان وەك ئەوتان پێ دەكرێ (ش/د).**

٨٢- وَعَنْها أَنَّ رَسُولَ اللهِ سُئِلَ: أيُّ الْعَمَلِ أَحَبُّ إِلى اللهِ؟ قالَ: أَدْوَمُهُ وَإِنْ قَلَّ. رَوَاهُ الشَّيْخان والتِرْمِذِيُّ[٧].

**واتە: عائیشە گوتی: لە پێغەمبەریان پرسی (دروودی خوای لەسەربێ) كام كارە لە لای خودا زۆر خێرو گەورەیە؟ فەرمووی: كارێكی باش كە خاوەنەكەی هەمیشە بیكاو تاسەر تەركی نەكا با كەمیش بێ! (ش/ت).**

(٦) بخاري. رقاق: ٦٤٦٦ ، ١٩٨٧. مسلم. صلاة المسافرين: ١٨٢٦. أبو داود. صلاة: ١٣٧٠.

(٧) بخاري. رقاق: ٦٤٦٥. مسلم. صلاة: ١٨٢٧.

بسم الله الرحمن الرحیم

# نامەی نیازو نیاز پاکی (نییەتو ئیخلاص)

(سێ باسە)

## ١١) باسی یەکەم: باسی نیازو نیازپاکیو سوودیان

## كتاب النية والاخلاص (وفيه ثلاثة أبواب)

## الباب الاول: في النية والاخلاص ومزاياهما

قَالَ اللهُ جَلَّ شَأْنُهُ: {فَاعْبُدِ اللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ الدِّينَ، أَلَا لِلَّهِ الـدِّينُ الْخَـالِصُ – ٣٩/ ٢–٣}.

واتــە: بەنـدەیێ هـەر بـۆ خـودا بكـە لـە حاڵێكـدا كـە بـە نیـازێكی پـاك ئاییندارى بۆ خودا بكەى، وە بزانن كە خودا بەس كردەوەى پاكو بێگەردو چاكی دەوێ وە هەر دینی بێ تۆزو گەردو پاكی دەوێ.

{وقَالَ: – وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاء – ٩٨/٥}.

خودای گەورە دەفەرموێ: ئەمە لە كاتێكدا ئەمە پێغەمبەرەكە هـاتووە بۆلایان داوای شتی زیادەی لێ نەكردوونو فەرمانیان پێ نـەكراوە بەوە نـەبێ كـە بەنـدەییو پەرسـتـشی خـودا بكـەن لـە حاڵێكـدا كـە بـەنیازێكی پـاك ئاییندارییی بۆ بكەن وەلابدەن لە هەموو بیرو باوەڕێكی خواروو خێچ.

٨٣– عَنْ عُمَرَ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّـاتِ وَإِنَّمَـا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللَّـهِ وَرَسُـولِهِ وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ لِدُنْيَا يُصِيبُهَا أَوِ امْرَأَةٍ يَتَزَوَّجُهَا فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ[1].

واتــە: عومــەر (خـوای لێ ڕازی بـێ) گــوتی: پێغەمبــەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) دەفەرموێ: هەموو كردەوەیێ بەپێی نیازو نییەتەكەیەتی وە هـیچ كـارێ بـەبێ

---

(١) بخـاري. بـدء الـوحی: ١ ، ٥٤ ، ٢٥٢٩ ، ٣٨٩٨ ، ٥٠٧٠ ، ٦٦٨٩ ، ٦٩٥٣. مـسلم. إمـارة: ٤٩٠٤. أبـو داود. طـلاق: ٢٢٠١، ترمذي. جهاد: ١٦٤٧. نسائي. طهارة: ٧٥ ، ٣٤٣٧ ، ٣٨٠٣.

نیـازو خواسـتی دڵ دانامـەزرێ، وە هـەموو کەسـێکیش بـە پاداشـی نیـازو نییەتی خۆی دەگا (چ چاك چ خـراپ) کـەوابوو هـەر کەسـێ مەبەسـتی لـە کـۆچ کردنەکـەی لـە مەککـەوە بـۆ مەدینـە ڕەزای خـوداو پێغەمبـەربێ ئـەوە کۆچـکردنەکەی قەبووڵـەو بـە پاداشـی گـەورە دەگـا، وە هـەر کەسـێکیش کۆچکردنەکەی لەبەر کارێکی دونیایی بێ کە دەستی بکەوێ، یاخود لەبەر ئافرەتێ بێ کە مارەی بکا ئەوە کۆچکردنەکەی بەپێی نیازەکەیەتی و هیچ خێری ناگا لەسەری (ش/د/ت/ن).

٨٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنْ ألنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِيمَا يَرْوِي عَنْ رَبِّهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى قالَ: إنَّ اللَّهَ كَتَبَ الْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ ثُمَّ بَيَّنَ ذَلِكَ فَمَنْ هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللَّهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً وَإنْ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا كَتَبَهَا اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عِنْدَهُ عَشْرَ حَسَنَاتٍ إلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ إلَى أَضْعَافٍ كَثِيرَةٍ وَإنْ هَمَّ بِسَيِّئَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا كَتَبَهَا اللَّهُ عِنْدَهُ حَسَنَةً كَامِلَةً وَإنْ هَمَّ بِهَا فَعَمِلَهَا كَتَبَهَا اللَّهُ سَيِّئَةً وَاحِدَةً. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ إلاَّ أَبَا دَاوُدَ[٢].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەگێڕێتـەوە لـە خـودای گـەورەو بـێ هاوتـاوە دەفـەرموێ: خـودا هـەموو چاکەیەك و هـەموو خراپەیـەکی لـە (لـوح المحفـظ) نووسـیوەو بـەم شـێوەیە ڕوونی کردوونەتەوە بۆ هەموو کەسێ: ئەگەر کەسێ ویستی چاکەیێ بکاو بۆی نەکرا ئەوە خودا لەلای خۆی چاکەیەکی تەواوی بۆ دەنووسێ، وە ئەگەر کەسێ ویستی چاکەیێ بکاو لە هەمان کاتدا کردی ئەوە خودای سەردارو سەروەر لەلای خۆی لە دە چاکەوە تا حەوت سەد چاکەتا ئەوەندەی خودا خۆی حەزکا چاکەی بۆ دەنووسێ، وە ئەگەر کەسێ ویستی خراپەیێ بکا بەڵام نەیکرد ئەوە خودا لەلای خۆی چاکەیەکی تەواوی بۆ دەنووسێ، وە ئەگەر کەسێ ویستی خراپەیێ بکا وەکردی ئەوە خودا بەیەك خراپە دەینووسێ. (ش/ت/ن).

---

(٢) بخاري. رقائق: ٦٤٩١. مسلم. إيمان: ٢٣٠ هەتا. ٢٣٦. نسائي. تفسير: ٢٠٧٣

٨٥- عَنْ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ ألنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: بَيْنَمَا ثَلاَثَةُ نَفَرٍ يَمْشُونَ أَخَذَهُمُ الْمَطَرُ، فَأَوَوْا إِلَى غَارٍ فِي جَبَلٍ، فَانْحَطَّتْ عَلَى فَمِ غَارِهِمْ صَخْرَةٌ مِنَ الْجَبَلِ فَانْطَبَقَتْ عَلَيْهِمْ، فَقَالَ: بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ انْظُرُوا أَعْمَالاً عَمِلْتُمُوهَا صَالِحَةً لِلَّهِ فَادْعُوا اللَّهَ بِهَا لَعَلَّهُ يُفَرِّجُهَا عَنْكُمْ. قَالَ: أَحَدُهُمْ: اللَّهُمَّ إِنَّهُ كَانَ لِي وَالِدَانِ شَيْخَانِ كَبِيرَانِ، وَلِي صِبْيَةٌ صِغَارٌ كُنْتُ أَرْعَى عَلَيْهِمْ، فَإِذَا رُحْتُ عَلَيْهِمْ حَلَبْتُ، فَبَدَأْتُ بِوَالِدَيَّ أَسْقِيهِمَا قَبْلَ بَنِيَّ، وَإِنِّي اسْتَأْخَرْتُ ذَاتَ يَوْمٍ فَلَمْ آتِ حَتَّى أَمْسَيْتُ، فَوَجَدْتُهُمَا نَائِمَيْنِ، فَحَلَبْتُ كَمَا كُنْتُ أَحْلُبُ، فَقُمْتُ عِنْدَ رُءُوسِهِمَا، أَكْرَهُ أَنْ أُوقِظَهُمَا، وَأَكْرَهُ أَنْ أَسْقِيَ الصِّبْيَةَ، يَتَضَاغَوْنَ عِنْدَ رِجْلَيَّ حَتَّى طَلَعَ الْفَجْرُ، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُهُ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ فَافْرُجْ لَنَا فَرْجَةً نَرَى مِنْهَا السَّمَاءَ. فَفَرَجَ اللَّهُ فَرَأَوُا السَّمَاءَ. وَقَالَ: الآخَرُ: اللَّهُمَّ إِنَّهَا كَانَتْ لِي بِنْتُ عَمٍّ أَحْبَبْتُهَا كَأَشَدِّ مَا يُحِبُّ الرِّجَالُ النِّسَاءَ، فَطَلَبْتُ مِنْهَا فَأَبَتْ حَتَّى أَتَيْتُهَا بِمِائَةِ دِينَارٍ، فَبَغَيْتُ حَتَّى جَمَعْتُهَا، فَلَمَّا وَقَعْتُ بَيْنَ رِجْلَيْهَا قَالَتْ يَا عَبْدَ اللَّهِ اتَّقِ اللَّهَ، وَلاَ تَفْتَحِ الْخَاتَمَ إِلاَّ بِحَقِّهِ، فَقُمْتُ، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُهُ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ فَافْرُجْ عَنَّا فَرْجَةً. فَفَرَجَ. وَقَالَ: الثَّالِثُ اللَّهُمَّ إِنِّي اسْتَأْجَرْتُ أَجِيرًا بِفَرَقِ أَرُزٍّ، فَلَمَّا قَضَى عَمَلَهُ قَالَ: أَعْطِنِي حَقِّي. فَعَرَضْتُ عَلَيْهِ، فَرَغِبَ عَنْهُ، فَلَمْ أَزَلْ أَزْرَعُهُ حَتَّى جَمَعْتُ مِنْهُ بَقَرًا وَرُعَاتَهَا فَجَاءَنِي فَقَالَ: اتَّقِ اللَّهَ. فَقُلْتُ اذْهَبْ إِلَى ذَلِكَ الْبَقَرِ وَرُعَاتِهَا فَخُذْ. فَقَالَ: اتَّقِ اللَّهَ وَلاَ تَسْتَهْزِئْ بِي. فَقُلْتُ إِنِّي لاَ أَسْتَهْزِئُ بِكَ فَخُذْ. فَأَخَذَهُ، فَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنِّي فَعَلْتُ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ فَافْرُجْ مَا بَقِيَ، فَفَرَجَ اللَّهُ. وَفِي رَوَايَة: فَخَرَجُوا يَمْشُون. رَوَاهُ ألشَّيْخَان والنَسائي[٣].

**واتە: ئیبنو عومەر** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: جارێ سێ کەس بە ڕێگەیەکا دەڕۆیشتن، باران دای گرتن جا پەنایان بردە بەر ئەشکەوتێ لە کێوێ، تاوێرێ لە کێوەکەوە گل بۆوەو دەرگای ئەشکەوتەکەی قەپاتکرد، جا لەناو خۆیاندا گوتیان: سەیربکەن بزانن چی کردەوەیەکی باشتان کردووە بۆ خودا بەو کردەوانە لە خودا**

---

(٣) بخاري. إجارة: ٢٢٧٢ ، ٢٢١٥ ، ٢٣٣٣ ، ٣٤٦٥ ، ٥٩٧٤. مسلم. توبة: ٦٨٨٥ ، ٦٨٨٤ ، ٦٨٨٦.

بپارێنەوە سا بەشکوو خودا دەرووتان لێ بکاتەوە. یەکێکیان گوتی: خودایە! خۆت ئاگاداری کەمن باوكو دایکێکی پیرو ئیختیارم هەبوونو چەن منداڵێکی وردیشم هەبوون، شوانیم بۆ دەکردن، هەموو جارێ کە دەگەڕامەوە بۆماڵەوە رانەکەم دەکردە پەچەوەو شیرم دەدۆشی و لە پێشدا دەرخواردی باوكو دایکم دەدا ئەوجا بەشی مناڵەکانیشمم دەدا، تا رۆژێ درەنگم بەسەرهاتو کە هاتمەوە شەوبوو، روانیم باوكو دایکم خەوتوون، منیش وەك جاران شیرم دۆشی و بە دیار سەریانەوە راوەستام (تاکەی خەبەریان بۆوە شیرەکەیان بخۆنەوە) بەڵام حەزم نەکرد کە خەبەریان بکەمەوەو پێشم ناخۆش بوو کە بەر لەوان شیر بدەم بە منداڵەکان، مناڵەکانیش (لەوماوەیەدا لە بەرپێما) لە برساندا هەر دەزرووکانەوە، تا شەبەقیدا ئەمە حاڵمان بوو، جا ئەی خودایە! تۆ دەزانی ئەگەر ئەمەم لەبەر رەزامەندیی تۆ کردووە ئەوا دەروویەکمان لێ بکەرەوەو کەلەبەرێکمان بۆ بکەرەوە کە ئاسمانی لێوە ببینین! جا خودا کەلەبەرێکی بۆ کردنەوەو ئاسمانیان لێوەدی، یەکێکی تریان گوتی: خودایە! خۆت ئاگاداری کە کچێکی ئامۆزام هەبوو، چەندە پیاو حەز لە ئافرەت دەکا ئەوەندە حەزم لێی بوو، کە داوای ئیشی خراپەم لێکردخۆی نەدا بە دەستەوە تا سەد دیناری زێڕی نەدەمێ، منیش تێکۆشام تا ئەو پارەیەم کۆ کردەوەو بۆم بردو پێمدا جا کاتێ لە ناولنگیا دانیشتمو ویسم بە دەستی بگرم، کچەکە گوتی: ئەی عەبدوڵلا!: ئەی بەندەی خودا! لە خودا بترسەو ئەم مۆرە بە ناڕەوا مەشکێنە، ئیتر منیش هەڵسامو وازم لێ هێناو پارەکەیشم دایە بە خۆڕایی بۆ خۆی جا ئەی خودایە! تۆ دەزانی ئەگەر ئەمەم لەبەر رەزامەندی تۆ کردوە ئەوا دەروویەکمان لێ بکەرەوە، جا خودا دەروویەکی تری لێ کردنەوەو، تا دووبەشی تاوێرەکە لەسەر دەرگاکە لاچوو سێهەمیشیان گوتی: خودایە! تۆ خۆت ئاگات لێیە کەمن جاری بەقرناخێ برنج کرێکارێکم بەکرێ گرت، کە ئیشەکەی تەواوکرد گوتی: کرێکەمم بدەرێ، منیش گوتم: کرێکەت ئەوەتانێ، کەچی بەدڵی نەبوو، وەری نەگرت، ئیتر لەوە دوا هەموو وەرزێ ئەو چەڵتووکەم دەچاند، تا وازووربوو گاگەلێكو

چەن شوانێکم پێکڕی، تا ڕۆژێ کرێکارەکەم هاتەوە بۆلام وتی: لە خودا بترسە کرێکەم بدەرێ. منیش گوتم: بڕۆ ئەو گاگەلەو شوانەکانی ببە بۆخۆت. گوتی: لەخوا بترسە گاڵتەم پێ مەکە، منیش گوتم: بەڕاستمە، گاڵتەت پێ ناکەم هەمووی ببە، جا ئەویش هەمووی برد بۆ خۆی. جا ئەی خودایە! تۆ دەزانی ئەگەر ئەمەم لەبەر خاتری تۆ کردووە ئەوا دەرگای ئەشکەوتەکەمان بە تەواوی بۆ بکەرەوە، جا خودا دەرگاکەی تەواو بۆ کردنەوە. لە گێڕانەوەیەکا: (ئەو جا هاتنە دەرەوەو ڕۆیشتن). (ش/ن).

٨٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ قالَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ، مَنْ أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَقَدْ ظَنَنْتُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أَنْ لاَ يَسْأَلَنِي عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ أَحَدٌ أَوَّلُ مِنْكَ، لِمَا رَأَيْتُ مِنْ حِرْصِكَ عَلَى الْحَدِيثِ، أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ، خَالِصًا مِنْ قَلْبِهِ أَوْ نَفْسِهِ. رَوَاهُ ألبُخاري.

واتە: ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! کێ شادمانترین کەسە بە شەفاعەتو تکای تۆ لە ڕۆژی قیامەتدا؟ فەرمووی: ئەی ئەبو هورەیرە! خۆشم گومانم وابوو کە کەس لەپێش تۆدا ئەمەم لێ نەپرسێ وە تۆ یەکەم کەسبی کە ئەم پرسیارەم لێ بکەی، چونکە دەتبینم ئەوەندە حەریسو سووریت لەسەر فەرموودەو حەدیث: لە ڕۆژی قیامەتدا بەختەوەرترین کەس بەتکای من ئەو کەسەیە کە بەدڵێکی سافو بێگەرد یا فەرمووی: کە بەسینەیەکی ساف بڵێ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ: هەر خودا خودایەو هیچ خودای تر نیە (ب).

## ١٢- باسی دووەم: ئادەمیزاد لەسەر نیازی باشی ڕووت پاداشی باش وەردەگرێ: (الباب الثاني: يثاب المرء على نيته فقط)

٨٧- عَنْ مَعْنَ بْنَ يَزِيدَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قالَ: كَانَ أَبِي يَزِيدُ أَخْرَجَ دَنَانِيرَ يَتَصَدَّقُ بِهَا فَوَضَعَهَا عِنْدَ رَجُلٍ فِي الْمَسْجِدِ، فَجِئْتُ فَأَخَذْتُهَا فَأَتَيْتُهُ بِهَا فَقَالَ: وَاللّٰهِ مَا إِيَّاكَ

أَرَدْتُ. فَخَاصَمْتُهُ إِلَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: لَكَ مَا نَوَيْتَ يَا يَزِيدُ، وَلَكَ مَا أَخَذْتَ يَا مَعْنُ. رَوَاهُ الْبُخاري في الزَّكَاةَ(١).

**واتە: مەعنی کوڕی یەزید (ڕەزای خودایان لێبێ) گوتی: یەزیدی باوکم چەند دیناری لەلای پیاوێ لە مزگەوت دادەنێ بۆی بکا بە خێر، منیش چووم پارەکەم برد بۆخۆمو هێنام بۆ لای باوکم، باوکم گوتی: بەخوا نابێ، من مەبەستم تۆ نەبووە، منیش بۆ دادخوایی و سکالاکردن بردم بۆ لای حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: تۆ بەنیازی خۆت گەیشتیت ئەی یەزید! وەتۆیش ئەوەی بردووتە هی خۆتە ئەی مەعن! (ب).**

٨٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ ٱلنَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ اللّٰهَ لاَ يَنْظُرُ إِلَى صُوَرِكُمْ وَأَمْوَالِكُمْ وَلَكِنْ يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ وَأَعْمَالِكُمْ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وَابنُ ماجَه.

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: خودا تەماشای شکڵو شێوەو ماڵو سامانتان ناکا، بەڵام تەماشای دڵو دەروونو کردەوەی پاکتان دەکا (م/ ئیبنو ماجە).**

٨٩- عَنْ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ عَنِ ٱلنَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ سَأَلَ اللّٰهَ ٱلشَّهَادَةَ بِصِدْقٍ بَلَّغَهُ اللّٰهُ مَنَازِلَ ٱلشُّهَدَاءِ وَإِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ. رَوَاهُ ٱلْخَمْسَةُ ٱلأَبُخاري وَلَفْظُ ٱلتِّرْمِذِيُّ: مَنْ سَأَلَ ٱللّٰهَ ٱلْقَتْلَ فِي سَبِيلِهِ صَادِقاً مِنْ قَلْبِهِ أَعطَاهُ اللّٰهُ أَجْرَ ٱلشَّهِيدِ(٢).

**واتە: سەهلی کوڕی حەنیف لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (درودی خوای لەسەربێ): هەرکەسێ بە ڕاستی (بەدڵ) لە خودا داوای شەهیدبوون بکا خودا پایەی شەهیدی دەداتێ، با لەسەر نوێنی خۆشی بمرێ بەدەردی خودا (م/د/ت/ن) گێڕانەوەی تیرمیذی بەم شێوەیە: هەرکەسێ بەڕاستی بەدڵ لە خودا داوا بکا کە لەڕێگەی ئەودا بکوژرێ ئەوا خودا پاداشی شەهیدی دەداتێ.**

---

(١) بخاري. علم: ٩٩ ، ٦٥٧٠.

(٢) مسلم. إمارة: ٤٩٠٧ ، أبو داود. صلاة: ١٥٢٠. ترمذي. فضائل: ١٦٥٣.

٩٠- عَنْ عَائِشَةَ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مَنِ امْرِئٍ تَكُونُ لَهُ صَلاَةٌ بِلَيْلٍ يَغْلِبُهُ عَلَيْهَا نَوْمٌ إِلا كُتِبَ لَهُ أَجْرُ صَلاَتِهِ وَكَانَ نَوْمُهُ عَلَيْهِ صَدَقَة. رَوَاهُ أبو دَاوُدَ وَالنَسائي(٤).

واتە: عائیشە (خوای لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە دەفەرموێ: (دروودی خوای لەسەربێ): هەر کەسێ فێری شەونوێژبێ و شەوێ خەو زۆری بۆبێنێ و بۆی نەکرێ و بخەوێ خودا پاداشی شەونوێژی بەقەد جارانی بۆ دەنووسێ و خەوەکەشی بەخێر بۆ دەنووسرێ (د/ن).

٩١- عَنْ أَبِي كَبْشَةَ الأَنْمَارِيُّ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: ثَلاَثَةٌ أُقْسِمُ عَلَيْهِنَّ: مَا نَقَصَ مَالُ عَبْدٍ مِنْ صَدَقَةٍ وَلاَ ظُلِمَ عَبْدٌ مَظْلِمَةً فَصَبَرَ عَلَيْهَا إِلاَّ زَادَهُ اللّٰهُ عِزًّا وَلاَ فَتَحَ عَبْدٌ بَابَ مَسْأَلَةٍ إِلاَّ فَتَحَ اللّٰهُ عَلَيْهِ بَابَ فَقْرٍ أَوْ كَلِمَةً نَحْوَهَا وَأُحَدِّثُكُمْ حَدِيثًا فَاحْفَظُوهُ قَالَ: إِنَّمَا الدُّنْيَا لأَرْبَعَةِ نَفَرٍ عَبْدٍ رَزَقَهُ اللّٰهُ مَالاً وَعِلْمًا فَهُوَ يَتَّقِي فِيهِ رَبَّهُ وَيَصِلُ فِيهِ رَحِمَهُ وَيَعْلَمُ لِلّٰهِ فِيهِ حَقًّا فَهَذَا بِأَفْضَلِ الْمَنَازِلِ وَعَبْدٍ رَزَقَهُ اللّٰهُ عِلْمًا وَلَمْ يَرْزُقْهُ مَالاً فَهُوَ صَادِقُ النِّيَّةِ يَقُولُ لَوْ أَنَّ لِي مَالاً لَعَمِلْتُ بِعَمَلِ فُلاَنٍ فَهُوَ بِنِيَّتِهِ فَأَجْرُهُمَا سَوَاءٌ وَعَبْدٍ رَزَقَهُ اللّٰهُ مَالاً وَلَمْ يَرْزُقْهُ عِلْمًا فَهُوَ يَخْبِطُ فِي مَالِهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ لاَ يَتَّقِي فِيهِ رَبَّهُ وَلاَ يَصِلُ فِيهِ رَحِمَهُ وَلاَ يَعْلَمُ لِلّٰهِ فِيهِ حَقًّا فَهَذَا بِأَخْبَثِ الْمَنَازِلِ وَعَبْدٍ لَمْ يَرْزُقْهُ اللّٰهُ مَالاً وَلاَ عِلْمًا فَهُوَ يَقُولُ لَوْ أَنَّ لِي مَالاً لَعَمِلْتُ فِيهِ بِعَمَلِ فُلاَنٍ فَهُوَ بِنِيَّتِهِ فَوِزْرُهُمَا سَوَاءٌ. رَوَاهُ التِّرْمِذِيُّ(٥).

واتە: ئەبو کەبشەی ئەنماری (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر دەفەرموێ: (دروودی خوای لەسەربێ) سوێند لەسەر ئەم ئەم سێ شتە دەخۆم:

یەکەم: ماڵی بەندە بەخێرکردن کەم ناکات.

دووەم: هەر کەسێ یەکێ ستەمی لێ بکاو ئەویش سەبرو ئارام بگرێ لەبەر باری خودادا خودا سەربەرزی دین و دونیای دەکا.

---

(٤) سكت عنه درجته الشارح (مترجم).

(٥) رواه الترمذي بسندٍ صحيحٍ (شرحه).

**سێیەم:** هەرکەسێ دەرگای سوالْ لەخۆی بکاتەوە خودا دەرگای هەژاری بۆ دەکاتەوە! یا حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) قسەیەکی ئاوای فەرموو فەرمووشی: گوێ بگرن قسەیەکتان بۆ دەکەم لە بەری بکەن جا فەرمووی: جیهان تەنها بۆ ئەم چوار کەسەیە:

**یەکەم:** کەسێ خودا ماڵی رەحمەتو عیلمو زانستی بە بەرەکەتی پێ عەتا کردبێ، ئەویش تەقوای خودایان پێ بکاو سیلەی رەحمیان پێ بەجێ بێنێو مافو هەقی خودایان لێ بدا ئەمە گەورەترین پایەی هەیە.

**دووەم:** کەسێ خودا زانستی پێ ببەخشێ بەلاّم ماڵو دارایی نەداتێ، ئەویش بەنیازێکی پاك بڵێ: خۆزگە ماڵم دەبوو منیش وەك فیسارە کەس خێرو خێراتم پێ دەکرد، ئەمە (بەهۆی نیازی پاکییەوە) لەگەڵ کەسی یەکەمدا لە پاداشدا چون یەکن.

**سێیەم:** کەسێ خودا ماڵی پێ بدا بەلاّم عیلمو زانستی پێ نەدا، جا خۆی بە نادانی چەپو گوویی تیا بکاو تەقوای خودای پێ نەکاو مافی خزمو خوێشی لێ نەدا وەسیلەی رەحمی پێ بەجێ نەهێنێو مافی خودای لێنەدا، ئا ئەمە پیسترین پایەی هەیە.

**چوارەم:** بەندەیێ خودا نەماڵو نە زانستی پێ نەدابێ کەچی بڵێ: بریا ماڵم دەبوو منیش وەك فیسارە کەس بە نەفامی خەرجم دەکرد، جا ئەم نەگبەتە (بەهۆی نیازی پیسیەوە) لە تۆڵەی تاوانا لەگەڵ کەسی سێیەمدا چون یەکن! (ت-س/ص).

## ١٣) باسی سێیەم: هەرەشەکردن لە ریاکاریو رواڵەتکردنو ریابازی
## الباب الثالث: في التحذير من الرياء

قَالَ اللهُ جَلَّ شأْنُهُ: {فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا – ١٨/١١٠}.

**واتە: خودای گەورەو شکۆمەند دەفەرمویٚ: هەرکەسیٚ بەهیوایە کە بگا بە خزمەتی خودای خۆیو شادمان بیٚ بە ڕەزای خودای خۆی با هەمیشە کاری باش بکاو لە عیبادەتو خودا پەرستیدا هاوبەش بۆ خودا پەیدا نەکا.**

**٩٢- عَنْ جُنْدُبٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: مَنْ سَمَّعَ سَمَّعَ اللهُ بِهِ وَمَنْ يُرَائِي يُرَائِي اللهُ بِهِ. رَوَاهُ الشَّيْخَانِ وَالتِّرْمِذِيُّ**[1].

**واتــە: جونــدوب** (خــوای لیٚ ڕازی بــیٚ) **گــوتی: پیٚغەمبــەر** (دروودی خــوای لەســەربیٚ) **فەرمووی: هەرکەسیٚ بۆ ناوبانگو شۆرەت چاکەو خودا پەرستی بکا، لە ڕۆژی قیامەتدا خودا بە پەندی دەکا، وە هەر کەسیٚ بۆ ڕواڵەت هەر کاریٚ بکا لە ڕۆژی قیامەتدا خودا پەردەی لەروو هەڵ دەماڵیٚو ریابازییەکەی ئاشکرا دەکا (ش/ت).**

**٩٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: اللّٰهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَنَا أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ مَنْ عَمِلَ عَمَلاً أَشْرَكَ فِيهِ مَعِي غَيْرِي تَرَكْتُهُ وَشِرْكَهُ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ**[2].

**واتە: ئەبو هورەیرە** (خوای لیٚ ڕازی بیٚ) **گوتی: پیٚغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربیٚ) **دەفەرمویٚ: خودای گەورەو بیٚ هاوتا دەفەرمویٚ: من لە هەموو کەسیٚ زیاتر بیٚ نیازم بەشەریكو هاوبەش، جا هەرکەسیٚ کاریٚ بکاو کەسیٚ تر بکا بە هاوبەشی من لەو کارەدا ئەوە بەخۆیو بەهاوبەشەکەیەوە تووڕی دەدەم (م).**

**٩٤- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: إِنَّ أَوَّلَ النَّاسِ يُقْضَى يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَيْهِ رَجُلٌ اسْتُشْهِدَ فَأُتِيَ بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا؟ قَالَ: قَاتَلْتُ فِيكَ حَتَّى اسْتُشْهِدْتُ. قَالَ: كَذَبْتَ وَلَكِنَّكَ قَاتَلْتَ لأَنْ يُقَالَ: جَرِيءٌ. فَقَدْ قِيلَ. ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ. وَرَجُلٌ تَعَلَّمَ الْعِلْمَ وَعَلَّمَهُ وَقَرَأَ الْقُرْآنَ فَأُتِيَ بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا قَالَ: تَعَلَّمْتُ الْعِلْمَ وَعَلَّمْتُهُ**

---

(١) بخاري. رقاق: ٦٤٩٩. مسلم. زهد: ٧٤٠١ ، ٧٤٠٢.

(٢) مسلم. زهد: ٧٤٠٠

وَقَرَأْتُ فِيكَ الْقُرْآنَ. قالَ: كَذَبْتَ وَلَكِنَّكَ تَعَلَّمْتَ الْعِلْمَ لِيُقَالَ: عَالِمٌ. وَقَرَأْتَ الْقُرْآنَ لِيُقَالَ: هُوَ قَارِئٌ. فَقَدْ قِيلَ ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ حَتَّى أُلْقِيَ فِي النَّارِ. وَرَجُلٌ وَسَّعَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَعْطَاهُ مِنْ أَصْنَافِ الْمَالِ كُلِّهِ فَأُتِيَ بِهِ فَعَرَّفَهُ نِعَمَهُ فَعَرَفَهَا قَالَ: فَمَا عَمِلْتَ فِيهَا؟ قَالَ: مَا تَرَكْتُ مِنْ سَبِيلٍ تُحِبُّ أَنْ يُنْفَقَ فِيهَا إِلاَّ أَنْفَقْتُ فِيهَا لَكَ قَالَ: كَذَبْتَ وَلَكِنَّكَ فَعَلْتَ لِيُقَالَ: هُوَ جَوَادٌ. فَقَدْ قِيلَ ثُمَّ أُمِرَ بِهِ فَسُحِبَ عَلَى وَجْهِهِ ثُمَّ أُلْقِيَ فِي النَّارِ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وَالتِّرْمِذِي والنَّسائِي[٣].

**واتە: دیسان ئەو گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: یەكەم كەس كە لە ڕۆژی قیامەتدا مەحكەمە دەكرێو حوكم دەدرێ پیاوەێكە شەهید كراوە، دەیهێنن لەبەردەم خودادا رایدەوەستێنن خودا چاكەكانی خۆیی یەكە یەكە بیر دەخاتەوە ئەویش یەك بە یەك پێیان لێ دەنێ، جا خودا دەفەرموێ: باشە لەباتی ئەو چاكانە تۆ چی كارێكی باشت كردووە بۆ من!؟ دەڵێ: منیش لە پێناوی تۆدا جەنگم كردووەو لەگەڵ دوژمنی تۆدا شەڕم كردووە هەتا لە ئەنجامدا بە دەستی دوژمن شەهیدكراوم! یەزدان دەفەرموێ: درۆتكرد، بەڵام تۆ بۆیە غەزات كرووە هەتا بڵێن: ئازایە، وە ئەم قسەیەشیان لە جیهاندا پێ گوتویت (واتە تۆ بەمافی خۆت گەشتویت!) جا ئەوجا خودا فەرمان دەدا لەسەر روو بەكێشی دەكەن تا تووڕی دەدەنە ناو ئاگری دۆزەخەوە، وە دووەم كەس كەمەحكەمە دەكرێ پیاوێكە لە جیهاندا زاناو مامۆستاو قورئانخوێن بووە، دەیهێنن، خودا هەرچی چاكەیەكی لەگەڵ كردووە دەیانخاتەوە بیری ئەویش یەك بە یەك پێیان لێ دەنێ، جا خودا دەفەرموێ: باشە تۆ لەباتی ئەوانە چی كارێكی باشت كردووە لەبەر خاتری من؟ دەڵێ: منیش عیلمو زانست فێربوومو خەڵكی ترم فێری زانین كردو لەبەر رەزای تۆیش قورئانم دەخوێند، دەفەرموێ: درۆ دەكەی، بەڵام تۆ بۆیە فێری زانین بووی تا بڵێن: زانایە، وە بۆیە قورئانیشت خوێندووە تا بڵێن: قورئانخوێنە، وە ئەم قسەیەشیان لە دنیادا پێ گوتوویت، ئەوجا بە فەرمانی خودا لەسەر سك**

---

(٣) مسلم. جهاد: ٤٩٠٠. نسائي. جهاد: ٣١٣٧.

بەکێشی دەکەن و تووڕی دەدەنە ناو ئاگرەوە، سێیەم کەس کەمەحکەمە دەکرێ پیاوێکە کە خودا لە دنیادا داراو دەوڵەمەندی کردووەو لە هەموو چەشنەماڵێکی پێ داوە، کە دەی هێنن خودا هەموو چاکەکانی خۆیی وە بیر دەخاتەوە ئەویش پێیان لێ دەنێ دەفەرموێ: چیت پێ کردن؟ دەڵێ: هەرچی تۆ پێت خۆشبێ کە ماڵی تیا بەخت بکرێ لەوەدا ماڵی خۆمم خەرج کردووە، دەفەرموێ: درۆدەکەی، بەڵام تۆ بۆیە وات دەکرد تا بڵێن سەخی و جوامێرە، وە ئەو قسەیەش لە دنیادا کراوە، ئەوجا بە فەرمانی خودا لەسەر دەم رای دەکێشن و دەیبەن تووڕی دەدەنە ناو ئاگرەوە (م/ت/ن).

٩٥- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: تَعَوَّذُوا بِاللَّهِ مِنْ جُبِّ الْحُزْنِ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا جُبُّ الْحُزْنِ؟ قالَ: وَادٍ فِي جَهَنَّمَ تَتَعَوَّذُ مِنْهُ جَهَنَّمُ كُلَّ يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَنْ يَدْخُلُهُ؟ قالَ: الْقُرَّاءُ الْمُرَاءُونَ بِأَعْمَالِهِمْ[٤].

واتە: دیسان ئەو گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: پەنابگرن بە خودا لە دەرەی خەم! گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! دەرەی خەم چییە؟ فەرمووی: شیوێکە لە دۆزەخا هەموو رۆژێ دۆزەخ خۆی سەد جار پەنا دەگرێ بە خودا لە دەستی گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە کێی تێ دەچێ؟ فەرمووی: ئەو قورئان خوێنانەی تێ دەچن کە بۆ چاوەو رواڵەت قورئان دەخوێنن (ت-س/ح).

٩٦- وَعَنْهُ قالَ: قَالَ: رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ الرَّجُلُ يَعْمَلُ الْعَمَلَ فَيُسِرُّهُ فَإِذَا اطُّلِعَ عَلَيْهِ أَعْجَبَهُ ذَلِكَ! قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَهُ أَجْرَانِ أَجْرُ السِّرِّ وَأَجْرُ الْعَلاَنِيَةِ. رَوَاهُمَا التِّرْمِذِيُّ[٥].

واتە: دیسان ئەو گوتی: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! پیاو هەیە بە نهێنی کارێ دەکا، بەڵام کە ئاشکرا بوو پێی خۆشە کە وا خەڵك باسی کارەباشەکەی دەکەن بە باشە ئایا خێری دەمێنێ؟ فەرمووی: ئەوە دوو

---

(٤) رواه الترمذي في الزهد بسند حسن (شرحه).

(٥) رواه الترمذي في الزهد بسند حسن (شرحه).

جۆرە پاداشی بۆ هەیە: یەك پاداشی کاری باشی نهێنی کە بێ رووپایی بێ و ساف و ساغ بۆ خودابێ، یەك پاداشی باشی کاروکردەوەی ئاشکرا کە دەبێ بەسەر مەشقی جوان بۆ خەڵکی تریش (ت–س/ح).

٩٧– عَنْ أَبِي سَعْدِ بْنِ أَبِي فَضَالَةَ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا جَمَعَ اللَّهُ النَّاسَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لِيَوْمٍ لاَ رَيْبَ فِيهِ نَادَى مُنَادٍ مَنْ كَانَ أَشْرَكَ فِي عَمَلٍ عَمِلَهُ لِلَّهِ أَحَدًا فَلْيَطْلُبْ ثَوَابَهُ مِنْ عِنْدِ غَيْرِ اللَّهِ فَإِنَّ اللَّهَ أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ. رَوَاهُ التِّرْمِذِي[٦].

واتە: ئەبو سەعدی کوڕی فەضالە گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: لە رۆژی قیامەتا کاتێ کە خودا خەڵك کۆ دەکاتەوە بۆ حیساب و لێ پرسینەوەی ئەو رۆژەی کە شك و گومانی تیانییە، بە فەرمانی خودا جارچییەك جاڕ دەدا بەناو عەشاماتەکەدا: هەر کەسێ لە دنیادا کارێکی کردووە بۆ خوداو لە هەمان کاتدا کەسێکی تری کردووە بە هاوبەشی لەو کارەدا، ئەوە با داوای پاداشی خۆی لە غەیری خودا بکا، چونکە خودا لە هەموو کەسێ زیاتر بێ نیازە بە هاوبەش (ت–س/ح).

(٦) فی التفسیر بسند حسن ·شرحه)

بسم الله الرحمن الرحيم

# نامەی زانین (عیلم)

(سێ باس و پاشەکی (خاتمە)یەکە)

## ١٤) باسی یەکەم: باسی فەزڵ و گەورەیی زانین و زانایان

(کتاب العلم: (وفيه ثلاثه أبواب وخاتمة)

الباب الاول: في فضل العلم والعلماء)

قَالَ اللهُ تَعَالى: {إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاء – ٢٨/٣٥}.

واته: بە راستی کەس لە خودا ناترسێ بە تەواوی بەندە زاناکانی نەبێ.

{قَالَ: تَعالى – هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ}.

واته: خودای گەورە دەفەرموێ: ئایا چۆن دەبێ کە زاناو نەزان چون یەك بن؟

وَقَالَ تَعَالى: {وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَا إِلَّا الْعَالِمُونَ – ٤٣/٢٩}.

واته: خودای گەورە دەفەرموێ: (ئەم وێنەو نموونە جوانە بەنرخانە بەیان دەکەین بۆ کۆمەڵی ئادەمیزاد، بەڵام تەنیا زانا هۆشمەندەکان مانایان دەزانن و لە مەبەستەکە باش تێ دەگەن).

٩٨– عَنْ مُعَاوِيَةَ عَن النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ، وَإِنَّمَا أَنَا قَاسِمٌ وَاللَّهُ يُعْطِي، وَلَنْ تَزَالَ هَذِهِ الأُمَّةُ قَائِمَةً عَلَى أَمْرِ اللَّهِ لاَ يَضُرُّهُمْ مَنْ خَالَفَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّهِ. رَوَاهُ الأربعة[1].

واته: موعاوییە (خوای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (دروودی خوای لەسەربێ): هەر کەسێ کە خودا ویستی تووشی خێرو خۆشی بکا شارەزای ئایینی دەکا، من تەنیا ئەوەندەم بە دەستە کە ئەم فەرمایشت و شەریعەتە دابەش بکەم و بەس، بەڵام بەشی گەورە یا بچووك ئەوە بەدەست خودا خۆیەتی و خودا خۆی ئەوە دەدا یا، نایدا، وە ئەم ئۆمەتی ئیسلامەیش هەر

(١) بخاري. إيمان: ٧١ ، ٣١١٦ ، ٣٦٤١ ، ٧٣١٢ ، ٧٤٦٠. مسلم. زكاة: ٢٣٨٩ ، ٢٣٨٦.

دەڕۆن لەسەر ئەم ئاییینی خودایە تانزیکی قیامەت، وە ئەوەی لە دژیان بێ زیانیان پێ ناگەیەنێ (ش/ت/ن).

٩٩- عَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْنَمَا جَالِسٌ فِي الْمَسْجِدِ وَالنَّاسُ مَعَهُ، إِذْ أَقْبَلَ ثَلاثَةُ نَفَرٍ، فَأَقْبَلَ اثْنَانِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَذَهَبَ وَاحِدٌ، قَالَ: فَوَقَفَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَمَّا أَحَدُهُمَا فَرَأَى فُرْجَةً فِي الْحَلْقَةِ فَجَلَسَ فِيهَا، وَأَمَّا الآخَرُ فَجَلَسَ خَلْفَهُمْ، وَأَمَّا الثَّالِثُ فَأَدْبَرَ ذَاهِبًا، فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: أَلاَ أُخْبِرُكُمْ عَنِ النَّفَرِ الثَّلاثَةِ أَمَّا أَحَدُهُمْ فَأَوَى إِلَى اللَّهِ، فَآوَاهُ اللَّهُ، وَأَمَّا الآخَرُ فَاسْتَحْيَا، فَاسْتَحْيَا اللَّهُ مِنْهُ، وَأَمَّا الآخَرُ فَأَعْرَضَ، فَأَعْرَضَ اللَّهُ عَنْهُ. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ إِلاَّ أَبَا دَاوُدَ[٢].

واتە: ئەبو واقیدی لەیثی (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لە مزگەوت دانیشتبوو، خەڵکەکەیش لە دەوری دانیشتبوون خەریکی طاعەتی خودا بوون لەو کاتەدا سێ کەس هاتن، دوانیان هاتنە بەرەوە بۆ لای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وە یەکێکیان ڕۆیشت. گوتی: جا دوو کەسەکە لە دیار پێغەمبەر راوەستان تایەکێیان کەلێنێکی لە ئەڵقەی کۆڕەکەدا بەدی کردوو تیا دانیشت، وە ئەوی تریشیان لە پشتیانەوە دانیشت، وە سێهەمیشیان هەڵی تۆاندو ڕۆیشت، جا کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لێ بۆوەوە فەرمووی: با باسی حاڵی ئەم سێ کەسەتان بۆ بکەم: یەکێکیان هانای بردە بەر خوداو خودا هانایدا، یەکێکیشیان شەرمی کردوو خودایش شەرمی لەوکرد، ئەوی تریشیان پشتی هەڵکردو بەمەجلیسی ئێمە رازی نەبوو خودایش پشتی لەو هەڵکردوو لێی تووڕە بوو (ش/ت/ن)

١٠٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا نَفَّسَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ يَسَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَاللَّهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ

---

(٢) بخاري. العلم: ٦٦ ، ٤٧٤. مسلم. آداب: ٥٦٤٥ ترمذي. استئذان: ٢٧٢٤.

فِيهِ عِلْمًا سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ بِهِ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ وَمَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللَّهِ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ إِلاَّ نَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ وَحَفَّتْهُمُ الْمَلاَئِكَةُ وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ وَمَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وَأبو دَاوُدَ وَالتِّرْمِذِيُّ[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (درودی خوای لەسەربێ): هەر كەسێ موسوڵمانێ لە مەینەتێ لە مەینەتەكانی جیهان رزگار بكا خودا لە پاداشی ئەوەدا مەینەتێ لەمەینەتەكانی رۆژی قیامەتی بۆ چار دەكاو رزگاری دەكا لێی. وە هەركەسێ دەسگیرۆیی هەژارو نەدارایی بكا لە دنیاو لە قیامەتا خوداش دەسگیۆیی ئەو دەكا، وە هەركەسێ عەیبو نەنگی موسوڵمانی بپۆشێ، یا جەستەو لەشی بە پۆشاكێ داپۆشێ ئەوە خودا ئەوكەسە لەهەر دوو جیهاندا بە بەرگی رەحمەتی خۆی دادەپۆشێ، وە خودا لەپشتی ئەو بەندەیە كە پشتی برای دەگرێ، هەركەسێ رێگەی زانین بگرێو وێڵی دوای زانستو زانین بێ خودا رێگەی بەهەشتی بۆ خۆش دەكا، وە هەر كۆمەڵی لە ماڵێ لە ماڵەكانی خودادا كۆببنەوەو نامەی خودا بخوێنن لەناو خۆیانا دەوری بكەنەوەو واتەو مانای لێك بدەنەوە ئەوە بێگومان كەوا دڵنیایی بەسەریانا دادەبارێو رەحمەتو میهرەبانی دایان دەپۆشێو فریشتە دەوریان لێ دەدەن، وە خودایش لە بارەگای خۆی لەلای مەلەئی ئەعلا باسی چاكەیان دەكا، وە هەر كەسێ كارو كردەوەی خۆی دوای بخا بنەچەو رەسەنی پێشی ناخا (م/د/ت).

١٠١- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ قالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: مَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَبْتَغِي فِيهِ عِلْمًا سَلَكَ اللَّهُ بِهِ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ وَإِنَّ الْمَلاَئِكَةَ لَتَضَعُ أَجْنِحَتَهَا رِضَاءً لِطَالِبِ الْعِلْمِ وَإِنَّ الْعَالِمَ لَيَسْتَغْفِرُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ حَتَّى الْحِيتَانُ فِي الْمَاءِ وَفَضْلُ الْعَالِمِ عَلَى الْعَابِدِ كَفَضْلِ الْقَمَرِ عَلَى سَائِرِ

(٣) مسلم. الذكرو الدعاء: ٦٧٩٣ ، ٦٧٩٥. أبو داود. أدب: ٤٩٤٦ ترمذي. دعوات: ٣٣٧٨.

الْكَوَاكِبِ إِنَّ الْعُلَمَاءَ وَرَثَةُ الأَنْبِيَاءِ إِنَّ الأَنْبِيَاءَ لَمْ يُوَرِّثُوا دِينَارًا وَلاَ دِرْهَمًا إِنَّمَا وَرَّثُوا الْعِلْمَ فَمَنْ أَخَذَ بِهِ أَخَذَ بِحَظٍّ وَافِرٍ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَالتِّرْمِذِيُّ وَاللفظُ لَهُ(٤).

**واتە: ئەبو دەردا** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو** (درودی خوای لەسەربێ): **کەسێ رێگەیێ بگرێ بەشوێن فێربوون و زانستا بگەڕێ، خودا رێگەی بەهەشتی بۆ ئاسان دەکا، فریشتەکانیش کاتێ قوتابییەك یا فێرخوازێ دەبینن لە خۆشی ئەو قوتابییە دەنیشنەوە دەورەی لێ دەدەن،دانیشتوانی ئاسمانەکان و زەمین هەموو دەپاڕێنەوە بۆ زانا، هەتا ماسیش لە ئاوا لە خودا دەپاڕێتەوە بۆی! باوو قەدرو گەورەیی زانا لەچاو شۆفیلکەی خودا پەرستدا وەك باوو قەدرو گەورەیی مانگ وایە لەچاو ئەستێرەکانی تردا، بێگومان کە زاناکان میراتبەرو کەلەپوور گری پێغەمبەرەکانن، دیارە کە پێغەمبەرەکانیش دینارو درەم و زێڕو زیویان بە کەلەپوور لەپاش خۆیان بەجێ نەهێشتووە، بەڵکوو عیلم و زانست کەلەپووری ئەوانە، جا بەراستی ئەو کەسەی لەم کەلەپوورەی بەر بکەوێ بەشی فرە گەورەیە!** (ت-س/منقطع-د).

١٠٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْعِلْمُ ثَلاَثَةٌ وَمَا سِوَى ذَلِكَ فَهُوَ فَضْلٌ: آيَةٌ مُحْكَمَةٌ أَوْ سُنَّةٌ قَائِمَةٌ أَوْ فَرِيضَةٌ عَادِلَةٌ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَابن مَاجَه(٥).

**واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عەمرەوە پێغەمبەر دەفەرموێ:** (درودی خوای لەسەربێ): **زانین بریتییە لەم سێ شتە وە زیاد لەم سێ شتە خێرە:**

**یەکەم: زانینی ئایەتێکی موحکەم لە قورئان کە مانایەکی رۆشنی هەبێ و حوکمەکەی دامەزرابێ و نەسخ نەبووبێتەوە.**

**دووەم: زانینی یاسایەکی دامەزراو لە رەوشت و سوننەتی پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ).

---

(٤) بسند منقطع (شرحه).

(٥) رواه أبو داود بسند فيه عبد الرحمن الأفريقي (شرحه) فى حديثه مناكير (تهذيب التهذيب)

سـێیەم: زانینـی یاسـای مـیرات و كەلـەپوور بەشـكردن بـەڕێكوپێكی (د/ئیبنو ماجە).

١٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: خَصْلَتَانِ لاَ تَجْتَمِعَانِ فِي مُنَافِقٍ حُسْنُ سَمْتٍ وَلاَ فِقْهٌ فِي الدِّينِ[٦].

واتـە: ئـەبو هـورەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) لـە پێغەمبـەرەوە دەفـەرموێ: (درودی خوای لەسەربێ): دوو نیـشانە هـەن، لـە ئـادەمیزادی ناپـاك و دووڕوودا قـەت كـۆ نابنەوە: یەكێ شێوەی شیرین، یەكێ: شارەزایی لە ئایین! (ت/سند غریب).

١٠٤- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: الْكَلِمَةُ الْحِكْمَةُ ضَالَّةُ الْمُؤْمِنِ فَحَيْثُ وَجَدَهَا فَهُوَ أَحَقُّ بِهَا. وَفِي رِوَايَةٍ: مَنْ طَلَبَ الْعِلْمَ كَانَ كَفَّارَةً لِماَ مَضى[٧].

واتــە: دیـسان ئـەو گـوتی: پێغەمبــەر (درودی خـوای لەسـەربێ) دەفـەرموێ: فەرمایشتی جوان و قسەی بەنرخ و وتەی پڕ حیكمەت و مانا، نێچیری پیاوی موسوڵمانە، بۆیە لە هەرلا چنگی بكەوێ هەر لەخۆی جوانە لـە گێڕانەوەیـەكا: هەر كەسێ منەی عیلم و زانست بكاو بگەڕێ بەدوای فێربوونی زانینا ئەوە دەبێ بە كەففارەتی گوناهی رابووردووی (ت/سند غریب).

١٠٥- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قـالَ: فَقِيـهٌ أَشَـدُّ عَلَـى الشَّيْطَانِ مِنْ أَلْفِ عَابِدٍ[٨].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوای لێ ڕازی بێ) گـوتی: پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەربێ) دەفەرموێ: شەریعەتزانێ یا مەلایێ، یا زانایەكی ئایینی بۆ شەیتان لـە هـەزار سۆفی و سۆفیلكە ترس و زیانی زۆر ترە. (ت-سند غریب).

١٠٦- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ قالَ: ذُكِرَ لِرَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلاَنِ أَحَدُهُمَا عَابِدٌ وَالآخَرُ عَالِمٌ فَقَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَـضْلُ الْعَـالِمِ عَلَـى

(٦) سند غريب (شرحه).

(٧) سند غريب (شرحه).

(٨) سند غريب (شرحه).

الْعَابِدِ كَفَضْلِي عَلَى أَدْنَاكُمْ". ثُمَّ قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّ اللّٰهَ وَمَلَائِكَتَهُ وَأَهْلَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ حَتَّى النَّمْلَةَ فِي جُحْرِهَا وَحَتَّى الْحُوتَ لَيُصَلُّونَ عَلَى مُعَلِّمِ النَّاسِ الْخَيْرَ(٩).

واتە: ئەبو ئومامەی باهیلی (خوای لێ رازی بێ) گوتی: باسی دوو پیاو کرا لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەربێ) یەکێکیان سۆفیلکەبوو، ئەوی تریان زانابوو، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: رێزو گەورەیی زانا لەچاو سۆفی و سۆفیلکەدا وەك رێزو گەورەیی من وایە لەچاو کەمترین کەستانا. (لە پاشا فەرمووشی (دروودی خوای لەسەربێ): خودا خۆی و فریشتەکانی و خەڵکی ئاسمانەکان و خەڵکی زەوی هەموویان سەڵاوات دەدەن لە دیداری ئەو کەسانە کە خەڵك فێری چاکە دەکەن و دەبن بە مامۆستای خێرو چاکە بۆ مەردووم، هەتا میروولە لەناو شارەکەیداو ماسی لەناو ئاودا سەڵاواتیان لەسەر دەدەن و دووعاو نزای خێریان بۆ دەکەن) (ت- سند غريب).

١٠٧- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَنْ يَشْبَعَ الْمُؤْمِنُ مِنْ خَيْرٍ يَسْمَعُهُ حَتَّى يَكُونَ مُنْتَهَاهُ الْجَنَّةُ. رَوَى هَذه الْخَمْسَة أَلتَّرْمِذِيُّ(١٠).

واتە: ئەبو سەعیدی خودری (خوای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: موسوڵمان لەبیستن و لەفێربوونی خێرو چاکە قەت تێر نابێ هەتا نەمرێ و لە بەهەشتا هەوار هەڵ نەدا! (ت-س/ تیرمیذی بە سەنەدی حەسەن).

١٠٨- عَنْ عُثْمَانَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَشْفَعُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثَلَاثَةٌ الأَنْبِيَاءُ ثُمَّ الْعُلَمَاءُ ثُمَّ الشُّهَدَاءُ. رَوَاهُ إِبنْ مَاجَه(١١).

---

(٩) سند غريب (شرحه).

(١٠) سند حسن (شرحه).

(١١) بسند حسن (شرحه).

واتــە: عوسمـان (خوای لێ رازی بێ) لـە پێغەمبـەرەوە دەفـەرموێ: (دروودی خوای لەسەربێ): لە رۆژی قیامەتا سێ دەستە لەلای خودا تکا دەکەن بۆ مەردوم:

دەستەی یەکەم: پێغەمبەران،

دەستەی دووەم: زانایان.

دەستەی سێیەم: شەهیدان، (ئیبنو ماجە – س/ح).

**١٥) باسی دووەم: راگەیاندنی زانین پێویستە، وە بڵاوکردنەوەیشی زۆر خێروگەورەیە: (الباب الثاني: في وجوب تبليغ العلم وفضل نشره)**

{قَالَ: اللهُ تَعالى – وَإِذَ أَخَذَ اللّهُ مِيثَاقَ الَّذِينَ أُوتُـواْ الْكِتَـابَ لَتُبَيِّنُنَّـهُ لِلنَّـاسِ وَلاَ تَكْتُمُونَهُ – ١٨٧/٣}.

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: ئەی خۆشەویست! باسی ئەو چاخ و چەرخە بکە بۆ یارانت کە خودا عەهدو پەیمانی وەرگرت لەو زانایانە کە نامەی خودایان پێ دراوە کە بەڕاستی مەبەستو مانای ئەو نامەی خودایە روونـاك بکەنەوە بۆ هەموو کەسێ وە لە کەسی نەشارنەوە.

١٠٩– عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ، فَإِنَّ الشَّاهِدَ عَسَى أَنْ يُبَلِّغَ مَنْ هُوَ أَوْعَى لَهُ مِنْهُ. رَوَاهُ أَلشَّيْخَانَ[١].

واتــە: ئـەبو بـەکرە لـە پێغەمبـەرەوە دەفـەرموێ: (دروودی خوای لەسەربێ): با ئەوەی حازرەو گوێی لەم فەرموودانەو بەیانی شەریعەتەیە هەرچی دەژنەوێ بەپێی توانا رایبگەیەنێ بەو کەسانە کە لێرە حازرنین، سا بەشکوو حازرەکە ئەم زانین و فەرمایشتانە رابگەیەنێ بە کەسێکی تر کە دوورنیە ئەو لەم باشتر لێیان تێبگاو چاکتر لەبەریان بکا (ش).

١١٠– عَنْ عَبْدِ اللّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ أللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيَةً وَحَدِّثُوا عَنْ بَنِـي إِسـرائِيلَ وَلا حَـرَجَ وَمَـنْ كَـذَبَ عَلَـيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ. رَوَاهُ أَلْبُخَارِي وَالتِّرْمِذِيُّ[٢].

---

(١) بخاري. علم: ٦٧ ، ١٠٥ ، ١٧٤١ ، ٣١٩٧ ، ٤٤٠٦ ، ٤٦٦٢ ، ٥٥٥٠ ، ٧٠٧٨ ، ٧٤٤٧. مسلم. حدود: ٤٢٥٩.

(٢) بخاري. أنبياء: ٣٤٦١.

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەمر (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر تەنیا یەك ئایەتیشتان لە لایەنی منەوە ڕاگەیاندووە بە موسوڵمانان بیکەنو ڕای بگەیەنن پێیان، قسەو باسو خواسی بەنی ئیسائیل (نەوەی ئیسرائیل)یش بگێڕنەوە لەناو خۆتانا، بۆ پەند دادانو ئامۆژگاری قەیناکا، هەر کەسێکیش بە ئارەزوو بەدەم منەوە درۆ بکا، با جێگەی خۆی لە دۆزەخا خۆش بکا (ب/ت).

١١١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ سُئِلَ عَنْ عِلْمٍ فَكَتَمَهُ أَلْجَمَهُ اللّٰهُ بِلِجَامٍ مِنْ نَارٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَالتِّرْمِذِيُّ[٣].

واتە: ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (درودی خوای لەسەربێ) هەرکەسێ لە زانستێ پرسیاری لێ بکەنو حەشاری بداو وەڵامی پرسیارەکە نەداتەوە ئەوە لە ڕۆژی قیامەتا خودا لغاوی ئاگرینی لەدەم دەکا! (د/ت-س/ح).

١١٢- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَثَلُ مَا بَعَثَنِي اللّٰهُ بِهِ مِنَ الْهُدَى وَالْعِلْمِ كَمَثَلِ الْغَيْثِ الْكَثِيرِ أَصَابَ أَرْضًا، فَكَانَ مِنْهَا نَقِيَّةٌ قَبِلَتِ الْمَاءَ، فَأَنْبَتَتِ الْكَلأَ وَالْعُشْبَ الْكَثِيرَ، وَكَانَتْ مِنْهَا أَجَادِبُ أَمْسَكَتِ الْمَاءَ، فَنَفَعَ اللّٰهُ بِهَا النَّاسَ، فَشَرِبُوا وَسَقَوْا وَزَرَعُوا، وَأَصَابَتْ مِنْهَا طَائِفَةً أُخْرَى، إِنَّمَا هِيَ قِيعَانٌ لاَ تُمْسِكُ مَاءً، وَلاَ تُنْبِتُ كَلأً، فَذَلِكَ مَثَلُ مَنْ فَقِهَ فِي دِينِ اللّٰهِ وَنَفَعَهُ مَا بَعَثَنِي اللّٰهُ بِهِ، فَعَلِمَ وَعَلَّمَ، وَمَثَلُ مَنْ لَمْ يَرْفَعْ بِذَلِكَ رَأْسًا، وَلَمْ يَقْبَلْ هُدَى اللّٰهِ الَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ. رَوَاهُ الشَّيخَانِ[٤].

واتە: ئەبو مووسا (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت دەفەرموێ: (درودی خوای لەسەربێ): ئەم هیدایەتو ڕێنموویی و زانستەکە خودا بەمنا ناردوویەتی بۆ ئەم خەڵکە وەك بارانێکی زۆر وایە کە بباریێ لە خاکێ، بەشێکی خاکێکی پاكو بەپیزبێو باراناوەکە بگرێتە خۆیو لەوەڕو گیایەکی زۆری پێ سەوز ببێ، وە

---

(٣) رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

(٤) بخاري. علم: ٧٩. مسلم. فضائل: ٥٩١٢.

بەشێكی تری زەوییەكی رەقەن و رووتەن بێ شینایی و سەوزایی نەڕوێنێ بەڵام ئاوەكە قووت نەداتەوە بەڵكوو گلی بداتەوەو ببێ بە گۆماوو خودا بیكا بە مایەی خێرو خۆشی و سوود بۆ خەڵك: بەم رەنگە هەم خۆیان لێی بخۆنەوەو هەم ئاژەڵ و ماڵاتی پێ ئاوبدەن و هەم كەشتوكاڵی لەبەرا بكەن وە بەشێكی تریشی دەشتانی و شۆرەكات بێ نە ئاو گل بداتەوەو نە لەوەڕیش سەوز بكا، جا ئەم خاك و بارانە نموونەو وێنەیە بۆ ئەو كەسە خودا پێداوانە كە لە ئایینی خودا شارەزا دەبن و بە فەرمانی خودا لەم ئایینی منە سوود وەردەگرن و هەم خۆیان فێری زانین دەبن و هەم خەڵكی تریش فێر دەكەن و لە هەردوو جیهانا سەریان بەرز دەبێتەوە، هەر وەك نموونەو وێنەشن بۆ ئەو كەسانەیش كە سەریان پێی بەرز نابێ و ئەو هیدایەت و دینە راستەی كە خودا بەمنا ناردوویەتی نایانەوێ و وەری ناگرن (ش)

١١٣- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: وَاللهِ لَأَنْ يَهْدِيَ اللهُ بِهُدَاكَ رَجُلاً وَاحِداً خَيْرٌ لَكَ مِنْ حَمْرِ النَّعَمْ. رَوَاهُ الثَلاثَة[٥].

واتە: سەهلی كوڕی سەعد (خوای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) لە غەزای خەیبەردا بە ئیمامی عەلی فەرموو: بەخودا ئەگەر بەهۆی رابەریی تۆوە خودا تاقە یەك كەس شارەزای رێگەی راست بكا ئەوە لە هەموو ماڵی دنیا چاكترە بۆتۆ! (ش/د).

١١٤- عَنْ بْنَ مَسْعُودٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: لاَ حَسَدَ إلاَّ فِي اثْنَتَيْنِ رَجُلٌ آتَاهُ اللّٰهُ مَالاً فَسُلِّطَ عَلَى هَلَكَتِهِ فِي الْحَقِّ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللّٰهُ الْحِكْمَةَ، فَهُوَ يَقْضِي بِهَا وَيُعَلِّمُهَا. رَوَاهُ الشَيخَانَ والتِّرْمِذِيُّ[٦].

واتە: ئیبنو مەسعوود (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: حەسوودی و بەخیلی بەكەس دروست نیە بەم دوو كەسە نەبێ: یەك بە پیاوێ خودا ماڵی رەحمەتی بداتێ وەخۆشی دەستی تێ بچێ لە

---

(٥) بخاري. جهاد: ٢٩٤٢ ، ٣٠٠٩ ، ٣٧٠١ ، ٤٢١٠. مسلم. فضائل: ٦١٧٣.

(٦) بخاري. علم: ٧٣ ، ١٤٠٩ ، ٧١٤١ ، ٧٣١٦. مسلم: ١٨٩١، ١٨٩٢ ، ١٨٩٣.

ڕێگەی ڕاستا داغانی بکا، یەك بە پیاوێ کە خودا دانایی و پەندیاریی پێبدا، جا هەم خۆی ڕەفتاری پێ بکاو هەم فێری خەڵکی تریشی بکا (ش/ت).

١١٥- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: نَضَّرَ اللَّهُ امْرَأً سَمِعَ مِنَّا شَيْئًا فَبَلَّغَهُ كَمَا سَمِعَ فَرُبَّ مُبَلَّغٍ أَوْعَى مِنْ سَامِعٍ. رَوَاهُ أَلتِّرْمِذِيُّ وَأَبُو دَاوُدَ. وَفِي رِوَايَةٍ:نَضَّرَ اللَّهُ امْرَأً سَمِعَ مِنَّا حَدِيثاً فَحَفِظَهُ حَتىّ يُبَلِّغَهُ فَرُبَّ حامِلِ فِقْهٍ إِلى مَنْ هُوَ أَفْقَهُ مِنْهُ وَرُبَّ حامِلِ فِقْهٍ لَيْسَ بِفَقِيهٍ[٧].

واتـە: دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: خودا گەشی و خۆشی بخاتە ئەو کەسە کە شتێ لە ئێمە دەبیستێ وە چۆنی دەبیستێ ئاوا رای دەگەیەنێ بە موسوڵمانان، چونکە زۆر کەس لە وانەی کە ئەو فەرمایشتەیان پێ دەگاتەوە گەلێ باشتر تێی دەگەن لە زۆر لەو کەسانەی کە بە گوێی خۆیان لە دەمی منی دەبیستن! (ت-س/ص-د).

لە گێڕانەوەیەکا: خودا رووی ئەو کەسە شەوقدارو گەش کا کە فەرموودەیێ لە ئێمە دەبیستێ و لەبەری دەکا تا دەیگەیەنێ بە جێگەی خۆی، چونکە زۆر شەریعەت هەڵگر هەیە شەریعەتەکە لەبەردەکا تا دەیگەیەنێ بە کەسێکی تر کە ئەو لەم باشتر لێی تێ دەگا، وە زۆر شەریعەت لەبەر هەیە کە خۆی شەریعەتزان نیە.

١١٦- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْبَدْرِيِّ أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَسْتَحْمِلُهُ فَقَالَ: إِنَّهُ قَدْ أُبْدِعَ بِي. فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ايْتِ فُلاَنًا فَأَتَاهُ فَحَمَلَهُ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَنْ دَلَّ عَلَى خَيْرٍ فَلَهُ مِثْلُ أَجْرِ فَاعِلِهِ. رَوَاهُ ألأربَعَة[٨].

واتـە: ئەبو مەسعوودی بەدری (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ هاتە لای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) داوای وڵاخی سواری لێ کرد بۆ خۆی گوتی:

---

(٧) رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

(٨) بخاري. جهاد: ٢٨٤٣. مسلم. جهاد: ٤٨٧٦ ، ٤٨٧٧ ، ٤٨٧٨ ، ٤٨٧٩. أبو داود. جهاد: ٢٥٠٩ ترمذي. جهاد: ١٦٣١.

پەكم كەوتووە لەبەر بێ ولاٚخی. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بچۆ بۆ لای فیسارە كەس ئەویش چوو بۆ لای، كابرا ولاٚخێكی سواری دایە، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەر كەسێ خێرێ نیشانی كەسێ بدا خۆشی بەقەد خێركەرەكە خێری دەگا (ش/د/ت).

## ١٦) سەرباسێ: دەشێ زانین بنووسرێتەوە تا نەفەوتێ

## فرع – يكتب العلم لصيانته

١١٧– عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قالَ: قُلْتُ لِعَلِيّ: هَلْ عِنْدَكُمْ كِتَابٌ؟ قالَ: لاَ، إلاَّ كِتَابُ اللَّهِ، أَوْ فَهْمٌ أُعْطِيَهُ رَجُلٌ مُسْلِمٌ، أَوْ مَا فِي هَذِهِ الصَّحِيفَةِ. قَالَ: قُلْتُ فَمَا فِي هَذِهِ الصَّحِيفَةِ قَالَ: الْعَقْلُ، وَفَكَاكُ الأَسِيرِ، وَلاَ يُقْتَلُ مُسْلِمٌ بِكَافِرٍ[1].

واتە: ئەبو جوحەیفە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: بە ئیمامی (علی)م گوت: ئێوە كە خانەوادەی پێغەمبەرن (درودی خوای لەسەربێ) ئایا هیچ نامەو نووسراوێكی تایبەتیتان لەلا هەیە كە لەلای خەڵكی تر نەبێ، وەك هەندێ كەس ئەم داوایە دەكەن؟ عەلی گوتی: نەء، شتی وامان لەلا نیە، جگە لە قورئان كە نامەی خودایە، كە ئەویش لەلای هەموو موسوڵمانێ هەیە، مەگەر تێگەیشتن و فەهمێ كە خودا بیدا بە بازێ پیاوی موسوڵمان، لەگەڵ ئەوەی لەم تۆمارەدا نووسراوە (كە لە كێلانی شمشێرەكەما هەڵم گرتووە تا نەفەوتێ) گوتم: باشە ئەم تۆمارە چی لێ نووسراوە؟ گوتی: باسی چۆنێتی خوێندان و ئەندازەو چەشنی خوێنبایی و باسی سەرانەو بارمتەی دیل و ئەو مەسەلەیەیش: كە موسوڵمان لە باتی كافرو بێ بڕوا ناكوژرێتەوە! (ش/ت).

١١٨– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: عَامَّ فَتْحِ مَكَّةَ فِيْ الْحَدِيثِ الطَّوِيلِ: اكْتُبُوا لِأَبِي شاهٍ. رَوَاهُمَا الشَّيْخَانِ والتِّرْمِذِيُّ.

---

(١) بخاري. الفرائض: ٦٧٥٥.

**واتـە: ئـەبو هـورەیرە** (خوای لێ رازی بێ) **گـوتی: لـە سـاڵی فـەتحی مەککـەدا پێغەمبـەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **دوانێکـی دوورو درێـژی دا پیـاوێکی یەمـەنی کـەناوی ئەبوشـاە بـوو گـوتی: (ئـەی پێغەمبـەری خـودا! بفـەرموو کـە ئـەم فەرمایشتە بنووسن بۆم!) پێغەمبەریش** (درودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: بۆ ئـەبو شاهی بنووسن (ش/ت).**

١١٩- وَعَنْهُ يَقُولَ: ما مِنْ أَصْحَابِ أَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَحَدٌ أَكْثَرَ حَدِّيثاً عَنْهُ مِنِّي إِلاَّ ما كَانَ مِنْ عَبدِأللهِ بْنِ عِمْرٍو فَإِنَّهُ كَانَ يَكْتُبُ وَلاَ أَكْتُبْ. رَوَاهُ أَلْبُخاري والتِّرْمِذِيُّ(٣)

**واتە: دیسان گوتی: کەس لە یارانی پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **بەقـەد من فەرموودەی پێغەمبەری لە لانیە، مەگەر عەبدوڵلای کوڕی عەمر، ئەو لە من زیاتر فـەرموودەی حـەزرەتی لـە لایـە، چونکە ئـەو خوێنـدەواربوو دەینووسـی بەڵام من خوێندەوارنیمو نازانم بنووسم (ب/ت).**

١٢٠- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَـالَ: كُنْـتُ أَكْتُـبُ كُـلَّ شَـيْءٍ أَسْمَعُهُ مِنْ أَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أُرِيدُ حِفْظَهُ فَنَهَتْنِي قُرَيْشٌ وَقَالُوا: أَتَكْتُبُ كُلَّ شَيْءٍ تَسْمَعُهُ وَرَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَشَرٌ يَتَكَلَّمُ فِي الْغَضَبِ وَالرِّضَا فَأَمْسَكْتُ عَنِ الْكِتَابِ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَوْمَأَ بِأُصْبُعِهِ إِلَـى فِيـهِ فَقَـالَ: اكْتُبْ فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا يَخْرُجُ مِنْهُ إِلاَّ حَقٌّ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ(٤).

**واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەمر** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: هەرچیم لە پێغەمبـەر** (درودی خوای لەسەربێ) **دەبیست دەم نووسی هـەتا لەبـەری بکـەم، بـەڵام قـوڕەیش نـەیان هێـشتمو گوتیـان: چـۆن شـتی وا دەکـەی، مەینووسـە چـونکە پێغەمبـەریش** (درودی خوای لەسەربێ) **هـەر ئـادەمیزادەو لـە تووڕەیی و شـێنەیی دا قسان دەکا، لەبەر ئەوە مەرج نیە کە هەرچی فـەرموو ئیتر شـەریعەت بـێ، جا منیش وازم لە نووسین هێنا تا ئـەم باسـەم گێڕایـەوە بۆ حـەزرەت** (درودی خوای

(٣) رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه. جلد/٣ص٤١٠ حاشية رقم: (٨).

(٤) سكت عنه الشارح (مترجم).

لەسەربێ) جا حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) پەنجەی خۆی دانا لەسەردەمی موبارەکی، فەرمووی: هەرچی لەم دەمە دەبیستی بینووسە، دەسا بەو کەسە کە گیانی منی بە دەسە ئەوەی راستو دروست نەبێ لەم دەمە دەرناچێ! (د).

## ١٧) باسی سێیەم: باسی دەستوورو نادابی زانین
## الباب الثالث: في آداب العلم

١٢١- عَنْ أَنَس (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ كَانَ إِذَا تَكَلَّمَ بِكَلِمَةٍ أَعَادَهَا ثَلاثًا حَتَّى تُفْهَمَ عَنْهُ، وَإِذَا أَتَى عَلَى قَوْمٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ سَلَّمَ عَلَيْهِمْ ثَلاثًا. رَوَاهُ ٱلْبُخَارِي وَأَبُو دَاوُدَ[١].

واتە: ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وابوو کە قسەیەکی دەکرد لە بابەت ئایینەوە سێ جار دووبارەی دەکردەوە، تاباش لە قسەکەی تێبگەن، وە کە دەچوو بۆ ناو کۆمەڵێ، کاتێ سلاوی لێ دەکردن (ئەگەر گوێیان لێ نەبوایە) تا سێ جار سلاوەکەی دووبارە دەکردەوە (ب/د).

١٢٢- وَعَنْه عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَسِّرُوا وَلاَ تُعَسِّرُوا، وَبَشِّرُوا وَلاَ تُنَفِّرُوا. رَوَاهُ ٱلشيخان[٢].

واتە: دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: کار ئاسان بکەن، وەکار گران مەکەن وە مژدەی خۆش بە خەڵك بدەن، وە بە هەڕەشەو گوڕەشەی زۆر خەڵك لە دین مەتەکێننەوە (ش).

١٢٣- عَنْ أَبِي وَائِلٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ عَبْدُ اللّٰهِ يُذَكِّرُ النَّاسَ فِي كُلِّ خَمِيسٍ، فَقَالَ: لَهُ رَجُلٌ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ لَوَدِدْتُ أَنَّكَ ذَكَّرْتَنَا كُلَّ يَوْمٍ. قَالَ: أَمَا

(١) بخاري. إيمان: ٩٤ ، ٩٥ ، ٦٢٤٤.

(٢) بخاري. إيمان: ٦٩ ، ٦١٢٥. مسلم. مغازى: ٤٥٠٣.

إِنَّهُ يَمْنَعُنِي مِنْ ذَلِكَ أَنِّي أَكْرَهُ أَنْ أُمِلَّكُمْ، وَإِنِّي أَتَخَوَّلُكُمْ بِالْمَوْعِظَةِ كَمَا كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَخَوَّلُنَا بِهَا، مَخَافَةَ السَّآمَةِ عَلَيْنَا. رَوَاهُ الشيخان والترميذي(٣).

واتە: ئەبو وائیل گوتی: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود دەستووری وابوو هەموو رۆژێ پێنج شەموانێ تەمێ و ئامۆژگاری خەڵکەکەی دەکرد، رۆژێ پیاوێ پێی گوت: ئەی باوکی ئەورەحمان! خۆزگەم هەموو رۆژێ ئەم تەمێ و ئامۆژگارییەت دەکردین. گوتی: ئەدی من لەبەر ئەوە وا ناکەم حەز ناکەم وە رستان بکەم منیش وەك جارانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) چۆن ئەو ناو بەناو پەندی دادەداین و ئامۆژگاری دەکرێن نەبادا ئەگەر هەموو رۆژێ پەندمان دابدا، جاڕس ببین، منیش ئێستا لەگەڵ ئێوەدا ئاوا دەکەم چاو لەو دەکەم (ش/ت).

١٢٤- قَالَ: أَنَسٌ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) إِنَّهُ لَيَمْنَعُنِي أنْ أُحَدِّ تَكُمْ حَدِيثاً كَثِيرا أَنَّ ألنَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: مَنْ تَعَمَدَ عَلَى كَذِباً فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ. رَوَاهُ ألأربَعَة(٤).

واتە: ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: بۆیە من فەرمایشتی زۆری حەزرەتتان بۆ ناگێڕمەوە چونکە حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ بەقەستی بەدەم منەوە درۆ بکا با جێگەی خۆی لە ئاگری دۆزەخدا خۆش بکا (ش/د/ت).

١٢٥- وَلِمُسْلِمٍ إِنَّ كَذِبًا عَلَيَّ لَيْسَ كَكَذِبٍ عَلَى أَحَدٍ، فَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ(٥).

واتە: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: درۆکردن بەدەم منەوە وەك درۆکردن بەدەم کەسی ترەوە نیە، هەر کەسێ بەقەستی بەدەم منەوە درۆ بکا با جێگەی خۆی لەناو ئاگری دۆزەخدا خۆش بکا(م).

---

(٣) بخاري. علم: ٧٠. مسلم. توبه: ٧٠٦٠ ، ٧٠٥٨.

(٤) بخاري. العلم: ١١٠ ، ١٠٩ ، ١٠٦ ، ٦١٩٧. مسلم. مقدمة: ٢ ، ٢ ، ٤.

(٥) مسلم. مقدمة: ٥ ، ٢١٥٤ ، ٢١٥٥ ، ٢١٥٦. بخاري. جنائز: ١٢٩١.

١٢٦- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ اللّٰهَ لاَ يَقْبِضُ الْعِلْمَ انْتِزَاعًا، يَنْتَزِعُهُ مِنَ الْعِبَادِ، وَلَكِنْ يَقْبِضُ الْعِلْمَ بِقَبْضِ الْعُلَمَاءِ، حَتَّى إِذَا لَمْ يُبْقِ عَالِمًا، اتَّخَذَ النَّاسُ رُءُوسًا جُهَّالاً فَسُئِلُوا، فَأَفْتَوْا بِغَيْرِ عِلْمٍ، فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا. رَوَاهُ الشيخان والترمذي[٦].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوە نەبێ کە خودا لەپڕ عیلمو زانین لە بەندەکانی خۆی بگرێتەوە، بەسڕین بیسڕێتەوە لە سینگیان، بەڵام خودا بەرو دوا زاناکان دەباتەوە بۆ لای خۆی، تاوای لێ دێ عیلمو زانین نامێنێو هەڵ دەگیرێ، جا کاتێ نەزانین ماو نە زانا ما، ئەوجا رەشە خەڵکە کە، سەرۆکی نەزانو نەدان دادەنێن بۆ خۆیانو، دەست دەکەن بە پرسیارکردن لێیان، جا ئەوانیش بە نەزانیو نادانی فەتوایان بۆ دەدەن، جا هەم خۆیان لە رێ دەر دەچنو هەم خەڵکی تریش لەرێ دەردەکەن! (ش/ت).

١٢٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أُفْتِيَ بِغَيْرِ عِلْمٍ كَانَ إِثْمُهُ عَلَى مَنْ أَفْتَاهُ وَمَنْ أَشَارَ عَلَى أَخِيهِ بِأَمْرٍ يَعْلَمُ أَنَّ الرُّشْدَ فِي غَيْرِهِ فَقَدْ خَانَهُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَابْن ماجه.

واتە: ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ یەکێ بە نەزانی فەتوای بۆ بدا ئەوە گوناهی بە ئەستۆی ئەو کەسەیە کە بە نەزانی فەتوای بۆ دەدا، وە هەر کەسێ هەر کارێ نیشانی برایەکی موسوڵمانی خۆی بداو پێی بڵێ کە بیکا، وە لە هەمان کاتدا بشزانێ کە کردنی ئەو کارە باش نیە، یا بە پێچەوانەوە، ئەوە سوور ئەو کەسە گزیو ناپاکی لەو براموسڵمانەی خۆی دەکا! (د/ ئیبنو ماجە).

١٢٨- عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَقُصُّ عَلَى النَّاسِ إِلاَّ أَمِيرٌ أَوْ مَأْمُورٌ أَوْ مُخْتَالٌ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَأَحمد[٨].

---

(٦) بخاري. علم: ١٠٠ ، ٧٣٠٧. مسلم. ٦٧٣٧. ترمذي: ٢٦٥٢.

٨) بسند حسن (شرحه).

**واتە:** عەوفی کوڕی مالیك (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: کەس هەقی تەمێ و ئامۆژگاریکردنی خەڵکی نیە بێجگە لەم دوو کەسە. یا فەرمانڕەوا خۆی یا کەسێ کە فەرمانڕەوا رێگەی ئەوەی پێ بدا، ئیتر لەم دوو کەسە بترازێ هەر کەسێکی تر لە خۆیەوە شتی وا بکا ئەوە بۆ فیزو دەعیە دەیکا، بۆ رەزای خودا نایکا (د/ئەحمەد–س/ح).

١٢٩– عَنْ أَبِي هَارُونَ الْعَبْدِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قالَ: كُنَّا نَأْتِي أَبَا سَعِيدٍ فَيَقُولُ مَرْحَبًا بِوَصِيَّةِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: إِنَّ النَّاسَ لَكُمْ تَبَعٌ وَإِنَّ رِجَالاً يَأْتُونَكُمْ مِنْ أَقْطَارِ الأَرَضِينَ يَتَفَقَّهُونَ فِي الدِّينِ فَإِذَا أَتَوْكُمْ فَاسْتَوْصُوا بِهِمْ خَيْرًا. رَوَاهُ الترمذي وَابن ماجه[٩].

**واتە:** ئەبو هاروونی ئەل–عەبدی گوتی: جاران کە دەچوین بۆ لای ئەبو سەعید دەیگوت: خۆش هاتنو بەخێر بێن، دەربارەی ئێوە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ئامۆژگاری دەکرین: دەیفەرموو: خەڵکی تر پەیڕەوی ئێوەنو چاو لە ئێوە دەکەن ئەی خەڵکی شاری مەدینە! پیاوان لە دوورە وڵاتەوە لە هەموو لایەکەوە دێن بۆ لاتان، تاکوو شارەزای ئایین ببن، جا کەدێن بۆ لاتان وەسێت بێ لێتان چاوی خێرتان لێیان بێو قەدریان بزانن! (ت – سند غريب – ئیبنو ماجە).

## ١٨) لاباسێ: زانین دەبێ هەر بۆڕەزامەندی خودای گەورەبێ:
## فرع: يلزم أن يكون العلم لله تعالى

١٣٠– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: مَنْ تَعَلَّمَ عِلْمًا يُبْتَغَى بِهِ وَجْهُ اللَّهِ لاَ يَتَعَلَّمُهُ إِلاَّ لِيُصِيبَ بِهِ عَرَضًا مِنَ الدُّنْيَا لَمْ يَجِدْ عَرْفَ الْجَنَّةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَابن ماجه[١].

---

(٩) رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

(١) سكت عنه الشرح (مترجم).

**واتە: ئەبو هورەیرە** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: هەر کەسێ زانستێ فێر ببێ — لەو شتانە کە بە زانستی ئایینی دادەنرێت و، دەبێ مەبەست لە فێر بوونیان ڕەزامەندی خودا بێ — بەڵام ئەو بۆ ئەوەی بێ کە پڕو پیتی ئەم جیهانەی پێ کۆ بکاتەوە ئەوە ئەو کەسە لە ڕۆژی قیامەتدا بۆن و بەرامەی بەهەشت ناکا** (د/ ئیبنو ماجە).

**١٣١– عَنْ ابْنِ عُمَرَ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **مَنْ تَعَلَّمَ عِلْماً لِغَيْرِ اللهِ أَوْ أَرَادَ بِهِ غَيْرَ اللهِ فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَابن ماجه**(٢).

**واتە: ئیبنو عومەر** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **دەفەرموێ: هەر کەسێ زانستێکی شەرعی فێربێ بۆ غەیری خودا یا فەرمووی: مەبەستی پێی غەیری خودابێ با بڕواتە ناو دۆزەخەوە** (ت – س/ح – ئیبنو ماجە).

**١٣٢– عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قالَ: مَنْ طَلَبَ الْعِلْمَ لِيُجَارِيَ بِهِ الْعُلَمَاءَ أَوْ لِيُمَارِيَ بِهِ السُّفَهَاءَ أَوْ يَصْرِفَ بِهِ وُجُوهَ النَّاسِ إِلَيْهِ أَدْخَلَهُ اللّٰهُ النَّارَ. رَوَاهُمَا التِّرْمِذِي وَابن ماجه**(٣).

**واتە: کەعبی کوڕی مالیك** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **دەفەرموێ: هەر کەسێ بۆ ئەوە فێری عیلم و زانست ببێ کە پێی ببێ بە هاوشانی زانایان، یاخود بۆ ئەوە کە دەمە دەمێ و دەمەوەری پێ بکا لەگەڵ گەوج و نەفامان، یان بۆ ئەوە کە خەڵك ڕووی دەمی تێ بکەن و ناو بانگ دەربکا لە ناویان ئەوە ئەو کەسە خودا بۆ خۆی دەیخاتە ناو ناخی دۆزەخەوە!** (ت – سند غريب – ئیبنو ماجە).

---

(٢) رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

(٣) رواه الترذي بسند غريب (شرحه).

## ١٩) پاشەكی: شوێنەواری عیلمو زانست هەتا هەتایە دەمێنێ
## خاتمة: يبقى أثر ألعلم خالدا

١٣٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ دَعَا إِلَى هُدًى كَانَ لَهُ مِنَ الأَجْرِ مِثْلُ أُجُورِ مَنْ يَتَّبِعُهُ لاَ يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا وَمَنْ دَعَا إِلَى ضَلاَلَةٍ كَانَ عَلَيْهِ مِنَ الإِثْمِ مِثْلُ آثَامِ مَنْ يَتَّبِعُهُ لاَ يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ آثَامِهِمْ شَيْئًا. رَوَاهُ مُسْلِم وَأَبُو دَاوُدَ وَالتِّرْمِذِيُّ[1].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر كەسێ رێگەی راست نیشانی خەڵك بدا خۆشی بەقەد ئەو كەسانە كە بەگوێی دەكەن خێری دەگا، بەبێ ئەوە كە هیچ لە خێری ئەوان كەم بكاتەوە. وە هەر كەسێ رێگەی خراپ نیشانی خەڵك بدا خۆشی بەقەد ئەو كەسانە كە بە گوێی دەكەن گوناهی دەگا، بەبێ ئەوە كە هیچ لە گوناهی ئەوان كەم بكاتەوە! (م/د/ت).**

١٣٤- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا مَاتَ أَبْنُ آدَمَ أَنْقَطَعَ عَمَلُهُ إِلا مِنْ ثَلاثٍ: صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ أَو عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ. رَوَاهُ أَلْخِمْسَة إِلا الْبُخَارِي[2].

**دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: كاتێ ئادەمیزاد دەمرێ هەموو كردەوەیكی كۆتایی دێ ئەم سێ شتە نەبێ:**

**یەكەم: خێرێكی نەبڕاوە (وەك مزگەوتو كاریزو شتی وەقف).**

**دووەم: زانینی بەسوود.**

**سێیەم: منداڵو وەچەیەكی باش كە دەوعاو نزای باشی بۆ بكا (م/د/ت/ن).**

١٣٥- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ مِمَّا يَلْحَقُ أَلْمُؤْمِنَ مِنْ عَمَلِهِ وَحَسَنَاتِهِ بَعْدَ مَوْتِهِ عِلْماً عَلَّمهُ وَنَشَرَهُ وَوَلَداً صَالِحاً تَرِكَهُ أَوْ مُصْحَفاً وَرَّثَهُ أَوْ

---

(١) مسلم. علم: ٦٧٤٥. أبو داود. السنة: ٤٦٠٩. ترمذي. علم: ٢٦٧٤.

(٢) مسلم. وصية: ٤١٩٩. ترمذي. أحكام: ١٣٧٦. نسائي. وصايا: ٣٦٥٢.

مَسْجِداً بَنَاهُ أَوْ بَيْتاً لِإبنِ ألسَّبِيلِ بَنَاهُ أَوْ نَهْراً اَجْرَاهُ أَوْ صَدَقَةً أَخْرَجَهَا مِـنْ مَالِـهِ فِيَ صِحَّتِهِ وَحَيَاتِهِ تَلْحَقُهُ مِنْ بَعْدِ مَوْتِهِ. رَوَاهُ ابن ماجه والبيهقي وابن خزيمة[٣]

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: موسوڵمان (لە پاش مردنیشی) خێری ئەم کردەوەو چاکانەی خۆیی پێ دەگاتەوە: خێری ئەو زانینە کە فێری خەڵکی تری کردووەو لەناو خەڵکا بڵاوی کردۆتەوە، وە خێری ئەو منداڵە باشە کە لەپاش خۆی بەجێی هێشتووە، وە خێری ئەو مزگەوتە کە دروستی کردووە، یا ئەو دیوەخانە کە دروستی کردووە بۆ رێبوارو رەفتەنی یا ئەو جۆگایە کە هەڵی گرتووە، یا ئەو قورئانە کە بەمیرات بەجێی هێشتووە بۆ کەسوکاری، هەروەها پاداشی هەموو وەقف و خێرێکی تریش کە موسوڵمان (لە حاڵی لەشساغی و ژیانی خۆیا) لە ماڵی خۆی جیای دەکاتەوەو دەیکا بە خێرو وەقف، سەرجەم خێرو پاداشی ئەمانە دەگاتەوە پێی لەپاش مردنی خۆی! (ئیبنو ماجە —س/ح—بەیهەقی/ئیبنو خوزەیمە).

١٣٦– عَنِ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِاللّٰهِ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَنْ سَنَّ فِي الإِسْلاَمِ سُنَّةً حَسَنَةً فَعَمِلَ بِهَا بَعْدَهُ كَتِبَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِ مِنْ عَمِلَ بِهَـا وَلاَ يَـنْقُصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَىْءٌ وَمَنْ سَنَّ فِي الإِسْلاَمِ سُنَّةً سَيِّئَةً فَعَمِلَ بِهَا بَعْدَهُ كُتِبَ عَلَيْهِ مِثْـلُ وِزْرِ مِنْ عَمِلَ بِهَا وَلاَ يَنْقُصَ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَىْءٌ. رَوَاهُ مُسْلِم والتَّرْمِذِيُّ[٤].

واتە: جەریری کوڕی عەبدوڵلا (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەرکەسێ (لە ئیسلاما) رەووشت و یاسایەکی جوان دابهێنێ وەخەڵك چاوی لێ بکەن و رەفتاری پێ بکەن، چ لە ژیانیا چ لەپاش مردنی، ئەوە لە پاداشی ئەوەدا بەقەد پاداشی ئەو کەسانە کە بەو یاسایە کار دەکەن خێرو پاداشیش بۆ ئەو کەسە دەنووسرێ، بەبێ ئەوە کە هیچ لە خێری ئەوان کەم بکاتەوە، وە هەر کەسێ (لە ئیسلاما) یاسایەکی ناشرین دابهێنێ و خەڵك چاوی لێ بکەن و رەفتاری پێ بکەن، چ لە ژیانیا چ لە پاش

(٣) رواه ابن ماجه بسند حسن (شرحه).

(٤) مسلم. علم: ٦٧٤١ ، ٢٣٥١ ، ٢٣٤٨ ، ٦٧٤٤.

خۆی، ئەوە بەقەد گوناهی ئەوانەی کاری پێ دەکەن گوناهیش بۆ ئەو کەسە دەنووسرێ بەبێ ئەوە کە هیچ لە گوناهی ئەوان کەم بکاتەوە. (م/ت).

١٣٧- عَنْ عَوفِ الْمُزَنِّي أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: لِبِلاَلِ بْنِ الْحَارِثِ: اعْلَمْ. قالَ: مَا أَعْلَمُ يَا رَسُولَ اللّٰهِ قَالَ: اعْلَمْ يَا بِلاَلُ قالَ: مَا أَعْلَمُ يَا رَسُولَ اللّٰهِ قَالَ: أَنَّهُ مَنْ أَحْيَا سُنَّةً مِنْ سُنَّتِي قَدْ أُمِيتَتْ بَعْدِي فَإِنَّ لَهُ مِنَ الأَجْرِ مِثْلَ مَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا وَمَنِ ابْتَدَعَ بِدْعَةَ ضَلاَلَةٍ لاَ يَرْضَاهَا اللّٰهُ وَرَسُولُهُ كَانَ عَلَيْهِ مِثْلُ آثَامِ مَنْ عَمِلَ بِهَا لاَ يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أَوْزَارِ النَّاسِ شَيْئًا. رَوَاهُ التِّرْمِذِيُّ وَاللهُ اَعْلَم[٥].

**واتە: عەوفی ئەل-موزەنی** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **بە بیلالی کوڕی حاریثی فەرموو: (بزانە) بیلال گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! چی بزانم؟ فەرمووی: (بزانە ئەی بیلال) بیلال گوتیەوە: ئەی پێغەمبەری خودا! چی بزانم؟ فەرمووی: (بزانە کە هەر کەسێ دەستووروو یاسایێ زیندوو بکاتەوە لەو دەستوورو یاسایانەی من کە لەپاش خۆم کوێر کراونەتەوە، ئەوە بەقەد ئەوانەی کار بەو دەستوورو یاسایە بکەن خێرو پاداشی بۆ هەیە، بەبێ ئەوەی کە هیچ لە پاداشی ئەوان کەم بکاتەوە وە هەر کەسێ رەووشتێکی تازە قەڵڵای ناڕەوا بەرپا بکا کە خوداو پێغەمبەری خودا پەسەندی نەکەن و رەزایان لەسەری نەبێ ئەوە بەقەد ئەوانەی کار بەو رەووشتە ناشایستە دەکەن گوناەو تاوانی بۆ هەیە، بەبێ ئەوەی کە هیچ لە گوناهی ئەوان کەم بکاتەوە (ت-س/ح).**

---

(٥) رواه الترمذي بسند حسن (شه = شرحه).

بسم الله الرحمن الرحيم

# نامەی پاکیو خاوێنی (تەهارەت)

(هەشت باسە)

## ٢٠) باسی یەکەم: باسی سوودو بەهرەی خاوێنی

## كتاب الطهارة: (وفيه أبواب ثمانية)

## الباب الأول: في فضائل الطهارة

قَالَ اللهُ جَل شأنُهُ: {فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْ وَاللّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ – ١٠٨/٩}.

لەو مزگەوتەدا هەیە چەن پیاوێکی وا کە حەزیان لە پاکیو خاوێنییەو حەزدەکەن خۆیانو جلو بەرگیان پاك رابگرن، دڵو دەروونیان پاك بکەنەوە لە گوناهو تاوانباری، وە خودا ئەو کەسانەی خۆش دەوێ کە خۆیان پاكو خاوێن رادەگرن.

١٣٨– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: إِنَّ أُمَّتِي يُدْعَوْنَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ غُرًّا مُحَجَّلِينَ مِنْ آثَارِ الْوُضُوءِ، فَمَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يُطِيلَ غُرَّتَهُ فَلْيَفْعَلْ. رَوَاهُ الْخَمْسَة إِلاَّ أَبا دَاوُدَ[1].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: لە رۆژی قیامەتا ئۆمەتی من پێیان دەڵێن: قەشی چوار پەل سپی، بەهۆی ئەسەرو شوێنەواری دەسنوێژەوە، جا لەبەر ئەم بەهرەیە تا دەتوانن قەشیو پەل سپێتیی خۆتان زۆر تر بکەن (ش/ت/ن).

١٣٩– وَعَنْه عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: أَلاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا يَمْحُو اللَّهُ بِهِ الْخَطَايَا وَيَرْفَعُ بِهِ الدَّرَجَاتِ قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ. قالَ: إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ عَلَى الْمَكَارِهِ وَكَثْرَةُ الْخُطَا إِلَى الْمَسَاجِدِ وَانْتِظَارُ الصَّلاَةِ بَعْدَ الصَّلاَةِ فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ. رَوَاهُ مُسْلِم وَالتِّرْمِذِيُّ وَالنَسائي[2].

---

(١) بخاري. وضوء: ١٣٦. مسلم. طهارة: ٥٧٨ ، ٥٧٩.

(٢) مسلم. طهارة: ٥٨٦. ترمذي. طهارة: ٥١.

واتە: دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئاگادار بن با ئەو شتەتان نیشان بدەم کە خودا هەم گوناهانی پێ دەکوژێنێتەوەو هەم پایەی موسوڵمانانی پێ بەرز دەکاتەوە یارانیش گوتیان: فەرموو، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: دەسنوێژ گرتنی تەواوو تێرو تەسەل لە هەموو کاتێکدا، لەکاتی خۆشیدا لەکاتی ناخۆشیدا، وە هاموشۆکردنی مزگەوت بە گەرمیو هاتن بۆی لەرێی دوورەوە، وە چاوەڕوانکردنی نوێژەکان یەك لە دوای یەك، ئا ئەمانەن خەباتو تێکۆشانو لێبڕان بۆ خودا. (م/ت/ن).

١٤٠ – وَعَنْه عَنِ النّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قالَ: إِذَا تَوَضَّأَ الْعَبْدُ الْمُسْلِمُ – أَوِ الْمُؤْمِنُ – فَغَسَلَ وَجْهَهُ خَرَجَ مِنْ وَجْهِهِ كُلُّ خَطِيئَةٍ نَظَرَ إِلَيْهَا بِعَيْنَيْهِ مَعَ الْمَاءِ – أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ – فَإِذَا غَسَلَ يَدَيْهِ خَرَجَ مِنْ يَدَيْهِ كُلُّ خَطِيئَةٍ كَانَ بَطَشَتْهَا يَدَاهُ مَعَ الْمَاءِ – أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ – فَإِذَا غَسَلَ رِجْلَيْهِ خَرَجَتْ كُلُّ خَطِيئَةٍ مَشَتْهَا رِجْلَاهُ مَعَ الْمَاءِ – أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ – حَتَّى يَخْرُجَ نَقِيًّا مِنَ الذُّنُوبِ. رَوَاهُ مُسْلِم وَالتِّرْمِذِي[٣].

واتە: دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەیفەرموو: کاتێ بەندەی موسوڵمان یا فەرمووی: کاتێ بەندەی بڕوادار دەسنوێژ دەگرێ کە دەمووچاوی دەشوا هەرچی گوناهێ کە بەچاوەکانی کردوونی لەگەڵ ئاوەکەدا لە دەمو چاوی دەر دەچن یا فەرمووی: لەگەڵ دوا دڵۆپی ئاوەکەدا لە دەموچاوی دەتەکێنە خوارەوەو دەموچاوی تەواو لە گوناهی وردە پاك دەبێتەوە (م/ت).

١٤١ – وَعَنْهُ قالَ: سَمِعْتُ خَلِيلِي (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يَقُولُ: تَبْلُغُ الْحِلْيَةُ مِنَ الْمُؤْمِنِ حَيْثُ يَبْلُغُ الْوَضُوءُ. رَوَاهُ مُسْلِم وَالنَسائي[٤].

واتە: دیسان گوتی (خوای لێ رازی بێ): لە خۆشەویستی خۆمم ژنەوت دەیفەرموو (درودی خوای لەسەربێ): دەیفەرموو (درودی خوای لەسەربێ) هەتا کوێی

---

(٣) مسلم. طهارة: ٥٧٦. ترمذي. طهارة: ٢.

(٤) مسلم. طهارة: ٥٨٥. نسائي. حلية الوضوء: ١٤٩.

ئەندامی موسوڵمان ئاوی دەسنوێژ بیگرێتەوە لە قیامەتا هەتا ئەوێ خشڵی تێ دەکا! (ا/ن).

١٤٢- عَنْ أَبِي مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) الأَشْعَرِيِّ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الطُّهُورُ شَطْرُ الإِيمَانِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلأُ الْمِيزَانَ. وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلآنِ - أَوْ تَمْلأُ - مَا بَيْنَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَالصَّلوةُ نُورٌ وَالصَّدَقَةُ بُرْهَانٌ وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ وَالْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَكَ أَوْ عَلَيْكَ كُلُّ النَّاسِ يَغْدُو فَبَائِعٌ نَفْسَهُ فَمُعْتِقُهَا أَوْ مُوبِقُهَا. رَوَاهُ مُسْلِم والنسائي والترميذي[٥].

واتە: ئەبو مالیکی ئەشعەری (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: پاکی‌و خاوێنیی دڵ‌و دەم‌و دەس‌و لەش‌و بەرگ‌و جێ‌و شوێن نیوەی راستی ئیمان‌و باوەڕە! وەخێری ذیکری (الحمد لله) تای خێری تەرازووی خێرو شەڕ پڕ دەکا! وە خێری ذیکری (سبحان الله والحمد لله) پڕ بە ناوەندی ئەرزو ئاسمانەکانە، وە نوێژ نوورە بۆ چاوو هەناو، رووناکییە بۆ دڵ‌و دەروون وە خێرو خێرات‌و زەکات بەڵگەیە لەسەر ئیمانی خاوەنی‌و قەڵغانی دەستیەتی، صەبرو ئارام‌و خۆگری مایەی رۆشنایی دڵ‌و دەروونەو چرای دەستی پیاوی موسوڵمانە لە ژیانیا، وە قورئان شایەت‌و بەڵگەیە، جا یا لەسەرت دەکاتەوە (ئەگەر لەسەری بکەیتەوە) یا لە دژت دەوەستێ ئەگەر رەفت (عەمەل)ی پێ نەکەی وە هەموو کەسێ کە رۆژ دەکاتەوە خۆی بەلایەکا ساخ دەکاتەوە: جا یاخۆی دەفرۆشێ بە خودای میهرەبان‌و خۆی ئازاد دەکا لە ئاگری دۆزەخ یا خۆی دەفرۆشێ بە شەیتان‌و خۆی ماڵ وێران دەکا (م/ن/ت).

١٤٣- عَنْ عُثْمَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ خَرَجَتْ خَطَايَاهُ مِنْ جَسَدِهِ حَتَّى تَخْرُجَ مِنْ تَحْتِ أَظْفَارِهِ. رَوَاهُ مُسْلِم[٦].

---

(٥) مسلم. طهارة: ٥٣٣. ترمذي. دعوات: ٣٥١٧.

(٦) مسلم. طهارة: ٥٧٧.

**واتــە: عوسمــان** (خـوای لێ رازی بـێ) **گـوتی: پێغەمبــەر** (درودی خـوای لەســەربێ) **دەفەرمویێ: هەر کەسێ دەسنوێژێ بە جوانی بشۆرێ، گوناهەکانی لە لەشی دەرەچن، هەتا لەژێر نینۆکەکانیشیەوە دێنە دەروە (م).**

١٤٤- عَنْ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: ما مِنْكُمْ مِنْ أحَد يَتَوَضَّأَ فَيُحْسِنَ الْوُضُوءَ ثُمَّ يَقُولُ حِينَ يَفْرُغُ مِنْ وُضُوئِهِ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ اللّٰهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، إلاَّ فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيةُ يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ. رَوَاهُ الْخَمْسَة إلا البخاريَّ وَزَادَ التِّرْمِذِي: اللّٰهُمَّ اجْعَلْنِي مِنْ التَّوَّابِينَ وَاجْعَلْنِي مِنَ الْمُتَطَهِّرِينَ[٧].

**واتە: عومەر** (خوای لێ رازی بێ) **لە حەزرەتەوە** (درودی خوای لەسەربێ) **دەفەرمویێ: هەر کامێ لە ئێوە دەسنوێژێ بە جوانی بگرێ، جا کە لە دەسنوێژەکە بۆوە بڵێ:**

{أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ}

**شایەتی دەدەم کە لەخودا بەولاوە خودای تر نیە، وە شایەتی دەدەم کە موحەممەد بەندەو پێغەمبەری خودایە فەرمووی: هەر کامێ لەئێوە ئەمە بکا ئیتر هەر هەشت دەرگاکانی بەهەشتی بۆ دەکەنەوە بە ئارەزووی خۆی لە کامیانەوە حەز بکا دەچێتە ژوورەوە (م/د/ت/ن) تیرمیذی ئەمەشی لێ پتر کردووە:**

{اللّٰهُمَّ اجْعَلْنِي مِنَ التَّو ابِينَ وَاجْعَلْنِيْ مِنَ الْمتَطَهِّرِينَ}

**خودایە! بمکە بە تەوبەکارو بمکە بەیەکێ لەوانە کە خۆیان پاکو خاوێن را دەگرن.**

١٤٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: مَنْ تَوَضَّأَ عَلَى طُهْرٍ كَتِبَ لَهُ عَشْرُ حَسَنَاتٍ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَالتِّرْمِذِيُّ[٨].

---

(٧) مسلم. وضوء: ٥٥٢ ، ٥٥٣. أبو داود. طهارة: ١٦٩ ، ٩٠٦. نسائي. طهارة: ١٤٨ ، ١٥١.

(٨) رواه الترمذي بسند ضعيف (شه = شرحه).

**واتــە: ئیبنــو عومــەر** (خوای لێ رازی بێ) (دروودی خوای لەسەربێ) **دەفـەرموێ: هـەر کەسـێ دەسـنوێژەکەی تـازە بکاتـەوە دەچـاکەی بـۆ دەنووسـرێ (د/ت – سـند ضعیف).**

## ٢١) باسی دووەم: باسی ئەحکامی ئاو

## الباب الثاني: في أحكام المياه

{قَالَ: الله جلَّ شأنُهُ – وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّن السَّمَاء مَاء لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ – ٨/١١}.

**واتــە: خـودای گـەورەو شـکۆمەند دەفـەرموێ: ئێـوە باسـی ئەوچـاکەو منەتانی خودا بکەن لە سەرتان کە لـە شـەوا نووستبوون دوور لـە ئـاوی بـەدر خودا لە ئاسمانەوە بارانی باراندو ئاوی رژاند بەسەرتانا تا بـەو ئـاوە پـەکتان بکاتەوە لـەبێ دەسـنوێژیو لـە شـپیسیو چڵکی لـەشو ژەنگـو وەسوەسـەی دڵ.**

١٤٦– عَنْ هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قالَ: سَأَلَ رَجُلٌ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقالَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنَّا نَرْكَبُ الْبَحْرَ وَنَحْمِلُ مَعَنَا الْقَلِيلَ مِنَ الْمَاءِ فَإِنْ تَوَضَّأْنَا بِـهِ عَطِشْنَا أَفَنَتَوَضَّأُ بِمَاءِ الْبَحْرِ؟ فَقالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هُوَ الطَّهُـورُ مَـاؤُهُ الْحِلُّ مَيْتَتُهُ. رَوَاهُ أصحاب السنين[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە** (خوای لێ رازی بێ) **گـوتی: پیـاوێ لـە پێغەمبـەری پرسـی** (دروودی خوای لەسەربێ) **گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئێمـە کاتـێ سـواری کەشـتی دەبین لە دەریادا کەمێ ئاوی شـیرین هەڵـدەگرین، ئەگـەر دەسـنوێژی پێبگـرین بەشی خواردنەوەمان ناکاو توونیمان دەبێ، جا ئایا بـەئاوی دەریـا دەسـنوێژ بگرین یانا؟ پێغەمبەریش** (درووی خوای لەسەربێ) **فـەرمووی: بـەڵێ دەسـنوێژی پـێ بگرن چونکە ئاوی دەریا هەم پاکەو هەم پاکەوەکەریشە، وە مردارەوە بووشی حەڵاڵـەو گیانلەبـەری ئـاوی کاتـێ دەمـرێ هـەتا نەگـەنێ خـواردنی دروسـتە (د/ت/ن–س/ص).**

---

(١) بسند صحيح (شه = شرحه).

١٤٧- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ يُقَالُ لَهُ: إِنَّهُ يُسْتَقَى لَكَ مِنْ بِئْرِ بُضَاعَةَ وَهِيَ بِئْرٌ يُلْقَى فِيهَا لُحُومُ الْكِلاَبِ وَالْمَحَايِضُ وَعَذِرُ النَّاسِ. قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّ الْمَاءَ طَهُورٌ لاَ يُنَجِّسُهُ شَيْءٌ. رَوَاهُ أصحاب السنن[٢].

واتــە: ئـەبو سـەعیدی خـودری (خـوای لێ رازی بـێ) گـوتی: گـوێم لێبـوو: دەیـانگوت بـە پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەربێ): ئـەو ئـاوەی تـۆ دەیخۆیتـەوەو بەکاری دەهێنی بۆ نانو چێشتو دەسنوێژو شتی وا ئەوە لەبیری بوضاعە دەیهێـنن، ئـەو بیرەیـش گۆشـتی سـەگی تۆپییـوو پـەڕۆی بـێ نوێـژی ژنـانو پیسایی ئـادەمیزادی تـێ دەکـەوێ بـە تایبـەت لـەکاتی سـێڵاوو لافـاوا، جـا لـەپاش ئـەم روون کردنەوەیـە، بۆمـان بـەیان بفـەرموو کـە حـوکمی ئـەم ئـاوە چییە؟ پێغەمبـەریش (درودی خـوای لەسـەربێ) فـەرمووی: ئـەو ئـاوە هـەم پاکـەو هـەم پاککەرەوەیـە، چونکە گەیشتۆتە رادەی قوللەتێنو بەپێی شـەرع کە بناغـەی لەسەر ئاسانکارییە بەهیچ پیس نابێ (د/ت/ن-س/ح).

١٤٨- وَقَالَ: أَبُو دَاوُدَ: قَدَّرْتُ بِئْرَ بُضَاعَةَ بِرِدَائِي مَدَدْتُهُ عَلَيْهَا ثُمَّ ذَرَعْتُهُ فَإِذَا عَرْضُهَا سِتَّةُ أَذْرُعٍ وَسَمِعْتُ قُتَيْبَةَ بْنَ سَعِيْدٍ قَالَ: سَأَلْتُ قَيِّمَ بِئْرِ بُضَاعَةَ عَنْ عُمْقِهَا قَالَ: أَكْثَرُ ما يَكُونُ فِيهَا الْمَاءُ إِلَى الْعَانَةِ قَلْتُ: فَإِذَا نَقَصَ قَالَ: دُونَ الْعَوْرَةِ وَسَأَلْتُ صَاحِبَ الْبُسْتَانِ الَّذِي هِيَ فِيهِ: هَلْ غُيِّرَ بِنَاؤُهَا عَمَّا كَانَتْ عَلَيْهِ؟ قَالَ: لآ[٣].

واتــە: ئـەبو داوود دانـەری کتێبـی (سـنن ابـی داود) دەڵـێ: بـە پۆشـاك (ریداء)ەکەم ئەندازەی پانیی بیری بوضاعـەم گـرت، لـە پاشا کـە پۆشاکەکەمم بە باڵی خۆم پێوایەوە پانی بیرەکە شەش باڵ دەرچوو، وە لە قوتەیبەی کوڕی سەعیدیشم بیست دەیـوت: لـە بیرەوان (کاربەدەسـت)ەکەی بیری بوضـاعـەم پرسـی: کـە قووڵییەکـەی چـەندە؟ گـوتی: کاتــێ ئــاوی زۆر تیابــێ لــە

---

(٢) بسند حسن. وقال احمد: إنه صحيح (شه = شرحه).

(٣) أثر صحيح (مترجم)

بەرمووسڵدانن (بەرموسڵدان = بە عەورەت) دەدا، گوتی ئەگەر تەواو کەم بکا دەگاتە کوێ؟ گوتی: دەگاتە بەر ئەژنۆ، وە لەخاوەنی ئەو باخەیشم پرسی کە بیرەکەی لەناودایە: ئایا دروستکردن (بینا)ی بیرەکە وەك خۆی ماوەو نەکۆڕاوەو لەسەردەمی پێغەمبەردا چۆن بووە ئێستاکەیش هەروا ماوە؟ گوتی: بەڵێ وەك خۆی ماوە.

١٤٩ – عَنْ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الْمَاءِ يَكُونُ فِي الْفَلاَةِ وَماَ يَنُوبُهُ مِنَ الدَّوَابِّ وَالسِّبَاعِ. فَقالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا كَانَ الْمَاءُ قُلَّتَيْنِ لَمْ يَحْمِلِ الْخَبَثَ. رَوَاهُ اصحاب السن[٤].

واتە: ئیبنو عومەر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە پێغەمبەریان پرسی (دروودی خوای لەسەربێ): ئاو هەیە لە چۆڵ،، ماڵیاتو دڕندە دەچنە سەریو لێی دەخۆنەوەو دەمی تێ دەخەنو کەڵێ جار مەلەی لێ دەکەنو وا دەبێ گمێزیشی تێ دەکەن ئایا ئەو ئاوە بەمە پیس دەبێ یانا؟ فەرمووی: کە ئاو بوو بە قوللەتین. (واتە: دوو جەڕەی گەورە) ئیتر پیسی هەڵناگری (د/ت/ن-س/ص).

١٥٠ – عَنْ أَنَسٍ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دَعَا بِإِنَاءٍ مِنْ مَاءٍ، فَأُتِيَ بِقَدَحٍ رَحْرَاحٍ فِيهِ شَيْءٌ مِنْ مَاءٍ، فَوَضَعَ أَصَابِعَهُ فِيهِ. قَالَ: أَنَسٌ: فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ إِلَى الْمَاءِ يَنْبُعُ مِنْ بَيْنِ أَصَابِعِهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَنَسٌ: فَحَزَرْتُ مَنْ تَوَضَّأَ مَا بَيْنَ السَّبْعِينَ إِلَى الثَّمَانِينَ. رَوَاهُ الشَّيْخَان[٥].

واتە: ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە دەفرێکا داوای ئاوی کرد، جامێکی دەم پەلیان بۆ هێنا کەمێ ئاوی تیابوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پەنجەکانی تێ خست، ئەنەس دەیگوت: کە سەیری ئاوەکەم کرد لە نێوان پەنجەکانی پێغەمبەرەوە هەڵدەقوڵا ئەنەس دەیگوت: ئەوانەی کە دەسنوێژیان لەو جامەگرت بە زەینم حەفتا هەشتا کەسێك دەبوون (ش).

(٤) بسند صحيح (شه = شرحه).

(٥) بخاري. وضوء: ٢٠٠ ، ١٦٩. مسلم. فضائل: ٥٩٠٠، ٥٩٠١ ، ٥٩٠٣. ترمذي. مناقب: ٣٦٣١. نسائي. وضوء: ٧٦.

١٥١– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ فِي الْمَاءِ الدَّائِمِ الَّذِي لاَ يَجْرِي، ثُمَّ يَغْتَسِلُ فِيهِ. وفي رَوَايَة: ثُمَّ يَتَوَضَّأُ مِنْهُ. وَفِي رَوَايَة: نَهى أَنْ يُبالَ فِي الْماءِ الرَّاكِدِ(٦).

واتە: ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: کەستان گەمێز مەکەنە ئاوی راوەستاوەوەو لە دواییشا خۆتانی تیا بشۆرن لە گێرانەوەیەکا: لە دواییشا دەسنوێژی لێ بگرێ لە گێرانەوەیەکی تردا: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) یاساخی کردووە کە گمێز بکرێتە ئاوی راوەستاوەوە (ش/د/ت/ن).

١٥٢– عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ (رَضِيَ اللهُ عَنهُا) كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَالنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ مِنْ قَدَحٍ يُقَالُ لَهُ الفَرَقُ. وفي رَوَايَة: وَنَحْنُ جُنُبَانْ: رَوَاهُماَ الْخِمْسَة(٧).

واتە: عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جاران منو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەیەکەوە خۆمان دەشۆرد لەیەك دەفر، پێیان دەگوت: فەرەق شازدە رەتڵ ئاوی دەگرت لە گێرانەوەیەکا: هەردوو لاشمان لەشمان پیس بوو. (ش/د/ت/ن)

١٥٣– عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قالَ: كَانَ الرِّجالُ وَالنِّساءُ يَتَوَضَّأُونَ فِي زَمَانِ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ نُدْلي فِيهِ أَيْدِيناَ. رَوَاهُ البخاري وَأَبُو دَاوُدَ وَالنَسائي(٨).

واتە: ئیبنو عومەر گوتی: (خوای لێ رازی بێ) جاران بە سەرینیی پێغەمبەر خۆی (درودی خوای لەسەربێ) پیاوو ژن پێکەوە لەیەك قاپ دەسنوێژیان دەگرت، وە دەستیشمان پیادەکرد (لەکاتی دەسنوێژ گرتنەکەدا) (ب/د/ن).

---

(٦) مسلم. وضوء: ٦٥٣ ، ٦٥٥. نسائي. طهارة: ٣٥. ترمذي. طهارة: ٦٨.

(٧) بخاري. غسل: ٢٥٠ ، ٢٦١ ، ٢٦٣ ، ٢٧٣ ، ٢٩٩ ، ٧٣٣٩ ، ٥٩٥٦. مسلم. طهارة: ٧٢٥. ٧٢٦. نسائي. طهارة: ٢٢٧.

(٨) بخاري. وضوء: ١٩٣.

١٥٤- عَنِ أبْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) قالَ: أغْتَسَلَ بَعْضُ أَزوَاجِ ألنَبِيّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فِي جَفْنَةٍ فَجَاءَ ألنَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لِيَتَوَضَّأَ مِنْهاَ أَوْ يَغْتَسِلَ فَقَالَتْ لَهُ: يَا رَسُولَ أللهِ إِنّي كُنْتُ جُنُباً فَقَالَ: رَسُولُ اللهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) إِنَّ ألْمَاءَ لاَ يَجْنَبُ. رَوَاهُ أصحاب السنن(٩).

واتە: ئینو عەبباس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: یەکێ لە ژنەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە سۆینەیەکا خۆی شۆرد، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) هاتەوە ویستی دەسنوێژی لێ بگرێ یا خۆی لێ بشوا، ژنەکەی پێی گوت: ئەی رەهبەری خودا! خۆ من لەشم پیس بوو کە خۆم لەو ئاوە شۆرد ئیتر تۆ چۆن خۆتی پێ دەشۆری؟ پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: خۆ ئاوەکەیش لەشی پیس نابێ شتی واقەی ناکا (د/ت/ن-س/ص).

١٥٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قالَ: لاَ يَغْتَسِلُ اَحَدُكُمْ فِي ألْمَاءِ ألدَّائِمِ وَهُوَ جُنُبٌ فَقالَ: كَيْفَ يَفْعَلُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ؟ قالَ: يَتَنَاوَلُهُ تَنَاوُلاً. رَوَاهُ مُسْلِم(١٠).

واتە: ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر یەکێ لە ئێوە لەشی پیس بوو با لەئاوی کەمی راوەستاودا خۆی نەشۆرێ گوترا: ئەی ئەبو هوەیرە! ئەی چۆن بکا؟ گوتی: بەدەستی ئاوەکە هەڵبگرێو بیکا بەخۆیا یا بەقاپێ ئاوەکە لە قووڵکەکە هەڵبگرێو بیکا بەسەر جەستەی خۆیا (م).

١٥٦- عَنْ كَبْشَةَ بِنْتِ كَعْبٍ قَالَتْ: دَخَلَ أبُو قَتَادَةَ فَسَكَبَتْ لَهُ وَضُوءًا فَجَاءَتْ هِرَّةٌ فَشَرِبَتْ مِنْهُ فَأَصْغَى لَهَا الإِنَاءَ حَتَّى شَرِبَتْ فَرَآنِي أَنْظُرُ إِلَيْهِ فَقَالَ: أَتَعْجَبِينَ يَا ابْنَت أَخِي؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ. فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قالَ: إِنَّهَا لَيْسَتْ بِنَجَسٍ إِنَّهَا مِنَ الطَّوَّافِينَ عَلَيْكُمْ وَالطَّوَّافَاتِ. رَوَاهُ اصحاب السنن(١١).

---

(٩) بسند صحيح (شه = شرحه).

(١٠) مسلم. طهارة: ٦٥٦.

(١١) بسند صحيح (شه = شرحه).

کە بشەی کچی کەعب (خوای لێ رازی بێ) گوتی: ئەبو قەتادەی خەزوورم هاتەوە، ئاوی دەسنوێژم بۆ داکرد، پشیلەیەك هات لێی خواردەوە، ئەبو قەتادەیش قاپەکەی بۆ لار کردەوە تا پشیلەکە تێری خواردەوە، کەمنی دی سرنجی دەدەم گوتی: برازا! ئەوە بەلاتەوە سەیرە؟ گوتم: بەڵێ: گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: پشیلە پیس نیە، پشیلەیش لە ریزی کارەکەرو نۆکەرو ئەوانەیە کە بۆ خزمەت بەسەرتانا دەخولێنەوە (د/ت/ن-س/ص).

١٥٧- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قالَ: سُئِلَ ألنَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَتَوَضَّأُ بِمَا أَفْضَلَتِ الْحُمُرُ؟ قالَ: نَعَمْ وَبِمَا أَفْضَلَتِ السِّبَاعُ كُلُّهَا. رَوَاهُ الشافعي والبيهقي[١٢].

واتە: جابیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە پێغەمبەریان پرسی (دروودی خوای لەسەربێ): ئایا بەو ئاوەی کە لەبەرکەر دەمێنێتەوە دەسنوێژی پێ بگرین؟ فەرمووی: بەڵێ، هەروەها بە بەرماوەی هەموو درندەیێ دەسنوێژ دەگیرێ (شافیعی/ بەیهەقی).

١٥٨- وَعَنْهُ قالَ: جَاءَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَعُودُنِي، وَأَنَا مَرِيضٌ لاَ أَعْقِلُ، فَتَوَضَّأَ وَصَبَّ عَلَيَّ مِنْ وَضُوئِهِ، فَعَقَلْتُ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللّٰهِ لِمَنِ الْمِيرَاثُ؟ إِنَّمَا يَرِثُنِي كَلاَلَةٌ. فَنَزَلَتْ آيَةُ الْفَرَائِضِ. رَوَاهُ الشَيخان والنسائي[١٣].

واتە: دیسان جابیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: نەخۆش بووم هۆشم نەبوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ): هاتبوو بۆ سەردانم، دەسنوێژ دەگرێو لە ئاوی دەسنوێژەکەی لێم دەپرژێنێ، ئەوجا هۆشم دێتەوە، جا گوتم: ئەی رەهبەری خودا! میراتو کەلەپوورەکەم بۆ کێیە؟ چونکە من تەنیا چەن خۆشکێکم هەن کە کەلە پوورم لێ بگرنو کەسی ترم نیە نە باوکو دایکو نە منداڵ جا بەم بۆنەیەوە ئایەتی فەرائیز هاتە خوارەوە (ش/ن).

---

(١٢) سكت عن بيان درجة الحديث الشارح (مترجم).

(١٣) بخاري. فرائض: ٦٧٢٣ ، ٧٣٠٩. مسلم ميراث: ٤١٢١ ، ٤١٢٢ ، ٤١٢٣ ، ٤١٢٤. نسائي. وضوء: ١٣٨.

## ٢٢) باسی سێیەم: باسی لابردنی پیسی (دوو بەشە):

### بەشی یەکەم: باسی پاککردنەوەی پێستی مردارەوەبوو گلاّویی سەگ‌و بەراز

### الباب الثالث: في إزالة النجاسة (وفيه فصلان):

### فصل الأول: في تطهير جلد الميتة والنجاسة الكلبية

١٥٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَجَدَ شَاةً مَيْتَةً أُعْطِيَتْهَا مَوْلاَةٌ لِمَيْمُونَةَ مِنَ الصَّدَقَةِ، فَقَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): هَلاَّ انْتَفَعْتُمْ بِجِلْدِهَا؟ فَقَالُوا: إِنَّهَا مَيْتَةٌ. فَقَالَ: إِنَّمَا حَرُمَ أَكْلُهَا. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ[1].

واتە: ئیبنو عەبباس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: جارێ مەڕێکیان بەزەکات دابوو بە کارەکەرێکی مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر مەڕەکە مردارەوە بوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کەلاکی مەڕەکەی دی فڕێ درابوو. فەرمووی: ئە ی ئەوە بۆچی کەڵکتان لە کەوڵەکەی وەرنەگرتووە؟ گوتیان: ئاخر ئەمە مردارەوە بووە، فەرمووی: تەنیا خواردنی دروست نیە (ش/د/ت).

١٦٠- وَعَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: إِذَا دُبِغَ الْإِهَابُ فَقَدْ طَهُرَ. وَفِي رِوَايَةٍ: أَيُّمَا إِهَابٍ دُبِغَ فَقَدْ طَهُرَ. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ إِلا البخاري[2].

واتە: دیسان گوتی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (درودی خوای لەسەربێ): (هەموو کەوڵێ کە خۆشەکرا پاك دەبێتەوە، لە گێڕانەوەیەکا: هەر کەوڵێ خۆشە بکرێ ئیتر پاك دەبێتەوە (م/د/ت).

١٦١- عَنْ ابْنُ وَعْلَةَ السَّبَائِيُّ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ قُلْتُ: إِنَّا نَكُونُ بِالْمَغْرِبِ فَيَأْتِينَا الْمَجُوسُ بِالأَسْقِيَةِ فِيهَا الْمَاءُ وَالْوَدَكُ فَقَالَ: اشْرَبْ. فَقُلْتُ: أَرَأْيٌ

---

(١) بخاري. زكاة: ١٤٩٢ ، ٢٢٢١ ، ٥٥٣١ ، ٥٥٣٢. مسلم طهارة: ٨٠٤ هەتا ٨٠٩. أبو داود. لباس: ٤١٢٠ ، ٤١٢١. نسائي. الفرع والعتيدة: ٤٢٤٥.

(٢) مسلم. طهارة: ٨١٠

تَرَاهُ؟ فَقالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰـهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَلّمَ) يَقُـولُ: دِبَاغُـهُ طَهُـورُهُ. رَوَاهُ مُسْلِم(٣).

**واتە: ئیبنو وەعلەی سەبائی گوتی: لە ئیبنو عەبباسم پرسی، گوتم: ڕێ دەکەوێ دەچین بۆ وڵاتی ڕۆژاوا، ئاگر پەرستەکان کوندە ئاوو مەشکە پیومان بۆ دێنن نازانین ئەو کوندەو مەشکانە هی ئاژەڵی سەربڕاون یا نا؟ گوتی: لەو کوندەو مەشکانە بخۆرەوە؟ گوتم: ئەمە بەرای خۆت وا دەڵێی یا شتێکت بیستووە، لەم بارەیەوە لە گوتی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خوای لەسەربێ): خۆشەکردنەکەی پاکی دەکاتەوە (م).**

١٦٢– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قالَ: إِذَا وَلَـغَ الْكَلْبُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ فَلْيُرِقْهُ ثُمَّ لِيَغْسِلْهُ سَبْعَ مِرَارٍ. وفي رِوَايَة: أُولاَهُنَّ أَوْ إِحْدَاهُنَّ بِالتُّرابِ. وفي أخرى: اَلسَّابِعَة بِالتُّرابِ. رَوَاهُ الْخَمْسَةَ(٤).

**واتە: ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: کە سەگ یا بەراز دەمی نایە ناو حاجەت‌و قاپتانەوە هەرچی تێدایە بیرێژن، ئینجا حەوت جار بە ئاو بیشۆرن لە گێڕانەوەیەکا: یەکەمجاریان، یاخود جارێ لەو جارانە بە خۆڵاو بیشۆرن لە گێڕانەوەیەکی تردا: جاری حەوتەمیان بە خۆڵاو (ش/د/ت/ن).**

**٢٣) بەشی دووەم: پاککردنەوەی خوێن‌و میزو مەزی‌و ئەم جۆرە شتانە..**

**الفصل الثاني: في تطهير الدم والبول والمذي وغيرها..**

١٦٣– عَنْ أَسْمَاءَ قَالَتْ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَقَالَـتْ: إِحْدَانَا يُصِيبُ ثَوْبَهَا مِنْ دَمِ الْحَيْضَةِ كَيْفَ تَصْنَعُ بِهِ قالَ: تَحُتُّهُ ثُمَّ تَقْرُصُهُ بِالْمَاءِ ثُمَّ تَنْضَحُهُ ثُمَّ تُصَلّي فِيهِ(١).

---

(٣) مسلم. طهارة: ٨١٣ ، ٨١٢.

(٤) بخاري. وضوء: ١٧٢ ، مسلم. طهارة: ٦٤٦ هەتا ٦٥١. نسائي. سؤر الكلب: ٦٣. أبو داود. سؤر الكلب: ٧٤.

**واتە: ئەسماء** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: ئافرەتێ هاتە لای پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **گوتی: ئەگەر خوێنی بێ نوێژی بەر جلەکانمان کەوت چی لێ بکەین؟ فەرمووی: بیوڵێنو بی کرێنو ئینجا بە ئاوهەڵی گوڵوفنو سەری پەنجەی تێخەنو لەپاشا پاك بی شۆرن، ئیتر نوێژی پێوە بکەن (ش/د/ت/ن).**

**١٦٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **قالَ: قَامَ أَعْرابِيٌّ فَبَالَ فِي الْمَسْجِدِ فَتَنَاوَلَهُ النَّاسُ فَقَالَ لَهُمُ النَّبِيّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **دَعُوهُ وَأَهَرِيقُوا عَلى بَوْلِهِ سَجْلاً مِنْ مَاءٍ أَوْ ذَنُوباً مِنْ مَاءٍ فإنما بُعِثْتُمْ مُيَسِّرِينَ، وَلَمْ تُبْعَثُوا مُعَسِّرِينَ[٢].**

**واتە: ئەبو هورەیرە** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: عەرەبێکی دەشتەکی هەڵسا لەناو مزگەوتەکەی پێغەمبەردا** (درودی خوای لەسەربێ) **گمێزی کرد، چەن کەسێ تێیان خوڕی: شتی وا نەکەی، پێغەمبەریش** (درودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی پێیان: وازی لێ بێنن، بەلام سەتڵێ ئاو یا دۆڵچەیێ ئاو بکەن بە شوێنی میزەکەیدا، خودای گەورە بۆیە منی کردووە بە پێغەمبەری ئێوە کە کار ئاسان بکەن، نەوەك کار گران بکەن (جا چاو لە نەزان بپۆشنو بەناسکی فێری یاساکانی ئیسلامی بکەن). (ش/د/ت/ن).**

**١٦٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **قالَ: مَرَّ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **بِقَبْرَيْنِ فَقالَ: إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ أَمَّا أَحَدُهُمَا فَكَانَ لاَ يَسْتَتِرُ مِنْ الْبَوْلِ وَأَمَّا الآخَرُ فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ ثُمَّ أَخَذَ جَرِيدَةً رَطْبَةً فَشَقَّهُمَا نِصْفَيْنِ فَغَرَزَ فِي كُلِّ قَبْرٍ وَاحِدَةً قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ لَمَ فَعَلْتَ هذا؟ قَالَ: لَعَلَّهُ أَنْ يُخَفَّفَ عَنْهُمَا مَا لَمْ يَيْبَسَا[٣].**

---

(١) بخاري. وضوء: ٢٢٧ ، ٣٠٧. مسلم. طهارة: ٦٧٣. أبو داود. طهارة: ٣٦١ ، ٣٦٢. ترمذي. طهارة: ١٣٨. نسائي: دم الحيض: ٢٩٢.

(٢) بخاري. وضوء: ٢٢٠ ، ٦١٢٨ ، ٦٠٢٥. مسلم. طهارة: ٦٥٧. نسائي. ترك التوقيت فى الماء: ٥٣.

(٣) بخاري. وضوء: ٢١٦ ، ٢١٨ ، ١٣٦١ ، ١٣٧٨ ، ٦٠٥٢ ، ٦٠٥٥. مسلم. طهارة: ٦٧٥. أبو داود. استبراء من البول: ٢٠. نسائي. تنذه عن البول: ٣١. جنائز: ٢٠٦٧.

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێبێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بەلای دوو گۆڕا رابوورد، فەرمووی: خاوەنی ئەم دوو گۆڕە عەذابو سزا دەدرێن، لەسەر شتێ سزا دەدرێن خۆیان بە گەورەو گرانیان دانەناوەو بەبێ نرخیان زانیوە، بەڵام ئەوشتە لەلای خودا گوناهو تاوانێكی گەورەیە، یەكێكیان لەسەر ئەوە ئازار دەدرێ چونكە (لە حاڵی ژیانیدا) خۆی لە گمێزی خۆی نەدەپاراستو لەكاتی میزكردندا خۆی لەپاڵ شتێكدا حەشار نەدەدا، ئەویتریشیان دوو زمانی دەكردو قسەچێن بوو، قسەی دەهێناو دەبرد بۆ تێك بەردانی خەڵك لە یەكتری! ئینجا حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) پەڵكە خورمایەكی تەڕی هەڵگرتو كردی بە دوو لەتەوەو هەر كوتەی لەسەر گۆڕێكیان چەقاند گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمەت بۆچی كرد؟ فەرمووی: (چونكە گیاو داری سەوزو تەڕی سەر گۆڕ تا وشك دەبێو تەڕایی تیا نامێنێ دەپارێتەوە بۆ مردووەكە، جا كەوابوو بەشكوو ئەم پەلكە خورما سەوزانە ئازاریان سووك بكەن هەتا ئەوكاتەی وشك دەبن (ش/د/ت/ن).

١٦٦- عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ أَنَّهَا أَتَتْ بِابْنٍ لَهَا صَغِيرٍ لَمْ يَأْكُلِ الطَّعَامَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَجْلَسَهُ فِي حَجْرِهِ فَبَالَ عَلَى ثَوْبِهِ فَدَعَا بِمَاءٍ فَنَضَحَهُ وَلَمْ يَغْسِلْهُ. وفي روايةٍ: فَلَمْ يَزِدْ عَلَى أَنْ يَنضَحَ بِالْماءِ. روى هذه الأربعة الخَمْسَة[٤].

ئوم قەیسی كچی میحصەن گوتی: كوڕێكی كۆرپەم هەبوو، نانەخۆرە نەبوو بوو، بردم بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە كۆشی خۆیا داینا، میزیكرد بە جلەكانیا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) داوای ئاوی كردو ئاوەكەی پرژاند لە جلەكەیو ئیتر نەیشۆرد لە گێڕانەوەیەكا: تەنیا ئاوی لێ پرژاندو بەس (ش/د/ت/ن).

---

(٤) بخاري. وضوء: ٢٢٣ ، ٥٦٩٣. مسلم. طهارة: ٦٦٠ ، ٦٦٥. أبو داود. بول الصبي: ٣٧٤. بول الغلام: ٧١. نسائي. بول الصبي: ٣٠١.

١٦٧- عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: أُتِيَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِصَبِيٍّ يَرْضَعُ فَبَالَ فِي حِجْرِهِ فَدَعَا بِمَاءٍ فَصَبَّهُ عَلَيْهِ. رَوَاهُ مُسْلِم[٥].

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: کوڕێکی ساوای مەمکە خۆرەیان هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێ) منداڵەکە میزیکرد بە کۆشی حەزرەتدا، جا حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) داوای ئاوی کردو ئاوەکەی کرد بەسەر جێگەی میزەکەدا(م).

١٦٨- عَنْ لُبَابَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ قَالَتْ: كَانَ الْحُسَيْنُ فِي حِجْرِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَبَالَ عَلَيْهِ فَقُلْتُ: الْبَسْ ثَوْبًا وَأَعْطِنِي إِزَارَكَ حَتَّى أَغْسِلَهُ قالَ: إِنَّمَا يُغْسَلُ مِنْ بَوْلِ الأُنْثَى وَيُنْضَحُ مِنْ بَوْلِ الذَّكَرِ. رَوَاهُ أبو داود وأحمد والحاكم[٦].

لوبابەی کچی حاریث (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ حوسەینی کوڕی عەلی لە کۆشی پێغەمبەردا بوو (دروودی خوای لەسەربێ) میزی کرد بەکۆشیا، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری نازدار! جلێ لەبەرکەو بەرکۆش (ئیزار)ەکەتم بدەرێ تا بیشۆم. فەرمووی: شۆردن بەس بۆ میزی مێیینەیە بەڵام ئاولێ پرژاندن بۆ میزی نێرینەیە (د/ ئەحمەد/ حاکم – س/ص).

١٦٩- عَنْ أَبِي السَّمْحِ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: يُغْسَلُ مِنْ بَوْلِ الْجَارِيَةِ وَيُرَشُّ مِنْ بَوْلِ الْغُلاَمِ. رَوَاهُ أبو داود والنسائي[٧].

ئەبو سەمح (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: میزی کچ دەشۆرێ، وە میزی کوڕ ئاوی لێ دەپرژێنرێ! (د/ن–س/ح).

١٧٠- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قالَ: يُغْسَلُ بَوْلُ الْجَارِيَةِ وَيُنْضَحُ بَوْلُ الْغُلاَمِ مَا لَمْ يَطْعَمْ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ هَكَذا (موقوفاً على علَي) وَالتِّرْمِذِي مرفوعاً[٨].

واتە: عەلی (خوای لێ رازی بێ) گوتی: میزی کچ دەشۆرێ، وە میزی کوڕ (تانانە خۆرە دەبێ) ئاوی لێ دەپرژێنرێ (د/ موقوفات – مرفوعا –ن–س/ح).

---

(٥) مسلم. طهارة: ٦٦١.

(٦) رواه الحاكم بسند صحيح (شرحه).

(٧) بسند حسن (شرحه).

(٨) بسند حسن (شرحه).

١٧١- وَعَنْهُ قالَ: كُنْتُ رَجُلاً مُذَّاءً وَكُنْتُ أَسْتَحِي أَنْ أَسْأَلَ النَّبِيَّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِمَكَانِ ابْنَتِهِ فَأَمَرتُ الْمِقْدَادَ بْنِ الأسْوَدِ فَسَأَلَهُ فَقالَ: يُغْسَلُ ذَكَرَهُ وَيَتَوضَّأُ. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ[٩].

واتـە: دیـسان عـەلی (خـوای لێ رازی بێ) گـوتی: مـەزیم زۆر بـوو، شەرمیـشم دەکـرد بـۆ خـۆم لـە پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) بپرسـم، چـونکە کـچەکەی خێـزانم بـوو، جـا بـە میقـدادی کـوڕی ئەسـوەدم گـوت بـۆ ئەمـە لێـی پرسـی، فەرمووبووی: چووکی بشۆرێ‌و دەسنوێژ بگرێ (ش/د/ت/ن).

١٧٢- عَنْ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ قالَ: كُنْتُ أَلْقَى مِنَ الْمَذْيِ شِدَّةً وَكُنْتُ أُكْثِرُ مِنْهُ الْإغْتِسَالَ فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ ذلِكَ فَقالَ: إِنَّمَا يُجْزِئُكَ مِنْ ذَلِكَ الْوُضُوءُ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ فَكَيْفَ بِمَا يُصِيبُ ثَوْبِي مِنْهُ؟ قالَ: يَكْفِيـكَ أَنْ تَأْخُذَ كَفًّا مِنْ مَاءٍ فَتَنْضَحَ بِها مِن ثَوْبَـكَ حَيْـثُ تَـرَى أَنَّـهُ أَصَـابَهُ. رَوَاهُ أَبُـو دَاوُدَ والترميذي[١٠].

واتە: سەهلی کوڕی حونەیف (خوای لێ رازی بێ) گـوتی: بەدەسـت مـەذییـەوە دامابووم لەبەر ئەوە زۆر خۆم دەشۆرد، جا کە بۆ ئەمـە لـە پێغەمبـەرم پرسـی فـەرمووی: بـۆ ئـەوە تـەنیا دەسـنوێژت بەسـەو پێویـست بـە خۆشـۆردنی لەشپیـسی ناکـا. گـوتم: ئەی پێغەمبـەری خـودا! ئەی ئەوەی کـە دەکـەوێ لـە جلەکانم چی لێ بکەم؟ فەرمووی: لەپێ ئاو هەڵبگرەو بی پرژێنە لەو جێگەیەی جلەکەت کە دەزانی مەزییەکە بەری کەوتووەو بەس (د/ت-س/ص).

١٧٣- عَنْ عَبْدِاللّٰهِ يَقُولُ: أَتى النَّبِيُّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْغَائِطَ فَأَمَرَنِي أَنْ آتِيهُ بِثَلاثَةِ أَحْجَارٍ فَوَجَدْتُ حَجَرَيْنِ وَالْتَمَسْتُ الثالِثَ فَلَمْ أَجِدْهُ فَأَخَذْتُ رَوْثَةً فأتَيْتُهُ بِهَا فَأَخَذَ الْحَجَرَيْنِ وَأَلْقَى الْرَوْثَة وَقالَ: هَذا رِكْسٌ. البخاري والترمذي والنسائي[١١].

---

(٩) بخاري. علم: ١٣٢ ، ١٧٨ ، ٢٦٩. مسلم. حيض: ٦٩٣ ، ٦٩٤ ، ٦٩٥. نسائي.ماينقض الوضوء: ١٥٧.

(١٠) بسند صحيح (شرحه).

(١١) بخاري. وضوء: ١٥٦.

**عەبدوڵڵا** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **چوو بۆ سەراو، فەرمووی پێم: کەسێ بەردی بۆ بەرم، منیش دوو بەردم دەست کەوت‌و گەڕام بۆ بەردی سێیەم دەستم نەکەوت‌و لەباتی ئەو تەرسەقولێکم دۆزییەوەو بردم بۆی، جا هەردوو بەردەکەی وەرگرت‌و تەرسەقولەکەی تووڕداو فەرمووی: ئەمە پیسە بەکاری خۆپاککردنەوە نایەت (ب/ت/ن).**

١٧٤- عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُنْتُ أَغْسِلُ الْجَنَابَةَ مِنْ ثَوْبِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَيَخْرُجُ إِلَى الصَّلاَةِ، وَإِنَّ بُقَعَ الْمَاءِ فِي ثَوْبِهِ. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ[١٢].

**واتە: عائیشە** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: جاری وادەبوو ئەسەری لەشپیسیم دەشۆرد بەجلەکانی پێغەمبەرەوە** (درودی خوای لەسەربێ) **کە دەچوو بۆ نوێژ هێشتا جێگە شۆراوەکە تەڕبوو، وەك پەڵە بەجلەکەیەوە دیاربوو (ش/د/ت/ن).**

١٧٥- وَعَنْهَا قَالَتْ: لَقَدْ رَأَيْتُنِي أَفْرُكُ الْمَنِيَّ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَرْكًا فَيُصَلِّي فِيهِ. رَوَاهُ الْخَمْسَةَ إِلا الْبَخَارِي[١٣].

**واتە: دیسان گوتی: خۆم بەدەستی خۆم تۆماو (مەنی)ی وشکەوەبووم بە جلەکانی پێغەمبەرەوە** (درودی خوای لەسەربێ) **دەووڵی و لەپاشا دەمتەکاند، ئیتر بەبێ شۆردن پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **نوێژی پێوە دەکرد (م/د/ت/ن).**

١٧٦- عَنْ مَيْمُونَةَ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سُئِلَ عَنِ فَأْرَةٍ سَقَطَتْ فِي سَمْنٍ فَقَالَ: أَلْقُوهَا وَمَا حَوْلَها وَكلُوُا سَمْنَكُمْ. وَفِي رواية: إِذَا وَقَعَتِ الْفَأْرَةُ فِي السَّمْنِ فَإِنْ كَانَ جَامِداً فَأَلْقُوهَا وَمَا حَوْلَهَا وَإِنْ كَانَ مَائِعًا فَلاَ تَقْرَبُوهَا. رَوَاهُ الْخَمْسَةَ إِلا مسلماً[١٤].

---

(١٢) بخاري. وضوء: ٢٢٩، ٢٣٠ ، ٢٣١ ، ٢٣٢. مسلم. طهارة: ٦٧٠ ، ٦٧١ ، ٦٧٢. أبو داود. المنى يصيب الثوب: ٣٧٣. ترمذي. غسل المنى: ١١٧. نسائي. غسل المنى من الثوب: ٢٩٤.

(١٣) مسلم. طهارة: ٦٦٧. نسائي. فرك المنى: ٢٩٦ ، ٢٩٧ ، ٢٩٨. أبو داود. المني يصيب الثوب: ٣٧١.

(١٤) بخاري. وضوء: ٢٣٥ ، ٢٣٦ ، ٥٥٣٨ ، ٥٥٣٩.

واتــە: مەیموونــە (خـوای لێ رازی بێ) گـوتی: مـشکێ دەکەوێتــە نـاو رۆنــی مەییوەوە بۆ ئەمە لە پێغەمبەریان پرسیارکرد، فەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ): مــشکە تۆپیوەکــەو دەورو بەرەکــەی فــڕێ دەن‌و رۆنــی خۆتــان بخــۆن، لــە گێڕانەوەیـەکا: ئەگـەر مـشك کەوتـە نـاو رۆنـەوە تەماشـاکەن: ئەگـەر رۆنەکـە مـەییوبوو مـشکەکەو دەوروبەرەکـەی فڕێ دەن، بـەڵام ئەگـەر رۆنەکـە شل بـوو توخنی مەکەون (ب/د/ت/ن).

١٧٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: إِذَا وَقَـعَ الذُّبَابُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ، فَلْيَغْمِسْهُ كُلَّهُ، ثُمَّ لْيَطْرَحْهُ، فَإِنَّ فِي أَحَدِ جَنَاحَيْهِ شِفَاءً وَفِي الآخَرِ دَاءً. رَوَاهُ البخاري وأبو داود وزاد: وإِنَّهُ يَتَّقِي بِجَنَاحِهِ الَّذي فِيهِ الَّداءُ[١٥].

واتە: ئـەبو هـورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) دەفەرموێ: ئەگـەر مێش کەوتـە نـاو حاجەتێکتانـەوە ئـاو یـا شـتی شـلی تـری تیابوو، لـە پێشا مێشەکە هـەمووی نـوقم بکـەن ئینجـا دەری بێنن‌و فڕێیدەن، چــونکە بــاڵێکی دەرمــانی پــێ وەیــەو ئــەو باڵەکــەی تــری دەرد (ب/د) لــە گێڕانەوەی ئەبو داوودا ئەمەشی پترە: وە بەو باڵـەیانی کە دەردەکـەی پێوەیـە خـۆی دەپـارێزێ‌و پاسـی خـۆی پـێ دەکـا تـا نەکـەوێ، جـا کاتـێ دەکـەوێ لـە پێشا ئەو باڵەی دەکەوێتە ناو قاپەکەوە.

١٧٨- وَجَاءَتِ امْرَأَةٌ تَسْأَلُ أُمَّ سَلَمَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَـتْ: إِنِّي امْرَأَةٌ أُطِيلُ ذَيْلِي وَأَمْشِي فِي الْمَكَانِ الْقَذِرِ. فَقَالَتْ: أُمُّ سَلَمَةَ قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُطَهِّرُهُ مَا بَعْدَهُ. رَوَاهُ أبو دَاوُدَ وَمالك والترمذي[١٦].

واتــە: ئافرەتـێ هـات لـە ئـوم سـەلەمەی هاوسـەری پێغەمبـەری پرسـی، گـوتی: مـن ئـافرەتم‌و داوێـنم درێـژە، کـە لـە شـوێنی چـەپەڵەوە دەڕۆم داوێـنم دەخـشێ لـەزەوی‌و پـیس دەبـێ؟ ئـوم سـەلەمە گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـوای

---

(١٥) بخاري. بدء الخلق: ٣٣٢٠ ، ٥٧٨٢.

(١٦) رواه الترمذي بسند صالح ومالك بسند صحيح (شرحه).

لەسەربێ) فەرموویەتی: لەوە دوا کە خشایەوە لەزەوی پاك ئەوە پاکی دەکاتەوە (د/مالك–س/ص–ت– سند صالح).

١٧٩– وَقَالَتْ أمْرَأَةٍ مِنْ بَنِي عَبْدِ الأَشْهَلِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إنَّ لَنَا طَرِيقًا إلَى الْمَسْجِدِ مُنْتِنَةً فَكَيْفَ نَفْعَلُ إذَا مُطِرْنَا؟ قَالَ: أَلَيْسَ بَعْدَهَا طَرِيقٌ هِيَ أَطْيَبُ مِنْهَا قَالَتْ قُلْتُ: بَلَى قالَ: فَهَذِهِ بِهَذِهِ[١٧].

واتە: ئافرەتێکی بەنی ئەشهەلی گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! رێگەی مزگەوتەکەمان بۆگەنە، کە باران باری چی بکەین؟ فەرمووی: ئایا لە دوای ئەوەوە رێگەی لەو پاکترنییە؟ گوتی: با هەیە، فەرمووی: دەئەو پاکە ئەوی تر پاك دەکاتەوە(د).

١٨٠– عَنْ أَبِي هَرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إذَا وَطِيءَ أحَدُكُمْ بَنعْلِهِ ألأَذَى فَإِنَّ ألتُّرَابَ لَهُ طَهُورٌ. وَفِي رِوَايَةٍ: إذَا وَطِيءَ ألأذى بِخُفَّيهِ فَطَهُورُهُمَا التُّرَابُ[١٨].

واتە: ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر بە پێڵاوەوە پێتان نا لە پیسی. لە پاشا بەسەر خاکی پاکا رۆیشتن ئیتر پێڵاوەکانتان پاك دەبێتەوە لە گێرانەوەیەکا: ئەگەر بەپێڵاوەوە پێی نا لە پیسی خاك پاکی دەکاتەوە (د–س/ص).

١٨١– عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ إلَى الْمَسْجِدِ فَلْيَنْظُرْ فَإِنْ رَأَى فِي نَعْلَيْهِ قَذَرًا أَوْ أَذًى فَلْيَمْسَحْهُ وَلْيُصَلِّ فِيهِمَا. رَوى الثلاثة أبو داود[١٩].

واتە: ئەبو سەعید گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: کە دەچن بۆ مزگەوت تەماشا بکەن: ئەگەر پیسیو ئازار بە کەوشەکانتانەوە هەبوو بیان سڕن بەزەویو ئیتر نوێژیان پێوە بکەن (د–س/ص).

---

(١٧) سکت الشارح عن بيان درجته (مترجم).

(١٨) رواه أبو داود بسند صحيح (شرحه).

(١٩) رواه أبو داود بسند صحيح ،شرحه).

## ٤) باسی چوارەم: باسی تاراتگرتن (ئەم باسە دوو بەشە):

## بەشی یەكەم: دەستووری سەراو

## الباب الرابع: في الاستنجاء وفيه فصلان:

### الأول: في آداب الخلاء

١٨٢- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ إِذَا ذَهَبَ الْمَذْهَبَ أَبْعَدَ. رَوَاهُ أصحاب السنن[1].

واتە: موغیرەی كوڕی شوعبە گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) كە دەچوو بۆ سەراو تەواو دوور دەكەوتەوە لە خەڵك (د/ت/ن).

١٨٣- وَلِأَبِي دَاوُدَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا أَرَادَ الْبَرَازَ انْطَلَقَ حَتَّى لا يَراهُ أَحَدٌ[2].

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) كە دەیویست دەست بەئاو بگەیەنێ ئەوەندە دوور دەكەوتەوە تا لەبەر چاو گوم دەبوو! (د).

١٨٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَرْدَفَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَاتَ يَوْمٍ خَلْفَهُ فَأَسَرَّ إِلَيَّ حَدِيثًا لاَ أُحَدِّثُ بِهِ أَحَدًا مِنَ النَّاسِ وَكَانَ أَحَبُّ مَا اسْتَتَرَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِحَاجَتِهِ هَدَفٌ أَوْ حَائِشُ نَخْلٍ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ[3].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی جەعفەر گوتی: ڕۆژێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە پاشكۆی خۆیا سواری كردمو فەرمایشتێكی بە پەنهانی پێ فەرمووم بۆ كەسی ناگێڕمەوە، وە باشترین شتێكیش كە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بۆ سەراو خۆی لەپاڵدا حەشاربدایە بارستاییو بەرزاییو شوورەی باخە خورما بوو (م).

١٨٥- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا دَخَلَ الْخَلاَءَ نَزَعَ خَتَمِهُ. رَوَاهُ أبو داود والترمذي وَحَسَّنَهُ[4].

---

(١) بسند صحيح (شه = شرحه).

(٢) رواه أبو داود (شه = شرحه).

(٣) مسلم. طهارة: ٧٧٢.

(٤) حسنه الترمذي (مترجم).

**واته: ئەنەس گوتی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **کاتێ دەرۆیشتە ئاو ئاو دەستەوە ئەنگوستیلەکەی دادەکەند چونکە مۆری (محمد رسول الله)ی لێ هەڵکەندرابوو** (د/ت:ح/ح).

١٨٦- وَعَنْهُ قالَ: كَنَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا دَخَلَ الْخَلاَءَ قالَ: اللّٰهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبْثِ وَالْخَبَائِثِ[٥].

**واته: دیسان ئەنەس** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **کە دەیویست بچێتە ناو ئاودەستەوە دەیفەرموو:**

اَللّٰهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبْثِ وَالْخَبَائِثِ :

**ئەی خودایە! پەنا دەگرم بەتۆ لەگوڵو دێڵی شەیتانی چەپەڵ** (ش/د/ت/ن).

١٨٧- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: سَتْرُ مَا بَيْنَ أَعْيُنِ الْجِنِّ وَعَوْرَاتِ بَنِي آدَمَ إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْخَلاَءَ أَنْ يَقُولَ بِسْمِ اللّٰهِ. رَوَاهُ الترميذي وأحمد وحسّنه[٦].

**واته: عەلی** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **دەفەرموێ: پەردەیێ کە بەری چاوی جنۆکەو شەیاتینی بگرێو نەیەڵێ شەرمگا (عەورەت)ی ئادەمیزاد ببینن لەکاتی چوونە ناو ئاودەستا ئەوەیە کە بڵێ: (باسم الله): بەناوی خودا** (ت/ئەحمەد:ح/ح).

١٨٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا أَرَادَ حَاجَةً لاَ يَرْفَعُ ثَوْبَهُ حَتَّى يَدْنُوَ مِنَ الأَرْضِ. رَوَاهُأَبُو دَاوُدَ وَالتِّرْمِذِيُّ[٧].

**ئیبنو عومەر** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **کە دەیویست دەست بەئاو بگەیەنێ هەتا تەواو لە زەوی نزیک نەبوایەتەوە جلەکانی هەڵ نەدەماڵی** (د/ت – سند ضعيف).

---

(٥) بخاري. وضوء : ١٤٢ ، ٦٣٢٢. مسلم. حيض: ٨٢٩ ، ٨٣٠ ترمذي. إذا دخل الخلاء. أبو داود. إذا دخل الخلاء: ٦. نسائ. عند دخول الخلاء: ١٩.

(٦) حسنه أحمد.

(٧) حديث ضعيف (شرحه).

**١٨٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَخْرُجُ الرَّجُلاَنِ يَضْرِبَانِ الْغَائِطَ كَاشِفَيْنِ عَنْ عَوْرَتِهِمَا يَتَحَدَّثَانِ فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَمْقُتُ عَلَى ذَلِكَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[٨].**

**واتە: ئەبو سەعید** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: نابێ دوو کەس بەیەکەوە بچن بۆ سەرپێشاوو شەرمیان هەڵماڵن و دەست بکەن بە قسەکردن، چونکە خودای گەورەو مەزن رقی لەشتی وا دەبێتەوە (د- سند ضعيف).**

**١٩٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَرَّ رَجُلٌ عَلَى النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ يَبُولُ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ[٩].**

**واتە: ئیبنو عومەر** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: جارێ پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **گمیزی دەکرد پیاوێ لەلایەوە رابوورد، سلاوی لێکرد، پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **وەلامی نەسەندەوە (ش/د/ت/ن).**

**١٩١- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا أَتَى أَحَدُكُمُ الْغَائِطَ فَلاَ يَسْتَقْبِلِ الْقِبْلَةَ وَلاَ يُوَلِّهَا ظَهْرَهُ، شَرِّقُوا أَوْ غَرِّبُوا[١٠].**

**واتە: ئەبو ئەیوبی ئەنصاری** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **دەیفەرموو: کە دەچنە سەرپێشاو نەڕوو بکەنە رووگە (قیبلە)و نەپشتی تێ بکەن، بەلام رووبکەنە ئەم لاو ئەولا (ش/د/ت/ن).**

**١٩٢- عَنْ أبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: ارْتَقَيْتُ فَوْقَ بَيْتِ حَفْصَةَ لِبَعْضِ حَاجَتِي، فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْضِي حَاجَتَهُ مُسْتَدْبِرَ الْقِبْلَةِ مُسْتَقْبِلَ الشَّأْمِ. وَفِي رَوَايَة: قَاعِداً عَلَى لِبَنَتَيْنِ[١١].**

---

(٨) حديث ضعيف (شرحه).

(٩) بخاري. تيمم: ٣٣٧. مسلم. تيمم: ٨٢٠ ، ٨٢١.

(١٠) بخاري. وضوء: ١٤٤ ، ٣٩٤. مسلم. طهارة: ٦٠٨ ، ٦٠٩. أبو داود. استقبال القبلة عند قضاء الحاجه: ٩. ترمذي. نهى عن استقبال القبلة: ٨. نسائي. نهى استدبار القبلة: ٢١.

(١١) بخاري. وضوء: ١٤٥ ، ١٤٨ ، ١٤٩ ، ٣١٠٢. مسلم. طهارة ٦١٠ ، ٦١١.

**واتــە: ئیبنــو عومــەر (خوای لێ رازی بێ) گــوتی: ئیـشم هــەبوو چــوومە ســەر سەربانەكەی حەفسەی خوشكم كە ژنی پێغەمبەر بوو، پێغەمبەرم دی خـەریك بــوو روو بەشــام دەســتی بــەئاو دەگەیانــد وە پــشتی كردبــوە رووگــە، لــە گێڕانەوەیــەكا: لەســەر دووخــشتی كــاڵ دانیــشتبوو ســەراوی دەكــرد (ش/د/ت/ن).**

**١٩٣- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سُبَاطَةَ قَوْمٍ فَبَالَ قَائِمًا، ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ، فَجِئْتُهُ بِهِ فَتَوَضَّأَ[١٢].**

**واتە: حوزەیفە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) چووە سەر سەرانگۆێلكی هۆزێ، لەوێ بەپێوە گمێزی كرد، ئینجا داوای ئاوی كرد، منیش ئاوم بۆبرد، دەسنوێژی پێ گرت (ش/د/ت/ن).**

**١٩٤- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا بَالَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَأْخُذَنَّ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ، وَلاَ يَسْتَنْجِ بِيَمِينِهِ، وَلاَ يَتَنَفَّسْ فِي الإِنَاءِ. رَوَى هَذِهِ الخمسة الأصول الخمسة[١٣].**

**واتــە: ئــەبو قــەتادە (خوای لێ رازی بێ) گــوتی: پێغەمبــەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەیفەرموو: كەمیز دەكەن بەدەستی راستتان چووكتان مەگرن، تاراتیش بە دەســتی راســتتان مــەگرن، لــەجامی ئــاو خواردنەوەشــدا لــەكاتی ئــاو خواردنەوەدا هەناسە مەدەن (ش/د/ت/ن).**

**١٩٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اتَّقُوا اللاَّعِنَيْنِ قَالُوا: وَمَا اللاَّعِنَانِ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: الَّذِي يَتَخَلَّى فِي طَرِيقِ النَّاسِ أَوْ ظِلِّهِمْ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَمُسْلِمٌ[١٤].**

---

(١٢) بخاري. وضوء: ٢٢٤ ، ٢٢٥ ، ٢٢٦ ، ٢٤٧١. مسلم. طهارة: ٦٢٣ ، ٦٢٤. أبو داود. البول قائماً: ٢٣. ترمذي. رخصة في ذلك: ١٣. نسائ. رخصة في البول في الصحراء: ٢٦ ، ٢٧ ، ٢٨.

(١٣) بخاري. وضوء: ١٥٣ ، ٥٦٣٠ ، ١٥٤. مسلم. طهارة: ٦١٢ ، ٦١٣.

(١٤) مسلم. طهارة: ٦١٧. أبو داود. المواضع التي نهى النبيَ عن البول فيها: ٢٥.

**واتە: ئەبو هورەیرە** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **دەفەرموێ: خۆتان بپارێزن لەو دوو شتە ناشرینە کە دەبن بەهۆی ئەوە خەڵکی نەفرین‌و لەعنەتتان لێبکەن گوتیان ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو دوو شتەیە چی‌و چین؟ فەرمووی: یەك سەراوکردن لە سەرەڕێدا، یەك سەراوکردن لە سێبەری جێگە دانیشتنی مەردوومدا (د/م).**

**١٩٦- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: اتَّقُوا الْمَلاَعِنَ الثَّلاَثَةَ: الْبَرَازَ فِي الْمَوَارِدِ وَقَارِعَةِ الطَّرِيقِ وَالظِّلِّ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ**[١٥].

**واتە: موعاذی کوڕی جەبەل** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: خۆتان بپارێزن لەم سێ شتە کە دەبن بەهۆی لەعنەت‌و نەفرەت:**

**یەکەم: لە سەراوکردن لە قەراخ ئاوی خواردنەوەدا.**

**دووەم: لە سەراوکردن لە سەرەڕێدا.**

**سێیەم: لە سەراوکردن لە سێبەری دانیشتندا. (د).**

**١٩٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَرْجِسَ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **أَنَّ النَّبِيَّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **نَهَى أَنْ يُبَالَ فِي الْجُحْرِ. قَالُوا لِقَتَادَةَ: مَا يُكْرَهُ مِنَ الْبَوْلِ فِي الْجُحْرِ؟ قَالَ: كَانَ يُقَالُ: إِنَّهَا مَسَاكِنُ الْجِنِّ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَالنَسائِي**[١٦].

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سەرجیس** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **قەدەغەی کردووە کە گمێز بکرێتە ناو کونەوە، گوتیان بە قەتادە: بۆچی باش نیە کە گمێز بکرێتە ناو کونەوە؟ گوتی: دەڵێن: جێگەو لانەی جنۆکەیە (ن/د).**

**١٩٨- وَلأَبِي دَاوُدَ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **إِذَا أَرَادَ أَحَدُكُمْ أَنْ يَبُولَ فَلْيَرْتَدْ لِبَوْلِهِ مَوْضِعًا**[١٧].

---

(١٥) مؤيل بالصحيح (شرحه).

(١٦) لم يذكروا نسبته، ولكنه فى باب الترهيب (شرحه).

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: کاتێ دەتانەوێ گمێز بکەن جێگەیێ بدۆزنەوە کە دەست بدا بۆ میز لێکردن! (د).

١٩٩- عَنْ أُمَيْمَةَ بِنْتِ رُقَيْقَةَ قَالَتْ: كَانَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَدَحٌ مِنْ عِيْدَانٍ تَحْتَ سَرِيرِهِ يَبُولُ فِيهِ بِاللَّيْلِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَالنَسائِي(١٨).

واتە: ئومەیمەی کچی روقیقە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کۆتکە دار خورمایەکی هەبوو لەژێر چارپاکەیدا دایدەنا، بەشەو میزی تێ دەکرد. (د/ن).

٢٠٠- عَنْ عَائِشَةُ (رَضيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا خَرَجَ مِنَ الْخَلاءِ قَالَ: غُفْرَانَكَ. رَوَاهُ أصحاب السنن(١٩).

واتە: عائیشە گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کە لەئاو دەست دەهاتە دەرەوە دەیفەرموو: (غُفْرَانَكَ): ئەی خودایە! داوای لێبووردنت لێ دەکەم کە ئەم ماوە دوورو درێژە لەیادو ذیکری تۆ دوور کەوتمەوە (د/ت/ن).

## ٢٥) بەشی دووەم: تاراتگرتن (استنجاء - خۆپاککردنەوە):
## الفصل الثاني: في الاستنجاء

٢٠١- عَنْ أَنسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا خَرَجَ لِحَاجَتِهِ أَجِيءُ أَنَا وَغُلاَمٌ مَعَنَا إِدَاوَةٌ مِنْ مَاءٍ. يَعْنِي يَسْتَنْجِي بِهِ. رَوَاهُ الْخِمْسَة ولفظ مُسْلِم: كَانَ رَسَوُلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَدْخُلُ الْخَلاَءَ، فَأَحْمِلُ أَنَا وَغُلاَمٌ إِدَاوَةً مِنْ مَاءٍ، وَعَنَزَةً، فَيَسْتَنْجِي بِالْمَاءِ(١).

---

(١٧) لم يذكر الشارح نسبته (مترجم).

(١٨) لم يذكر الشارح نسبته (مترجم).

(١٩) بسند حسن (شرحه).

(١) بخاري. وضوء: ١٥٠ ، ١٥١ ، ١٥٢ ، ٢١٧، ٥٠٠. مسلم. طهارة: ٦١٨ ، ٦١٩. أبو داود. بالماء: ٤٣. نسائي. الاستنجاء بالماء: ٤٥.

**واتـه: ئەنـەس** (خوای لێ رازی بێ) **گـوتی: پێغەمبـەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **کـه دەچوو بۆ سەراو منو کوڕێکی تر جەوەندەیێ ئاومان هەڵدەگرتو شوێنی دەکەوتین، واتـه: بـەو ئاوه تاراتی پـێ دەگرت (ش/د/ت/ن) گفتەی موسلیم ئاوایە: منو کوڕێکی تر لـه سێرەی مندا کـه پێغەمبـەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **دەچوو بۆ سەراو جەوەندەیێ ئاومان بۆی دەبرد، بەو ئاوه تاراتی دەگرت، وه نەقیزەیەکیشمان لەگەڵ خۆمان دەبرد پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **دایدەچەقاندو دەیکرد بە بەردەم (سوتره) لەکاتی نوێژدا.**

**٢٠٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قالَ: اتَّبَعْتُ النَّبِيَّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **وَخَرَجَ لِحَاجَتِـهِ، فَكَانَ لاَ يَلْتَفِتُ فَدَنَوْتُ مِنْهُ فَقَالَ: ابْغِنِي أَحْجَارًا أَسْتَنْفِضْ بِهَا - أَوْ نَحْوَهُ - وَلاَ تَأْتِنِي بِعَظْمٍ وَلاَ رَوْثٍ فَأَتَيْتُهُ بِأَحْجَارٍ بِطَرَفِ ثِيَابِي فَوَضَعْتُهَا إِلَى جَنْبِهِ وَأَعْرَضْتُ عَنْهُ، فَلَمَّا قَضَى أَتْبَعَهُ بِهِنَّ. رَوَاهُ الْبُخاري**(٢).

**واته: ئەبو هورەیره** (خوای لێ رازی بێ) **گـوتی: پێغەمبـەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **رۆیشت بۆ سەراو منیش دوای کوتم، دەستووری وا بوو ئاوڕی نەدەدایەوە، جا که لێی نزیك بوومەوە فەرمووی: چەن بەردێکم بۆ پەیدا که خۆمیان پـێ پـاك دەکەمـەوە یـا قـسەیەکی ئـاوای فـەرموو: فەرمووشـی: بـەڵام ئێسقانو تەپاڵـەم بۆ مەهێنە منیش لـه داوێنـی جلەکانما چـەن بـەردێکم بـۆی بـردو لـه تەنیشتییەوە دامنانو پشتم تێکرد، کاتێ سەراوەکەی تەواوکرد خۆی بە بەردەکان سڕی (ب).**

**٢٠٣- عَنْ سَلْمَانَ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **قِيلَ لَهُ: قَدْ عَلَّمَكُمْ نَبِيُّكُمْ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **كُلَّ شَيْءٍ حَتَّى الْخِرَاءَةَ. فَقَالَ: أَجَلْ لَقَدْ نَهَانَا أَنْ نَسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةَ لِغَائِطٍ أَوْ بَوْلٍ أَوْ أَنْ نَسْتَنْجِيَ بِالْيَمِينِ أَوْ أَنْ نَسْتَنْجِيَ بِأَقَلَّ مِنْ ثَلاَثَةِ أَحْجَارٍ أَوْ أَنْ نَسْتَنْجِيَ بِرَجِيعٍ أَوْ بِعَظْمٍ. رَوَاهُ الْخَمْسَة إِلا الْبُخاري**(٣).

---

(٢) بخاري. وضوء: ١٥٥ ، ٣٨٦٠.

(٣) مسلم. الاستطابه: ٦٠٥ ، أبو داود ، كراهة استقبال القبلة عند قضاء الحاجة: ٧. ترمذي. استنجاء: ١٦.

**واته: گوتیان بە سەلمان** (خوای لێ ڕازی بێ)**: ئەم پێغەمبەرەی ئێوە هەموو شتێکتان فێردەکا، تەنانەت دەستووری سەراویشتان فێردەکا! سەلمانیش گوتی: بەڵێ وایە، ئەوەتانێ یاساخی کردووە لێمان کە لەکاتی پیساییو میزکردندا ڕوو بکەینە ڕووگە، یا بەدەستی ڕاست تارات بگرین، یا بەسێ بەرد کەمتر خۆمان پاك بکەینەوە یا بە تەپاڵەو تەرسو ئێسقانو شتی وا، خۆمان پاك بکەینەوە (م/د/ت/ن).**

**٢٠٤- وَللتِرْمِذِي: لاَ تَسْتَنْجُوا بِالرَّوْثِ وَلاَ بِالْعِظَامِ فَإِنَّهُ زَادُ إِخْوَانِكُمْ مِنَ الْجِنِّ[٤].**

**واته: حەزرەت** (درودی خوای لەسەربێ) **دەفەرموێ: بە تەپاڵەو تەرسو بە ئێسقان خۆتان پاك مەکەنەوە، چونکە ئەوانە تۆشەی جنۆکەکانی براتانن (ت).**

**٢٠٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قالَ: مَنْ تَوَضَّأَ فَلْيَسْتَنْثِرْ وَمَنْ اسْتَجْمَرَ فَلْيُوتِرْ. رَوَاهُ الْخَمْسَةَ إِلاَّ أبا دَاوُدَ[٥].**

**واته: ئەبو هورەیرە** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: هەرکەسێ دەسنوێژ دەگرێ باهنگ بکاو ئاو لەلووتی ڕابدا وە هەر کەسێ بە بەرد یا بەشتی وا تارات دەگرێ با بەچەن بەردێکی تاك خۆی پاك بکاتەوە (ش/ت/ن).**

**٢٠٦- وَلأَبِي دَاوُدَ: مَنِ اكْتَحَلَ فَلْيُوتِرْ، مَنْ فَعَلَ فَقَدْ أَحْسَنَ وَمَنْ لاَ فَلاَ حَرَجَ وَمَنِ اسْتَجْمَرَ فَلْيُوتِرْ، مَنْ فَعَلَ فقَدْ أَحْسَنَ وَمَنْ لاَ فَلاَ حَرَجَ وَمَنْ أَكَلَ فَمَا تَخَلَّلَ فَلْيَلْفِظْ وَمَا لاَكَ بِلِسَانِهِ فَلْيَبْتَلِعْ مَنْ فَعَلَ فَقَدْ أَحْسَنَ وَمَنْ لاَ فَلاَ حَرَجَ وَمَنْ أَتَى الْغَائِطَ فَلْيَسْتَتِرْ فَإِنْ لَمْ يَجِدْ إِلاَّ أَنْ يَجْمَعَ كَثِيبًا مِنْ رَمْلٍ فَلْيَسْتَدْبِرْهُ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَلْعَبُ بِمَقَاعِدِ بَنِي آدَمَ مَنْ فَعَلَ فَقَدْ أَحْسَنَ وَمَنْ لاَ فَلاَ حَرَجَ[٦].**

---

(٤) لم يذكر الشارح نسبته (مترجم).

(٥) بخاري. وضوء : ١٦١ ، ١٦٢. مسلم. طهارة: ٥٦١.

(٦) رواه أبو داود وابن ماجه (شرحه).

واته: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەوەی چاو دەرێژێ با بە تاك بیرێژێ واته: ژمارەی ئەو جارانەی کە کلچێوکەکە دەهێنێ بەهەر چاوێکیا باتاك بێ، ئەوەی وا دەکا ئەوە زۆر باش دەکا وە ئەوەشی وا نەکا قەیناکا، ئەوەی تارات دەگرێ بە بەرد بابەچەن بەردێکی تاك خۆی پاك بکاتەوە، ئەوەی وا دەکا ئەوە زۆر باش دەکا وە ئەوەشی وا نەکا قەیناکا، ئەوەی شت دەخوا هەرچی بە چوکڵە دەیئاژێنێتەوەو دەری دێنێ لەبن ددانەکانی با بیتفێنێتەوە، هەرچیش بەزمان دەری دێنێ و بەزمان دەیچنێتەوە با قووتی بداو بیخوا، ئەوەی وا دەکا زۆر باش دەکا وە ئەوەشی وا نەکا قەیناکا، ئەوەی دەچێت بۆ سەر پێشاو با خۆی لە پاڵ شتێکا حەشار بدا، ئەگەر هەر هیچ نەبوو با کۆمەڵێ لم کۆ بکاتەوەو پشتی تێ بکا، چونکە شەیتان وازی دەکا بە پاشەڵی ئادەمیزاد ئەوەی وا دەکا باش دەکا وە ئەوەشی نەیکا قەیناکا (د).

## ٢٦) باسی پێنجەم: باسی دەسنوێژ (سێ بەشە):

### بەشی یەکەم: هۆکانی بێ دەسنوێژیی

## الباب الخامس: في الوضوء وفيه ثلاثة فصول

### الفصل الأول في أسباب الحدث

قَالَ اللهُ جَلَّ شَأْنُهُ: { أَوْ جَاء أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ الْغَائِطِ أَوْ لاَمَسْتُمُ النِّسَاء – ٥/٦}.

خودای گەورەو شکۆمەند دەفەرموێ: وە یاخود یەکێ لە ئێوە لەسەر ئاو هاتەوەو بێ دەسنوێژبوو، یاخود دەست یا پێستتان کەوت لە دەست یا لە پێستی ژنانو بێ دەسنوێژبوون، وە یاخود دروست بوون لەگەڵیان، وە لەم حاڵەتانەدا ئاوتان دەست نەکەوت بۆ دەسنوێژ گرتن یا بۆ لەشپیسی دەرکردن ئەوە لە هەموو ئەم شێوانەدا بەگڵێکی پاك تەیەموم بکەن.

٢٠٧– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تُقْبَلُ صَلاَةُ مَنْ أَحْدَثَ حَتَّى يَتَوَضَّأَ. رَوَاهُ الأربعة وَزاد البخاري: قَالَ: رَجُلٌ مِنْ

حَضْرَمَوْتَ: مَا الْحَدَثُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ؟ قالَ: فُسَاءٌ أَوْ ضُرَاطٌ. وفي رواية: لا تُقْبَلُ صَلاةٌ بِغَيْرِ طُهُورٍ وَلاَ صَدَقَة مِنْ غُلُولٍ[١].

**واتە: ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ دەسنوێژی شکا تا دەسنوێژ نەگرێتەوە نوێژی دروست نیە (ش/د/ت) ئیمامی بوخاری (پڕ گۆڕەکەی لە نووربێ) ئەمەی زیاتر کردووە: پیاوێکی حەزرەمەوتیش گوتی: ئەی ئەبو هورەیرە! دەسنوێژ بەچی دەشکێ؟ گوتی: بە لێبوونەوەی تڕو تسو شتی وا، لە گێڕانەوەیەکا: نە نوێژ بەبێ دەسنوێژو پاکی گیرا دەبێو نە خێر لە گزیو دزی گیرا دەبێ.**

٢٠٨- عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ عَنْ عَمِّهِ أَنَّهُ شَكَى إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الرَّجُلُ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ يَجِدُ الشَّيْءَ فِي الصَّلاَةِ. قالَ: لاَ يَنْصَرِفْ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتًا أَوْ يَجِدَ رِيحًا. وفي رواية: إِذَا وَجَدَ أَحَدُكُمْ فِي بَطْنِهِ شَيْئًا فَأَشْكَلَ عَلَيْهِ أَخَرَجَ مِنْهُ شَيْءٌ أَمْ لاَ فَلاَ يَخْرُجَنَّ مِنَ الْمَسْجِدِ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتًا أَوْ يَجِدَ رِيحًا. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ[٢].

**واتە: عەببادی کوڕی تەمیم گوتی: مامەم گوتی: لەلای حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) سکالایان کرد گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! پیاوی وا هەیە لەناو نوێژدا بە خەیاڵ وا هەست دەکا کە هەست بەشتێ دەکا وەك بایێ، نەڕاییی یەك ئەمە چاری چیە؟ فەرمووی: نوێژەکەی نەبڕێ هەتا دەنگێ دەبیستێ یا هەست بە بۆنێ دەکا! لە گێڕانەوەیەکا: ئەگەر هەستتان بە شتێ کرد لەسکتانا وەبوو بەگرێ لە دڵتانا: ئایا بایەکتان لێ بەربووەتەوە یانا، ئەوە نوێژەکەتان مەبڕن تا دەنگێ نەبیستن یا بۆنێ نەکەن (ش/د/ت/ن).**

٢٠٩- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: وِكَاءُ السَّهِ الْعَيْنَانِ فَمَنْ نَامَ فَلْيَتَوَضَّأْ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَإِبن ماجه[٣].

---

(١) بخاري. وضوء: ١٣٥ ، ٦٩٥٤. مسلم. طهارة: ٥٣٥ ، ٥٣٤.

(٢) بخاري. وضوء: ١٣٧ ، ١٧٧ ، ٢٠٥٦. مسلم. طهارة: ٨٠٢ ، ٨٠٣. أبو داود.: إذا شك في الحدث: ١٧٦. نسائي. وضوء من الريح: ١٦٠.

(٣) بسند ضعيف (شرحه).

**واتـە: ئیمـامی عـەلی** (خـوای لێ ڕازی بێ) **لـە پێغەمبـەرەوە** (دروودی خوای لەسەربێ) **دەفەرموێ: چاو دەمبێنی کۆمە، جا لەبەر ئەمە ئەگەر کەسێ خەوت کاتێ کە هەڵ دەسێ با دەسنوێژ بگرێ (د– سند ضعيف – ئیبنو ماجە).**

**٢١٠– عَنْ أَنَسٍ قالَ: كَانَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **يَنَامُونَ ثُمَّ يُصَلُّونَ وَلاَ يَتَوَضَّئُونَ. رَوَاهُ مُسْلِم وَأَبُو دَاوُدَ وَالتِّرْمِذِيُّ(٤).**

**واتە: ئەنەس** (خوای لێ ڕازی بێ) **گـوتی: یارانی پێغەمبـەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **جاران دەشخەوتن کە هەڵدەستان – بەبێ ئەوە کە دەسنوێژ تازە بکەنەوە – نوێژیان دەکرد.** (م/د/ت).

**٢١١– عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **عَـنِ النَّبِـيِّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَـالَ: إِنَّ الْوُضُوءَ لاَ يَجِبُ إِلاَّ عَلَى مَنْ نَامَ مُضْطَجِعًا فَإِنَّهُ إِذَا اضْطَجَعَ اسْتَرْخَتْ مَفَاصِلُهُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَالتِّرْمِذِي(٥).**

**واتە: ئیبنو عەباس** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **لە سـەجدەدا خـەوی لێکـەوت بـەرەنگێکی وا دەسـتیکرد بـە پرخـەپرخ، ئینجـا هەڵساو نوێژەکەی تەواوکرد، منیش پێم گوت: خۆ تۆ خـەوتبوویت؟ ئـەویش فـەرمووی: دەسـنوێژ تازەکردنـەوە بـەس لەسـەر ئەوانـە پێویـستە کـە پـاڵ دەکەونو دەخەون، چونکە ئەوانە کەپاڵ دەکەون جومگـەکانیان خاودەبنـەوە، جـا لـەم حاڵـەدا دوور نیـە کـە شـتێ لـە (دووڕا: سـەبیلەینەوە دەربـچێ). (د/ت – سند مستقيم).**

**٢١٢– عِنْ بُسْرَةَ بْنْتِ صَفْوَانَ عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَـالَ: مَـنْ مَـسَّ ذَكَرَهُ فَلاَ يُصَلِّ حَتىّ يَتَوَضَّأَ. رَوَاهُ أصحاب السنن(٦).**

---

(٤) مسلم. طهارة: ٨٣٣. ترمذي. الوضوء من النوم: ٧٨.

(٥) بسند مستقيم (شرحه).

(٦) بسند صحيح (شرحه).

واتــە: بوسـرەی کـچی صـەفوان گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) دەفـەرموێ: هەرکەسـێ دەسـتیدا لـە چووکی خـۆی بانوێـژ نـەکا تـا دەسـنوێژ نەگرێ (د/ت/ن–س/ص).

٢١٣– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا أَفْضَى أَحَدُكُمْ بِيَدِهِ إِلَى فَرْجِهِ وَلَيْسَ بَيْنَهُمَا سِتْرٌ وَلاَ حَائِلٌ فَلْيَتَوَضَّأْ. رَوَاهُ الإمام الـشافعي والحاكم وأحمد[٧].

واتە: ئـەبو هـورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفـەرموێ: هـەر کامێکتـان بـەبێ پـەردە یـا بـەبێ دەسـتپێچ دەسـتی بـدا لـە شـەرمگای خـۆی واتـە: لـەپاش و پێـشی خـۆی بـا دەسـنوێژ بگرێتـەوە (شافیعی/حاکم/ئەحمەد).

٢١٤– عَنْ طَلْقِ بْنِ عَلِيٍّ قالَ: قَدِمْنَا عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَجَاءَ رَجُلٌ كَأَنَّهُ بَدَوِيٌّ فَقالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ مَا تَرَى فِي مَسِّ الرَّجُلِ ذَكَرَهُ بَعْدَ مَا يَتَوَضَّأُ؟ فَقـالَ: هَلْ هُوَ إِلاَّ مُضْغَةٌ مِنْهُ أَوْ بَضْعَةٌ مِنْهُ. رَوَاهُ أصحاب السنن[٨].

واتــە: تـەڵقی کـوڕی عـەلی (خـوای لێ رازی بـێ) گـوتی: چـووین بـۆ خزمـەتی حـەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) پیـاوێکیش هـات وەك دەشـتەکی وابـوو، گـوتی: ئـەی رەهبـەری خـودا! پیـاو بـە دەسـنوێژەوە دەسـتی لـە چووکی بکـەوێ ئایـا دەسـنوێژەکەی دەشـکێ یانـا؟ فـەرمووی: نـەخێر، چـونکە ئـەویش پارچـە گۆشـتێکە لـە خـۆی یـا فـەرمووی: (خـەیر چـونکە چووکیـشی پارچـەیەکە لـە خۆی (وەك دەستی یا قاچی یا پەنجەی)) (د/ت/ن–س/ص).

٢١٥– عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَبَّلَ امْرَأَةً مِنْ نِسَائِهِ ثُمَّ خَـرَجَ إِلَى الصَّلاَةِ وَلَمْ يَتَوَضَّأْ. قَالَ: عُرْوَةُ فَقُلْتُ لَهَا: مَنْ هِيَ إِلاَّ أَنْـتِ فَـضَحِكَتْ. رَوَاهُ دَاوُدَ والترميذي[٩].

---

(٧) بسند صحيح (شرحه).

(٨) بسند صحيح (شرحه).

(٩) لم يذكر الشارح نسبته (مترجم).

**واتە: عائیشە** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **یەكێ لە ژنەكانی خۆیی ماچ كردو رۆیشت نوێژیشی كردو دەسنوێژیشی نەگرتەوە. عوروەی خوشكەزای گوتی: پێم گوت: دیارە ئەو ژنە هەر خۆت بوویت؟ئەویش پێكەنی. (د/ت).**

**٢١٦- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَاءَ فَتَوَضَّأَ فَلَقِيتُ ثَوْبَانَ فِي مَسْجِدِ دِمَشْقَ فَذَكَرْتُ ذلِكَ لَهُ فَقَالَ: صَدَقَ وَأَنَا صَبَبْتُ لَهُ وَضُوءَهُ. رَوَاهُ أصحاب السنن[١٠].**

**واتە: ئەبو دەرداء** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **جارێ رشایەوە لە پاشا دەسنوێژی تازە كردەوە، قسە گێڕەوە (راوی) دەڵێ: جا لە مزگەوتەكەی دیمەشق تووشی ثەوبان بووم ئەم قسەیەم بۆ گێڕایەوە، گوتی: ئەبو دەردا راست دەكا من خۆم ئاوی دەسنوێژەكەم دەكرد بە دەستیا لەو رۆژەدا. (د/ت/ن —س—/ص).**

**٢١٧- عَنْ الْبَرَاءِ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللّٰهِ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **عَنِ الْوُضُوءِ مِنْ لُحُومِ الإِبِلِ فَقَالَ: تَوَضَّئُوا مِنْهَا، وَسُئِلَ عَنِ لُحُومِ الْغَنَمِ فَقَالَ: لاَ تَوَضَّأُوا مِنْهَا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَمُسْلِم وَالتِّرْمِذِيُّ[١١].**

**واتە: بەراء** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: لە پێغەمبەریان پرسی** (دروودی خوای لەسەربێ)**: كەسێ گۆشتی حوشتر بخوا دەسنوێژی لەسەرە؟ فەرمووی: (بەڵێ لەسەریەتی) بەڵام بۆ خواردنی گۆشتی مەڕو بزن لێیان پرسی فەرمووی: (دەسنوێژ ناشكێنێ) (د/م/ت).**

**٢١٨- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: الْوُضُوءُ مِمَّا مَسَّتِ النَّارُ رَوَاهُ الْخَمْسَةَ إِلاَّ الْبُخاري[١٢].**

---

(١٠) بسند صحيح ·شرحه).

(١١) مسلم. طهارة: ٨٠٠ ، ٨٠١.

(١٢) مسلم. طهارة: ٧٨٥ ، ٧٨٦ ، ٧٨٧.

زەیدی کوڕی ثابت (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: خواردنی هەر شتێ کە بەئاگر دروست کرابێ دەسنوێژ پێویست دەکا (م/د/ت/ن).

٢١٩- عَنْ أبْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَكَلَ كَتِفَ شَاةٍ، ثُمَّ صَلّٰى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ. رَوَاهُ الثلاثة[١٣].

ئیبنو عەبباس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) شانی مەڕێکی خوارد، دوای ئەوە نوێژی کردو دەسنوێژیشی تازە نەکردەوە. (ش/د).

٢٢٠- عَنْ جَابِرٍ قالَ: كَانَ آخِرُ الأَمْرَيْنِ مِنْ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَرْكَ الْوُضُوءِ مِمَّا غَيَّرَتِ النَّارُ. رَوَاهُ أبُو دَاوُدَ والنسائي[١٤].

جابیر (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە دواییدا دواکاری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) هاتە سەر ئەوە: وازی لە دەسنوێژگرتن هێنا بۆ خواردنی ئەو خواردەمەنییەی کە بەئاگر پوختە بکرێ! (د/ن).

## ٢٧) بەشی دووەم: دەستوورەکانی دەسنوێژ
## الفصل الثاني: في آداب الوضوء

٢٢١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: إِذَا أَسْتَيْقَظَ اَحَدُكُمْ مِنَ نَوْمِهِ فَلاَ يُدْخِلَ يَدَهُ فِي الإِناءِ، حَتَّى يَغْسِلَهَا ثَلاَثَ مَرَّاتٍ فَإِنَّ أَحَدُكَمْ لاَ يَدْرِى أَيْنَ بَاتَتْ يَدُهُ أَوْ أَيْنَ كَانَتْ تَطُوفُ يَدُهُ. رَوَاهُ الْخَمْسَةَ[١].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ لەخەو هەڵدەستن دەست مەکەن بەناو حاجەتەکەدا لە پێشا

(١٣) بخاري. وضوء: ٢٠٨ ، ٦٧٥ ، ٢٩٢٣ ، ٥٤٠٨ ، ٥٤٢٢ ، ٥٤٦٢. مسلم. حيض: ٧٨٨ ، ٧٨٩. أبو داود. ترك الوضوء ممّا مَست النار: ١٨٧.

(١٤) مؤيد بالذى قبله (كترجم).

(١) بخاري. وضوء: ١٦٢. مسلم. كراهة غمس المتوضئ يده: ٦٤١.

سێ جار لە دەرەوەی حاجەتەكە دەستتان بشۆرن، چونكە ئێوە نازانن دەستتان شەو چی بەسەر هاتووە یا فەرمووی: نازانن دەستتان لەكوێ سووڕاوەتەوە لەوانەیە شەو لەكاتی نووستندا لە زیپكەیێ، لە تەڕاییێ، لە شتێكی پیسی دابێ (ش/د/ت/ن).

٢٢٢- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: لا صَلاةَ لِمَنْ لا وُضُوءَ لَهُ وَلا وُضُوءَ لِمَنْ لَمْ يَذْكُرِ اسْمَ اللهِ عَلَيْهِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَالتِّرْمِذِيُّ(٢).

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: نوێژی بێ دەسنوێژ دروست نیە، دەسنوێژیش - كە ناوی خودای لە سەر نەبرابێ - دروست نیە (د/ت).

٢٢٣- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ مَعَ كُلِّ وُضُوءٍ. رَوَاهُ مالكٌ والبخاري(٣).

دیسان گوتی: دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەربێ): نەبادا ئازارو دەردی سەری ئۆمەتم بدەم ئەگینا بۆ گرتنی هەموو دەسنوێژێ فەرمانم پێ دەكردن بە سیواككردن! (مالیك/ب).

٢٢٤- عَنْ عَائِشَةَ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: ألسِّوَاكُ مُطْهَرَةٌ لِلْفَمِ مَرْضَاةٌ لِلرَّبِّ. رَوَاهُ البخاري والشافعي والنسائي(٤).

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەربێ): سیواك هەم دەم پاك دەكاتەوەو هەم مایەی رەزامەندیی‌و خۆشنوودیی خودایە (ب/شافیعی/ن).

٢٢٥- وَعَنْهَا عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: عَشْرٌ مِنَ الْفِطْرَةِ قَصُّ الشَّارِبِ وَإِعْفَاءُ اللِّحْيَةِ وَالسِّوَاكُ وَالاِسْتِنْشَاقُ بِالْمَاءِ وَقَصُّ الأَظْفَارِ وَغَسْلُ الْبَرَاجِمِ

---

(٢) قال البخاري هو أحسن حديث فى التحية. (شرحه).

(٣) بخاري. سواك: ٨٨٧ ، ٧٢٤٠. مسلم. سواك: ٥٨٨.

(٤) قال الأمام النووى: رواه النسائي وابن خزيمة فى صحيحه بأسانيد صحيحه (رياض رقم: ١٢٠٢).

وَنَتْفُ الإِبِطِ وَحَلْقُ الْعَانَةِ وَانْتِقَاصُ الْمَاءِ الإِسْتِنْجَاءَ قَالَ: مُصْعَبٌ: وَنَسِيتُ الْعَاشِرَةَ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ الْمَضْمَضَةَ. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ[٥].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەم دەشتە لە فیترەتن، یاساو دەستوورێکی گەلێ کۆنن و لە بەرکۆنی ولەمێژی دەلێی خوویەکی زکماك و سروشتین:

یەکەم: بەرسمێڵکردن و قرتاندنی مووی سمێڵ.

دووەم: هێشتنەوەی ریش.

سێیەم: سیواککردن.

چوارەم: ئاو لە لووت رادان.

پێنجەم: قرتاندنی نینۆك.

شەشەم: شۆردنی لۆچی سەر جمگەو کرێ پەنجەکان.

حەوتەم: هەڵکێشانی مووی بنباڵ.

هەشتەم: تاشینی مووی بەر.

نۆهەم: تاراتگرتن بەئاو واتە: خۆشۆردن بەئاو لەپاش سەرئاوکردن، موصعەب گوتی:

دەهەمیانم لەیاد نەماوە، مەگەر ئاو لەدەم وەردان بێ. (ش/د/ت/ن).

٢٢٦- وَعَنْها قَالَت: كَانَ نَبِيُّ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَسْتَاكُ فَيُعْطِينِي السِّوَاكَ لأَغْسِلَهُ فَأَبْدَأُ بِهِ فَأَسْتَاكُ ثُمَّ أَغْسِلُهُ وَأَدْفَعُهُ إِلَيْهِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[٦].

واتە: دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کە دەیویست سیواك بکا، سیواکەکەی دەدا بەمن تابیشۆرم بۆی، منیش لەپێشا (بۆموبارەکی)

---

(٥) بخاري. لباس: ٥٨٨٩ ، ٥٨٩١ ، ٦٢٩٧. مسلم. خصال الفطرة: ٥٩٦ ، ٥٩٧ ، ٦٠٣. أبو داود. سواك: ٥٣. ترمذي. تقليم الأظافر: ٢٧٥٧. نسائي. الزينة. الفطرة: ٥٠٥٥ ، ٥٠٥٦ ، ٥٠٥٧.

(٦) لم يذكر نسبته الشارح (مترجم).

سیواکم پێ دەکرد، ئەوجا دەیم شۆردو دەم دایەوە دەستی جا ئەویش سیواکی پێ دەکرد (دروودی خوای لەسەربێ).

٢٢٧- عَنْ أَنَسٍ يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَغْتَسِلُ بِالصَّاعِ إِلَى خَمْسَةِ أَمْدَادٍ وَيَتَوَضَّأُ بِالْمُدِّ. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ(٧).

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: گەلێ جار وا دەبوو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بەمەن (صاع)ێك ئاو خۆی دەشۆرد، یا بە پێنج مشت (مود) خۆی دەشۆرد، جاروباریش بەمستێ ئاو دەسنوێژێکی دەگرت! (ش/د/ت/ن).

٢٢٨- وَعَنْهُ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَوَضَّأُ بِإِنَاءٍ يَسَعُ رَطْلَيْنِ وَيَغْتَسِلُ بِالصَّاعِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَقَالَ: قَالَ: أَحْمَدَ بْنَ حَنْبَلٍ: الصَّاعُ خَمْسَةُ أَرْطَالٍ وَثُلُثٌ(٨).

واتە: دیسان ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) غوسڵی خۆیی دەردەکرد بە مەنێ ئاو، وە جارجارەیش دەسنوێژی دەگرت بە دەفرێ کە دوو رەتڵ ئاوی دەگرت. ئەبو داوود ئەم فەرموودەیەی گێڕاوەتەوەو دەڵێ: ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەڵێ: مەن (صاع)ێ پێنج رەتڵ وسێیەکی رەتڵێکە.

٢٢٩- وَسَمِعَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مُغَفَّلٍ وَلَدَهُ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْقَصْرَ الأَبْيَضَ عَنْ يَمِينِ الْجَنَّةِ إِذَا دَخَلْتُهَا. فَقَالَ: يَا بُنَيَّ سَلِ اللَّهَ الْجَنَّةَ وَتَعَوَّذْ بِهِ مِنَ النَّارِ فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: إِنَّهُ سَيَكُونُ فِي هَذِهِ الأُمَّةِ قَوْمٌ يَعْتَدُونَ فِي الطُّهُورِ وَالدُّعَاءِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وإبن ماجه(٩).

واتە: عەبدوڵلای کوڕی موغەففەل گوێی لێ بوو کوڕەکەی دەیگوت: خودایە! داوای کۆشکە سپییەکەی لای راستی بەهەشتت لێ دەکەم هەرکاتێ

(٧) بخاري. وضوء: ٢٠١. مسلم. طهارة: ٧٣٤ ، ٧٣٥ أبو داود: مايجزئ من فى الماء الوضوء: ٩٥. ترمذي. مايجزئ من الماء فى الوضوء: ٦٠٩ تعليقاً.

(٨) لم يذكر نسبته الشارح (مترجم).

(٩) بسند صالح (شرحه).

چوومە بەهەشت، جا عەبدوڵڵای باوکی پێی گوت: کوڕی شیرینم! داوای بە هەشت لە خودا بکەو پەنا بگرە پێی لە دەستی ئاگری دۆزەخو ئیتر پێی لێ هەڵمەبڕە چونکە بۆ خۆم لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خوای لەسەربێ): لەناو ئەم ئۆمەتەدا دەستەیێ پەیدا دەبن لە سەرفکردنی ئاوی دەسنوێژو لە دوعاو نزاکردنا زیادە ڕەوی دەکەن (د/ ئیبنو ماجە – سند صالح).

٢٣٠– عَنِ الْحَكَمِ أَوِ ابْنِ الْحَكَمِ عَنْ أَبِيهِ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَالَ ثُمَّ تَوَضَّأَ وَنَضَحَ فَرْجَهُ. رَوَاهُ أصحاب السنن[10].

حەکەم (یا کوڕەکەی حەکەم گوتی: باوکم) گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) میزی کردو دەسنوێژی گرتو ئینجا لوێچێ ئاوی پرژاند لەنا فەکی خۆی بۆ نەهێشتنی دوو دڵیو وەسوەسە. (د/ت/ن – س/ ضعیف).

٢٣١– عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ لِلْوُضُوءِ شَيْطَانًا يُقَالُ لَهُ وَلَهَانُ فَاتَّقُوا وَسْوَاسَ الْمَاءِ[11].

واتە: ئوبەیی کوڕی کەعب (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: دەسنوێژ شەیتانێکی هەیە ناوی وەلهانە شەیدای دەسنوێژ تێکدانە جا لەبەر ئەوە خۆتان بپارێزن لە دوودڵیو وەسوەسەی ئاوی دەسنوێژو ئاوی خۆشۆردن، بەم ڕەنگە لە پێشا پەنا بگرن بەخودا لە وەسوەسەی ئەو شەیتانەو ناوی خودا بێنن (ت– سند غريب).

٢٣٢– عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ لِرَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خِرْقَةٌ يَسْتَنْشِفُ بِهَا بَعْدَ الْوُضُوءِ. رَوَاهُما الترميذي[12].

واتە: عائیشە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: جاران پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) مەندیلێکی هەبوو لەپاش دەسنوێژ خۆی پێ وشك دەکردەوە. (ت– سند غريب).

---

(١٠) بسند ضعيف (شرحه).

(١١) رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

(١٢) رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

## ٢٨) بەشی سێیەم: باسی دەسنوێژو ماوەی مانەوەی دەسنوێژ
## الفصل الثالث: في بيان الوضوء ومدته

{قَالَ: اللهُ تَعالَى – يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُواْ بِرُؤُسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَينِ – ٦/٥}.

واتە: ئەی کەسانێ کە باوەڕتان هێناوە بە ئاییني ئیسلام کاتێ ویستتان بچن بەلای نوێژەوە روخسارو دەمو چاوتان بشۆرن، ئینجا دەستەکانتان بشۆرن هەتا ئانیشك، ئینجا دەستی تەڕ بهێنن بەسەرتانا، لە پاشا قاچتان بشۆرن هەتا دەگاتە هەردوو قولاپەکانتان.

٢٣٣- عَنْ حُمْرَانَ مَوْلَى عُثْمَانَ قالَ: إنَّ عُثْمَانَ دَعَا بِوُضُوءٍ فَتَوَضَّأَ فَغَسَلَ كَفَّيْهِ ثَلاثَ مَرَّاتٍ ثُمَّ مَضْمَضَ وَاسْتَنْثَرَ ثَلاثًا، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاثَ مَرَّاتٍ ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ الْيُمْنى إِلَىَ الْمِرْفَقِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ ثُمَّ غَسَلَ يَدَهُ الْيُسْرى مِثْلَ ذلِكَ ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ ثُمَّ رِجْلَهُ الْيُمْنى إِلى الْكَعْبَيْنِ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ ثُمَّ غَسَلَ الْيُسْرى مِثْلَ ذلِكَ ثُمَّ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هذا ثُمَّ قالَ: مَنْ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هذا ثُمَّ قَامَ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ لا يُحَدِّثُ فِيهِماَ نَفْسَهُ غُفِرَ لَهُ ماَ تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ. وفِي رِوَايَة: فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَاسْتَنْثَرَ ثَلاَثاً بِثَلاَثِ غَرَفَاتٍ مِنْ مَاءٍ. وَفِي أُخْرىَ: فَمَسَحَ رَأْسَهُ ثَلاثاً. وفي رواية: فَمَسحَ رَأْسَهُ فَأَقْبَلَ بِيَدْيهِ وَأَدْبَرَ، بَدَأَ بِمُقَدَّمِ رَأْسِهِ، ثُمَّ ذَهَبَ بِهِمَا إِلَى قَفَاهُ، ثُمَّ رَدَّهُمَا حَتَى رَجَعَ إِلَى الْمَكَانِ الَّذِى بَدَأَ مِنْهُ. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ[1].

واتە: حومرانی نۆکەری عوسمان (خوای لێ رازی بێ) گوتی: عوسمان داوای ئاوی کردو لەسەر ئەم شێوەیە دەسنوێژێکی گرت: لە پێشا سێ جار هەردوو لەپی شۆرد، ئینجا ئاوی لە دەمی و لە لووتی راداو هنگی کرد، ئینجا سێ جار دەموچاوی شۆرد، ئینجا سێ جار دەستی راستی هەتا ئانیشکی شۆرد، ئینجا بەو چەشنە دەستی چەپیشی شۆرد ئینجا دەستی تەڕی هێنا

(١) بخاري. وضوء: ١٥٩ ، ١٦٠ ، ١٦٤ ، ١٩٣٤ ، ٦٤٣٣. مسلم. طهارة : ٢٢٧ ، ٥٣٨ ، ٥٣٩. أبو داود: صفة وضوء النبي (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): ١٠٦ ، نسائي. مضمضة: ٨٤ ، ٨٥ ، ١١٦.

بەسەریاو سەری خۆی مەسحكرد، ئینجا قاچی راستی هەتا هەردوو قاپە رەقەڵەی سێ جار شۆرد، ئینجا بەو چەشنە پێی چەپیشی شۆرد، لەپاشا عوسمان گوتی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دی (درودی خوای لەسەربێ) وەك ئەم دەسنوێژەی من گرتم ئاوا دەسنوێژی گرتو فەرمووی (درودی خوای لەسەربێ): هەر كەسێ دەسنوێژێ بگرێ لە چەشنی ئەم دەسنوێژەی كە ئێستا من گرتم، ئینجا هەڵسێ دوو ركات نوێژی پوختەی دوور لە خەیاڵی جیهان بكا ئیتر خودای گەورە لە گوناهی لەوە پێشی خۆش دەبێ، لە گێڕانەوەیەكا: سێ جار بەسێ لۆچ ئاو ئاوی لەدەمو لووتی وەرداو هنگیكرد، لە گێڕانەوەیەكی تردا: سێ جار سەری مەسحكرد، لە گێڕانەوەیەكا: سەری خۆی بەم شێوەیە مەسحكرد: هەر دوو دەستی لە پێشەوە هێنا بەسەر سەریاو پەنجەكانی بڵاوكردنەوەو هەردوو ئەنگوستی دۆشاومژەی لكان بەیەكەوە ئینجا بەو شێوەیە، لە پێشەسەریەوە دەستەكانی خشاند بەسەر سەریداو تا گەیاندنیە پشتملی، ئینجا بەهەمان شێوە كشاندنیەوە بەسەر شوێنی خۆیاندا تا گەڕایەوە سەر ئەو جێگەیە كە لەوێوە دەستی پێ كردبوو! (ش/د/ت/ن).

٢٣٤- عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ زَيْدٍ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَوَضَّأَ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ[٢].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی زەید (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەسنوێژی گرتو هەموو ئەندامەكانی دەسنوێژی دووجار دووجار شۆرد. (ب/د/ت).

٢٣٥- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قالَ: تَوَضَّأَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَرَّةً مَرَّةً. رَوَاهُما البخاري وأبو دَاوُدَ والترمِذِي[٣].

واتە: ئیبنو عەباس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) جارە جارە كە دەسنوێژی دەشۆرد، هەموو ئەندامێكی دەسنوێژی یەك جار دەشۆرد. (ب/د/ت).

---

(٢) بخاري، وضوء : ١٥٨.

(٣) بخاري، وضوء: ١٥٧.

٢٣٦- وَجَاءَ أَعْرابِي إِلَى النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) يَسْأَلُهُ عَنِ الْوُضُوءِ فَأَرَاهُ ثَلاثًا ثَلاثًا ثُمَّ قالَ: هكَذا الْوُضُوءُ فَمَنْ زَادَ هـذا فَقَدْ أَسَاءَ وَتَعَدَّى وَظَلَمَ. رَوَاهُ النسائي وأحمد وابو داود ولفظه: فَمَنْ زادَ عَلى هذَا أَوْ نَقَصَ فَقَدْ أَساءَ وَظَلَمَ[٤].

واتە: عەرەبێكی دەشتەكی هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لێی پرسی كەفێری دەسنوێژی بكا، ئەویش (دروودی خوای لەسەربێ) نیشانیدا كە هەموو ئەندامەكانی دەسنوێژ سێ جار سێ جار بشۆرێ، ئینجا پێی فەرموو: دەسنوێژ خۆی ئاوایە، ئیتر ئەوەی لەمە زیاتر بكا ئەوە خراپ دەكاو لەرادە دەردەچێ (ن/ئەحمەد/د) گفتەی (د = ابو داود) ئاوایە: ئیتر ئەوەی لەمە زیاتر بكا یا لەمە كەمتر بكا ئەوە بەراستی خراپ دەكاو زۆرو ستەم لەخۆی دەكا.

٢٣٧- عَنْ أَنَسٍ أَنَّ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) كَانَ إِذَا تَوَضَّأَ أَخَذَ كَفًّا مِنْ مَاءٍ فَأَدْخَلَهُ تَحْتَ حَنَكِهِ فَخَلَّلَ بِهِ لِحْيَتَهُ وَقالَ: هَكَذَا أَمَرَنِي رَبِّي. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي[٥].

واتە: ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: كە پێغەمبەر دەسنوێژی هەڵدەگرت لۆچێ ئاوی هەڵدەگرتو دەیكرد بەژێر چەناگەیەوەو دەستی پێ دەخستە ریشی، وە دەیفەرموو: (دروودی خوای لەسەربێ) خوداكەم ئاوای پێ گوتووم. (د/ت/-س/ص).

٢٣٨- وَلَـهُ (أي للترمـذي): إِذَا تَوَضَّـأْتَ فَخَلِّـلْ بَـيْنَ أَصَـابِعِ يَـدَيْكَ وَرِجْلَيْكَ[٦].

واتـە: پێغەمبـەر دەفـەرموێ: (دروودی خوای لەسەربێ) كە دەسنوێژ دەگریت دەست بخەرە ناو پەنجەی دەستو پێت (ت-س/ح).

٢٣٩- عَنِ الْمُسْتَوْرِدِ قالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) إِذَا تَوَضَّأَ يُخَلِّلُ أَصَابِعَ رِجْلَيْهِ بِخِنْصَرِهِ. رَوَاهُ الترميذي وابو داود[٧].

---

(٤) بسند صالح (شرحه).

(٥) بسند صحيح (شرحه).

(٦) بسند حسن (شرحه).

واتــه: موســتەورید (خـوای لێ رازی بـێ) گـوتی: گـەڵێ جـار سـرنجم دەدا: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کە دەسنوێژی دەگرت پەنجە تووتەی (دەستی چەپی) دەخستە ناو پەنجەی هەر دوو پێی‌و بە پەنجە تووتەی ناو پەنجەکانی پێکانی دەئاژنینەوە. (ت/د-س/ح).

٢٤٠- عَنْ أبْنِ عَبَّاسٍ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَسَحَ بِرَأْسِهِ وَأُذُنَيْهِ ظَاهِرِهِمَا وَبَاطِنِهِمَا. رَوَاهُ ألترميذي وأبو داود[٨].

واتە: ئیبنو عەباس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) (لە دەسنوێژدا) دەستی تەڕی هێنا بەسەر سەری خۆیاو بە هەردوو گۆچکەی دا، بە دیوی دەرەوەو بە دیوی ناویاندا. (ت/د-س/ص).

٢٤١- عَنْ ألْمُغِيرَةِ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَوَضَّأَ فَمَسَحَ بِنَاصِيَتِهِ وَعَلَى ألْعِمَامَةِ وَعَلَى ألْخُفَّيْنِ. رَوَاهُ الأربعة[٩].

موغیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەسنوێژی گرت‌و پێشە سەری مەسح کردو ئینجا لەباتی تەواوی سەری مێزەرەکەی مەسح کردو لە جیاتی شۆردنی پای دەستی تەڕی هێنا بەسەر پشتی خوففەکانیا. (ش/د/ت).

٢٤٢- وَرَأَى أبوْ هُرَيْرَةَ قَوْمًا يَتَوَضَّئُونَ مِنَ ألْمِطْهَرَةِ فَقَالَ: أَسْبِغُوا الْوُضُوءَ فَإِنِّي سَمِعْتُ أَبَا الْقَاسِمِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: وَيْلٌ لِلْعَرَاقِيبِ مِنَ النَّار. وَفِي رِوَايَةٍ: وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ. رَوَاهُ ألْخَمْسَةُ[١٠].

واتــه: جـارێ ئـەبو هـورەیرە (خـوای لێ رازی بـێ) دەسـتەیەکی دی لـە دەستشۆرەکە دەسنوێژیان دەگرت گوتی: بە تەواوی‌و بەجوانی دەسنوێژ بگرن، چونکە بەگوێی خۆم گوێم لێبوو کە حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ)

---

(٧) بسند حسن (شرحه).

(٨) بسند صحيح (شرحه).

(٩) بخاري. وضوء: ١٨٢ ، ٢٠٣ ، ٢٠٦ ، ٣٦٣ ، ٣٨٨ ، ٢٩١٨ ، ٤٤٢١ ، ٥٧٩٨ ، ٥٧٩٩.

(١٠) بخاري. وضوء: ١٦٥ ، ٩٦ ، ١٦٣. مسلم. طهارة: ٥٧١ ، ٥٧٥ ، ٥٧٣.

دەیفەرموو: وای بۆ ئەو كەسانەی كە بە باشی شادەمارەكەی‌سەرقنكە پاژنەیان ناشۆرن! ئەی هاوار لەدەست ئەو ئاگرەی كە بۆ ئەوانە ئامادەكراوە. لە گێڕانەوەیەكا: (وای لەدەست ئاگری دۆزەخ بۆ ئەو كەسەی كە بە باشی پاژنەی پێی ناشۆرێ). (ش/د/ت/ن).

٢٤٣- عَنْ عُمَرَ أنَّ رَجُلاً تَوَضَّأَ فَتَرَكَ مَوْضِعَ ظُفُرٍ عَلَى قَدَمِهِ فَأَبْصَرَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقالَ: ارْجِعْ فَأَحْسِنْ وُضُوءَكَ فَرَجَعَ ثُمَّ صَلَّى. رَوَاهُ مُسْلِم وأبو داود[١١].

عومەر (خوای لێ ڕازی بێ): گوتی: پیاوێ دەسنوێژی گرت، بەقەد نینۆكێكی لەپێی نەشۆرد، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) چاوی لێ بوو پێی فەرموو: (بچۆرەوە بەجوانی دەسنوێژەكەت بگرە! ئەویش چوو وای كرد، ئینجا نوێژی كرد. (م/د)

٢٤٤- وَلَهُ (أي لأبي دَاوُدَ: اَسْبِغِ الْوضُوءَ وَخَلِّلْ بَيْنَ الأَصَابِعِ وَبَالِغْ فِي الاِسْتِنْشَاقِ إِلاَّ أَنْ تَكُونَ صَائِمًا[١٢].

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: بە تەواوی دەسنوێژ بشۆرەو دەست بخەرە ناو پەنجەكانتو زۆر باش ئاو لە دەمو لووتت رابدە، بەڵام ئەگەر بە ڕۆژوو بوویت زیادە ڕەوی مەكە لەئاو لەدەمو لووت راداندا (د).

٢٤٥- عَنْ أَنَسٍ قالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَوَضَّأُ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ. قُلْتُ: كَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ؟ قالَ: يُجْزِئُ أَحَدَنَا الْوُضُوءُ مَا لَمْ يُحْدِثْ. رَوَاهُ الْخَمْسَةَ إِلا مسبماً[١٣].

ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بۆ هەموو نوێژێ لەكاتی داهاتنیا دەسنوێژی تازەی دەگرت هەتا ڕۆژێ گرتنی شاری مەككە، بەڵام لە ڕۆژی فەتحی مەككەدا بەیەك دەسنوێژ هەموو نوێژەكانی كرد

---

(١١) مسلم. طهارة: ٥٧٥.

(١٢) سكت عنه الشارح (مترجم).

(١٣) بخاري. وضوء: ٢١٤.

قسەگێڕەوە (راوی) دەڵێ: گوتم: ئەی ئێوە یارانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) چۆن دەسنوێژتان دەگرت؟ گوتی: یەك دەسنوێژمان بەس بوو تا کاتێ دەسنوێژەکەمان دەشکا ئەوسا لەکاتی پێوستدا دەسنوێژێکی ترمان هەڵدەگرتەوە. (ب/د/ت/ن).

٢٤٦- عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَلَّى الصَّلَوَاتِ يَوْمَ الْفَتْحِ بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ فَقَالَ: لَهُ عُمَرُ: لَقَدْ صَنَعْتَ الْيَوْمَ شَيْئًا لَمْ تَكُنْ تَصْنَعُهُ. قالَ: عَمْدًا صَنَعْتُهُ يا عُمَرَ. رَوَاهُ الْخَمْسَةَ إلا البخاري[١٤].

واتە: سولەیمانی کوڕی بورەیدە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: باوکم گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەرۆژی گرتنی شاری مەککەدا بەیەك دەسنوێژ هەموو نوێژەکانی کرد، وە قاچەکانیشی نەشۆرد بەڵکوو لەباتی ئەوە دەستی تەڕی هێنا بەسەر سۆل (خوف)ەکانیا، عومەریش عەرزیکرد: ئەمەی ئەمڕۆ کردت نەم دیوە لە مەوپێش بیکەی هۆی ئەمە چیبوو؟ فەرمووی: (دروودی خوای لەسەربێ) بەقەستی وامکرد ئەی عومەر! تا ئێوەش ئەگەر بتانەوێ لەکاتی پێویستدا ئاوا وەك من بکەن (م/د/ت/ن).

## ٢٩) دەستی تەڕهێنان بەسەر خوفف (سۆل)دا: (مسح الخفين)

٢٤٧- عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَرَجَ لِحَاجَتِهِ فَأَتْبَعَهُ الْمُغِيرَةِ بِإِدَاوَةٍ فِيهَا مَاءٌ فَصَبَّ عَلَيْهِ حِينَ فَرَغَ مِنْ حَاجَتِهِ فَتَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ. رَوَاهُ الْخَمْسَةَ[١].

موغیرەی کوڕی شوعبە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) چووە دەرەوە رۆیشت بۆ سەراو، منیش بە جەوەندەیێ ئاوەوە

---

(١٤) مسلم. وضوء: ٦٤٠ أبو داود. الصلوات بوضوء واحد: ١٧٢ ترمذي. الصلوات بوضوء واحد: ٦١. نسائي. وضوء لكل صلوة: ١٣٣.

(١) بخاري. وضوء: ١٨٢ ، ٢٠٣ ، ٢٠٦ ، ٣٦٣ ، ٣٨٨ ، ٢٩١٨ ، ٤٤٢١ ، ٥٧٩٨ ، ٥٧٩٩. مسلم. وضوء: ٦٢٥ ، ٩٥١. أبو داود. مسح على الخفين: ١٤٩ ، ١٥١ نسائي. صب الماء في الوضوء: ٧٩.

شوێنی کەوتم، جا کە لە سەراوەکەی بۆوە ئاوەکەم کرد بە دەستیاو دەسنوێژی گرت، وە لە جیاتی شۆردنی پێی دەستی تەڕی هێنا بەسەر هەردوو سۆڵەکانیا (ش/د/ت/ن).

٢٤٨- وَعَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ نَسِيتَ، قَالَ: بَلْ أَنْتَ نَسِيتَ، بِهَذَا أَمَرَنِي رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ(٢).

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) جارێ دەسنوێژی دەگرت دەستی تەڕی هێنا بەسەر سۆڵەکانیا، منیش گوتم ئەی پێغەمبەری خودا! لەیادت چوو پێت بشۆرێت، فەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ): نەء، بەڵکوو تۆ لەیادت چووە، من پەروەردگاری گەورەو سەوەرم ئاوای پێ گوتووم (د-سند صالح).

٢٤٩- عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ أَنَّ النَّجَاشِيَّ أَهْدَى إِلَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خُفَّيْنِ أَسْوَدَيْنِ سَاذَجَيْنِ فَلَبِسَهُمَا ثُمَّ تَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَيْهِمَا. أَبُو دَاوُدَ وَأَحمد والترمذي(٣).

واتە: بورەیدە گوتی: نەجاشی (پادشای حەبەشە) جووتێ خوففی ڕەشی سادەی بە دیاری نارد بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەپێیکردنو دەسنوێژی گرتو لەجیاتی شۆردنی قاچی دەستی تەڕی هێنا بەسەر پشتی خوففەکانا. (د/ئەحمەد/ت).

٢٥٠- عَنْ الْمُغِيرَةِ قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي سَفَرٍ فَأَهْوَيْتُ لِأَنْزِعَ خُفَّيْهِ فَقَالَ: دَعْهُمَا فَإِنِّي أَدْخَلْتُهُمَا طَاهِرَتَيْنِ. فَمَسَحَ عَلَيْهِمَا. رَوَاهُ الثلاثة(٤).

موغیرە (خوای لێ ڕازی بێ) لە سەفەرێکا لە خزمەتی حەزرەتدا بووم (دروودی خوای لەسەربێ) دەسنوێژی گرت، کە گەیشتە سەر قاچی دانەویمەوە کە

(٢) بسند صالح مؤيد بالصحيح (شرحه).

(٣) سكت عنه الشارح (مترجم).

(٤) تقدم تخريجه بمثل الحديث الرقم: ٢٥٦ من تلل. ٢٩ (مترجم).

خوففەکانی لەپێی داکەنم، فەرمووی: وازیان لێبێنە بە دەسنوێژەوە لەپێم کردوون ئیتر قاچی نەشۆردو لەجیاتی ئەوە دەستی تەڕی هێنا بەسەر سۆڵەکانیا. (ش/د).

٢٥١- وَعَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَمْسَحُ عَلى ظَهْرِ الْخُفَّيْنِ. رَوَاهُ الترمذي وأبو داود[٥].

دیسان لەوەوە گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەستووری وابوو دەستی تەڕی دەهێنا بەسەر پشتی سولەکانیا لەجیاتی شۆردنی قاچی لە دەسنیوێژا لە هەندێ کاتی تایبەتیدا. (ت/د-ص).

٢٥٢- وَلَهُ عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قالَ: لَوْ كَانَ الدِّينُ بِالرَّأْيِ لَكَانَ أَسْفَلُ الْخُفِّ أَوْلَى بِالْمَسْحِ مِنْ أَعْلاَهُ وَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَمْسَحُ عَلَى ظَاهِرِ خُفَّيْهِ[٦].

عەلی (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەگەر ئایین بەراو بە قیاس بێ دەبێ مەسحی ژێر سینگی خوفف بکرێ، نەوەك سەر پشتی، بەڵام من بە چاوی خۆم دیومە کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) مەسحی سەرپشتی خوففەکانی خۆی دەکرد کەواتە رای ئایینی بەرای تایبەت نابێ. (د/ح-ص).

٢٥٣- عَنِ الْمُغِيرَةِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ وَالنَّعْلَيْنِ. رَوَاهُ أصحاب السنن بسند صحيح[٧].

موغیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) جارێ دەسنوێژی دەگرت، دەستی تەڕی هێنا بەسەر گورەوی‌و پێڵاو (نەعل)ەکانیا. (د/ت/ن-س/ص).

---

(٥) صحيح (شرحه).

(٦) صحيح (شرحه).

(٧) سنده صحيح.

٢٥٤- وَقَالَ: أَبو دَاوُدَ: وَمَسَحَ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ عَلِيٌّ وَابْنُ مَسْعُودٍ وَالْبَرَاءُ وَأَنَسٌ وَأَبو أُمَامَةَ وَسَهْلُ بْنُ سَعْدٍ. وَقَالَ: الترمذي: وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوري وَابْنُ الْمُبَارَكِ وَالشَّافِعِيُّ وَأَحْمَد وَإسحاق. قَالوا: يَمْسَحُ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ وإِنْ لَمْ تَكُنْ نَعْلان إِذا كَانَا ثخينيْنِ(٨).

ئەبو داوودیش دەڵێ: ئەم زاتانە: عەلیو ئیبنو مەسعوودو بەراو ئەنەسو ئەبو ئومامەو سەهلی كوڕی سەعد لە دەسنوێژدا لە جیاتی شۆردنی پێ گەڵێ جار وادەبوو دەستی تەڕیان دەهێنا بەسەر گۆرەویدا، تیرمیذیش دەڵێ: سوفیانی ثەوریو ئیبنو موبارەكو شافیعیو ئەحمەدو ئیسحاقیش هەر وا دەڵێن: دەسنوێژگر دەستی تەڕ دەهێنێ بەسەر گۆرەویدا، ئەگەر گۆرەوییەكە ئەستووربێ، با پێڵاویشی لەپێدا نەبێ.

٢٥٥- عَنْ شُرَيْحِ بْنِ هَانِئٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ عَنِ الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ فَقَالَتْ: عَلَيْكَ بِابْنِ أَبِي طَالِبٍ فَسَلْهُ فَإِنَّهُ كَانَ يُسَافِرُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). فَسَأَلْنَاهُ فَقالَ: جَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثَلاثَةَ أَيَّامٍ وَلَيَالِيَهُنَّ لِلْمُسَافِرِ وَيَوْمًا وَلَيْلَةً لِلْمُقِيمِ. رَوَاهُ مُسْلِمْ وَالْنَسائي(٩).

شورەیحی كوڕی هانی (خوای لێ رازی بێ) گوتی: بۆ مەسحی خوفف لە عائیشەم پرسی گوتی: بۆ ئەمە بچۆ لە عەلی كوڕی ئەبو طالیب بپرسە، چونكە ئەو دەچوو بۆ سەفەر لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەربێ) جا كە لەومان پرسی گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) سێ شەوو سێ رۆژی داناوە بۆ رێبوار، وە شەوو رۆژێكیشی داناوە بۆ نیشتەجێ. (م/ن).

٢٥٦- عَنْ خُزَيْمَةَ بْنِ ثَابِتٍ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: الْمَسْحُ عَلَى الْخُفَّيْنِ لِلْمُسَافِرِ ثَلاثَةُ أَيَّامٍ وَلِلْمُقِيمِ يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ. رَوَاهُ أَبو دَاوُدَ وَالترمذي(١٠).

---

(٨) أثر صحيح (مترجم).

(٩) مسلم. مسح على الخفين: ٦٣٧. نسائي. توقيت في المسح: ١٢٨ ، ١٢٩.

(١٠) بسند صحيح (شرحه).

خوزەیمەی کوڕی ثابیت (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ڕێبوار لە سەفەرەکەیدا هەموو جارێ کە خوففەکانی لەپێ دەکا تا سێ ڕۆژ ماوەی هەیە مەسحی خوفف بکا، نیشتەجێش تا شەوو ڕۆژێ ماوەی هەیە (د/ت-س/ص).

٢٥٧- عَنْ صَفْوَانَ بْنَ عَسَّالٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قالَ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَأْمُرُنَا إِذَا كُنَّا مُسَافِرِينَ أَنْ نَمْسَحَ عَلَى خِفَافِنَا وَلاَ نَنْزِعَهَا ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ مِنْ غَائِطٍ وَبَوْلٍ وَنَوْمٍ إِلاَّ مِنْ جَنَابَةٍ. رَوَاهُ النسائي والترمذي[11].

صەفوانی کوڕە عەسال (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: جاران کە لە سەفەردا بووینایە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پێمانی دەگوت کە هەتا ماوەی سێ ڕۆژ مەسحی خوففەکانمان بکەین‌و لەوسێ ڕۆژانەدا دایان نەکەنین نەبۆ پیسی‌و نەبۆ میزو نەبۆ خەو مەگەر بۆ لەشپیسی (ن/ت-س/ص).

**٣٠) باسی شەشەم: باسی خۆشۆردن (غوسڵ)ە (ئەم باسە سێ بەشە):**

**بەشی یەکەم: باسی هۆکانی خۆشوردن**

**الباب السادس: في الغسل (وفيه ثلاثة فصول):**

**الفصل الأول: في أسباب الغُسل**

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُواْ – ٦/٥}.

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: ئەگەر لەشتان پیس بوو ئەوە خۆتان بشۆرن.

وَقَالَ تعالى: {وَلاَ جُنُبًا إِلاَّ عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّىَ تَغْتَسِلُواْ – ٤- ٤٣}.

واتە: دیسان دەفەرموێ: ئەی موسوڵمانان! نزیکی نوێژ مەکەونەوە بە لەشی پیسەوە هەتا خۆتان دەشۆن مەگەر کاتێ ڕێبوار بن‌و ئاوتان دەست نەکەوێ ئەوە لەوێدا تەیەممووم دەکەن.

(١١) بسند صحيح (شرحه).

٢٥٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: إِذَا جَلَسَ بَيْنَ شُعَبِهَا الأَرْبَعِ ثُمَّ جَهَدَهَا فَقَدْ وَجَبَ عَلَيْهِ الْغُسْلُ. وَفِي رواية: وَإِنْ لَمْ يُنْزِلْ. وَفِي أخرى: وَمَسَّ الْخِتانُ الْختانَ. رَوَاهُ الْخَمْسَةَ إِلاَّ الترمذي[١].

له ئەبو هورەیرەوە (خوای لێ رازی بێ) پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی کە پیاو لەناو چوار پەلی ئافرەتا دانیشتو لەگەڵیا دروست بوو ئیتر خۆشۆردن پێویست دەبێ لەسەر هەردوولا لە گێڕانەوەیەکا: با ئاویشی نەیەتەوە هەر لەشیان پیس دەبێ، چونکە تێڕۆکردن (ایلاج) رووی داوە، لە گێڕانەوەیەکی تردا: وەسەری چووك نوقم بوو لەناو زێی ژندا ئیتر لەش پیس دەبێ. (ش/د/ن).

٢٥٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهَا) قَالَتْ: إِنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الرَّجُلِ يُجَامِعُ أَهْلَهُ ثُمَّ يُكْسِلُ هَلْ عَلَيْهِمَا الْغُسْلُ وَعَائِشَةُ جَالِسَةٌ. فَقالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنِّي لأَفْعَلُ ذَلِكَ أَنَا وَهَذِهِ ثُمَّ نَغْتَسِلُ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ[٢].

عائیشە گوتی: من دانیشتبووم لە خزمەتی حەزرەتدا، پیاوێ لێی پرسی: ئەگەر پیاوێ دروست بوو لەگەڵ حەلاڵی خۆیا بەلام بۆی تەواو نەکراو ئاوی نەهاتەوە ئایا لەم حاڵەدا ژنو پیاوەکە خۆشۆردنیان لەسەرە یان نا؟ فەرمووی: من خۆمو ئەم ژنەی خۆم ئاوا دەکەینو لە پاشا هەردووکمان خۆمان دەشۆرین (م).

٢٦٠- وَعَنْهَا قَالَتْ: إِذَا جَاوَزَ الْخِتَانُ الْخِتَانَ فَقَدْ وَجَبَ الْغُسْلُ فَعَلْتُهُ أَنَا وَرَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاغْتَسَلْنَا. رَوَاهُ الترمذي[٣].

---

(١) بخاري. وضوء: ٢٩١. مسلم. طهارة: ٧٨١. أبو داود. في الإكسال: ٢١٦. نسائي. وجوب الغسل إذا التقى الختانان: ١٩١.

(٢) مسلم. طهارة: ٧٨٤.

(٣) بسند صحيح (شرحه).

دیسان عائیشه (خوای لێ رازی بێ) گوتی: هەرکاتێ گۆمکەی سەری چووك نوقم بوو لەناو زێی ژندا ئیتر خۆشۆردن پێویست دەبێ هەرچەند هیچ لایەکیشیان ئاویان نەیەتەوە، وارێکەوتووە منو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ئاوامان کردووە لەپاشا خۆمان شۆردووە. (ت-س/ص).

٢٦١- عَنْ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قالَ: أَنَّ الْفُتْيَا الَّتِي كَانُوا يُفْتُونَ أَنَّ الْمَاءَ مِنَ الْمَاءِ كَانَتْ رُخْصَةً رَخَّصَهَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فِي بَدْءِ الإِسْلاَمِ ثُمَّ أَمَرَ بِالاِغْتِسَالِ بَعْدُ. رَوَاهُ أبُو دَاوُدَ وَالترمذي(٤).

ئوبەیی کوڕی کەعب (خوای لێ رازی بێ) گوتی: ئەو فەتوایەی کە جاران فەتوایان پێ دەدا کە گوایە: ئاو لە ئاوەوەیە واتە: خۆشۆردن بە ئاوهاتنەوە پێویست دەبێ ئەوە روخصەتێکی جارەکی بوو، لە سەرەتای ئیسلامەتییەوە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) رێگەی ئەوەی دابوو، بەڵام لەپاشا کە ئیسلامەتی دامەزرا حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمانیدا بەخۆشۆردن هەرکاتێ سەری چووك چوو بەناو پێش یا بەناو پاشدا، هەر چەند هیچ لایەکشیان ئاویان نەیەتەوە. (د/ت-س/ص).

٢٦٢- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهَا) قَالَتْ: جَاءَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ إِلَى النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنَّ اللّٰهَ لاَ يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ فَهَلْ عَلَى الْمَرْأَةِ مِنْ غُسْلٍ إِذَا احْتَلَمَتْ؟ فَقالَ: رَسُولُ اللهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) نَعَمْ إِذَا رَأَتِ الْمَاءَ، قَالَتْ أُمُّ سَلَمَةَ: يَا رَسُولَ اللهِ وَتَحْتَلِمُ الْمَرْأَةُ؟ فَقالَ: تَرِبَتْ يَدَاكِ فَبِمَ يُشْبِهُهَا وَلَدُهَا. رَوَاهُ الثلاثة. وَزاد مُسْلِم:إِنَّ مَاءَ الرَّجُلِ غَلِيظٌ أَبْيَضُ وَمَاءَ الْمَرْأَةِ رَقِيقٌ أَصْفَرُ، فَمِنْ أَيِّهِمَا عَلا أَوْ سَبَقَ يَكُونُ مِنْهُ الشَّبَهُ(٥).

ئوم سەلەمە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: ئم سولەیمی دایکی ئەنەسی کوڕی مالیك هات بۆلای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! خودا لە گوتنی قسەی رەوا شەرم ناکا، کەوابوو ئایا ئەگەر ئافرەت شەیتانی

---

(٤) بسند صحيح (شرحه).

(٥) بخاري. علم: ١٣٠ ، ٢٨٢ ، ٣٣٢٨ ، ٦٠٩١ ، ٦١٢١. مسلم. طهارة: ٧١٠ ، ٧٠٨.

بوو خۆشۆردنی لەسەرە یانا؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر ئاوی بێتەوەو هەستی پێ بکا جا ئوم سەلەمەیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆچی ئافرەتیش شەیتانی دەبێ؟ فەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ): بە میوانی هەژاریی بیت! ئەی ئەگەر شەیتانی نابێو ئاوی نایەتەوە ئەی بەچی منالەکەی شێوەی لێی دەچێ! (د/ش) موسلیم ئەمەی پتر: ئاوی پیاو خەستو سپییەو ئاوی ئافرەت روونو زەردە، جا ئاوی هەرکامیان سەرکەوتو زاڵبوو یا لەپێش ئاوی ئەوی تریانا هاتەوە ئەوە شێوەی منالەکە لەویان دەکا.

٢٦٣- وَلَهُ أَيْضًا: إِذَا عَلا مَاؤُهَا مَاءَ الرَّجُلِ أَشْبَهَ الْوَلَدُ أَخْوالَهُ وَإِذَا عَلا مَاءُ الرَّجُلِ مَاءَهَا أَشْبَهَ الْوَلَدُ أَعْمَامَهُ.وفي رواية: فَإِذَا اجْتَمَعاَ فَعَلا مَنِيُّ الرَّجُلِ مَنِيَّ الْمَرْأَةِ أَذْكَراَ بِإِذْنِ اللهِ وَإِذَا عَلا مَنِي الْمَرْأَةِ مَنِيَّ الرَّجُلِ آنَثَا بِإِذْنِ اللهِ[٦] :

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر ئاوی ژن زاڵ بوو بەسەر ئاوی پیاودا ئەوە منداڵ لە خاڵوانی دەکا، ئەگەر ئاوی پیاو زاڵ بوو بەسەر ئاوی ژندا ئەوە منداڵ لەباوانی دەکا، لە گێڕانەوەیەکا: کە ژنو پیاو جووت بوونو تۆوی پیاوەکە زاڵ بوو بەسەر تۆوی ئافرەتەکەدا بە فەرمانی خودا نێرینەیان دەبێ، ئەگەر تۆوی ئافرەتەکەیش زاڵ بوو بەسەر تۆوی پیاوەکەدا ئەوە بەفەرمانی خودامێیینەیان دەبێ (م).

٢٦٤- عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الرَّجُلِ يَجِدُ الْبَلَلَ وَلاَ يَذْكُرُ احْتِلاَمًا. قالَ: يَغْتَسِلُ، وَعَنِ الرَّجُلِ يَرَى أَنَّهُ قَـدِ احْـتَلَمَ وَلاَ يَجِـدُ الْبَلَلَ قالَ: لاَ غُسْلَ عَلَيْهِ، فَقَالَتْ: أُمُّ سُلَيْمٍ: الْمَرْأَةُ تَرَى ذَلِكَ أَعَلَيْهَا غُسْلٌ؟ قَـالَ: نَعَمْ إِنَّمَا النِّسَاءُ شَقَائِقُ الرِّجَالِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي[٧].

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە پێغەمبەریان پرسی (دروودی خوای لەسەربێ): ئەگەر پیاوێ تەڕایی تۆماوی هەست پێکرد بەڵام نەیەتەوە یادی کە شەیتانی

---

(٦) مسلم. طهارة: ٧١٣ ، ٧١٤.

(٧) بسند فيه ضعيف الحفظ (شرحه).

بووبێ، ئایا خۆی بشۆرێ یانا؟ فەرمووی: (دروودی خوای لەسەربێ): خۆی بشۆرێ، وە لێشیان پرسی: ئەگەر بە پێچەوانەوە بوو: تەڕایی نەبوو بەڵام وای دەزانی کە شەیتانی بووە ئەوە چۆنە؟ فەرمووی: خۆشۆردنی لەسەر نیە. ئوم سولەیمیش گوتی: ئافرەتیش هەست بەو تەڕاییە دەکا ئایا خۆشۆردنی لەسەرە یانا؟ فەرمووی: بەڵێ لەسەریەتی، چونکە ژنیش مانەندی پیاوەو لەگەڵ حوکما وەك ئەو وایە. (د/ت–سند ضعیف).

٢٦٥– وَعَنْهاَ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَغْتَسِلُ مِنْ أَرْبَعٍ مِنَ الْجَنَابَةِ وَيَوْمِ الْجُمُعَةِ وَمِنَ الْحِجَامَةِ وَمِنْ غُسْلِ الْمَيِّتِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ(٨).

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بۆ ئەم چوار شتە خۆی دەشۆرد:

یەکەم: بۆ لەشپیسی.

دووەم: بۆ رۆژی هەینی.

سێیەم: بۆ کەڵەشاخ گرتنو خوێن بەردان.

چوارەم: بۆ شۆردنی مردوو. (د–سند ضعیف).

٢٦٦– عَنْ قَيْسِ عاَصِمٍ أَنَّهُ أَسْلَمَ فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ يَغْتَسِلَ بَماءٍ وَسِدْرٍ. رَوَاهُ اصحاب السُّنن(٩).

قەیسی کوڕی عاصم گوتی: کە ئیسلام بووم پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پێی گوتم بە ئاوو مۆرد خۆم بشۆرم. (د/ت/ن–س/ح).

---

(٨) بسند ضعیف (شرحه).

(٩) بسند حسن (شرحه).

## ٣١) بەشی دووەم: دەستوری خۆشۆردنو حوکمی چوون بۆ گەرماو (حەمام)
## الفصل الثاني: في آداب الغسل وحكم الحمام

٢٦٧- عَنْ أُمِّ هَانِئٍ بِنْتِ أَبِي طَالِبٍ تَقُولُ: ذَهَبْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَامَ الْفَتْحِ، فَوَجَدْتُهُ يَغْتَسِلُ وَفَاطِمَةُ تَسْتُرُهُ فَقالَ: مَنْ هَذِهِ؟ قُلْتُ: أَنَا أُمُّ هَانِئٍ. رواهُ الخمسة إلا أبا داود[١].

ئوم هانیئ کچی ئەبو طالیب (خوای لێ رازی بێ) گوتی: ساڵی گرتنی مەککە چووم بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کە چووم خۆی دەشۆرد، وە فاطیمەی کچی بە پارچەیێ جل پەردەی بۆ کردبوو، فەرمووی: (درودی خوای لەسەربێ): ئەو ژنە کێیە؟ گوتم: منم ئوم هانیئم.

٢٦٨- عَنْ مَيْمُونَةَ قَالَتْ: وَضَعْتُ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَاءً وَسَتَرْتُهُ فَاغْتَسَلَ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ[٢].

واتە: مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر گوتی: ئاوم دانا بۆ پێغەمبەرو پەردەم بۆیگرتەوە ئینجا خۆی شۆرد. (م).

٢٦٩- (ب - ١ ز - ٢١ فەرمووی: ٧ المجلد الأول التسلسل/٢١ رقم ٧،، زاد هنا بعد: (يُقَالَ: لَهُ ألفَرَقُ) هذه العبارة: تَخْتلِفُ أَيْدِينَا فِيهِ[٣]).

واتە: لێرەدا لەپاش وشەی: پێیان دەگوت فەرق ئەمەشی هەیە: دەستی هەردووکمان لەناو دەفرەکەدا لەکاتی ئاو هەڵگرتندا بەرەنگاری یەکتر دەبوون!.

٢٧٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لا يَنْظُرِ الرَّجُلُ إِلَى عَوْرَةِ الرَّجُلِ وَلا الْمَرْأَةُ إِلَى عَوْرَةِ الْمَرْأَةِ وَلاَ يُفْضِي الرَّجُلِ إِلَىَ الرَّجُلِ فِي

---

(١) بخاري. غسل: ٢٨٠ ، ٣٥٧ ، ٣١١٧ ، ٦١٥٨. مسلم. طهارة: ٧٦٢ ، ٧٦٣ ، ١٦٦٦. ترمذي. استئذان: ٢٧٣٤. نسائي. استتار عند اغتسال: ٢٢٥.

(٢) مسلم. طهارة: ٧٦٥.

(٣) تقدم تخريجه في الحديث: ٧/ ١٥٢

ثَوْبٍ وَاحِدٍ وَلاَ تُفْضِي الْمَرْأَةُ إِلَى الْمَرْأَةِ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ. رَوَاهُ الْخَمْسَةَ إِلا البخاريَّ[٤].

ئەبو سەعيد (خوای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: نە پیاو تەماشای شەرمگای پیاوێکی تر بکاو نە ژنیش تەماشای شەرمگای ژنێکی تر بکا، وە پیاو بەرووتی خۆی نەنووسێنێ بە پیاوێکی ترەوە لە ژێریەك لۆنوێنا، وە هەروەها ژنیش نابێ بە رووتی خۆی بنووسێنێ بەژنێکی ترەوە لەژێر یەك پارچە نوێنا (م/د/ت/ن).

٢٧١- عَنْ بَهْزِ بْنِ حَكِيمٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ قالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ عَوْرَاتُنَا مَا نَأْتِي مِنْهَا وَمَا نَذَرُ؟ قالَ: احْفَظْ عَوْرَتَكَ إِلاَّ مِنْ زَوْجَتِكَ أَوْ مَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِذَا كَانَ الْقَوْمُ بَعْضُهُمْ فِي بَعْضٍ؟ قَالَ: إِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ لاَ يَرَيَنَّهَا أَحَدٌ فَلاَ يَرَيَنَّهَا قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِذَا كَانَ أَحَدُنَا خَالِيًا؟ قالَ: اللَّهُ أَحَقُّ أَنْ يُسْتَحْيَى مِنْهُ مِنَ النَّاسِ. رَوَاهُ أصحاب السنن وللبخاري بعضه[٥].

واتە: لە بەهزی کوڕی حەکیمەوە لە باوکیەوە لە باپیریەوە (رەزای خودایان لێبێ) گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! شەرمگاکانمان زۆرنو جا کامەی دەرخەینو کامەی داپۆشین؟ فەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ): ئاگات لە شەرمگای خۆت بێ مەهێڵە کەس تەماشای بکا مەگەر بۆ ژنو حەلاڵو کەنیزەکی خۆت گوتم: ئەی رەهبەری خودا! ئەی ئەگەر خەڵکەکە زۆربوونو چووبوون بەناو یەکتردا چۆن؟ فەرمووی: تا دەتوانی کەس عەورەتت نەبینێ، گوتم: ئەی رەهبەری خودا! باشە، ئەی ئەگەر یەکێکمان هەر بەتەنها خۆی بوو چۆن؟ فەرمووی: لەم حاڵەدا خودای گەورە لە هەموو کەسێکی تر رەواترو شیاوترە بۆ ئەوە کە شەرمو شکۆی لێ بکرێ (د/ت/ن-س/ح). (ئەم فەرموودەیە هەندێکی بوخاریش ریوایەتی کردووە).

---

(٤) مسلم. طهارة: ٧٦٦. أبو داود. ماجاء في القرى: ٤٠١٨. ترمذي. أدب: ٢٧٩٣.

(٥) بسند حسن (شرحه).

٢٧٢- عَنْ جَرْهَدٍ مِنْ أَصْحَابِ الصُّفَّةِ قالَ: جَلَسَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عِنْدَنَا وَفَخِذِي مُنْكَشِفَةٌ فَقالَ: أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ الْفَخِذَ عَوْرَةٌ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي والبخاري[٦].

جەرهەد (کە یەکێك بوو لە برادەرانی صوففە) گوتی: (خوای لێ رازی بێ): پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دانیشتبوو لە لامان منیش لەوکاتەدا رانم بەدەرەوە بوو، فەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ): ئەوە نازانی کە ران عەورەتە!

٢٧٣- عَنْ يَعْلَى أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَأَى رَجُلاً يَغْتَسِلُ بِالْبَرَازِ بِلاَ إِزَارٍ، فَصَعِدَ الْمِنْبَرَ فَحَمِدَ اللّٰهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ وَقالَ: إِنَّ اللّٰهَ حَيِيٌّ سِتِّيرٌ يُحِبُّ الْحَيَاءَ وَالسَّتْرَ فَإِذَا اغْتَسَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَتِرْ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَالنسائي[٧].

یەعلا (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەو چۆڵە پیاوێکی دی بەرووتی بەبێ پەشتەماڵ خۆی دەشۆرد جا حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) سەرکەوتە سەر دوانگە (مینبەر)و سوپاس‌و ستایشی خودای کردو فەرمووی: خودا بۆ خۆی خاوەن شەرم‌و داپۆشەرو سرپۆشە، وەشەرم‌و شکۆو سرپۆشینی زۆر پێ خۆشە، جا هەر حەلێ کە خۆتان دەشۆرن شەرمی خۆتان داپۆشن (د/ن-سند صالح)

٢٧٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْ دُخُولِ الْحَمَّامَاتِ ثُمَّ رَخَّصَ لِلرِّجَالِ أَنْ يَدْخُلُوهَا فِي الْمَيَازِرِ[٨].

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە پێشا چوونە ناو گەرماوی یاساخکردبوو، بەڵام لەپاشا رێگەی پیاوانی دا کە بچن بۆ حەمام بە مەرجێ لەوێ پشتەماڵ بگرنەوە بەناوەندی ناوك‌و ئەژنویاندا. (د/ت-س/ح).

---

(٦) بخاري. صلاة: باب مايذكر في الفخذ، رقم: ١٢ من كتاب الصلاة. بين رقم: ٣٧٠ وَفي رِوايَةِ رقم: ٣١٧.

(٧) بسند صالح (شرحه).

(٨) بسند حسن (شرحه).

٢٧٥- وَعَنْهاَ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: مَا مِنِ امْرَأَةٍ تَخْلَعُ ثِيَابَهَا فِي غَيْرِ بَيْتِهَا إِلاَّ هَتَكَتْ مَا بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللَّهِ تَعَالَى. رواهما أبو داود والترمذي[٩].

دیسان عائیشه (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەر ژنێ لە غەیری ماڵی خۆیدا جلی دابکنێو خۆی رووت بکاتەوە ئەوە بێگومان کە پەردەی پەیمانی شەرمو شکۆی نێوانی خۆیو نێوانی خودای خۆی دادڕیوە! (د/ت-س/ح).

٢٧٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: إِنَّهَا سَتُفْتَحُ لَكُمْ أَرْضُ الْعَجَمِ وَسَتَجِدُونَ فِيهَا بُيُوتًا يُقَالُ لَهَا الْحَمَّامَاتُ فَلاَ يَدْخُلَنَّهَا الرِّجَالُ إِلاَّ بِالأُزُرِ وَامْنَعُوهَا النِّسَاءَ إِلاَّ مَرِيضَةً أَوْ نُفَسَاءَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَابنْ ماجه[١٠].

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بەزوویی ولاتی عەجەم دەگرن، جۆرە خانوویەکی لێیە، پێی دەڵێن گەرماو، پیاوان تا پەشتە ماڵ نەگرنەوە نەچنە ناوی، لە ژنیشی قەدەغە بکەن، مەگەر بۆ ژنی نەخۆشو زەیستان (د-س/ ضعیف-ئیبنو ماجە).

## ٣٢) بەشی سێیەم: روونکردنەوەی چۆنیتیی خۆشۆردنو حوکمی لەشپیس:

## الفصل الثالث: في بيان الغسل وحكم الجنب

٢٧٧- عَنِ مَيْمُونَةُ قَالَتْ: وَضَعْتُ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَاءً لِلْغُسْلِ، فَغَسَلَ يَدَيْهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا، ثُمَّ أَفْرَغَ عَلَى شِمَالِهِ فَغَسَلَ مَذَاكِيرَهُ، ثُمَّ مَسَحَ يَدَهُ بِالأَرْضِ، ثُمَّ مَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، ثُمَّ أَفَاضَ عَلَى جَسَدِهِ، ثُمَّ تَحَوَّلَ مِنْ

---

(٩) بسند حسن (شرحه).

(١٠) بسند ضعيف (شرحه).

مَكَانِهِ فَغَسَلَ قَدَمَيْهِ وَفِي رِوَايَةٍ: ثُمَّ غَسَلَ رَأْسَهُ ثَلاَثاً. وَفِي رِوَايَةٍ: فَأَتَيْتَهُ بِخِرْقَةٍ فَلَمْ يُرِدْهَا فَجَعَلَ يَنْفُضُ الْمَاءَ بِيَدِهِ[1].

مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر (درودی خودا لەسەر پێغەمبەر بێو رەزای خودایش لەسەر ئەو) گوتی: ئاوی خۆشۆردنم دانا بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەپێشا دوو جار یا سێ جار هەردوو دەستی خۆی شۆرد، ئینجا ئاوی کرد بە دەستی چەپیداو ناوگەڵی خۆی شۆرد، لە پاشا بەزەوییەکە دەستی خۆی سڕی هەتا تەواو ئەثەری تاراتگرتنەکەی پێوە نەمێنێ، ئینجا ئاوی لەدەمو لووتی رادا، ئینجا روخسارو هەردوو دەستی خۆی شۆرد، ئینجا سەرتاپا هەموو لەشی خۆی شۆرد، ئینجا لە شوێنەکەی خۆی گواستیەوە، ئەوجا هەردوو قاچی خۆشی شۆردن! لە گێڕانەوەیەکا: ئینجا سێ جار سەری خۆی شۆرد واتە: لەپێش شۆردنی لەشیدا، لە گێڕانەوەیەکی تردا: جا منیش پەڕۆیەکم بۆ هێنا کە خۆی پێ وشك بکاتەوە بەڵام پەرۆکەی نەویست ئاوەکەی بەدەستی لە لەشی تەکاند (ش/د/ت/ن).

٢٧٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا اغْتَسَلَ مِنَ الْجَنَابَةِ يَبْدَأُ فَيَغْسِلُ يَدَيْهِ ثُمَّ يُفْرِغُ بِيَمِينِهِ عَلَى شِمَالِهِ فَيَغْسِلُ فَرْجَهُ ثُمَّ يَتَوَضَّأُ وُضُوءَهُ لِلصَّلاَةِ ثُمَّ يَأْخُذُ الْمَاءَ فَيُدْخِلُ أَصَابِعَهُ فِي أُصُولِ الشَّعْرِ حَتَّى إِذَا رَأَى أَنْ قَدِ اسْتَبْرَأَ حَفَنَ عَلَى رَأْسِهِ ثَلاَثَ حَفَنَاتٍ ثُمَّ أَفَاضَ عَلَى سَائِرِ جَسَدِهِ ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ. رواهما الخمسة[2].

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: دەستووری پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وابوو کە بۆ لەشپیسی خۆی دەشۆرد، لە پێشا هەردوو دەستی دەشۆرد، تا مووچەکانی، ئەوجا بە دەستی راستی ئاوی دەکرد بە دەستی چەپیاو ناوگەڵی دەشۆرد ئینجا دەسنوێژێکی دەگرت، دەق وەك دەسنوێژی نوێژ!

---

(١) بخاري. غسل: ٢٦٠ ، ٢٤٩ ، ٢٥٧ ، ٢٥٩ ، ٢٦٥ ، ٢٦٦ ، ٢٧٤ ، ٢٧٦ ، ٢٨١. مسلم طهارة: ٧٢٠ ، ٧٦٥. أبو داود. غسل من الجنابة: ٢٤٥. ترمذي. غسل من الجنابة: ١٠٣.

(٢) بخاري. غسل: ٢٤٨ ، ٢٦٢ ، ٢٧٢. مسلم. طهارة: ٧١٦.

ئینجا ئاوی هەڵ دەگرتو پەنجەی دەخستە بن مووەکانی سەری تا دەیزانی کەوا تەواو تەڕبوون، ئەوجا سێ مشت ئاوی دەکرد بەسەر سەریا، لەپاشا سەراپا باقی مەندەی لەشی خۆی دەشۆرد، لە پاشان هەردوو قاچیشی دەشۆرد (ش/د/ت/ن).

٢٧٩- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي امْرَأَةٌ أَشُدُّ ضَفْرَ رَأْسِي أَفَأَنْقُضُهُ لِغُسْلِ الْجَنَابَةِ قالَ: لاَ إِنَّمَا يَكْفِيكِ أَنْ تَحْثِينَ عَلَى رَأْسِكِ ثَلاَثَ حَثَيَاتٍ ثُمَّ تُفِيضِينَ عَلَيْكِ الْمَاءَ فَتَطْهُرِينَ. رَوَاهُ الخمسة إلا البخاري(٣).

واتە: ئوم سەلەمە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من ئافرەتمو پەلکەکانم توند شەتەك دەدەم، ئایا بۆ خۆشۆردنی لەش پێسی هەڵیان وەشێنمەوە یانا؟ فەرمووی: نەء، تەنیا ئەوەندەت بەسە سێ مشت ئاو بکە بەسەر سەرتاو باش قژو کەزییەکانت هەڵگوڵۆفەو ئینجا سەراپا ئاو بکە بەسەر خۆتا ئیتر پاك دەبیتەوە. (م/د/ت/ن).

٢٨٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيُحِبُّ التَّيَمُّنَ فِي طُهُورِهِ إِذَا تَطَهَّرَ وَفِي تَرَجُّلِهِ إِذَا تَرَجَّلَ وَفِي انْتِعَالِهِ إِذَا انْتَعَلَ. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ(٤).

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەکردنی ئەم شتانەدا حەزی لەوە بوو کەلای راستی پێش بخات: لە دەسنوێژ شۆردنو خۆشۆردنا وە لەقژ شانەکردنو پێڵاو لەپێ کردنا (ش/د/ت/ن).

٢٨١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ تَحْتَ كُلِّ شَعْرَةٍ جَنَابَةً فَاغْسِلُوا الشَّعْرَ وَأَنْقُوا الْبَشَرَ. رَوَاهُ الترمذي وَأَبُو دَاوُدَ. وَفِي

(٣) مسلم. غسل: ٧٤٢. أبو داود. نقض شعر المرأة: ٢٥١. ترمذي. نقض شعر المرأة: ١٠٥. نسائي. نقض شعر رأس المرأة: ٢٤١.

(٤) بخاري. وضوء: ١٦٨ ، ٤٢٦ ، ٥٣٨٠ ، ٥٨٥٤ ، ٥٩٢٦. مسلم. طهارة: ٦١٥ ، ٦١٦. أبو داود. لباس. انتعال: ٤١٤٠. ترمذي. تيمن فى الطهور: ٦٠٨ نسائي. بدء أى الرجلين بالغسل: ١١٢ ، ٤١٩ ، ٥٢٥٥.

رِوَايَة: مَنْ تَرَكَ مَوْضِعَ شَعَرَةٍ مِنْ جَنَابَةٍ لَمْ يَغْسِلْهَا فُعِلَ بِهَا كَذَا وَكَذَا مِنَ النَّارِ. قَالَ: عَلِيّ: فَمِنْ ثُمَّ عَادَيْتُ رَأْسِي ثَلَاثاً وَكَانَ يَجُزُ شَعَرَهُ[٥].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: لەژێر هەموو موویەکا لەش پیسی هەیە، کەواتە موو باش بشۆرن‌و پێست تەواو خاوێن بکەنەوە لەکاتی غوسڵ دەرکردندا (ت-سند ضعیف-د) لە گێرانەوەیکا: هەر کەسێ شوێنی تاقە یەك موو بهێڵێتەوەو نەیشۆرێ لەکاتی خۆشۆردنی لەش پیسیدا ئەوە بەئاگری دۆزەخ واوای لێ دەکرێ! عەلی (خوای لێ رازی بێ) سێ جار گوتی: دەسا من لەبەر ئەمەیە کەوا شەڕم بەستۆتە سەری خۆم، عەلی دەستووری وابوو مووی خۆی هەڵ دەپاچی.

٢٨٢- وَقَالَ: أَبْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) كَانَتِ الصَّلَاةُ خَمْسِينَ وَالْغُسْلُ مِنَ الْجَنَابَةِ سَبْعَ مِرَارٍ وَغَسْلُ الْبَوْلِ مِنَ الثَّوْبِ سَبْعَ مِرَارٍ فَلَمْ يَزَلْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَسْأَلُ حَتَّى جُعِلَتِ الصَّلَاةُ خَمْسًا وَالْغُسْلُ مِنَ الْجَنَابَةِ مَرَّةً وَغَسْلُ الْبَوْلِ مِنَ الثَّوْبِ مَرَّةً. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[٦].

ئیبنو عومەر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لەپێشا نوێژ هەموو رۆژێ پەنجا نوێژبوو، خۆشۆردنی لەشپیسیش حەوت جاربوو، شۆردنی میزیش بە جل‌و بەرگەوە حەوت جاربوو، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) هەر داوای لەخودا دەکرد کە بۆ بارسووکی ئۆمەتی کەمیان بکاتەوە هەتا لە ئەنجاما نوێژ لە پەنجا نوێژەوە شەوو رۆژی، بوو بە پێنج نوێژو خۆشۆردنی لەشپیسیش لە حەوت جارەوە بوو بە یەك جار، هەروا شۆردنی میزیش بەجل‌و بەرگەوە ئەویش بوو بە یەك جار (د).

٢٨٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَقِيَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي طَرِيقٍ مِنْ طُرُقِ الْمَدِينَةِ وَأَنَا جُنُبٌ فَاخْتَنَسْتُ.وَفِي رِوَايَة: فَانْسَلَلْتُ فَذَهَبْتُ

---

(٥) رواه الترمذي ، بسند ضعيف (شرحه).

(٦) بسند ضعيف (شرحه).

فَاغْتَسَلْتُ ثُمَّ جِئْتُ فَقالَ: أَيْنَ كُنْتَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ؟ قُلْتُ: إِنِّي كُنْتُ جُنُبًا فَكَرِهْتُ أَنْ أُجَالِسَكَ عَلَى غَيْرِ طَهَارَةٍ. قالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ! إِنَّ الْمُسْلِمَ لاَ يَنْجُسُ(٧).

ئەبو هورەیرە (خوای لیٚ رازی بیٚ) گوتی: جاریٚ لەشم پیسبوو، لە یەكیٚ لە ڕیٚگەكانی مەدینە تووشی پیٚغەمبەر بووم (دروودی خوای لەسەربیٚ) لەبەر ئەوە خۆم لیٚی شاردەوە. لە گیٚڕانەوەیەكا گوتی: لەبەرئەوە خۆم لیٚ دزییەوەو چووم خۆم شۆردو هاتمەوە بۆ خزمەتی، فەرمووی: ئەی ئەبو هورەیرە! لەكویٚ بووی؟ گوتم: ڕاستیەكەی لەشم پیس بوو، لەبەر ئەوە حەزم نەكرد بە لەشی ناپاكەوە لە خزمەتتا دانیشم. فەرمووی: سوبحانەڵلا! چەندە سەیریت! موسوڵمان چۆن پیس دەبیٚ!.

٢٨٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ أللهُ عَنهُا) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا كَانَ جُنُبًا فَأَرَادَ أَنْ يَأْكُلَ أَوْ يَنَامَ تَوَضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلاَةِ. رواهما الخمسة(٨).

عائیشە (خوای لیٚ رازی بیٚ) گوتی: پیٚغەمبەر (دروودی خوای لەسەربیٚ) دەستووری وابوو ئەگەر بە لەشی پیسەوە بی ویستبایە شت بخوا، یا بخەویٚ، لە پیٚشا دەسنویٚژیٚكی دەگرت، دەق وەك دەسنویٚژی نویٚژی! (ش/د/ت/ن).

٢٨٥- سَأَلْتُ عَائِشَةَ (رَضِيَ أللهُ عَنهُا) كَيْفَ كَانَ رَسُولِ اللَّـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَصْنَعُ مِنَ الْجَنَابَةِ؟ أَكَانَ يَغْتَسِلُ قَبْلَ أَنْ يَنَامَ أَمْ يَنَامُ قَبْلَ أَنْ يَغْتَسِلَ؟ قَالَتْ: كُلُّ ذَلِكَ قَدْ كَانَ يَفْعَلُ، رُبَّمَا اغْتَسَلَ فَنَامَ وَرُبَّمَا تَوَضَّأَ فَنَامَ قُلْتُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي جَعَلَ فِي الأَمْرِ سَعَةً. رَوَاهُ الْخَمْسَةَ إِلاَّ الْبُخارِيَّ(٩).

پرسیاركرا لە عائیشە (خوای لیٚ رازی بیٚ): جاران پیٚغەمبەر (دروودی خوای لەسەربیٚ) لە حاڵی لەش پیسیدا چی دەكرد؟ ئایا لە پیٚشا خۆی دەشۆردو ئەوجا دەنووست یا لە پیٚشا دەخەوت لە پاشا خۆی دەشۆرد؟ عائیشەیش گوتی:

---

(٧) بخاري. غسل: ٢٨٣ ، ٢٨٥. مسلم. طهارة: ٨٢٢ أبو داود. الجنب يصافح: ٢٣١. ترمذي. مصافحة الجنب: ١٢١. نسائي. مجالسة الجنب: ٢٦٩.

(٨) بخاري. غسل: ٢٨٧ ، ٢٨٩ ، ٢٩٠. مسلم. طهارة: ٧٠٢.

(٩) مسلم. طهارة: ٧٠٣. أبو داود. وقت الوتر: ١٤٣٧. ترمذي. في قراءة الليل: ٤٤٩.

هەردوولایانی دەکرد: جار جارە لە پێشا خۆی دەشۆردو ئەوجا دەنووست جارجارەیش بەس دەسنوێژی دەگرتو دەخەوت. قسەگێڕەوە کە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەیسە دەڵێ: منیش گوتم: سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە ئەم کارەی ئاوا گوشاد کردووە (م/د/ت/ن).

٢٨٦– عَنْ أَنَسٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَطُوفُ عَلَى نِسَائِهِ فِي اللَّيْلَةِ الْوَاحِدَةِ وَلَهُ يَوْمَئِذٍ تِسْعُ نِسْوَةٍ. وَفِي رِوَايَةٍ: كَانَ يَطُوفُ عَلَى نِسَائِهِ بِغُسْلٍ وَاحِدٍ. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ[١٠].

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەسەر دەمێکا نۆ ژنی هەبوو، وادەبوو لەیەك شەودا دەڕۆیشتە لای هەرنۆیان لە گێڕانەوەیەکا: وادەبوو یەکە یەکە دەڕۆیشتە لای ژنەکانیو لە دواییدا یەکجار خۆی دەشۆرد (ش/د/ت/ن).

٢٨٧– عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا أَتَى أَحَدُكُمْ أَهْلَهُ ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يَعُودَ فَلْيَتَوَضَّأْ بَيْنَهُمَا وُضُوءً. رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ البخاريَّ[١١].

ئەبو سەعید (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر کەسێکتان رۆیشتە لای ژنی خۆیو لەپاشا ویستی دووبارەی بکاتەوە با لە نێوانی هەردوو جارەکەدا دەسنوێژێ بگرێ دەق وەك دەسنوێژی نوێژ (م/د/ت/ن).

٢٨٨– عَنْ أَبِي رَافِعٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) قالَ: طَافَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَاتَ يَوْمٍ عَلَى نِسَائِهِ يَغْتَسِلُ عِنْدَ هَذِهِ وَعِنْدَ هَذِهِ. قالَ: فَقُلْتُ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلاَ تَجْعَلُهُ غُسْلاً وَاحِدًا؟ قالَ: هَذَا أَزْكَى وَأَطْيَبُ وَأَطْهَرُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَالنَسائيُّ[١٢].

---

(١٠) بخاري. غسل: ٢٧٠ ، ٢٦٨ ، ٢٨٤ ، ٥٠٦٨ ، ٥٢١٥. مسلم. طهارة: ٧٠٦.

(١١) مسلم. طهارة: ٧٠٥. أبو داود. الوضوء لمن أراد العود: ٢٢٠. ترمذي. الجنب المعيد للجماع: ١٤١. نسائي. الجنب المعيد: ٢٦٢.

(١٢) بسند صحيح (شرحه).

ئەبو رافیع (خوای لێ رازی بێ) گوتی: ڕۆژێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) یەك لەدوای یەك ڕۆیشتە لای ژنەكانی و لەلای هەمووشیان خۆی شۆرد، منیش پێم گوت: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆچی لەپاش چوونەلای هەموویان یەك جار خۆت ناشۆریتو لەشپیسیی خۆت دەرناكەی، فەرمووی: بەم شێوەیە بەبڕشتترو خۆشترو پاكو خاوێنترە (د/ن-س/ص).

٢٨٩- عَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قالَ: كَانَ ٱلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْرَئُنا ٱلْقُرْآنَ عَلى كَلّ حَالٍ ما لَمْ يَكُنْ جُنُبًا. رَوَاهُ أصحاب السنن[١٣].

عەلی (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جاران پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەستووری وابوو - بە لەشی پیسەوە نەبێ - لە هەموو حاڵێكی تردا دەرسی قورئانی پێ دەگوتین (د/ت/ن-س/ص).

**٣٣) باسی حەوتەم: باسی بێنوێژیو زەیستانیو بێنوێژیی ناوەخت (ئیستیحاضە) (ئەم باسە سێ بەشە):**

**بەشی یەكەم: باسی تێكەڵیو گوزەرانكردن لەگەڵ ئەم ژنانەدا**

**الباب السابع: في الحيض والنفاس والاستحاضة وفيه ثلاثة فصول:**

**الفصل الأول: في مخالطتهن**

٢٩٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ الْيَهُودَ كَانُوا إِذَا حَاضَتِ الْمَرْأَةُ فِيهِمْ لَمْ يُؤَاكِلُوهَا وَلَمْ يُجَامِعُوهُنَّ فِي الْبُيُوتِ فَسَأَلَ أَصْحَابُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ ذَلِكَ فَأَنْزَلَ اللّٰهُ - وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ وَلا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّى يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللهُ. فَقالَ: رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): اصْنَعُوا كُلَّ شَيْءٍ إِلاَّ النِّكَاحَ فَبَلَغَ ذَلِكَ الْيَهُودَ فَقَالُوا: مَا يُرِيدُ هَذَا الرَّجُلُ أَنْ يَدَعَ مِنْ أَمْرِنَا شَيْئًا إِلاَّ خَالَفَنَا فِيهِ فَجَاءَ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ وَعَبَّادُ بْنُ بِشْرٍ فَقَالاَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنَّ الْيَهُودَ تَقُولُ كَذَا وَكَذَا فَلاَ نُجَامِعُهُنَّ؟ فَتَغَيَّرَ وَجْهُ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى ظَنَنَّا أَنْ قَدْ وَجَدَ عَلَيْنَا

---

(١٣) بسند صحيح (شرحه).

فَخَرَجَا فَاسْتَقْبَلَهُمَا هَدِيَّةٌ مِنْ لَبَنٍ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَرْسَلَ فِي آثَارِهِمَا فَسَقَاهُمَا فَعَرَفَا أَنْ لَمْ يَجِدْ عَلَيْهِمَا. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ إِلاَّ البخاريَّ[1].

ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: جوولەکە دەستووریان وابوو کە ژنیان دەکەوتە بێنوێژییەوە ئیتر نە لەگەڵیاندا دەخواردنو نە لەماڵیشەوە لەگەڵیان دادەنیشتن، بەڵکوو پارێزیان لێ دەکردنو جێیان بۆ جیا دەکردنەوە! یارانی پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) لەم بارەیەوە لێیان پرسی، جا خودا ئەم ئایەتەی ناردە خوارده:

{وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُواْ النِّسَاء فِي الْمَحِيضِ وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىَ يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللّهُ – ٢/٢٢٢}.

واتە: هاوڕێکانت پرسیارت لێ دەکەن لە حوکمی بێنوێژی: کە چۆنەو چی لێ پەیدا دەبێ؟ بفەرموو پێیان: خوێنی بێنوێژی قیزاوییەو مایەی ڕەنجو ئێشوئازارە هەم بۆ ژنەکە هەم بۆ مێردەکە، دەی کەنار بگرن لە ژنەکان لەکاتی بێنوێژیدا، وە نزیکیان مەبنەوە هەتا پاك دەبنەوەو خۆیان دەشۆرن، جا کاتێ کە خۆیان پاك کردەوەو لەش پیسی خۆیانیان دەرکرد بچنە لایان لەو شوێنەوە کە خودا ڕێی داوونو ڕەوای دیوە بۆتان، جا حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەموشتێ بکەن لەگەڵیانا تەنیا چوونە لا نەبێ، کە جوولەکەکان ئەمەیان بیست گوتیان: ئەم پیاوە دەیەوێ لە هەموو یاسایەکی ئێمەدا دژی ئێمە بوەستێ، جا ئوسەیدی کوڕی حوضەیرو عوببادی کوڕی بیشر هاتن بۆ خزمەتی حەزرەتو ئەم باسەیان بۆ گێڕایەوەو گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆچی ڕێگەمان پێ نادەی هەتا لەکاتی بێنوێژیشدا بچینە لایانو دروست ببین لەگەڵیانا؟! جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ڕووی گرژکردو ڕەنگی گۆڕا، هەتا گومانمان برد کە حەزرەت لە دڵەوە زویر بووە لێیان، جا هەردووکیان هەستانو ڕۆیشتن، لەپاشا هەندێ شیریان بەدیاری

---

(١) مسلم. حيض: ٦٩٢. أبو داود. مؤاكلة الحائض: ٢٥٨ ترمذي. تفسير القرآن: ٢٩٧٧. نسائي. طهارة تأويل دويسألونك عن الحيض (٢٨٧).

هێنا بۆ حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) وە حەزرەت هەندێ لەو شیرەی نارد بۆیانو خواردیانەوەو تێگەیشتن کە حەزرەت دڵی لێیان نەیەشاوە (م/د/ت/ن).

٢٩١- وَقَالَتْ عَائِشَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ): قَالَ: لِيْ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَاوِلِينِي الْخُمْرَةَ مِنَ الْمَسْجِدِ فَقُلْتُ: إِنِّي حَائِضٌ. فَقالَ: إِنَّ حَيْضَتَكِ لَيْسَتْ فِي يَدِكِ فَنَاوَلْتُهُ. رَوَاهُ الْخَمْسَةَ إِلاَّ البخاريَّ[٢].

دیسان عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەناو مزگەوتەوە فەرمووی پێم: بەرماڵەکەم بدەرێ. منیش گوتم: ئاخر چۆن دەبێ، خۆ من بێنوێژم چۆن دەست درێژ بکەم بۆ ناو مزگەوت؟ فەرمووی (درودی خوای لەسەربێ): خۆ خوێنی بێنوێژییەکەت لەناو دەستتا نیەو دەستت پاکە جا منیش بەرماڵەکەم دایە دەستی (م/د/ت/ن).

٢٩٢- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (رَضيَ اللّهُ عَنْهُا) وَكَانَتْ بَايَعَتِ ألنَّبِيّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَتْ: كُنَّا لاَ نَعُدُّ الْكُدْرَةَ وَالصُّفْرَةَ بَعْدَ ألطُّهْرِ شَيْئًا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَالبخاري والنسائي[٣].

واتە: ئوم عەطییە (خوای لێ رازی بێ) – کە یەکێك بوو لەو ژنانە کە پەیمانیان دابوو بە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) – گوتی: دەستوورمان وا بوو لەپاش پاکەوە بوون لە بێنوێژی، لێڵاوو زەرداومان بەهیچ دانەدەنا (د/ب/ن).

## ٣٤) بڕێتی (کەففارەت)ی چوونەلای ژنی بێنوێژ: (كفارة الوقاع في الحيض)

٢٩٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الَّذي يَأْتِي امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ قَالَ: يَتَصَدَّقُ بِدِينَارٍ أَوْ بِنِصْفِ دِينَارٍ. رَوَاهُ أصحاب السنن[١].

---

(٢) مسلم. طهارة: ٦٨٧. أبو داود. لحائض تناول فى المسجد: ٢٦١. ترمذي. الحائض تناول... من المسجد: ١٣٤. نسائي. استخدام الحائض: ٢٧١.

(٣) بخاري. حيض: ٣٢٦.

(١) بسند صحيح (شرحه).

ئیبنو عەباس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە بارەی ئەو کەسەوە کە لە بێنوێژیدا بڕواتە لای ژنی خۆی، فەرمووی: دینارێ یا نیو دینار بکا بەخێر (د/ت/ن-س/ص).

٢٩٤- وَلأَبِي دَاوُدَ: إِذَا أَصَابَهَا فِي أَوَّلِ الدَّمِ فَدِينَارٌ وَإِذَا أَصَابَهَا فِي انْقِطَاعِ الدَّمِ فَنِصْفُ دِينَارٍ(٢).

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: پیاو ئەگەر لەسەرەتای خوێنی بێنوێژییەوە چووە لای ژن، ئەوە دینارێ خێری لەسەرە، ئەگەر لەکاتی ووشکایی هاتنی خوێنەکەدا چووە لای، نیو دیناری خێری لەسەرە مەبەست دیناری زێڕی سەردەمی پێغەمبەرە. (د-س/ص).

٢٩٥- وللترمذي: نَقْلاً مِنْ شرحِ غاية المأمول: إِذَا كَانَ دَمًا أَحْمَرَ فَدِينَارٌ وَإِذَا كَانَ دَمًا أَصْفَرَ فَنِصْفُ دِينَارٍ(٣).

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر خوێنەکە سوور بوو ئەوە دینارێ کەفارەتی لەسەر، بەڵام ئەگەر خوێنەکە زەرد بوو ئەوە نیو دینار کەفارەتی لەسەرە (ت): ئەم فەرموودەیە نەقڵ کراوە لە غایەتول مەئموولەوە کە شەرحی تاجە.

٢٩٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أَتَى حَائِضًا أَوِ امْرَأَةً فِي دُبُرِهَا أَوْ كَاهِنًا فَقَدْ كَفَرَ بِمَا أُنْزِلَ عَلَى مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رَوَاهُ الترمذي(٤).

لە ئەبو هورەیرەوە (خوای لێ رازی بێ) پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: کەسێ بڕواتە لای ژنی بێنوێژ یا لە دواوە بە پاش بڕواتە لای ژن، یا بچێت بۆلای کاهین کە بەدرۆ لافی زانینی غەیب لێ دەدا وەباوەڕ بەقسەی بکا لەم بارەیەوە، ئەوە بەراستی باوەڕی نەماوە بەو قورئانەی

---

(٢) بسند صحيح (شرحه).

(٣) سكت عن درجة الحديث الشارح (مترجم).

(٤) بسند ضعيف (شرحه).

كە هاتۆتە خوارەوە بۆ موحەممەد (دروودو صەلاتو سەلامی خودای لەسەربێ) (ت— سند ضعيف).

**٣٥) بەشی دووەم: باسی حوکمی ژنی زەیستانو ژنی بێنوێژو چۆنیتی پاکەوە بوونیان: (الفصل الثاني: في تطهرهن وحكم الحائض والنفساء)**

٢٩٧- عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ أَسْمَاءَ (رَضيَ اللهُ عَنهُما) سَأَلَتِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ غُسْلِ الْمَحِيضِ فَقالَ: تَأْخُذُ إِحْدَاكُنَّ مَاءَهَا وَسِدْرَتَهَا فَتَطَهَّرُ فَتُحْسِنُ الطُّهُورَ ثُمَّ تَصُبُّ عَلَى رَأْسِهَا فَتَدْلُكُهُ دَلْكًا شَدِيدًا حَتَّى تَبْلُغَ شُئُونَ رَأْسِهَا ثُمَّ تَصُبُّ عَلَيْهَا الْمَاءَ. ثُمَّ تَأْخُذُ فِرْصَةً مُمَسَّكَةً فَتطَهَّرُ بِهَا فَقَالَتْ أَسْمَاءُ: وَكَيْفَ تَطَهَّرُ بِهَا؟ فَقَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ تَطَهَّرِينَ بِهَا فَقَالَتْ عَائِشَةُ: تَتَبَّعِينَ أَثَرَ الدَّمِ. وَفِي رواية: قَالَ: خُذِيْ فِرْصَةً مُمَسَّكَةً فَتَوَضَّئِي بِهَا ثَلاثاً وَاسْتَحْيَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَعْرَضَ بِوَجْهِهِ فَقَالَتْ عَائِشَةُ: نِعْمَ النِّسَاءُ نِسَاءُ الأَنْصَارِ لَمْ يَكُنْ يَمْنَعُهُنَّ الْحَيَاءُ أَنْ يَتَفَقَّهْنَ فِي الدِّينِ. رَوَاهُ الْخَمْسَة إلاَّ النرمذي[1].

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: ئەسماء بۆچونیەتی خۆشۆردنی بێنوێژی لە پێغەمبەری پرسی فەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ): هەر کامێکتان کە ویستی خۆی بشۆرێ با لە پێشا ئاوو مۆردەکەی ئامادە بکاو خۆی پاك بکاتەوەو تاراتێکی جوان بگرێ، ئینجا دەسنوێژێکی جوان بگرێ، ئەوسا ئاو بکا بەسەر سەریاو دەستی تێخاو زۆر باش هەڵی بگلۆفێ تا ئاو دەگاتە بن مووەکانی سەری، ئەو حەلە ئاو بکا بەسەر خۆیا سەراپا، ئینجا گوڵەلۆکەیەکی میسکاوی یا گوڵە خورییەکی میسکاوی بێنێ یا پەڕۆیەکی بۆنخۆش بێنێ خۆی پێ پاك بکاتەوەو تاراتی پێ بگرێ! ئەسمائیش باش تێ نەگەیشت گوتی: چۆن چۆن خویی پێ پاك بکاتەوەو تاراتی پێ بگرێ؟ فەرمووی: (دروودی خوای لەسەربێ) سوبحانەڵڵا سەیرە بۆ تێ ناگەی! خۆتی پێ پاك بکەرەوەو تاراتی پێ بگرەو تەواو. عائیشەش (خوای لێ رازی بێ) گوتی: منیش ئەسمام

(١) بخاري. حيض: ٣١٤ ، ٣١٥ ، ٧٣٥٧ ، مسلم. حيض: ٧٤٨ ، ٧٤٦. نسائي. غسل: ٢٥١. أبو داود. حيض: ٣١٤.

راکێشا بەلای خۆمەوە کە کچی شەکەل بوو، وە پێم گوت: وەرە من تێت بگەیەنم: بیهێنە بە شوێنی خوێنەکەداو داینێ لەناو شەرمتا، تا ناوگیانت بۆ ساری لێ نەیەو بۆنی خۆش بێ، لەگێڕانەوەیەکا، حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) سێ جار فەرمووی: پارچەیەکی میسکاوی بێنەو تاراتی پێ بگرە ئیتر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) شەرم گرتیو رووی کرد بەولاوە،، عائیشە دەیگوت: ژنگەلی یاریدە دەران (انصار) ژنگەلی چاکن ئافەریم بۆ خۆیان! شەرمو شکۆ رێگەی ئەوەی لێ نەدەگرتن کە بۆ خۆیان شارەزای ئایین بن! (ش/د/ن).

٢٩٨- وَبَعَثَ نِسَاءٌ إِلَى عَائِشَةَ بِالدُّرْجَةِ فِيهَا الْكُرْسُفُ فِيهِ الصُّفْرَةُ فَقَالَتْ: لاَ تَعْجَلْنَ حَتَّى تَرَيْنَ الْقَصَّةَ الْبَيْضَاءَ. تُرِيدُ بِذَلِكَ تَمَامَ الطُّهْرِ مِنَ الْحَيْضَةِ. رَوَاهُالبخاري ومالك[٢].

ئافرەتان قەعەدەیان نارد بۆلای عائیشە، کە زەرداوی پاش خوێنی بێنوێژی بە گوڵەلۆکەوە لەناو قەعەدەکەدا بوو گوتیان: ئایا ئەم دەرداوەش دادەنرێ بە خوێنی بێنوێژی یانا؟ عائیشەش وەرامی بۆ ناردنو گوتی: پەلەمەکەن لە کردنی نوێژو گرتنی رۆژوو کردنی شتی تر تا لینجاوە سپییەکەی هەرە دواوە دەبینن کە وەك گەچاو وایە، یا گوتی: پەلە مەکەن لە غوسڵ دەرکردن تا پەڕۆی بێنوێییەکەتان کە لە ناوگیانتان دەری دێنن وەگ گەچ سپی بێ، مەبەستی عائیشە لەم وەڕامە ئەوەبوو کە تەواو لە بێنوێژی پاك ببنەوە (ب/ مالك).

٢٩٩- عَنْ مُعَاذَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ فَقُلْتُ: مَا بَالُ الْحَائِضِ تَقْضِي الصَّوْمَ وَلاَ تَقْضِي الصَّلاَةَ فَقَالَتْ: أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ قُلْتُ لَسْتُ بِحَرُورِيَّةٍ وَلَكِنِّي أَسْأَلُ. قَالَتْ: كَانَ يُصِيبُنَا ذَلِكَ فَنُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّوْمِ وَلاَ نُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّلاَةِ. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ[٣].

---

(٢) أثر ذكره البخاري فى كتاب الحيض. باب: إقبال المحيض وإدباره. قبل رقم: ٣٢٠ (مترجم).

(٣) بخاري. حيض: ٣٢١. مسلم. حيض: ٧٥٩ ، ٧٦١. أبو داود. حيض: ٢٦٢ ، ٢٦٣. ترمذي. حيض: ١٣٠. نسائي. حيض: ٣٨٠.

موعاذە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە عائیشەم پرسی گوتم: بۆچی ئافرەتی بێنوێـژ رۆژووی رەمـەزان دەگێڕێتـەوە كەچـی نوێـژە فـەرزەكان ناگێڕێتـەوە؟ گوتی: بۆ تۆیش حەرووریيەتو لەو خەواریخانەی كە دەڵێن: دەبێ ژن نوێژی كاتی بێنوێـژیش وەك رۆژوو بگێڕێتـەوە؟ گوتم: خـەیر، من لـەوان نیم، بـەڵام پرسـیارەو دەیكـەم، گـوتی: جـاران بەسـەرینیی پێغەمبـەر خـۆی (درودی خوای لەسـەربێ) كـە دەكەوتینـە بێنوێژییـەوە لـەپاش پـاك بوونـەوەو خۆشـۆردن، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمانی دەكرد پێمان كە رۆژوو بگێڕینـەوە بـەڵام فەرمانی پێ نەدەكردین كە نوێژ بگێڕینەوە. (ش/د/ت/ن).

٣٠٠- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَـتِ النُّفَـسَاءُتَجْلِسُ عَلَـى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَرْبَعِينَ يَوْمًـا فَكُنَّـا نَطْلِـي وُجُوهَنَـا بِـالْوَرْسِ مِـنَ الْكَلَفِ. رَوَاهُ الترمذي وَأَبو دَاوُدَ[٤].

ئـوم سـەلەمە (خـوای لێ رازی بـێ) گـوتی: لـە سـەردەمی (ژیـانی) پێغەمبـەردا (درودی خوای لەسەربێ) ژنـی زەیـستانی چـل رۆژ دادەنیـشتو دەسـتی هەڵـدەگرت لەنوێـژو پەرسـتشو دروسـتبوونو كۆبوونـەوە لەگـەڵ مێـردا، هـەتا وامـان لێ دەهـات لەبـەر زیپكـەو قنـچكەو ناخـاوێنی رووی خۆمـان دەگرتـە زەعفـەران! (ت/د-س/ص).

٣٠١- وَعَنْهاَ كَانَتِ الْمَرْأَةُ مِنْ نِسَاءِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَقْعُدُ فِي النِّفَاسِ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً لاَ يَأْمُرُهَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِقَضَاءِ صَلاَةِ النِّفَاسِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[٥].

دیسان گوتی: جاران ژنی زەیستان — لە كەسو كاری پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێ) — چل شەو لێ دەكەوتو وازی لە نوێژو رۆژوو پەرستش دەهێنـاو جـووت نـەدەبوو لەگـەڵ شـووەكەی پێغەمبـەریش (درودی خـوای لەسـەربێ) لـەوەدوا پێی نەدەگوت كە نوێژی ئەو ماوەی زەیستانییەی بگێڕێتەوە (د).

---

(٤) بسند صحيح (شرحه).

(٥) سكت عن درجة الحديث الشارح (مترجم).

٣٠٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَقْـرَإِ الْحَـائِضُ وَلاَ الْجُنُبُ شَيْئًا مِنَ الْقُرْآنِ. رَوَاهُ الترمذي[٦].

ئیبنــو عومــەر (خــوای لێ ڕازی بــێ) گــوتی: پێغەمبــەر (درودی خــوای لەســەربێ) فــەرمووی: نابــێ ژنــی بێنوێـژو ئـادەمیزادی لەشـپیس قورئـان بخـوێنن (ت-س/ص).

٣٠٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: وَجِّهُوا هَذِهِ الْبُيُوتَ عَنِ الْمَسْجِدِ فَإِنِّي لاَ أُحِـلُّ الْمَـسْجِدَ لِحَـائِضٍ وَلاَ جُنُـبٍ. رَوَاهُ أَبُـو دَاوُدَ[٧].

عائیــشه (خــوای لێ ڕازی بــێ) گــوتی: پێغەمبــەر (درودی خــوای لەســەربێ) فەرمووی: دەرگای ماڵەکانتان لەسەر ناوماڵی مزگەوت لابەرن چونکە من چوونە ناو مزگەوت ڕەوا نابینم نە بۆ ژنـی بێنوێـژو نـە بۆ لەشـپیس (د-سند ضعیف).

## ٣٦) بەشی سێیەم: باسی ئەحکامی موستەحاضە یا ژنی بێنوێژی بێ وەخت واتە: ئەو ژنەی کە لە غەیری کاتی خۆشیا (وەختو ناوەخت) دەکەوێتە سەرخوێن جا ئەم ژنە یا بەدەستووری لەوەپێشی دەکا یاماوەی خوێنە بەهێزەکەیان دادەنێ بە خوێنی بێنوێژیو کاڵەکەشیان دادەنێ بە پاکی:

## الفصل الثالث: في أحكام المستحاضة. ترجع لعادتها أو تعمل القوى حيضا

٣٠٤- عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ أَبِي حُبَيْشٍ سَأَلَتِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَتْ: إِنِّي أُسْتَحَاضُ فَلاَ أَطْهُرُ أَفَأَدَعُ الـصَّلاَةَ؟ فَقَـالَ: لاَ إِنَّ ذَلِـكِ عِـرْقٌ وَلَـيْسَ بِالْحَيْضَةِ وَلَكِنْ دَعِي الصَّلاَةَ قَدْرَ الْأَيَّامِ الَّتِي كُنْتِ تَحِيضِينَ فِيهَا ثُمَّ اغْتَسِلِي وَصَلِّي.

---

(٦) بسند صحيح (شرحه).

(٧) بسند ضعيف (شرحه).

وفي رواية: إِذَا أَقْبَلَتِ ٱلْحَيْضَةُ فَدَعِي الصَّلاَةَ وَإِذَا أَدْبَرَتْ فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ وَصَلِّي. رَوَاهُ الخمسة وزاد الترمي: وَتَوَضَّئِي لِكُلِّ صَلاَةٍ حَتَّى يَجِيءَ ذلِكِ ٱلْوَقْتُ[١].

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: فاطیمەی کچی ئەبو حوبەیش لە پێغەمبەری پرسی (درودی خوای لەسەربێ) گوتی: من کە دەکەومە بێنوێژییەوە ئیتر هەرپاك نابمەوە، جا ئایا هەتا حاڵم ئاوەها بێ واز لە نوێژبێنم یانا؟ فەرمووی: نەء، چونکە ئەوە دەمارەو خوێنی بەربووە وە ئەوە خوێنی بێنوێژی نیە، بەلأم لەوەپێش چەن رۆژ دەکەوتیتە بێنوێژییەوە ئێستاش لەم حاڵەدا بەقەد ئەو رۆژانەی بێنوێژی جارانت نوێژ مەکە، ئینجا خۆت بشۆرەو نوێژی خۆت بە ئاسایی بکە، لە گێڕانەوەیەکا: کاتێ سەرەتای بێنوێژییەکەی جارانت دەستی پێ کرد ئیتر نوێژ مەکە هەتا بەقەد ئەورۆژانە دەروا، ئینجا با خوێنەکەش نەوەستێ بەلأم تۆ بەنیازی خۆشۆردنی بێنوێژی خۆت بشۆرەو، نوێژی خۆتی لێ بکە (ش/د/ت/ن) تیرمیذی ئەمەی پترە: وەبۆ هەموو نوێژێکیش دەسنوێژێکی تازە بگرەوە، هەتا دیسانەوە دەچێتەوە کاتی خۆت، ئیتر دووبارە وا دابنێ کەوا تازە تێ دەکەویتو واز لە نوێژ بێنەوە، ئیتر هەموو کات بەم دەستوورە واز دێنی یا تێهەڵدەچیتەوە.

٣٠٥- وَلِأَبِي دَاوُدَ: (رَحِمَهُ اللّٰه) لِتَنْظُرْ عِدَّةَ ٱلْأَيَّامِ واللَّيَالِي الَّتِى كَانَتْ تَحِيضُهُنَّ مِنَ الشَّهْرِ قَبْلَ أَنْ يُصِيبَهَا الَّذِى أَصَابَهَا فَلْتَتْرُكِ الصَّلاَةَ قَدْرَ ذَلِكَ مِنَ الشَّهْرِ فَإِذَا خَلَّفَتْ ذَلِكَ فَلْتَغْتَسِلْ ثُمَّ لْتَسْتَثْفِرْ بِثَوْبٍ ثُمَّ لِتُصَلِّي[٢].

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: با ژن باش سەرنجی ژمارەی ئەو رۆژو شەوانە بدا کە جاران هەموو مانگێ تیایانا دەکەوتە بێنوێژییەوە بەر لەوەی کە تووشی ئەم حاڵە ببێ، جا لەپاش تووشبوونی ئەم حاڵەیش هەموومانگێ بە ئەندازەی دەستووری پێشوویو بە ژمارەی رۆژانی جارانی،

---

(١) بخاري. وضوء: ٢٢٨ ، ٣٠٦ ، ٣٢٠ ، ٣٢٥ ، ٣٣١. مسلم. حيض: ٧٥١. ترمذي. ماجاء فى المستحاضة: ١٢٥. نسائي. ذكر الأقراء: ٣٥٧.

(٢)....؟

واز لە نوێژ بێنێ، جا کە لەو ژمارەیە ڕەت بوو ئیتر باخۆی بشۆرێ لە پاشا بە جلکێ خۆی قایم بکاو تۆپەوانەیێ بۆ وانێکەکەی بکاو نەیەڵێ خوێنەکە لەکاتی کردنی نوێژەکاندا بێتە دەرێ، ئەوجا با نوێژی خۆی بکا (د).

٣٠٦– عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ أَبِي حُبَيْشٍ أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنِّي أُسْتَحَاضُ فَقَالَ: لَهَا: إِذَا كَانَ دَمُ الْحَيْضِ فَإِنَّهُ دَمٌ أَسْوَدُ يُعْرَفُ فَإِذَا كَانَ ذَلِكَ فَأَمْسِكِي عَنِ الصَّلاَةِ فَإِذَا كَانَ الآخَرُ فَتَوَضَّئِي وَصَلِّي فَإِنَّمَا هُوَ عِرْقٌ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي[٣].

فاطیمەی کچی حوبەیش (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من لە وەخت‌و ناوەختا دەکەومە سەر خوێن، فەرمووی: (درودی خوای لەسەربێ) ئەگەر خوێنی بێنوێژی بێ دیارە، چونکە خوێنێکی ڕەشی خەستی بۆگەنەو ژنان خۆیان باشی دەناسن، جا هەر کاتێ ئاوابوو ئەوە خۆیەتی، ئیتر دەست هەڵگرە لە نوێژ، وە ئەگەر بەجۆرێکی تریش بوو ئەوە خۆی نیەو لەبەر ئەوە دەسنوێژی خۆتی لێ بگرەو بە سەربەستی بەبێ پەروا نوێژی خۆتی لێ بکە! چونکە ئەوە لەم حاڵەدا تەنیا دەمارەو خوێنی بەربووەو پەیوەندی بە بێنوێژییەوە نیە (د/ن–سند حسن).

**٣٧) جا ئەم ژنە یا وەك گوترا وا دەکا، یاخود زوربەی کاتی بێنوێژی واتە: (غالب الحیض) کە شەشە یا حەوت ڕۆژە دادەنێ بە ماوەی بێنوێژی‌و باقی مەندەی مانگ دادەنێ بە کاتی پاکی، وەیاخۆ هەموو ڕۆژێ دوانزە مانگەی خوا سێ جار خۆی دەشۆرێ‌و دوو نوێژ دوو نوێژ کۆیان دەکاتەوەو نوێژی بەیانەکیش بەغوسڵێکی سەربەخۆ دەکا!:**

**تتحیض غالب الحین أو تجمع الصلاتین بعد الغسل...**

٣٠٧– عَنْ حَمْنَةَ بِنْتِ جَحْشٍ قَالَتْ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنِّي امْرَأَةٌ أَسْتَحَاضُ حَيْضَةً كَثِيرَةً شَدِيدَةً فَمَا تَرَى فِيهَا قَدْ مَنَعَتْنِي الصَّلاَةَ وَالصَّوْمَ؟ قالَ: أَنْعَتُ لَكِ الْكُرْسُفَ فَإِنَّهُ يُذْهِبُ الدَّمَ قَالَتْ: هُوَ

---

(٣) بسند حسن •شرحه).

أَكْثَرُ مِنْ ذَلِكَ. قالَ: فَاتَّخِذِي ثَوْبًا فَقَالَتْ: هُوَ أَكْثَرُ مِنْ ذَلِكَ إِنَّمَا أَثُجُّ ثَجًّا. قالَ: سَآمُرُكِ بِأَمْرَيْنِ أَيَّهُمَا فَعَلْتِ أَجْزَأَ عَنْكِ مِنَ الآخَرِ فَإِنْ قَوِيتِ عَلَيْهِمَا فَأَنْتِ أَعْلَمُ إِنَّمَا هَذِهِ رَكْضَةٌ مِنْ رَكَضَاتِ الشَّيْطَانِ، فَتَحَيَّضِي سِتَّةَ أَيَّامٍ أَوْ سَبْعَةَ أَيَّامٍ فِي عِلْمِ اللَّهِ تَعَالَى ذِكْرُهُ ثُمَّ اغْتَسِلِي حَتَّى إِذَا رَأَيْتِ أَنَّكِ قَدْ طَهُرْتِ وَاسْتَنْقَأْتِ فَصَلِّي ثَلاثًا وَعِشْرِينَ لَيْلَةً أَوْ أَرْبَعًا وَعِشْرِينَ لَيْلَةً وَأَيَّامَهَا وَصُومِي فَإِنَّ ذَلِكَ يُجْزِئُكِ وَكَذَلِكَ فَافْعَلِي عَلَى أَنْ تُؤَخِّرِي الظُّهْرَ وَتُعَجِّلِي الْعَصْرَ فَتَغْتَسِلِينَ وَتَجْمَعِينَ بَيْنَ الصَّلاتَيْنِ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ وَتُؤَخِّرِينَ الْمَغْرِبَ وَتُعَجِّلِينَ الْعِشَاءَ ثُمَّ تَغْتَسِلِينَ وَتَجْمَعِينَ بَيْنَ الصَّلاتَيْنِ فَافْعَلِي وَتَغْتَسِلِينَ مَعَ الْفَجْرِ فَافْعَلِي وَصُومِي إِنْ قَدَرْتِ عَلَى ذَلِكَ قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهَذَا أَعْجَبُ الأَمْرَيْنِ إِلَيَّ. رَوَاهُ أصحاب السنن[١].

حەمنەی کچی جەحش کە ژنخۆشکی پێغەمبەر بوو گوتی: چووم بۆ لای حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بێنوێژییەکی ئێجگار زۆرو یەکجار سەخت پەرەی لێ سەندووم، بە رەنگێکی وا کە رێگەی نوێـژو رۆژووی لێ گرتووم، جا تۆ بۆ ئەمە دەفەرمووی چی؟ حەزرەتیش (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: لۆکەت نیشان دەدەم بەرۆن زەیت چەوری بکەو هەڵی بگرە ئیتر خوێنەکە دەوەستێنێ، گوتی: گوتم: ئەوە چاری ناکا زۆر زۆرە، فەرمووی: پەڕۆیێ بۆ خۆت دروستکەو خۆتی پێ شەتەکدە، گوتم: زۆر زۆرە ئەوەیش چاری ناکا، چونکە من بە خوڕەم هاژەی خوێنم دێ، فەرمووی: دەبا دوو شتت پێ بڵێم هەر کامێکیان بکەی ئەوەیانت بەسە، وە ئەگەر تەوانای هەردووکیانیشت هەبوو وە ویستت یەکێکیان بکەی ئەوە خۆت سەرپشکیت، چونکە ئەم حاڵەتەی تۆیە تەنیا لەقەی شەیتانەو بەر ئەو رەگە کەوتووەو پچڕاندوویەتی بۆ مەبەستی پیسی خۆی، جا دەستووری یەکەم ئاوایە: شەش رۆژ یا حەوت رۆژ خۆت دابنێ بەبێ نوێژ وە باش وردبەرەوە لە حاڵی ژنی بێنوێـژ (لە کەسو کاری خۆتو لە هاوتەمەنی خۆت) سا بەشکوو پەی بەریت بە ماوەی بێنوێژی راستەقینەی خۆت بە قیاس لەسەر

---

(١) بسند صحيح (شرحه).

هـی ئـەوان وەك ئـەو ماوەیـەی کـە لـە زانستو عیلمـی خـودادا هەیـە، یـا دوو ناوی هەتا هەتایە بەرزو پایـەدار بـێ، ئینجا خـۆت پـاك پـاك بـشۆرەو بیستو سێ شەو بە ڕۆژەکانیەوە، وە یاخۆبیستو چوار شەو بە ڕۆژەکانیەوە نوێـژی خـۆت بکـەو ڕۆژووی خـۆت بگـرە ئـیتر ئەمـەت بەسـە، وە هـەموو مانگـێ بـەم چەشـنە بکـە شـەش ڕۆژ یـا حـەوت ڕۆژ دابنـێ بـە مـاوەی بێنوێـژیتو بـاقی مەنـدەی مـانگ دابنـێ بـە مـاوەی پاکیـت لـە چەشـنی ئـەو ژنانـەی کـە بـەرێكو پێکـی کـاتی بێنوێـژیو پـاکیی خۆیـان دەزانـن، ئەمـە دەسـتووری یەکـەم بـوو، دەستووری دووەمیش ئاوایـە: وە ئەگـەر دەشـتوانیت ئـەوا هـەموو ڕۆژێ سـێ جار خۆت بشۆرە لەسـەر ئـەم یاسایە: نوێـژی نیوەڕۆ دوابخـەو نوێـژی عەسـر زووبکە بەم شێوەیە لەپێشا خـۆت بشۆرەو غوسڵی خـۆت دەرکـەو ئینجا ئـەم دوو نوێژە بکە ئینجا لەسـەرەتای نوێـژی عەسریـشەوە نوێـژی عەسربکە، وە نوێژی شێوانو خەوتنانیش بە دەستووری نوێژی نیوەڕۆو عەسر بکە، لەگەڵ شەبەقیشدا خۆت بشۆرەو خۆت ئامادە بکە بۆ کردنی نوێژی بەیانی، وە هـەر وەها ڕۆژووش بگرە، هەر کات ئارەزووت بوو، وەکـاتی پاکیـت بـوو جـا ئەگـەر تەوانای ئـەم سـێ جـارەت هەیە ئـەوا بیکـە زۆر شـتی چاکە، پێغەمبـەر (درووودی خـوای لەسـەربێ) فـەرمووی: مـن ئـەم دەسـتوورە دواییـنـەیانم بـەدڵترە! (د/ت/ن-س/ص).

### ٣٨) ژنـی بێنوێژی ناوەخـت دەتوانـێ خەڵوەبکێشـێ (واتە: ئیعتیاف بکا)و مێردەکەشی بڕواتە لای: (المستحاضة تعتكف ويغشاها زوجها)

٣٠٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ أللهُ عَنْهَا) قَالَتِ: اعْتَكَفَتْ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) امْرَأَةٌ مِنْ أَزْوَاجِهِ فَكَانَتْ تَرَى الصُّفْرَةَ وَالْحُمْرَةَ، وَرُبَّمَا وَضَعْنَا الطَّسْتَ تَحْتَهَا وَهِيَ تُصَلِّي. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والبخاري والنسائي[1].

---

(١) بخاري. حيض: ٣٠٩ ، ٣١٠ ، ٣١١ ، ٢٠٣٧.

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: ژنێ لە ژنەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەگەڵ پێغەمبەردا لەناو مزگەوتا خەڵوەی دەکێشا، لەو حاڵەدا خوێنی زەردباوو خوێنی سوورباوی پیا دەهات، گەلێ جار لەکاتی نوێژ کردنیا تەشتمان لەژێریدا دادەنا نەبادا مزگەوتکە پیس ببێ (د/ب/ن).

٣٠٩- عَنْ عِكْرِمَةَ قالَ: كَانَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ تُسْتَحَاضُ فَكَانَ زَوْجُهَا يَغْشَاهَا[٢].

عیکریمە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: ئوم حەبیبە لە وەختو ناوەختا دەکەوتە بێنوێژییەوە واتە: موستەحاضە بوو وە مێردەکەشی کە عەبدورەحمانی کوڕی عەوف بوو لە هەمان کاتا لەگەڵیا دروست دەبوو، بەڵام تەنیا لەو ماوەیەدا کە بە ماوەی پاکی دادەنرێ (د-سند صالح).

٣١٠- وَعَنْهُ أَنَّ حَمْنَةَ بِنْتِ جَحْشٍ كَانَتْ مُسْتَحَاضَةً وَكَانَ زَوْجُهَا يُجَامِعُهَا[٣].

دیسان عیکرەمە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: حەمنەی کچی جەحش لەوەختو ناوەختا تێ دەکەوتو دەکەوتە سەرخوێن، وە لە هەمان کاتدا مێردەکگەی جووت دەبوو لە گەڵیا لەوماوەیەدا کە بەماوەی پاکی دادەنرێ (د-سند صالح).

### ٣٩) باسی هەشتەم: باسی تەیەمموم، (ئەم باسە سێ بەشو پاشکییەکە):

### بەشی یەکەم: باسی پەیدابوونی تەیەمموم:

### الباب الثامن: في التيمم (وفيه فصول ثلاثة وخاتمة): الفصل الأول: في أصله

٣١١- عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالْبَيْدَاءِ أَوْ بِذَاتِ الْجَيْشِ انْقَطَعَ عِقْدٌ لِي فَأَقَامَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى الْتِمَاسِهِ وَأَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ فَأَتَى النَّاسُ أَبَا بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) فَقَالُوا: أَلاَ تَرَى إِلَىَ مَا صَنَعَتْ عَائِشَةُ؟ أَقَامَتْ بِرَسُولِ اللّٰهِ

---

(٢) رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

(٣) رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

(صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَبِالنَّاسِ مَعَهُ وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ. فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَاضِعٌ رَأْسَهُ عَلَى فَخِذِي قَدْ نَامَ فَقَالَ: حَبَسْتِ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَالنَّاسَ وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ. قَالَتْ: فَعَاتَبَنِي أَبُو بَكْرٍ وَقَالَ: مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقُولَ وَجَعَلَ يَطْعُنُ بِيَدِهِ فِي خَاصِرَتِي، فَمَا يَمْنَعُنِي مِنَ التَّحَرُّكِ إِلاَّ مَكَانُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى فَخِذِي فَنَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى أَصْبَحَ عَلَى غَيْرِ مَاءٍ فَأَنْزَلَ اللَّهُ آيَةَ التَّيَمُّمِ. (فَتَيَمَّمُوا صَعِيداً طَيِّباً) قالَ: أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ وَهُوَ أَحَدُ النُّقَبَاءِ: مَا هِيَ بِأَوَّلِ بَرَكَتِكُمْ يَا آلَ أَبِي بَكْرٍ. فَقَالَتْ عَائِشَةُ: فَبَعَثْنَا الْبَعِيرَ الَّذِي كُنْتُ عَلَيْهِ فَوَجَدْنَا الْعِقْدَ تَحْتَهُ[1].

**عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە خزمەتی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەربێ) لە سەفەرێکا کەوتینە رێ، رۆیشتین تا گەیشتینە بەیدا - یا گەیشتینە (ذاتولجەیش) - لەوێ گەردانەیەکی من پچڕایەوە گوم بوو، ئیتر پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) لەوێ مایەوە بە هیوای دۆزینەوەی ئەو گەردانەیە خەڵکەکەیش لە گەڵیا مانەوە، ئەمە لە کاتێکابوو کە نەشوێنەکە ئاوی لێ بوو وە نەخۆشیان ئاویان پێ بوو، جا خەڵکەکە چوون بۆلای ئەبو بەکری باوکم‌و گلەیی دەکەن‌و دەڵێن: نابینی عائیشەی کچت چیکرد؟ پێغەمبەرو ئەم عەشاماتەی لەم بیابانە چۆڵ‌و بێ ئاوەدا گل دایەوەو ئاویشمان پێ نیە! پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەو کاتەدا خەوتبوو سەری لەسەر رانم دانابوو، ئەبوبەکر بەتوورەیی هات، گوتی: پێغەمبەرو ئەم عەشامەتەت لەم شوێنە چۆڵ‌و بێ ئاوەدا (بەبی ئاو) گل داوەتەوە بە خۆت‌و خۆرایی ئەمەئیش بوو تۆ کردت؟ ئیتر چەندە خوا حەزکا ئەبو بەکر گلەیی لێ کردم‌و قسەی پێ گوتم، خۆش خۆشیش بەسەرە سیخوڕمە دیکوتایە کەلەکەم، منیش هەر چەند ئێشم پێ گەیشتبوو بەڵام لەبەر ئەوەی سەری پێغەمبەر لەسەر ڕانم بوو جوولەم پێ نەدەکرا! جا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەو شەوە خەوت‌و**

---

(١) بخاري. تيمم: ٣٣٤ ، ٣٣٦ ، ٣٦٧٢ ، ٣٧٧٣ ، ٤٥٨٣ ، ٤٦٠٧ ، ٤٦٠٨ ، ٥١٦٤ ، ٥٢٥٠ ، ٥٨٨٢ ، ٦٨٤٤ ، ٦٨٤٥. مسلم. تيمم: ٨١٤. نسائي. تيمم: ٣٠٩.

مایـەوە لـەوێ، کاتـێ بـەیانی کـە هەسـتا ئـاو نـەبوو، جـا خـودا ئایـەتی تەیەموومی نارده خوارەوە کە دەفەرموێ:

{فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا ـ ٥-٦}.

جا بـەم بۆنەیـەوە ئوسـەیدی کوڕی حوضـەیر گـوتی: ئـەی خانـەوادەی ئـەبو بـەکر! بەڕاسـتی ئێوە بۆ ئـەم نەتـەوەی ئیسلامە بوون بـەپیتو فـەڕ ئـەم داهـاتنی تەیەمووم بـەهۆی ئێـوەوە بـوو ئـەوە نـەبێ ئەمـە یەکـەم پیـتو بەرەکەتی ئێوە بێ، ئوسـەید یـەکێك بوو لـە دەمڕاسـت (نـەقیب)ەکانی شـەوی پـەیمانی عەقەبـە کـە پێغەمبـەر (درووودی خوای لەسەربێ) لـەو شـەوەدا کردبوونی بـە دەمڕاستو سەر گەورەی هۆزەکانی خۆیان. عائیشە گوتی: سەیر لەوەدا بوو ئەو وشترەی کە من سواری دەبووم کە هەڵمان ساند گەردانەکە لەژێریدا بوو دۆزیمانەوە (ش/د/ن).

٣١٢- وَعَنها أَنَّهَا اسْتَعَارَتْ مِنْ أَسْمَاءَ قِلاَدَةً فَهَلَكَتْ فَأَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَاسًا مِنْ أَصْحَابِهِ فِي طَلَبِهَا فَأَدْرَكَتْهُمُ الصَّلاَةُ فَصَلُّوا بِغَيْرِ وُضُوءٍ، فَلَمَّا أَتَوُا النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شَكَوْا ذَلِكَ إِلَيْهِ فَنَزَلَـتْ آيَـةُ التَّـيَمُّمِ. قَـالَ: أُسَـيْدُ بْـنُ حُضَيْرٍ: جَزَاكِ اللَّهُ خَيْرًا فَوَاللَّـهِ مَـا نَـزَلَ بِـكِ أَمْـرٌ تَكْرَهِينَـهُ إِلاَّ جَعَـلَ اللَّـهُ لَـكِ وَلِلْمُسْلِمِينَ خَيْرًا. رَوَاهُما الخمسة إلاّ الترمذي[٢].

دیسان عائیشە (خوای لێ ڕازی بێ) گـوتی: گـەردانـەیێکم لـە ئـەسمای خوشـکم خواست، گەردانەکە بزربوو، پێغەمبـەریش (درووودی خوای لەسەربێ) دەستەیەکی لـە یارانی خۆی نارد کە بۆی بگەڕێن، جا ئـەوانیش کاتـێ نوێـژیان لێ دەبـێ ئـاو نابێ، لەبەر ئەوە بەبێ دەسنوێژ نوێژ دەکەن، جا کە هاتنەوە بۆلای پێغەمبـەر (درووودی خوای لەسەربێ) سـکاڵای ئـەم حاڵـەیان لـەلاکرد، ئـەوجا ئایـەتی تەیـەمموم هاتـە خـوارەوە، ئوسـەیدی کـوڕی حوضـەیریش (بـەم بۆنەیـەوە) گـوتی: ئـەی عائیشە! خودا پاداشی چاکەت بداتەوە، بۆ ئێمە بووی بەمایەی خێر، بەخودا

---

(٢) بخاري. سبق تخريجه في رقم: ٣٢٠/١.

هەرچیت تووش دەبێ و پێت ناخۆش دەبێ (بەپێچەوانەوە) خوا دەیکا بەمایەی خێرو خۆشی و بەرەکەت، چ بۆ خۆت و چ بۆ موسوڵمانان. (ش/د/ن).

## ٤٠) بەشی دووەم: باسی ئەو شتانەی دەبن بەهۆی تەیەممووم، لەگەڵ باسی دەستی تەڕهێنان بەسەر مووشەمای سەربریندا (مسح لەسەر جەبیرە):

## الفصل الثاني: في اسبابه والمسح على الجبيرة

٣١٣- عَنْ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ اَلْخُزاعِيِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَأَى رَجُلاً مُعْتَزِلاً لَمْ يُصَلِّ فِي الْقَوْمِ فَقالَ: يَا فُلاَنُ مَا مَنَعَكَ أَنْ تُصَلِّيَ مَعَ الْقَوْمِ؟ فَقالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَصَابَتْنِي جَنَابَةٌ وَلاَ مَاءَ. قَالَ: عَلَيْكَ بِالصَّعِيدِ فَإِنَّهُ يَكْفِيكَ. رَوَاهُ البخاري والنسائي[١].

عیمرانی کوڕی حوصەینی خوزاعی (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ڕوانی پیاوێ لەکۆمەڵ کلابووەو نوێژ ناکا لەگەڵیانا، فەرمووی: ئەی فیسار! بۆچی لەگەڵ کۆمەڵ نوێژت نەکرد؟ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەشم پیس بووەو ئاویش نیە، فەرمووی: ئەوەندت بەسە کە بە خۆڵی پاك تەیەممووم بکەی (ب/ن).

٣١٤- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الصَّعِيدَ الطَّيِّبَ وَضُوءُ الْمُسْلِمِ وَإِنْ لَمْ يَجِدِ الْمَاءَ عَشْرَ سِنِينَ فَإِذَا وَجَدَ الْمَاءَ فَلْيُمِسَّهُ بَشَرَتَهُ فَإِنَّ ذَلِكَ خَيْرٌ. رَوَاهُ أصحاب السنن[٢].

ئەبو ذەڕ (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: خۆڵی پاك ئاوی دەسنوێژی موسوڵمانە، با دەساڵیش لەسەر یەك ئاوی دەست نەکەوێ، بەڵام هەرکاتێ ئاوی دەست کەوت با دەسنوێژی پێ بگرێ، چونکە ئەوە زۆر باشە (د/ت/ن-س/ص).

---

(١) بخاري. تيمم: ٣٤٨ ، ٣٤٤ ، ٣٥٧١.

(٢) بسند صحيح (شرحه).

٣١٥- عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قالَ: احْتَلَمْتُ فِي لَيْلَةٍ بَارِدَةٍ فِي غَزْوَةِ ذَاتِ السَّلاَسِلِ فَأَشْفَقْتُ إن اغْتَسَلْتُ أَنْ أَهْلِكَ فَتَيَمَّمْتُ ثُمَّ صَلَّيْتُ بِأَصْحَابِي الصُّبْحَ فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقالَ: يَا عَمْرُو صَلَّيْتَ بِأَصْحَابِكَ وَأَنْتَ جُنُبٌ؟ فَأَخْبَرْتُهُ بِالَّذِي مَنَعَنِي مِنَ الاغْتِسَالِ وَقُلْتُ: إنِّي سَمِعْتُ اللَّهَ يَقُولُ (وَلاَ تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ إنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا) فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَلَمْ يَقُلْ شَيْئًا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَالبخاري[٣].

عەمری کوڕی عاص (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە غەزای (ذاتول سەلاسیلدا)، شەوێ شەیتانی بووم، شەوەکەی زۆر تۆف و ساردبوو، ترسام ئەگەر خۆم بشۆرم لەسەرمانا بمرم، جا تەیەموومم کردو نوێژی بەیانیم بۆ هاوڕێکانم کرد، جا کاتێ ئەم باسەیان گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی عەمر! بە لەشی پیسەوە چۆن بەر نوێژیت بۆ هاوڕێکانت کردووە؟ منیش گوتم پێی کە لەبەرچی خۆم نەشۆرد، وە عەرزیشم کرد: گوێم لە خوداشە لە قورئانا دەفەرموێ:

{وَلاَ تَقْتُلُواْ أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا - ٤-٢٩}.

واتە: خۆتان مەکوژن، وە هەروەها یەکتریش مەکوژن بە ناهەق، بەراستی خودای گەورەو مەزن بەرابەر بە ئێوەو بەرابەر بەهەر کەسێکی تریش کەملی رێگەی راستبگرێ بەرەحم و میهرەبانە،ئیتر کەوام گوت پێغەمبەر(درودی خوای لەسەربێ)دەستیکرد بەپێکەنین و هیچی تری نەفەرموو (د/ب).

٣١٦- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قالَ: خَرَجْنَا فِي سَفَرٍ فَأَصَابَ رَجُلاً مِنَّا حَجَرٌ فَشَجَّهُ فِي رَأْسِهِ ثُمَّ احْتَلَمَ فَسَأَلَ أَصْحَابَهُ فَقَالَ: هَلْ تَجِدُونَ لِي رُخْصَةً فِي التَّيَمُّمِ؟ فَقَالُوا: مَا نَجِدُ لَكَ رُخْصَةً وَأَنْتَ تَقْدِرُ عَلَى الْمَاءِ فَاغْتَسَلَ فَمَاتَ فَلَمَّا قَدِمْنَا عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أُخْبِرَ بِذَلِكَ فَقالَ: قَتَلُوهُ قَتَلَهُمُ اللَّهُ أَلاَّ سَأَلُوا إِذْ لَمْ يَعْلَمُوا

---

(٣) بخاري. تيمم: ٣٣٩ ، ٣٤٠ ، ٣٤١ ، ٣٤٢ ، ٣٤٣ ، ٣٤٥ ، ٣٤٦ ، ٣٤٧.

فَإِنَّمَا شِفَاءُ الْعِيِّ السُّؤَالُ إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيهِ أَنْ يَتَيَمَّمَ وَيَعْصِبَ عَلَى جُرْحِهِ خِرْقَـةً ثُـمَّ يَمْسَحَ عَلَيْهَا وَيَغْسِلَ سَائِرَ جَسَدِهِ رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[٤].

جـابیر (خـوای لێ رازی بـێ) گـوتی: لەسـەفەرێکا بـەردێ دای لـە پیاوێکمـان سـەری شـکان لـە پاشـا شـەیتانی بـوو، وە لـە هاورێکـانی پرسـی گـوتی: ئایـا رێگـەی تەیـەموومم پـێ دەدەن؟ دەڵێن: نـەء، رێگـەت پـێ نـادەین، چـونکە تـۆ دەتوانیت ئاو بەکاربێنیت، ئەویش خۆی شۆردو مرد، ا کە هاتینـەوە بـۆ لای پێغەمبەرو ئەم باسەیان بۆ گێڕایەوە فەرمووی: کوشتوویانە خودا بیـانکوژێ، کە خۆیان نەیانزانیوە بۆ نەیانپرسیوە لە زانایێ، چونکە چاری نـادانی تـەنها پرسینەو فێربوون، ئەم پیاوە تەنیا ئەوەندەی بەس بوو کە لەجیاتی شۆردنی شـوێنە زامارەکـەی بـە خـۆڵ تـەیموومی بکردایـەو بـە پـەڕۆیێ برینەکـەیی بپێـچایەو ئینجـا لـە جیـاتی شـۆردنی ژێـر پەڕۆکـە دەسـتی تـەڕی بەسـەر ئـەو پەڕۆیەدا بهێنایە، وە باقی مەندەی لەشی بشۆردایە! (د-سند ضعیف).

## ٤١) بەشی سێیەم: چۆنێتیی تەیەمموم

## الفصل الثالث: في كيفيَّته

{قَالَ: اَللهُ تَعالى – (وَإِن كُنتُم مَّرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاء أَحَدٌ مَّنكُم مِّنَ الْغَائِطِ أَوْ لاَمَسْتُمُ النِّسَاء فَلَمْ تَجِدُواْ مَاء) فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم – ٥/٦}.

واتـە: خـودای گـەورە دەفـەرموێ: لـە قورئـانی پیرۆزدا: ئەگـەر نـەخۆش بوونو نەتان دەتوانی ئاو بەکار بێنن، یاخود لە سەفەرا بوونو ئاوتان دەست نەدەکـەوت، خـواه لـەم صـوورەتانەدا لەشـتان پیـسبێ یـا بێدەسـنوێژبن، وەیاخود یەکێ لە ئێوە لەسەر ئاو هاتەوە بێدەسنوێژبوو، یاخود دەستتان دا لـە پێـستی ژنـانو بێدەسـنوێژ بـوون، وە یـاخود دروسـت بـوون لەگـەڵیانا وە ئاوتان دەست نەکەوت بەکاری بێنن بۆ لابردنی بێ دەسنوێژی یا لەشپیسی،

---

(٤) رواه أبو داود بسند ضعيف (شرحه)

ئەوە لە هەموو ئەم صوورەتانەدا قەسدی هەڵکرتنی گڵێکی پاك بکەن‌و لە تۆزی ئەو گڵە پاکە دەست بێنن بە دەم‌وچاوتاناو بە دەستتانا.

٣١٧- جَاءَ رَجُلٌ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) فَقَالَ: إِنِّي أَجْنَبْتُ فَلَمْ أُصِبِ الْمَاءَ فَقَالَ: عَمَّارُ بْنُ يَاسِرٍ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ: أَمَا تَذْكُرُ إِذَا كُنَّا فِي سَفَرٍ أَنَا وَأَنْتَ فَأَمَّا أَنْتَ فَلَمْ تُصَلِّ، وَأَمَّا أَنَا فَتَمَعَّكْتُ فَصَلَّيْتُ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكَ هَكَذَا فَضَرَبَ بِكَفَّيْهِ عَلَى الأَرْضَ، وَنَفَخَ فِيهِمَا ثُمَّ مَسَحَ بِهِمَا وَجْهَهُ وَكَفَّيْهِ. رَوَاهُ الْخَمْسَةَ[1].

پیاوێ هاتە لای عومەری کوڕی خەطاب (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لەشم پیسەو ئاوم دەست ناکەوێ چارم چیە؟ عەمماری کوڕی یاسیریش لەوێ بوو بە عومەری کوڕی خەطابی گوت: ئایا لە بیرتە کە من‌و تۆ رەوتەنی بووین لەشمان پیس بوو، کە نوێژمان لێ بوو تۆ نوێژت نەکرد، بەڵام من خۆم لە خۆڵا گەوزان‌و نوێژم کرد، جا کە ئەمەم گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر، هەردوو لەپی خۆی ماڵی بەسەر رووی زەوییەکەداو فووی لێکردن تا تۆزەکەیان تۆزێ سووك بێ ئەوسا بەهەر دوو ناولەپی مەسحی دەموچاوو هەردوو دەستی خۆیی کرد! (ش/د/ت/ن).

٣١٨- عَنْ أَبِي الْجُهَيْمِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَقْبَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ نَحْوِ بِئْرِ جَمَلٍ فَلِقِيَهُ رَجُلٌ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى أَقْبَلَ عَلَى الْجِدَارِ فَمَسَحَ بِوَجْهِهِ وَيَدَيْهِ ثُمَّ رَدَّ عَلَيْهِ السَّلاَمَ. رَوَاهُ الخمسة والشافعي ولفظه: فَمَسَحَ وَجْهَهُ وَذِرَاعَيْهِ[2].

ئەبولجەهم (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر ( لەلای بیری جەمەلەوە دەهات، پیاوێ پێی گەیشت‌و سلاوی لێ کرد، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) سلاوەکەی نەسەندەوە هەتا رووی کردە دیوارەکەو رووی خۆی‌و

---

(١) بخاري. تيمم: ٣٣٩ ، ٣٤٠ ، ٣٤١ ، ٣٤٢ ، ٣٤٣ ، ٣٤٥ ، ٣٤٦ ، ٣٤٧. مسلم. حيض: ٨١٨. نسائي. تيمم: ٣١١. ترمذي. تيمم: ١٤٤. أبو داود. تيمم: ٣٢٢.

(٢) بخاري. تيمم: ٣٣٧. أبو داود. تيمم: ٣٢٩. نسائي. تيمم: ٣١٠ مسلم. حيض: ٨٢٠.

هــەردوو دەســتی مەســح کــرد لــە گــەردی ســەر بــەردی دیوارەکــەو کــە تەیەممومەکــەی تــەواو کــرد ئینجــا وەڵامــی ســڵاوی پیاوەکــەی دایــەوە (ش/د/ت/ن–شافیعی). گفتەی شافیعی: دەموچاوو هەردوو باسکی خۆی مەسح کرد.

٣١٩– وَلأَبِي دَاوُدَ عَنْ أبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): فَضَرَبَ بِيَدَيْهِ عَلَى الْحَائِطِ وَمَسَحَ بِهِمَا وَجْهَهُ ثُمَّ ضَرَبَ ضَرْبَةً أُخْرَى فَمَسَحَ ذِرَاعَيْهِ ثُمَّ رَدَّ عَلَى الرَّجُلِ السَّلاَمَ وَقَالَ: إِنَّهُ لَمْ يَمْنَعْنِي أَنْ أَرُدَّ عَلَيْكَ السَّلاَمَ إِلاَّ أَنِّي لَمْ أَكُنْ عَلَى طُهْرٍ[٣]

ئیبنــو عومــەر (خوای لێ رازی بێ) گــوتی: جــا پێغەمبــەر (دروودی خوای لەسەربێ) هەردوو دەستی ماڵی بە دیوارەکەداو هێنانی بەڕووی خۆیدا، ئینجا دووبارە پیاماڵیینەوەو هێنانی بە هەردوو باسکیا، ئینجا وەڵامی سڵاوی پیاوەکەی دایەوەو فەرمووی: لە پێشا لەبەر ئەوە سڵاوەکەم نەسەندیتەوە چونکە لەسەر پاکی نەبووم (د).

## ٤٢) (پاشەکی): ئەگەر بە تەیەمموم نوێژی کردو لە پاشا کاتی ئەو نوێژە مابوو کە ئاوی دەست کەوت ئەوە نوێژکەی دووبارە ناکاتەوە:

## (خاتمة): إذا تيمم وصلى ثم وجد الماء في الوقت لا يعيد

٣٢٠– عَنْ أبْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّهُ أَقْبَلَ مِنَ ألْجُرُفِ حَتَّى إِذَا كَانَ بِالمِرْبَدَ تَيَمَّمَ فَمَسَحَ وَجهَهُ وَيَدَيْهِ وَصَلَّى ألْعَصْرَ ثُمَّ دَخَلَ ألْمَدِينَةَ وَألشمَّمْس مُرْتَفِعَةٌ فَلَمْ يُعِدِ الصَّلاَةَ. رَوَاهُ البخاريُّ ومالكٌ والشافعيُّ[١].

ئیبنــو عومــەر (خــوای لێ رازی بــێ) لــە ئەلجورفــەوە هاتــەوە بــۆ مەدینــەی مونــەوەرە کــە گەیــشتە ئەلمیربەد (کــە شــوێنێکە پەچــەی وشــترو رانــە) لــەوێ تەیــەموومی بــەم شــێوەیەکرد: دەســتی بەگــەردو تــۆزەوە هێنــا بــەروو هــەردوو دەســتی خۆیــدا نوێــژی عەصــری بــە تەیــەمووم کــرد، لەپاشــا کــە هاتــەوە نــاو

(٣) سكت عن بيان درجة الحديث الشارح (مترجم).

(١) رواه البخاري تعليقاً قبل رقم: ٣٣٧ مباشرة.(مترجم).

شـاری مەدینـە هێـشتا خـۆر بـەرز بـوو نوێژەکەشـی دووبـارە نـەکردەوە (ب/مالیم/شافیعی).

٣٢١- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجَ رَجُلَانِ فِي سَفَرٍ فَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ وَلَيْسَ مَعَهُمَا مَاءٌ فَتَيَمَّمَا صَعِيدًا طَيِّبًا فَصَلَّيَا ثُمَّ وَجَدَا الْمَاءَ فِي الْوَقْتِ فَأَعَادَ أَحَدُهُمَا الصَّلَاةَ وَالْوُضُوءَ وَلَمْ يُعِدِ الآخَرُ ثُمَّ أَتَيَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَذَكَرَا ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ: لِلَّذِي لَمْ يُعِدْ: أَصَبْتَ السُّنَّةَ وَأَجْزَأَتْكَ صَلَاتُكَ وَقَالَ: لِلَّذِي تَوَضَّأَ وَأَعَادَ: لَكَ الأَجْرُ مَرَّتَيْنِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي[٢].

ئەبو سەعید (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: دوو پیاو دەچن بۆ سەفەرێ، کە نوێژ دەبێ ئاویان پێ نابێ، جا بە خۆڵێکی پاك تەیموومم دەکەن، لە پاشا هێشتا کاتی ئەو نوێژە دەمێنێ کە تووشی ئاو دەبن، جا یەکێکیان دەسنوێژ دەگرێو نوێژەکەی دووبارە دەکاتەوە، بەڵام ئەوی تریان نە دەسنوێژ دەگرێو نە نوێژەکەی دەکاتەوە، جا کە دێنەوە خزمەتی حەزرەتو ئەمە باس دەکەن بۆی، بەوەیان کە نوێژەکەی دووبارە نەکردبووەوە دەفەرموێ: تۆ یاسای ڕاستت پێکاوەو نوێژەکەت جێگەی خۆی گرتووە وە بەوەشیان دەفەرموێ: - کە دەسنوێژی گرتبوو وە نوێژی دووبارە کردبۆوە -: بۆ تۆیش دوو پاداش هەیە (د/ن)[١].

---

(٢) سكت عنه الشارح (مترجم).

[١] دانەر (پرگۆڕەکەی لە نووربێ) دەفەرموێ: ژمارەی فەرموودەکان لە سەرەتای نامەکەوە هەتا ئێرە (٣٣٠) فەرموودەیە.

بسم الله الرحمن الرحيم

# نامەی نوێژ

(سێزدە باس‌و پاشەکییەکە)

## باسی یەکەم: باسی پەیدابوونی نوێژ لە بنەڕەتەوەو باسی ئاگاداریکردنی نوێژ، (ئەم باسە دوو بەشە):

## كتاب الصلاة : (وفيه ثلاثة عشر بابا وخاتمة)

## الباب الأول: في أصل الصلاة والمحافظة عليها، (وفيه فصلان):

### ٤٣) بەشی یەکەم: باسی فەضڵ‌و گەورەیی نوێژو باسی فەرزبوون‌و پێویست بوونی: (الفصل الأول: في فرضية الصلاة وفضلها)

قَالَ اللهُ تَعالى: {فَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ إِنَّ الصَّلاَةَ كَانَتْ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَّوْقُوتًا – ٤/١٠٣}.

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: جا... نوێژەکانتان بەرێك‌و پێکی‌و بەرەسایی بەجێ بێنن، چونکە بەڕاستی نوێژ لەسەر موسوڵمانان فەرزێکە بەسراوە بەکاتی تایبەتی خۆیەوە.

وَقَالَ تعالى: {وَأَقِمِ الصَّلَاةَ إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ – ٢٩/٤٥}.

واتە: خودای گەورە دیسان دەفەرموێ: بەهێزی دڵەوە نوێژەکانت بکەو لەکاتی خۆیا نوێژ بەجێ بێنە، بەپێی مەرج‌و بەندەکانی، وە لە نوێژا دڵت لای خودابێ، چونکە بێگومان نوێژی وا نوێژکەر دوور دەخاتەوە لە کاری بەدو ناپەسەندو بێ شەرعی.

٣٢٢– عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: فُرِضَتْ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِهِ الصَّلَوَاتُ خَمْسِينَ ثُمَّ نُقِصَتْ حَتَّى جُعِلَتْ خَمْسًا ثُمَّ نُودِيَ يَا مُحَمَّدُ إِنَّهُ لاَ يُبَدَّلُ الْقَوْلُ لَدَيَّ وَإِنَّ لَكَ بِهَذِهِ الْخَمْسِ خَمْسِينَ. رَوَاهُ اْلخَمْسَة إلاَّ ابا دَاوُدَ[1].

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لەو شەوەدا کە شەوڕەوی بە حەزرەت دەکرێ‌و دەبرێ بۆ میعراج خودا شەوو ڕۆژێ پەنجا نوێژ لەسەر خۆی‌و

(١) بخاري. كيفية فرض الصلاة: ٣٤٩ ، ١٦٣٦ ، ٣٣٤٢. مسلم. إيمان: ٤١٣.

ئۆمـەتی دادەنـێ، لەپاشا لەسـەر ئامۆژگـاری حـەزرەتی مووسـا (سەلامی خودای لەسەربێ) پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەربێ) تکـا دەکـا لـە خـودا کـە کـەمیان بکاتـەوە خودا کەمیان دەکاتەوە هەتا لە شەوو رۆژێکا دێنە سەرپێنج نوێژ، ئیتر خـودا بانگی حەزرەت دەکاو دەفەرموێ: ئـەی موحممـەد! ئەمـە دوا قسەیەو گۆڕانی بۆ نیە وە ئیتر لەمـە زیاتر ژمارەی نوێـژەکان کـەم ناکەمـەوە بـەڵام بۆ تـۆو بۆ هـەموو نوێژکـەرێکی ئۆمـەتی تـۆ هەیـە لـە جیـاتی ئـەم پێـنج نوێـژە پاداشـی پەنجا نوژەکەی پێشوو (ش/ت/ن).

٣٢٣- عَنْ طَلْحَةَ بْنَ عُبَيْدِاللّٰهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُـولِ اللّٰـهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ أَهْلِ نَجْدٍ، ثَائِرُ الرَّأْسِ، يُسْمَعُ دَوِيُّ صَوْتِهِ، وَلاَ يُفْقَهُ مَا يَقُـولُ حَتَّى دَنَا، فَإِذَا هُوَ يَسْأَلُ عَنِ الإِسْلاَمِ فَقَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَمْـسُ صَلَوَاتٍ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ فَقَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا قَالَ: لاَ، إِلاَّ أَنْ تَطَوَّعَ قالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَصِيَامُ رَمَضَانَ قالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُ؟ قـالَ: لاَ، إِلاَّ أَنْ تَطَـوَّعَ قالَ: وَذَكَرَ لَهُ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الزَّكَاةَ قالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا؟ قـالَ: لاَ، إِلاَّ أَنْ تَطَوَّعَ قالَ: فَأَدْبَرَ الرَّجُلُ وَهُوَ يَقُولُ: وَاللّٰهِ لاَ أَزِيـدُ عَلَـى هَـذَا وَلاَ أَنْقُـصُ. قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَفْلَحَ إِنْ صَدَقَ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ الترمذي[٣].

طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا (رەزای خودایان لەسەربێ) گـوتی: پیـاوێکی قژئاڵۆزاوی خەڵکی نەجد دەهات بۆ خزمەتی حـەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) لـە دوورەوە گرمـەی دەنگی دەهات بەڵام نەمان دەزانی دەڵێ چی، جا کە هاتەپێشەوە بۆمـان دەرکـەوت کـە لـە بـاەری ئیـسلامەوە پرسـیاری هەیـە، پێغەمبـەریش (دروودی خـوای لەسـەربێ) فەرمووی: لە شەوو رۆژێکا دەبێ پێنج نوێژبکەی، پیاوەکە گوتی: باشە نوێژی تـرم لەسەرە یانا؟ فـەرمووی: نـەء، نوێـژی تـرت لەسـەر نییـە مەگـەر بـە ئارەزووی خـۆت نوێـژی سـوننەت بکـەیت، ئـەنجا پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەربێ) فـەرمووی: رۆژووی رەمـەزانیش دەبـێ بگریـت. پیاوەکـە گـوتی: باشـە رۆژووی تـرم لەسـەرە یانـا؟ فـەرمووی: نـەء، مەگـەر بـە ئارەزووی خـۆت رۆژووی تـر بگریـت. پێغەمبـەر

---

(٣) بخاري. علم: ٤٦ ، ١٨٩١ ، ٢٦٧٨ ، ٦٩٥٦ ، مسلم. إيمان: ١٠٠. نسائي. ٤٥٧ ، ٢٠٨٩. أبو داود: ٣٩١.

(درودی خوای لەسەربێ) باسی زەکاتیشی بۆ کرد، پیاوەکەیش گوتی: باشە لەمە زیاتر زەکاتی ترم لەسەرە یانا؟ فەرمووی: نەء، مەگەر بە ئارەزووی خۆت خێری تر بکەی لە پاشا کابراکە ڕۆیشتو گوتی: بەخودا نە لەمە زیتر دەکەمو نە لەمە کەمتر دەکەم، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر ڕاست بکا ڕزگاری دەبێ! (ش/د/ن).

٣٢٤- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ الصُّنَابِحِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قالَ: زَعَمَ أَبُو مُحَمَّدٍ أَنَّ الْـوِتْرَ وَاجِبٌ فَقَالَ: عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ: كَذَبَ أَبُو مُحَمَّدٍ أَشْهَدُ أَنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰـهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: خَمْـسُ صَـلَوَاتٍ افْتَرَضَـهُنَّ اللّٰـهُ عَـزَّ وَجَـلَّ مَـنْ أَحْـسَنَ وُضُوءَهُنَّ وَصَلاَّهُنَّ لِوَقْتِهِنَّ وَأَتَمَّ رُكُوعَهُنَّ وَخُشُوعَهُنَّ كَانَ لَهُ عَلَى اللّٰـهِ عَهْـدٌ أَنْ يَغْفِرَ لَهُ وَمَنْ لَمْ يَفْعَلْ فَلَيْسَ لَهُ عَلَى اللّٰهِ عَهْدٌ إِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ وَإِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي[٣].

عەبدوڵڵای کوڕی صەنابیحی (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەبو موحەممەد وا دەزانێ کە نوێژی وەتر پێویستە واتە: (واجبە) عوبادەی کوڕی صامیتیش گوتی: ئەبو موحەممەد هەڵەیە، من شایەتی دەدەم کە بە گوێی خۆم لە دەمی پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (درودی خوای لەسەربێ): خودای گەورەو سەروەر پێنج نوێژی داناوە لەسەر ئۆمەتی موحەممەد هەر کەسێ بە جوانی دەسنوێژیان بۆ بگرێ، وە لەکاتی خۆبانا بیانکا، وە ڕوکوع (چەمینەوە) یان تەوابکا، وە بەخوشووعو ملکەچی و سەرکزییەوە بیانکا بۆ ڕەزای خوا، ئەوە ئیتر ئەو کەسە پەیمانی دەکەوێتە سەر خودا کە لێی خۆش بێ، وە ئەو کەسەی کە ئەمە نەکا ئەوە هیچ پەیمانێکی لەسەر خودانیە، جا ئەگەر خودا مەیلی لەسەربێ ئەوە لێی خۆش دەبێ وە ئەگەر مەیلی لەسەر نەبێ ئەوە سزای دەدا. (د/ن/مالیك-ح/ص).

٣٢٥- عَنْ أَبِی قَتَادَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: قَالَ: اللّٰهُ عَزَّ وَجَلَّ: إِنِّي افْتَرَضْتُ عَلَى أُمَّتِكَ خَمْسَ صَلَوَاتٍ وَعَهِدْتُ عِنْدِي عَهْدًا أَنَّهُ مَنْ جَـاءَ

---

(٣) رواه أبو داود والنسائي والإمام مالك فهو صحيح (شرحه).

يُحَافِظُ عَلَيْهِنَّ لِوَقْتِهِنَّ أَدْخَلْتُهُ الْجَنَّةَ وَمَنْ لَمْ يُحَافِظْ عَلَيْهِنَّ فَلاَ عَهْدَ لَهُ عِنْدِي. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ(٤).

ئـەبو قـەتادە (خـوای لێ رازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) دەفەرموێ: خودای گەرەو سەروەر دەفەرموێ: من پێنج نوێژم لەسەر ئۆمەتی تۆ داناوە، وە پەیمانیشم كردووە لەگەڵ خۆم: كە هەركەسێ بچێ بەرێك و پێكی لەكاتی خۆیانا بیانكا ئەوە دیبەمە بەهەشت، وە هەر كەسێكیش ئاگادارییان نەكا، ئەوە هیچ پەیمان و بەڵێنێكی لەسەر من نییە (د).

٣٢٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَرَأَيْتُمْ لَوْ أَنَّ نَهَرًا بِبَابِ أَحَدِكُمْ، يَغْتَسِلُ فِيهِ كُلَّ يَوْمٍ خَمْسَ مَرَّاتٍ هَلْ يُبْقِى مِنْ دَرَنِهِ شَيْئٌ؟ قَالُوا: لاَ يُبْقِي مِنْ دَرَنِهِ شَيْئٌ. قالَ: فَذَلِكَ مِثْلُ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ، يَمْحُو اللّٰهُ بِهَا الْخَطَايَا. رَوَاهُ الخمسة إلا أبا دَاوُدَ(٥).

ئـەبو هـورەیرە (خـوای لێ رازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) فەرمووی: پێم بڵێن ئەگەر جۆگە ئاوێ لەبەر دەرگای یەكێكتانابێ وە هەموو رۆژێ پێنج جار خۆی تیا بشۆرێ ئایا هیچ چڵكی پێوە دەمێنێ؟ یاران گوتیان: نەء هیچ چڵكی پێوە نامێنێ، فەرمووی: دەئەمە وێنەی ئەم پێنج نوێژە فەرزەیە، خودا گوناهیان پێ دەكوژێنێتەوە (ش/ت/ن).

٣٢٧- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَتَعَاقَبُونَ فِيكُمْ مَلاَئِكَةٌ بِاللَّيْلِ وَمَلاَئِكَةٌ بِالنَّهَارِ، وَيَجْتَمِعُونَ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ وَصَلاَةِ الْعَصْرِ، ثُمَّ يَعْرُجُ الَّذِينَ بَاتُوا فِيكُمْ، فَيَسْأَلُهُمْ وَهْوَ أَعْلَمُ بِهِمْ كَيْفَ تَرَكْتُمْ عِبَادِي؟ فَيَقُولُونَ تَرَكْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ، وَأَتَيْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ. رَوَاهُ الشيخان والنسائي(٦).

---

(٤) سكت عنه الشارح (مترجم).

(٥) بخاري. مواقيت الصلاة: ٥٢٨ ، ٢٤١. مسلم. صلاة: ١٥٢٠. ترمذي. مثل الصلوات الخمس: ٢٨٦٨. نسائي. فضل الصلوات الخمس: ٤٦١.

(٦) بخاري. صلوة العصر: ٥٥٥ ، ٣٢٢٣ ، ٧٤٢٩ ، ٧٤٨٦. مسلم. صلاة: ١٤٣٠. نسائي. فضل صلاة الجماعة: ٤٨٤.

دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: چەن فریشتەیێ بەشەوو چەن فریشتەیەكی تر بەرۆژ بەرو دوا بەدیارتانەوەن و بەسەرە ئێشكتان دەگرن، وە هەردوو لایان لە نوێژی بەیانی و نوێژی عەصردا یەك دەگرن و یەكتری دەگۆڕن، جا كاتێ ئەو تاقمە فریشتەیەی كەوا شەو لە دیارتان بوون سەر دەكەونەوە بۆ خزمەتی خودای گەورەو پەروەردگار، لێیان دەپرسێ (هەرچەند كە خۆشی باشتر حاڵیان دەزانێ) دەفەرموێ: كە ئێوە هاتنەوە ئەو بەندانەی من چییان دەكرد؟ دەڵێن: كە ئێمە چووین بۆلایان ئەوان نوێژیان دەكرد ئێمەش هاتینەوە لەلایان ئەوان هەر نوێژیان دەكرد (ش/ن).

٣٢٨- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: الصَّلَواتُ الْخَمْسُ وَالْجُمُعَةُ إِلَى الْجُمُعَةِ كَفَّارَتٌ لِمَا بَيْنَهُنَّ مَا لَمْ تُغْشَ الْكَبَائِرُ. رَوَاهُ مُسْلِم والترمذي[٧].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر پێنج نوێژەكان، ئەم نوێژ تا ئەو نوێژو نوێژی هەینی تا ئەو هەینی دەبن بە كەفارەتی ئەو گوناهانە كە لە نێوانیانا دەكرێن بە مەرجێ گوناهی گەورە نەبن (م/ت).

٣٢٩- عَنْ عُمَرِ بْنِ سَعِدٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قالَ: كُنْتُ عِنْدَ عُثْمَانَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) فَدَعَا بِطَهُورٍ فَقالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُول: مَا مِنِ امْرِئٍ مُسْلِمٍ تَحْضُرُهُ صَلاَةٌ مَكْتُوبَةٌ فَيُحْسِنُ وُضُوءَهَا وَخُشُوعَهَا وَرُكُوعَهَا إِلاَّ كَانَتْ كَفَّارَةً لِمَا قَبْلَهَا مِنَ الذُّنُوبِ مَا لَمْ يُؤْتِ كَبِيرَةً وَذَلِكَ الدَّهْرَ كُلَّهُ. رَوَاهُ مُسْلِم[٨].

عەمری كوڕی سەعید (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لەكن عوسمان بووم،، داوای ئاوی دەسنوێژی كردو گوتی: لە پێغەمبەرم ژنەوت (درودی خوای لەسەربێ) دەیفەرموو: هەر موسوڵمانێ كاتێ كە نوێژی لێ دەبێ، بە جوانی دەسنوێژی بۆ بگرێ و بەسەركزی و بەملكەچی بە جوانی جێبەجێی بكا، ئەوا دەبێ بە

(٧) مسلم. صلاة: ٥٥١. ترمذي. فضل الصلوات الخمس: ٢١٤.

(٨) مسلم. طهارة: ٥٤٢.

كەففارەتو بریتی ئەو گوناهانەی كە لەوە پێش كردوونی، بەمەرجێ كە گوناهی گەورە نەبن! ئەم مەرحەمەتەیش هەتا هەتایە هەر بەردەوام دەبێ و هەردەمێنێ ( لە كەرەمی خودا بەزیادبێ) (م = مسلم).

٣٣٠- عَنْ بْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً أَصَابَ مِنِ امْرَأَةٍ قُبْلَةً فَأَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَخْبَرَهُ فَأَنْزَلَ اللهُ أَقِمِ الصَّلاَةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ. فَقَالَ: الرَّجُلُ. يَا رَسُولَ اللهِ أَلِيَ هَذَا؟ قالَ:لِجَمِيعِ أُمَّتِي كُلِّهِمْ[٩].

ئیبنو مەسعوود (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پیاوێ ماچی لە ئافەرتێ دەسەنێ لە پاشا هات بۆلای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وە ئەمەی باسكرد بۆی، جا خودا ئەمەی نارده خوارەوە:

{وَأَقِمِ الصَّلاَةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ – ١١/١١٤}.

واتە: هەموو شەوو رۆژێ پێنج نوێژە فەرزەكان لەكاتی خۆیانا بكەن ئەم نوێژانە لە كردەوە هەرە باشەكانی ئێوەن، بزانن كە یاسایەكی خواییە كە كردەوەی باشو كاری چاكە هەمیشە كردەوەی خراپو تاوان لادەبەن. پیاوەكەش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە بە تایبەتی هەر بۆ من وایە؟ فەرمووی: ئەم حوكمە بۆ گشت ئۆمەتەكەمە، بۆ هەموویان هەروایە (ش/د/ت).

٣٣١- وَعَنْهُ قالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَيُّ الْعَمَلِ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ؟ قالَ: الصَّلاَةُ عَلَى وَقْتِهَا، قالَ: ثُمَّ أَيُّ؟ قالَ: بِرُّ الْوَالِدَيْنِ قالَ: ثُمَّ أَيُّ؟ قالَ: الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ قالَ: حَدَّثَنِي بِهِنَّ وَلَوِ اسْتَزَدْتُهُ لَزَادَنِي. رَوَاهُما الأربعة[١٠].

---

(٩) بخاري. مواقيت الصلاة: ٥٢٦ ، ٤٦٨٧. مسلم. توبة: ٦٩٣٢. ترمذي. سورة هود: ٣١١٣.

(١٠) بخاري. صلاة: ٥٢٧ ، ٢٧٨٢ ، ٥٩٧٠ ، ٧٥٣٤. مسلم. إيمان: ٢٤٨ هەتا ٢٥٢. ترمذي. صلاة: ١٧٣. نسائي. مواقيت الصلاة: ٦٠٩ ، ٦١٠.

دیسان گوتی: لە پێغەمبەرم پرسی (دروودی خوای لەسەربێ): كام كردەوەیە لەلای خودا زۆر خۆشەویستە؟ فەرمووی: نوێژ لە سەرەتای كاتی خۆیا. گوتم: لەپاش ئەمە چیتر زۆر خۆشەویستە لەلای خودا؟ فەرمووی: باشبوون بۆ باوك و دایك گوتم: ئەی لەپاش ئەو چیتر؟ فەرمووی: خەبات و تێكۆشان لە رێگەی خودادا. گوتی: ئەم شتانەی لەسەر ئەم ریزە پێ فەرمووم، وە ئەگەر لەم بارەیەوە زیاتریشم لێ بپرسییایە زیاتری پێ دەفەرمووم (ش/د/ت).

٣٣٢- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: فِتْنَةُ الرَّجُلِ فِي أَهْلِهِ وَمَالِهِ وَوَلَدِهِ وَجَارِهِ تُكَفِّرُهَا الصَّلاَةُ وَالصَّوْمُ وَالصَّدَقَةُ وَالأَمْرُ وَالنَّهْيُ. رَوَاهُ الشيخان والترمذي[11].

حوذەیفە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەو ئاژاوەو ناهەقییە كە تووشی پیاو دەبێ بەهۆی كەسوكارو ماڵ و منداڵ و دەرو دراوسێوە، ئەوە بە كردنی نوێژو رۆژوو و زەكات و خێرات و ئامۆژگاری باش، لە كۆڵی دەكەوێ (ش/ت).

٣٣٣- عَنْ ثَوْبَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: عَلَيْكَ بِكَثْرَةِ السُّجُودِ للهِ فَإِنَّكَ لاَ تَسْجُدُ لِلهِ سَجْدَةً إِلاَّ رَفَعَكَ اللهُ بِهَا دَرَجَةً وَحَطَّ عَنكَ بِهَا خَطِيئَةً. رَوَاهُ مُسْلِم والترمذي[12].

ثەوبان (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەتا دەتوانیت نوێژێكی بێ شومار بكە بۆ خودا، چونكە هەموو جارێ كە كڕنووش (سەجدە)یێ بۆ خودا دەبەیت خودا بەو كڕنووشە یەك پایە بەرزت دەكاتەوەو یەك گوناهیشت لێ هەڵ دەوەرێنێ (م/ت).

٣٣٤- عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ كَعْبٍ الْأَسْلَمِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ أَبِيتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَتَيْتُهُ بِوَضُوئِهِ وَحَاجَتِهِ فَقَالَ: لِي: سَلْ. فَقُلْتُ: أَسْأَلُكَ مُرَافَقَتَكَ فِي

---

(١١) بخاري. مواقيت الصلاة: ٥٢١ ، ٣٢٢١ ، ٧٠٠٤. مسلم. إيمان: ٣٦٧ — ٣٦٩ ، فتن: ٧١٩٧. ترمذي. فتن: ٢٢٥٨.

(١٢) مسلم. صلاة: ١٠٩٣ ، ١٠٩٤. ترمذي. صلاة: ٢٨٨.

أَلجَنَّةِ. قالَ: أَوْ غَيْرَ ذَلِكَ قُلْتُ: هُوَ ذاكَ قالَ: فَأَعِنِّي على نَفْسِكَ بِكَثْرَةِ ألسُّجُودِ. رَوَاهُ ألخمسة إلاَّ البخاري[١٣].

ڕەبیعەی کوڕی کەعبی ئەسلەمی (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە سەفەرێکا بەشەو لە خزمەتی پێغەمبەردا دەبووم (دروودی خوای لەسەربێ) جارێکیان کە ئاوی دەسنوێژو بەرماڵو سیواكو شتومەكەكەیم بۆی برد فەرمووی پێم: داخوازیت چیە بیكە گوتم: داوای ئەوەت لێ دەكەم كە لە بەهەشتا ببم بە هاوڕێتو لە خزمەتتا بم. فەرمووی: خۆ داوای شتێكی تر ناكەی؟ گوتم: نەخێر، داوام هەر ئەوەیەو بەس، فەرمووی: كەواتە خۆتیش بە كردنی نوێژی زۆر، كە سەجدەی زۆری تیایە یاریدەم بدەهەتا نەفست بێنینە سەر ڕێ (م/د/ت/ن).

٣٣٥- عَنْ أَبِي أُمامَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَخْطُبُ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ فَقالَ: اتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ وَصَلُّوا خَمْسَكُمْ وَصُومُوا شَهْرَكُمْ وَأَدُّوا زَكَاةَ أَمْوَالِكُمْ وَأَطِيعُوا ذَا أَمْرِكُمْ تَدْخُلُوا جَنَّةَ رَبِّكُمْ[١٤].

ئەبو ئومامە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە حەجی ماڵ ئاوایی (حجة الوداع)دا گوێم لێبوو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دوانی دەدا، گوێم لێ بوو دەیفەرموو: لە خودا بترسنو تەقوای خودا بكەنو پێنج نوێژەی خۆتان بكەنو ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی خۆتان بگرنو زەكاتی ماڵی خۆتان بدەنو بە گوێی خاوەن فەرمانو گەورەی خۆتان بكەن، ئیتر دەچنە ناو بەهەشتی خودای پەروەردگاری خۆتان (ت-س/ص).

٣٣٦- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: مَا أَذِنَ اللَّهُ لِعَبْدٍ فِي شَيْءٍ أَفْضَلَ مِنْ رَكْعَتَيْنِ يُصَلِّيهِمَا وَإِنَّ الْبِرَّ لَيُذَرُّ عَلَى رَأْسِ الْعَبْدِ مَا دَامَ فِي صَلاتِهِ وَمَا تَقَرَّبَ الْعِبَادُ إِلَى اللَّهِ بِمِثْلِ مَا خَرَجَ مِنْهُ يَعْنِي الْقُرْآنَ. رَوَاهُما الترمذي[١٥].

---

(١٣) مسلم. صلاة: ١٠٩٤. أبو داود. صلاة: ١٣٢٠. ترمذي. دعوات: ٣٤١٦. نسائي. فضل السجود: ١١٣٧.

(١٤) رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

(١٥) رواه الترمذي. بسند صحيح (شرحه).

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوەی کە (رەزای خوای لەسەر بێ)و خودا پێی خۆش بێ کە بەندەی خۆی بیکا هیچی وەك ئەوە ئاوا خێرو گەورە نیە کەوا بەندە دووڕکات نوێژی پاك‌و پوخت بەدڵێکی ساف بۆ خودا بکا، ئەمە لەلایێ، لە لایەکی تریشەوە بەندە هەتا لەناو نوێژدا بێ چاکە دادەبارێ بەسەریا، باشترین شتیش کە بەندە نزیك بکاتەوە لە خوداوە ئەو شتەیە کە لەلای خودا خۆیەوە هاتووە. کە قورئانە. واتە: لەبەرکردن‌و خوێندن‌و خزمەتی قورئان گەورەترین خواپەرستیە. (ت–سند غريب).

## ٤٤) بەشی دووەم: باسی ئاگاداریکردنی نوێژەکان

## الفصل الثاني: في المحافظة على الصلوات

قَالَ اللهُ تَعالى: {حَافِظُواْ عَلَى الصَّلَوَاتِ والصَّلاَةِ الْوُسْطَى وَقُومُواْ لِلّهِ قَانِتِينَ – ٢٣٨/٢}.

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: ئاگاداری هەموو نوێژە فەرزەکانتان بکەن بە تایبەتی نوێژی مەشهووربە (صلاة الوسطى) کە نوێژی عەصرە، وە لە نوێژدا بە سەرکزی راوەستن‌و دەم بە ذیکری خودا بن‌و قسەی دنیایی مەکەن.

٣٣٧– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: أَتَانِي رَبِّي فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ فَقالَ: يَا مُحَمَّدُ قُلْتُ: لَبَّيْكَ رَبِّي وَسَعْدَيْكَ قالَ: فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قُلْتُ: رَبِّي لاَ أَدْرِي فَوَضَعَ يَدَهُ بَيْنَ كَتِفَيَّ فَوَجَدْتُ بَرْدَهَا بَيْنَ ثَدْيَيَّ فَعَلِمْتُ مَا بَيْنَ الْمَشْرِق وَالْمَغْرِبِ قالَ: يَا مُحَمَّدُ. فَقُلْتُ لَبَّيْكَ رَبِّ وَسَعْدَيْكَ قالَ: فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قُلْتُ: فِي الدَّرَجَاتِ وَالْكَفَّارَاتِ وَفِي نَقْلِ الأَقْدَامِ إِلَى الْجَمَاعَاتِ وَإِسْبَاغِ الْوُضُوءِ فِي الْمَكْرُوهَاتِ وَانْتِظَارِ الصَّلاَةِ بَعْدَ الصَّلاَةِ وَمَنْ يُحَافِظْ عَلَيْهِنَّ عَاشَ بِخَيْرٍ وَمَاتَ بِخَيْرٍ وَكَانَ مِنْ ذُنُوبِهِ كَيَوْمَ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ. رَوَاهُ الترمذي[1].

---

(١) رواه الترمذي بسند حسن في التفسير (شرحه).

**ئیبنو عەباس** (ڕەزای خودایان لێبێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: خودا کەم لە شێوەیەکی فرە جوانا لە خەوما هات بۆلام فەرمووی: ئەی موحەممەد! گوتم: بفەرموو ئەی پەروەردگارم! وام لە خزمەتتا، فەرمووی: ئەنجوومەنی باڵا (الملأ الأعلى) کە فریشتە نزیکەکانی بارەگان لەسەر چی مشتو مڕوو دەمە قاڵیانە؟ گوتم: پەروەردگارم! نازانم، جا خودا دەستی دانا لەسەر ناوشانم، وە فێنکایی دەستی گەیشت بە ناوسینگمو دڵی پڕکردم لە زانستو رازو نهێنی، ئیتر زانیم کەچی لە نێوانی رۆژهەڵاتو رۆژئاوادا هەیە، فەرموویەوە: ئەی موحەممەد! گوتم: بفەرموو ئەی بینایی چاوان! فەرمانی تۆ لەسەرچاوانە، فەرموویەوە: ئەنجوومەنی باڵا لەسەرچی دەمەقاڵو مشتو مڕیانە؟ گوتم: لەسەر نوسینو تۆمارکردنی ئەو کردەوە باشانە مقۆمقۆیانە کە دەبن بە مایەی وەدەستهێنانی پایە بەرزەکانی بەهەشت، یا خۆ دەبن بەهۆی کەفارەتو سڕینەوەی گوناهو تاوان، چونکی هەر کەسەیان دەیەوێ دەستپێشکەری بکاو خۆی بینووسێ، وە هەروەها باسی گەورەیی پاداشی ئەو نوێژکەرانە دەکەن کە بەگەرمی دەچن بۆ نوێژی جەماعەت، یاخۆ لەکاتی خۆشیو ناخۆشیدا دەسنوێژی تێرو تەسەل دەگرن، یاخود چاوەنواڕی نوێژ دەکەن نوێژ لەپاش نوێژ، وەڵحاڵ هەرکەسێ ئاگاداری ئەم نوێژانە بە جوانی بکا ئەوە بە خۆشی دەژیو بە خۆشی دەمرێو وەك ئەو رۆژەشی کە لەدایك دەبێ ئاوا لە گوناه پاك دەبێتەوە (ت-س/ح).**

**٣٣٨-** عَنْ جَرِيرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَنَظَرَ إِلَى الْقَمَرِ لَيْلَةً فَقالَ: إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ هَذَا الْقَمَرَ لاَ تُضَامُّونَ فِي رُؤْيَتِهِ فَإِن اسْتَطَعْتُمْ أَلاَّ تُغْلَبُوا عَلى صَلاَةٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهاَ. فَافْعَلُوا. ثُمَّ قَرَأَ (وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ). رَوَاهُ الأربعة[٢].

---

(٢) بخاري. مواقيت الصلاة: ٥٥٤ ، ٥٧٣ ، ٤٨٥١ ، ٧٤٣٥ ، ٧٤٣٦. مسلم. صلاة: ١٤٣٢ ، ١٤٣٣. أبو داود. الرؤية: ٤٧٢٩ ، ٧٤٣٥. ترمذي. رؤية الله: ٢٥٥١ ، ١٧٧.

جەریر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: شەوێ لە خزمەتی حەزرەتدا بوین (درودی خوای لەسەربێ) تەماشایەکی مانگی کردو فەرمووی: چۆن ئێستاکە بە ئاسانی و ئاسوودەیی هەمووتان ئەم مانگە دەبینن لە قیامەتیشا ئاوا خودای خۆتان دەبینن، جا تا دەتوانن ئاگاداری نوێژی بەیانی و نوێژی عەسربن و مەیان چوێنن، چونکە ئەم دوو نوێژە هۆی چوونە بەهەشت و دیتنی خودان ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

{وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا – ٢٠/١٣٠}.

واتە: بەباشی ئاگاداریی نوێژی بەیانی و نوێژی عەصر بکەن و هەمیشە لەناو نوێژدا سوپاس و ستایشی خودای خۆتان بکەن (ش/د/ت).

٣٣٩– وللشيخين: مَنْ صَلَّى الْبَرْدَيْنِ دَخَلَ الْجَنَّةَ[٣].

واتـە: حـەزرەت (درودی خـوای لەسـەربێ) دەفـەرموێ: (هەرکەسێ نوێژی بەیانی و عەصر بکا دەچێتە بەهەشت (ش).

٣٤٠– عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ فَاتَتْهُ الْعَصْرِ فَكَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلَهُ وَمَالَهُ. رَوَاهُ الأربعة[٤].

ئیبنو عەمەر (خـوای لێ رازی بـێ) گـوتی: پێغەمبەر (درودی خـوای لەسـەربێ) فـەرمووی: هەرکەسێ نوێژی عەصری بچێ وەك ئەوە وایە کەماڵ و منالی بەفیڕۆ دابنێ. (ش/د/ت).

٣٤١– عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ قالَ: كُنَّا مَعَ بُرَيْدَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) فِيْ غَزْوَةٍ فِي يَومٍ ذِي غَيْمٍ فَقَالَ: بَكِّرُوا بِصَلاَةِ الْعَصْرِ فَإِنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ تَرَكَ صَلاَةَ الْعَصْرِ فَقَد حَبِطَ عَمَلُهُ. رَوَاهُ البخاري والنسائي[٥].

---

(٣) بخاري. مواقيت الصلاة: ٥٧٤. مسلم. صلاة: ١٤٣٦.

(٤) بخاري. مواقيت الصلاة: ٥٥٢. مسلم. صلاة: ١٤١٦، ١٤١٧، ١٤١٨. أبو داود. وقت صلاة العصر: ٤١٤.

(٥) بخاري. مواقيت الصلاة: ٥٥٣ ، ٥٩٤.

**ئـەبو مـەليح** (خوای لێ رازی بێ) **گـوتی: لـە غـەزایێكا رۆژێكـی هـەوره رۆژدا لەگـەڵ بورەیـدە دابـوین، گـوتی زوو نوێـژی عەصـر بكـەن، چـونكە پێغەمبـەر** (دروودی خـوای لەسـەربێ) **دەفـەرموێ: هەركەسـێ نوێـژی عەصـر نـەكا كـردەی ئـەوو بردەی با (ب/ن).**

## ٤٥) نوێژی ناوەڕاست (صەلاتول وسطا) بریتییە لە نیوژی عەصر: الصلاة الوسطى هي العصر

**٣٤٢- عَنْ عَلِيّ** (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) **قَالَ: قَالَ: رَسُـولُ اللّـهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) **يَـوْمَ الأَحْزَابِ شَغَلُونَا عَنِ الصَّلاَةِ الْوُسْطَى صَلاَةِ الْعَصْرِ مَلأَ اللَّهُ بُيُوتَهُمْ وَقُبُورَهُمْ نَارًا، ثُمَّ صَلاَّهَا بَيْنَ الْعِشَاءَيْنِ. رَوَاهُ الْخَمْسَة**[1].

**عەلی** (خوای لێ رازی بێ) **گـوتی: رۆژی غـەزای خەنـدەق پێغەمبـەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: خودا خانەو گۆڕیان پڕبكا لە ئاگر، بەهۆی ئەوانـەوە نـەمان پـەڕژا كـە نوێـژی ناوەڕاسـت بكـەین كـە بریتییـە لـە نوێـژی عەصـر لـە پاشـان پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **لە ناوەندی نوێژی شێوان و خەوتناندا نوێژەكەی عەصری كرد (ش/د/ت/ن).**

**٣٤٣- عَنْ أَبِي بَصْرَةَ الْغِفَارِيِّ** (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) **قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **الْعَصْرَ بِالْمُخَمَّصِ فَقالَ: إِنَّ هَذِهِ الصَّلاَةَ عُرِضَتْ عَلَـى مَـنْ كَـانَ قَـبْلَكُمْ فَضَيَّعُوهَا، فَمَنْ حَافَظَ عَلَيْهَا كَانَ لَهُ أَجْرُهُ مَـرَّتَيْنِ، وَلاَ صَـلاَةَ بَعْـدَهَا حَتَّـى يَطْلُـعَ الشَّاهِدُ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ والنسائي**[2].

**ئەبو بەصری غیفاری** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: لەموخەممەص پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **نوێژی عەصری بە كۆمەڵی (بەجەماعەت) بۆ كردین و فـەرمووی: لـەپێش ئێوەدا ئـەم نوێـژە دانرابـوو لەسـەر نەتـەوەكانی پـێش**

---

(١) بخاري. جهاد: ٢٩٣١ ، ٤١١١ ، ٤٥٣٣. ٣٦٩٦. مسلم. صلاة: ١٤١٩ — ١٤٢٥. أبو داود. صلاة العصر: ٤٠٩ ترمذي. سورة البقرة: ٢٩٨٤. نسائي. صلاة العصر: ٤٧٢.

(٢) مسلم. صلاة: ١٩٢٤. نسائي. مواقعيت: ٥٢٠.

ئێوەش، بەڵام ئەوان فەرموشیان کردو خستیانە پشت گوێ، جا لەبەر ئەوە ئەوەی ئاگاداری ئەم نوێژە بکا لەباتی پاداشتێ دوو پاداشی بۆ هەیە، وە نوێژی تر نییە لە دوایەوە تا ئاستێرە هەڵ دێ (م/ن).

٣٤٤- عَنْ عَبْدِاللهِ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: صَلاَةُ الْوُسْطى صَلاَةُ الْعَصْرِ. رَوَاهُ الترمذي[٣].

عەبدوڵلا (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: (صلاة الوسطى) نوێژی ناوەڕاست نوێژی عەسرە (ت-س/ص).

### ٤٦) حوکمی نوێژنەکەر: (حكم تارك الصلاة)

٣٤٥- عَنْ جَابِرٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: إِنَّ بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ وَالْكُفْرِ تَرْكَ الصَّلاَةِ. رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ البخاريَّ[١].

جابیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: جیاوازی نێوانی پیاوی موسوڵمان و پیاوی بتپەرست و بێ بڕوا نوێژنەکردنە (م/د/ت/ن).

٣٤٦- عَنْ بُرَيْدَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: الْعَهْدُ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمُ الصَّلاَةُ فَمَنْ تَرَكَهَا فَقَدْ كَفَرَ[٢].

بورەیدە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: جیاوازی نێوانی ئێمەو نێوانی ئەوان پەیمانی نوێژکردنە، جا ئەوەی نەیکا بێ گومان کافرو بێ بڕوا دەبێ (ت-س/ص).

٣٤٧- وَقَالَ: عَبْدِاللّٰهِ بْنِ شَقِيقٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ): كَانَ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ يَرَوْنَ شَيْئًا مِنَ الأَعْمَالِ تَرْكُهُ كُفْرٌ غَيْرَ الصَّلاَةِ. رَوَاهُما الترمذي[٣].

---

(٣) رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

(١) مسلم. إيمان: ٢٤٢. ترمذي. إيمان: بين الكفرو الإيمان/٢٦١٨.

(٢) رواه الترمذي بسند حسن ،شرحه).

(٣) رواه الترمذي بسند مكوتٍ عنه (شرحه).

عــەبوڵڵای كــوڕی شــقیق (خــوای لێ ڕازی بــێ) گــوتی: بیروبــاوەڕی یــارانی موحەمــمــەد (دروودی خــوای لەســەربێ) وابــوو نــەكردنی نوێــژ نــەبێ نــەكردنی هــیچ كارێكی تر بە كوفر دانانرێ! (ت).

## باسی دووەم: باسی كاتی نوێژ، (ئەم باسە دوو بەشە):

### ٤٧) بەشی یەكەم: كاتی كردنی نوێژە فەرزەكان

### (الباب الثاني: في المواقيت، (وفيه فصلان): الفصل الأول: في مواقيت الصلاة)

٣٤٨- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: نَزَلَ جِبْرِيلُ فَأَمَّنِي، فَصَلَّيْتُ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ، ثُمَّ صَلَّيْتُ مَعَهُ يَحْسُبُ بِأَصَابِعِهِ خَمْسَ صَلَوَاتٍ. زاد في روايةٍ: ثُمَّ قالَ: بِهَذَا أُمِرْتُ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ الترمذي[1].

ئــەبو مەســعوود (خــوای لێ ڕازی بــێ) گــوتی: پێغەمبــەر (دروودی خــوای لەســەربێ) فەرمووی: جوبرائیل هاتە خوارەوە بۆ ئەوەی كە فێری نوێژم بكا، جا هەر نوێژەی لەكاتی خۆیا بەرنوێژییەكەی بۆ كردم، لە پێشا نوێژی نیوەڕۆم لەگەڵ كرد، لە پاشان نوێژی عەصریشم لەگەڵ كرد، لە پاشان نوێژی شێوانیشم لەگەڵ كرد لە پاشا نوێژی خەوتنانیشم لەگەڵ كرد، لەپاشا نوێژی بەیانیشم لەگەڵ كرد. پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بە پەنجەكانی هەر پێنج نوێژە فەرزەكانی ژمارد... لە گێڕانەوەیەكا ئەم زیادەیەشی هەیە: ئینجا حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: خودا فەرمانی پێكردووم بە كردنی ئەم پێنج نوێژە لەم پێنج كاتەدا (ش/د/ن).

٣٤٩- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَمَّنِي جِبْرِيلُ (عَلَيْهِ السَّلَامُ) عِنْدَ الْبَيْتِ مَرَّتَيْنِ فَصَلَّى الظُّهْرَ فِي الْأُولَى مِنْهُمَا حِينَ كَانَ الْفَيْءُ

---

(١) بخاري. مواقيت: ٥٢١ ، ٣٢٢١ ، ٤٠٠٧. مسلم. صلاة: ١٣٧٨ ، ١٣٧٩. أبو داود: مواقيت: ٣٩٤. نسائي. مواقيت: ٤٩٣.

مِثْلَ الشِّرَاكِ ثُمَّ صَلَّى الْعَصْرَ حِينَ كَانَ كُلُّ شَيْءٍ مِثْلَ ظِلِّهِ ثُمَّ صَلَّى الْمَغْرِبَ حِينَ وَجَبَتِ الشَّمْسُ وَأَفْطَرَ الصَّائِمُ ثُمَّ صَلَّى الْعِشَاءَ حِينَ غَابَ الشَّفَقُ ثُمَّ صَلَّى الْفَجْرَ حِينَ بَرَقَ الْفَجْرُ وَحَرُمَ الطَّعَامُ عَلَى الصَّائِمِ. وَصَلَّى الْمَرَّةَ الثَّانِيَةَ الظُّهْرَ حِينَ كَانَ ظِلُّ كُلِّ شَيْءٍ مِثْلَهُ لِوَقْتِ الْعَصْرِ بِالأَمْسِ ثُمَّ صَلَّى الْعَصْرَ حِينَ كَانَ ظِلُّ كُلِّ شَيْءٍ مِثْلَيْهِ ثُمَّ صَلَّى الْمَغْرِبَ لِوَقْتِهِ الأَوَّلِ ثُمَّ صَلَّى الْعِشَاءَ الآخِرَةَ حِينَ ذَهَبَ ثُلُثُ اللَّيْلِ ثُمَّ صَلَّى الصُّبْحَ حِينَ أَسْفَرَتِ الأَرْضُ ثُمَّ الْتَفَتَ إِلَيَّ جِبْرِيلُ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ هَذَا وَقْتُ الأَنْبِيَاءِ مِنْ قَبْلِكَ. وَالْوَقْتُ فِيمَا بَيْنَ هَذَيْنِ الْوَقْتَيْنِ. رَوَاهُ الترمذي وصاحباه[٢].

**ئیبنو عەباس** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: جوبرائیل** (درودی خودای لێبێ) **دوو رۆژ لەكن كەعبە بەرنوێژی نوێژەكانی بۆ كردم، لە رۆژی یەكەما ئەوكاتە بەرنوێژی نوێژی نیوەڕۆی بۆ كردم كەسێبەر بەقەد قەیتانێ دەبێ واتە: خۆر بە دیمەن لەناوەڕاستی ئاسمان لای دابوو، وە سێبەری تاقی ئێوارە بەحاڵ لە زیادی بوو، وە ئەو كاتە بەر نوێژی نوێژی عەصری بۆ كردم كە سێبەری هەموو شتێ بەقەد خۆی دەبێ، وە ئەو كاتە بەر نوێژی نوێژی شێوانی بۆ كردم كە خۆر ئاوا دەبێ و رۆژووەوان رۆژوو دەشكێنێ، وە ئەو كاتە بەرنوێژی نوێژی خەوتنانی بۆ كردم كە سوورایی كەناری ئاسمان گوم دەبێ، وە ئەوكاتە بەرنوێژی نوێژی بەیانی بۆ كردم كە شەبەق دەداو خۆراك لە رۆژووەوان یاساخ دەبێ، بەڵام لە رۆژی دووەما ئەوكاتە نوێژی نیوەڕۆی بۆ كردم كە سێبەری هەموو شتێ بەقەد خۆی دەبێ، كە دەق دەكاتە كاتی نوێژی عەصری رۆژی یەكەم، وە ئەو كاتە نوێژی عەصری بۆ كردم كە سێبەری هەموو شتێ دووجار بە قەد خۆی دەبێ، وە نوێژی شێوانی لەكاتی پێشووی خۆیدا بۆ كردمەوە، وە ئەو كاتە نوێژی خەوتنانی بۆ كردم كە سێیەكی شەو دەڕوا، وە ئەوكاتە نوێژی بەیانی بۆ كردم كە سەرزەوی روونـاك دەبێتەوە كەناری رۆژ هەڵات**

---

(٢) بسند صحيح (شرحه).

زەردهەڵدەگەڕێ، ئینجا جوبرائیل (درودی خوای لەسەربێ) رووی تێ کردمو فەرمووی: ئەی موحەممەد ئەمانە کاتی نوێژی پێغەمبەرانی پێش تۆ بوون، وەکاتی نوێژی تۆش لەناوەندی ئەم دوو کاتەدایە کە دوێنێ و ئەمڕۆ نیشانتم دا (ت/د/ن-س/ص).

٣٥٠- عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضيَ اللهُ عَنهُ) قالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ وَقْتِ الصَّلَوَاتِ فَقالَ: وَقْتُ صَلاَةِ الْفَجْرِ مَا لَمْ يَطْلُعْ قَرْنُ الشَّمْسِ الأَوَّلُ وَوَقْتُ صَلاَةِ الظُّهْرِ إِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ عَنْ بَطْنِ السَّمَاءِ مَا لَمْ يَحْضُرِ الْعَصْرُ وَوَقْتُ صَلاَةِ الْعَصْرِ مَا لَمْ تَصْفَرَّ الشَّمْسُ وَيَسْقُطْ قَرْنُهَا الأَوَّلُ وَوَقْتُ صَلاَةِ الْمَغْرِبِ إِذَا غَابَتِ الشَّمْسُ مَا لَمْ يَسْقُطِ الشَّفَقُ وَوَقْتُ صَلاَةِ الْعِشَاءِ إِلَى نِصْفِ اللَّيْلِ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ البخاريَّ(٣).

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: بۆ کاتی نوێژە فەرزەکان لە پێغەمبەریان پرسی (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: کاتی نوێژی بەیانی لە شەبەقەوەیە تا خۆر لە ئاسۆوە سەرهەڵدەداو گۆشە دەکێشێ، وە کاتی نوێژی نیوەڕۆ دەست پێ دەکا لەو کاتەوە کە خۆرلادەدا لەناوەڕاستی ئاسمان وە دەمێنێ تا نوێژی عەصر دادێ، وە کاتی نوێژی عەصر دەست پێدەکا لەو کاتەوە کە سێبەری هەموو شتێ بەقەد خۆی دەبێ، وە دەمێنێ تا خۆر زەردهەڵدەگەڕێ، تا کاتی زەردەپەڕ، وە کاتی نوێژی شێوان (کە خۆر ئاوابوو) دەست پێ دەکا، وە دەمێنێ تا سووری کەناری ئاسمان گوم دەبێ، وە کاتی نوێژی خەوتنان لەم کاتەوە دەست پێ دەکا وە تا نیوەشەو دەمێنێ (م/د/ت/ن).

٣٥١- وَسُئِلَ جَابِرٌ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنْ صَلاَةِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: كَانَ يُصَلِّي الظُّهْرَ بِالْهَاجِرَةِ، وَالْعَصْرَ وَالشَّمْسُ حَيَّةٌ، وَالْمَغْرِبَ إِذَا وَجَبَتْ، وَالْعِشَاءَ إِذَا كَثُرَ النَّاسُ عَجَّلَ، وَإِذَا قَلُّوا أَخَّرَ، وَالصُّبْحَ بِغَلَسٍ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ الترمذي(٤).

---

(٣) مسلم. صلاة: ١٣٨٤ ، ١٣٨٥. أبو داود. مواقيت: ٣٩٦. نسائي. مواقيت: ٥٢١.

(٤) بخاري. مواقيت: ٥٦٠ ، ٥٦٥. مسلم. مساجد: ٦٤٦ (تجريد البخاري/ال — ٣٣٢).

لە جابیریان پرسی (خوای لێ رازی بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە چ کاتێکا نوێژەکانی دەکرد؟ گوتی: لە قرچەی گەرمای نیوەڕۆدا نوێژی نیوەڕۆی دەکرد، کە نوێژی عەصریشی دەکرد خۆر هێشتا بە گوڕبوو، کە خۆریش ئاوا دەبوو نوێژی شێوانی دەکرد، نوێژی خەوتنانیش ئەگەر خەڵکەکە زۆر بوونایە، زو بە زوو دەیکرد، بەڵام ئەگەر نوێژ کەرەکان کەم بوونایە درەنگ دەیکرد، بە تاریکو لێڵەکەش نوێژی بەیانی دەکرد. (ش/د/ن).

٣٥٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيُصَلِّي الصُّبْحَ، فَيَنْصَرِفُ النِّسَاءُ مُتَلَفِّعَاتٍ بِمُرُوطِهِنَّ، مَا يُعْرَفْنَ مِنَ الْغَلَسِ. رَوَاهُ الخمسة(٥).

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: گەلێ جار وا دەبوو کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نوێژی بەیانی بۆ دەکردین ئیتر ژنان چارۆکەو شاڵینەکانیان دەپێچا لە خۆیانەوەو دەگەڕانەوە بۆ ماڵەوە، کەچی هێشتا لە ریگە لەبەر تاریکو لێڵەکە کەس نەیدەناسینەوە. (ش/د/ت/ن).

٣٥٣- عَنْ أَبِي بَرْزَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي الصُّبْحَ وَأَحَدُنَا يَعْرِفُ جَلِيسَهُ، وَيَقْرَأُ فِيهَا مَا بَيْنَ السِّتِّينَ إِلَى الْمِائَةِ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ الترمذي(٦).

ئەبو بەرزە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جاران پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کاتێ کە لە نوێژی بەیانی دەبۆوە بەری دنیا روناك دەبۆوە بە رەنگێکی وا کە هاونیشینی خۆمان دەناسییەوە بەڵام لە سەرەتای نوێژ دابەستنەوە نەمان دەناسییەوە وە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەوری شەست تا سەد ئایەتی تیا دەخوێند (ش/د/ن).

---

(٥) بخاري. أذان: ٨٦٧ مسلم. صلاة: ١٤٥٥ — ١٤٥٧. أبو داود. وقت الصبح: ٤٢٣. ترمذي. تغليس الفجر: ١٥٣ نسائي. مواقيت: ٥٤٤.

(٦) بخاري. مواقيت: ٥٤١ ، ٥٤٧ ، ٥٦٨ ، ٥٩٩ ، ٧٧١. مسلم. صلاة: ١٤٦. أبو داود. ٣٩٨ ، ٤٨٤٩. نسائي. وقت الظهر: ٤٩٤ ، ٥٢٤ ، ٥٢٩.

٣٥٤- وَلِأَصْحَاب السنن: أَسْفِرُوا بِالْفَجْرِ فَإِنَّهُ أَعْظَمُ لِلأَجْرِ[٧].

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: كە بەری دنیا رۆشن بووەوە ئەوسا نوێژی بەیانی بكەن، چونكە ئەوە پاداشی گەورەترە (د/ت/ن-س/ص).

٣٥٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا اشْتَدَّ الْحَرُّ فَأَبْرِدُوا بِالصَّلَاةِ، فَإِنَّ شِدَّةَ الْحَرِّ مِنْ فَيْحِ جَهَنَّمَ وَاشْتَكَتِ النَّارُ إِلَى رَبِّهَا عَزَّ وَجَلَّ فَقَالَتْ: يَا رَبِّ أَكَلَ بَعْضِي بَعْضًا فَأَذِنَ لَهَا بِنَفَسَيْنِ نَفَسٍ فِي الشِّتَاءِ وَنَفَسٍ فِي الصَّيْفِ، فَهُوَ أَشَدُّ مَا تَجِدُونَ مِنَ الْحَرِّ وَأَشَدُّ مَا تَجِدُونَ مِنَ الزَّمْهَرِيرِ. رَوَاهُ الخمسة[٨].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: كە گەرما داهات بەفێنكی نوێژی نیوەڕۆ بكەن و ماوەیێ دوای بخەن لە قرچەی گەرمای نیوەڕۆدا مەیكەن چونكە قرچەی گەرما لە هاڵاوی ئاگری دۆزەخە، ئاگر لەلای خودا سكاڵای لە حاڵی خۆی كردو گوتی: ئەی پەروەردگارم! ناوسكی خۆمم خواردۆتەوەو لەناو خۆما پەنگم خواردۆتەوە پشوویەكم بدەرێ جا خودا رێگەیدا كە دوو هەناسە بدا، هەناسەیێ لە زستاناو هەناسەیێ لە هاوینا جا قرچەی گەرمای هاوین و تەشقی سەرمای زستان (كە ئێوە هەستیان پێ دەكەن) بریتین لەو دوو هەناسەیە (ش/د/ت/ن).

٣٥٦- عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ قَدْرُ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الصَّيْفِ ثَلَاثَةَ أَقْدَامٍ إِلَى خَمْسَةِ أَقْدَامٍ وَفِي الشِّتَاءِ خَمْسَةَ أَقْدَامٍ إِلَى سَبْعَةِ أَقْدَامٍ. رَوَاهُ أبو داود والنسائي[٩].

---

(٧) رواه أصحاب السنن بسند صحيح (شرحه).

(٨) بخاري. مواقيت: ٥٣٧ ، ٣٢٦٠. مسلم. صلاة: ١٤٠٠. أبو داود. وقت صلاة الظهر: ٤٠١. ترمذي. تأخير الظهر: ١٥٨.

(٩) لم يذكر الشارح نسبة الحديث ودرجته (مترجم).

ئیبنو مەسعوود (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە هاوینا ئەوکاتە نوێژی نیوەڕۆی دەکرد کە سێبەر لە سێ پێوە تا پێنج پێ دادێ، لە زستانیشدا ئەوکاتە نوێژی نیوەڕۆی دەکرد کە سێبەر لە پێنج پێوە تا حەوت پێ دادێ (د/ن).

٣٥٧- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قالَ: كُنَّا نُصَلِّي الْعَصْرَ ثُمَّ يَذْهَبُ الذَّاهِبُ مِنَّا إِلَى قُبَاءٍ فَيَأْتِيهِمْ وَالشَّمْسُ مُرْتَفِعَةٌ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ الترمذي[١٠].

ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: جاران لەکاتی پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خوای لەسەربێ) کە نوێژی عەصرمان دەکرد هەمان بوو لەپاش نوێژکردن دەچوو بۆ قوبا، کە دەگەیشتە ئەوێ هێشتا خۆر بەرز بوو (ش/د/ن).

٣٥٨- عَنْ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قالَ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَغْرِبَ إِذَا تَوَارَتْ بِالْحِجَابِ. رَوَاهُ الأربعة[١١].

سەلەمە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: جاران لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەربێ) ئەوکاتە نوێژی شێوانمان دەکرد کە خۆرئاوا دەبێ (ش/د/ت).

٣٥٩- وَلِلثَّلاَثَةِ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَغْرِبَ فَيَنْصَرِفُ أَحَدُنَا وَإِنَّهُ لَيُبْصِرُ مَوَاقِعَ نَبْلِهِ[١٢].

ڕافیعی کوڕی خەدیج (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەوسا لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەربێ) کە نوێژی شێوانمان دەکردو دەگەڕاینەوە بۆ شوێنی خۆمان هێشتا دنیا ئەوەندە ڕووناك بوو شوێنی دەمە تیرمان دەبینی، کە دەمان تەقان دەمان بینی لەکوێ دەدا لە زەوی (ش/د).

٣٦٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قالَ: أَخَّرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَلاَةَ الْعِشَاءِ إِلَى نِصْفِ اللَّيْلِ، ثُمَّ صَلَّى ثُمَّ قالَ: قَدْ صَلَّى النَّاسُ وَنَامُوا، أَمَا إِنَّكُمْ فِي صَلاَةٍ مَا

---

(١٠) بخاري. مواقيت: ٥٥٠. نسائي: ٥٠٥. مسلم. صلاة: ١٤٠٩.

(١١) بخاري. مواقيت: ٥٦١. مسلم. مساجد: ١٤٣٨. أبو داود: ٤١٧. ترمذي: ١٦٤.

(١٢) بخاري. مواقيت: ٥٥٩. مسلم: ١٤٣٩.

انْتَظَرْتُمُوهَا. وفي رواية: لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لأَمَرْتُهُمْ أَنْ يُصَلُّوهَا هَكَذَا. رَوَاهُ الثلاثة والترمذي ولفظه: لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لأَمَرْتُهُمْ أَنْ يُؤَخِّرُوا الْعِشَاءِ إِلى ثُلُثِ اللَّيْلِ أَوْ نِصْفِهِ(١٣).

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: شەوێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نوێژی خەوتنانی دواخست، لە نیوەشەوا كردی، كە لەنوێژ بۆوە فەرمووی: خەڵكی تر نوێژی خۆیان كردو نوستن، بەڵام ئێوە ئەوەتی چاوەنواڕی نوێژ دەكەن بە نوێژ بۆتان حلیبە. لە گێڕانەوەیەكا: مەبادا زەحمەتی ئۆمەتم بدەم ئەگینا دەمگوت پێیان كە ئێستا ئەم نوێژە بكەن (ش/د/ت) گفتە (لەفظ)ی تیرمیذی ئاوایە: نەبادا ئۆمەتم تووشی زەحمەتو رەنج بكەم ئەگینا فەرمانم پێ دەكردن كە نوێژی خەوتنان درەنگ بكەن، تا سێ یەكی شەو یا تا نیوەی شەو دوای بخەن!

٣٦١- عَنْ أَبِي بَرْزَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَكْرَهُ النَّوْمَ قَبْلَ الْعِشَاءِ وَالْحَدِيثَ بَعْدَهَا. رَوَاهُ الشيخان واترمذي(١٤).

ئەو بەرزە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ئەم دوو شتەی پێ ناخۆش بوو.

یەكەم: نووستن لە پێش نوێژی خەوتنانا

دووەم: قسەكردن لەپاش نوێژی خەوتنان (ش/ت).

٣٦٢- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَهُ: يَا عَلِيُّ ثَلاَثٌ لاَ تُؤَخِّرْهَا: الصَّلاَةُ إِذَا آنَتْ وَالْجَنَازَةُ إِذَا حَضَرَتْ وَالأَيِّمُ إِذَا وَجَدْتَ لَهَا كُفْؤًا(١٥).

عەلی (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پێی فەرمووم: ئەی عەلی! ئەم سێ شتە دوامەخە: نوێژ كەبوو تازوو بیكەی كەمە، تەرمیش

---

(١٣) بخاري. مواقيت: ٥٦٩ ، ٥٧١ ، ٧٢٣٩ ، ٥٧٢ ، ٦٠٠ ، ٦٦١ ، ٨٤٧ ، ٥٨٦٩ ، مسلم: ١٤٤٤ — ١٤٤٧. نسائي: ٥٢١٧. أبو داود: وضوء:١٩٩.

(١٤) بخاري. مواقيت: ٥٤١ ، ٥٤٧ ، ٥٦٨ ، ٥٩٩ ، ٧٧١. مسلم. مساجد: ١٤٦٠ — ١٤٦٢.

(١٥) رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

**کە ئامادەبوو تا زوو بینێژیت درەنگە ژنی بێ مێردیش کە هاوتای خۆی دەست کەوت تا زووتر بیدەی بەشوو درەنگە (ت-س/ح).**

**٣٦٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ أَللهُ عَنْهُما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: الْوَقْتُ الأَوَّلُ مِنَ الصَّلاَةِ رِضْوَانُ اللهِ وَالْوَقْتُ الآخِرُ عَفْوُ اللهِ. رَوَاهُما الترمذي[١٦].**

**ئیبنو عومەر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: کردنی نوێژ لە سەرەتای کاتی خۆیا هۆی رەزامەندیی خودایە، وە لە دواکاتیا هۆی لێ بووردنی خودایە (ت-سند غریب).**

## ٤٨) هەر نوێژێ (لەکاتی خۆیا) فریای رکاتێکی بکەوی ئەوە فریای هەمووی دەکەویت: (تدرك الصلاة بإدراك ركعة)

**٣٦٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الصُّبْحِ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ فَقَدْ أَدْرَكَ الصُّبْحَ، وَمَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الْعَصْرِ قَبْلَ أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ فَقَدْ أَدْرَكَ الْعَصْرَ. رَوَاهُ الخمسة[١].**

**لە ئەبو هورەیرەوە (خوای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ فریای یەك رەکاتی نوێژی بەیانی بکەوێ لەپێش خۆرکەوتنا ئەوە فریای نوێژی بەیانی بە تەواوی دەکەوێ بە مەعنا بە حازری دەیکا نەك بەقەزا وە هەر کەسێ فریای رکاتێکی نوێژی عەصر بکەوێ لەپێش خۆرئاوابوونا ئەوە فریای نوێژی عەصر بە تەواوی دەکەوێ (ش/د/ت/ن).**

**٣٦٥- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ ألصَّلاَةِ فَقَدْ أَدْرَكَ ألصَّلاَةَ. رَوَاهُ الشيخان والنسائي[٢].**

---

(١٦) رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

(١) بخاري: ٥٨٠. مسلم: ١٣٧٠. أبو داود: ١١٢١. نسائي: ٥٥٢.

(٢) بخاري. ٥٨٠. مسلم. ١٣٧٠. أبو داود: ١١٢١. نسائي. ٥٥٢.

دیسان لەوەوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ (لەهەر نوێژێ) بەیەك ركاتیا بگا ئەوە بەو نوێژە بە هەموویا گەیشتووە (ش/ن). واتە نوێژەکەی بەحازر حسێب دەکرێ.

## ٤٩) بەهانەی ڕەوای نوێژ: (أعذار الصلاة)

٣٦٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ نَسِيَ صَلاَةً فَلْيُصَلِّ إِذَا ذَكَرَهَا، لاَ كَفَّارَةَ لَهَا إِلاَّ ذَلِكَ، أَقِمِ الصَّلاَةَ لِذِكْرِى. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ[1].

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ، هەر نوێژێکی لەبیرچوو لەکاتی خۆیا نەیکرد با هەر کاتێ یادی کەوتەوە ئەوکاتە بیکا، ئیتر جگە لەمە برێتی (کەفارەت)ی تری نیە ئەوەتا خودا دەفەرموێ: {أَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي - ٢٠/١٤}. واتە: بەتایبەتی ئاگاداری نوێژەکەت بکەو لە لەکاتی خۆیا بیکە بۆ یادکردن و ناوبردنی من (ش/د/ت/ن).

٣٦٧- وَلِمُسْلِمٍ: إِذَا رَقَدَ أَحَدُكُمْ عِنِ الصَّلاَةِ أَوْ غَفَلَ عَنْهاَ فَلْيُصَلِّهاَ إِذَا ذَكَرَهاَ فَإِنَّ الله يَقُولُ - أَقِمِ الصَّلاَةَ لِذِكْرِيْ-[2].

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر یەکێکتان لەکاتی نوێژدا خەوتبوو یا لەبیری چوو نوێژ بکا ئەوە هەر کاتێ بیری کەوتەوە یا لەخەو هەڵسا با ئەو دەمە ئەو نوێژە بکا، چونکە خودا دەفەرموێ:

{أَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي - ٢٠/١٤} (م).

٣٦٨- عَنْ عَمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ فِي مَسِيرٍ لَهُ، فَنَامُوا عَنْ صَلاَةِ الْفَجْرِ فَاسْتَيْقَظُوا بِحَرِّ الشَّمْسِ فَقالَ: عَلَيْهِ الصَّلاَةُ

---

(١) بخاري. ٥٩٧. مسلم: ١٥٦٤ - ١٥٦٧. أبو داود: ٤٤٢. ترمذي. ١٧٨.

(٢) مسلم: ١٥٥٨ ، ١٥٦٧.

وَٱلسَّلَامُ: تَنَحَّوُا عَنْ هَذَا ٱلْمَكَانِ ثُمَّ أَمَرَ بِلالاً فَأَذَّنَ ثُمَّ تَوَضَّأُوا وَصَلُّوا رَكْعَتِي الفَجْرِ ثُمَّ أَمَرَ بِلاَلاً فَأَقَامَ الصَّلاَةَ فَصَلَّى بِهِمْ صَلاَةَ الصُّبْحِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والشيخان[٣].

**عیمرانی کوڕی حوصەین** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **لەسەفەرێکا دەبێ، بۆ نوێژی بەیانی خەویان لێ دەکەوێ، کە خەبەر دەبنەوە هەتاو گەرم دەبێ، جا پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **دەفەرموێ: لەم جێگایە بگوێزنەوە چونکە ئێرە شەیتانی لێیە، کە لەوێ گوێزایانەوە ئەوجا پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **بە بیلالی فەرموو، بانگ بڵێ: جا بیلال بانگیدا، ئینجا دەسننوێژیان گرت و دوو ڕکاتە سوننەتەکەی بەیانییان کرد، ئینجا فەرمانی کرد بەبیلال قامەتی کرد، ئینجا پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **نوێژی بەیانی بە کۆمەڵ (بە جەماعەت) بۆ کردن (د/ش).**

٣٦٩- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: ذَكَرُوا لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَوْمَهُمْ عَنِ ٱلصَلاَةِ فَقالَ: إِنَّهُ لَيْسَ فِي النَّوْمِ تَفْرِيطٌ إِنَّمَا التَّفْرِيطُ فِي الْيَقَظَةِ. رَوَاهُ الترمذي ومسلم وأبو داود[٤].

**ئەبو قەتادە** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: گوتیان بە پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **کە جارو بار لەکاتی نوێژا خەومان لێ دەکەوێ و خەبەرمان نابێتەوە لەکاتی خۆیا بیکەین؟ فەرمووی: خەو قەیدی نیە بەڵام ئەوەی قەیدی هەیە کاتی بەخەبەر بوونە (ت/م/د).**

٣٧٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ أللهُ عَنْهَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَلَّى بِالْمَدِينَةِ سَبْعًا وَثَمَانِيًا الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ. رَوَاهُ ٱلْخَمْسَةَ. وَلَفْظُ مُسْلِمٍ جَمعَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِالْمَدِينَةِ فِي غَيْرِ خَوْفٍ وَلاَ مَطَرٍ قِيلَ لاَبْنِ عَبَّاسٍ: مَا أَرَادَ إِلى ذَلِكَ؟ قَالَ: أَرَادَ أَلاَّ يُحْرِجَ أُمَّتَهُ[٥].

---

(٣) بخاري. مناقب: ٣٥٧١. مسلم. مساجد: ١٥٦١.

(٤) مسلم: ١٥٦٠.

(٥) بخاري. ٥٤٣ ، ٥٦٢ ، ١١٧٤. مسلم: ١٦٣٢ ، ١٦٣١. أبو داود: ١٢١١. ترمذي: ١٨٧ نسائي: ٦٠١.

ئیبنو عەباس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: جارە جارە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە مەدینە نوێژی نیوەڕۆو عەصری کۆ دەکردەوەو بەجەمع. هەشت رکاتی دەکرد، بە دوو سلاو، هەروەها شێوان و خەوتنانیشی کۆ دەکردەوەو بەجەمع حەوت رکاتی دەکرد بە دوو سلاو. (ش/د/ت/ن) گفتەی موسلیم: (پرکۆڕەکەی لە نووربێ) ئاوایە: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) جارێ لە شاری مەدینە نوێژی نیوەڕۆو عەصری کۆکردەوەو بە جەمع کردنی، هەروەها نوێژی شێوان و خەوتنانیشی کۆکردەوەو ئەوانیشی بە جەمعکرد، ئەو ڕۆژەش پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نە لە سەفەردا بوو، وە نەترسی دوژمنی هەبوو، وە نەباران بوو، عەرزی ئیبنو عەباس دەکەن: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەبەر چی ئاوای کردووە؟ دەڵێ: مەبەستی ئەوە بووە کە ئۆمەتی تووشی نارەحەتی نەکا.

٣٧١- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ جَمَعَ بَيْنَ الصَّلاَتَيْنِ مِنْ غَيْرِ عُذْرٍ فَقَدْ أَتَى بَابًا مِنْ أَبْوَابِ الْكَبَائِرِ. رَوَاهُ الترمذي والبيهقي والحاكم(٦).

دیسان لەوەوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ (بەبێ بەهانەیەکی رەوا) دوو نوێژ کۆبکاتەوە بە جەمع بیان کات بێگومان کە ئەوە بابەتێ لە بابەتەکانی گوناهە گەورەکانی کردووە (تیرمیذی/ بەیهەقی/ حاکم — رەحمەتی خودایان لێبێ).

## ٥٠) بەشی دووەم: ئەوکاتە تایبەتیانەی کە نوێژی سوننەتیان تیا باش نیە

## الفصل الثاني: في الأوقات المنهي عن النافلة فيها

٣٧٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: شَهِدَ عِنْدِي رِجَالٌ مَرْضِيُّونَ وَأَرْضَاهُمْ عِنْدِي عُمَرُ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنِ الصَّلاَةِ بَعْدَ الصُّبْحِ حَتَّى تَشْرِقَ الشَّمْسُ، وَبَعْدَ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ(١).

---

(٦) رواه الحاكم في المستدرك، فيه حنش وهو ثقة (شرحه).

(١) بخاري: ٥٨١. مسلم: ١٩١٨. أبو داود: ١٢٧٦. ترمذي: كراهية الصلاة بعد العصر: ١٨٣. نسائي: ٥٦١.

ئیبنو عەباس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: چەن پیاوچاکێ کە یەکێکیان عومەربوو، کە بەلامەوە ئەو لە هەموویان پەسەند تربوو، شایەتییاندا لەلامو گوتیان: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەپاش کردنی نوێژی بەیانی تا خۆرهەڵ دەهات، ڕێگەی کردنی نوێژی سوننەتی نەدەدا، هەروەها لەپاش کردنی نوێژی عەصریش ڕێگەی کردنی نوێژی سوننەتی نەدەدا تا خۆر ئاوا دەبوو (ش/د/ت/ن).

٣٧٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَحَرَّوْا بِصَلاَتِكُمْ طُلُوعَ الشَّمْسِ وَلاَ غُرُوبَهَا فَإِنَّهَا تَطْلُعُ بِقَرْنَيْ شَيْطَانٍ وَفِي رواية: إِذَا طَلَعَ حَاجِبُ الشَّمْسِ فَأَخِّرُوا الصَّلاَةَ حَتَّى تَرْتَفِعَ وَإِذَا غَابَ حَاجِبُ الشَّمْسِ فَأَخِّرُوا الصَّلاَةَ حَتَّى تَغِيبَ. رَوَاهُ الشيخان والنسائي[٢].

ئیبنو عومەر (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: لەکاتی خۆرکەوتنو خۆر ئاوابوونا نوێژ مەکەن، چونکە خۆر لەوکاتەدا شەیتانو دەستەی شەیتان دەوری لێ دەدەنو چاوەڕوانی کوڕنووش بردنی خۆرپەرستەکان دەکەن بۆ خۆر، تا بە دیمەن کوڕنووشو سەجدەکە بۆ ئەوان بێ. لە گێڕانەوەیەکا: کە خۆر لە ئاسۆوە سەری کێشا ئیتر نوێژ مەکەن تا بەقەد ڕمێك بەرز دەبێتەوە، کە نووکی خۆریش ئاوابوو ئیتر نوێژ مەکەن تا بەتەواوی ئاوا دەبێ (ش/ن).

٣٧٤- عَنْ عَمْرِو بْنِ عَبَسَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَيُّ اللَّيْلِ أَسْمَعُ؟ قَالَ: جَوْفُ اللَّيْلِ الآخِرُ فَصَلِّ مَا شِئْتَ فَإِنَّ الصَّلاَةَ مَشْهُودَةٌ مَكْتُوبَةٌ حَتَّى تُصَلِّيَ الصُّبْحَ ثُمَّ أَقْصِرْ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ فَتَرْتَفِعَ قِيسَ رُمْحٍ أَوْ رُمْحَيْنِ فَإِنَّهَا تَطْلُعُ بَيْنَ قَرْنَيْ شَيْطَانٍ وَتُصَلِّي لَهَا الْكُفَّارُ ثُمَّ صَلِّ مَا شِئْتَ فَإِنَّ الصَّلاَةَ مَشْهُودَةٌ مَكْتُوبَةٌ حَتَّى يَعْدِلَ الرُّمْحُ ظِلَّهُ ثُمَّ أَقْصِرْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ تُسْجَرُ وَتُفْتَحُ أَبْوَابُهَا فَإِذَا زَاغَتِ الشَّمْسُ فَصَلِّ مَا شِئْتَ فَإِنَّ الصَّلاَةَ مَشْهُودَةٌ مَكْتُوبَةٌ حَتَّى تُصَلِّيَ الْعَصْرَ، ثُمَّ أَقْصِرْ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ فَإِنَّهَا تَغْرُبُ بَيْنَ قَرْنَيْ شَيْطَانٍ وَيُصَلِّي لَهَا الْكُفَّارُ. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ إِلا البخاري[٣].

---

(٢) بخاري. ٥٨٢ ، ٥٨٥ ، ٥٨٩ ، ١١٩٢ ، ١٦٢٩ ، ٣٢٧٣ ، ٥٨٣ ، ٣٢٧٢. مسلم: ١٩٢٢. نسائي. ٥٧٠.

(٣) مسلم: ١٩٢٧.

عومری كوڕی عەبەسە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! چی كاتێكی شەو دووعاو نزاو پەرستنش باشتر گیرا دەبێ؟ فەرمووی: نیوەی دووەمی شەو بكە بەسێ بەشەوە، بەشی ناوەڕاستی، ئیتر چەنێ ئارەزوو دەكەی نوێژ بكە، چونكە نوێژی ئەم كاتە فریشتە دێتە دیاریو تەماشای دەكەنو پاداشەكەی دەنووسن، ئیتر هەرنوێژ بكە تا نوێژی بەیانی دەكەی ئەوجا وازبێنە تا خۆر دەكەویو بەقەد رمێك یا دوو رم بەرز دەبێتەوە، چونكە خۆر كە هەڵدێ لە نێوانی دوو شاخەی شەیتانەوە هەڵدێو بێ بڕواكان لەو دەمەدا كوڕنووشی بۆ دەبەن، لەپاشان چەنێ حەز دەكەی نوێژ بكە، چونكە نوێژ لەوكاتەدا فریشتە دێنە دیاریو تەماشای دەكەنو پاداشەكەی دەنووسن، ئیتر هەرنوێژ بكە تا سێبەری رم بەقەد خۆی لێ دێو یەك تۆسقاڵ لە هیچ لایەكەوە سێبەری نامێنێ ئەوجا واز بێنە، چونكە لەوكاتەدا دۆزەخ وەك تەندوور دادەخرێو جۆش دەسەنێ و دەرگاكانی دەكرێنەوە، بەڵام كە خۆرلایدا لە ناوەڕاستی ئاسمان ئیتر چەنێ ئارەزوو دەكەی نوێژبكە، چونكە نوێژی ئەو كاتە فریشتە دێنە دیاریو تەماشای دەكەن، ئیتر هەر نوێژ بكە تا نوێژی عەصر دەكەی، ئەوجا وازبێنە تا خۆرئاوا دەبێ، چونكە خۆر كە ئاوادەبێ لە نێوانی دوو شاخەی شەیتانەوە ئاوا دەبێو بێ بڕواكان لەو كاتەدا كوڕنووشی بۆ دەبەن (م/د/ن/ن).

٣٧٥- وَالأَبِي دَاوُدَ وَالْبَيْهَقِي: كَرِهَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الصَّلاَةَ نِصْفَ النَّهَارِ إِلاَّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَإِنَّ جَهَنَّمَ تُسْجَرُ إِلاَّ فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ[٤].

گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نوێژكردنی لەناوەڕاستی ڕۆژدا پێ ناخۆش بوو جگە لە ڕۆژی هەینی، چونكە هەموو ڕۆژێ لە ناوەڕاستی ڕۆژدا دۆزەخ دادەخرێو جۆش دەسەنێ تەنیا ڕۆژی هەینی نەبێ (د/بەیهەقی).

٣٧٦- وَلِلنَّسَائِي: يَا بَنِي عَبْدِ مَنَافٍ لاَ تَمْنَعُوا أَحَدًا طَافَ بِهَذَا الْبَيْتِ وَصَلَّى أَيَّةَ سَاعَةٍ شَاءَ مِنْ لَيْلٍ أَوْ نَهَارٍ[٥].

(٤) سكت عن درجته الشارح (مترجم).

گــوتی: پێغەمبــەر (دروودی خــوای لەســەربێ) فــەرمووی: ئــەی نەتــەوەی عەبدومەناف! هەر كەسێ لەهەر كاتێكا چ بە شەو چ بە ڕۆژ دەیەوێ تەوافی ئەم ماڵی خودایە بكا یا نوێژی تیا بكا ڕێگەی لێ مەگرن و تەوافی كابەو نوێژی ناو بەیت لە هەموو كاتێكا دروستە (ن).

٣٧٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيَّ قَالَ: إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَلاَ صَلاَةَ إِلاَّ الْمَكْتُوبَةَ. رَوَاهُ الْخَمْسَة إِلاَّ الْبُخَارِيَّ، والله أعلم[٦].

ئـەبو هـورەیرە (خـوای لێ ڕازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) فەرمووی: كە نوێژی فەرز دابەسترا ئیتر جگە لە نوێژە فەرزەكە هیچ نوێژێكی تر دروست نیە (م/د/ت/ن).

## ٥١) باسی سێیەم: باسی مەرجەكانی نوێژ

## الباب الثالث: في شروط الصلاة

٣٧٨- عَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلاَثَةٍ عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الصَّبِيّ حَتَّى يَحْتَلِمَ وَعَنِ الْمَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي والحاكم وصحَّحه[١].

عەلی (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: قەڵەم لەسەر ئەم سێ كەسە هەڵگیراوە: لەسەر خەوتوو تا خەبەری دەبێتەوە، لەسەر منداڵ تا شەیتانی دەبێ، لەسەر شێت تا دێتەوە هۆش خۆی (د/ن/حاكم:ح/ص).

٣٧٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: عَرَضَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ أُحُدٍ فِي الْقِتَالِ وَأَنَا ابْنُ أَرْبَعَ عَشْرَةَ سَنَةً فَلَمْ يُجِزْنِي وَعَرَضَنِي يَوْمَ الْخَنْدَقِ وَأَنَا ابْنُ خَمْسَ عَشْرَةَ سَنَةً فَأَجَازَنِي. قَالَ: نَافِعٌ: فَقَدِمْتُ عَلَى عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ وَهُوَ يَوْمَئِذٍ خَلِيفَةٌ فَحَدَّثْتُهُ بِهَذَا فَقَالَ: إِنَّ هَذَا لَحَدٌّ بَيْنَ الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ. فَكَتَبَ إِلَى

---

(٥) سكت عن درجه الشارح (مترجم).

(٦) مسلم. ١٦٤٢. أبو داود: ١٢٦٦.

(١) حديث صحيح عنه الحاكم (المترجم).

عُمَّالِهِ أَنْ يَفْرِضُوا لِمَنْ كَانَ ابْنَ خَمْسَ عَشْرَةَ سَنَةً وَمَنْ كَانَ دُونَ ذَلِكَ فَاجْعَلُوهُ فِي الْعِيَالِ. رَوَاهُ اْلْخَمْسَةُ(٢).

ئیبنو عومەر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: رۆژی غەزای ئوحود چواردە ساڵ بووم پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) تەماشای کردم تا بزانێ بە کەڵکی جەنگ دێم یانا بەڵام لەبەر بچووکی تەمەنم بە گەندی نەکردم، وەلێ رۆژی غەزای خەندەق پازدەساڵ بووم، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بۆ هەمان مەبەست تەماشای کردمو رێگەی غەزاکردنی دام. نافیع گوتی: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز جێنشین (خەلیفە) بوو چووم بۆ سەردانیو ئەم فەرموودەیەم بۆ گێڕایەوە، جا عومەر گوتی: ئەم سەرگوروشتەیە رادەی جیاکردنەوەی بچووكو گەورەیە لە یەکتری، جا بۆیە نامەی نووسی بۆ سەرکارەکانی: کە ئەوەی تەمەنی پازدە ساڵی تەواوە بەشی بۆ دانێنو لە خێرو لەشەڕدا بە پیاوی تەواو حلێبی بکەن، ئەوەشی تەمەنی لەوە کەمتر بێ دایبنێن بە (وردە) خێزانو لەچاكو لە خراپا حاڵی حاڵی منالە (ش/د/ت/ن).

٣٨٠- عَنْ سَبْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مُرُوا الصَّبِيَّ بِالصَّلاَةِ إِذَا بَلَغَ سَبْعَ سِنِينَ وَإِذَا بَلَغَ عَشْرَ سِنِينَ فَاضْرِبُوهُ عَلَيْهَا. زاد في رواية: وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضَاجِعِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَأحمد والترمذي(٣).

سەبرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: منالْ کە بوو بە حەوت ساڵ ئیتر نوێژی پێ بکەن، وە کە بوو بە دەساڵ ئەگەر بەپێ گوتن نەی کرد لێی بدەن لەسەری لە گێڕانەوەیەکا ئەمەی پترە: جێگەی خەویان بۆ جیا بکەنەوەو بەیەکەوە مەیانخەوێنن مەبادا خوویان خراپ ببێ (د/ئەحمەد/ت-س/ص).

---

(٢) مسلم. ٤٨١٤ ، ٤٨١٥. أبو داود: ٤٤٠٧.

(٣) بسند صحيح (شرحه).

**٥٢) پاكیو خاوێنیی (لەشو بەرگو جێگە) لە مەرجەكانی نوێژە: (الطهارة)**

٣٨١- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ صَلاَةً بِغَيْرِ طُهُورٍ وَلاَ صَدَقَةً مِنْ غُلُولٍ. رَوَاهُ الْخَمْسَةُ إلا البخاري[1].

ئیبنو عومەر (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: خودای گەورە نە نوێژ بەبێ دەسنوێژو پاكی گیرا دەكاو نەخێر لەگزیو دزیقەبووڵ دەكا (م/د/ت/ن).

٣٨٢- عَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): عَنِ النَّبِيِّ قالَ: مِفْتَاحُ الصَّلاَةِ الطُّهُورُ وَتَحْرِيمُهَا التَّكْبِيرُ وَتَحْلِيلُهَا التَّسْلِيمُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي والحاكم وصحَّحه[2].

عەلی (رەزای خودای لێبێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: كلیلی نوێژ پاكییە، وە قفڵدانی ئەڵڵاهو ئەكبەری نوێژ دابەستنە، وە كرنەوەو تەواو بوونی سەلام دانەوەیە (د/ت/حاكم:ص).

٣٨٣- (ب – ١ ز – ٢٣ ژمارە: ١/١٧٠)[3].

٣٨٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي بِأَصْحَابِهِ إِذْ خَلَعَ نَعْلَيْهِ فَوَضَعَهُمَا عَنْ يَسَارِهِ فَلَمَّا رَأَى ذَلِكَ الْقَوْمُ أَلْقَوْا نِعَالَهُمْ فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَلاَتَهُ قالَ: مَا حَمَلَكُمْ عَلَى إِلْقَائِكُمْ نِعَالَكُمْ؟ قَالُوا: رَأَيْنَاكَ أَلْقَيْتَ نَعْلَيْكَ فَأَلْقَيْنَا نِعَالَنَا، فَقَالَ: إِنَّ جِبْرِيلَ (عَلَيْهِ السَّلاَم) أَتَانِي فَأَخْبَرَنِي أَنَّ فِيهِمَا قَذَرًا أَوْ أَذًى وَقَالَ: إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ إِلَى الْمَسْجِدِ فَلْيَنْظُرْ فَإِنْ رَأَى فِي نَعْلَيْهِ قَذَرًا أَوْ أَذًى فَلْيَمْسَحْهُ وَلْيُصَلِّ فِيهِمَا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَأحمد والحاكم[4].

ئەبو سعید (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) جارێ نوێژی دەكرد بۆ هاورێكانی، لەپڕ لەناو نوێژەكەیدا پێڵاوەكانی خۆی

---

(١) مسلم: ٥٣٤ ، ترمذي.

(٢) صحيح عند الحاكم (مترجم).

(٣) سبق تخريجه فى رقم: ١٦٩/١.

(٤) بسند صالح (شرحه).

داكەنـدو لـەلای چـەپیەوە داینـان، یـارانیش (كـە ئەمـەیان دی) ئـەوانیش پێڵاوەكانی خۆیان فڕێدا، جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) كە نوێژەكەی تەواو كرد فەرمووی: ئەوە ئێوە بۆ پێڵاوەكانی خۆتان داكەند؟ گوتیان: دیمان تۆ پێڵاوەكانی خۆتت داكەند ئێمەش چاومان لەتۆ كردو پێڵاوەكانی خۆمانمان داكەند، فەرمووی: من بۆیە وامكرد چونكە جوبرائیل (دروودی خوای لەسەربێ) هات بۆ لام و پێی گوتم كەپیسی و ئازاریان پێوەیە، وە فەرمووشی: كە دێن بۆ مزگەوت سەرنجی پێڵاوەكانتان بدەن ئەگەر پیسی و ئازاریان پێوەبوو بیسڕن و نوێژیان پێوە بكەن (د/ئەحمەد:حاكم-سند صالح).

٣٨٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا أَحْدَثَ أَحَدُكُمْ فِي صَلاَتِهِ فَلْيَأْخُذْ بِأَنْفِهِ ثُمَّ لِيَنْصَرِفْ. رَوَاهُ ابُو دَاوُدَ وابن ماجة[٥].

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرمویێ: ئەگەر لەناو نوێژدا دەست نوێژەكەتان شكا دەست بگرن بەلوتتانەوەو لووت پڕژان بكەن بە بەهانە، تا تەریق نەبنەوە ئینجا نوێژەكەتان ببڕن و بڕۆن (د/ئیبنو ماجە-سند صالح).

## ٥٣) رووكردنە رووگە: (إستقبال القبلة)

٣٨٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ صَلَّى صَلاَتَنَا، وَاسْتَقْبَلَ قِبْلَتَنَا، وَأَكَلَ ذَبِيحَتَنَا، فَذَلِكَ الْمُسْلِمُ الَّذِى لَهُ ذِمَّةُ اللَّهِ وَذِمَّةُ رَسُولِهِ، فَلاَ تُخْفِرُوا اللَّهَ فِي ذِمَّتِهِ. رَوَاهُ البخاري والنسائي[١].

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرمویێ: هەركەسێ وەك خۆمان ئەم نوێژەی ئێمەیە بكاو وەك خۆمان رووبكاتە ئەم قیبلەی ئێمەیەو وەك خۆمان لە گۆشتی حەیوانێ بخوا كە ئێمە سەری ببڕین، ئیتر ئەو كەسە موسوڵمانی تەواوەو لە ئامانی خوداو لە ئامانی پێغەمبەری

(٥) بسند صالح (شرحه).

(١) بخاري: ٣٩١ ، ٣٩٢ ، ٣٩٣.

خودادایە، کە وابوو ئیتر ئێوەش ئامان‌و پەیمانی خودا ببەنە سەرو، ناپاکی لەو موسوڵمانە مەکەن (ب/ن).

٣٨٧- عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ: صَلَّيْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَحْوَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ سِتَّةَ عَشَرَ شَهْرًا أَوْ سَبْعَةَ عَشَرَ شَهْرًا، ثُمَّ صُرِفْنَا نَحْوُ الْكَعْبَةِ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ أبا داود[٢].

بەراء (خوای لێ رازی بێ) گوتی: تا شازدە مانگ یا تا حەڤدە مانگ (لەمەدینە) لەگەڵ پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خوای لەسەربێ) نوێژمان بەرەو (بيت المقدس) دەکرد، لە پاشان بەفەرمانی خودا لە نیوژداو لەو تاعەتانەدا کەروو دەکرێتە رووگە، رووومان کردە کەعبە (ش/ت/ن).

٣٨٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): قالَ: بَيْنَمَا النَّاسُ فِي صَلاَةِ الصُّبْحِ بِقُبَاءٍ إِذْ جَاءَهُمْ آتٍ فَقالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَدْ أُنْزِلَ عَلَيْهِ اللَّيْلَةَ. وَقَدْ أُمِرَ أَنْ يَسْتَقْبِلَ الْكَعْبَةَ فَاسْتَقْبِلُوهَا. وَكَانَتْ وُجُوهُهُمْ إِلَى الشَّامِ فَاسْتَدَارُوا إِلَى الْكَعْبَةِ. رَوَاهُ الْخَمْسَةَ إِلاَّ الترمذي[٣].

ئیبنو عومەر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: ئەوا موسوڵمانان لە قوبا، رووبەرەو شام خەریکن نوێژی بەیانی دەکەن لەوکاتەدا، لەناو نوێژەکەدا دەبن، کە پیاوێ دێ دەڵێ پێیان: ئەم شەو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ئایەتی بۆ هاتووەو فەرمانی پێ کراوە کە ئیتر رووبکاتە کابە، جا ئێوەش رووی تێبکەن، ئیتر ئەوانیش روویان لەشام وەرچەرخان‌و رووی خۆیان کردە کەعبە (ش/د/ن).

٣٨٩- وَكَانَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُحِبُّ أَنْ يُوَجَّهَ لِلْكَعْبَةِ فَأَنْزَلَ اللهُ (قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاءِ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ

(٢) بخاري. ٤٠ ، ٣٩٩ ، ٤٤٨٦ ، ٤٤٩٢ ، ٧٢٥٢. مسلم: ١١٧٧. نسائي. ٤٨٧.

(٣) بخاري: ٤٠٣ ، ٤٤٨٨ ، ٤٤٩٠ ، ٤٤٩١ ، ٤٤٩٣ ، ٤٤٩٤ ، ٧٢٥١. مسلم: ١١٧٨ ، ١١٧٩. نسائي: ٤٩٢ ، ٧٤٤.

الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَحَيْثُماَ كُنتُمْ فَوَلُّوا وُجُوهَكُمْ شَطْرَهُ فَتَوَجَّهَ نَحْوَ الْكَعْبَةِ. رَوَاهُ البخاريُّ والترمذيُّ(٤).

گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە پێشدا لە نوێژدا رووی دەكردە بەیتولمەقدیس، بەڵام لە دڵەوە حەزی دەكرد كە خودا رێگەی بداتەوە وەك یەكەم جار روو بكاتەوە كەعبە، جاخودا ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە:

{قَدْ نَرَى تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي السَّمَاء فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَاهَا فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَحَيْثُ مَا كُنتُمْ فَوَلُّواْ وُجُوِهَكُمْ شَطْرَهُ – ٢/١٤٤}.

واتە: بەڕاستی ئێمە تۆ دەبینین و ئاگامان لێتە كە ڕوو دەكەیتە ئاسمان بەهیوای هاتنی مژدەی گۆڕینی رووگە (قبلە)ی، دڵنیابە كەوا رووت دەكەینە رووگەیێ كە خۆت پەسەندی بكەی، سادەی لەمەولا لە نوێژا رووبكە بۆلای (مسجد الحرام) كە ئەو مزگەوتەیە كە ئێمە دەستی رێزو حورمەتمان لێناوە، كە كابەی شەریف لە ناوەڕاستی حەوشەكەیایەتی، ئێوەش ئەی موسوڵمانینە! لە هەر لایەك بوون لە نوژدا رووبكەنە لای ئەو مزگەوتە، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) رووی كردە كەعبە. (بوخاری و تیرمیذی – بەر رەحمەتی خوداكەون).

٣٩٠– وَقَالَ: عُمَرُ (رَضيَ اللهُ عَنْهُمَا): وَافَقْتُ رَبِّي فِي ثَلاَثٍ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوِ اتَّخَذْنَا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى فَنَزَلَتْ (وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى) وَآيَةُ الْحِجَابِ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَوْ أَمَرْتَ نِسَاءَكَ أَنْ يَحْتَجِبْنَ، فَإِنَّهُنَّ يُكَلِّمُهُنَّ الْبَرُّ وَالْفَاجِرُ. فَنَزَلَتْ آيَةُ الْحِجَابِ، وَاجْتَمَعَ نِسَاءُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) فِي الْغَيْرَةِ عَلَيْهِ فَقُلْتُ لَهُنَّ: عَسَى رَبُّهُ إِنْ طَلَّقَكُنَّ أَنْ يُبَدِّلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِنْكُنَّ. فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ. رَوَاهُ البخاري(٥).

عومەر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لەم سێ شەتەدا رای من لەگەڵ فەرمانی پەروەردگاری گەورە مایەكی گرت.

---

(٤) بخاري: ٣٩٩.

(٥) بخاري. تفسير: ٤٤٨٣ ، ٤٠٢ ، ٢٥٥ ، ٤٧٩٠ ، ٤٩١٦.

یەكەم: وتم: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆزگە مەقامی ئیبراهیممان دەكرد بە نوێژگا واتە: ئەو شوێنەی كە لەكاتی دروستكردنی كەعبەدا ئیبراهیم تیا دەوەستا دەمان كرد بە جێگە نوێژ جا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: {وَاتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى – ٢/١٢٥}.

واتە: لە مەقامی ئیبراهیم جیگە نوێژ وەربگرن و نوێژی سوننەتی تیابكەن بۆ خۆتان.

دووەم: گوتم: پێغەمبەری خودا! خۆزگە فەرمانت دەكرد بە ژنەكانت كە خۆیان دابپۆشن و پەردەبگرنەوە واتە: لە پیاوی بێگانە پەچەبگرنەوە، یا لەپشتی پەردەوە قسەو گوفتو گۆیان لەگەڵدا بكەن، چونكە چاك و خراپ قسەیان لەگەڵ دەكەن، جا بەم بۆنەیەشەوە ئایەتی حیجاب هاتە خوارەوە كە دەفەرموێ: {وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاء حِجَابٍ – ٣٣/٥٣}.

واتە: كاتێ داوای شتێكتان لە ژنەكانی حەزرەت كرد بەرەو روویان مەوەستن و لەپشتی پەردەیەكەوە (وەك دیوار یادەرگا یا پەردەی ناو بارەگاوە) داوایان لێ بكەن.

سێیەم: كاتێ كە ژنەكانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەبەرهەوێ باری یەكتری كۆبوونەوەیان كرد لە حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) منیش پێم گوتن: {عَسَى رَبُّهُ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ}.

جا لەم هۆیەشەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارێ: {عَسَى رَبُّهُ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبْدِلَهُ أَزْوَاجًا خَيْرًا مِّنكُنَّ – ٦٦/٥}.

هیوا وایە ئەگەر تەڵاقتان بدا خوا لەباتی ئێوە چەن ژنێكی باشتری پێبدا(ب).

٣٩١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ قِبْلَةٌ. رَوَاهُ ابن ماجه والحاكم والدار قطني والترمذي وصحَّحه[٦].

---

(٦) رواه الترمذي بسند صحيح. (منه)

**لە ئەبو هورەیرەوە (خوای لێ رازی بێ) حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ:** **نێـوانی خۆرهـەڵاتو خۆرئـاوا هـەمووی قیبلەیـە (ئیبنـو ماجـە:حـاكیم/ دارە قوطنی/ت:ص).**

٣٩٢- عَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي سَفَرٍ فِي لَيْلَةٍ مُظْلِمَةٍ فَلَمْ نَدْرِ أَيْنَ الْقِبْلَةُ فَصَلَّى كُلُّ رَجُلٍ مِنَّا عَلَى حِيَالِهِ فَلَمَّا أَصْبَحْنَا ذَكَرْنَا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَنَزَلَ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ. رَوَاهُ الترمذي[٧].

**عامیری كوڕی رەبیعە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لەسـەرفەرێكا، شـەوبوو گـەلێ تاریك بوو، لە خزمەتی حەزرەتتدا بووین، نـەمان دەزانـی رووگـە لـە كوێوەیـە، جا هـەر كەسـەی بـەڕای خۆی كوێی بەڕووگـەزانی لـە نیوژەكـەیا رووی كـردە ئەوێ جا بۆ بەیانی كە ئـەم باسـەمان عـەرزی حـەزرەت كـرد بـەم بۆنەیـەوە ئـەم ئایەتە هاتە خوارەوە:**

{فَأَيْنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجْهُ اللّهِ – ٢/١١٥}.

**واتە: لـە نوێـژا هـەرلایێ رووبكـەن ئـەوێ روو بەخوایە، یـاخود: لـە هـەر شوێنێكا رووبكەنە رووگە خودا لەوێدا هەیە (ت-سند ضعیف).**

## ٥٤) نوێژی سوننەت لەسەفەردا رووەو شوێنی سەفەرەكە دروستە
## تُصلّى النافلة في السفر الى جهته

٣٩٣- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَتِهِ حَيْثُ تَوَجَّهَتْ بِهِ، فَإِذَا أَرَادَ الْفَرِيضَةَ نَزَلَ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ. رَوَاهُ الخمسة. وفي رواية: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُسَبِّحُ عَلَى الرَّاحِلَةِ قِبَلَ أَيِّ وَجْهٍ تَوَجَّهَ، وَيُوتِرُ عَلَيْهَا، غَيْرَ أَنَّهُ لاَ يُصَلِّي عَلَيْهَا الْمَكْتُوبَةَ[١].

---

(٧) رواه الترمذي بسند ضعيف (شرحه).

(١) بخاري: ١٠٩٨ ، ١٠٩٩. مسلم: ١٦١٤ ، هەتا ١٦١٧. نسائي: ٤٩١ ، ٤٨٩ ، ٧٤٣. أبو داود. ١٢٢٤.

جابیر (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: جاران پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بەسواری ولاخ نوێژی سوننەتی دەكرد، بەمەرجێ ولاخەكە لەژێریا رووی لە شوێنی مەقصەد بوایە، بەلام كە دەیویست نوێژی فەرز بكا لە ولاخەكە دادەبەزیو رووی دەكردە رووگە (ش/د/ت/ن) لە گێڕانەوەیەكا: جاران پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نوێژی سوننەتو نوێژی وەتری بەسەر پشتی ولاخەوە دەكرد، بەرەو هەرلایێ بوایە بەمەرجێ رووی لە مەقصەد بوایە، بەلام نوێژی فەرزی بەسەر ولاخەوە نەدەكرد.

٣٩٤- وَلأَبِيَ دَاوُدَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا سَافَرَ فَأَرَادَ أَنْ يَتَطَوَّعَ إِسْتَقْبَلَ بِنَاقِتِهِ القِبْلَةَ فَكَبَّرَ ثُمَّ صَلَّى حَيْثُ تَوَجَّهَ رِكَابُهُ(٢).

گوتی: جاران پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەسەفەردا كە دەیویست نوێژی سوننەت بكا لە پێشان رووی وشترەكەی دەكردە قیبلە ئینجا بەرەو قیبلە بە ئەڵلاهو ئەكبەر نوێژی دادەبەست، ئیتر نوێژەكەی تەواو دەكردو وشترەكەی رووی لەهەرلا بكردایە مەبەستی نەبوو بە مەرجێ بەرەو مەقصەد بڕۆیشتایە (د-سند صالح).

٣٩٥- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي حَاجَةٍ فَجِئْتُ وَهُوَ يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَتِهِ نَحْوَ الْمَشْرِقِ وَالسُّجُودُ أَخْفَضُ مِنَ الرُّكُوعِ. رَوَاهُ أصحاب السنن(٣).

جابیر (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) منی نارد بۆ كارێ، كە هاتمەوە تەماشام كرد پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بەسەر ولاخەكەیەوە نوێژی سوننەت دەكا، رووی لە رۆژهەلاتە، سەجدەشی نەویتربوو لەروكوعی (د/ت/ن-س/ص).

(٢) رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

(٣) بسند صحيح (شرحه).

**٥٥) داپۆشینی شەرمگا (عەورەت) لە نوێژا مەرجە: (ستر العورة)**

قَالَ أللهُ تعالى: { يَا بَنِي آدَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ -٧/٣١}.

**واتــە: خـودای گـەورە دەفـەرموێ: ئـەی نەتـەوەی ئـادەم! بـەرگی باشـی پاكی جوان لەبەر بكەن بۆ داپۆشینی عەورەت، لەلای هەموو مزگەوتێكا، چ بۆ تەواف بڕۆن بۆ ئەوێ یا بۆ نوێژكردن.**

قَالَ أللهُ تعالى: {وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ – ٧٤/٤}.

**واتــە: وە بـەرگ‌و كـالآت بـە پـاك رابگـرەو پـاكی بكـەرەوە لـە هەرشـتێ لەگەڵ بەندەیی خودادا ناگونجێ.**

٣٩٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) قالَ: قَامَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَأَلَهُ عَنِ الصَّلاَةِ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ فَقالَ: أَوَكُلُّكُمْ يَجِدُ ثَوْبَيْنِ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ الترمذي. وزاد البخاريُّ: ثُمَّ سَأَلَ رَجُلٌ عُمَرَ فَقالَ: إِذَا وَسَّعَ اللَّهُ فَأَوْسِعُوا، جَمَعَ رَجُلٌ عَلَيْهِ ثِيَابَهُ، صَلَّى رَجُلٌ فِي إِزَارٍ وَرِدَاءٍ، فِي إِزَارٍ وَقَمِيصٍ، فِي إِزَارٍ وَقَبَاءٍ، فِي سَرَاوِيلَ وَرِدَاءٍ، فِي سَرَاوِيلَ وَقَمِيصٍ، فِي سَرَاوِيلَ وَقَبَاءٍ، فِي تُبَّانٍ وَقَبَاءٍ، فِي تُبَّانٍ وَقَمِيصٍ، وَما أَحْسِبُهُ قالَ: فِي تُبَّانٍ وَرِدَاءٍ[1].

**ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ هەڵسا لە پێغەمبەری پرسی: نوێـژ بەیـەك لۆجلـەوە دروسـتە؟ ئـەویش فـەرمووی: (دروودی خوای لەسەربێ) بۆچـی هەمووتان یەكی دوو پارچە جلتان هەیە؟ (ش/د/ت) بوخاری (پرگوزەكەی لە نووربێ) ئەمەشی لێ زیـاد كـردووە: لـەوە دوا پیـاوێ بـۆ ئـەم باسـە لـە عومـەری پرسـی: عومەریش گوتی: هەركاتێ خودا ماڵی داو خۆشی خستەوە قـەیناكا ئێـوەش خـۆش رابـوێرن، ئەوكاتـە پیـاو جلـی زۆریـش لەبـەر بكـا قـەیناكا، پیـاو بـە كراس‌و دەرپێوە نوێژ دەكا، بە پەشتـەماڵ‌و كراسـەوە، یـا بـەكراس‌و كـەواوە، یا بەدەرپێ‌و پشتەماڵەوە، یا بە شەرواڵ‌و كراسەوە، یـا بـەدەرپێ‌و كـەواوە یـا**

(١) بخاري: ٣٥٨ ، ٣٦٥. مسلم: ١١٤٨ ، ١١٤٩ ، ١١٥٠. أبو داود: ٦٢٥. نسائي: ٧٦٢.

بە دەرپێی كورتو كەواوە، یا بە دەرپێی كورتو كراسەوە، وا دەزانم گوتیشی: یا بە دەرپێی كورتو پەشتەماڵەوە.

٣٩٧- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يُصَلِّ أَحَدُكُمْ فِي الثَّوْبِ الْوَاحِدِ، لَيْسَ عَلَى عَاتِقَيْهِ شَيْءٌ. رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ الترمذيَّ(٢).

دیسان خۆی گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بەیەك پارچە جلی واوە نوێژمەكەن كە نەگاتەوە بەسەر هەردوو شانتانا (ش/د/ن).

٣٩٨- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ مُتَوَشِّحًا بِهِ. رَوَاهُ الشيخان(٣).

جابیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەرم دی بەیەك پارچە جلەوە نوێژی دەكردو راستو چەپ لەخۆی ئاڵاندبوو (ش).

٣٩٩- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أُهْدِيَ لِرَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَرُّوجُ حَرِيرٍ فَلَبِسَهُ فَصَلَّى فِيهِ ثُمَّ انْصَرَفَ فَنَزَعَهُ نَزْعًا شَدِيدًا كَالْكَارِهِ لَهُ وَقَالَ: لاَ يَنْبَغِي هَذَا لِلْمُتَّقِينَ. رَوَاهُ الشيخان والنسائي(٤).

عوقبەی كوڕی عامیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: كەوایەكی چاكداری ئاورێشمیان بە دیاری هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەبەری كردو نوێژی پێوەكرد، لەپاشا كە گەڕایەوە بە توندو نیژی دایكەند لە بەرخۆیو فڕێیدا وەك یەكێ پێی ناخۆش بێ، وە فەرمووی: ئەمە بۆ كەسێ لەخوا بترسێ دەست نادا (ش/ن).

٤٠٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْفَخِذَ عَوْرَةٌ. رَوَاهُ البخاري وأبو داود والترمذي(٥).

---

(٢) بخاري: ٣٥٩ ، ٣٦٠. مسلم: ١١٥١. أبو داود: ٦٢٦. نسائي: ٧٦٨.

(٣) بخاري: ٣٥٤ ، ٣٥٥ ، ٣٥٦. مسلم: ١١٥٢ ، ١١٥٣. ترمذي: ٣٣٢. نسائي: ٧٦٣.

(٤) بخاري: ٣٧٥ ، ٥٨٠١. مسلم: ٥٣٩٤. نسائي: ٧٦٩.

(٥) رواه البخاري تعليقاً، ورد في صحيح البخاري بعد رقم: ٣٧٠ مباشرة (المترجم).

**ئیبنو عەباس** (ڕەزای خودایان لێبێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: ڕانیش هەر عەورەتە (ب-تعليقا/د/ت).**

**٤٠١- عَنْ عَلِيّ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: لاَ تَكْشِفْ فَخِذَكَ وَلاَ تَنظُرْ إِلى فَخِذِ حَيّ وَلاَ مَيّتٍ. رَوَاهُ أبو داود والحاكم والبزّار**[٦].

**عەلی** (خوای لێ ڕازی بێ) **لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ:** (دروودی خوای لەسەربێ) **ڕانی خۆت ڕووت مەكەو سەیری ڕانی زیندوو و مردووش مەكە (د/حاكم/بزار).**

**٤٠٢- عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ عَنْ أبيهِ عَنْ جَدّهِ (رَضِيَ أللهُ عَنْهُم) عَنِ النَّبِيِّ قالَ: وَإِذَا زَوَّجَ أَحَدُكُمْ خَادِمَهُ عَبْدَهُ أَوْ أَجِيرَهُ فَلاَ يَنْظُرْ إِلَى مَا دُونَ السُّرَّةِ وَفَوْقَ الرُّكْبَةِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والدار قطني والبيهقي**[٧].

**لە عەمری كوڕی شوعەیبەوە لە باوكیەوە لە باپیریەوە** (ڕەزای خودایان لێبێ) **لە پێغەمبەرەوە** (دروودی خوای لەسەربێ) **دەفەرموێ: ئەگەر كەنیزەكی خۆتان مارەبڕی لە بەندەی خۆتان یا لە ڕەنجبەری خۆتان ئیتر تەماشای خوار ناوك و ژوور ئەژنۆی مەكەن چونكە ئەم شوێنە شەرمگای ئەو ئافرەتەیە كە ژنی مێرددارە، وە تەنیا بۆ مێردەكەی دروستە تەماشای ئەو جێگەیەی بكا (د/ داره قوطنی/بەیهەقی- سند صالح).**

**٤٠٣- عَنْ مَيْمُونَةَ (رَضِيَ أللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ أَلنَّبِيُّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **يَصَلّي عَلىَ أَلْخُمْرَةِ؟. رَوَاهُ الأربعة**[٨].

**مەیمونە** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: گەلێ جار وادەبوو حەزرەت** (دروودی خودای لەسەربێ) **لەسەر بەرماڵی پەلكە خورما نوێژی دەكرد (ش/د/ت).**

**٤٠٤- عَنْ أَنَسٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **أَنَّ النَّبِيَّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **كَانَ يَزُورُ أُمَّ سُلَيْمٍ فَتُدْرِكُهُ الصَّلاَةُ أَحْيَانًا فَيُصَلِّى عَلَى بِسَاطٍ لَنَا وَهُوَ حَصِيرٌ نَنْضَحُهُ بِالْمَاءِ. رَوَاهُ**

---

(٦) سكت عن بيان درجة ضعفه وقوته الشارح (مترجم).

(٧) بسند صالح (شرحه).

(٨) بخاري: ٣٣٣ ، ٣٨١ ، ٣٧٩ ، ٥١٧ ، ٥١٨. مسلم: ١٥٠٢. أبو داود: ٦٥٦.

الخمسة واللفظ لأبي داود. وفي رواية: كَانَ أَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي عَلَى أَلْحصِيرِ وَأَلْفَرْوَةِ أَلْمَدْبُوغَةِ[٩].

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دیدەنی ئوم سولمەیمی دەكرد، جاروبار لەوێ نوێژی لێ دەبوو، رایەخێكمان هەبوو حەسیربوو، كەمێ ئاومان لێ دەپرژاندو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نوێژی لەسەر دەكرد (د/ش/ت/ن) لە گێڕانەوەیەكا: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەسەر حەسیرو كەوڵپۆست نوێژی دەكرد.

## ٥٦) بەرگی ژنی ئازاد لە نوێژدا: (لباس الحرة في الصلاة)

٤٠٥- سَأَلَتْ أُمَّ سَلَمَةَ (رَضيَ أَللّٰهُ عَنْهَا): مَا تُصَلِّى فِيهِ الْمَرْأَةُ مِنَ الثِّيَابِ؟ فَقَالَتْ: تُصَلِّى فِي الْخِمَارِ وَالدِّرْعِ السَّابِغِ الَّذِى يُغَيِّبُ ظُهُورَ قَدَمَيْهَا[١].

پرسیاركرا لە ئوم سەلەمە (خوای لێ رازی بێ): ئافرەت بەچی جلێكەوە نوێژبكا؟ گوتی: بە لەچك و بەكراسی ئاودامانەوە كەپشتی هەردوو پێی داپۆشێ نوێژ بكا (د).

٤٠٦- وَقَالَتْ: سَأَلَتِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَتُصَلِّى الْمَرْأَةُ فِي دِرْعٍ وَخِمَارٍ لَيْسَ عَلَيْهَا إِزَارٌ؟ قالَ: إِذَا كَانَ الدِّرْعُ سَابِغًا يُغَطِّى ظُهُورَ قَدَمَيْهَا. رَوَاهُمَا أَبُو داود[٢].

ئوم سەلەمە (خوای لێ رازی بێ) گوتیشی: لە پێغەمبەرم پرسی (دروودی خوای لەسەربێ) ئایا ژن (ئەگەر ئاوەڵكراسی لەبەردانەبێ) دروستە بەكراس و لەچكەوە نوێژ بكا؟ فەرمووی: ئەگەر كراسەكەی ئاودامان بێ و پشتی هەردوو پێی داپۆشێ دروستە (د-موقوفا).

---

(٩) بخاري: ٣٨٠ ، ٧٢٧ ، ٨٦٠ ، ٨٧١ ، ٨٧٤ ، ١١٦٨. مسلم: ١٤٩٨ — ١٤٩٩. أبو داود: ٦١٢. ترمذي: ٢٣٤. نسائي: ٨٠٠.

(١) سكت عنه المصنف والشارح (مترجم).

(٢) وقال في الثاني: وروى موقوفاً، ولكن قال الحاكم: إن رفعه صحيح على شرط البخاري (شرحه).

٤٠٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قالَ: لاَ يَقْبَلُ اللّٰهُ صَلاَةَ حَائِضٍ إِلاَّ بِخِمَارٍ. رَوَاهُ أَبو دَاوُدَ والترمذي[٣].

عائیشه (خوای لێ رازی بێ) لـه پێغەمبـەرەوه دەفـەرموێ: (درودی خوای لەسەربێ) خـودا نوێژی ژنی رەسیده (بالْغ) بەبێ سەرپۆش و لەچكه گیرا ناكا (د/ت-س/ح).

**٥٧) به پێلاوی پاكەوه نوێژ دروسته: (تجوز الصلاة في النعل الطّاهر)**

٤٠٨- سُئِلَ أَنَسٌ (رَضيَ اللهُ عَنهُ): أَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي فِي نَعْلَيْهِ؟ قالَ: نَعَمْ. رَوَاهُ الخَمْسَة إلاَّ أبا داود[١].

له ئەنەسیان پرسی (خوای لێ رازی بێ): ئایا پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێ) بـه پێلاوەكانیەوه نوێژی دەكرد؟ گوتی: بەڵێ (ش/ت/ن).

**٥٨) لەناو نوێژدا قسەی زۆرو كاری زۆر دروست نیه**
**ترك الكلام والفعل الكثيرين**

٤٠٩- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) قالَ: كُنَّا نَتَكَلَّمُ فِي الصَّلاَةِ يُكَلِّمُ الرَّجُلُ صَاحِبَهُ وَهُوَ إِلى جَنْبِهِ فِي ألصَّلاَةِ حَتّى نَزَلَتْ وَقُومُوا لِلّٰهِ قَانِتِينَ، فَأُمِرْنَا بِالسُّكُوتِ وَنُهِينَا عَنِ الْكَلاَمِ. رَوَاهُ ألْخَمْسَةُ[١].

زەیدی كوڕی ئەرقەم (خوای لێ رازی بێ) گوتی: ئێمـه لـه پێشدا لـەناو نوێـژدا قسەمان لەگـەڵ یـەكتردا دەكـرد، تـا ئـەم ئایـەتـه هاتـه خـوارەوه كـه دەفـەرموێ: {وَقُومُواْ لِلّهِ قَانِتِينَ - ٢/٢٣٨}.

واتـه: لـه نوێـژدا بـه سـەركزیو بـەمل كەچـی راوەسـتن و دەم بـەیادو ذیكری خودابن و قسەی دنیایی مەكەن ئیتر فەرمانمان پێ كرا بـه خامۆشـیو قسەكردنمان لێ قەدەغەكرا (ش/د/ت/ن).

---

(٣) بسند حسن (شرحه).

(١) بخاري: ٣٨٦ ، ٥٨٥٠. مسلم: ١٢٣٦ ، ١٢٣٧. ترمذي: ٤٠٠. نسائي: ٧٧٤.

(١) بخاري: ١٢٠٠ ، ٤٥٣٤. مسلم: ١٢٠٣. أبو داود: ٩٤٩. ترمذي: ٤٠٥ ، ٢٩٨٦. نسائي: ١٢١٨.

٤١٠- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) قالَ: كُنَّا نُسَلِّمُ عَلَى النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ فِي الصَّلاَةِ فَيَرُدُّ عَلَيْنَا، فَلَمَّا رَجَعْنَا مِنْ عِنْدِ النَّجَاشِيِّ سَلَّمْنَا عَلَيْهِ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْنَا فَقُلْنَا يَا رَسُولَ اللهِ كُنَّا نُسَلِّمُ عَلَيْكَ فَتَرُدُّ عَلَيْنَا فَقالَ: إنَّ فِي الصَّلاَةِ شُغْلاً. رَوَاهُ الشيخان[٢].

عەبدوڵلا (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لەپێشدا لەناو نوێژدا سڵاومان لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەکرد، ئەویش سڵاوەکەی دەسەندینەوە تا ئەوکاتەی کە لەلای نەجاشی گەڕاینەوە، ئیتر کە سڵاومان لێ دەکرد سڵاوەکەی نەدەسەندینەوە، جا عەرزمانکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! جاران کە لەناو نوێژدا سڵاومان لێ دەکردیت وەڕامی سڵاوەکەت دەداینەوە کەچی ئێستە وەڵامی نادەیتەوە هۆی ئەمەچییە؟ فەرمووی: بەڕاستی نوێژ خەریکبوونی گەرەکەو لە نوێژدا دەبێ هەر خەریکی نوێژەکە بی و بەس (ش).

٤١١- وَلِمُسْلِمٍ وَأبي دَاوُدَ وَأحمد: إنَّ هَذِهِ الصَّلاَةَ لاَ يَصْلُحُ فِيهَا شَيْءٌ مِنْ كَلاَمِ النَّاسِ هَذَا إِنَّمَا هُوَ التَّسْبِيحُ وَالتَّكْبِيرُ وَقِرَاءَةُ الْقُرْآنِ أَوْ كَمَا قالَ: (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)[٣].

گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بەڕاستی ئەم نوێژە بەکەڵکی قسەی دنیایی نایێ، چونکە نوێژ دەبێ هەر بریتیی بێ لە تەسبیحات و ئەڵلاهو ئەکبەر کردن و باسی ستایش و گەورەیی خودا کردن و قورئان خوێندن گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) یا ئاوای فەرموو، یا فەرمایشتێکی لەم بابەتەی فەرموو (م/د/ئەحمەد).

٤١٢- عَنْ مُعَيْقِبٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: ذَكَرَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَسْحَ فِي الْمَسْجِدِ يَعْنِي الْحصَى قَالَ: إِنْ كُنْتَ لاَ بُدَّ فَاعِلاً فَمَرَّةً وَاحِدَةً. رَوَاهُ الخمسة[٤].

---

(٢) بخاري: ١١٩٩ ، ١٢١٦ ، ٣٨٧٥. مسلم: ١٢٠١. ١٢٠٢. أبو داود: ٩٢٣.

(٣) مسلم: ١١٩٩ ، ٥٧٧٤. أبو داود : ٩٣٠ ، ٣٢٨٢ ، ٣٩٠٩. نسائي: ١٢١٧.

(٤) بخاري: ١٢٠٧. مسلم: ١٢١٩ ، ١٢٢٠. أبو داود: ٩٤٦. ترمذي: ٣٧٩. نسائي: ١١٩١.

موعـەيقيب (خـوای لێ رازی بـێ) گـوتـی: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) باسـی تـەختكرنی قۆقزايی و رێكخستنی زيخ و چەوو گڵمتكی شوێن سوژدەی بۆ كـردين فـەرمووی: ئەگـەر هـەر ناچار بـوون شـتی وابكـەن بـە يـەكجار تـەواوی بكەن! (ش/د/ت/ن).

٤١٣- وَلأَسحاب السنن: إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ إِلَى الصَّلاَةِ فَإِنَّ الرَّحْمَةَ تُوَاجِهُـهُ فَلاَ يَمْسَحِ الْحَصى[٥].

گوتی پێغەمبەر: دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەربێ): كاتێ ئێوە هەڵدەستن بۆ نوێژ ئيتر دەرگای رەحمەتی خۆداتان لێ دەكرێتـەوەو خـودا رووی رەحمـەتتان تێ دەكاو ئەو زاتە مەزنە گوفتوگۆتان لەگەڵ دەكا كەوابوو ئيتر ئێوەش بەپێی ئەومەقامە رەفتار بكـەن و زۆر سـەلارو بـە نەزاكـەت بن و خۆتـان بەرێكخستنی زيخ و چەوەوە خەريك مەكەن (د/ت/ن-س/ح).

## ٥٩) باسی چوارەم: باسی ئەو شتانەی كە لەپێش نوێژدا كردنيان سوننەتە. (ئەم باسە سێ بەشە):

### بەشی يەكەم: باسی بانگ و قامەت

### الباب الرابع: في سنن الصلاة المتقدمة، (وفيه فصول ثلاثة):

### الفصل الأول: في الاذان والاقامة

قَالَ اللهُ تَعالى: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِي لِلصَّلَاةِ مِن يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ – ٦٢/٩}.

واتە: ئەی كەسانێ باوەڕتان بەخوداو پێغەمبەری خودا كردووە! كاتێ بانگ درا بۆ نوێـژی جومعـە لـە رۆژی هەينيـدا بـەرزوويی بڕۆن بـەلای نوێـژو ذيكری خوداوەو واز لە كڕين و فرۆشتن و سەوداو مامەڵـە بێنن، ئەگـەر بزانن ئەمە بۆ ئێوە گەلێ باشترە لەوشتانە.

وَقَالَ تَعالى: {وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى الصَّلاَةِ اتَّخَذُوهَا هُزُوًا وَلَعِبًا – ٥/٥٨}.

---

(٥) رواه أصحاب السنن بسند حسن (شرحه).

واتــە: ئێـوە كاتــێ بـانگ دەدەن و موسـوڵمانان بـانگ دەكـەن بـێن بـۆ نوێژكردن، ناحەزان ئەو نوێژە یا ئەو بانگدانی ئێوەیە دەكەن بە گاڵتەو كەپ.

٤١٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا نُودِيَ لِلصَّلاَةِ أَدْبَرَ الشَّيْطَانُ وَلَهُ ضُرَاطٌ حَتَّى لاَ يَسْمَعَ التَّأْذِينَ، فَإِذَا قَضَى والنِّدَاءَ أَقْبَلَ، حَتَّى إِذَا ثُوِّبَ بِالصَّلاَةِ أَدْبَرَ، حَتَّى إِذَا قَضَى التَّثْوِيبَ أَقْبَلَ حَتَّى يَخْطُرَ بَيْنَ الْمَرْءِ وَنَفْسِهِ، يَقُولُ لَهُ اذْكُرْ كَذَا، وَاذْكُرْ كَذَا. مِمَّا لَمْ يَكُنْ يَذْكُرُ، حَتَّى يَظَلَّ الرَّجُلُ مَا يَدْرِي كَمْ صَلَّى. رَوَاهُ الْخَمْسَةَ إِلاَّ الترمذي[1].

ئـەبو هـورەیرە (خـوای لێ رازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) دەفەرموێ: كاتێ بانگ دەدرێ بۆ نوێژ شەیتان هەڵدەتۆرێنێ و جرت لێ دەدا، تا گوێی لەبانگەكە نەبێ، جا كاتێ بانگەكە تەواو دەبێ دیسان دێتەوە تا قامەت دەكرێ بۆ نوێژ، ئەوجا دووبارە هەڵ دەتۆرێنێتەوە، كە قامەت تەواو دەبێ، دیسان دێتەوە دەچێتە بنكلێشەی پیاوەوەو پێی دەڵێ: بیر لەمە بكەرەوەو بیر لەوە بكەرەوە، وە ئەوشتانەی وەبیر دێنێتەوە كە لەوەپێش لەبیری نەبوون، هەتا بەڕادەیەكی وا دڵی بێ ئاگا دەكا كە نازانێ چەن ركات نوێژ دەكا (ش/د/ن).

٤١٥- وَلِمُسْلِمٍ: (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): إِنَّ الشَّيْطَانَ إِذَا سَمِعَ النِّدَاءَ بِالصَّلاَةِ ذَهَبَ حَتَّى يَكُونَ مَكَانَ الرَّوْحَاءِ[2].

گـوتی: دەفـەرموێ (دروودی خوای لەسەربێ): كاتـێ شـەیتان كـە دەبیستێ وا بانگ دەدرێ بۆ نوێژ لەو ناوە هەڵدێ و لێرەوە تا رەوحا دوور دەكەوێتەوە (م).

٤١٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي صَعْصَعَةَ أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: لَهُ: إِنِّي أَرَاكَ تُحِبُّ الْغَنَمَ وَالْبَادِيَةَ، فَإِذَا كُنْتَ فِي غَنَمِكَ أَوْ بَادِيَتِكَ فَأَذَّنْتَ بِالصَّلاَةِ فَارْفَعْ صَوْتَكَ بِالنِّدَاءِ، فَإِنَّهُ لاَ يَسْمَعُ مَدَى صَوْتِ الْمُؤَذِّنِ

---

(١) بخاري: ١٢٣١ ، مسلم: ١٣٦٧. نسائي: ١٢٥٢.

(٢) مسلم: ٨٥٢.

جِنٌّ وَلاَ إِنْسٌ وَلاَ شَيْءٌ إِلاَّ شَهِدَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. قَالَ: أَبُو سَعِيدٍ سَمِعْتُهُ مِنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رَوَاهُ البخاري والنسائي[٣].

عەبدوڵڵای كوڕی عبدالرحمن كوڕی صەعصەعە گوتی: ئەبو سەعیدی خودی (خوای لێ رازی بێ) پێی گوتم: دەتبینم تۆ حەزت لە ماڵاتو مەڕداریو دەشتە، جا هەر كاتێ لەناو مەڕو ماڵاتەكەتا بوویتو بانگتدا، یا لەو دەشتە بوویتو بانگتدا، تەواو دەنگ لە بانگەكە هەڵبڕە، چونكە هەرچی لە قەرەی دەنگی بانگدەر دەیبیێو گوێی لێبێ، خوا جنۆكە بێ، خوا مرۆڤ بێ، خوا شتی تر بێ، لە رۆژی قیامەتدا ئەو شایەتییەی بۆ دەدا. ئەبو سەعید (خوای لێ رازی بێ) گوتی: ئەم فەرمایشتەم لە پێغەمبەر بۆ خۆی (درودی خوای لەسەربێ) بیستووە وە ئەمە فەرموودەی ئەوەو قسەی من نیە (ب/ن).

٤١٧- عِنْ مُعَاوِيَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْمُؤَذِّنُونَ أَطْوَلُ النَّاسِ أَعْنَاقًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ. رَوَاهُ مسلم وأحمد[٤].

موعاوییە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: لە رۆژی قیامەتدا بانگدەران لە هەموو كەس گەردنیان بەرز ترە (م/ئەحمەد).

٤١٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَلإِمَامُ ضَامِنٌ وَالْمُؤَذِّنُ مُؤْتَمنٌ اللَّهُمَ أَرْشِدِ الْأَئِمةَ وَأغِفْر لِلْمُؤَذِّنِينَ. رَوَاهُ أبو داود والشافعي والترمذي[٥].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: پێشنوێژ دەستبەرە واتە: زامنی نوێژی پاشنوێژ (مەئموومەكانەو دەشێ لە مەرجو بەندی نوێژەكەدا درێغی نەكا، وە بانگدەریش ئەمیندارەو خەڵك باوەڕی پێ دەكەن بۆ نوێژو رۆژوویان كەوابوو دەبێ رێك لەكاتی خۆیا بانگبدا، ئەگینا

---

(٣) بخاري: ٦٠٩.

(٤) مسلم: ٨٥٠.

(٥) بسند صحيح (شرحه).

ئۆباڵی خەڵکەکەی بە ئەستۆیە. ئەی خودایە! فرسەتی پێشنوێژ خوێنەکان بدەو لە بانددەرەکانیش خۆشبە (د/شافیعی/ت–س/ص).

٤١٩– وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْمُؤَذِّنُ يُغْفَرُ لَهُ مَدَى صَوْتِهِ وَيَشْهَدُ لَهُ كُلُّ رَطْبٍ وَيَابِسٍ. رواه أبو داود والنسائي. وزاد في رواية: وَلَهُ مِثْلُ أَجْرِ مَنْ صَلَّى مَعَهُ[٦].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: بانگدەر چەنێ دەنگی بڕ بکا پڕئەوە خودا لە تاوانی خۆش دەبێ، وە ئەوەی لە قەرەی دەنگی ئەوابێ، چ تەڕ چ وشك لە قیامەتا شایەتی بۆ دەدا (د/سند صالح–ن) لە گێڕانەوەیێکا ئەمەشی لێ پتر کردووە: وە بەقەد خێری ئەو کەسانەیش کە بەبانگی ئەو نوێژ دەکەن خێری تری بۆ هەیە (چونکە خێرکەرو خێرنیشاندەر چون یەکەن)!.

### ٦٠) روونکردنەوەی بانگو قامەت: (بيان الآذان والإقامة)

٤٢٠– عَنْ أَبِي مَحْذُورَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَّمَهُ الأَذَانَ تِسْعَ عَشْرَةَ كَلِمَةً وَالإِقَامَةَ سَبْعَ عَشْرَةَ كَلِمَةً الأَذَانُ: اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ. زَادَ فِي رِوَايَةٍ: تَرْفَعُ بِهَا صَوْتَكَ ثُمَ تَقُولُ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ. زَادَ فِي رِوَايَة: تَخْفِضُ بَهَا صَوْتَكَ ثُمَّ تَرْفَعُ صَوْتَكَ بِالشَّهَادَةِ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ فَإِنْ كَانَ صَلاَةَ الصُّبْحِ قُلْتَ: الصَّلاَةُ خَيْرٌ مَنْ النُّوْمُ الصَّلاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. وَالإِقَامَةُ: اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ

---

(٦) رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

اللّٰهِ حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ اللّٰهُ أَكْبَرُ اللّٰهُ أَكْبَرُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ. رَوَاهُ الخمسة إلا البخاريَّ. وفي رواية في الإِقَامَةِ: اللّٰهُ أَكْبَرُ اللّٰهُ أَكْبَرُ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّٰهِ حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ اللّٰهُ أَكْبَرُ اللّٰهُ أَكْبَرُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ[1].

**لە ئەبو مەحزوورەوە** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **بانگی فێرکردم، نۆزدە وشەبوو، قامەتیشی فێرکردم حەڤدە وشەبوو، بانگ ئەمەیە:**

{اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرْ اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَر}.

**لە گێڕنەوەیەکا ئەمەی زیاترە: دەنگی خۆتیان لێ هەڵبڕە، ئینجا دەڵێیت:**

{أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ أَشْهدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسول الله}:

**لە گێڕانەوەیەکا ئەمەی زیاتر کردووە: لەژێر لێوەوە ئەم وشانە بڵێ، ئینجا بە دەنگی بەرز وشەکانی شایەتمان بڵێرەوەو بڵێ:**

{أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ أَشْهدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسول الله، حَيَّ عَلى الصَّلاةِحَيَّ عَلى الصلاةِ حَيَّ عَلى الفَّلاحِ حَي عَلى الْفَلاحِ}.

**ئەگەر بۆ نوێژی بەیانی بانگت دەدا بشڵێ:**

{الصَّلاَة خَيْرٌ مِنَ النَّوْم الصَّلاةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْم اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَر لا إِلهَ الاَّ اللهُ}.

**قامەتیش ئەمەیە:**

{اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ أَشْهدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسول الله حَيَّ عَلى الصَّلاةِحَيَّ

---

(١) مسلم: ٤٨٠. أبو داود: ٥٠٠ ، ٥٠١ ، ٥٠٣ ، ٥٠٥. ترمذي: ١٩١ ، ١٩٢. نسائي: ٦٢٨ ، ٦٢٩ ، ٦٣٠ ، ٦٣٣.

عَلى الصلاةِ حَيَّ عَلى ألفَّلاحِ حَي عَلى ألْفَلاحِ قَدْ قَامَتِ ألصَّلاةُ قَدْ قَامَتِ ألصَّلاةُ اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ لا إلهَ إلاَّ أَللَّهْ}.

(م/د/ت/ن) لە گێڕانەوەیەکدا: قامەت بەم جۆرەیە:

{اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إلاَّ اللهُ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ حَيَّ عَلى ألصَّلاةِ حَيَّ عَلى ألفَّلاحِ قَدْ قَامَتِ ألصَّلاةُ قَدْ قَامَتِ ألصَّلاةُ اللهُ أَكْبَرُ اللهُ أَكْبَرُ لا إلهَ إلاَّ اللهُ}.

٤٢١- عَنْ أَنَسٍ قَالَ: أُمِرَ بِلاَلٌ (رَضيَ اللهُ عَنْهُماَ) أَنْ يَشْفَعَ الأَذَانَ وَيُوتِرَ الإِقَامَةَ إِلاَّ الإِقَامَةَ. رَوَاهُ الخمسة[٢].

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمانی بە بیلال کرد (خوای لێ رازی بێ) کە وتەکانی بانگ جووتە بڵێ، وە وتەکانی قامەت بەتاک بڵێ، وتەی: {قَدْ قَامَتِ ألصَّلاةُ}

نەبێ بەڵام ئەم وتەیە لە قامەتدا جووتێ جار بڵێ: (ش/د/ت/ن).

## ٦١) ئەوەی لە بانگدا پەسەندە: (المستحب للآذان)

٤٢٢- عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: يَا رَسُولَ اللّهِ اجْعَلْنِي إِمَامَ قَوْمِي. قَالَ: أَنْتَ إِمَامُهُمْ وَاقْتَدِ بِأَضْعَفِهِمْ وَاتَّخِذْ مُؤَذِّنًا لاَ يَأْخُذُ عَلَى أَذَانِهِ أَجْرًا. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ البخاريَّ[١].

عوسمانی کوڕی ئەبو لعاص (خوای لێ رازی بێ) گوتی گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بمکە بە پێشنوێژی خزمەکانم؟ فەرمووی: تۆ پێشنوێژیانی وە لەکاتی نوێژکردندا چاوت لە هەرە زەبوونەکەیان بێ ئاگات لە حاڵی بێ و نەکەی بە بەرنوێژیی دوورو درێژ ئەوەندەی تر ماندوو بێ تاقەتی بکەی! وە

(٢) بخاري: ٦٠٣، ٦٠٥، ٦٠٦، ٦٠٧، ٣٤٥٧. مسلم: ٨٣٦، أبو داود: ٥٠٨، ٥٠٩. ترمذي: ١٩٣. نسائي: ٦٢٦.

(١) مسلم: ١٠٥٠.

بانگدەرەیێکیش دابنێ کە لەباتی بانگ دانەکەی مووچە وەرنەگرێ (ئیمامی موسلیم و ئەبو داوودو تیرمیذیو نەسائی ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە).

٤٢٣- عَنْ زِيَادِ بْنِ الْحَارِثِ الصُّدَائِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنْ أُؤَذِّنَ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ فَأَذَّنْتُ فَأَرَادَ بِلاَلٌ أَنْ يُقِيمَ فَقَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّ أَخَا صُدَاءٍ قَدْ أَذَّنَ وَمَنْ أَذَّنَ فَهُوَ يُقِيمُ. رَوَاهُ الترمذي وأبو داود[٢].

زیادی کوڕی حاریثی صودائی (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەمنی فەرموو کە بۆنوێژی بەیانی بانگ بدەم، جا کە بانگمدا بیلال ویستی قامەت بکا، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: کاکەی صودائی بانگیدا، کێش بانگ بدا هەر ئەو خۆشی قامەت دەکا! (ت/د-سند ضعیف)؟

٤٢٤- عَنِ امْرَأَةٍ مِنْ بَنِي النَّجَّارِ قَالَتْ: كَانَ بَيْتِي مِنْ أَطْوَلِ بَيْتٍ حَوْلَ الْمَسْجِدِ وَكَانَ بِلاَلٌ يُؤَذِّنُ عَلَيْهِ الْفَجْرَ. رَوَاهُ أبو داود[٣].

ئافرەتێکی بەنی نەجاری گوتی: خانووەکەی من لە هەموو خانووەکانی تری دەوری مزگەوتەکەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەربێ) بەرزتر بوو، لەبەر ئەوە جاران بیلال بانگی بەیانیی لەسەر دەدا (د-سند صالح).

٤٢٥- عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: رَأَيْتُ بِلاَلاً يُؤَذِّنُ وَيَدُورُ وَيُتْبِعُ فَاهُ هَا هُنَا وَهَا هُنَا وَإِصْبَعَاهُ فِي أُذُنَيْهِ وَرَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي قُبَّةٍ لَهُ حَمْرَاءَ، مِنْ أَدَمٍ فَخَرَجَ بِلاَلٌ بَيْنَ يَدَيْهِ بِالْعَنَزَةِ فَرَكَزَهَا بِالْبَطْحَاءِ فَصَلَّى إِلَيْهَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَمُرُّ بَيْنَ يَدَيْهِ الْكَلْبُ وَالْحِمَارُ وَعَلَيْهِ حُلَّةٌ حَمْرَاءُ كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى بَرِيقِ سَاقَيْهِ. وَفي رواية: فَلَمَّا بَلَغَ حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ حَيَّ عَلىَ الْفَلاحِ لَوَى عُنُقَهُ يَمِيناً وَشِمَالاً وَلَمْ يَسْتَدِر. رَوَاهُ الخمسة واللفظ للترمذي[٤].

---

(٢) بسند ضعيف (شرحه).

(٣) بسند صالح (شرحه).

(٤) بخاري: ٣٧٦ ، ٥٧٨٦ ، ٥٨٥٩. مسلم: ١١٢٠.

ئـەبو جوحەیفـە (خـوای لێ ڕازی بـێ) گـوتی: بـیلالم دی بـانگی دەدا، بـەدەم بانگدانەكەوە دەخولایەوەو ئەم لاولای دەكردو دەمی خۆی بە ڕاستو بە چەپا دەسووڕاند، وە دوو پەنجەی خۆشی نابوونە ناو هەردوو كونەگوێی خۆی تا دەنگی تەواو بە هێزبێ و بەهەر چوارلادا بگا لەو كاتەدا پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەربێ) لەناو چادرێكی سووری چەرمینا بوو كەهی خۆی بوو، ئینجا بیلال لەبەر دەمیەوە ڕۆیشت، نێزەیەكی پێ بوو لە زیخەڵانەكەی بەطحادا دای چەقاند كردی بە بەربەست (سوترە) بۆ نوێژەكە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەرەو ئەو نێزەیە نوێژی دابەست، ئیتر لەو دیو نێزەكەوە، سەگو كەرو ئاژەڵو ماڵاتو خەڵك بە بەرنوێژەكەیدا ئامووشۆیان دەكردو قەدەغە نەدەكران، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لەوكاتەدا دەستێ جلی سووری لەبەردابوو زۆر باش لەیادمە، دەڵێی ئیستایە، بریقەی لاقەكانیم هەر لەبەر چاوە!! لە گێڕانەوەیەكا: كە بیلال لە بانگەكەدا كاتێ گەیشتە سەر {حَيَّ عَلَى الصَّلاةِ} ئەستۆی خۆی بەلای ڕاستا بادا، وە كاتێ گەیشتە سەر {حَيَّ عَلَى الفَلاحْ} ئەستۆی خۆی بەلای چەپا بادا، بەڵام سینگی نەدەسووڕانەوە لەگەڵیا (ت/ش/د/ن).

٤٢٦- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لِبِلاَلٍ: يَا بِلاَلُ إِذَا أَذَّنْتَ فَتَرَسَّلْ فِي أَذَانِكَ وَإِذَا أَقَمْتَ فَاحْدُرْ وَاجْعَلْ بَيْنَ أَذَانِكَ وَإِقَامَتِكَ قَدْرَ مَا يَفْرُغُ الآكِلُ مِنْ أَكْلِهِ وَالشَّارِبُ مِنْ شُرْبِهِ وَالْمُعْتَصِرُ إِذَا دَخَلَ لِقَضَاءِ حَاجَتِهِ. رَوَاهُ الترمذي(٥).

جابیر (خـوای لێ ڕازی بـێ) گـوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بـە بـیلالی فەرموو: ئەی بیلال! كە بانگ دەدەیت لە سەرخۆ بە شێنەیی بانگ بدەو پەلەی لێ مەكە، بەڵام قامەت بە گورجی تێپەڕێنە، وە ئەوەندەیش بەینی بانگو قامەت بخە كە نانخۆر لە خواردنەكەی ببێتەوەو ئاو خۆر لە خواردنەوەكەی ببێتەوەو تەنگاو كە بچێ بۆ سەراو لە سەراوەكەی ببێتەوە (تەرمەزی-سند ضعيف).

---

(٥) بسند ضعيف (شرحه).

**٦٢) دەشێ مزگەوت دوو بانگدەری هەبێ: (ينبغي مؤذنان للمسجد)**

٤٢٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُؤَذِّنَانِ بِلاَلٌ وَابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ الأَعْمَى. رَوَاهُ مُسْلِمٌ(١).

**ئیبنو عومەر** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: جاران پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دوو بانگدەری هەبوو: یەکێکیان بیلال بوو وە ئەوی تریان ئیبنو ئومی مەکتووم بوو کە پیاوێکی کوێربوو (م).**

٤٢٨- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ بِلاَلاً يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُنَادِيَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ. رَوَاهُ الخمسة. وَزَادَ الْبُخَارِي قَالَ: وَكَانَ رَجُلاً أَعْمَى لاَ يُنَادِي حَتَّى يُقَالَ: لَهُ أَصْبَحْتَ أَصْبَحْتَ(٢).

**دیسان گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **فەرمووی: بیلال شەوی دەمێنێ کە بانگی بەیانی دەدا هەتا ئاگادارتان بکاتەوە تا خۆتان ئامادە بکەن، کەوابوو بخۆن و بخۆنەوە هەتا ئیبنو ئومی مەکتووم بانگ دەدا (ش/د/ت/ن) بوخاری** (پڕ گۆڕەکەی لە نووربێ) **ئەمەشی لێ زیاکردووە: گوتی: ئیبنو ئومی مەکتوومیش پیاوێکی کوێربوو، بانگی نەدەدا تا لەگشت لایەکەوە پێیان دەگوت: ڕۆژی ڕووناکە بانگدە - ڕۆژی ڕووناکە بانگدە!**

**٦٣) کەسێ گوێی لە بانگ بێ چی باشە کە بیکا: (ما يستحب لسامع الآذان)**

٤٢٩- عَنْ أَبِي سَعِيد (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا سَمِعْتُمُ النِّدَاءَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ الْمُؤَذِّنُ. رَوَاهُ الخمسة. وَزَادَ غَيْرَ البخاريُّ: ثُمَّ صَلُّوا عَلَيَّ فَإِنَّهُ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاَةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ بِهَا عَشْرًا ثُمَّ سَلُوا اللهَ لِيَ الْوَسِيلَةَ فَإِنَّهَا مَنْزِلَةٌ فِي الْجَنَّةِ لاَ تَنْبَغِي إِلاَّ لِعَبْدٍ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ وَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَنَا هُوَ فَمَنْ سَأَلَ اللهَ لِيَ الْوَسِيلَةَ حَلَّتْ لَهُ الشَّفَاعَةُ(١).

---

(١) مسلم: ٨٤١.

(٢) بخاري: ٦١٧ ، ٦٢٠ ، ٦٢٣ ، ١٩١٨ ، ٢٦٥٦ ، ٧٢٤٨. مسلم: ٢٥٣١ – ٢٥٣٥. ترمذي: ٢٠٣. نسائي: ٦٣٧.

(١) بخاري: ٦١١. مسلم: ٨٤٧. أبو داود: ٥٢٣. ترمذي. ٣٦١٤. نسائي: ٦٧٧.

ئەبو سەعیدی خودری (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: كاتێ گوێتان لە بانگ دەبێ بانگدەر چ دەڵێ ئێوەش ئەوە بڵێنەوە (ش/د/ت/ن) بوخاری لێ دەرچێ ئەو چوار پێشەواكانی تر ئەمەشیان لێ زیاد كردووە: لەپاشا صەلاوات لە دیاری من بدەن، چونكە ئەوەی یەك صەلاوات لەسەر من بدا خودای گەورە لە باتی ئەوە دە ڕەحمەت دەڕێژێ بەسەریدا، لەپاش ئەوەیش داوای پایەی (الوسیلە)م لە خودا بۆ بكەن، كە یەكێكە لە پایە هەرە بەرزەكانی بەهەشت، دانراوە بۆ بەندەیەكی باش لە بەندە هەرە باشەكانی خودا وە بۆ ئەو نەبێ بۆ كەسی تر دەست نادا، وە من ئومێد دەكەمو هیوام هەیە كە خۆم ئەو بەندەیەبم، جا ئەوەیش بزانن ئەو كەسەی كە داوای ئەم پایەی ئەلوەسیلەیە لە خودا بكا بۆ من ئیتر تكاو شەفاعەتی منیش بۆ ئەو سەر دەگرێو مسۆگەر دەبێ.

٤٣٠- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ قَالَ: حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ اللّٰهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ إِلاَّ حَلَّتْ لَهُ الشَّفَاعَةُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. رَوَاهُ الخمسة إلاّ مسلماً[٢].

جابیر (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەر كەسێ لەكاتی بیستنی بانگدا بڵێ:

اللّٰهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ.

ئەی خودایە! ئەی خاوەندی ئەم بانگەوازی تەواوە! ئەی پەروەردگاری ئەم نوێژە دابەستراوە! ببەخشە بە موحەممەد پایەی هەرە بەرزی ئەلوەسیلەو پلەی هەرە گەورەی ئەلفەضیلە، وە بی بەرە ئەوبارەگا پەسەندەی كە خۆت بەڵێنت پێی داوەو ڕەوانەی ئەوێی بكە كە مەقامی

---

(٢) بخاري: ٦١٤ ، ٤٧١٩.

شەفاعەتی گەورەیە هەر کەسێ لەو کاتەدا ئەمە بڵێ، لە ڕۆژی قیامەتا تکای من بۆ ئەو قەبووڵ دەبێ (ب/د/ت/ن).

٤٣١- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ قَالَ: حِينَ يَسْمَعُ الْمُؤَذِّنَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ رَضِيتُ بِاللّٰهِ رَبًّا وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا. غُفِرَ لَهُ ذَنْبُهُ. رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ البخاريَّ[٣].

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەرکەسێ لەوکاتەدا کە بانگ دەبیستێ بڵێ:

{أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ رَضِيتُ بِاللّٰهِ رَبًّا وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا}.

شایەتی دەدەم کە هەر خودا خودایەو تاكو تەنیایەو هیچ هاوەڵو هاوبەشی نیە، وە هەروەها شایەتی دەدەم کە موحەممەد بەندەو پێغەمبەری ئەوە، یەزدانی پاکم بەخودا قوبووڵەو موحەممەدم بە پێغەمبەر قوبووڵەو ئیسلامم بەدینو ئایین قوبووڵە، هەر کەسێ لەوکاتەدا ئەمە بڵێ، خودا لە گوناهی خۆش دەبێ (م/د/ت/ن).

٤٣٢- وَلِمُسْلِمٍ وَأَبِي دَاوُدَ: مَنْ قَالَ: مِثْلَ مَا يَقُولُ الْمُؤَذِّنُ إِلاَّ فِي الْحَيْعَلَتَيْنِ فَقَالَ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ مِنْ قَلْبِهِ دَخَلَ الْجَنَّةَ[٤].

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ کە بانگدەر بانگ دەدا چی دەڵێ: ئەویش وشە بەوشە لە شوێن ئەوەوە گوتەکەی ئەو بەزمان بڵێتەوەو بە دڵیش باوەڕی پێی هەبێ دەچێتە بەهەشت! بەڵام لە وشەی (حَيَّ عَلَى الصَّلاة)ی و (حَيَّ عَلَى الفَلاحْ)یدا وەك بانگدەر نەڵێ، بەڵکوو لەکاتی ژنەوتنی ئەم دوو وشەیەدا بڵێ: (لا حَوْلَ وَلاَ قُوَّةُ) هێزو تەوانایێ هەر بەدەستی خودا خۆیەتیو بەس. (م/د) (بەر ڕەحمەتی خودای گەورە کەون).

---

(٣) مسلم: ٨٤٩. أبو داود: ٥٢٥. ترمذي: ٢١٠. نسائي: ٦٧٨.

(٤) مسلم: ٨٤٨. أب٢٧و داود: ٥٢٧.

٤٣٣- وَشَرَعَ بِلاَلٌ فِي الإِقَامَةِ فَلَمَّا أَنْ قَالَ: قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ قَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَقَامَهَا وَأَدَامَهَا وَقَالَ: فِي سَائِرِ الإِقَامَةِ كَالأَذَانِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[٥].

بیلال (خوای لێ رازی بێ) دەستی کرد بەقامەتکردن کە گەیشتەسەر وشەی: (قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ) پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: (أَقَامَهَا اللهُ وَأَدَامَهَا) خودا ئەم نوێژەیە پایەدار بکاو تاسەر رایبگرێ بەڵام لە وشەکانی تری قامەتدا هەمان وشەی دووبارە دەکردەوە کە بیلال دەیگوتن، دەق وەك وەڵام سەندنەوەی بانگ (د- سند صالح).

## ٦٤) دووعاو نزای نێوان بانگو قامەت گیرایە: (الدعاء بين الأذانين مقبول)

٤٣٤- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: لاَ يُرَدُّ الدُّعَاءُ بَيْنَ الأَذَانِ وَالإِقَامَةِ. رَوَاهُ أصحاب السنن[١].

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (درودی خوای لەسەربێ): نزاو دووعا (لە ناوەندی بانگو قامەتدا) رەت نابێتەوە! (د/ت/ن-س/ح).

٤٣٥- وَقَالَ: رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الْمُؤَذِّنِينَ يَفْضُلُونَنَا. فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قُلْ كَمَا يَقُولُونَ فَإِذَا انْتَهَيْتَ فَسَلْ تُعْطَهْ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[٢].

پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بانگدەرەکان پێشمان کەوتوون چی بکەین دەیانگرینەوە؟ پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بانگدەرەکان کاتێ بانگ دەدەن هەرچی دەڵێن تۆیش لە دوا ئەوانەوە لەبەر خۆتەوە ئەوە بڵێرەوە جا کاتێ لە وەڵام سەندنەوەی بانگەکە بوویتەوە لەخودا داوا بکە داواکەت دێتە جێ (د- سند صالح).

---

(٥) بسند صالح (شرحه).

(١) بسند حسن (شرحه).

(٢) بسند صالح (شرحه).

٤٣٦- عَنْ أَبِي الشَّعْثَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): قَالَ: كُنَّا مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ فِي الْمَسْجِدِ فَخَرَجَ رَجُلٌ حِيْنَ أَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ لِلْعَصْرِ، فَقَالَ: أَبُو هُرَيْرَةَ: أَمَّا هَذَا فَقَدْ عَصى أَبا الْقاسِمِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رَوَاهُ الخمسة إلاّ البخاري[٣].

ئەبو شەعثاء (خوای لێ رازی بێ) گوتی: رۆژێ (لەمزگەوت) لەلای ئەبو هورەیرە بووین، لەوكاتەدا كە بانگدەر بانگی دەدا بۆ نوێژی عەصر پیاوێ لە مزگەوتەكە دەرچووە دەرەوە، ئەبو هورەیرەش گوتی: بەڵێ ئەم پیاوە بەم دەرچوونی ناوەختە، بەم كردەوە ناشرینە لە فەرمانی پێغەمبەری خۆشەویست دەرچوو! (م/د/ت/ن).

## ٦٥) بەشی دووەم: باسی سیواك

## الفصل الثاني: في السواك

٤٣٧- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا قَامَ لِيَتَهَجَّدَ يَشُوصُ فَاهُ بِالسِّوَاكِ[١].

خوذەیفە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) كە شەو هەڵدەسا لەخەو بۆ شەونوێژكردن سیواكی لەدەمی رادەدا (ش/د/ن).

٤٣٨- عَنْ أَبِي مُوسى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَوَجَدْتُهُ يَسْتَنُّ بِسِوَاكٍ بِيَدِهِ يَقُولُ أُعْ أُعْ ، وَالسِّوَاكُ فِي فِيهِ، كَأَنَّهُ يَتَهَوَّعُ. رَوَاهُمَا الخمسة إلاّ الترمذي[٢].

ئەبو موسا (خوای لێ رازی بێ) گوتی: چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) سەیرم كرد سیواكێكی لە دەستایە سیواكی پێ دەكا، لەكاتی گێرانی سیواكەكە بەناو دەمیا ئەوەندە موبالەغەی تێدا دەكرد دەتگوت هێڵنج دەدا: دەیفەرموو: (ئوع — ئوع!) (ش/د/ن).

---

(٣) مسلم: ١٤٨٧ ، ١٤٨٨. أبو داود: ٥٣٦. ترمذي: ٢٠٤. نسائي: ٦٨٢ ، ٦٨٣٠.

(١) بخاري: ٢٤٥ ، ٨٨٩ ، ١١٣٦. مسلم: ٥٩٢. أبو داود: ٥٥. نسائي. طهارة: ٢ ، ١٦٢٠ ، ١٦٢١ ، ١٦٢٢ ، ١٦٢٣.

(٢) بخاري: ٢٤٤. مسلم: ٥٩١.

٤٣٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ): أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ مَعَ كُلِّ صَلاَةٍ. رَوَاهُ الخمسة[٣].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: نەبادا ئازارو زەحمەتی ئۆمەتم بدەم ئەگینا فەرمانم پێدەکردن کە بۆ هەموو نوێژێ سیواك بکەن (ش/د/ت/ن).

٤٤٠- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ وَلأَخَّرْتُ صَلاَةَ الْعِشَاءِ إِلَى ثُلُثِ اللَّيْلِ فَكَانَ زَيْدُ بْنُ خَالِدٍ يَشْهَدُ الصَّلَوَاتِ فِي الْمَسْجِدِ وَسِوَاكُهُ عَلَى أُذُنِهِ مَوْضِعَ الْقَلَمِ مِنْ أُذُنِ الْكَاتِبِ لاَ يَقُومُ إِلَى الصَّلاَةِ إِلاَّ اسْتَنَّ ثُمَّ رَدَّهُ إِلَى مَوْضِعِهِ. رَوَاهُ الترمذي وصاحباه[٤].

زەیدی کوڕی خالید (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: مەبادا ئازارو زەحمەتی ئۆمەتم بدەم ئەگینا فەرمانم پێ دەدان کە بۆ هەموو نوێژێ سیواك بکەن، وە نوێژی خەوتنانیش دوابخەن تا سێیەکی شەو دەڕوا، زەیدی کوڕی خالید خۆی دەستووری وابوو بۆ هەموو نوێژەکان دەهات بۆ مزگەوت، کە دەچوو بۆ مزگەوت سیواکەکەی لە پشت گوێچکەیەوە دادەنا: لەو شوێنەدا کە نووسەر لەپاڵ گوێچکەیدا قەڵەم دادەنێ، وە هەموو جارێ کە هەڵدەسایەوە بۆ نوێژ سیواکی پێ دەکردو دەینایەوە جێگەی خۆی (ت/د/ن-س/ص).

٤٤١- عَنْ جَابِرٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) قَالَ: رَكْعَتَانِ بِالسِّوَاكِ أَفْضَلُ مَنْ سَبْعَيْنَ رَكْعَةً بِغَيْرِ سِوَاكٍ. رَوَاهُ أحمد والدار قطني[٥].

---

(٣) بخاري: ٨٨٧ ، ٧٢٤. مسلم: ٥٨٨. أبو داود: ٤٦. نسائي: ٥٣٣.

(٤) بسند صحيح (شرحه).

(٥) سكت عنه الشارح (مترجم)

جابیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: دوو ركات نوێژ (لەگەڵ سیيواكا) گەورەترن لەحەفتا ركات نوێژ كە بەبێ سیواك بكرێت (ئەحمەد/ دره قوطنی).

٤٤٢- (ب ١- ز - ٢٧ ژمارە/ ٢٢٣ ، ٢٢٤ ، ٢٢٥ ، ٢٢٦).

## ٦٦) باسی مێزەر: (العمامة)

٤٤٣- عَنْ عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: رَأَيْتُ أَلنَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلىَ أَلْمِنْبَرِ وَعَلَيْهِ عَمَامَةٌ سَوْدَاءٌ قَدْ أَرْخـى طَرَفَهَا بَيْنَ كَتِفَيْهِ. رَوَاهُ ألخمسة إلاَّ البخاريَّ.

عەمری كوڕی حورەیث (خوای لێ رازی بێ): گوتی: لەسەر دوانگە (مینبەر) پێغەمبەرم دی (درودی خوای لەسەربێ) مێزەرێكی رەشی بەسەرەوە بوو، چمكەكەی بەناو شانیا شۆڕكردبووەوە (م/د/ت/ن).

٤٤٤- عَنْ أَبْنِ عُمَرَ (رَضيَ أَللهُ عَنهُما) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا اعْتَمَّ سَدَلَ عِمَامَتَهُ بَيْنَ كَتِفَيْهِ. قَالَ: نَافِعٌ: وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَسْدِلُ عِمَامَتَهُ بَيْنَ كَتِفَيْهِ. رَوَاهُ الترمذي[٢].

ئیبنو عومەر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) كە مێزەری دەبەستەوە لفكەكەی بەناو شانیا شۆڕدەكردەوە. نافیع گوتی: ئیبنو عومەریش لفكەی مێزەرەكەی بە ناوشانیا شۆڕ دەكردەوە (ش-س/ح).

٤٤٥- عَنْ جَابِرٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: رَكْعَتَانِ بِعَمَامَةٍ خَيْرٌ مَنْ سَبْعِينَ رَكْعَةً بِلاَ عِمَامَةٍ. رَوَاهُ الدَّيلميُّ[٣].

جابیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: (دوو ركات نوێژ بە مێزەرەوە خێرترە لە حەفتا ركاتی بەبێ مێزەر (دەیلەمی).

---

(٢) بسند حسن (شرحه).

(٣) سكت عنه الشارح (مترجم).

## ٦٧) بەشی سێیەم: باسی بەربەست (سوترە)
## الفصل الثاني: في السترة

٤٤٦- عَنْ سَهْلٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ بَيْنَ مُصَلَّى رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَبَيْنَ الْجِدَارِ مَمَرُّ الشَّاةِ. رَوَاهُ الثَّلاثة[1].

**سەهل (خوای لێ رازی بێ) گوتی: نوێژگە (موصەللا) کەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لە جێگەی پێکانیەوە تادیوارەکە (بەقەد گوزەرگای مەڕێك دەبوو) (ش/د).**

٤٤٧- عَنْ يَزِيد قَالَ: كَانَ سَلَمَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يَتَحَرَّى الصَّلاَةَ عِنْدَ الأُسْطُوَانَةِ الَّتِي عِنْدَ الْمُصْحَفِ فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَبَا مُسْلِمٍ أَرَاكَ تَتَحَرَّى الصَّلاَةَ عِنْدَ هَذِهِ الأُسْطُوَانَةِ؟ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَحَرَّى الصَّلاَةَ عِنْدَهَا. رَوَاهُ الشيخان[2].

**یەزید (خوای لێ رازی بێ) گوتی: سەلەمە (خوای لێ رازی بێ) دەستووری وابوو لەلای کۆڵەکەکەی کن صندووقی قورئانەکەدا منەیی نوێژی دەکرد، منیش پێم گوت: ئەی ئەبو موسلیم! دەتبینم لەلای ئەم کۆڵەکەیەدا منەیی نوێژ دەکەی؟ گوتی: دیومە کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لێرانەدا منەیی نوێژی دەکرد (ش).**

٤٤٨- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يُرْكَزُ لَهُ الْحَرْبَةُ فَيُصَلِّي إِلَيْهَا. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ الترمذي[3].

**ئیبنو عومەر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جاران نێزەیەکیان دادەچەقاند بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئینجا بەرەو ئەو نێزەیە نوێژی دەکرد (ش/د/ن).**

---

(١) بخاري: ٤٩٦ ، ٧٣٣٤. مسلم: ١١٣٤. أبو داود: ٦٩٦.

(٢) بخاري: ٥٠٢. مسلم: ١١٣٥. أبو داود: ١٠٨٢.

(٣) بخاري: ٤٩٤. مسلم: ١١١٥. أبو داود: ٦٨٧.

٤٤٩- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يُعَرِّضُ رَاحِلَتَه فَيُصَلِّي إِلَيْهَا. رَوَاهُ الثلاثة[٤].

**دیسان ئەو گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وڵاخەكەی لەبەردەم خۆیا لەسەر لا درێژ دەكرد لەباتی بەربەست ئینجا بەرەو وڵاخەكە نوێژی دەكرد (ش/د).**

٤٥٠- وَقَالَتْ عَائِشَةُ (رَضِيَ اللَّهُ عَنهَا) سُئِلَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ سُتْرَةِ الْمُصَلِّي فَقَالَ: مِثْلُ مُؤَخِرَةُ الرَّحْلِ. رَوَاهُ مُسْلِم[٥].

**عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پرسیار كرا لە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەندازەی بەرزایی بەربەستی نوێژكەر (سترة المصلّي) چەن بێ باشە؟ فەرمووی: بەقەد قوتكەی دواوەی كۆپانە وشترێ! (م).**

٤٥١- عَنْ طَلْحَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا وَضَعَ أَحَدُكُمْ بَيْنَ يَدَيْهِ مِثْلَ مُؤْخِرَةِ الرَّحْلِ فَلْيُصَلِّ وَلاَ يُبَالِ مَنْ مَرَّ وَرَاءَ ذَلِكَ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وَأَبُو دَاوُدَ الترمذي[٦].

**طەلحە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەركامێكتان شتێكی لەبەردەم نوێژەكەیدا دانا كە بەقەد كۆپارەی پاشەوەی كورتانە وشترێ بارستایی هەبێ ئیتر با نوێژی خۆیی لێ بكاو دەربەستی ئەوشتانە نەبێ كە لەو دیوی ئەو بەربەستەوە دێن و دەچن! (م/د/ت).**

٤٥٢- وَقَالَ: عِطَاءً (رَضِيَ اللهُ عَنهُ): آخِرَةُ الرَّحْلِ ذِرَاعٌ فَمَا فَوْقَهُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[٧].

**عەتا دەڵێ: مەبەست لەوە كە بەربەست بەقەد قوتكەی دواوەی كۆپانە وشترێ ببێ ئەمەیە كە بەقەد گەزێ (یا زیاتر لە گەزێ) بەرزبێ! (د).**

---

(٤) بخاي: ٥٠٧. مسلم: ١١١٧. ابو داود: ٦٩٢. ترمذي: ٣٥٢.

(٥) مسلم: ١١١٣ ، ١١١٢ ، ١١١٤.

(٦) مسلم: ١١١١. أبو داود: ٦٨٥. ترمذي: ٣٣٥.

(٧) أثر صحيح (مترجم).

٤٥٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فَلْيَجْعَلْ تِلْقَاءَ وَجْهِهِ شَيْئًا فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَلْيَنْصِبْ عَصًا فَإِنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ عَصًا فَلْيَخْطُطْ خَطًّا ثُمَّ لاَ يَضُرُّهُ مَنْ مَرَّ أَمَامَهُ[٨].

ئـەبو هـورەیرە (خـوای لێ رازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) فـەرمووی: كاتـێ كەسـێكتان كـە نوێـژەكا بـا روو بكاتـە شـتێ، یـا شـتێ لەبـەردەم خۆیـەوە دابنـێ، ئەگـەر هـەر هیـچی دەسـت نەكـەوت بـا دار دەسـتێ داچەقێنێ، ئەگەر داردەستیشی پێ نەبوو با هێڵـێ لەبـەردەم جـێ نوێژەكەیـدا بكێشێ، ئیتر ئەوەی لەو دیوی خەتەكەوە بە بەردەمی نوێژەكەیدا بڕوا زیـانی نابێبۆی (د/ ئەحمەد-س/ص).

٤٥٤- عَنِ الْمِقْدَادِ بْنِ الأَسْوَدِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي إِلَى عُودٍ وَلاَ عَمُودٍ وَلاَ شَجَرَةٍ إِلاَّ جَعَلَـهُ عَلَـى حَاجِبِـهِ الأَيْمَـنِ أَوِ الأَيْسَرِ وَلاَ يَصْمُدُ لَهُ صَمْدًا. رَوَاهُمَا أَبُو داود وأحمد[٩].

میقدادی كوڕی ئەسوەد (خوای لێ رازی بێ) گوتی: نـەم دیـوە كـە پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە نوێـژا ڕێكو ڕاسـت سـینگ بكاتـە دارێ یـا كۆڵەكـەیێ یـا دەرختـێ، بەڵام لـە نوێـژا كـەرووی دەكـردە شـتێ دەیخستـە ئاسـتی سـەر بـرۆی ڕاستی یا سەر برۆی چەپی! (د/ ئەحمەد – سند صالح).

٤٥٥- (ب ١- ز ١- ٦١ ل- ٢٢٨ چـاپی یەكـەم ژمـارە/٤/٤٢٤ رأيت بلالاً يؤذِن).

## ٦٨) نزیكی لەبەر بەستەوە باشە: (الدنو من السترة)

٤٥٦- كَانَ ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) إِذَا دَخَلَ الْكَعْبَةَ مَشَى قِبَلَ وَجْهِـهِ وَجَعَلَ الْبَابَ قِبَلَ ظَهْرِهِ، فَمَشَى حَتَّى يَكُونَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجِدَارِ الَّذِي قِبَلَ وَجْهِهِ قَرِيبًا مِنْ ثَلاَثَةِ أَذْرُعٍ، صَلَّى يَتَوَخَّى الْمَكَانَ الَّذِي أَخْبَرَهُ بِهِ بِلاَلٌ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)

---

(٨) بسند صحيح (شرحه).

(٩) بسند صحيح ،شرحه).

صَلَّى فِيهِ. قَالَ: وَلَيْسَ عَلَى أَحَدِنَا بَأْسٌ إِنْ صَلَّى فِي أَيِّ نَوَاحِي الْبَيْتِ شَاءَ. رَوَاهُ البخاري وأحمد[1].

ئیبنو عومەر (خوای لێ ڕازی بێ) کە دەچووە ناو کەعبەوە بەرەو ڕوو دەڕۆیشت و پشتی دەکردە دەرگاکەو دەچووە پێشەوە تا نزیکەی سێ گەزی دەما بۆ دیوارەکەی بەرامبەر دەرگاکە، لەوێ دەستی دەکرد بە نوێژکردن، ئیبنو عومەر دەگەڕا بەشوێن ئەو جێگەیەدا کە بیلال پێی گوتبوو: کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەوێدا نوێژی کردووە. ئیبنو عومەر دەیگوت: هەرکەسێ بە ئارەزووی خۆی لەهەر لایەکی بەیتا نوێژ بکا قەیناکا (ب/ئەحمەد).

٤٥٧- وَلِأَبِي دَاوُدَ وَأَحْمَدَ: إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ إِلَى سُتْرَةٍ فَلْيَدْنُ مِنْهَا لاَ يَقْطَعُ الشَّيْطَانُ عَلَيْهِ صَلاَتَهُ[2].

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: کە نوێژ دەکەن بەرەو بەربەست لێی نزیك ببنەوە تا شەیتان نوێژەکەتان پێ نەبڕێ (د/ئەحمەد).

## ٦٩) هاموشۆکەر بە بەردەم نوێژکەرا گوناهی دەگا نوێژخوێن بۆی هەیە ڕێگەی نەداتێ: (يأثم المار أمام المصلي وله دفعه)

٤٥٨- عَنْ أَبِي جُهَيْمٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَوْ يَعْلَمُ الْمَارُّ بَيْنَ يَدَيِ الْمُصَلِّي مَاذَا عَلَيْهِ لَكَانَ أَنْ يَقِفَ أَرْبَعِينَ خَيْرًا لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَيْهِ. قَالَ: أَبُو النَّضْرِ: لاَ أَدْرِي أَقَالَ: أَرْبَعِينَ يَوْمًا أَوْ شَهْرًا أَوْ سَنَةً. رَوَاهُ الخمسة[1].

ئەبو جوهەیم (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئاموشۆکەر کە لە بەردەمی نوێژکەرەوە ڕەت دەبێ ئەگەر بزانێ

---

(١) بخاري حج: ١٥٩٩.

(٢) سكت عنه الشارح (المترجم).

(١) بخاري: ٥١٠. مسلم: ١١٣٢. أبو داود: ٧٠١. ترمذي: ٣٣٦. نسائي: ٧٥٥.

بـەوە چـەنێ گونـاهی تـووش دەبـێ حـەزی دەكـرد كـە چـل.. رابوەسـتایەو لەبەردەمیـەوە رەت نەبوایـە. ئـەبو نـەضـر كـە یەكێكـە لـە راوییـەكانی ئـەم فەرمووەدیـە دەڵـێ: نـازانم بوسـری كـوڕی سـەعید كـە ئەمـەی بـۆمن گێڕایـەوە گوتی: چل ڕۆژ یا چل مانگ یا چل ساڵ (ش/د/ت/ن).

٤٥٩- وَلِلتِّرْمِذِيِ وَابْنِ حَبَّانَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنهُمَا) لَأَنْ يَقِفَ أَحَدُكُمْ مِائَةَ عَامٍ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمُرَّ بَيْنَ يَدَىَ أَخِيهِ وَهُوَ يُصَلِّي[٢].

پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفـەرموێ: ئـەو كەسـەتان كـە لەبـەردەم نوێـژی برایـەكی ئـایینی خۆیـەوە دەڕوا ئەگـەر سـەد سـاڵ رابوەسـتێ هێشتا ئەوەی باشترە! (ت/ئیبنو حەببان).

٤٦٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ): عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ إِلَى شَيْءٍ يَسْتُرُهُ مِنَ النَّاسِ، فَأَرَادَ أَحَدٌ أَنْ يَجْتَازَ بَيْنَ يَدَيْهِ فَلْيَدْفَعْهُ، فَإِنْ أَبَى فَلْيُقَاتِلْهُ، فَإِنَّمَا هُوَ شَيْطَانٌ. رَوَاهُ الثلاثة[٣].

ئـەبو سـەعید (خـوای لێ رازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەربێ) فـەرمووی: ئەگـەر یـەكێكتان بـەرەو بەربەسـتێ نوێـژی دەكـردو كردبـووی بـە پـەردەی نێـوانی خـۆی خـەڵكی تـر، یـەكێكی تـریش ویـستی كـە لەوكاتـەدا بـە بەرنوێژەكـەیا تـێ پـەڕێ بـا نەیـەڵێ و پـاڵی پێوەنـێ، جـا ئەگـەر كـابرا هـەر سەرەخەریی كردو بەلاساری ویستی بڕوا، با نەیـەڵێ و بچێ بەگژیا چونكە ئەوە شەیتان ئەوەی پێ دەكا (ش/د).

## ٧٠) بەربەستی پێشنوێژ هەم بۆ خۆیەتیو هەم بۆ ئەوانەیشە كە لە پشتیەوە نوێژ دەكەن: (سترة الإمام له ولمن خلفه)

٤٦١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ إِذَا خَرَجَ يَوْمَ الْعِيدِ أَمَرَ بِالْحَرْبَةِ فَتُوضَعُ بَيْنَ يَدَيْـهِ، فَيُـصَلِّي إِلَيْهَـا وَالنَّـاسُ وَرَاءَهُ، وَكَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ فِي السَّفَرِ، فَمِنْ ثَمَّ اتَّخَذَهَا الأُمَرَاءُ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ الترمذي[١].

---

(٢) سكت عنه الشارح (المترجم).

(٣) بخاري: ٥٠٩ ، ٣٢٧٤. مسلم: ١١٢٨. أبو داود: ٦٩٧. ٦٩٨. نسائي: ٧٥٦.

**ئیبنو عومەر** (ڕەزای خودایان لێبێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **یاسای وابوو لە ڕۆژی جەژنا بۆ نوێژی جەژن دەچووە دەرەوەی شار، جا لەوێ فەرمانی دەدا نیزەیەکیان دەهێنا، لەبەردەمیا دایان دەچەقاند، ئینجا بەرەو نێزەکە نوێژی جەژنی دادەبەستو خەڵکەکەیش لەپشت ئەوەوە نوێژیان دادەبەست، وە لە سەفەریشدا ئاوای دەکرد، جا بۆیە کە فەرمانڕەواکانیش ئەمەیان کردووە بە دەستوور (ش/د/ن).**

٤٦٢– عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالْهَاجِرَةِ فَأُتِيَ بَوَضُوءٍ فَتَوَضَأَ وَصَلَّى بِنَا الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ وَبَيْنَ يَدَيْهِ عَنَزَةٌ، وَالْمَرْأَةُ وَالْحِمَارُ يَمُرُّونَ مِنْ وَرَائِهَا. رَوَاهُ الثلاثة[٢].

**ئەبو جوحەیفە** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: لە قرچەی نیوەڕۆدا پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **هاتە دەرەوە بۆ لامان، ئاوی دسنوێژیان بۆ هێناو دەسنوێژی گرتو بەرنوێژی نیوەڕۆو عەصری بۆ کردین،، نێزەیەك لەبەردەمیا بوو کردبووی بە بەربەست ئیتر لەو دیو نیزەکەوە ئافرەتو گوێرێژو ئاژەڵو شت دەهاتنو دەچوونو کەس ڕێگەی لێ نەدەگرتن! (ش/د/ت).**

## ٧١) هەندێ شت کە بەقسەی هەندێ کەس نوێژدەبڕێ
## ما قيل إنه يقطع الصلاة

٤٦٣– عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ يُصَلِّي فَإِنَّهُ يَسْتُرُهُ إِذَا كَانَ بَيْنَ يَدَيْهِ مِثْلُ آخِرَةِ الرَّحْلِ فَإِذَا لَمْ يَكُنْ بَيْنَ يَدَيْهِ مِثْلُ آخِرَةِ الرَّحْلِ فَإِنَّهُ يَقْطَعُ صَلاَتَهُ الْحِمَارُ وَالْمَرْأَةُ وَالْكَلْبُ الأَسْوَدُ قُلْتُ: يَا أَبَا ذَرٍّ مَا بَالُ الْكَلْبِ الأَسْوَدِ مِنَ الْكَلْبِ الأَحْمَرِ مِنَ الْكَلْبِ الأَصْفَرِ؟ قَالَ: يَا ابْنَ أَخِي سَأَلْتُ رَسُولَ اللّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَمَا سَأَلْتَنِي فَقَالَ: الْكَلْبُ الأَسْوَدُ شَيْطَانٌ. رَوَاهُ الخمسة إلاّ البخاريّ[١].

---

(١) بخاري: ٤٩٤ ، ٤٩٨ ، ٩٧٢ ، ٩٧٣. مسلم: ١١١٥. أبو داود: ٦٨٧.

(٢) بخاري: ١٨٧، ٣٧٦، ٤٩٥، ٤٩٩، ٥٠١ ، ٦٣٣، ٦٣٤، ٣٥٥٣، ٣٥٦٦، ٥٧٨٦، ٥٨٥٩. مسلم: ١١٢٢. نسائي: ٤٦٩.

(١) مسلم: ١١٣٧. أبو داود: ٧٠٢. ترمذي: ٣٣٨. نسائي: ٧٤٩.

ئەبو ذەڕ (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: لەکاتی نوێژکردنا ئەگەر شتێ بەقەد قوتکەی دواوەی کۆپانە وشترێ لەبەر دەستانا هەبێ ئیتر ئەوە دەبێ بەمحەججەرەو پەردە بۆی، بەڵام ئەگەر بەربەستێکی وا لەبەر دەم نوێژەکەتانا نەبوو ئەوە لەم حاڵەدا کەرو ژن و سەگی رەش ئەگەر بە بەردەم نوێژەکەتاناتێپەڕن نوێژەکەتان دەبڕن قسەبەر دەڵێ: گوتم: ئەی ئەبو ذەڕ! سەگی رەش جیاوازی چییە لە سەگی سوور یا لە سەگی زەرد یا لەهەر سەگێکی تر. گوتی: ئەی کوڕی برام ئەم پرسیارەی کە تۆ لەمنت پرسی منیش هەمان پرسیارم لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پرسی، لە وەراما فەرمووی: سەگی رەش شەیتانە (م/د/ت/ن).

٤٦٤- وَلأَبِي دَاوُدَ وَالنَّسائِي (رَضيَ اللهُ عَنْهُمَا): إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ إِلَى غَيْرِ سُتْرَةٍ فَإِنَّهُ يَقْطَعُ صَلاَتَهُ الْكَلْبُ وَالْحِمَارُ وَالْخِنْزِيرُ وَالْيَهُودِيُّ وَالْمَجُوسِيُّ وَالْمَـرْأَةُ، وَيُجْزِئُ عَنْهُ إِذَا مَرُّوا بَيْنَ يَدَيْهِ عَلَى قَذْفَةٍ بِحَجَرٍ[٢].

حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر کەسێ بەبێ بەربەست نوێژبکا ئەوە سەگ و کەرو بەرازاو جوولەکەو ئاگرپەرست و ژن، ئەگەر لەبەردەمیەوە تێ پەڕن نوێژەکەی دەبڕن، بەڵام ئەگەر ئەمانە بەردەهاوێژێ دوور لەبەردەمیەوە بڕۆن قەیناکا (د/ن-سند غريب).

٤٦٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: أَقْبَلْتُ رَاكِبًا عَلَى حِمَارٍ وَأَنَا يَوْمَئِذٍ قَدْ نَاهَزْتُ الاِحْتِلاَمَ وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّى بِالنَّاسِ بِمِنًى إِلَى غَيْرِ جِدَارٍ فَمَرَرْتُ بَيْنَ يَدَىْ بَعْضِ الصَّفِّ فَنَزَلْتُ فَأَرْسَلْتُ الأَتَانَ تَرْتَعُ وَدَخَلْتُ فِي الصَّفِّ فَلَمْ يُنْكِرْ ذَلِكَ أَحَدٌ. رَوَاهُ الخمسة. وَفِي رواية: فمرَّت الأتان بين أيديهم فلم تقطع صلاتهم[٣].

ئیبنو عەباس (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: خەریکبوو باڵق دەبووم، بە سواری گوێدرێژێ هاتم پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەوکاتەدا لە مینا بەرنوێژی

---

(٢) بسند غريب ، وقال أبو داود: ذكر المجوسي فيه منكر (شرحه).

(٣) بخاري: ٧٦ ، ٤٩٣ ، ٨٦١ ، ١٨٥٧ ، ٤٤١٢. مسلم: ١١٢٤. أبو داود: ٧١٥. ترمذي: ٣٣٧. نسائي: ٧٥١.

دەكرد بۆ خەڵكەكە، هیچ رووی لە دیوارو شتی وا نەبوو، منیش بەسواری گوێرێژەكە چوومە پێشەوە تەنانەت بە بەردەمی هەندێ ریزیشدا رۆیشتم، ئەوجا دابەزیمو دێڵە كەرەكەم بەرەڵاكرد بۆ لەوەڕانو خۆم چوومە ناوڕیزی نوێژەكەوە، وە كەسیش بۆ ئەمە رەخنەی لێ نەگرتم! (ش/د/ت/ن) لە گێڕانەوەیەكی موسلیمو تیرمیذیدا: ماكەرەكە بە بەردەمیشیانا تێپەڕیو هیچ نوێژەكەشی نەبڕین ئیتر هەندێ كەس (لەسەر چ بیروباوەڕێ) دەڵێن: كەرو سەگو ژن بە بەرنوێژدا برۆن دەیبڕن؟

٤٦٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) أَنَّهُ ذُكِرَ عِنْدَهَا مَا يَقْطَعُ الصَّلاَةَ فَقَالُوا: يَقْطَعُهَا الْكَلْبُ وَالْحِمَارُ وَالْمَرْأَةُ. فَقَالَتْ: جَعَلْتُمُونَا كِلاَبًا. وفي رواية: قَدْ شَبَّهْتُمُونَا بِالْحُمُرِ وَالْكِلاَبِ. لَقَدْ رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي، وَإِنِّي لَبَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ، وَأَنَا مُضْطَجِعَةٌ عَلَى السَّرِيرِ، فَتَكُونُ لِي الْحَاجَةُ، فَأَكْرَهُ أَنْ أَسْتَقْبِلَهُ فَأَنْسَلُّ انْسِلاَلاً. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ الترمذي[٤].

هەندێ كەس لە خزمەتی عائیشەدا (خوای لێ رازی بێ) باسی ئەو شتانەیان دەكرد كە گوایە نوێژ دەبڕن، وە گوتیان: سەگو كەرو ژن نوێژ دەبڕن! عائیشەیش گوتی: دیارە ئێمەیشتان داناوە بە سەگ! لە گێڕانەوەیەكا: دیارە ئێمەیشتان لە چەشنی سەگەڵوكەرگەل داناوە! شتی وا راست نیە چونكە من خۆم وابووە لەسەر تەخت راكشاوم، لە بەینی پێغەمبەرو قیبلەدا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەو كاتەدا نوێژی دەكرد، جا ئەگەر بۆ كارێ هەڵبستامایە حەزم نەدەكرد كە رێك رووبەرووی حەزرەت راست ببمەوە، بەڵكوو بەهێواشی لەلای پایینی چارپایەكەوە خۆم دەكێشایەوە (ش/د/ن).

٤٦٧- وَعَنْهَا قَالَتْ: كُنْتُ أَنَامُ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَرِجْلاَيَ فِي قِبْلَتِهِ، فَإِذَا سَجَدَ غَمَزَنِي، فَقَبَضْتُ رِجْلَيَّ، فَإِذَا قَامَ بَسَطْتُهُمَا وَالْبُيُوتُ يَوْمَئِذٍ خَالِيَةُ الْمَصَابِيحُ. رَوَاهُ الشيخان[٥].

---

(٤) بخاري: ٥١١ ، ٥١٤ ، ٦٢٧٦. مسلم: ١١٤٣. نسائي: ٧٥٤.

(٥) بخاري: ٣٨٢ ، ٣٨٣ ، ٣٨٤ ، ٥٠٨ ، ٥١١ ، ٥١٢ ، ٥١٣ ، ٥١٤ ، ٥١٥ ، ٥١٩ ، ٩٩٧ ، ١٢٠٩ ، ٦٢٧٦. مسلم: ١١٤٥. أبو داود: ٧١٣. نسائي: ١٦٨.

دیسان عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جاری وادەبوو لە بەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەربێ) دەخەوتم، هەردوو قاچیشم لە ڕووی رووگەوە لە جێ سوژدەکەیا دەبوو، جا کە دەیویست سەجدە ببا تێوەی دەژەندم، منیش قاچم هەڵدەکێشا تا سوژدەکەی تەواو دەکرد جا کە ئەو هەڵدەسایەوە منیش دیسانەوە قاچم رادەکێشایەوە، وە ئەو سەردەمەش ماڵەکانمان چرای تیا نەبوو (بۆیە کە تا تێوەی نەژەنیمایە قاچم لانەدەبرد (ش).

٤٦٨- وَلأَبِي دَاوُدَ وَمالكٍ والدار قطني: لاَ يَقْطَعُ الصَّلاَةَ شَيءٌ وَادْرَأُوا مَا اسْتَطَعْتُمْ فَانَّما هُوَ شَيْطَانٌ. والله أعلم(٦).

حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هیچ شتێ نوێژ نابڕێ با بە بەردەمیشیا بڕوا بەلاّم تادەتوانن مەیەڵن شت بە بەردەمتانا بڕوا، چونکە ئەوەی بە بەردەمی نیوێژا بڕوا شەیتانە (د/مالیك/ دارە قوطنی).

٧٢) باسی پێنجەم: باسی چۆنێتیی نوێژ، (ئەم باسە دوو بەشە):

بەشی یەکەم: باسی بنیات (ستزن - روکن)ەکانی نوێژ:

(الباب الخامس: في كيفية الصلاة. وفيه فصلان - الفصل الأول: في أركان الصَّلاة)

٤٦٩- (ب – ١ ز – ١١ ژمارە: ٨٩/١)(١).

٤٧٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دَخَلَ الْمَسْجِدَ، فَدَخَلَ رَجُلٌ فَصَلَّى ثُمَّ جَاءَ فَسَلَّمَ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَرَدَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) السَّلاَمَ فَقَالَ: ارْجِعْ فَصَلِّ فَإِنَّكَ لَمْ تُصَلِّ ثَلاثاً، فَقَالَ: وَالَّذِى بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا أُحْسِنُ غَيْرَهُ فَعَلِّمْنِي، فَقَالَ: إِذَا قُمْتَ إِلَى الصَّلاَةِ فَكَبِّرْ، ثُمَّ اقْرَأْ مَا تَيَسَّرَ مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ، ثُمَّ ارْكَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ رَاكِعًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَعْتَدِلَ قَائِمًا، ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا، ثُمَّ ارْفَعْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ جَالِسًا ثُمَّ اسْجُدْ حَتَّى تَطْمَئِنَّ سَاجِدًا ثُمَّ افْعَلْ

---

(٦) سكت عنه الشارح (مترجم)

(١) تقدم تخريجه بمثل الحديث الرقم: ٨٩/١ →

ذَلِكَ فِي صَلاَتِكَ كُلِّهَا. رَوَاهُ الخمسة. وَزَادَ أَبُو دَاوُدَ: فَإِذَا فَعَلْتَ هذَا فَقَدْ تَمَّتْ صَلاَتُكَ وَمَا انتَقَصْتَ مَنْ هذَا شَيْئاً فَإِنَّما انْتَقَصتَهُ مَنْ صَلاتِكَ(٢).

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) هات بۆ مزگەوت، پیاوێکیش هاتە ژوورەوەو نوێژی کردو چوو بۆلای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وە سڵاوی لێ کرد، ئەویش سڵاوەکەی سەندەوە فەرمووی: بچۆرەوە نوێژەکەت بکەرەوە، چونکە ئەوە نوێژ نەبوو کە تۆ کردت، تا سێ جار پیاوەکە نوێژەکەی دەکردەوەو پێغەمبەریش دیسانەوە هەر وای پێ دەفەرمووەوە، تا لەسەری جاری سێیەمدا پیاوەکە گوتی: بەو خودایەی کە تۆی کردووە بە پێغەمبەری ڕاستو دروست لەمە باشتری لێ نازانم، دەی فێرم بکە •ئەی پێغەمبەری نازدار!) ئەویش (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: کە ڕاوەستایت بۆ نوێژ لە پێشا نوێژ دابەستەو بڵێ: ئەڵڵاهو ئەکبەر، ئینجا چەندت بۆ دەلوێ (لەو قورئانەی کە لەبەرتە) بیخوێنە، ئینجا بچەمێرەوەو ڕوکوع ببەو ئەوەندە لە ڕوکوعا بمێنەرەوە تا لەشت لەجمو جووڵ دەکەوێو ئەندامەکانت ئارام دەگرن، ئینجا ڕێك هەڵسەرەوە تا ڕەپ ڕادەوەستیت، ئینجا کوڕنووش بەرەو ئەوەندە لە کوڕنووشا بمێنەرەوە تا ئەندامەکانت ئارام دەگرن، ئینجا سەر بەرزکەرەوە تاقنچ دادەنیشیت، ئینجا دیسانەوە کوڕنووشێکی تری وەك کوڕنووشی یەکەم بەرەوە، ئیتر نوێژەکەت تاسەر بەم شێوەیە بکەو لە هەموو کاتێکا ئەمە پیشەت بێ، (ش/د/ت/ن) ئەبو داوود (ڕەحمەتی خودای لێبێ) ئەمەیشی پتر کردووە: جا ئەگەر ئەمە بکەی ئەوا نوێژەکەت تەواوە، وە هەرچیش لەمە کەم بکەیتەوە ئەوە لە نوێژەکەتی کەم دەکەیتەوە!.

٤٧١- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ صَلاَةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ. رَوَاهُ الخمسة(٣).

---

(٢) بخاري: ٧٥٧ ، ٧٩٣ ، ٦٢٥١ ، ٦٢٥٢ ، ٦٦٦٧. مسلم: ٨٨٣. أبو داود: ٨٥٦. ترمذي: ٣٠٣. نسائي: ٨٨٣.

(٣) بخاري: ٧٥٦. مسلم: ٨٧٢. أبو داود: ٨٢٢. ترمذي: ٢٤٧. نسائي: ٩١٠.

عوبـادەی كـوڕی صـامت (خـوای لێ ڕازی بێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەركەسێ لە نوێـژا لـە هـەموو ركاتێكدا سـوورەتی فاتیحا نەخوێنێ نوێژەكەی دروست نیە (ش/د/ت/ن).

٤٧٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ صَلَّى صَلاَةً لَمْ يَقْرَأْ فِيهَا بِأُمِّ الْقُرْآن فَهِيَ خِدَاجٌ ثَلاَثًا غَيْرُ تَمَامٍ فَقِيلَ لأَبِي هُرَيْرَةَ: إِنَّا نَكُونُ وَرَاءَ الإِمَامِ. فَقَالَ: اقْرَأْ بِهَا فِي نَفْسِكَ فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: قَالَ: اللَّهُ تَعَالَى: قَسَمْتُ الصَّلاَةَ بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي نِصْفَيْنِ وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ، فَإِذَا قَالَ: الْعَبْدُ: (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ). قَالَ: اللَّهُ تَعَالَى: حَمِدَنِي عَبْدِي، وَإِذَا قَالَ: (الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ). قَالَ: اللَّهُ تَعَالَى: أَثْنَى عَلَيَّ عَبْدِي. وَإِذَا قَالَ: (مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ). قَالَ: مَجَّدَنِي عَبْدِي، وَقَالَ: مَرَّةً فَوَّضَ إِلَيَّ عَبْدِي، فَإِذَا قَالَ: (إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ). قَالَ: هَذَا بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ. فَإِذَا قَالَ: (اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ). قَالَ: هَذَا لِعَبْدِي وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ البخاري[٤].

ئـەبو هـورەیرە (خـوای لێ ڕازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) فەرمووی: هەركەسێ هەر نوێژێ بكاو سوورەتی فاتیحای تیا نەخوێنێ ئەوە ئەو نوێژەی نابەكامە سێ جار وشەی ئەو نوێژەی نابەكامـەی دووبـارەكردەوە ئینجا فەرمووی: وە ناتەواویشە! جا گوترا بە ئەبو هورەیرە: ئەی باشە ئەگەر لەپشت پێش نوێژەوە بە جەماعەت نوێژمان دەكرد لـەم كاتـەدا چۆن؟ گـوتی: لـەم كاتـەدا بـە پەنامـەكی لـە دڵـی خۆتـەوە بیخوێنـە، چونكە مـن بـۆ خـۆم لـە پێغەمبـەرم بیست دەیفـەرموو (دروودی خوای لەسەربێ): خـودای گـەورە دەفـەرموێ: من نوێژم لە نێوانی خۆمو بەندەما كردووە بە دوو بەشەوە:

بەشی یەكەم: سوپاسو ستایشی خودایە.

بەشی دووەم: داوای یارمەتیو ڕێنیشاندانە بۆ بەندە جا كاتێ بەنـدە لـە فاتیحادا دەڵێ (أَلْحَمْدُ لِلهِ رَبِّ أَلعَالَمِينَ) هەمووستایشو سوپاسێ بۆ خودایە،

---

(٤) مسلم: ٨٧٦ ، ٨٧٨. أبو داود: ٨٢١ ، ترمذي: ٢٩٥٣م. نسائي: ٩٠٨.

کە خاوەنۆ پەروەردگاری هەموو شتێکە لە هەردوو جیهاندا. خودای گەورەش دەفەرموێ: ئەم بەندەیەی من سوپاس و ستایشی من دەکا، وە کاتێ بەندە دەڵێ: (الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ) کە خودایەکی بەخشندەی میهرەبانە خودای گەورەش دەفەرموێ: ئەم بەندەیەی من پەسنو مەدحی من دەکا، وە کاتێ بەندە دەڵێ: (مالِكِ يَوْمِ الدِّينْ): خاوەنی ڕۆژی تۆڵەو پاداشە کە ڕۆژی دواییە خودای گەورەش دەفەرموێ: ئەم بەندەیەی من بەشانو شکۆی مندا هەڵدەداو وەسپی گەورەیی من دەکا جارێ ئەبو هورەیرە لەم شوێنەدا گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: خودای گەورەش دەفەرموێ: ئەم بەندەیەی من کاری خۆی حەواڵە کرد بەمنو خۆی سپارد بەمن، حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: وە کاتێ بەندە دەڵێ: (إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ): خودایە! هەرتۆ دەپەرستینو بەندەیی هەر تۆ دەکەین وە هەر لەتۆ داوای یارمەتی دەکەین، خودای گەورەش دەفەرموێ: ئەمەیان ناوکۆییە لەبەینی منو ئەم بەندەیەما، وە ئەم بەندەیەم داوای هەرچیم لێبکا دەیدەمێو بێ دڵی ناکەم، وەکاتێ بەندە دەڵێ:

{اهدِنَا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنعَمتَ عَلَيهِمْ غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ}:

ئەی خودایە! شارەزاییمان بکە بۆ ڕێگەی ڕاست، بۆ ڕێگەی ئەو کەسانە کە نازونیعمەتت ڕژاندووە بەسەریاناو چاکەت لەگەڵ کردوون، وە مەمانخەرە سەر ڕێگەی ئەو کەسانە کە ڕقت لێ گرتوونو بەرقاری تۆ کەوتوونو ڕێگەی ڕاستیان ونکردووە، خودای گەورەش دەفەرموێ: ئەمە بەشی ئەم بەندەی منە، وە ئەم بەندەیەم داوای هەرچیم لێ بکا دەیدەمێو بێ دڵی ناکەم (م/د/ت/ن) (بەر ڕەحمەتی خودا کەون).

٤٧٣- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: كُنَّا خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ فَقَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَثَقُلَتْ عَلَيْهِ الْقِرَاءَةُ فَلَمَّا فَرَغَ قَالَ: لَعَلَّكُمْ تَقْرَءُونَ خَلْفَ إِمَامِكُمْ. قُلْنَا: نَعَمْ نَفْعَلُ هَذَا يَا رَسُولَ اللَّهِ.

قَالَ: لاَ تَفْعَلُوا إِلاَّ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ فَإِنَّهُ لاَ صَلاَةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِهَا. رَوَاهُ أصحاب السنن(٥).

**عوبادەی کوڕی صامیت** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: جارێ پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **بەرنوێژی نوێژی بەیانیی بۆ دەکردین، قورئانخوێندنەکەی لێ شێواو بەگران بۆی خوێندرا جا کاتێ لە نوێژەکە لێ بووەوە فەرمووی: ڕەنگە ئێوەش لە نوێژدا وەك پێشنوێژخوێن قورئان بخوێنن؟ گوتمان: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خودا دەیخوێنین. فەرمووی: بەس سوورەتی فاتیحا بخوێنن، چونکە ئەوەی لە نوێژا ئەم سوورەتە نەخوێنێ نوێژەکەی دروست نیە** (د/ت/ن/ب:ص).

٤٧٤– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) انْصَرَفَ مِنْ صَلاَةٍ جَهَرَ فِيهَا بِالْقِرَاءَةِ فَقَالَ: هَلْ قَرَأَ مَعِي أَحَدٌ مِنْكُمْ آنِفًا، فَقَالَ: رَجُلٌ. نَعَمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: إِنِّي أَقُولُ مَا لِي أُنَازَعُ الْقُرْآنَ. قَالَ: فَانْتَهَى النَّاسُ عَنِ الْقِرَاءَةِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِيمَا جَهَرَ فِيهِ مِنَ الصَّلَوَاتِ. رَوَاهُ أصحاب السنن(٦).

**ئەبو هورەیرە** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: جارێ پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **بەرنوێژی بۆ دەکردین، بە دەنگی بەرز لە نوێژەکەدا قورئانەکەی دەخوێند، کە نوێژەکەی تەواوکرد فەرمووی: ئایا ئێستاکە کەستان لەم نوێژەدا لەگەڵ مندا قورئانتان دەخوێند؟ پیاوێ گوتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: دەڵێم خودایە! بۆ قورئانەکەم باش بۆنایەت! گوتی: ئیتر لەوە بەدواوە پاشنوێژ (مەئموم)ەکان لەنوێژی ئاشکرا (نوێژی جەهری)دا کە لەگەڵ پێغەمبەردا دەیانکرد وازیان لە خوێندنی فاتیحا هێنا** (د/ت/ن–س/ص).

٤٧٥– عَنْ جَابِرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يَقُولُ: مَنْ صَلَّى رَكْعَةً لَمْ يَقْرَأْ فِيهَا بِأُمِّ الْقُرْآنِ فَلَمْ يُصَلِّ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ وَرَاءَ الإِمَامِ. رَوَاهُ الترمذي وصححه(٧).

---

(٥) وأحمد والبيهقي والدارقطني وابن حبان والبخاري في جزء القرآن وصححه (شرحه).

(٦) بسند صحيح (شرحه).

(٧) صحيح عند الترمذي.

جابیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: هەرکەسێ هەر نوێژێ بکا سوورەتی فاتیحای تیا نەخوێنێ، لە هەموو رکاتێکا ئەوە ئەو نوێژەی دورست نیەو وەك نوێژی نەکردبێ وایە، مەگەر لەکاتێکدا کە بە جەماعەت نوێژ بکا لە پشت پێشنوێژەوە (ت–ص).

٤٧٦– عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمْ) فَلَمْ أَسْمَعْ أَحَداً مِنْهُمْ يَقْرَأُ (بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ). رَوَاهُ الخمسة. ولفظ النسائي: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَمْ يُسْمِعْنَا قِرَأءةَ (بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)[٨].

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە پشتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ)و ئەبو بەکرو عومەرو عوسمانەوە نوێژم (بە جەماعەت) کردووە وە گوێم لێ نەبووە لە کەسیان کە {بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ} بخوێنن (ش/د/ت/ن) گفتەی نەسائی ئاوایە: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نوێژی بۆ کردین: گوێمان لێ نەبوو کە {بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ} بخوێنێ.

٤٧٧– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُما) قَالَ: كَانَ ألنَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَفْتَتِحُ صَلاَتَهُ (بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) رَوَاهُ الترمذي والحاكم والدار قطنيُّ[٩].

ئیبنو عەباس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وابوو سەرەتای نوێژی بە {بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ} دەست پێ دەکرد (ت/حاکم/دارە قوطنی – باسانید لم تسلم = بەچەند رەشتەیێ کەبێ نەنگ نەبوون).

٤٧٨– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُا) عَنِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أُمِرْتُ أَنْ أَسْجُدَ عَلَى سَبْعَةِ أَعْظُمٍ عَلىَ الْجَبْهَةِ (وَأَشَارَ بِيَدِهِ عَلَى أَنْفِهِ) وَالْيَدَيْنِ وَالرِّجْلَيْنِ وَأَطْرَافِ الْقَدَمَيْنِ وَلاَ نَكْفِتَ الثِّيَابَ وَلاَ الشَّعْرَ. رَوَاهُ الخمسة[١٠].

---

(٨) اخرجه البخاري بمعناه (٧٤٣). مسلم: ٨٨٨. نسائي: ٩٠٦.

(٩) بأسانيد لم تسلم ٠شرحه).

(١٠) بخاري: ٨١٢. نسائي: ١٠٩٥ ، ١٠٩٦ ، ١٠٩٧. مسلم: ١٠٩٧ – ١٠٩٩.

ئیبنو عەباس (ڕەزای خودایان لێبێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: خودا فەرمانی پێ کردووم کە لەسەر ئەم حەوت ئێسکە کوڕنووش ببەم لەسەر تەوێڵو لووتو بەری هەردوو دەستو هەردوو ئەژنۆو سەرپەنجەکانی هەردووپێ، وە فەرمایشی پێ کردووم کە لەکاتی نوێژکردندا جلو بەرگ هەڵنەکەینو قۆڵو فەقیانە نەپێچینو چاك نەکەین بەلاداو پرچو قژیش کۆمەڵ نەکەین! (ش/د/ت/ن).

٤٧٩- وَعَنْهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُعَلِّمُنَا التَّشَهُّدَ كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنَ فَكَانَ يَقُولُ: التَّحِيَّاتُ الْمُبَارَكَاتُ الصَّلَوَاتُ الطَّيِّبَاتُ لِلّٰهِ السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللّٰهِ وَبَرَكَاتُهُ السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللّٰهِ الصَّالِحِينَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ. زاد في رواية: وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّٰهِ. رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ البخاريّ[١١].

دیسان گوتی: جاران پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) چۆن فێری قورئانی دەکردین ئاوەهایش فێری تەحیاتی دەکردین، گشت جارێ دەیفەرموو:

{التَّحِيَّاتُ الْمُبَارَكَاتُ الصَّلَوَاتُ الطَّيِّبَاتُ لِلّٰهِ السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللّٰهِ وَبَرَكَاتُهُ السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللّٰهِ الصَّالِحِينَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّٰهِ}.

هەرچی هۆی قەدرو ڕێزە، چ بە گوفتار چ بەکردار، وە هەرچی مایەی پیتو فەڕو بەرەکەتە، وە هەرچی نوێژو داخوازیو پاڕانەوەو نزایە، وە هەرچی سەرچاوەی پاکیو خاوێنییە لە فەرمایشتی جوانو نوێژو پەرستشو بەندەیی، ئەمانە هەموویان لە ڕاستیدا هەر بۆ خودان، درودو سڵاو لەتۆ ئەی پێغەمبەری خودا، لەگەڵ سۆزو ڕەحمەتو پیتو فەڕو بەرەکەتی خودا، (درودو سڵاو لە ئێمەشو لەهەموو بەندەیەکی باشی خودا)، شایەتی دەدەم کە هەرخوا خودایەو خودای ترنییە، وە شایەتی دەدەم کە موحەممەد پێغەمبەری خودایە لە گێڕانەوەیەکا:

---

(١١) مسلم: ٩٠٠. أبو داود: ٩٧٤. ترمذي: ٢٩٠. نسائي: ١١٧٠.

{أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ}.

**شايەتی دەدەم كە هەر خودا خودايەو تاكو تەنيايەو هيچ هاوبەشی نيە، وە شايەتی دەدەم كە موحەممەد پێغەمبەری خودايە (م/د/ت/ن – رەحمەتی خودايان لێبێ).**

٤٨٠– عَنْ عَبْدُ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: كُنَّا نَقُولُ فِي الصَّلَواةِ خَلْفَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) السَّلاَمُ عَلَى اللهِ. السَّلاَمُ عَلَى فُلاَن. فَقَالَ: لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَاتَ يَوْمٍ: إِنَّ اللَّهَ هُوَ السَّلاَمُ ، فَإِذَا قَعَدَ أَحَدُكُمْ فِي الصَّلاَةِ فَلْيَقُلِ: التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ. فَإِذَا قَالَ:هاَ أَصَابَتْ كُلَّ عَبْدٍ لِلَّهِ صَالِحٍ فِي السَّمَاءِ وَالأَرْضِ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، ثُمَّ يَتَخَيَّرُ مِنَ المَسْأَلَة مَا شَاءَ. رَوَاهُ الخمسة(١٢).

**عەبدوڵلا (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە پێشدا كە لە پشتی پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەربێ) نوێژمان دەكرد لە پێش دانانی تەحياتا دەمانگوت: سەلام لە خودا، سەلام لەم، سەلام لەو، تا رۆژێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: پێمان: وا مەڵێن، چونكە خودا خۆی ناوی سەلامە بەڵام كاتێ لە نوێژدا دادەنيشن بۆ خوێندنی تەحيات بڵێن.**

{التَّحِيَّاتُ للهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ}.

**هەرچی هۆی قەدرو رێزە، چ بە گوفتار چ بە كردار، وە هەرچی نوێژو داخوازیو لاڵانەوەو پاڕانەوەو دوعاو نزايە، وە هەرچی سەرچاوەی پاكیو خاوێنييە ئەمانە هەموويان لە راستيدا هەر شايستەن بۆ خودای مەزن، دوورد لەسەر تۆ ئەی پێغەمبەری خودا لەگەڵ رەحمەتو بەرەكەتی خوا،**

---

(١٢) بخاري: ٦٣٢٨. مسلم: ٨٩٥. نسائي: ١١٦٨ ، ١١٦٩ ، ١٢٧٦.

(درووود لەسەر ئێمەش‌و لەسەر هەموو بەندە باشەكانی خودا)، شایەتی دەدەم كە هەر خودا خودایە خودای تر نیە، وە شایەتی دەدەم كە موحەممەد هەم بەندەی خوداو هەم پێغەمبەری خودایە چونكە هەر كەسێ ئەم وشە ئاوا بڵێ‌و لەسەر ئەم شێوەیە سڵاو بكا ئەوە سڵاوەكەی بەر هەموو بەندەیەكی باشی خودا دەكەوێ، ئیتر ئەو بەندەیە خوا لە زەویدابێ، وە خوا لە ئاسماندا بێ هەر دەیگرێتەوە، ئینجا بە ئارەزووی خۆی بپارێتەوە، بۆخۆی‌و حەزی لەچی بێ، لەخودا داوای بكا (ش/د/ت/ن).

٤٨١- عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ فِي الصَّلاةِ: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْراهِيمَ وَآلِ إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيْدٌ مَجِيْدٌ. رَوَاهُ الخمسة والشافعيُّ واللفظ له[١٣].

كەعبی كوڕی عوجرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە نوێژا لەپاش تەحیاتەوە دەیفەرموو:

{اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْراهِيمَ وَآلِ إِبْرَاهِيمَ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيْدٌ مَجِيْدٌ}.

ئەی خودایە! بڕژێنە میهرەبانی‌و رەحمەت بۆسەر موحەممەدو كەس‌و كاری موحەممەد، وەك ئەو میهرەبانی‌و رەحمەتەی كە راژاندووتە بەسەر ئیبراهیم‌و كەس‌و كاری ئیبراهیما، وە پیت‌و فەڕو بەرەكەت بڕژێنە بەسەر موحەممەدو بنەماڵەی موحەممەدا وەك ئەوپیت‌و فەڕو بەرەكەتەی كە رژاندۆتە بەسەر ئیبراهیم‌و بنەماڵەی ئیبراهیما، بەراستی تۆ ئەی خودایە!

---

(١٣) بخاري: ٣٣٧ ، ٤٧٩٧ ، ٦٢٥٧. مسلم: ٩٠٧ – ٩٠٩. ابو داود: ٩٧٩ ، ٩٧٦ ، ٩٧٨. ترمذي: ٤٨٣. نسائي: ١٢٨٦ ، ١٢٨٧ ، ١٢٨٨.

شایستەی هەموو ستایش و سوپاسێكیت، وەخودا یەكی گەلێ گەورەو پیرۆزیت! (شافیعی/ ش/د/ت/ن).

٤٨٢- عَنْ عِتْبَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّيْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَلَّمْنَا حِينَ سَلَّمَ. رَوَاهُ البخاريُّ[١٤].

عیتبان (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەربێ) كە نوێژمان دەكرد كە ئەو سڵاوی نوێژی دەدایەوە ئیتر ئێمەش سڵاومان دەدایەوە (ب).

٤٨٣- وَقَالَ: سَعْدٌ: كُنْتُ أَرَى رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ يَسَارِهِ حَتَّى أَرَى بَيَاضَ خَدِّهِ. رَوَاهُ مُسْلِم[١٥].

سەعیدیش (خوای لێ رازی بێ) گوتی: گەلێ جار پێغەمبەرم دەدی (دروودی خوای لەسەربێ) بەلای راست و بەلای چەپی خۆیا سڵاوی نوێژی دەدایەوە، بەرادەیەكی وا لای دەكردەوە سپیدەی روومەتی دەر دەكەوت (م).

٤٨٤- عَنْ عُبَيْدُ اللّٰهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ وَعَنْ شِمَالِهِ حَتَّى يُرى بَيَاضُ خَدِهِ وَيَقُولُ: السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللّٰهِ السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللّٰهِ. رَوَاهُ أصحاب السُّنن[١٦].

عەبدوڵڵا (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بەرەنگێكی وا سڵاوی نوێژی دەدایەوە بەلای راست و بەلای چەپی خۆیا، تەنانەت سپیدەی روومەتی دەردەكەوت، لە پێشا بەلای راستیا سڵاوی دەدایەوەو دەیفەرموو (أَلسَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ): سڵاوو رەحمەتی خوداتان لێبێ) ئینجا بەلای چەپیا سڵاوی دەدایەوەو دەیفەرموو: (أَلسَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ) سڵاوو رەحمەتی خوداتان لێبێ. (د/ت/ن-س/ص).

---

(١٤) بخاري: ٨٣٨.

(١٥) مسلم: ١٣١٥.

(١٦) بسند صحيح (شرحه).

٤٨٥- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: حَذْفُ السَّلاَمِ سُنَّةٌ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ الترمذي[١٧].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: سڵاودانەوە بە خێرایی سوننەتە (د/ت).

**٧٣) بەشی دووەم: باسی رازاندنەوەی نوێژ: وەك دەست بەرزكردنەوەو گوتنی ئەڵڵاهو ئەكبەر لەكاتی چوون لە بنیاتێكەوە بۆ بنیاتێكی تر:**

**(الفصل الثاني: في محاسن الصلاة: رفع اليدين وتكبيرات الانتقال)**

٤٨٦- عَنِ ابْنَ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) افْتَتَحَ التَّكْبِيرَ لِلصَّلاَةِ، فَرَفَعَ يَدَيْهِ حِينَ يُكَبِّرُ حَتَّى يَجْعَلَهُمَا حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ، وَإِذَا كَبَّرَ لِلرُّكُوعِ فَعَلَ مِثْلَهُ، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ. فَعَلَ مِثْلَهُ وَقَالَ: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ.وَفِي رِوَايَةٍ: وَإِذَا قَامَ مِنَ الرَّكْعَتَيْنِ رَفَعَ يَدَيْهِ وَلاَ يَفْعَلُ ذَلِكَ حِينَ يَسْجُدُ وَلاَ حِينَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ مِنَ السُّجُودِ. رَوَاهُ الخمسة[١].

ئیبنو عومەر (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: تەماشام دەكرد پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بە گوتنی ئەڵڵاهو ئەكبەر نوێژی دادەبەست، وە لەكاتی ئەڵڵاهو ئەكبەركردنا هەردوو دەستی بەرز دەكردەوە تا بەرامبەر هەردوو سەرشانی، وە كاتێ دەچوو بۆ روكوع ئەڵڵاهو ئەكبەری دەكردو دیسان بەو چەشنە هەردوو دەستی بەرز دەكردەوە، وە كاتێ لە روكوع هەڵدەسایەوە دەیفەرموو: (سمع الله لمن حمده:) هەر كەسێ سوپاسی خودا بكا خودا سوپاسەكەی قەبووڵ دەكا، وە دیسان لەم كاتەشدا بەو چەشنە هەردوو دەستی بەرز دەكردەوە تا ئاستی هەردوو سەرشانی، ئینجا دەیفەرموو: (ربَّنا ولك الحمد): پەروەردگارا! ئەی خودای ئێمە سوپاس بۆ تۆ لەسەر ئەوە كە سوپاس و داوامان گیرا دەكەی! لە گێرانەوەیەكا: هەروەها هەمان چەشن هەردوو

(١٧) موقوفاً على أبى هريرة، ورواه الحاكم وصححه (شرحه).

(١) بخاري: ٧٣٥ ، ٧٣٦ ، ٧٣٨ ، ٧٣٩. مسلم: ٨٥٩ – ٨٦٢. أبو داود: ٧٢١. ترمذي: ٢٥٥. نسائي: ١٠٢٤.

دەستی بەرز دەكردەوە لەو كاتەدا كە دوو ڕكاتی تەواو دەكردو هەڵدەسایەوە بۆ ركاتی سێیەم، بەڵام لەكاتی سەجدەداو لەو كاتەدا كە سەری لە سەجدە هەڵدەبڕی دەستی بەرز نەدەكردەوە (ش/د/ت/ن).

٤٨٧- وَلِمُسْلِمٍ وَأَبِي دَاوُدَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا كَبَّرَ رَفَعَ يَدَيْهِ ثُمَّ الْتَحَفَ بِثَوْبِهِ ثُمَّ أَخَذَ شِمَالَهُ بِيَمِينِهِ[٢].

گوتی: دەستووری پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وابوو كە ئەڵلاهو ئەكبەری دەكرد دەستەكانی بەرز دەكردەوە، ئینجا جلەكەیی دەپێچا بە خۆیەوە، ئینجا بە دەستی ڕاستی مووچی دەستی چەپی خۆی دەگرت (م/ت).

٤٨٨- عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ هَلِبٍ عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَؤُمُّنَا فَيَأْخُذُ شِمَالَهُ بِيَمِينِهِ. رَوَاهُ الترمذي[٣].

قەبیصەی كوڕی هەلیب (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: باوكم گوتی: یاسای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وا بوو كە بەرنوێژیی بۆ دەكردین بە دەستی ڕاستی مووچی دەستی چەپی خۆی دەگرت (ت-س/ح).

٤٨٩- وَقَالَ: عَلِيٌّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): السُّنَّةُ وَضْعُ الْكَفِّ عَلَى الْكَفِّ فِي الصَّلَاةِ تَحْتَ السُّرَّةِ. رَوَاهُ ابو دَاوُدَ وأحمد[٤].

عەلیش (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: سوننەتە لە نوێـژدا لەكاتی ڕاوەستانا دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ لە خوار ناوكەوە دابنرێ (د/ئەحمەد).

٤٩٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُكَبِّرُ فِي كُلِّ خَفْضٍ وَرَفْعٍ وَقِيَامٍ وَقُعُودٍ وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ. رَوَاهُ الخمسة واللفظ للترمذي[٥].

---

(٢) مسلم: ٨٩٤.

(٣) بسند حسن (شرحه).

(٤) سكت عنه الشارح (مترجم).

(٥) بخاري: ٧٨٤ ، ٧٨٦ ، ٨٢٦. مسلم: ٨٧١. أبو داود: ٨٣٥. نسائي: ١٠٨١ ، ١١٧٩.

عەبدوڵلا (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: جاران پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) و ئەبو بەکرو عومەر لەم کاتانەدا هەمو جارێ ئەڵلاهو ئەکبەریان دەکرد: لەکاتی دانەوینو بەرزبوونەوەداو لەکاتی هەڵسانو دانیشتندا (ت/ش/د/ن).

٤٩١- (ب-١ز-٨٣ کەوا لەدواوە لەم بەرگەدا. ژمارە ٥١٨).

## ٧٤) نزای سەرەتای نوێژ: (دعاء الافتتاح)

٤٩٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَسْكُتُ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَبَيْنَ الْقِرَاءَةِ إِسْكَاتَةً هُنَيَّةً فَقُلْتُ. بِأَبِي وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللّٰهِ، إِسْكَاتُكَ بَيْنَ التَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةِ مَا تَقُولُ؟ قَالَ: أَقُولُ: اللّٰهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اللّٰهُمَّ نَقِّنِي مِنَ الْخَطَايَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، اللّٰهُمَّ اغْسِلْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ. رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ الترمذي[1].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: عادەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وابوو، لە دوای ئەڵلاهو ئەکبەری نوێژ دابەستن، لەپێش خوێندنی فاتیحادا ئێست (سکته خفیفه). وێستانێکی کەمی دەکرد، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بە باوكو دایکمەوە بە قوربانت بم لەم ئێستەدا چی دەخوێنی؟ فەرمووی: دەڵێم:

{اللّٰهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اللّٰهُمَّ نَقِّنِي مِنَ الْخَطَايَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، اللّٰهُمَّ اغْسِلْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ}.

خودایە! لە گوناە دورم بخەرەوە وەك دووری خۆرهەلاتو خۆرئاوا، خودایە! لەگوناە پاکم بکەرەوە وەك پارچەیێ بلووری سپیی بێگەرد، خودایە! گوناهەکانم بە ئاوو بە بەفرو بەتەرزە بشۆرەوە - (ش/د/ن).

---

(١) بخاري: ٧٤٤. مسلم: ١٣٥٣. أبو داود: ٧٨١. نسائي: ٦٠ ، ٨٩٤.

٤٩٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهُمَا) قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ نُصَلِّى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذْ قَالَ: رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا وَالْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا وَسُبْحَانَ اللَّهِ بُكْرَةً وَأَصِيلاً. فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَنِ الْقَائِلُ كَلِمَةَ كَذَا وَكَذَا؟ قَالَ: رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: عَجِبْتُ لَهَا فُتِحَتْ لَهَا أَبْوَابُ السَّمَاءِ قَالَ ابْنُ عُمَرَ: فَمَا تَرَكْتُهُنَّ مُنْذُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ ذَلِكَ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ والترمذي[٢].

**ئیبنو عومەر** (خوایان لێ رازی بێ) **گوتی: جارێ پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **بەر نوێژیی بۆ دەکردین لە نێوانی ئەڵڵاهو ئەکبەری نوێژدابەستن و خوێندنی فاتیحادا پیاوێ گوتی:**

(اللهُ أَكْبَرُ كَبِيْراً وَالْحَمْدُ لِلهِ كَثِيْراً وَسُبْحَنَ اللهِ بُكْرَةً وَأَصِيْلاً).

**خودا لە هەموو کەسێ گەورترە، سوپاس و ستایشی زۆرو بێ شومار بۆزاتی پاکی پەروەردگار، بەیانی و ئێواری تەسبیحاتی خودا دەکەم و هەمیشە ناوی بەپاکی دەبەم. پێغەمبەریش** (درودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: کێ بوو وشەیەکی واوای گوت؟ پیاوەکە گوتی: من بووم ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: زۆرم پێ سەیربوو یەکسەر هەموو دەرگاکانی ئاسمانی بۆ خرانە سەرپشت! ئیبنو عومەر گوتی: لەوحەلەوە ئەمەم لە حەزرەت** (درودی خوای لەسەربێ) **بیستووە تەرکیم نەکردووە (م/ت).**

٤٩٤- عَنْ عَلِيٍّ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ كَبَّرَ ثُمَّ قَالَ: وَجَّهْتُ وَجْهِىَ لِلَّذِى فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفًا مُسْلماً وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ إِنَّ صَلاَتِى وَنُسُكِى وَمَحْيَاىَ وَمَمَاتِى لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ اللَّهُمَّ أَنْتَ الْمَلِكُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ. أَنْتَ رَبِّى وَأَنَا عَبْدُكَ ظَلَمْتُ نَفْسِى وَاعْتَرَفْتُ بِذَنْبِى فَاغْفِرْ لِى ذُنُوبِى جَمِيعًا إِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ وَاهْدِنِى لأَحْسَنِ الأَخْلاَقِ لاَ يَهْدِى لأَحْسَنِهَا إِلاَّ أَنْتَ

(٢) مسلم: ١٣٥٧. ترمذي: ٣٥٩٢. نسائي: ٨٨٤ ، ٨٨٥.

وَاصْرِفْ عَنِّى سَيِّئَهَا لاَ يَصْرِفُ عَنِّى سَيِّئَهَا إِلاَّ أَنْتَ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ وَالْخَيْرُ كُلُّهُ فِي يَدَيْكَ وَالشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ وَأَنَا بِكَ وَإِلَيْكَ تَبَارَكْتَ وَتَعَالَيْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ البخاري(٣).

عەلی (ڕەزای خودای لێبێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر) کە هەڵدەسا بۆ نوێژ لە پێشا ئەڵلاهو ئەکبەری نوێژ دابەستنی دەکرد ئینجا یەکسەر دەیفەرموو:

{وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِى فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ حَنِيفًا مُسْلِمًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ اللَّهُمَّ أَنْتَ الْمَلِكُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ. أَنْتَ رَبِّى وَأَنَا عَبْدُكَ ظَلَمْتُ نَفْسِي وَاعْتَرَفْتُ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي ذُنُوبِي جَمِيعًا إِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ وَاهْدِنِى لأَحْسَنِ الأَخْلاَقِ لاَ يَهْدِى لأَحْسَنِهَا إِلاَّ أَنْتَ وَاصْرِفْ عَنِّى سَيِّئَهَا لاَ يَصْرِفُ عَنِّى سَيِّئَهَا إِلاَّ أَنْتَ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ وَالْخَيْرُ كُلُّهُ فِي يَدَيْكَ وَالشَّرُّ لَيْسَ إِلَيْكَ أَنَا بِكَ وَإِلَيْكَ تَبَارَكْتَ وَتَعَالَيْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ}.

بەدڵێکی پاک‌و بێگەردەوە ڕوو دەکەمە ئەو خودایە کە ئەم ئاسمانانەو زەمینەی لە نەبوون دروست کردووە، من موسوڵمانێکی پاک‌و بێ خەوشم‌و بەهیچ جۆرێ لە دەستەی هاوبەش پەیدایداکەران نیم، بێگومان نوێژو ئادابی حەج‌و خواپەرستیم‌و ژیانم‌و مردنم هەمووی هەر بۆ خودایە کە پەروەردگری هەموو عالەمە، کە هیچ هاوبەش‌و هاورێیەکی بۆ نیە، وە بەمە فەرمانم پێکراوە، و من یەکێکم لە موسوڵمانان‌و یەکێکم لە فەرمانبەرانی خودا، ئەی خودایە! پادشای ڕاستەکی هەر تۆی، لە تۆ بەولاوە خودای تر نیە، تۆ خودای منیت، منیش بەندەی تۆم، زۆرو ستەمم لەخۆم کردووەو پێ لە تاوانی خۆم دەنێم، منیش بەندەی تۆم، دەی تۆیش بە گەورەیی‌و مەرحەمەت‌و میهرەبانی خۆت لە هەموو تاوانەکانم خۆش بە، چونکە خۆت نەبێ کەسی تر ڕادەی ئەوەی نیە کە لە تاوانی بەندەکان خۆش بێ،

---

(٣) مسلم: ١٨٠٩. أبو داود: ٧٤٤ ، ٧٦٠ ، ٧٦١ ، ١٥٠٩. ترمذي: ٢٦٦ ، ٣٤٢١ ، ٣٤٢٢ ، ٣٤٢٣. نسائي: ٨٩٦ ، ١٠٤٩ ، ١١٢٥.

پەروەردگاری من! فێری ڕەووشتی بەرزو خووی شیرینم بکە، چونکە ئەمە هەر لە خۆت دەوەشێتەوە، وە لام بدە لە خووی خراپ و بەد، چونکە ئەمە هەر بەتۆ دەکرێ، من هەمیشە گوێ لە مشتی تۆم و ئامادەم بۆ جێ بەجێ کردنی فەرمانی تۆ، خێرو خۆشی و چاکە هەمووی بە دەستی تۆیە، شەڕ لە تۆ ناوەشێتەوە، من لەبنەڕەتەوە بەتۆ بەندم و لەسایەی تۆوە هەم، وەپشت و پەناشم هەر تۆی و سەرەنجام دێمەوە بەر دەستی خۆت! تۆ خودایەکی بەفەڕو پیرۆزو گەورەو بەرزیت، داوای لێ خۆشبوونت لێ دەکەم و پەشیمانم و تەوبە دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لای تۆ! (م/د/ت/ن).

**٧٥) پەناگرتن بە خودا لە شەڕی شەیتان: (التعوذ بالله من الشيطان)**

{قَالَ: اللهُ تَعَالَى: فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ – ١٦/٩٦}.

**واتە:** پەنا دەگرم بە خودا لە شەڕی شەیتانی دەرکراوی دوورخراوە لە ڕەحمەتی خودا.

٤٩٥– عَنْ أَبِي سَعِيْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ بِاللَّيْلِ كَبَّرَ. ثُمَّ يَقُولُ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، تَبَارَكَ اسْمُكَ وَتَعَالَى جَدُّكَ وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ ثُمَّ يَقُولَ: اللهُ أَكْبَرُ كَبِيْرَاً ثُمَّ يَقُولُ: أَعُوذُ بِاللهِ السَّمِيعِ الْعَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ مِنْ هَمْزِهِ وَنَفْثِهِ وَنَفْخِهِ. رَوَاهُ أصحاب السُّنن[1].

ئەبو سەعید (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: یاسای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وابوو بە شەو کە هەڵدەسا بۆ شەو نوێژ، لە پێشدا بە گوتنی {الله أكبر} نوێژی دادەبەست، ئینجا نزای سەرەتای نوێژی دەخوێند دەیفەرموو:

{سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ تَبَارَكَ اسْمُكَ وَتَعَالَى جَدُّكَ وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ}.

ئەی خودایە! پاکی و بێ نەنگی هەر بۆتۆیە لەگەڵ سوپاس و ستایش، پیرۆزی و بەرەکەتی ناوی تۆ لە هەموو گێتی دیارە، پایەوشان و شکۆی تۆ

---

(١) قال الترمذي: إنه اشهر حديث في هذا الباب (شرحه).

گەلێ بەرزو بڵندە، تۆ نەبێ هیچ خودایەكی تر نیە ئینجا دەیفەرموو {اللهُ أَكْبَـرُ كَبِيرًا:} خودا لە هەموو كەسێ گەورەترە، ئەو خودایەی من باسی گەورەیی ئەو دەكەم گەلێ گەورەیە ئینجا دەیفەرموو:

{أَعُوذُ بِاللهِ الْسَمِيعِ الْعَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ مِنْ هَمْزِهِ وَنَفْثِهِ وَنَفْخِهِ}.

پەنا دەگرم بەو خودایە كە ئاگای لە هەموو شتێ هەیە، وەخۆم دەهاومە پەنای ئەوێ زاتە ژنەواو دانایە، لە شەڕی شەیتانی بەشبڕاو لە رەحمەتی خودا: لەخۆی، لە دەست لێ وەشاندنی، لە پسەپسی شیعر گوتنی، لە فشەكردنی (د/ت/ن).

٤٩٦- وَأَتَى عُثْمَانَ بْنَ أَبِي الْعَاصِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الشَّيْطَانَ قَدْ حَالَ بَيْنِي وَبَيْنَ صَلاَتِي وَقِرَاءَتِي يَلْبِسُهَا عَلَيَّ. فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَاكَ شَيْطَانٌ يُقَالُ لَهُ خِنْزِبٌ فَإِذَا أَحْسَسْتَهُ فَتَعَوَّذْ بِاللَّهِ مِنْهُ وَاتْفِلْ عَلَى يَسَارِكَ ثَلاَثًا. قَالَ: فَفَعَلْتُ ذَلِكَ فَأَذْهَبَهُ اللَّهُ عَنِّي. رَوَاهُ مُسْلِمٌ فِي الرُّقية[٢].

عوسمانی كوڕی ئەبو عاص (خوای لێ رازی بێ) هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) گوتی:ئەی پێغەمبەری خودا! شەیتان لە نوێژ خوێندنا سەری لێ شێواندووم‌و نوێژەكە تێكەڵ‌و پێكەڵ دەكا پێم پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوە شەیتانێكە ناوی خەنزەبە، هەركاتێ هەستت پێی كرد سێ جار: {أعـوذ بـالله} بكە لێی‌و سێ تفیش بەلای چەپتا بكە. عوسمان گوتی: جا كە ئەوەم كرد ئیتر خودا لە كۆڵی خستم (م).

### ٦) گوتنی ئامین لەپاش فاتیحاوە سوننەتە: (التامين عقب الفاتحة)

٤٩٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا أَمَّـنَ الإِمَامُ فَأَمِّنُوا، فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلاَئِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَـدَّمَ مِـنْ ذَنْبِـهِ. رَوَاهُ

(٢) مسلم: ٥٧٠٢.

الخمسة وَفِي رواية: إِذَا قَالَ: الإِمَامُ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ فَقُولُوا آمِينَ فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ قَوْلُه قَوْلَ الْمَلاَئِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ[1].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: كاتێ پێشنوێژ دەڵێ ئامین، ئێوەش بڵێن ئامین، چونكە هەركەسێ بۆی رێ بكەوێ لەگەڵ گوتنی فریشتەكانا بڵێ ئامین خودا نە گوناهی ئەوەبەری خۆش دەبێ (ش/د/ت/ن) لە گێڕانەوەیەكا: كاتێ پێشنوێژ دەڵێ: {غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ} ئێوەش بڵێن ئامین، چونكە هەركەسێ خوا بۆی رێك بخا لەگەڵ فریشتەكانا ئامین بكا، خودا لە گوناهی لەوەپێشی دەبوورێ.

٤٩٨- وَلِلْبُخَارِيُّ وَلِلنَّسَائِي. إِذَا قَالَ: أَحَدُكُمْ آمِينَ. وَقَالَتِ الْمَلاَئِكَةُ فِي السَّمَاءِ آمِينَ، فَوَافَقَتْ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ[2].

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر یەكێكتان بڵێ ئامین، فریشتەش لە ئاسمان بڵێ ئامین، وە ئەم دوو ئامینە یەك بگرنو خواو راسان رێكەوتی یەكتری بكەن. ئەوە خودا لە گوناهی لەوەبەری خۆش دەبێ (ب/ن).

٤٩٩- وَعَنْهُ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا تَلاَ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ. قَالَ: آمِينَ حَتَّى يَسْمَعُ مَنْ يَلِيهِ مِنَ الصَّفِّ الأَوَّلِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ الترمذي والحاكم وصححه[3].

دیسان ئەو گوتی: یاسای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وابوو كە دەیفەرموو {غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ} بە ئاسپایی دەیفەرموو: ئامین: خودایە! ئەم پاڕانەوەو نزایەمان گیرا بكە حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) ئەوەندە دەنگی لە گوتنی (ئامین هەڵدەبڕی، ئەگەر كەسێ لەڕیزی یەكەمی جەماعەتدا بوایە گوێی لێ دەبوو كە دەیفەرموو ئامین (د/ت/حاكم:ص).

---

(١) بخاري: ٧٨٠ ، ٦٢٠٢. مسلم: ٩١٤. أبو داود: ٩٣٦. ترمذي: ٢٥٠. نسائي: ٩٢٧.

(٢) بخاري: ٧٨١.

(٣) بخاري: ٧٨٢ ، ٤٤٥.

### ٧٧) دوو ئێست سوننەتە: (السكتتان)

٥٠٠- عَنْ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَكْتَتَان حَفِظْتُهُمَا عَنْ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَنْكَرَ ذَلِكَ عِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنٍ وَقَالَ: حَفِظْنَا سَكْتَةً. فَكَتَبْنَا إِلَى أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ بِالْمَدِينَةِ فَكَتَبَ أُبَيٌّ أَنْ حَفِظَ سَمُرَةُ. قَالَ: سَعْدٌ: فَقُلْنَا لِقَتَادَةَ مَا هَاتَانِ السَّكْتَتَانِ؟ قَالَ: إِذَا دَخَلَ فِي صَلاَتِهِ وَإِذَا فَرَغَ مِنَ الْقِرَاءَةِ. ثُمَّ قَالَ: بَعْدَ ذَلِكَ وَإِذَا قَرَأَ (وَلاَ الضَّالِّينَ). رَوَاهُ الترمذي وأبو دَاوُدَ[1].

سەموورە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: ئاگام لەدوو ئێست (سەكتە) هەیە، لە پێغەمبەر خۆیم وەگرتوون، عیمرانی كوڕی حوصەینیش نەیسەلماندو گوتی: ئێمە یەك ئێستمان ئاگا لێیە. جا بۆ چارەسەری ئەم كێشەیە نامەمان نووسی بۆلای ئوبەیی كوڕی كەعب لە مەدینە، نوبەیی وەڵامی نووسیبیەوە: كە سەموورە بە باشی ئاگای لێیەو قسەكەی ئەو تەواوە، سەعد گوتی: بەقەتادەمان گوت ئەو دوو ئێستانە كامانەن؟ گوتی:

یەكەم: لەپاش نوێژدا بەستنە كە لەم ئێستەدا نزای سەرەتای نوێژ بە پەنامەكی دەخوێنێ:

دووەم: لە پاش خوێندنی فاتیحا كە لەم ئێستەدا پێش نوێژ نزایێ یا هەندێ قورئان بە پەنامەكی دەخوێنێ، وە پاشنوێژە كانیش فاتیحای خۆیان بە پەنامەكی دەخوێنن. لەوە دوا قەتادە دەیگوت:

دووەم: كە دەڵێ: {وَلاَ الضَّالِّينَ} (ت/د-س/ح).

### ٧٨) خوێندنی سوورەت لەپاش فاتیحا سوننەتە: (قراءة السورة بعد الفاتحة)

٥٠١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ إِذَا رَجَعَ إِلَى أَهْلِهِ أَنْ يَجِدَ فِيهِ ثَلاَثَ خَلِفَاتٍ عِظَامٍ سِمَانٍ؟ قُلْنَا: نَعَمْ. قَالَ:

---

(١) بسند صحيح (شرحه).

فَثَلاَثُ آيَاتٍ يَقْرَأُ بِهِنَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلاَتِهِ خَيْرٌ لَهُ مِنْ ثَلاَثِ خَلِفَاتٍ عِظَامٍ سِمَانٍ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ[١].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: کەستان حەزدەکەن کە دەڕۆنەوە بۆ ماڵەوە لەوێ سێ وشتری ئاووسی قەبەی قەڵەوتان دەست بکەوێ؟ گوتمان: بەڵێ کێ بێ حەزی لەوە نەبێ ئەی پێغەمبەری نازدار! فەرمووی: دەسا سێ ئایەت لەپاش فاتیحاوە لە نێژدا بخوێنن ئەوە گەلێ باشترە بۆ ئێوە لە سێ وشتری ئاوا (م).

٥٠٢- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ مِنْ صَلاَةِ الظُّهْرِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَسُورَتَيْنِ، يُطَوِّلُ فِي الأُولَى، وَيُقَصِّرُ فِي الثَّانِيَةِ، وَيُسْمِعُ الآيَةَ أَحْيَانًا، وَفِي الْعَصْرِ مِثْلَ ذلِكَ. وَكَانَ يُطَوِّلُ فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى مِنْ صَلاَةِ الصُّبْحِ، وَيُقَصِّرُ فِي الثَّانِيَةِ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ الترمذي[٢].

ئەبو قەتادە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەستووری وابوو لە رکاتی یەکەمو لە رکاتی دووەمی نوێژی نیوەڕۆدا سوورەتی فاتیحاو سوورەتێکی تری دەخوێند، ئەو سوورەتەی کە لە رکاتی یەکەما دەیخوێند، درێژ تربوو لەو سوورەتەی کە لە رکاتی دووەما دەیخوێند. جارجاریش دەنگی ئەوەندە بەرزدەکردەوە کە ئایەتەکە دەبیسترا لە نوێژی عەسریشا هەرواى دەکرد، لە رکاتی یەکەمی بەیانیشا سوورەتی درێژتری دەخوێند لە سوورەتی رکاتی دووەم: (ش/د/ن).

٥٠٣- وَقِيلَ لِخَبَّابٍ بِأَيِّ شَيْءٍ كُنْتُمْ تَعْرِفُونَ قِرَاءَةَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ؟ قَالَ: بِاضْطِرَابِ لِحْيَتِهِ. رَوَاهُ البخاري وأبو دَاوُدَ[٣].

---

(١) مسلم ١٨٦٩.

(٢) بخاري: ٧٥٩ ، ٧٦٢ ، ٧٧٦ ، ٧٧٨ ، ٧٧٩. مسلم: ١٠١٢ ، ١٠١٣ ، أبو داود: ٧٩٨ ، ٧٩٩. نسائي: ٩٧٣ ، ٩٧٤ ، ٩٧٥ ، ٩٧٦ ، ٩٧٧.

(٣) بخاري: ٧٤٦ ، ٧٦٠ ، ٧٦١ ، ٧٧٧.

گوتیان بە خەباب: بە چییا دەتـانزانی کـە پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە نوێژی نیوە ڕۆو عەسردا سوورەت لـەپاش فاتیحـاوە دەخوێنـێ؟ گوتی: بە جووڵانەوەی ریشیا (ب/د).

### ٧٩) باسی ئەو سوورەتانە کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) گەلێ جار لە نوێژی نیوەڕۆو عەسردا دەیخوێندن : (ما قرأه ﷺ في الظهر والعصر)

٥٠٤- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقْـرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ بِالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْبُرُوجِ وَنَحْوِهِمَا مِنَ الـسُّوَرِ. رَوَاهُ أصحاب السنن[١].

جـابیری کـوڕی سـەمووره (خـوای لێ ڕازی بێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسەربێ) لە نوێژی نیوەڕۆو عەسردا سوورەتی {وَالـسَّمآِ وَالطَّـارِقِ} و سـوورەتی {وألـــسماءِ ذَات ألـــبروُجِ} و وێنـــەی ئـەم سـوورەتانەی دەخوێنـد (د/ت/ن-س/ص).

٥٠٥- وَعَنْهُ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْـرَأُ فِـي الظُّهْـرِ بِاللَّيْـلِ إِذَا يَغْشَى وَفِي الْعَصْرِ نَحْوَ ذَلِكَ وَفِـي الـصُّبْحِ أَطْـوَلَ مِـنْ ذَلِـكَ. رَوَاهُ مُـسْلِم وَابُـو دَاوُدَ[٢].

دیـسان گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) لـە نوێــژی نیــوەڕۆدا سـوورەتی {وَاللَّيْـلِ إِذَا يَغْـشَى}ی دەخوێنـد، لـە عەسریـشا سـوورەتێکی لـەم چەشنەی دەخوێند، لە نوێژی بەیانیشا سوورەتێکی لەوە درێژتری دەخوێند (م/د).

٥٠٦- وَعَنْهُ اَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ بَسَبِّحِ أسْمَ رَبِّكَ الأَعْلى وَفِي الصُّبْحِ بأَطْوَلَ مِنْ ذَلِكَ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ[٣].

---

(١) بسند صحيح (شرحه).

(٢) مسلم: ١٠٢٩.

دیسان ئەو گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) گەڵێ جار لە نوێژی نیوەڕۆدا سوورەتی {سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى}ی دەخوێند وە لە نوێژی بەیانیشا سوورەتێکی درێژتری دەخوێند (م).

**٨٠) ئەو سوورەتانەی کە حەزرەت درودی خوای لەسەر لە نوێژی شێوان و خەوتنانا خوێندوونی**

٥٠٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) أَنَّ أُمَّ الْفَضْلِ سَمِعَتْهُ وَهُوَ يَقْرَأُ وَالْمُرْسَلَاتِ عُرْفًا فَقَالَتْ: يَا بُنَيَّ وَاللهِ لَقَدْ ذَكَّرْتَنِي بِقِرَاءَتِكَ هَذِهِ السُّورَةَ إِنَّهَا لَآخِرُ مَا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْرَأُ بِهَا فِي الْمَغْرِبِ[1].

ئیبنو عەباس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ سوورەتی {وَالْمُرْسَلَاتِ عُرْفًا}م دەخوێند، ئوم فەضل گوێی لێبوو، گوتی رۆڵە! بەخودا بەخوێندنی ئەم سوورەتە ئەوەت یاد خستمەوە کە ئەم سوورەتە ئاخرەمین شت بوو گوێم لێبوو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لە نوێژی شێوانا دەیخوێند (ش/د/ت/ن).

٥٠٨- عَنْ جُبَيْرِ بَنِ مُطْعِمٍ (قَالَ:) سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْرَأُ بِالطُّورِ فِي الْمَغْرِبِ. رَوَاهُما الخمسة[2].

جوبەیری کوڕی موطعیم (خوای لێ رازی بێ) گوتی: گوێم لێبوو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لە نوێژی شێوانا سوورەتی {وَالطُّورِ}ی دەخوێند: نیوەی لەرکاتی یەکەماو ئەو نیوەکەی تری لە رکاتی دووەما (ش/د/ت/ن).

٥٠٩- وَصَلَّى ابْنُ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): إِمَامًا فِي الْمَغْرِبِ فَقَرَأَ فِيهَا بِقُلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ. رَوَاهُ ابو دَاوُدَ[3].

---

(٣) مسلم: ١٠٣٠.

(١) بخاري: ٧٦٣ ، ٤٤٢٩. مسلم: ١٠٣٣. أبو داود: ٨١٠. ترمذي: ٣٠٨. نسائي: ٩٨٥.

(٢) بخاري: ٧٦٥ ، ٣٠٥٠ ، ٤٠٢٣ ، ٤٨٥٤. مسلم: ١٠٣٥. أبو داود: ٨١١. نسائي: ٩٨٦.

(٣) سكت عنه الشارح (مترجم).

جارێ ئیبنو مەسعوود (خوای لێ رازی بێ) بەرنوێژیی نوێژی شێوانی دەكرد لەپاش خوێندنی فاتیحا سوورەتی قولهووەڵلای خوێند (د).

٥١٠- عَنْ الْبَرَاءَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَـرَأَ فِـي الْعِشَاءِ بِالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ. فَمَا سَمِعْتُ أَحَدًا أَحْسَنَ صَوْتًا مِنْـهُ. رَوَاهُ الخمـسة إلا أبـا دَاوُدَ[٤].

بەراء (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ گوێم لێبوو لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە نوێژی خەوتنانا سوورەتی {وَالـتِّينِ وَالزَّيْتُـونِ}ی دەخوێند، كەسی ترم نەدیوە كە وەك ئەو ئاوا دەنگی خۆشبێ (ش/ت/ن).

## ٨١) قورئان خوێندنی نوێژی بەیانی

٥١١- عَنْ أَبِي بَرْزَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقْـرَأُ فِي صَلاَةِ الْغَدَاةِ مِنَ السِّتِّينَ إِلَى الْمِائَةِ. رَوَاهُ الشيخان والترمذي[١].

ئەبو بەرزە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە نوێژی بەیانیدا لە شەست ئایەتەوە تا سەد ئایەتی تیا دەخوێند (ش/ت).

٥١٢- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: إِنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَـانَ يَقْرَأُ فِي الْفَجْرِ بِـ (ق وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ) وَكَانَتْ صَلاَتُهُ بَعْدُ تَخْفِيفًـا. رَوَاهُ مُـسْلِمٌ والترمذي[٢].

جـابیری كـوڕی سـەمووره (خـوای لێ رازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) گـەلێ جـار لـە نوێـژی بەیانیـدا سـوورەتی {ق وَالْقُـرْآنِ الْمَجِيـدِ}ی دەخوێنـد، وەلێ زۆرتـری كـات نوێـژێكی سـووكەڵەی پـاكو پـوختی دەكـرد (م/ت).

---

(٤) بخاري: ٧٦٧ ، ٧٦٨ ، ١٠٧٤ ، ١٠٧٨. مسلم: ١٠٣٧. أبو داود: ١٢٢١. ترمذي: ٣١٠.

(١) بخاري: ٧٧١. مسلم: ١٠٣١. نسائي: ٩٤٧.

(٢) مسلم: ١٠٢٧.

٥١٣- عَنْ عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَأَنِّي أَسْمَعُ صَوْتَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الْغَدَاةِ فَلاَ أُقْسِمُ بِالْخُنَّسِ الْجَوَارِ الْكُنَّسِ وَاللَّيْلِ إِذَا عَسْعَسَ. رَوَاهُ ابو دَاوُدَ ومُسْلِمٌ[٣].

عەمری کوڕی حورەیث (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئێستاکەش دەلێی گوێم لە دەنگی پێغەمبەرە (درودی خوای لەسەربێ) کە لە نوێژی بەیانەکیدا ئەو سوورەتەی دەخوێند کە:

{فَلَا أُقْسِمُ بِالْخُنَّسِ الْجَوَارِ الْكُنَّسِ وَاللَّيْلِ إِذَا عَسْعَسَ}ەی تیا دایە کە سوورەتی {إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ – ٥} (د/م).

٥١٤- وَلِلترمذي والحاكم: قَرَأَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الصُّبْحِ بِالوَاقِعَةِ[٤].

گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لە نوێژی بەیانیدا سوورەتی واقیعەی خوێند (ت/حاکم).

٥١٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّائِبِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الصُّبْحَ بِمَكَّةَ فَاسْتَفْتَحَ سُورَةَ الْمُؤْمِنِينَ حَتَّى إِذَا جَاءَ ذِكْرُ مُوسَى وَهَارُونَ أَوْ ذِكْرُ عِيسَى أَخَذَتْهُ سُعْلَةٌ فَرَكَعَ. رَوَاهُ الشيخان[٥].

عەبدوڵڵای کوڕی سائیب (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لە مەککەی موکەڕڕەمە نوێژی بەیانیی بۆ دەکردین، لە سەرەتاوە دەستی کرد بە سوورەتی موئمینوون تا گەیشتە سەر باسی مووسا و هاروون یاخود گەیشتە سەرباسی حەزرەتی عیسا (لەوێدا کۆکەیەك گرتی، ئیتر) قورئانخوێند نەکەی بڕی و چوو بۆ روکووع! (ش).

## ٨٢) دروستە یەك سوورەت لە دوو ڕكاتا دووبارە بكرێتەوە

(٣) مسلم: ١٠٢٣.

(٤) سكت عنه الشارح (مترجم).

(٥) اخرجه البخاري تعليقا قبل الرقم: ٧٧٤م مباشرة مسلم: ١٠٢٢.

**(يجوز تكرير السورة في الركعتين)**

٥١٦– عَنْ رَجُلٍ مِنْ جُهَيْنَةَ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْرَأُ فِي الصُّبْحِ إِذَا زُلْزِلَتِ الأَرْضُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ كِلْتَيْهِمَا فَلاَ أَدْرِي أَنَسِيَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَمْ قَرَأَ ذَلِكَ عَمْدًا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[1].

پیاوێكی جوهەینەیی (خوای لێ رازی بێ) گوتی: گوێم لێبوو كە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەهەردوو ركاتەكەی نوێژی بەیانیدا هەر سوورەتی {إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ}ی خوێند، جا ئەوەیان نازانم كە ئایا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لە بیری چوو بوو كە لە ركاتی یەكەمیشا هەر ئەم سوورەتەی خوێندبوو، یاخود بە ئارەزوو ئاوای كرد (د–س/ص).

## ٨٣) باسی روكووع (چەمینەوە)و ویردو تەسبیحاتی ناو روكووع
## الركوع والتسبيح فيه

٥١٧– رَأَى حُذَيْفَةُ رَجُلاً لاَ يُتِمُّ الرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ فَقَالَ: مَا صَلَّيْتَ، وَلَوْ مُتَّ مُتَّ عَلَى غَيْرِ الْفِطْرَةِ الَّتِي فَطَرَ اللّٰهُ مُحَمَّدًا (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَيْهَا. رَوَاهُ البخاري والنسائي[1].

حوذەیفە (خوای لێ رازی بێ) چاوی لێ بوو كە پیاوێ لە نوێژا چەمینەوەو كوڕنووش (رووكووع‌و سەجدە) تەواو ناكا، لەبەر ئەوە پێی گوت: ئەمە نوێژ نەبوو كەتۆ كردت، خۆ ئەگەر لەسەر ئەم حاڵە بڕۆی هەتا مردن ئەوە بە كافری دەمرێ‌و لەسەر دینی موحەممەد (درودی خوای لەسەربێ) نامرێ كە خودا موحەممەدی دامەزراندووە لە سەری (بوخاری‌و نەسائی – بەهەزاران هەزار رەحمەتی خودایان لێبێ).

٥١٨– عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: لِنَفَرٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَا أَحْفَظُكُمْ لِصَلاَةِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَأَيْتُهُ إِذَا كَبَّرَ جَعَلَ

---

(١) بسند صحيح (شرحه).

(١) بخاري: ٧٩١ باب/ ١١٩ من كتاب مواقيت الصلاة.

يَدَيْهِ حِذَاءَ مَنْكِبَيْهِ، وَإِذَا رَكَعَ أَمْكَنَ يَدَيْهِ مِنْ رُكْبَتَيْهِ، ثُمَّ هَصَرَ ظَهْرَهُ، فَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ اسْتَوَى حَتَّى يَعُودَ كُلُّ فَقَارٍ مَكَانَهُ، فَإِذَا سَجَدَ وَضَعَ يَدَيْهِ غَيْرَ مُفْتَرِشٍ وَلاَ قَابِضِهِمَا، وَاسْتَقْبَلَ بِأَطْرَافِ أَصَابِعِ رِجْلَيْهِ الْقِبْلَةَ، فَإِذَا جَلَسَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ جَلَسَ عَلَى رِجْلِهِ الْيُسْرَى وَنَصَبَ الْيُمْنَى، وَإِذَا جَلَسَ فِي الرَّكْعَةِ الآخِرَةِ قَدَّمَ رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَنَصَبَ الأُخْرَى وَقَعَدَ عَلَى مَقْعَدَتِهِ. رَوَاهُ الخمسة إلاّ مسلماً[٢].

ئەبو حومەیدی ساعیدی (خوای لێ رازی بێ) بەچەن كەسێ لە یارانی پێغەمبەری گوت (درودی خوای لەسەربێ): من لە هەمووتان باشتر ئاگام لێیەتی كە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نوێژی چۆن بوو: سەرنجم دەدا كە ئەڵلاهو ئەكبەری دەكرد، هەر دوو دەستی تا ئاستی هەردوو سەرشانەكانی هەڵدەبڕی، كە روكووعیشی دەبرد هەردوو دەستی لە هەردوو ئەژنۆكانی خۆی گیر دەكرد. وەڕێك پشتی خۆی دەچەماندەوە پشتو ملی خۆی رێك لەیەك ئاست بەبێ كوڕی رادەگرت كە سەرپشتی هەڵدەبڕی لە چەمینەوە رێك هەڵدەسایەوەو فنج رادەوەستایەوە، تا یەك یەك بڕاكەكانی پشتی دەچوونەوە شوێنی خۆیان. كە كوڕنووشیشی دەبرد هەردوو لەپی دەستی دادەنا لەسەر زەوییەكە بەڵام باسكی خۆیی رانەدەخست لەسەر زەوییەكەو كەمێ بەرز دەیگرتن وە نەشی دەنووساندن بە لاتەنیشتی خۆیەوە بەڵكوو هەردووباڵی خۆیی بڵاو دەكردەوە وە سینگی پەنجەكانی هەردوو پێی لە سەرزەوی دادەناو نووكی پەنجەكانی قاچی روویان دەكردە رووگە (قیبلە) لە تەحیاتی یەكەمیشا لەسەر قاچی چەپی دادەنیشتو قاچی راستی هەڵدەنا، لەدوا ركاتیشا پێی چەپی لەژێر خۆیەوە رەت دەكردو لەژێر پێی راستیەوە نووكە كەی دەردەكرد وە پێی راستیشی هەڵ دەناو لەسەر لاڕانی خۆی دادەنیشت (ب/د/ت/ن).

٥١٩- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا رَكَعَ قَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ رَكَعْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَلَكَ أَسْلَمْتُ خَشَعَ لَكَ سَمْعِي وَبَصَرِي وَمُخِّي وَعَظْمِي وَعَصَبِي. رَوَاهُ الخمسة إلاّ البخاريَّ.

---

(٢) بخاري: ٨٢٨.

عەلی (خوای لێ رازی بێ) گوتی: یاسای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وابوو لەناو رووكووعا دەیفەرموو:

{اللّٰهُمَّ لَكَ رَكَعْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَلَكَ أَسْلَمْتُ خَشَعَ لَكَ سَمْعِي وَبَصَرِي وَمُخِّي وَعَظْمِي وَعَصَبِي}.

خودایە! سەری بەندەیی بۆ تۆ دادەنەوێنم و ئەم روكوعەم لەبەر خاتری تۆیە، وە باوەڕم بەتۆ هەیە، وەخۆم سپارد بەتۆ، خودایە! گوێم، چاوم، مۆخم، ئێسكم، رەگ و ڕیشەم هەموو سەركزو ملكەچن بۆ فەرمانی تۆ (م/د/ت/ن).

٥٢٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ: سُبْحَانَكَ اللّٰهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللّٰهُمَّ اغْفِرْ لِي. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ الترمذي[٤].

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: یاسای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وابوو لە چەمینەوەو كوڕنووشدا دەیفەرموو:

{سُبْحَانَكَ اللّٰهُمَّ رَبَّنَا وَبِحَمْدِكَ، اللّٰهُمَّ اغْفِرْ لِي}.

خودایە! تۆ خودایەكی پاك و بێ نەنگیت، ئەی پەروەردگارم! لە سایەی خۆتەوەیە كەمن تەسبیح و سوپاس و ستایشی تۆ دەكەم،، خودایا! لێم خۆشبە (ش/د/ن).

٥٢١- وَعَنْهَا أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ: سُبُّوحٌ قُدُّوسٌ رَبُّ الْمَلاَئِكَةِ وَالرُّوحِ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وأَبُو دَاوُدَ والنسائي[٥].

دیسان گوتی: زۆر جار حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) لە چەمینەوەو كوڕنووشدا دەیفەرموو:

{سُبُّوحٌ قُدُّوسٌ رَبُّ الْمَلاَئِكَةِ وَالرُّوحِ}.

---

(٤) بخاري: ٧٩٤ ، ٨١٧ ، ٤٢٩٣ ، ٤٩٦٧ ، ٤٩٦٨. مسلم: ١٠٨٥. أبو داود: ٨٧٧. نسائي: ١٠٤٦ ، ١١٢١ ، ١١٢٢.

(٥) مسلم: أبو داود ٨٧٢. نسائي: ١٠٤٧ ، ١١٣٣.

بێ نەنگ‌و پاك‌و خاوێنەو پەروەردگاری فریشتەكان‌و جوبرائیلە (م/د/ن).

٥٢٢- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا رَكَعَ أَحَدُكُمْ فَقَالَ: فِي رُكُوعِهِ سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ فَقَدْ تَمَّ رُكُوعُهُ وَذَلِكَ أَدْنَاهُ. وَإِذَا سَجَدَ فَقَالَ: فِي سُجُودِهِ سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى ثَلَاثَ مَرَّاتٍ فَقَدْ تَمَّ سُجُودُهُ وَذَلِكَ أَدْنَاهُ. رَوَاهُ الترمذي وأبو دَاوُدَ[٦].

عەبدوڵڵا (خوای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەر كەسێ لە ئێوە لە ناوچەمینەوەدا سێ جار بڵێ: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ): پاك‌و بێ نەنگە پەروەردگاری گەورەم ئەوە چەمینەوەكەی تەواوە، بەڵام گوتنی سێ جار لای كەمی تەواویی چەمینەوەیە، هەر كەسەیشتان لەناو كوڕنووشدا سێ جار بڵێ: (سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى): پاك‌و بێگەردە پەروەردگاری بەرزو بڵندم ئەوە كوڕنووشەكەی تەواوە، بەڵام گوتنی سێ جار لای كەمی تەواوی ویردی ناو سەجدەیە (ت/د).

## ٨٤) سەربەرزكرنەوە لە چەمینەوەو ستایشی كاتی سەربەرزكردنەوە: الرفع من الركوع والحمد فيه

٥٢٣- عَنْ رِفَاعَةَ بْنِ رَافِعٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا يَوْمًا نُصَلِّي وَرَاءَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَمَّا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرَّكْعَةِ قَالَ: سَمِعَ اللّٰهُ لِمَنْ حَمِدَهُ فَقَالَ: رَجُلٌ وَرَاءَهُ: رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ، حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: مَنِ الْمُتَكَلِّمُ؟ قَالَ: أَنَا قَالَ: رَأَيْتُ بِضْعَةً وَثَلَاثِينَ مَلَكًا يَبْتَدِرُونَهَا، أَيُّهُمْ يَكْتُبُهَا أَوَّلًا. رَوَاهُ الخمسة إلاّ الترمذي[١].

ریفاعەی كوڕی رافع (خوای لێ رازی بێ) گوتی: رۆژێ لە پشتی پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەربێ) نوێژمان دەكرد، كە لەروكوع سەری هەڵبڕی فەرمووی: (سَمِعَ اللّٰهُ لِمَنْ حَمِدَهُ): هەركەسێ سوپاسی خودا بكا بە نیازی پاداشی باش خودا سوپاس‌و نیازەكەی قەبووڵ دەكا، پیاوێكیش لە پشتیەوە بوو گوتی:

---

(٦) قال أبو داود: مرسل، قال الترمذي: منقطع مؤيد بالصحاح. (شرحه).

(١) بخاري: ٧٩٩.

{رَبَّنا وَلَكَ الْحَمْد كَثِيراً طَيِّباً مُبَارَكاً فِيهِ}

پەروەردگارم؟ سوپاسێكی پاكی زۆری پیرۆز بوو تۆ لەسەر ئەوە كە سوپاس و نیازمان گێرادەكەی! جا كە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لە نوێژەكە لێ بۆوە فەرمووی: كێ بوو قسەیەكی ئاوای كرد؟ پیاوەكە گوتی: من بووم. فەرمووی: چاوم لێ بوو زیاتر لە سیی فریشتە پەلاماریان داو قۆستیانەوە، هەرەیەك لەوان پەلەی ئەوەی بوو كە خۆی لە پێشا بینووسێتەوە! (ش/د/ن).

٥٢٤- وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ. قَالَ: اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ. رَوَاهُ البخاري[٢].

یاسای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وابوو كە دەیفەرموو: (سمع الله لمن حمده) بە دویا دەیفەرموو: {اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ} (ب).

٥٢٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا قَالَ: الإِمَامُ سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ. فَقُولُوا اللَّهُمَّ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ. فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ قَوْلُهُ قَوْلَ الْمَلاَئِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ. رَوَاهُ الخمسة[٣].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: كە پێشنوێژ گوتی (سمع الله لمن حمده) ئێوەش بڵێن: (اللهم ربنا ولك الحمد) چونكە هەر كەسێ قسەی ئەوو قسەی فریشتەكان یەك بگرن واتە: بۆی رێ بكەوێ لەگەڵ ئەوانائەم وشە پیرۆزەیە بڵێ، ئەوە خودا لە گوناهی لەوەبەری خۆش دەبێ (ش/د/ت/ن).

٥٢٦- عَنْ عَلِي (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مَنْ الرُّكُعِ قَالَ: سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ مِلْءَ السَّمَوَاتِ وَمِلْءَ الأَرْضِ وَمِلْءَ مَا بَيْنَهُمَا وَمِلْءِ مَا شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ. رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ البخاريَّ

---

(٢) بخاري: ٧٩٥.

(٣) بخاري: ٧٩٦ ، ٣٢٢٨.

وزاد مُسْلِمٌ وأبو دَاوُدَ: أَهْلَ الثَّنَاءِ وَالْمَجْدِ، أَحَقُّ مَا قَالَ: الْعَبْدُ (وَكُلُّنَا لَكَ عَبْدٌ) اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ[٤].

عەلی (خوای لێ رازی بێ) گوتی: هەموو جارێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کەسەری بەرز دەکردەوە لە چەمینەوە دەیفەرمو:

{سَمِعَ اللَّهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ مِلْءَ السَّمَوَاتِ وَمِلْءَ الأَرْضِ وَمِلْءَ مَا بَيْنَهُمَا وَمِلْءِ ما شِئْتَ مِنْ شَيْءٍ بَعْدُ}.

ئەوی ستایش‌و سوپاسی یەزدان بکاو نیازی خۆی عەرزی بارەگای ئەو زاتە بکا ئەوە هەم سوپاسەکەی‌و هەم نیازەکەی گیرایە، پەروەردگارا! کەواتە سوپاسێکی زۆری بێ شومار بۆ تۆ، پڕ بە ئاسمان، پڕ بە زەوی، پڕ بە نێوانی ئەم دوانە، سەرەڕای ئەمانەیش پڕ بەهەرشتێکی تریش سوپاس بۆ تۆبێ کە حەزی تۆی لەسەربێ (م/د/ت/ن) موسلیم‌و ئەبو داوود (رەحمەتی خودایان لێبێ) ئەمەشیان لێ زیاد کردووە:

{أَهْلَ الثَّنَاءِ وَالْمَجْدِ، أَحَقُّ مَا قَالَ: الْعَبْدُ (وَكُلُّنَا لَكَ عَبْدٌ) اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ}.

ئەی کەسێ کە شایستەی هەموو ستایش‌و گەورەیی یەکێ! دروستترین وشەیێ کە یەکێ لە ئێمە بیڵێ (کە هەموومان بەندەی تۆین) وشەی ئەو بەندەیەیە کە دەڵێ:

{اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ}.

خودایە! هەرچی تۆ بیدەی بە کەسی تر نابڕێ، هەرچیش تۆنەیدەی بە کەسی تر نادرێ، دارایی داراو دەستداریی دەستدار هیچ دادێکیان نادەن لەلای تۆ.

٥٢٧- (ب – ١ ز – ٨٣ ژمارە: ٥١٩)[٥].

---

(٤) مسلم: ١٠٧٢ ، ١٠٧٣. أبو داود: ٨٤٧. نسائي: ١٠٢٧.

(٥) تقدم تخريجه بمثل الحديث الرقم: ٥١٩/٢.

## ٨٥) باسی کوڕنووش (سەجدە)و ستایشی ناوی (السجود والتسبیح فیه)

٥٢٨- عَنْ وَائِلِ بْنِ حُجْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا سَجَدَ وَضَعَ رُكْبَتَيْهِ قَبْلَ يَدَيْهِ وَإِذَا نَهَضَ رَفَعَ يَدَيْهِ قَبْلَ رُكْبَتَيْهِ. رَوَاهُ أصحاب السنن[١].

وائیلی کوڕی حوجر (خوای لێ رازی بێ) گوتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەستووری وابوو کە کوڕنووشی دەبرد ئەژنۆی لەپێش دەستیا دادەنا، کە هەڵیش دەسایەوە سەرپێ دەستی لەپێش ئەژنۆیا بەرز دەکردەوە (د/ت/ن-س/ح).

٥٢٩- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اعْتَدِلُوا فِي السُّجُودِ، وَلاَ يَبْسُطْ أَحَدُكُمْ ذِرَاعَيْهِ انْبِسَاطَ الْكَلْبِ. رَوَاهُ الخمسة[٢].

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: کەسەر لە سەجدە هەڵدەبڕن پشتتان رێك راست بکەنەوە، لەناو سەجدەشدا لە چەشنی سەگ لەسەر دەم رابکشێ ئاوا باڵتان لەسەر زەوییەکە رامەخەن (ش/د/ت/ن).

٥٣٠- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ بُحَيْنَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ إِذَا صَلَّى فَرَّجَ بَيْنَ يَدَيْهِ حَتَّى يَبْدُوَ بَيَاضُ إِبْطَيْهِ. رَوَاهُ الشيخان. وفي رواية: كَانَ إِذَا سَجَدَ جَافَى بَيْنَ يَدَيْهِ حَتَّى لَوْ أَنَّ بَهْمَةً أَرَادَتْ أَنْ تَمُرَّ تَحْتَ يَدَيْهِ مَرَّتْ[٣].

عەبدوڵڵای کوڕی بوجەینە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کە نوێژی دەکرد لەکاتی کوڕنووشدا هەر دوو باڵی خۆی بڵاو دەکردەوە، تەنانەت جاروبار سپینەی بنباخەڵی دەردەکەوت (ش) لە

---

(١) بسند حسن (شرحه).

(٢) بخاري: ٨٢٢ ، مسلم: ١١٠٢. أبو داود: ٨٩٧ ، ترمذي: ٢٧٦. نسائي: ١١٠٩.

(٣) بخاري: ٣٩٠ ، ٨٠٧ ، ٣٥٦٤ ، ١١٠٥. مسلم: ١١٠٥ ، ١١٠٦ ، ١١٠٧. نسائي: ١١١٠٥. أبو داود: ٨٩٨.

گێڕانەوەیەکدا: کە سوژدەی دەبرد وەها هەر دووباڵی خۆی بڵاو دەکردەوە کاروبەرخیان بەژێردا دەچوو.

٥٣١- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَيَضَعُ أَحَدُنَا طَرَفَ الثَّوْبِ مِنْ شِدَّةِ الْحَرِّ فِي مَكَانِ السُّجُودِ. رَوَاهُ الخمسة[٤].

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: زۆر جار کە لەپشتی پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەربێ) نوێژمان دەکرد، لەتاو تینی گەرما چمکی جلەکانمان لە جێگە کوڕنووشەکەدا دادەنا (ش/د/ت/ن).

٥٣٢- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا سَجَدَ قَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَلَكَ أَسْلَمْتُ سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ تَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ. رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ البخاريَّ[٥].

عەلی (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لە کوڕنووشدا دەیفەرموو:

{اللَّهُمَّ لَكَ سَجَدْتُ وَبِكَ آمَنْتُ وَلَكَ أَسْلَمْتُ سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَصَوَّرَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ تَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ}.

ئەی خودا! سەری بەندەیی بۆ تۆ دەنێمە سەر زەوی بڕوام هەیە بەتۆ، خۆم سپارد بەتۆو ملکەچی فەرمانی تۆم، روخسارم دەنێمە سەر خاكو کوڕنووشی بەندەیی دەبەم بۆ ئەو خودایە کە ئەم روخسارەی منی دروست کردووەو شەقڵو نەخشو وێنەی کێشاوەو گوێچکەو چاوی پێوە داتەراشیوە، دیارە کە یەزدان خودایەکی پاكو پیرۆزو گەورەیەو جوانترین کردگارە! (م/د/ت/ن).

٥٣٣- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ صَلَّى مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَكَانَ يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ: سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ. وَفِي سُجُودِهِ: سُبْحَانَ رَبِّيَ الأَعْلَى. وَمَا مَرَّ

---

(٤) بخاري: ٣٨٦ (٣٨٥)، ٥٨٥٠. مسلم: ١٤٠٦. أبو داود: ٦٦٠. ترمذي: ٥٨٤. نسائي: ١١٥. ابن ماجه: ١٠٣٣.

(٥) مسلم: ١٨٠٩. أبو داود: ٧٤٤ ، ٧٦٠، ٧٦١، ١٥٠٩. ترمذي: ٢٦٦ ، ٣٤٢١، ٣٤٢٢. نسائي: ٨٩٦ ، ١٠٤٩ ، ١١٢٥.

بِآيَةِ رَحْمَةٍ إِلاَّ وَقَفَ عِنْدَهَا فَسَأَلَ وَلاَ بِآيَةِ عَذَابٍ إِلاَّ وَقَفَ عِنْدَهَا فَتَعَوَّذَ. رَوَاهُ ابو دَاوُدَ والترمذي(٦).

حوذەیفە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: نوێژم دەكرد لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەربێ) لە چەمینەوەدا دەیفەرموو: (سبحان ربي العظيم: پاكو بێگەردو بێ نەنگە پەروەردگاری گەورەم) لە كوڕنووشیشدا دەیفەرموو: (سبحان ربي الاعلي: پاكو بێگەردو بێ نەنگە پەروەردگاری بڵندم) كە دەشگەیشتە سەر ئایەتی رەحمەت لەسەری دەوەستاو دەپاڕایەوەو لە خودا داوای بەشی لەو رەحمەتە دەكرد، كە دەشگەیشتە سەر ئایەتی سزاو عەذاب لەسەری رادەوەستاو پەنای دەگرت بە پەنای خودا لەو سزاو عەزابە (د/ت-س/ص).

٥٣٤- وَلَمَّا نَزَلَ: (فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ) قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اجْعَلُوهَا فِي رُكُوعِكُمْ. فَلَمَّا نَزَلَتْ (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى) قَالَ: اجْعَلُوهَا فِي سُجُودِكُمْ. رَوَاهُ أبو دَاوُدَ وأحمد(٧).

گوتی: كاتێ {فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ - ٦٩/٥٢} واتە: كەواتە ئەی پێغەمبەر؟ تۆش هەمیشە تەسبیحی خودای گەورەی خۆت بكە كاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: (بیكەن بە ذیكری روكوعتان واتە: لەناو روكوعدا بڵێن: سُبْحَانَ رَبِّيَ أَلْعَظِيمَ) وە كاتێ ئایەتی (سَبِّحِ أسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى - ١/٨٧) واتە: ناوی پیرۆزی پەروەردگاری بڵندی خۆت بە پاكو تەمیز رابگرە هاتە خوارەوە، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بیكەن بەذیكری كوڕنووشتان واتە: لەناو سەجدەدا، بڵێن: سُبْحَانَ رَبِّي الأَعْلَى (د/ ئەحمەد).

٥٣٥- عَنِ عَلِيّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَانِي حِبِّي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ أَقْرَأَ الْقُرْآنَ رَاكِعًا أَوْ سَاجِدًا. رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ البخاريَّ(٨).

---

(٦) بسند صحيح (شرحه).

(٧) سكت عنه الشارح (مترجم).

عەلی (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەری خۆشەویستم (درودی خوای لەسەربێ) فەرمانی پێ کردم کە لەناو روکوع و سەجدەدا قورئان نەخوێنم (م/د/ت/ن).

٥٣٦- (ب – ١ ز – ٨٣ ژمارە/ ٥١٨/٢).

٥٣٧- (ب – ١ ز – ٨٣ ژمارە: ٥١٨/٢.

٥٣٨- (ب – ١ ز ٨٣ ژمارە: ٥٢١/٥).

٥٣٩- (ب – ١ ز – ٨٣ ژمارە: ٥٢٢/٦).

## ٨٦) نزاو پاڕانەوە لە کوڕنووشا گیرایە

٥٤٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الْعَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وَهُوَ سَاجِدٌ فَأَكْثِرُوا الدُّعَاءَ فَقِمِنٌ أَنْ يُسْتَجَابَ لَكُمْ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وأبو دَاوُدَ[1].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هیچ کاتێ بەندە وەك کاتی ناو سەجدە لە خوداوە نزیك نابێتەوە، کەواتە لەو کاتەدا دوعاو نزا زۆر بکەن، جێگەی خۆیەتی کە پاڕانەوەکەتان قەبوڵ بکرێ (م/د).

٥٤١- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقُولُ فِي سُجُودِهِ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي كُلَّهُ دِقَّهُ وَجِلَّهُ وَأَوَّلَهُ وَآخِرَهُ وَعَلاَنِيَتَهُ وَسِرَّهُ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وأبو دَاوُدَ[2].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەناو کوڕنووشا دەیفەرموو: {اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي كُلَّهُ دِقَّهُ وَجِلَّهُ وَأَوَّلَهُ وَآخِرَهُ وَعَلاَنِيَتَهُ وَسِرَّهُ}.

خودایە! لە هەموو گوناهەکانم خۆش ببە: لە وردی و لە درشتی، وە لە پێشینی و پاشینی، وە لە ئاشکرای و پەنهانی (م/د).

---

(٨) مسلم: ١٠٧٦ – ١٠٨١. أبو داود: ٤٠٤٤ ، ٤٠٤٥ ، ٤٠٤٦. ترمذي: ١٧٣٧. نسائي: ١٠٤٣.

(١) مسلم: ١٠٨٣. نسائي: ١١٣٦.

(٢) مسلم: ١٠٨٤. أبو داود: ٨٧٨.

٥٤٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ أللهُ عَنْهُا) قَالَتْ: فَقَدْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) لَيْلَةً مِنَ الْفِرَاشِ فَالْتَمَسْتُهُ فَوَقَعَتْ يَدِى عَلَى بَطْنِ قَدَمَيْهِ وَهُوَ فِى الْمَسْجِدِ وَهُمَا مَنْصُوبَتَانِ وَهُوَ يَقُولُ: اللّٰهُمَّ أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ وَبِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ، لاَ أُحْصِى ثَنَاءً عَلَيْكَ أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ. رَوَاهُ الخمسة إلاّ البخاري[٣].

**عائیشە** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: شەوێ لە سەرنوێن پێغەمبەرم** (درودی خوای لەسەربێ) **لێ ون بوو، كە لەپم كوتا بۆی دەستم كەوت لەبەری پێكانی، لە كوڕنووشابوو، هەردوو پێی هەڵنابوون، دەیفەرموو:**

**{اللّٰهُمَّ أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ وَبِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ، لاَ أُحْصِى ثَنَاءً عَلَيْكَ أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ}.**

**خودایە! پەنا دەگرم بە ڕەزامەندیی تۆ لە خەشم و قاری تۆ، وە پەنا دەگرم بەچاو پۆشینی تۆ لە تۆڵە سەندنی تۆ، وە پەنا دەگرم بە خۆت لە خۆت، وەسپ و ثەنا خونیی تۆ لە كێشی منا نیەو سوپاس و ستایشی تۆ بەكەس نابژێرێ، ئەوە مەگەر هەر بەخۆت بكرێ** (م/د/ت/ن).

## ٨٧) دانیشتنی نێوانی دوو سەجدەو ستایشی ناوی
## (الجلوس بين السجدتين والدعاء فيه)

٥٤٣- عَنِ الْبَرَاءِ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رُكُوعُ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) وَسُجُودُهُ وَإِذَا رَفَعَ مِنَ الرُّكُوعِ وَبَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ، قَرِيبًا مِنَ السَّوَاءِ. رَوَاهُ الخمسة[١].

**بەڕرا** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: ماوەی روكووع و سەجدەو پشت راستكردنەوە لە روكوع و دانیشتنی نێوانی دوو سەجدەكانی پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **لە یەكترەوە گەلێ نزیك بوون** (ش/د/ت/ن).

---

(٣) مسلم: ١٠٩. أبو داود: ٨٧٩. نسائي: ١٦٩ ، ١٠٩٩.

(١) بخاري: ٧٩٢ ، ٨٠١ ، ٨٢٠. مسلم: ١٠٥٧. أبو داود: ٨٥٢ ، ٨٥٤. ترمذي: ٢٧٩ ، ٢٨٠ نسائي: ١٠٦٤ ، ١١٤٧ ، ١٣٣١.

٥٤٤- عَنْ طَاوُسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قُلْنَا لابْنِ عَبَّاسٍ فِي الإِقْعَاءِ عَلَى الْقَدَمَيْنِ قَالَ: هِيَ السُّنَّةُ. فَقُلْنَا: إِنَّا لَنَرَاهُ جَفَاءً بِالرَّجُلِ. قَالَ: بَلْ هِيَ سُنَّةُ نَبِيِّكُمْ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رَوَاهُ الترمذي ومُسْلِمٌ وأبو دَاوُدَ[٢].

طاووس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: بۆ دانیشتن بە چیچکانەوە لەسەر هەردوو قنگە پاژنەی پێ لەکاتی دانیشتنی نێوانی دوو سەجدەکانا لە ئیبنو عەبباسمان پرسی، گوتی: ئەوە سونەتە، گوتمان: خۆ ئێمە وامان دادەنا کە ئەو، نیشانەی بێ وێڵییە بۆ پیاو، گوتی: نا، بەڵکوو ئەوە سوننەتی پێغەمبەرەکەتانە (درودی خوای لەسەربێ) (ت/م/د).

٥٤٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي وَعَافِنِي وَاهْدِنِي وَارْزُقْنِي. رَوَاهُ أبو داود واترمذي[٣].

ئیبنو عەباس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: یاسای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وابوو لە دانیشتنی نێوانی دوو کوڕنووشەکاندا دەیفەرموو:

{اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي وَعَافِنِي وَاهْدِنِي وَارْزُقْنِي}.

خودایە! لێم خۆشبەو رەحمم پێ بکەو ئاسوودەو بێ وەیم بکەو شارەزای رێی راستم بکەو رزق و رۆژیم بدە (د/ت - سند غريب).

## ٨٨) دانیشتنی وچان: (جلسة الاستراحة)

٥٤٦- عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّى لَنَا مَالِكُ بْنُ الْحُوَيْرِثِ صَلاَةَ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَكَانَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ السَّجْدَةِ الآخِرَةِ فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى قَعَدَ ثُمَّ قَامَ. رَوَاهُ الخمسة إلا مسلماً ولفظ البخاري: وَكَانَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ عَنِ السَّجْدَةِ الثَّانِيَةِ جَلَسَ وَاعْتَمَدَ عَلَى الأَرْضِ، ثُمَّ قَامَ[١].

---

(٢) مسلم: ١١٩٨. أبو داود : ٨٤٥. ترمذي: ٢٨٣.

(٣) وقال إنه غريب (شرحه).

(١) بخاري: ٨٢٤.

ئەبو قیلابە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: مالیکی کوڕی حوەیریث لە چەشنی نوێژکردنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئاوا نوێژی بۆ دەکردین، هەموو جارێ کە سەری بەرز دەکردەوە لە کوڕنووشی دووەم لە ڕکاتییەکەم کەمێ دا ئەنیشت ئینجا هەڵدەسایەوە سەرپێ (ب/د/ت/ن) گفتەی بوخاری ئاوایە: هەموو جارێ کەسەری بەرزدەکردەوە لە کوڕنووشی دووەمی ڕکاتی یەکەم یا لە کوڕنووشی دووەمی ڕکاتی سێیەمی نوێژی چوار ڕکاتی تۆزێ دادەنیشت لەسەر عەردەکە، ئینجا هەڵدەسایەوە سەرپیا.

## ٨٩) تەحیاتی یەکەمو شێوەی دانیشتنی ناو نوێژ:

## (التشهد الأول وهيئة الجلوس في الصَّلاة)

٥٤٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَفْتَتِحُ الصَّلاَةَ بِالتَّكْبِيرِ وَالْقِرَاءَةَ بِالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، وَكَانَ إِذَا رَكَعَ لَمْ يُشْخِصْ رَأْسَهُ وَلَمْ يُصَوِّبْهُ وَلَكِنْ بَيْنَ ذَلِكَ وَكَانَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ لَمْ يَسْجُدْ حَتَّى يَسْتَوِيَ قَائِمًا وَكَانَ إِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ السُّجُودِ لَمْ يَسْجُدْ حَتَّى يَسْتَوِيَ قَاعِدًا، وَكَانَ يَقُولُ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ: التَّحِيَّاتُ، وَكَانَ إِذَا جَلَسَ يَفْرِشُ رِجْلَهُ الْيُسْرَى وَيَنْصِبُ رِجْلَهُ الْيُمْنَى، وَكَانَ يَنْهَى عَنْ عَقِبِ الشَّيْطَانِ وَعَنْ فِرْشَةِ السَّبُعِ وَكَانَ يَخْتِمُ الصَّلاَةَ بِالتَّسْلِيمِ. رَوَاهُ أبو داود ومسلم[1].

عائیشە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: هەمیشە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نوێژی بە ئەڵڵاهو ئەکبەر دادەبەست، قورئانخوێندنی بە سوورەتی (الحمد لله رب العالمين)ە دەست پێ دەکرد، لە چەمینەوەشا نە سەری قیت دەگرتو نە

(١) مسلم: ١١١٠ ، أبو داود: ٧٨٣.

ملی شۆڕ دەكردەوە، بەڵام سەرو ملو پشتی خۆی ڕێك دەگرت لەیەك ئاست وەك دووخ وە هەمیشە كە سەری لە چەمینەوە هەڵدەبڕی ڕێك ڕادەوەستایەوەو پشتی خۆی بە تەواوی ڕاست دەكردەوە ئەوجا دادەنەوی بۆ كوڕنووش، وە هەروەها كە سەریشی بەرز دەكردەوە لە كوڕنووشی یەكەم قنج دادەنیشت ئەوسا كوڕنووشی دووەمی دەبرد، وە لە هەموو دوو ركاتێكیشدا تەحیاتی دەخوێند، هەمیشە كە داشدەنیشت پێی چەپی ڕادەخستو پێی ڕاستی هەڵدەناو لەسەریان دادەنیشت. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نەهی دەكرد لە قنگەڵتس لە تەحیاتا، وە هەروەها نەهی دەكرد لە ڕاخستنی باڵ لەسەر زەوی لەناو كوڕنووشا لە چەشنی ڕاكشانی دڕندە لەسەر دەم، وە هەمیشەیش دوایی نوێژی دەهێنا بەسڵاودانەوە (د/م).

٥٤٨- عَنْ ابْنُ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهُمَا) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ إِذَا جَلَسَ فِي الصَّلاَةِ وَضَعَ كَفَّهُ الْيُمْنَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُمْنَى وَقَبَضَ أَصَابِعَهُ كُلَّهَا وَأَشَارَ بِإِصْبَعِهِ الَّتِي تَلِي الإِبْهَامَ وَوَضَعَ كَفَّهُ الْيُسْرَى عَلَى فَخِذِهِ الْيُسْرَى. رَوَاهُ الخمسة إلا البخاري[٢].

ئیبنو عومەر (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) زۆر جار كە لە تەحیاتا دادەنیشت لەپی ڕاستی دادەنا لەسەر ڕانی ڕاستیو گشت پەنجەكانی دەنووقاند، پەنجەی شایەتمانی نەبێ، بەڵام پەنجەی شایەتمانی بەرەڵا دەكردو لەكاتی گوتنی وشەی (الا الله)ی ناو شایەتیمانا بەرزی دەكردەوە، وە لەپی چەپیشی لەسەر ڕانی چەپی دادەنا (م/د/ت/ن).

٥٤٩- وَلأصحاب السنن: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) إِذَا جَلَسَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ الأُولَيَيْنِ كَأَنَّهُ عَلَى الرَّضْفِ حَتَّى يَقُومَ[٣].

---

(٢) مسلم: ١٣٠٨، ١٣٠٧، ١٣٠٩. ترمذي: ٢٩٤. نسائي: ١٢٦٨. أبو داود: ٩٨٨.

(٣) بسند حسن (شرحه).

گـوتی: پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەربێ) لـە دانیـشتنی تـەحیاتی یەكـەما ئەوەنـدە بـە پەلـەبوو دەتگـوت لەسـەر تـاوێری داخـە، لـەپاش كـەمێ هەڵدەسایەوە (د/ت/ن-س/ح).

## ٩٠) كردنی نوێژ بەجوانیو بەسەركزی لەگەڵ دڵ پێدانا (الخشوع في الصلاة وتحسينها)

٥٥٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: هَلْ تَرَوْنَ قِبْلَتِي هَا هُنَا وَاللَّهِ مَا يَخْفَى عَلَيَّ رُكُوعُكُمْ وَلاَ خُشُوعُكُمْ، وَإِنِّي لأَرَاكُمْ مِنْ وَرَاءَ ظَهْرِي[1].

ئـەبو هـورەیرە (خـوای لێ رازی بـێ) گـوتی: حـەزرەت (درودی خـوای لەسـەربێ) فەرمووی: لە ئێوە وایـە كـەمنیش وەك ئێوە هـەر رووی قیبلـە دەبینمو بـەس، بـەخودا ئاگـام لـە روكـوعو خوشـوعتانە، بـەخودا لـە پـشتی سەریـشمەوە بـە باشی دەتان بینم (ش).

٥٥١- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَتِمُّوا الرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ، فَوَاللَّهِ إِنِّي لأَرَاكُمْ مِنْ بَعْدِ ظَهْرِي إِذَا رَكَعْتُمْ وَإِذَا سَجَدْتُمْ. رَوَاهُمَا الشيخان[2].

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێ) جارێ فـەرمووی: چەمینەوەو كوڕنوشتان تەواو بكـەن، بـەخودا لەپشت سەریشمەوە بەباشی چاوم لێتانە كاتێ كە دانەوینەوە بۆ چەمینەوە یا بۆ كوڕنووش (ش).

٥٥٢- وَلِمُسْلِمٍ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمًا ثُمَّ انْصَرَفَ فَقَالَ: يَا فُلاَنُ أَلاَ تُحْسِنُ صَلاَتَكَ أَلاَ يَنْظُرُ الْمُصَلِّي إِذَا صَلَّى كَيْفَ يُصَلِّي فَإِنَّمَا يُصَلِّي لِنَفْسِهِ إِنِّي وَاللَّهِ لأُبْصِرُ مَنْ وَرَائِي كَمَا أُبْصِرُ مَنْ بَيْنَ يَدَيَّ[3].

---

(١) بخاري: ٤١٨ ، ٧٤١. مسلم: ٩٥٧.

(٢) بخاري: ٧٤٢. مسلم: ٩٥٨.

گوتی: ڕۆژێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەپاش لێبوونەوە لە نوێژ بە پیاوێکی فەرموو: ئەی فلان! بۆ نوێژەکەت بەجوانی ناکەی! نوێژکەر کە نوێژ دەکا دەبێ سرنج بدا کە چۆن نوێژ دەکا، چونکە خاس و خراپی نوێژەکەی هەر بۆ خۆیەتی، سوێند بەخودا من چۆن لەبەردەممەوە شت دەبینم ئاوەها لەپشتی سەریشمەوە شت دەبینم (م).

٥٥٣- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تُجْزِئُ صَلاَةُ الرَّجُلِ حَتَّى يُقِيمَ ظَهْرَهُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ(٤).

ئەبو مەسعوود (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: نوێژی کەس دروست نیە، هەتا تەواوپشتی لە چەمینەوەو کوڕنووش ڕاست نەکاتەوە (د/ت/ن-س/ص).

٥٥٤- عَنْ مُطَرِّفٍ عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي وَفِي صَدْرِهِ أَزِيزٌ كَأَزِيزِ الرَّحَى أوِ الْمِرجَلِ مِنَ الْبُكَاءِ. رَوَاهُما أصحاب السنن(٥).

موطەرریف (خوای لێ رازی بێ) گوتی: باوکم گوتی: (خوای لێ رازی بێ) پێغەمبەرم دی (درودی خوای لەسەربێ) نوێژی دەکرد، لەناو نوێژەکەدا لەبەر کوڵی گریان دەنگی سینگی دەتگوت ویزەی ئاشە، یا گیزەی مەنجەڵە (د/ت/ن-س/ص).

٥٥٥- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِي (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ فَيُحْسِنُ الْوُضُوءَ وَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ يَقْبِلُ بَقَلْبِهِ وَوَجْهِهِ عَلَيْهِماَ إلاَّ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ(٦).

عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنی (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ بە جوانی دەسنوێژێ بگرێ وە دوو رکات نوێژ بەدڵ و بەداو بۆ خودا بکا بەهەشت مسۆگەر دەکا بۆ خۆی (د).

---

(٣) مسلم: ٩٥٦. نسائي: ٨٧١.

(٤) رواه اصحاب السنن بسند صحيح (شرحه).

(٥) رواه أصحاب السنن بسند حسن (شرحه).

(٦) رواه أبو داود.

٥٥٦- عَنْ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ (رَضِيَ أَللهُ عَنْهُماَ) عَنِ النَّبِـيِّ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الرَّجُلَ لَيَنْصَرِفُ -أَيْ مِنْ صَلاَتِهِ - وَمَا كُتِبَ لَهُ إِلاَّ عُشْرُهَا تُسْعُهَا ثُمُنُهَـا سُبُعُهَا سُدُسُهَا خُمُسُهَا رُبُعُهَا ثُلُثُهَا نِصْفُهَا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[٧].

عەماری کوڕی یاسیر (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەندێ کەس کە لە نوێژ دەبێتەوە پاداشی نوێژەکەی بە تەواوی بۆ نانووسرێ: هەیە دەیەکی پاداشەکەی بۆ دەنووسرێ، هەیە نۆیەکی هەیە هەشتیەکی، هەیە حەوت یەکی، هەسە شەش یەکی، هەیە پێنج یەکی، هەیە چواریەکی، هەیە سێ یەکی، هەیە نیوەی!(د).

٥٥٧- عَنِ الْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) قَـالَ: الصَّلاَةُ مَثْنَى مَثْنَى، تَشَهَّدُ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ وَتَخَشَّعُ وَتَضَرَّعُ وَتَمَسْكَنُ وَتُقْنِعُ يَدَيْكَ (يَقُولُ تَرْفَعُهُمَا) إِلَى رَبِّكَ مُسْتَقْبِلاً بِبُطُونِهِمَا وَجْهَكَ وَتَقُولُ يَا رَبِّ يَا رَبِّ وَمَنْ لَمْ يَفْعَلْ فَهِيَ خِدَاجٌ. رَوَاهُ أصحاب السنن[٨].

فەضلی کوڕی عەباس (خوایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فـەرمووی: نوێـژی سـوننەت دوو ركـات دوو ركاتـە، لـە هـەموو دووركاتێكـا تەحيات دەخوێنی، سەر كزدەگری و بەكوڵ دەلاڵێیتەوە لە خوداو خۆت كزۆڵە دەگريـت و دەسـت پـان دەكەيتـەوە لـە پـەروەردگارت. واتـە: دەستەكانت بـەرز دەكەيتـەوەو لـە خـودا دەپاڕێيتـەوە. وە بـەری دەستت دەكەيتـە ڕووی خـۆت و دەڵێی: ئەی خودايە! ئەی پەروەردگارم! ئيتر ئـەوەی وا نـەكا ئـەوە نوێژەكـەی ناتەواوە (د/ت/ن-س/ص).

---

(٧) سكت عنه الشارح (مترجم).

(٨) بسند صحيح (شرحه).

## ٩١) کام کرداری نوێژ خێری زۆرترە: (أي أعمال الصلاة أفضل)

٥٥٨- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سُئِلَ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَيُّ الصَّلَاةِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: طُولُ الْقُنُوتِ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ والترمذي وأبو دَاوُدَ وَلفظه: سُئِلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَيُّ الأَعْمَالِ أفْضَل؟ فقَالَ: طُولُ الْقِيَامِ[1].

جابیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پرسیار کرا لە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ): کامەی نوێژ خێری زۆرترە؟ فەرمووی: بەپێوە راوەستانی دوورو درێژ (م/ت/د) گفتەی ئەبو داوود ئاوایە: پرسیار کرا لە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ): چ کارێ پاداشی گەورەترە؟ فەرمووی: بەپێوە راوەستانی زۆر لەناو نوێژدا!

## ٩٢) قونووت خوێندنی ناو نوێژ: (القنوت في الصلاة)

٥٥٩- عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقْنُتُ فِي الصَّبْحِ وَالْمَغْرِبِ. رَوَاهُ الخمسة[1].

بەر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) زۆرجار لە نوێژی بەیانی و نوێژی شێوانا قونووتی دەخوێند (ش/د/ت/ن).

٥٦٠- وَقِيلَ لأَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): هَلْ قَنَتَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ؟ قَالَ: نَعَمْ بَعْدَ الرُّكُوعِ يَسِيرًا. رَوَاهُ الخمسة. وفي رواية: قَنَتَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعْدَ الرُّكُوعِ شَهْرَاً يَدْعُو على قَاتِلِي الْقُرَّاءِ[2].

گوترا بە ئەنەس (خوای لێ رازی بێ): ئایا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لە نوێژی بەیانیدا قونووتی دەخوێند؟ گوتی: بەڵێ لەپاش روکووع بۆ ماوەی چەن رۆژێ خوێندی (ش/د/ن) لە گێڕانەوەیەکا: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ)

---

(١) مسلم: ١٧٦٥ ، ١٧٦٦.

(٢) بخـــاري: ١٠٠١ ، ١٠٠٢ ، ١٠٠٣ ، ١٣٠٠ ، ٢٨٠١ ، ٢٨١٤ ، ٣٠٦٤ ، ٣١٧٠ ، ٤٠٨٨ ، ٤٠٨٩ ، ٤٠٩٠ ، ٤٠٩١ ، ٤٠٩٢ ، ٤٠٦٤ ، ٤٠٩٥ ، ٤٠٩٦ ، ٦٣٩٤ ، ٧٣٤١. مسلم: ١٥٤٤ — ١٥٥٠. أبو داود: ١٤٤٤. نسائي: ١٠٧٠.

لـەپاش روكـووع تامـاوەی مانگـێ قونـووتی دەخوێنـد نـزای شـەڕی لـە بكوژەكانی قورئانخوێنەكان دەكرد.

٥٦١- وَقَالَ: أَبُو هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) وَاللّٰهِ لأُقَرِّبَنَّ بِكُمْ صَلاَةَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَكَانَ أَبُو هُرَيْرَةَ يَقْنُتُ فِي الظُّهْرِ وَالْعِشَاءِ الآخِرَةِ وَصَلاَةِ الصُّبْحِ وَيَدْعُو لِلْمُؤْمِنِينَ وَيَلْعَنُ الْكُفَّارَ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وأبو دَاوُدَ والنسائي[٣].

ئەبو هـورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گـوتی: بەخودا كە بەرنوێـژیتان بۆ دەكەم نزیكـی دەكەمـەوە لـە نوێـژكردنی پێغەمبـەر خۆیـەوە (دروودی خـوای لەسـەربێ) دەسـتووری ئـەبو هـورەیرە وابـوو لـە نوێـژی نیـوەڕۆو خـەوتنانو بەیانیـدا قونووتی دەخوێندو نزای چاكەی بۆ موسوڵمانان دەكردو نەفرینو لەعنەتی لەبێ بڕوایان دەكرد (م/د/ن).

٥٦٢- وَعَنْهُ أَنَّ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقُولُ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ بَعْدَ رَبَّنَا وَلَك وَلَكَ الْحَمْدُ فِي اُلْرَكْعَةِ اْلآخِرَةِ: اللّٰهُمَّ أَنْجِ الْوَلِيدَ بْنَ الْوَلِيدِ وَسَلَمَةَ بْنَ هِشَامٍ وَعَيَّاشَ بْنَ أَبِي رَبِيعَةَ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اللّٰهُمَّ اشْدُدْ وَطْأَتَكَ عَلَى مُضَرَ وَاجْعَلْهَا عَلَيْهِمْ كَسِنِي يُوسُفَ اللّٰهُمَّ الْعَنْ لِحَيَانَ وَرِعْلاً وَذَكْوَانَ وَعُصَيَّةَ عَصَتِ اللّٰهَ وَرَسُولَهُ ثُمَّ تَرَكَ ذَلِكَ حِينَ أُنْزِلَ: لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ. رَوَاهُ الثلاثة[٤].

دیسان ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە نوێـژی بەیانیـدا لـە ركاتی دووەما لـەپاش {رَبَّنَـا وَلَـكَ اُلْحَمْـدُ}ەوە دەیفـەرموو: خودایە! وەلیدی كوڕی وەلیدو سەلەمەی كوڕی هیشامو عەییاشی كوڕی ئەبو رەبیعەو هەموو موسوڵمانە لازەبوونەكان رزگار بكە لە دەستی دیلیی بێ بڕواكان خودایـە! لـە هـۆزی مـوزەر هەڵپێچیو تـەنگیان پـێ هەڵچنێو لایـان لێ ببڕیتـەوەو تووشـی قاتوقڕییـەكی وایـان بكـەی وەك حـەوت سـاڵە گرانییەكـەی سـەردەمی یووسف، خودایە! لەعنەتو نەفرین بكە لە هـۆزی لەحیانو لە هـۆزی ریعلو لە

---

(٣) بخاري: ٧٩٧ ، ٨٠٤ ، ١٠٠٦ ، ٢٩٣٢ ، ٣٣٨٦ ، ٤٥٦٠ ، ٤٥٩٨ ، ٦٢٠٠ ، ٦٣٩٣ ، ٦٩٤٠. مسلم: ١٥٤٢. أبو داود: ١٤٤٠.

(٤) بخاري: ٦٢٠٠. مسلم: ١٥٣٩. نسائي: ١٠٧٢.

هۆزی ذەكوان و لە هۆزی عوصەییە، كە لەخوداو پێغەمبەری خودا یاخی بوون. جا لەوە دوا كاتێ كە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە كە دەفەرموێ:

{لَيْسَ لَكَ مِنَ الأَمْرِ شَيْءٌ – ٣/١٢٨–}.

واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! حوكمی قەزاو قەدەر كەم یا زۆر بە دەستی تۆ نیە، ئەوە تەنیا بە دەستی خودا خۆیەتی. ئیتر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وازی لەم نەفرین كردنە هێنا بەلاّم قونووت خوێندن مایەوە (ش/د).

٥٦٣– عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَا زَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْنُتُ فِي صَلاَةِ الصُّبْحِ حَتَّى فَارَقَ الدُّنْيَا. رَوَاهُ الدار قطني وعبدالرزاق والحاكم(٥).

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) تا لە دنیا دەرچوو هەمیشە لە نوێـژی بەیانیـدا قونـووتی دەخوێنـد. (دارە قـوطنی/ عەبدورەزاق/ حاكم – رەحمەتی خودایان لێبێ).

٥٦٤– عَنْ الْحَسَنُ بْنِ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: عَلَّمَنِي رَسُولُ اللّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ فِي قُنُوتِ الْوِتْرِ: اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ إِنَّكَ تَقْضِي وَلاَ يُقْضَى عَلَيْكَ وَإِنَّهُ لاَ يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ وَلاَ يَعِزُّ مَنْ عَادَيْتَ تَبَارَكْتَ رَبَّنَا وَتَعَالَيْتَ. رَوَاهُ اصحاب السنن. وزاد النسائي: وصَلَّى اللهُ عَلَى النَّبِيِّ مُحَمَّدٍ(٦).

حەسەنی كوڕی عەلی (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ئەم چەن وشەیەی فێركردم كە لە قونووتی نوێژی وەتردا بیانڵێم:

{اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ إِنَّكَ تَقْضِي وَلاَ يُقْضَى عَلَيْكَ وَإِنَّهُ لاَ يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ وَلاَ يَعِزُّ مَنْ عَادَيْتَ تَبَارَكْتَ رَبَّنَا وَتَعَالَيْتَ}.

---

(٥) سكت عنه الشارح (مترجم).

(٦) ورواه ابن حبان والحاكم وغيرهما بسند حسن (شرحه).

خودایە! هیدایەتم بدەو شارەزای ڕێگەی ڕاستم بکە لەگەڵ ئەوانەدا کە خۆت هیدایەتت داون، وە بێوەی و سەرئاسوودەم بکە لەگەڵ ئەوانەدا کە خۆت بێوەی و سەرئاسوودەت کردوون وە ئەو بەخششەی داوتە پێم پێت و فەڕی تێخە بۆم، وەبم پارێزە لە زیانی ئەوەی کە بڕیارت داوە، بەڕاستی تۆ خۆت بڕیاری هەموو شتێ دەدەیت، بەڵام هیچ شتێ لەسەر تۆ بڕیار نادرێ، ئەوەی کە تۆ دۆستی ئەویت ئەوە قەت کەساس ناکەوێ و داماو نابێ، وە ئەوەی کە تۆ دوشمنایەتی تێ ببەستیت ئەوە هەرگیز سەرناکەوێ، ئەی پەروەردگاری ئێمە! بە ڕاستی پیرۆزی و گەورەیی هەر لەخۆت جوانە (د/ت/ن) نەسائی ئەمەشی لێ پتر کردووە: {وصلّى الله على النبيّ محمد}: دروودو ڕەحمەتی خودا لەسەر موحەممەد پێغەمبەر.

## ٩٣) نزاو پاڕانەوەی پێش سڵاودانەوە: (الدعاء قبل السلام)

٥٦٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَدْعُو (فِي الصَّلاةِ كَمَا فِي رِوَايَةٍ - شَرَحُهُ): اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ عَذَابِ النَّارِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ. زَادَ فِي رواية: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ فَقَالَ لَهُ قَائِلٌ: مَا أَكْثَرَ مَا تَسْتَعِيذُ مِنَ الْمَغْرَمِ فَقَالَ: إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا غَرِمَ حَدَّثَ فَكَذَبَ، وَوَعَدَ فَأَخْلَفَ. رَوَاهُ الثلاثة[1].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: یاسای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وابوو لە نوێژا لە کۆتایی تەحیاتی پێش سڵاودا دەیفەرموو:

{اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَمِنْ عَذَابِ النَّارِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ}.

---

(١) بخاري: ١٣٧٧ ، مسلم: ١٣٢٧ - ١٣٣٢. ترمذي: ٣٤٩٤. نسائي: ٢٠٦٢.

خودایە! پەنا دەگرم بە تۆ لە سزای گۆڕو لە سزای ئاگرو لە فیتنەو ئاژاوەی ژیان‌و مردن‌و لە ئاژاوەو ئاشووبی جەجاڵە کوێرەی جادوگەر. لە گێڕانەوەیەکا: ئەمەشی پتر کردووە:

{اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ}.

خودایە! پەنا دەگرم بەتۆ لە تاوانباری‌و لەباری ژێر قەرزاری. پیاوێکیش پێی گوت: بۆ ئەوەندە دادتە لە دەست باری ژێر قەرزاری؟ فەرمووی: چونکە پیاو کە بوو بەژێر قەرزو قوڵەوە تووشی درۆو دەلەسە دەبێ، ئەوجا بەڵێن دەداو بۆی ناچێتە سەر! (ش/د).

٥٦٦- عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلِّمْنِي دُعَاءً أَدْعُو بِهِ فِي صَلَاتِي. قَالَ: قُلِ اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَثِيرًا وَلاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ، وَارْحَمْنِي إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ. رَوَاهُ الخمسة إلاّ أبا دَاوُدَ[٢].

ئەبو بەکری صدیق (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ): نزایەکم فێربکە کە لە نوێژەکەما بیکەم. فەرمووی: بڵێ:

{اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَثِيرًا وَلاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ، وَارْحَمْنِي إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ}.

خودایە! من زۆرو ستەمێکی گەلێ زۆرم لەخۆم کردووە جگە لە تۆش کەسی تر ڕادەی ئەوەی نیە کە لەگوناه خۆش بێ، دەی بەلوتف‌و کەرەمی خۆت لێم خۆش بەو میهرەبانیم لەگەڵ بنوێنە، بەراستی تۆ تاوانبەخش ومیهرەبانیت (ش/ت/ن).

٥٦٧- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: بَيْنَ التَّشَهُّدِ وَالتَّسْلِيمِ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ

---

(٢) بخاري: ٨٣٤ ، ٧٣٨٨ ، ٦٣٢٦. مسلم: ٦٨٠٩ ترمذي: ٣٥٣١. نسائي: ١٣٠١.

وَمَا أَسْرَفْتُ وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّى أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ. رَوَاهُ الخمسة إلاّ البخاري[٣].

**عەلی (خوای لێ رازی بێ) گوتی: یاسای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وابوو لە تەحیاتا لە ناوەندی شایەتمانهێنان و سڵاودانەوەدا دەیفەرموو:**

{اللّٰهُمَّ اغْفِرْ لِى مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ وَمَا أَسْرَفْتُ وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّى أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ}.

**ئەی خودایە! لێم خۆشبە، لە گوناهی بەرو دواوم و لە گوناهی ئاشكراو نهێنیم و لەو تاوانە زۆرانەی كە لە خۆمم كردووە، لەو گوناهانەیش كە تۆ لەمن باشتر دەیانزانی، پەروەردگارا! پێش خستن و پاش خستن بە دەستی تۆیە، خودایەكی تر نیە تۆ نەبێ (م/د/ت/ن).**

٥٦٨- عَنْ مِحْجَنَ بْنَ الأَدْرَعِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَسْجِدَ فَإِذَا هُوَ بِرَجُلٍ قَدْ قَضَى صَلاَتَهُ وَهُوَ يَتَشَهَّدُ وَيَقُولُ اللّٰهُمَّ إِنِّى أَسْأَلُكَ يَا اللّٰهُ الأَحَدُ الصَّمَدُ الَّذِى لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ أَنْ تَغْفِرَ لِى ذُنُوبِى إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ. قَالَ: فَقَالَ: قَدْ غُفِرَ لَهُ ثَلاَثاً. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي[٤].

**میحجەنی كوڕی ئەدرەع (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) كە هات بۆ مزگەوت روانی كەوا پیاوێ خەریكە لە نوێژ دەبێتەوە، خەریكە تەحیات دەخوێنێ و دەڵێ:**

{اللّٰهُمَّ إِنِّى أَسْأَلُكَ يَا اللّٰهُ الأَحَدُ الصَّمَدُ الَّذِى لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ أَنْ تَغْفِرَ لِى ذُنُوبِى إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ}.

**خودایە! ئەی یەزدانی تاك و تەنیا! ئەی جێی نیازو هیواو ئومێدی هەموو كەسێ! ئەی ئەو كەسەی كە نیازی بە هیچ كەسێ نیە وە هەموو**

---

(٣) مسلم: ١٨٠٩. أبو داود: ٧٤٤ ، ٧٦٠. ترمذي: ٢٦٦. نسائي: ٨٩٦. راجع هامش رقم: (٢٤١).

(٤) بسند صالح (شرحه).

کەسێ نیازی بەو هەیە! ئەی ئەو کەسەی کە نە کەسی لێ بووەو نە خۆشی لە کەس بووەو نە کەسێ هاوتای دەکا! داوات لێ دەکەم کە بە میهرەبانی خۆت لە گوناهەکانم خۆش ببی، بە راستی هەرتۆ تاوانبەخش‌و میهرەبانی. گوتی: جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) سێ جار فەرمووی: ئەمە خودا لێی خۆش بوو، ئەمە خودا لێی خۆش بوو (د/ن- سند صالح).

## ٩٤) حوکمی ئەو کەسەی کە نەتوانێ بە راوەستانەوە فاتیحا بخوێنێ یا هەر نەزانێ قورئان بخوێنێ: (حکم من لم يستطع القيام أو لم يستطع القراءة)

٥٦٩- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: كَانَتْ لِيَ بَواسِير فَسَأَلْتَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الصَّلاَةِ فَقَالَ: صَلِّ قَائِمًا فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَقَاعِدًا فَإِنْ لَمْ تَسْتَطِعْ فَعَلَى جَنْبٍ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ مسلماً. وَسَيَأْتِيْ فِيْ قَضَاءِ ٱلنَّوافِلِ جَوَازُهَا مِنْ قُعُودٍ مَعَ القُدْرَةِ عَلىَ ٱلقِيَامِ[1].

عیمرانی کوڕی حوصەین (خوای لێ رازی بێ) گوتی: مەیاسیریم بوو، بۆ چۆنێتی کردنی نوێژی نەخۆش پرسیارم لە پێغەمبەر کرد (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر توانیت ئەوە بە راوەستانەوە نوێژبکە، وە ئەگەر بە راوەستانەوە نەت توانی ئەوا بە دانیشتنەوە بیکە، وە ئەگەر بە دانیشتنیسەوە نەت توانی ئەوا لەسەر تەنشت بەرەو رووگە بیکە (ب/د/ت/ن). دانەر (پرگۆپرکەی لەنووری خودابێ) دەڵێ: لەباسی قەزا کردنەوەی نوێژی سوننەتدا (کە لەمەولا دێ) ئەوەی تێدایە: کە نوێژی سوننەت بە دانیشتنیشەوە دروستە با نوێژکەر تەوانای راوەستانیشی هەبێ ئەمەیش ئیشارەتە بۆ ئەم فەرموودەیانە: (ب - ١ - ز١٨٥ ژمارە: ٩٩٤، ٩٩٥، ٩٩٦، ٩٩٧.

٥٧٠- عَنْ أَبِي أَوْفَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: إِنِّي لاَ أَسْتَطِيعُ أَنْ آخُذَ مِنَ الْقُرْآن شَيْئًا فَعَلِّمْنِي مَا يُجْزِئُ عَنْهُ. فَقَالَ: قُلْ سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ الْعَلِيِّ

(١) بخاري. صلاة القعد: ١١١٧.

العَظِيمِ. قَالَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ هَذَا لِلّٰهِ فَمَا لِي؟ قَالَ: قُلِ اللّٰهُمَّ ارْحَمْنِي وَارْزُقْنِي وَعَافِنِي وَاهْدِنِي، فَلَمَّا قَامَ قَالَ: هَكَذَا بِيَدِيْهِ فَقَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَمَّا هَذَا فَقَدْ مَلأَ يَدَيْهُ مِنَ الْخَيْرِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنَسائي[٢].

**ئیبنو ئەبو ئەوفا** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پیاوێ هاتە لای پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **گوتی: ئێستاكە بەم دەستوبردە ناتوانم هیچ لە قورئان لەبەر بكەم، كەوابوو شتێكم فێربكە كە لەباتی قورئان لە نوێژدا بیخوێنم، فەرمووی: بلّێ:**

{سُبْحَانَ اللّٰهِ وَالْحَمْدُ لِلّٰهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَاللّٰهُ أَكْبَرُ وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللّٰهِ الْعَلِيِّ العَظِيمِ}.

**پاكی و بێگەردی و سوپاس و ستایش هەر بۆ خوایە، خودای گەورە نەبێ خودای ترنیە، هێزو تەوانایی هەر بە دەستی خودای بلّندو گەورەیەو بەس جا پیاوەكە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە یادو ذیكری خودایەو بۆ ئەوە، ئەی چی بۆ من؟ فەرمووی** (درودی خوای لەسەربێ)**: بلّێ:**

{اللّٰهُمَّ ارْحَمْنِي وَارْزُقْنِي وَعَافِنِي وَاهْدِنِي}.

**ئەی خودایە! بەزەویت بێتەوە پێماو رۆژیم بدەو ئاسوودەو بێوەیم كەو شارەزای رێی راستم كە جا پیاوەكە هەلّسا بڕوا وشە وشە بە پەنجەكانی هەردوو دەستی دەیژماردن هەر وشەیەكی دەگوت و پەنجەیەكی دەنووقاندو دەیگوت ئەمە یەك، ئەمەدوو،..تاد پێغەمبەریش** (درودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: بەلّێ ئەم پیاوە هەردوو دەستی خۆی پڕكرد لە خێرو خۆشی** (د/ن–سند صالح).

**٩٥) ناتەواوی فەرز لە سوننەت تەواو دەكرێ: (يكمل نقص الفرض من التطوع)**

٥٧١– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ النَّاسُ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ أَعْمَالِهِمُ الصَّلاَةُ: يَقُولُ رَبُّنَا جَلَّ وَعَزَّ لِمَلاَئِكَتِهِ:–

---

(٢) بسند صالح (شرحه).

(وَهُوَ أَعْلَمُ) انْظُرُوا فِي صَلاَةِ عَبْدِي أَتَمَّهَا أَمْ نَقَصَهَا، فَإِنْ كَانَتْ تَامَّةً كُتِبَتْ لَهُ تَامَّةً وَإِنْ كَانَ انْتَقَصَ مِنْهَا شَيْئًا قَالَ: انْظُرُوا هَلْ لِعَبْدِي مِنْ تَطَوُّعٍ؟ فَإِنْ كَانَ لَهُ تَطَـوُّعٌ قَالَ: أَتِمُّوا لِعَبْدِي فَرِيضَتَهُ مِنْ تَطَوُّعِهِ ثُمَّ الزَكَاةُ مِثْلُ ذَلِكَ. ثُمَّ تُؤْخَذُ الأَعْمَالُ عَلَى حَسَبِ ذَلِكَ. رَوَاهُ ابُو دَاوُدَ والترمذي ولفظه: إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِـهِ الْعَبْـدُ يَـوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ عَمَلِهِ صَلاَتُهُ فَإِنْ صَلُحَتْ فَقَدْ أَفْلَـحَ وَأَنْجَـحَ وَإِنْ فَـسَدَتْ فَقَـدْ خَـابَ وَخَسِرَ فَإِنِ انْتَقَصَ مِنْ فَرِيضَتِهِ شَيْئَاً قَـالَ: الـرَّبُّ عَـزَّ وَجَـلَّ أَتِمُّـوا افَرِيـضَتَهُ مَـنْ تَطَوُّعِهِ[1].

ئـەبو هـورەیرە (خـوای لێ ڕازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) فـەرمووی: ڕۆژی قیامـەت نوێـژ یەكـەم كـردەوەی ئـادەمیزادە كـە لەسـەری موحاسەبە دەكرێ جا پـەروەردگاری گـەورەو سـەروەرمان (هەرچـەند خۆشـی باشتر دەزانـێ بـەڵام لەبـەر حیكمـەتێ) بـە فریـشتەكانی دەفـەرموێ: تەماشـای دەفتـەری نوێـژی ئـەم بەندەیـەم بكـەن ئایـا بـە تـەواوی نوێـژی كـردووە یـا بـە ناتـەواوی، ئـیتر ئەگـەر بـە تـەواوی نوێـژی كردبـێ ئـەوا بـە تـەواوی بـۆی دەنوسرێ، بەڵام ئەگەر بازێ نوێژی چوو بوو، یا هەنـدێ نوێـژی ناتـەواوی‌و كـەموكووڕیی هـەبوو ئـەوا خـودا دەفـەرموێ: تەماشـا بكـەن بـزانن ئایـا ئـەم بەندەیـەی مـن نوێـژی سـوننەتی هەیـە، وە سـوننەتەكانی نوێـژی جێبـەجێ كـردووە؟ جـا ئەگـەر سـەرمایەیەكی سـوونەتی هـەبوو ئـەوا دەفـەرموێ: ناتەوایی فەرزەكانی ئەم بەندەیەم لە سوننەتەكانی تەواو بكـەن، لـەپاش نوێـژ موحاسەبە دەكرێ لەسەر زەكات، ئەویش هـەروەها بـەم شـێوەیە، ئـیتر هـەموو كردەوەكانی تریش بەم پێیە وەر دەگیرێ! (د–س/ح–ت)، گفتـەی (ت) ئاوایـە (لـە ڕۆژی قیامـەتا یەكـەم كـردەوەی بەنـدە كـە موحاسـەبە دەكـرێ لەسـەری نوێژەكەیـەتی، جا ئەگـەر نوێژەكـەی خـاس‌و بـاش بـوو ئـەوا خۆشـی ڕزگـارو سـەرفراز دەبـێ، خـۆ ئەگـەر خـراپ بـوو ئـەوا خۆشـی نائومێـدو زیانبـار دەبـێ،

---

(١) بسند حسن (شرحه).

گریمـان فەرزەکـەی شـتێکی کـەم بـێ خـودای گـەورەو سـەروەر دەفـەرموێ: فەرزەکەی لە سوننەتەکەی تەواو بکەن!).

## ٩٦) چەن شتێ لە نوێژا پەسەن نین، یەکێ لەوانە تەماشاکردنی ئاسمان، یا لاکردنەوەیە، یا خەریکبوونە بە شتێکی ترەوە، یا وەنەوزو خەوە نووچکەیە

**بکره في الصلاة أمور منها النظر الى السماء والإلتفات، وكذا ما يلهي والنعاس (شرحه)**

٥٧٢– عَنْ أَنَسَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَقَالَ: مَا بَالُ أَقْـوَامٍ يَرْفَعُونَ أَبْصَارَهُمْ إِلَى السَّمَاءِ فِي صَلاَتِهِمْ فَاشْتَدَّ قَوْلُهُ فِي ذَلِكَ حَتَّى قَـالَ: لَيَنْـتَهُنَّ عَنْ ذَلِكَ أَوْ لَتُخْطَفَنَّ أَبْصَارُهُمْ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ الترمذي. ولفظ مُـسْلِمٌ: لَينـتَهِنَّ أَقْوَامٌ يَرْفَعُونَ أَبْصَارَهُمْ إِلَى السَّمَاءِ فِي صَلاَةِ أَوْ ترجِعُ إِلَيْهِمْ[1].

ئەنـەس (خـوای لێ رازی بـێ) گـوتی: حـەزرەت (دروودی خـوای لەسـەربێ) فـەرمووی: لەبەرچی هەندێ کەس لـە نوێـژا چاو هەڵدەبڕن بـۆ ئاسمان بـۆ وا دەکـەن بـۆ! ئیتر حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) لـەم بارەیـەوە گـەلێ بەتوندی هەڕەشـەی کـرد، تەنانـەت فـەرمووی: دەبـێ واز لـەم کـارە ناشـیرینە بێـنن ئـەگینا کـە بێگومـان چاویان کوێر دەبێ. (ش/د/ن)، واژەی موسلیم ئاوایە: کەسانێ کە لـە نوێـژا چاویان هەڵدەبڕن بەرەو ئاسمان، یا دەبێ واز لەم کـارە ناپەسـەندە بهێـنن، یا بێگومان چاویان کوێر دەبێ.

٥٧٣– عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُا) قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الإِلْتِفَاتِ فِي الصَّلاَةِ فَقَالَ: هُوَ اخْتِلاَسٌ يَخْتَلِسُهُ الشَّيْطَانُ مِنْ صَلاَةِ الْعَبْدِ. رَوَاهُ البخاري والنسائي وأبُو دَاوُدَ[2].

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: بۆ ئاوڕدانەوە لـەناو نوێـژدا لـە پێغەمبـەرم پرسی فەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ): ئەوە لێ دزینەوەیـە شـەیتان دەیفڕێنـی لـە نوێژی بەندە! (ب/ن/د).

---

(١) بخاري: ٧٥٠. مسلم: ٩٦٥ ، ٩٦٦. نسائي: ١٢٧٥.

(٢) بخاري: ٧٥١ ، ٣٢٩١.

٥٧٤- وَلَهُمَا: لاَ يَزَالُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ مُقْبِلاً عَلَى الْعَبْدِ وَهُوَ فِي صَلاَتِهِ مَا لَمْ يَلْتَفِتْ فَإِذَا الْتَفَتَ انْصَرَفَ عَنْهُ[٣].

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: لەناو نوێـژا رووی رەحمەتی خودا لە بەندەیە هەتا لا دەکاتەوە، بەڵام کە لایکردەوە ئیتر خودا رووی رەحمەتی خۆی لێ وەردەگێڕێ (ن/د- سند صالح).

٥٧٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَلْحَظُ فِي الصَّلاَةِ يَمِينًا وَشِمَالاً وَلاَ يَلْوِي عُنُقَهُ خَلْفَ ظَهْرِهِ[٤].

ئیبنو عەباس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە نوێژ بەلای راستو بەلای چەپا بەگۆشەی چاو تەماشای دەکرد بەڵام بەپشتا ملی بانەدەدا (ت- سند غريب).

٥٧٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَا بُنَيَّ إِيَّاكَ وَالاِلْتِفَاتَ فِي الصَّلاَةِ فَإِنَّهُ هَلَكَةٌ، فَإِنْ كَانَ لاَ بُدَّ فَفِي التَّطَوُّعِ لاَ فِي الْفَرِيضَةِ. رَوَاهُمَا الترمذي[٥].

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پێی فەرمووم: کوڕی شیرینم! نەکەی لەناو نوێـژدا لابکەیتەوە، چونکە شتی وا سەر تیا چوونەو ماڵوێرانی، ئەگەر هەر چارت نەبوو لە نوێـژی سوونەتابێت، بێ سوچترە تا نوێژی فەرز (ت-ح/ح).

٥٧٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَلَّى فِي خَمِيصَةٍ لَهَا أَعْلاَمٌ فَقَالَ: شَغَلَتْنِي أَعْلاَمُ هَذِهِ اذْهَبُوا بِهَا إِلَى أَبِي جَهْمٍ وَأْتُونِي بِأَنْبِجَانِيَّتِهِ. رَوَاهُ الثلاثة[٦].

---

(٣) رواه النسائي وأبو داود بسند صالح (شرحه).

(٤) رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

(٥) رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

(٦) بخاري: ٧٥٢. مسلم: ١٢٣٨ ، أبو داود: ٩١٤ ، ٤٠٥٣. نسائي: ٧٧٠.

عائیشە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نوێژی دەکرد کراسێکی خوری گوڵ گوڵی لەبەردا بوو، جا لەپاشا فەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ): گوڵ و نەخشی ئەم کراسە خەریکیان کردم و نەیانهێشت باش دڵ بدەمە نوێژەکەم، ئەمە ببنەوە بۆ ئەبو جەهم خۆی و کراسە ئەنبیجانییە سادەکەی ئەوم بۆ بێنن (ش/د):

٥٧٨- وَعَنْهَا عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ فِي الصَّلاَةِ فَلْيَرْقُدْ حَتَّى يَذْهَبَ عَنْهُ النَّوْمُ فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا صَلَّى وَهُوَ نَاعِسٌ لَعَلَّهُ يَذْهَبُ يَسْتَغْفِرُ فَيَسُبُّ نَفْسَهُ. رَوَاهُ الخمسة[٧].

دیسان عائیشە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ یەکێ لە ئێوە لە نوێژا وەنەوزی دەداو خەوەنووچکەی بوو ئیتر بابچێ بخەوێ هەتا خەوەکەی دەڕوا، چونکە کاتێ بەدەم وەنەوزەکوتێ و خەوبردنەوەوە نوێژ بکەن ڕەنگە بتانەوێ بپاڕێنەوە بۆ خۆتان بەڵام لە جیاتی ئەوە جنێو بە خۆتان بدەن! (ش/د/ت/ن).

## ٩٧) هەندێکی تر لەو شتە ناپەسەندانە تف ڕۆکردن و دەست لەسەر کەلەکە دانان و ماڵین و تەختکردنی چەوو زیخ و ئیشارەتکردنە بەدەست:

## ومنها البصاق والاختصار ومسح الحصى والاشارة باليد

٥٧٩- عَنْ أَنَسَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ فِي الصَّلاَةِ فَإِنَّهُ يُنَاجِي رَبَّهُ، فَلاَ يَبْزُقَنَّ بَيْنَ يَدَيْهِ وَلاَ عَنْ يَمِينِهِ، وَلَكِنْ عَنْ شِمَالِهِ تَحْتَ قَدَمِهِ[١].

ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ یەکێ لە ئێوە لەناو نوێژدا دەبێ ئەوە ڕازو قسەی نهێنی لەگەڵ پەروەردگاری خۆیا دەکاو ڕووبەڕووی خودا وەستاوەو خودا ڕووی ڕەحمەتی

---

(٧) بخاري: ٢١٢. مسلم: ١٨٣٢. أبو داود: ١٣١٠.

(١) بخاري: ٤١٣ ، ١٢١٤. مسلم: ١٢٣٠.

لێیەتی کەواتە با لەوکاتەدا لە بەردەمی خۆیەوە یا لەلای راستیەوە تف رۆ نەکا، بەڵام ئەگەر هەرچاری نەبوو با لەلای چەپییەوە لە ژێر پێیا تف رۆ بکا ئەگەر لەسەر خۆڵ وەستابوو. ئەگینا تفەکەی بکاتە لۆی جلەکەیەوە یا بیکاتە ناو دەستە سڕێکەوە (ش/د/ت/ن).

٥٨٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ يُصَلِّيَ الرَّجُلُ مُخْتَصِرًا. رَوَاهُمَا الخمسة(٢).

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) یاساخی کردووە کە پیاو لە نوێژا دەست لەسەر کەلەکەی دانێ (ش/د/ت/ن).

٥٨١- (ب - ١ ز - ٥٨ ژمارە: ٥/٤١٣).

٥٨٢- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَكُنَّا إِذَا سَلَّمْنَا قُلْنَا بِأَيْدِينَا السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ فَنَظَرَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: مَا شَأْنُكُمْ تُشِيرُونَ بِأَيْدِيكُمْ كَأَنَّهَا أَذْنَابُ خَيْلٍ شُمُسٍ؟ إِذَا سَلَّمَ أَحَدُكُمْ فَلْيَلْتَفِتْ إِلَى صَاحِبِهِ وَلاَ يُومِئْ بِيَدِهِ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وَأَبُو دَاوُدَ(٤).

جابیری کوڕی سەمموورە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە پێشا کە لەگەڵ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کە نوێژمان دەکرد (کاتێ سڵاوی نوێژمان دەدایەوە بەلای راستا) بەدەست ئیشارەتمان دەکردو دەمانگوت (السلام علیکم) وە هەروەها (بەلای چەپا) بە دەست ئیشارەتمان دەکردو دەمانگوت (السلام علیکم) هەتا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) سەرنجێکی داین و فەرمووی: ئەوە چیتانە کەوا دەستتان دەڵێی کلکی ماینی چەمووشە بەم لاولادا رایدەوەشێنن و ئیشارەتی پێ دەکەن؟ شتی وا مەکەن بەڵکوو لەباتی ئەوە لابکەنەوە بەلای هاوڕێکانتانەوە (م/د).

---

(٢) مسلم: ١٢١٨. نسائي: ٨٨٩. ترمذي: ٣٨٣.

(٤) مسلم: ٩٦٩ ، ٩٧٠. أبو داود: ٩٩٨ ، ٩٩٩. نسائي: ١١٨٤ ، ١٣١٧ ، ١٣٢٥.

### ٩٨) هەندێ تریان نوێژکردنە لەکاتی ئامادەبوونی خۆراکا، یا لەکاتی تەنگەتاو بوونی سەراودا: (ومنها الصلاة بحضرة الطعام ومع مدافعة الحدث)

٥٨٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ أللهُ عَنْهَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا وَضَعَ الْعَشَاءُ وَأُقِيْمَتِ ألصَّلاَة فَابْدَءُوا بِالْعَشَاءِ. وَفِي رواية: إذا قَدَّمَ الْعِشَاءُ فَأبْدَأُوا بَهِ قَبْلَ صَلاَةَ الْمَغْرِبِ، وَلاَ تَعْجَلُوا عَنْ عَشَائِكُمْ. رَوَاهُ الشيخان والترمذي[1].

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: کە شێو دانرا لە کاتی قامەتی نوێژدا لە پێشا دەست بەخواردنی شێوەکە بکەن. لە گێڕانەوەیەکا: ئەگەر شێو دانرا دەستی پێ بکەن لەپێش کردنی نوێژی شێوانا وە هیچ پەلە مەکەن لە شێوەکەتان و لەسەر خۆتان نانەکەتان بە تەواوی بخۆن و ئەوسا نوێژەکەتان بکەن، وە هەروەها نوێژەکانی تریش (ش/ت).

٥٨٤- وَعَنْهَا عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ صَلاَةَ بِحَضْرَةِ الطَّعَامِ وَلاَ وَهُوَ يُدَافِعُهُ الأَخْبَثَانِ[2].

دیسان پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) گوتی: پێغەمبەر دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەربێ): کە نان دانرا نوێژکردن باش نیە، کە سەراویش تەنگەتاویکردن هەروەها (م).

٥٨٥- وَسُئِلَ أَنَسٌ عَنِ الثُّومِ فَقَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الشَّجَرَةِ فَلاَ يَقْرَبَنَّا وَلاَ يُصَلِّي مَعَنَا. رَوَاهُما مُسْلِمٌ[3].

پرسیار کرا لە ئەنەس (خوای لێ رازی بێ): ئەگەر کەسێ سیری کاڵی خوارد نوێژبکا؟ گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ لەم گیایەی خوارد بانزیکی ئێمە نەکەوێ و نوێژمان لەگەڵ نەکا بەڵکوو لەماڵەوە نوێژی خۆی بکا (م).

---

(١) بخاري: ٦٧٢ ، ٥٤٦٣. مسلم: ١٢٤١ — ١٢٤٧. أبو داود: ١٩٢٧٠. ترمذي: ٣٥٣.

(٢) مسلم: ١٢٤٦.

(٣) مسلم: ١٢٤٨ — ١٢٥٠. بخاري: ٨٥٣ ، ٨٥٥ ، ٨٥٤ ، ٥٤٥٢ ، ٧٣٥٩.

## ٩٩) هەندێکی تریان خرهەڵدانی قژو شۆڕکردنەوەی جل‌و بەرگە بەرەنگێگی وا کە بخشێ لەسەر زەوی: (ومنها كف الشعر والاسبال)

٥٨٦- مَرَّ أَبُو رَافِعٍ مَوْلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) عَلـىَ الْحَـسَنِ بـنِ عَلِـيّ (عَلَيهِماَ اَلسَّلاَمُ) وَهُوَ يُصَلِّي قَائِماً وَقَدْ غَرَزَ ضَفْرَهُ فِي قَفَاهُ فَحَلَّها أَبُو رافِعٍ فَالتَفَتَ حَسَنٌ إِلَيْهِ مُغْضَبًا فَقَالَ: أَقْبِلْ عَلَى صَلاَتِكَ وَلاَ تَغْضَبْ فَإِنِّى سَـمِعْتُ رَسُـولَ اللّـهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: ذَلِكَ كِفْلُ الشَّيْطَانِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي[1].

جارێ حەسەنی کوڕی عەلی (درووديان لێبێ) راوەستابوو نوێژی دەکرد، پەلکەکانی خرکردبوونەوەو گرێی دابوون بە پشتەسەریەوە، ئەبو رافیع (کە کاتی خۆی نۆکەری پێغەمبەربوو (درودی خوای لەسەربێ) چوو بەلایەوەو پەلکەکانی کردەوە، حەسەنیش لێی مۆڕبۆوەو خێسەیەکی لێکرد، ئەویش گوتی: دڵ بەدەرە نوێژەکەت‌و تووڕەمەبە، چونکە بۆ خۆم لە پێغەمبەرم ژنەوت (درودی خوای لەسەربێ) دەیفەرموو: ئەوە دۆشەکەڵەی شەیتانە لەسەری دادەنیشێ (د/ت-س/ح).

٥٨٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَـى عَـنِ السَّدْلِ فِي الصَّلاَةِ وَأَنْ يُغَطِّيَ الرَّجُلُ فَاهُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي[2].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نەهی کردووە لە شۆڕکردنەوەو خشاندنی جل‌و بەرگ بەسەر زەویدا لەناو نوێژدا هەروەها لەوەش کە پیاو لەکاتی نوێکردندا بە لفکەی مێزەرو شتی وا دەمی خۆی هەڵپێچێ (د/ت- سند ضعيف).

٥٨٨- وَعَنْهُ عَنِ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: إِنَّ اللهَ جَـلَّ ذِكْـرُهُ لاَ يَقْبَـلُ صَلاَةَ رَجُلٍ مُسْبِلٍ إِزَارَهُ[3].

---

(١) بسند حسن (شرحه).

(٢) بسند ضعيف مؤيد بالصحاح (شرحه).

(٣) رواه أبو داود بسند صحيح (شرحه).

دیسان ئەو گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: خودای گەورەو سەروەر نوێژی ئەو پیاوە گیرا ناکا کە جلەکانی بخشێنێ لە زەوی (د-ح/ص).

٥٨٩- عَنِ عَبْدِ اللهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أَسْبَلَ إِزَارَهُ فِي صَلاَتِهِ خُيَلاَءَ فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ جَلَّ ذِكْرُهُ فِي حِلّ وَلاَ حَرَامٍ. رَوَاهُمَا أَبُو دَاوُدَ[٤].

عەبدڵلا (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەرکەسێ لە نوێژدا بۆ فیزو دەعیە جلەکەی لە زەوی بخشێنێ ئەوە فڕی بەسەر حەلاڵو حەرامی خودای گەورەوە نیە (د- روی مسندا وموقوفا).

## ١٠٠) هەندێکی تریان باوێشکدانو پەنجە تێکپەڕاندنو فووکردنە: (ومنها التثاؤب والتشبيك والنفخ)

٥٩٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: التَّثَاؤُبُ فِي الصَّلاَةِ مِنَ الشَّيْطَان فَإذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَكْظِمْ مَا اسْتَطَاعَ. رَوَاهُ الترمذي والبخاري فِيَ بَدْءِ الخَلَقْ وَلَفْظَهُ: لَتَّثَاؤُبُ مِنَ الشَّيْطَان فَإذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَرُدَّهُ مَاسْتَطَاعَ فَإِنَّ أَحَدُكُمْ إِذَا قَالَ: (هَا) ضَحِكَ الشَّيْطَانُ مِنْهُ[١].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: باوێشکدان (لە نوێژا) لە شەیتانەوەیە، جا لەبەر ئەوە هەرکاتێ یەکێکتان باوێشکی هات با تا دەتوانێ قووتی بداتەوە (ت/ب) گفتەی بوخاری (پڕ گۆڕی پیرۆزی لە نوورو رەحمەتی خودای میهرەبانو گەورەبێ) ئاوایە: (باوێشك لە شەیتانەوەیە، کەواتە ئەگەر یەکێکتان باوێشکیدا با تا دەتوانێ بیداتە دواوەو دەم بنوقێنێو بە پشتی دەستی چەپی بەری دەمی

(٤) روى مسنداً وموقوفا (شرحه).

(١) بخاري: ٣٢٨٩ ، ٦٢٢٣ ، ٦٢٢٦.

بگرێ چونكە لەوكاتەدا كە دەم پان دەكاتەوەو دەڵێ: ها، شەیتان پێی پێدەكەنێ).

٥٩١- عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ ثُمَّ خَرَجَ عَامِدًا إِلَى الْمَسْجِدِ فَلاَ يُشَبِّكَنَّ بَيْنَ أَصَابِعِهِ فَإِنَّهُ فِي صَلاَةٍ. رَوَاهُ الترمذي وأبو داود بسند موثق[٢].

كەعبی كوڕی عوجرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: لەپاش ئەوەی كە دەسنوێژێكی جوانتان گرتو چوون بۆ مزگەت بۆ نوێژ ئیتر پەنجەتان تێك مەپەڕێنن بە ئیعتیبار ئیتر ئێوە لەناو نوێژدان (ت/د- سند موثق).

٥٩٢- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: رَأَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) غُلاَمًا لَنَا يُقَالُ لَهُ أَفْلَحُ إِذَا سَجَدَ نَفَخَ فَقَالَ: يَا أَفْلَحُ تَرِّبْ وَجْهَكَ. رَوَاهُ الترمذي[٣].

ئوم سەلەمە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: نۆكەرێكمان هەبوو ناوی ئەفلەح بوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) چاوی لێوە بوو كە كوڕنووشی دەبرد فووی دەكرد لە خۆڵی جێگە كوڕنووشەكەی. جا فەرمووی پێی: ئەی ئەفلەح! تەوێڵت خۆڵاویی كە چونكە ئەو خۆڵە نیشانەی بەندەگی و عیبادەتی خودای گەورەیە (ت- سند ضعیف)

٥٩٣- وَلِابْنِ ماجه: لاَ تُفَقِّعْ أَصَابِعَكَ وَأَنْتَ فِي الصَّلاَةِ (شرحه)[٤].

دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەربێ): لە نوێژا پەنجەكانت مەتەقێنە (ئیبنو ماجە) ئەم فەرموودەیە نەقڵ كراوە لەشەرحەكەی سەر (تاج) خۆیەوە.

---

(٢) بسند موثق.

(٣) بسند ضعیف (شرحه).

(٤) احتج به الشارح (مترجم).

## ١٠١) باسی شەشەم: باسی سوننەتە دامەزراوەکانی نوێژ، (ئەم باسە سێ بەشە):

### بەشی یەکەم: باسی سوننەتە دامەزراوەکانی نوێژە فەرزەکان (رواتب الفرائض)

### الباب السادس: في الرواتب. (وفيه فصول ثلاثة):

### الفصل الأول: في رواتب الفرائض

**٥٩٤**- عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ مَا مِنْ عَبْدٍ مُسْلِمٍ يُصَلِّي لِلَّهِ كُلَّ يَوْمٍ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً تَطَوُّعًا غَيْرَ فَرِيضَةٍ إِلاَّ بَنَى اللَّهُ لَهُ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ البخاري. وزاد الترمذي: أَرْبَعًا قَبْلَ الظُّهْرِ وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعِشَاءِ وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ[1].

**ئوممو حەبیبە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خوای لەسەربێ): هەر بەندەیەکی موسوڵمان هەموو رۆژێ دوانزە رکات نوێژی سوننەت بکا بۆ خودا، سەرەڕای نوێژە فەرزەکان، مسۆگەر کە خودای گەورە لە بەهەشتا کۆشکێکی بۆ دروست دەکا ئوممو حەبیبە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: ئەوەتی ئەمەم لە حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) ژنەوتووە لەوساکەوە هەمیشە ئەم دوانزە رکاتەیە دەکەم (م/د/ت/ن).**

**تیرمیذی ئەمەشی لێ زیاد کردووە: چوار رکات لە پێش نیوەڕۆداو دوو رکات لە پاشیەوەو دوو رکات لەپاش شێوانەوەو دوو رکات لەپاش خەوتنانەوەو دوو رکات لە پێش نوێژی بەیانییەوە.**

## ١٠٢) سوننەتی دامەزراوی نوێژی بەیانی: (راتبة الفجر)

**٥٩٥**- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: رَكْعَتَا الْفَجْرِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا. رَوَاهُ مسلم والترمذي وأحمد[1].

---

(١) مسلم: ١٦٩١ – ١٦٩٣. أبو داود: ١٢٥٠.

(١) مسلم: ١٦٨٥ ، ١٦٨٦. ترمذي: ٤١٦. نسائي: ١٧٥٨.

**عائیشە** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **دەفەرموێ: دوو ركاتە سوننەتەكەی پێش نوێژی بەیانی لە هەموو موڵك و سامانی دنیا باشترن. (م/ت/احمد).**

**٥٩٦- ولأبي دَاوُدَ وأحمد: لاَ تَدَعُوهُمَا وَإِنْ طَرَدَتْكُمُ الْخَيْلُ[٢].**

**دەفەرموێ:** (درودی خوای لەسەربێ)**: ئەگەر بە سواری ئەسپ نیشتوونەتە سەرتان ئەم دوو ركاتە سوننەتە تەرك مەكەن (د-سند صالح-ئەحمەد).**

**٥٩٧- وَعَنْهَا قَالَتْ: لَمْ يَكُنِ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **عَلَى شَيْءٍ مِنَ النَّوَافِلِ أَشَدَّ مُعَاهَدَةً مِنْهُ عَلَى الرَّكْعَتَيِ الْفَجْرِ. رَوَاهُ الثلاثة[٣].**

**دیسان عائیشە** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **هیچ سوننەتێكی تری وەك دوو ركاتە سوننەتەكەی پێش نوێژی بەیانی ئاوا بەباشی سەرەوكاری نەدەكرد! (ش/د).**

**٥٩٨- وَعَنْهَا قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **يُخَفِّفُ الرَّكْعَتَيْنِ اللَّتَيْنِ قَبْلَ صَلاَةِ الصُّبْحِ حَتَّى إِنِّي لأَقُولُ هَلْ قَرَأَ بِأُمِّ الْكِتَابِ. رَوَاهُ الخمسة إلاّ الترمذي[٤].**

**دیسانەوە گوتی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **ئەوەندە بە گورجی دوو ركاتە سوننەتەكەی پێش نوێژی بەیانی دەكرد، تەنانەت لە دڵی خۆمەوە دەمگوت: چۆن فریای خوێندنی فاتیحا دەكەوێ! (ش/د/ن).**

**٥٩٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَرَأَ فِي رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ) وَ (قُلْ هُوَ اللّٰهُ أَحَدٌ). رَوَاهُ الخمسة إلاّ البخاري[٥].**

---

(٢) رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

(٣) بخاري: ١١٦٩. مسلم: ١٦٨٣. أبو داود: ١٢٥٤.

(٤) بخاري: ١١٧١ ؛ ١٦٨١ ، ١٦٨٢. ابو داود: ١٢٥٥. نسائي: ٩٤٥.

(٥) مسلم: ١٦٨٧. أبو داود: ١٢٥٦. نسائي: ٩٤٤.

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) جارو بار لە دوو رکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانی دا سوورەتی {قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ}ەو سوورەتی {قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ}ی دەخوێند (م/د/ت/ن).

٦٠٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْرَأُ فِي رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ (قُولُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْنَا) وَالَّتِي فِي آلِ عِمْرَانَ (تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ). رَوَاهُ مُسْلِمٌ وأَبُو دَاوُدَ[٦].

ئیبنو عەباس (رەزای خودای لێبێ) گوتی: گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە دوو رکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانیدا لە رکاتی یەکەما ئایەتی {قُولُوا آمَنَّا بِاللهِ وَمَا أُنْزِلَ إِلينا} ئایەتی {تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ}ی لە رکاتی دووەما ئایەتی خوێند کە لە سوورەتی ئالی عیمراندایە (م/د).

٦٠١- وللترمذي وأبي داود: إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ فَلْيَضْطَجِعْ عَلَى يَمِينِهِ[٧].

دەفەرموێ: (دروودی خوای لەسەربێ): کە دوو رکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی بەیانیتان کرد لەسەر لای راست بەرەو رووگە راکشێن (ت/د-س/ح).

### ١٠٣) سوننەتە دامەزراوەکان کە بە جەخت کراون: (الرواتب المؤكدة)

٦٠٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: حَفِظْتُ مِنَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَشْرَ رَكَعَاتٍ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَهَا، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْمَغْرِبِ فِي بَيْتِهِ، وَرَكْعَتَيْنِ بَعْدَ الْعِشَاءِ فِي بَيْتِهِ، وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلاَةِ الصُّبْحِ، وَكَانَتْ سَاعَةً لاَ يُدْخَلُ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِيهَا[١].

---

(٦) مسلم: ١٦٨٨ ، ١٦٨٩. أبو داود : ١٢٩٥. نسائي: ٩٤٣.

(٧) بسند حسن ،شرحه).

(١) بخاري: ١١٧٢. مسلم: ١٦٩٥.

**ئیبنو عومەر** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: لە پێغەمبەر خۆیەوە** (دروودی خوای لەسەربێ) **دە ركات نوێژی سوننەت فێربووم: دوو ركات لە پێش نوێژی نیوەڕۆوەو دوو ركات لە پاشیەوەو دوو ركات لە پاش نوێژی شێوانەوە، حەزرەت ئەم دوو ركاتەی لە ماڵەوە دەكرد، وە دوو ركات لەپاش نوێژی خەوتنانەوە، حەزرەت** (دروودی خوای لەسەربێ) **ئەم دوو ركاتەشی لە ماڵەوە دەكرد، وە دوو ركاتیشی لە پێش نوێژی بەیانییەوە، وە لەم كاتەدا كەپێی دەگوترێ: سەبای ساڵحان كەس نەدەچوو بۆ خزمەتی، چونكە لەم دەمەدا لەگەڵ خودای خۆی خەریكبوو! (ش/د/ت/ن).**

**٦٠٣- وَعنْهُ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَبْلَ الظُّهْرِ، سَجْدَتَيْنِ وَبَعْدَهَا سَجْدَتَيْنِ وَبَعْدَ الْمَغْرِبِ سَجْدَتَيْنِ وَبَعْدَ الْعِشَاءِ سَجْدَتَيْنِ وَبَعْدَ الْجُمُعَةِ سَجْدَتَيْنِ، فَأَمَّا الْمَغْرِبُ وَالْعِشَاءُ وَالْجُمُعَةُ فَصَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **فِي بَيْتِهِ[٢].**

**دیسان گوتی: لەگەڵ پێغەمبەر خۆیدا** (دروودی خوای لەسەربێ) **ئەم نوێژە سوننەتانەم كردووە: دوو ركات لە پێش نیوەڕۆوەو دوو ركاتیش لە پاشیەوە، وە دوو ركات لەپاش شێوانەوە وە دوو ركات لەپاش خەوتنانەوە، وە دوو ركات لەپاش نوێژی هەینییەوە، بەڵام سوننەتی شێوان و خەوتنان و هەینیم لەگەڵ پێغەمبەردا** (دروودی خوای لەسەربێ) **لە ماڵی پێغەمبەر دەكرد (ش/د/ت/ن).**

**٦٠٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) أَنَّ النَّبِيَّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **كَانَ لاَ يَدَعُ أَرْبَعًا قَبْلَ الظُّهْرِ وَرَكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلاَةِ الْغَدَاةِ. روى هذه الثلاثة الأصول الخمسة[٣].**

**عائیشە** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **هەرگیز ئەم نوێژە سوننەتانەی تەرك نەدەكرد: چوار ركات لە پێش نوێژی نیوەڕۆوەو دوو ركاتیش لە پێش نوێژی بەیانییەوە (ش/د/ت/ن).**

---

(٢) بخاري. تهجد: ١١٧٢. مسلم. صلاة المسافرين: ١٦٩٥.

(٣) بخاري: ١١٨٢.

## ١٠٤) سوننەتە دامەزراوەكان كە جاروبار پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) تەركی كردوون: (الرواتب غير المؤكّدة)

٦٠٥- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ مُغَفَّلٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلاَةٌ مَـرَّتَيْنِ ثُـمَّ قَـالَ: فِي الثَّالِثَـةِ: لِمَـنْ شَـاءَ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ الترمذي[1].

عەبدوڵڵای كوڕی موغەففەل (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دوو جار لە سەریەك فەرمووی: لە بەینی هەموو بانگو قامەتێكا نوێژێكی سوننەت هەیە، لەسەری جای سێهەما فەرمووی: ئەمە بۆ كەسێ ئارەزووی ئەم نوێژەی هەبێ (ش/د/ن).

٦٠٦- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ الْمُزَنِيِّ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: صَلُّوا قَبْلَ صَلاَةِ الْمَغْرِبِ قَالَ: فِي الثَّالِثَةِ: لِمَنْ شَاءَ، كَرَاهِيَةَ أَنْ يَتَّخِذَهَا النَّاسُ سُنَّةً. رَوَاهُ البخاري وأَبُو دَاوُدَ[2].

عەبدوڵڵای موزەنی (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: دوو ركات نوێژی سوننەت بكەن لە پێش نوێژی شێوانەوە لەسەری جاری سێهەما فەرمووی: ئەمە بۆ كەسێكە كە ئارەزووی ئەم نوێژەی هەبێ، حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) بۆیە وای فەرموو نەوەك مەردوم بیكەن بە دەستوور (ب/د).

٦٠٧- عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَـنْ حَافَظَ عَلَى أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ قَبْلَ الظُّهْرِ وأَرْبَـعٍ بَعْـدَهَا حَرَّمَـهُ اللّٰـهُ عَلَـى النَّـارِ. رَوَاهُ أصحاب السنن[3].

ئوممو حەبیبە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەر كەسێ چوار ركات نوێژی سوننەت لە پێش نیوەڕۆوەو چوار

---

(١) بخاري: ٦٢٤ ، ٦٢٧. مسلم: ١٩٣٧. أبو داود: ١٢٨٣. ترمذي: ١٨٥. نسائي: ٦٨٠ ، ١١٦٢.

(٢) بخاري: ٦٢٤ ، ٦٢٧.

(٣) بسند صحيح (شرحه).

ركات لە پاشیەوە هەمیشە بە رێكوپێكی بكا خودا ئاگری لەسەر حەرام دەكا (د/ت/ن-س/ص).

٦٠٨- عَنْ أبْنِ عُمَرَ (رَضيَ أللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: رَحِمَ اللهُ امْرَءاً صَلَّى قَبْلَ العَصْرِ أرْبَعاً. رَوَاهُ أبُو دَاوُدَ والترمذي[٤].

ئیبنو عومەر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: رەحمەتی خودا لەو كەسەبێ كە لەپێش نوێـژی عەصرەوە چوار ركات نوێـژی سوننەت دەكا بەنیاز (نیەت)ی سوننەتی پێش عەصر (د/ت-س/ح).

٦٠٩- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ صَلَّى بَعْدَ الْمَغْرِبِ سِتَّ رَكَعَاتٍ لَمْ يَتَكَلَّمْ فِيمَا بَيْنَهُنَّ بِسُوءٍ عُدِلْنَ لَهُ بِعِبَادَةِ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ سَنَةً. وفِي رواية: مَنْ صَلَّى بَعْدَ الْمَغْرِبِ عِشْرِينَ رَكْعَةً بَنَى اللّٰهُ لَهُ بَيْتًا فِى الْجَنَّةِ. رَوَاهُمَا الترمذي[٥].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەر كەسێ لەپاش نوێژی شێوانەوە شەش ركات نوێـژی سوننەت بكا ئەوە هاوتای عیبادەتو خودا پەرستیی دوازدە ساڵ دەكا بە مەرجێ لە نێوانیانا قسەی خراپ نەكا (ت- سند ضعیف) لە گێڕانەوەیەكا: هەر كەسێ لەپاش شێوان بیست ركات نوێژی سوننەت بكا خودا لە بەهەشتا كۆشكێكی بۆ دروست دەكا (ت- سند ضعیف).

## ١٠٥) بەشی دووەم: باسی نوێژی وەتر: (الفصل الثاني: في الوتر)

٦١٠- عَنْ عَلِيّ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ قَالَ: يَا أَهْلَ الْقُرْآنِ أَوْتِرُوا فَإِنَّ اللّٰهَ وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ. رَوَاهُ اصحاب السنن[١].

---

(٤) بسند حسن (شرحه).

(٥) بسند ضعيف (شرحه).

(١) بسند ضعيف (شرحه).

عەلی (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی قورئان خواکان! ئەی پەیڕەوانی قورئان! واتە: ئەی ئۆمەتی مەحەممەد! نوێژی وەتر بکەن کە نوێژێکە ڕکاتەکانی تاکە لەپاش نوێژی خەوتنانەوە دەکرێ چونکە خودا خۆی تاکەوتاکی خۆش دەوێ (د/ت/ن-س/ح).

٦١١- عَنْ خَارِجَةَ بْنِ حُذَافَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى قَدْ أَمَدَّكُمْ بِصَلاَةٍ وَهِيَ خَيْرٌ لَكُمْ مِنْ حُمْرِ النَّعَمِ وَهِيَ الْوِتْرُ فَجَعَلَهَا لَكُمْ فِيمَا بَيْنَ الْعِشَاءِ إِلَى طُلُوعِ الْفَجْرِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي والحاكم وصحَّحه[٢].

خاریجەی کوڕی حوذافە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەماڵ دەرچوو و هات بۆ لامان فەرمووی: خودای گەورەو سەروەر، سەرەڕای نوێژە فەرزەکان نوێژێکی تریشی پێ بەخشیون، ئەو نوێژە بۆ ئێوە گەلێ چاکترە لە ڕانە وشتری سوور کە نایابترین ماڵی عەرەبانە کە ئەویش نوێژی وترە، وە کاتی بوونی ئەم نوێژە لەپاش کردنی نوێژی خەوتنانەوە دەست پێ دەکا، وە هەتا هەڵاتنی شەبەق کاتی دەمێنێ! (د/ت/حاکم - حاکم بە صەحیحی داناوە).

٦١٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اجْعَلُوا آخِرَ صَلاَتِكُمْ وِتْرًا. رواه الأربعة[٣].

ئیبنو عومەر (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: وەتر بکەن بە دواترین نوێژی شەوتان (ش/د/ت).

٦١٣- عَنْ مَسْرُوقٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قُلْتُ لِعَائِشَةَ: مَتَى كَانَ يُوتِرُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَتْ: كُلَّ ذَلِكَ قَدْ فَعَلَ أَوْتَرَ أَوَّلَ اللَّيْلِ وَوَسَطَهُ وَآخِرَهُ وَلَكِنِ انْتَهَى وِتْرُهُ حِينَ مَاتَ إِلَى السَّحَرِ. رَوَاهُ الخمسة[٤].

---

(٢) صحيح عند الحاكم.

(٣) بخاري: ٩٩٨. مسلم: ١٧٥٢. أبو داود: ١٤٣٨.

مەسرووق (خوای لێ رازی بێ) گوتی: بە عائیشەم گوت: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نوێژی وەتری کەی دەکرد؟ گوتی: لە هەموو کاتێکی شەودا وەتری دەکرد: هەندێ جار لە سەرەتای شەوەوە دەیکرد، هەندێ جار لە ناوەراستی شەودا دەیکرد، هەندێ جاریش لە دوادوایی شەوەوە دەیکرد، بەلاّم لەپێش مردنیا هەر بەرەبەیان وەتری دەکرد (ش/د/ت/ن).

**٦١٤– عَنْ جَابِرٍ** (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنِ النَّبِيَّ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: مَنْ خَافَ أَنْ لاَ يَقُومَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ فَلْيُوتِرْ أَوَّلَهُ وَمَنْ طَمِعَ أَنْ يَقُومَ آخِرَهُ فَلْيُوتِرْ آخِرَ اللَّيْلِ فَإِنَّ صَلاَةَ آخِرِ اللَّيْلِ مَشْهُودَةٌ وَذَلِكَ أَفْضَلُ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ والترمذي(٥).**

جابیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ دەترسێ کە لە کۆتایی شەوەوە هەڵنەسێ بۆ شەو نوێژ با لە سەرەتای شەوەوە وەتر بکا، وە هەر کەسێ کە بەتەمایە کە لە کۆتایی شەوەوە هەڵبسێ بۆ شەو نوێژ با لە کۆتایی شەودا نوێژی وەتر بکا، چونکە نوێژی ئاخری شەو فریشتەی رەحمەت دینە دیاریو تەماشای دەکەن، ئاشکرایە کە ئەمە زۆر باشترە! (م/ت).

**٦١٥– عَنْ أَبِي قَتَادَةَ** (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) **أَنَّ النَّبِيَّ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ لأَبِي بَكْرٍ: مَتَى تُوتِرُ؟ قَالَ: أُوتِرُ آخِرَ مِنْ أَوَّلِ اللَّيْلِ. وَقَالَ: لِعُمَرَ: مَتَى تُوتِرُ؟ قَالَ: أُوتِرُ اللَّيْلِ. فَقَالَ: لأَبِي بَكْرٍ: أَخَذَ هَذَا بِالْحَزْمِ وَقَالَ: لِعُمَرَ: أَخَذَ هَذَا بِالْقُوَّةِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ(٦).**

ئەبو قەتادە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بە ئەبو بەکری فەرموو: کەی وەتر دەکەی؟ گوتی: لە سەرەتای شەوەوە وەتر دەکەم، بە عومەریشی فەرموو: ئەی تۆ کەی وەتر دەکەی؟ گوتی: لە ئاخری شەوەوە وەتر دەکەم، جا بە ئەبو بەکری فەرموو: ئەمە لایەنی توندو تۆڵی (حەزم)ی گرتووە بە عومەریشی فەرموو: ئەمە لایەنی پتەوی نیاز (عەزم)ی گرتووە (د–سند صالح).

---

(٤) بخاري: ٩٩٦. مسلم: ١٧٣٣ ، ١٧٣٤ ، ١٧٣٥.

(٥) مسلم: ١٧٦٣ ، ١٧٧٤. ترمذي: ٤٥٥.

(٦) بسند صالح (شرحه).

## ١٦٠) تاچەند ركات وەتر دروستە: (بيان الوتر)

٦١٦- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُماَ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: صَلاَةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا أَرَدْتَ أَنْ تَنْصَرِفَ فَارْكَعْ رَكْعَةً تُوتِرُ لَكَ مَا صَلَّيْتَ. رَوَاهُ الخمسة[1].

**ئیبنو عومەر** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: شەو نوێژ دوو ركات دوو ركاتە، جا كەویستت دەست هەڵبگری یەك ركات بكە دەبێ بە وەتری ئەو نوێژانەی كە كردووتن (ش/د/ت/ن).**

٦١٧- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْوِتْرُ رَكْعَةٌ مَنْ آخِرِ اللَّيْلِ. رواه مسلم والنسائي وأحمد[2].

**دیسان گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: نوێژی وەتر یەك ركاتە، باش وایە كە لە ئاخری شەودا بكرێ (م/ن/ئەحمەد).**

٦١٨- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْوِتْرُ حَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ فَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِخَمْسٍ فَلْيَفْعَلْ. وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِثَلاَثٍ فَلْيَفْعَلْ وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِوَاحِدَةٍ فَلْيَفْعَلْ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وانسائي. وفي رواية: الْوِتْرُ حَقٌّ فَمَنْ شَاءَ أَوْتَرَ بِسَبْعٍ وَمَنْ شَاءَ أَوْتَرَ بِخَمْسٍ وَمَنْ شَاءَ أَوْتَرَ بِثَلاَثٍ وَمَنْ شَاءَ أَوْتَرَ بِوَاحِدَةٍ[3].

**ئەبو ئەیوبی ئەنصاری** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: وەتر شتێكی هەقە لەسەر هەموو موسوڵمانێ، جا ئەوەی حەزدەكا كە پێنج ركات وەتر بكا با بیكا، وە ئەوەی حەز دەكا كە سێ ركات وەتر بكا با بیكا، وە ئەوەی حەزدەكا كە یەك ركات وەتر بكا با بیكا. (د/ن- سند صالح) لە گێڕانەوەیەكا: وەتر هەقە، جا ئەوەی حەز دەكا با حەوت**

---

(١) بخاري: ٩٩٠. مسلم: ١٧٤٥ — ١٧٤٨. أبو داود: ١٣٢٦. نسائي: ١٦٩٣.

(٢) مسلم: ١٧٥٤ ، ١٧٥٥. نسائي: ١٦٨٨.

(٣) بسند صالح (شرحه).

ركات وەتر بكا، وە ئەوەی حەزدەكا با پێنج ركات وەتر بكا، وە ئەوەی حەز دەكا با سێ ركات وەتر بكا، وە ئەوەی حەز دەكا با یەك ركات وەتر بكا.

٦١٩- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضيَ أللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُوتِرُ بِثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً فَلَمَّا كَبِرَ وَضَعُفَ أَوْتَرَ بِسَبْعٍ. رَوَاهُ الترمذي والنسائي (٤). وفي رواية: أَوْتَرَ بِتِسْعٍ (شرحه).[٤].

ئوممو سەلەمە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە پێشا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) سیازدە ركات وەتری دەكرد، بەلام كە ئیختیارو بێ هێز بوو حەوت ركاتی دەكرد (ت/ن-س/ح). لە گێڕانەوەیەكی شەرحەكەدا: نۆ ركاتی دەكرد.

٦٢٠- عَنْ طَلْقِ بْنِ عَلِيٍّ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: لاَ وِتْرَانِ فِي لَيْلَةٍ. رَوَاهُ أصحاب السنن[٥].

طەلقی كوڕی عەلی (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خوای لەسەربێ) لە یەك شەوا دوو وەتر نابێ (د/ت/ن-س/ح).

## ١٠٧) قورئان خوێندنی وەتر: (القراءة في الوتر)

٦٢١- عَنْ عَبْدِالعَزِيزِ بْنِ جُرَيْجٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَأَلْنَا عَائِشَةَ بِأَيِّ شَيْءٍ كَانَ يُوتِرُ رَسُولَ اللهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ قَالَتْ: كَانَ يَقْرَأُ فِي الأُولَى بِسَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى وَفِي الثَّانِيَةِ بِقُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ وَفِي الثَّالِثَةِ بِقُلْ هُوَ اللّٰهُ أَحَدٌ وَالْمُعَوِّذَتَيْنِ. رَوَاهُ أصحاب السنن. وزاد النسائ وأبو دَاوُدَ: وَكَانَ يَقُولُ إِذَا سَلَّمَ سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ ثَلاَثاً وَيَرفَعُ صَوْتَهُ بِالثَّالِثَةِ[١].

عەبدولعەزیزی كوڕی جورەیج (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە عائیشەمان پرسی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە نوێژی وەتردا چ سوورەتێكی

---

(٤) بسند حسن (شرحه).

(٥) بسند حسن (شرحه).

(١) بسند حسن (شرحه).

دەخوێند؟ گوتی: لە ركاتی یەكەمدا سوورەتی {سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى}ی دەخوێند، وە لە ركاتی دووەمدا سوورەتی {قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ}ەی دەخوێند، وە لە ركاتی سێیەمدا سوورەتی {قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ}و سوورەتی {قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ}و سوورەتی {قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ}ی دەخوێند (د/ت/ن-س/ح) نەسائیۆ ئەبو داوود ئەمەیان پتر كردووە: كە سەلاویشی دەدایەوە سێ جار دەیفەرموو {سُبْحَانَ الْمَلِكُ الْقُدُّوسُ}: پاكی‌و بێگەردی بۆ پاشای پاكی بێ نەنگ. وە لە سەری جاری سێیەمدا دەنگی لێ هەڵدەبڕی.

٦٢٢- وَسَئِلَتْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهَا): أَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُسِرُّ بِالْقِرَاءَةِ فِي الْوِتْرِ أَمْ يَجْهَرُ؟ قَالَتْ: كُلَّ ذَلِكَ كَانَ يَفْعَلُ رُبَّمَا أَسَرَّ وَرُبَّمَا جَهَرَ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وأبو داود.

پرسیار كرا لە عائیشە (خوای لێ رازی بێ): ئایا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە نوێژی وەتردا قورئانی بە نهێنی دەخوێند یا بە دەنگی بەرز؟ گوتی: بەهەردوولا دەیخوێند، گەلێ جار بە پەنامەكی‌و گەلێ جار بە ئاشكرا دەیخوێند (م/د).

٦٢٣- عَنْ عَلِيٍّ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقُولُ فِي آخِرِ وِتْرِهِ بَعْدَ السَّلاَمِ مِنْهُ: اللَّهُمَّ أنّي أَعُوذَ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ وَبِمعُافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ لاَ أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ. رَوَاهُ أصحاب السنن[٣].

عەلی (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەپاش وەترەوە كە سلاوی دەدایەوە دەیفەرموو:

{اللَّهُمَّ أنّي أَعُوذَ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ وَبِمعُافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ لاَ أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ}.

---

(٣) بسند حسن (شرحه).

خودایە پەنا دەگرم بەرەزامەندی تۆ لە خەشم و قاری تۆ، وە پەنا دەگرم بە چاوپۆشینی تۆ لە تۆڵەسەندی تۆ، وە پەنا دەگرم بە خۆت لە خۆت، وەسپ و ثەنا خوانیی تۆ لە کێشی منا نیە، وە سوپاس و ستایشی تۆ بەکەس نابڕێرێ، ئەوە مەگەر هەر بەخۆت بکرێ! (د/ت/ن–س/ح).

**١٠٨) بەشی سێیەم: باسی دوعاو نزاو پاڕانەوەو ذیکرو یادی خوداو ویرد لەپاش نوێژەوە: الفصل الثالث: في الدعاء والذكر عقب الصلاة**

٦٢٤– عَنْ ثَوْبَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّٰـهِ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) إِذَا انْصَرَفَ مِنْ صَلاَتِهِ اسْتَغْفَرَ ثَلاَثًا وَقَالَ: اللّٰهُمَّ أَنْتَ السَّلاَمُ وَمِنْكَ الـسَّلاَمُ تَبَارَكْـتَ يَاذَا الْجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ. وفي رواية: كَانَ النَّبِيُّ (صَلّٰى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا سَلَّمَ لَمْ يَقْعُدْ إِلاَّ مِقْدَارَ مَا يَقُولُ: اللّٰهُمَّ أَنْتَ السَّلاَمُ إلخ. رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ البخاري[1].

ئەوبان (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کە سڵاوی نوێژی دەدایەوە سێ جار داوای لێ بووردنی لە خودا دەکردو دەیفەرموو:

{أَسْتَغْفِرَ اللهَ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ.

ئینجا دەیفەرموو:

{اللّٰهُمَّ أَنْتَ السَّلاَمُ وَمِنْكَ السَّلاَمُ تَبَارَكْتَ يَاذَا الْجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ}.

خوداوەندا! پەروەردگارا! سەلام ناوی تۆیەو سەرچاوەی سەلام و سەلامەتی و ئامان و پەناو هانا هەر لەلای تۆیە، بە راستی تۆ زۆر بەفەڕو پیرۆزو گەورەیت، ئەی خاوەن شکۆی بەقەدرو حورمەت! لە گێڕانەوەیەکا: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەستووری وابوو کە سڵاوی دەدایەوە تەنیا ئەوەندە دادەنیشت لە نوێژگاکەیدا کە دەیفەرموو {اَللّٰهُمَّ أَنْتَ السَّلَام} تاد (م/د/ت/ن).

---

(١) مسلم: ١٣٣٣ ، ١٣٣٤. أبو داود: ١٥١٣. ترمذي: ٣٠٠. نسائي: ١٣٣٦.

٦٢٥- عَنْ زَيْدٍ مَوْلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أَسْتَغْفِرَ اللَّهَ الَّذِى لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَىَّ الْقَيُّومَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ. غُفِرَ لَهُ وَإِنْ كَانَ فَرَّ مِنَ الزَّحْفِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي ولفظه: مَنْ أَسْتَغْفِرَ اللهَ الْعَظِيمَ[٢].

زەیدی ئازا كراوی پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرەو رەزای خودا لە زەید) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەر كەسێ بڵێ:

{أَسْتَغْفِرَ اللَّهَ الَّذِى لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَىَّ الْقَيُّومَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ}.

داوای لێبووردن‌و تاوان بەخشین لەو خودایە دەكەم كە بێجگە لەخۆی خودای تر نیە، كە نەمرو زیندووەو راگری عالەمەو مایەی مانی هەموو شتێكە، وە پەشیمانم لە تاوانم‌و تەوبە دەكەم لە كوناهانم‌و دەگەڕێمەوە بۆ لای ئەو. فەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ) هەر كەسێ ئەمە بڵێ خودا لێی خۆش دەبێ، گریمان ئەو كەسە لە ریزی غەزاشا هەڵهاتبێ هەر خودا لێی خۆش دەبێ (د-سند صالح-ت) گفتەی ترمیذي: لە جیاتی رستەی {مَنِ أَسْتَغْفَرَ اللهَ الَّذِي} رستەی {مَنِ آسْتَغْفَرَ اللهَ الْعَظِيمِ الَّذِي}یە تا دوایی فەرموودەكە.

٦٢٦- عَنْ وَرَّادٍ مَوْلَىَ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَتَبَ الْمُغِيرَةُ إِلَى مُعَاوِيَةَ إِنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ إِذَا فَرَغَ مِنْ صَلاَتِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَىَ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ وَلاَ مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ الترمذي[٣].

وەڕرادی نۆكەری موغیرەی كوڕی شوعبە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: موغیرە نامەی نووسی بۆ موعاوییە لەسەر داوای خۆی كاتێ كە فەرمانڕەوای موسوڵمانان بوو: جاران كە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) كە لە نوێژ دەبوەوەو سلاوی دەدایەوە دەیفەرموو:

---

(٢) رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

(٣) بخاري: ٨٤٤ ، ٢٤٠٨ ، ٥٩٧٥ ، ٦٣٣٠ ، ٦٤٧٣ ، ٦٦١٥ ، ٧٢٩٢. مسلم: ١٣٣٧ – ١٣١٤. أبو داود: ١٥٠٥. نسائي: ١٣٤٠ ، ١٣٤١ ، ١٣٤٢.

{ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ اَللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِماَ أَعْطَيْتَ وَلاَ مُعْطِيَ لِماَ مَنَعْتَ وَلاَ يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدُّ}.

بێجگە لە خودا هیچ خودایەکی تر نیە، خودایەکی تاکو تەنیایە، هیچ هاوبەشێکی نیە، موڵکو دارایی و پاشایەتی و سەڵتەنەتو سوپاس و ستایش هەموو بۆ ئەوە، وە ئەو خودایەکی وایە دەستی دەڕوا بە سەر هەموو شتێکاو تەوانای هەموو شتێکی هەیە، پەروەردگارا! هەرچی تۆ بیدەیت بە کەسی تر نابڕێت، هەرچیش تۆ نەیدەیت بە کەسی تر نادرێت، دارایی داراو دەستداریی دەستدار هیچ دادییێکیان نادا لەلای تۆ (ش/د/ن).

٦٢٧- عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مُعَقِّبَاتٌ لاَ يَخِيبُ قَائِلُهُنَّ أَوْ فَاعِلُهُنَّ ثَلاَثٌ وَثَلاَثُونَ تَسْبِيحَةً وَثَلاَثٌ وَثَلاَثُونَ تَحْمِيدَةً وَثَلاَثٌ وَثَلاَثُونَ تَكْبِيرَةً فِي دبُرِ كَلِّ صَلاَةٍ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ والترمذي[٤].

کەعبی کوڕی عوجرە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: چەن وشەو چەن تەسبیحاتێ هەن لەپاش نوێژەکانەوە دەگوترێن، هەر کەسێ لەپاش هەموو نوێژێ بیانڵێ یا بیانکات قەت نائومێد نابێ، ئەویش ئەمەیە کە لەپاش هەموو نوێژێ سیی و سێ {سُبْحَانَ اللّٰهِ}و سیی و سێ {اَلْحَمْدُ لِلّٰهِ}و سی و سێ {اَللّٰهُ أَكْبَرُ} بکا (م/ت).

٦٢٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ فُقَرَاءَ الْمُهَاجِرِينَ أَتَوْا رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالُوا: ذَهَبَ أَهْلُ الدُّثُورِ بِالدَّرَجَاتِ وَالنَّعِيمِ الْمُقِيمِ. فَقَالَ: وَمَا ذَاكَ؟ قَالُوا: يُصَلُّونَ كَمَا نُصَلِّي وَيَصُومُونَ كَمَا نَصُومُ وَيَتَصَدَّقُونَ وَلاَ نَتَصَدَّقُ وَيُعْتِقُونَ وَلاَ نُعْتِقُ. فَقَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَفَلاَ أُعَلِّمُكُمْ شَيْئًا تُدْرِكُونَ بِهِ مَنْ سَبَقَكُمْ وَتَسْبِقُونَ بِهِ مَنْ بَعْدَكُمْ وَلاَ يَكُونُ أَحَدٌ أَفْضَلَ مِنْكُمْ إِلاَّ مَنْ صَنَعَ مِثْلَ مَا صَنَعْتُمْ؟ قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللّٰهِ. قَالَ: تُسَبِّحُونَ وَتُكَبِّرُونَ وَتَحْمَدُونَ دُبُرَ كُلِّ صَلاَةٍ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ مَرَّةً. قَالَ: أَبُو صَالِحٍ: فَرَجَعَ فُقَرَاءُ الْمُهَاجِرِينَ إِلَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالُوا: سَمِعَ إِخْوَانُنَا

(٤) مسلم: ١٣٤٩. ترمذي: ٣٤١٢. نسائي: ١٣٤٨.

أَهْلُ الأَمْوَالِ بِمَا فَعَلْنَا فَفَعَلُوا مِثْلَهُ. فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ. رَوَاهُ الأربعة. وَزَادَ أَبُو دَاوُدَ: وَتَخْتِمُهَا بِلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيْكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. ولفظ الترمذي قولُوا: سُبْحَانَ اللَّهَ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ وَالْحَمْدُ اللَّهَ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ وَاللَّهُ أَكْبَرُ أَرْبَعاً وَثَلاَثِينَ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ عَشْرَ مَرَّاتٍ.(٥).

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: هەژارانی كۆچكەران (مهاجرین) هاتن بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! هەرچی پایەی بەرزو نازو نیعمەتو بەهرەی پایە دار هەیە هەمووی داراو دەوڵەمەندەكان دەیبەن بۆ خۆیانّ! پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: چۆن؟ عەرزیان كرد: چونكە ئەوان وەك ئێمە نوێژدەكەنو وەك ئێمە ڕۆژوو دەگرنو سەرەڕای ئەوەیش ماڵیان هەیە خێرو خێراتی لێ دەكەنو بەندەی لێ دەكڕنو بۆ ڕەزای خودا ئازادی دەكەن بەلاّم ئێمە ماڵمان نیە، لەبەر ئەوە نەخێرمان پێ دەكرێو نەبەندەمان بۆ ئازاد دەكرێ پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: دەبا شتێكتان فێربكەم كە ئەوانەی پێ دەگرنەوە كە پێشتان كەتوون، وە هەمیشەیش پێش ئەوانە دەكەون كە ئێستا وان لە دواتانەوە، وە كەس لە ئێوە باشتر نابێ مەگەر كەسێ كە وەك ئێوە ئەوە بكا؟ گوتیان: فەرموو بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: لە پاش هەموو نوێژێ سیی و سێ جار {سُبْحَانَ اللهِ} و سیی و سێ جار {الْحَمْدُ لِلهِ} و سیی و سێ جار {اللهُ أَكْبَرُ} بكەن، ئەبو صالح (كەراوییە لە ئەبو هورەیرەوە) گوتی: دیسانەوە هەژارانی كۆچكەران كەڕانەوە بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) گوتیان: برا موسوڵمانە دەوڵەمەندەكانمان ئەوەیان بیستۆتەوە كە ئێمە دەیكەین وە ئەوانیش وەك ئێمە هەمان شت دەكەن! پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) (بەم بۆنەیەوە ئیستیشهادی بەم ئایەتە پیرۆزەیە كردو فەرمووی: {ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاء – ٥/٥٤}.

---

(٥) بخاري: ٨٤٣ ، ٦٣٢٩. مسلم: ١٣٤٦ ، ١٣٤٧.

**واتە: ئەمە لە سایەو فەضڵ‌وگەورەیی خوداوەیە، لەگەڵ هەر كەسێكا مەیلی هەبێ دەیكا (ش/د/ت) ئەبو داوود بە رەحمەتی خودابێ ئەمەی لێ پتر كردووە: لە كۆتاییدا بڵێ:**

{لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ}.

**گفتەی تیرمیذیش ئاوایە: سیی و سێ جار بڵێن {سُبْحَانَ اللهِ} و سیی و سێ جار بڵێن {الْحَمْدُ لِلهِ} و سیی و چوار جار بڵێن {اللهُ أَكْبَرُ} و دەجار بڵێن: {لا اله الا الله}.**

٦٢٩- وَلِمُسْلِمٍ: مَنْ سَبَّحَ اللَّهَ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ وَحَمِدَ اللَّهَ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ وَكَبَّرَ اللَّهَ ثَلاَثًا وَثَلاَثِينَ فَتِلْكَ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ وَقَالَ: تَمَامَ الْمِائَةِ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ غُفِرَتْ خَطَايَاهُ وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ[٦].

**ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەر كەسێ (لەپاش هەموو نوێژێ) سیی و سێ جار تەسبیحات بكا، وە سیی و سێ جار حەمدو سوپاسی خودا بكا، وە سیی و سێ جار ئەڵڵاهو ئەكبەر بكا) كە ئەمە هەمووی دەكاتە نەوەت و نۆ جار، وە لەسەری جاری سەد هەما بڵێ:**

{لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ}:

**هەركەسێ لەپاش هەموو نوێژێ ئەمە بكا خودا لە هەموو تاوانەكانی خۆش دەبێ، هەرچەن تاوانەكانی وەك كەفی دەریاش زۆربن (م).**

٦٣٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ عِنْدِ جُوَيْرِيَةَ وَهِيَ فِي مُصَلاَّهَا وَدَخَلَ وَهِيَ فِي مُصَلاَّهَا فَقَالَ: لَمْ تَزَالِي فِي مُصَلاَّكِ

---

(٦) مسلم: ١٣١٥.

هَذَا؟ قَالَتْ: نَعَمْ قَالَ: قَدْ قُلْتُ بَعْدَكِ أَرْبَعَ كَلِمَاتٍ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ لَوْ وُزِنَتْ بِمَا قُلْتِ لَوَزَنَتْهُنَّ: سُبْحَانَ اللّٰهِ وَبِحَمْدِهِ عَدَدَ خَلْقِهِ وَرِضَا نَفْسِهِ وَزِنَةَ عَرْشِهِ وَمِدَادَ كَلِمَاتِهِ. رَوَاهُ الخمسة الا البخاري[٧].

**ئیبنو عەبباس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەلای جووەیرییەی هاوسەری بوو، جوەیرییە لە نوێژگاکەیدا بوو خەریکی یادی خودا بوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەسەر ئەم حاڵە بەجێی هێشتو دەرچووە دەرەوە، وە لەپاش ماوەیێ کە گەڕایەوە بۆ لای جووەیرییە هەر لەسەر نوێژگاکەی بوو هەر خەریکی یادی خودا بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) پێی فەرموو: لەوساکەوە لێرەدا هەر خەریکی تەسبیحاتیت؟ گوتی: بەڵێ. فەرمووی: دەسا من لە دوا ئەوە کە لە تۆ جیا بوومەتەوە سێ جار ئەم چوار وشەیەم گوتووە، ئەگەر هەڵبکێشرێن بەو هەموو تەسبیحاتەدا کە تۆ لەوساکەوە کردوتن بەرابەریان دەکەن کە ئەویش ئەمەیە:**

{سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ عَدَدَ خَلْقِهِ وَرِضَا نَفْسِهِ وَزِنَةَ عَرْشِهِ وَمِدَادَ كَلِمَاتِهِ}.

**بەقەی ژمارەی دروستکراوانی خودا تەسبیحاتو حەمدو سوپاسی خودا دەکەم، ئەوەندەی کە خودا خۆی پێی خۆش بێ، وە بەقەد سەنگو کێشی تەختو بارەگای خودا، وە بەقەد ژمارەی وشەکانی خودا.** (م/د/ت/ن).

٦٣١- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَخَذَ بِيَدِهِ وَقَالَ: يَا مُعَاذُ! إِنِّي وَاللّٰهِ لأُحِبُّكَ أُوصِيكَ يَا مُعَاذُ لاَ تَدَعَنَّ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلاَةٍ تَقُولُ: اللّٰهُمَّ أَعِنِّي عَلَى ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي[٨].

**موعاذی کوڕی جەبەل (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەستی گرتمو فەرمووی: ئەی موعاذ! بەخودا من زۆر تۆم خۆش دەوێ، ئەی**

---

(٧) مسلم: ٦٨٥١ ، ترمذي: ٣٥٥٥ ، نسائي: ١٣٥١.

(٨) بسند صحيح (شرحه).

موعاذ! کەواتە با ئامۆژگارییەکت بکەم: لەپاش هەموو نوێژێ ئەم وشانە بڵێ و هەرگیز تەرکیان مەکە بڵێ:

{اللَّهُمَّ أَعِنِّى عَلَى ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ}.

خودایە! یاریدەم بدە لەسەر ذیکرو یادی خۆت وە لەسەر سوپاس و ستایشی خۆت وە لەسەر بەندەیی و عیبادەتی خۆت لەسەر شێوەیەکی شیرین و جوان (د/ن–س/ص).

٦٣٢– عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ أَقْرَأَ بِالْمُعَوِّذَاتِ دُبُرَ كُلِّ صَلَاةٍ. رَوَاهُ أصحاب السنن والحاكم وصححّه[٩].

عوقبەی کوڕی عامیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمانی پێ کردم کە لەپاش هەموو نوێژێ سوورەتی {قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ}و سورەتی {قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ} بخوێنم (د/ت/ن/حاکم – حاکم بە صەحیحی داناوە).

٦٣٣– عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لِرَجُلٍ: كَيْفَ تَقُولُ فِي الصَّلَاةِ؟ قَالَ: أَتَشَهَّدُ وَأَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّى أَسْأَلُكَ الْجَنَّةَ وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ النَّارِ أَمَا إِنِّى لاَ أُحْسِنُ دَنْدَنَتَكَ وَلاَ دَنْدَنَةَ مُعَاذٍ. فَقَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَوْلَهَا نُدَنْدِنُ. وَفِي رِوَايَةٍ: إِنِّي وَمُعَاذٌ حَوْلَ هَاتَيْنِ نُدَنْدِنُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وابن ماجه[١٠].

جابیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بە پیاوێکی فەرموو: لە نوێژدا چی دەڵێیت؟ گوتی: تەحیات دەخوێنم و دەڵێم:

{اللَّهُمَّ إِنِّى أَسْأَلُكَ الْجَنَّةَ وَأَعُوذُ بِكَ مِنَ النَّارِ}

پەروەردگارا! داوای بەهەشت لێ دەکەم و پەنا دەگرم بەتۆ لە ئاگری دۆزەخ، بەڵام ئەم ورتە ورتەی کە تۆو موعاذ دەیکەن من نایزانم، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئێمەیش هەر بە دەوری بەهەشتا

---

(٩) صحيح عند الحاكم.

(١٠) لم يبين الشارح درجته (مترجم).

ورتە ورت دەكەین، لە گێڕانەوەیەكا: من و موعاذیش هەر بەدەوری ئەم دوانەدا ئەم سرپەسرپە دەكەین! (د/ ئیبنو ماجە).

## ١٠٩) باسی حەوتەم: باسی كوڕنووشی هەڵە (سەجدەی سەهو)و كوڕنووشی قورئانخوێندن (سەجدەی تیلاوەت)، (ئەم باسە دوو بەشە):

## بەشی یەكەم: باسی هۆی كوڕنووشی بەهەڵە داچوون

## الباب السابع: في سجود السهو والتلاوة وفيه فصلان

## الفصل الأول: في أسباب سجود السهو

٦٣٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا قَامَ يُصَلِّي جَاءَهُ الشَّيْطَانُ فَلَبَسَ عَلَيْهِ حَتَّى لاَ يَدْرِي كَمْ صَلَّى فَإِذَا وَجَدَ ذَلِكَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ. رَوَاهُ الخمسة. وزاد ابو دَاوُدَ: قبل التسليم[1].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: كاتێ یەكێ لە ئێوە كە هەڵ دەسێ و دەست دەكا بە نوێژ، شەیتان دێ بەلایەوەو بە رنگێكی وا سەری لێ دەشێوێنێ كە خۆشی نازانێ چەند ركات نوێژ دەكا، جا ئەگەر تووشی شتێ وابوون لەناو نوێژا بە دانیشتنەوە دوو كوڕنووش بەرن (ش/د/ت/ن) گێڕانەوەی ئەبو داوود ئەمەی پترە: بە دانیشتنەوە دوو كوڕنووش ببەن لە پێش سڵاودانەوەدا.

٦٣٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا شَكَّ أَحَدُكُمْ فِي صَلاَتِهِ فَلَمْ يَدْرِ كَمْ صَلَّى ثَلاَثًا أَمْ أَرْبَعًا فَلْيَطْرَحِ الشَّكَّ وَلْيَبْنِ عَلَى مَا اسْتَيْقَنَ ثُمَّ يَسْجُدُ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ، فَإِنْ كَانَ صَلَّى خَمْسًا شَفَعْنَ لَهُ صَلاَتَهُ وَإِنْ كَانَ صَلَّى إِتْمَامًا لأَرْبَعٍ كَانَتَا تَرْغِيمًا لِلشَّيْطَانِ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وأَبُو دَاوُدَ وَأَحمَد[2].

ئەبو سەعیدی خودری (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر كەسێكتان لە نوێژدا گومانی بۆ پەیدا بوو، وە نەی دەزانی

---

(١) بخاري: ١٢٣٢. مسلم: ١٢٦٥. أبو داود: ١٠٣٠. نسائي: ١٢٥١.

(٢) مسلم: ١٢٧٢. أبو داود: ١٠٢٤ ، ١٠٢٦ ، ١٠٢٧. نسائي: ١٢٣٢.

كە چەن ركات نوێژی كردووە، وەك ئەوە نەیدەزانی كە سێ ركاتی كردووە یا چوار، ئەوە با گومانەكەی تووڕبدا، چەندەی لە لایەقین و بێگومانە با لەسەر ئەوەوە نوێژەكەی تەواو بكا، لەپاشا لەپێش سەلام دانەوەوە دوو كوڕنووشی هەڵـە ببـات، جـا ئەگـەر لـە راسـتیدا پێـنج ركـاتی كردبـوو ئـەوا ئـەو دوو كوڕنووشە نوێژەكەی دەكەنـەوە بە جـووت، ئەگەر چواری تەوایشی كردبوو ئـەوا ئـەو دوو كوڕنووشـە دەبن بـەهۆی نوشوستی و سـەر شۆڕی بۆ شـەیتان (م/د/ئەحمەد).

٦٣٦- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا سَهَا أَحَدُكُمْ فِي صَلاَتِهِ فَلَمْ يَدْرِ وَاحِدَةً صَلَّى أَوْ ثِنْتَيْنِ فَلْيَبْنِ عَلَى وَاحِدَةٍ فَإِنْ لَمْ يَدْرِ ثِنْتَيْنِ صَلَّى أَوْ ثَلاَثًا فَلْيَبْنِ عَلَى ثِنْتَيْنِ فَإِنْ لَمْ يَدْرِ ثَلاَثًا صَلَّى أَوْ أَرْبَعًا فَلْيَبْنِ عَلَى ثَلاَثٍ وَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يُسَلِّمَ. رَوَاهُ أَحمد والترمذي وصحَّحه[٣].

عەبدولڕەحمانی كـوڕی عـەوف (خـوای لێ رازی بێ) گـوتی: پێغەمبـەر (درووودی خوای لەسەربێ) فـەرمووی: ئەگـەر كەسـێكتان لـە نوێـژدا بـە هەڵـەدا چـوو، وەنـەی دەزانی كە یەك ركاتی كـردووە یـا دوو، بـا لەسـەر یـەك ركاتـەوە تـەواوی بكـا، ئەگـەر نـەی دەزانـی كـە دوو ركـاتی كـردووە یـا سـێ بـا لەسـەر دوو ركاتـەوە تەواوی بكا، ئەگەر نەیدەزانی كە سێ ركاتی كردووە یا چوار با لەسەر سێ ركاتەكـەوە ركـاتێكی تـر بكـا، وە لـە هـەموو ئـەم حاڵانەشـدا لـە پـێش سلاّودانەوەدا دوو كوڕنووش ببا (ئەحمەد/ت:ص).

٦٣٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ابْنِ بُحَيْنَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: إِنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَامَ مَنْ اثْنَتَيْنِ مِنَ الظُّهْرِ لَمْ يَجْلِسُ بَيْنَهُماَ فَلَماَ قَضَى صَلاَتَهُ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ بَعْدَ ذَلِكَ وَسَجَدَهُمَا النَّاسُ مَعَهُ مَكَانَ مَا نَسِيَ مِنَ الْجُلُوسِ. رَوَاهُ الخمسة[٤].

عەبدوڵڵای كوڕی بوحەینە (خوای لێ رازی بێ) گوتـی: جارێ پێغەمبـەر (درووودی خوای لەسەربێ) لە ركاتی دووەمی نوێژی نیوەڕۆدا یەكسەر هەڵسایەوەو تەحیاتی

---

(٣) صحيح عنه الترمذي.

(٤) بخاري: ٨٢٩ ، ٨٣٠ ، ١٢٢٤ ، ١٢٢٥ ، ١٢٣٠ ، ٦٦٧٠. أبو داود : ١٠٣٤ ، ١٠٣٥. ترمذي: ٣٩١. نسائي: ١١٧٦ ، ١١٧٧.

یەكەمی نەخوێند، لە پاشا كە نوێژەكەی تەواو كرد دوو كوڕنووشی برد لە جیاتی ئەو تەحیاتەی كە لە یادی چوو بوو، ئینجا لەپاش ئەوە سڵاوی دایەوە، وە خەڵكەكەش لەگەڵ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ئەم دوو كوڕنووشەیان برد (ش/د/ت/ن).

٦٣٨- عَنِ الْمُغِيرَةِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا قَامَ الإِمَامُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ فَإِنْ ذَكَرَ قَبْلَ أَنْ يَسْتَوِيَ قَائِمًا فَلْيَجْلِسْ فَإِنِ اسْتَوَى قَائِمًا فَلاَ يَجْلِسْ وَيَسْجُدُ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَأَحْمَد والبيهقي[٥].

موغیرە (خوای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر پێشنوێژ (ئیمام) لە ركاتی دووەما یەكسەر هەڵسایەوەو لە یادی نەبوو كە تەحیات بخوێنێ ئەوە ئەگەر پێش ئەوەی كە ڕێك ڕاوەستێ یادی كەوتەوە كە تەحیاتی نەخوێندووە بارێك دابنیشێتەوەو تەحیات بخوێنێ بەڵام ئەگەر ڕاست ڕاوەستا ئەوساكە یادی كەوتەوە كە تەحیاتی نەخوێندووە ئەوە بادانەنیشێتەوە، بەڵكوو لە پێش سەلام دانەوەدا لە جیاتی ئەو هەڵەیە دوو كوڕنووشی بەهەڵەدا چوون ببات (د/ئەمحەد/بەیهەقی).

٦٣٩- عَنْ زِيَادِ بْنِ عِلاَقَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّى بِنَا الْمُغِيرَةُ فَلَمَّا صَلَّى رَكْعَتَيْنِ قَامَ وَلَمْ يَجْلِسْ فَسَبَّحَ بِهِ مَنْ خَلْفَهُ فَأَشَارَ إِلَيْهِمْ أَنْ قُومُوا فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ صَلاَتِهِ سَلَّمَ وَسَجَدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ وَقَالَ: هَكَذَا صَنَعَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رَوَاهُ الترمذي وَأَبُو دَاوُدَ[٦].

زیادی كوڕی عیلاقە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: موغیرە (خوای لێ ڕازی بێ) نوێژی بۆ دەكردین، كە دوو ركاتی كرد یەكسەر هەڵساو دانەنیشت بۆ تەحیاتی یەكەم جا ئەوانەی كە لەپێشەوە بوون دەستیان كرد بە سوبحانەڵلا كردن بۆی هەتا ئاگادار ببێتەوەو دابنیشێتەوە بۆ خوێندنی تەحیات بەڵام موغیرە ئیشارەتی بۆ كردن: كە هەڵسن، جا كە نوێژەكەی تەواوكرد سڵاوی دایەوەو

(٥) سكت عنه الشارح.

(٦) بسند صالح (شرحه).

دوو کوڕنووشی بە هەڵەدا چوونی برد، وە گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئاوەهای کرد (ت/د-سند صالح).

٦٤٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّى لَنَا رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَلاَةَ الْعَصْرِ فَسَلَّمَ فِي رَكْعَتَيْنِ فَقَامَ ذُو الْيَدَيْنِ فَقَالَ: أَقَصُرَتِ الصَّلاَةُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَمْ نَسِيتَ؟ فَقَالَ: رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): كُلُّ ذَلِكَ لَمْ يَكُنْ. فَقَالَ: قَدْ كَانَ بَعْضُ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَأَقْبَلَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: أَصَدَقَ ذُو الْيَدَيْنِ؟ فَقَالُوا: نَعَمْ يَا رَسُولَ اللهِ، فَأَتَمَّ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَا بَقِيَ مِنَ الصَّلاَةِ ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ بَعْدَ التَّسْلِيمِ. رَوَاهُ الخمسة[٧].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەر نوێژیی نوێژی عەصری بۆ دەکردین، دوو رکاتی کردو سلاوی دایەوە، (ذو اليدين)یش هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا نوێژ کورت کراوەتەوە یا تۆ لەیادت نەبوو؟ پێغەمبەریش گوتی: با، ئەی پێغەمبەری خودا! یەکێ لەم دوو شتە رووی دا، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) رووی کردە خەڵکەکەو فەرمووی: ئایا شتی وا رووی داوە ذولیەدین راست دەکا؟ گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا! ئینجا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دوو رکاتی تری کردو بە دانیشتنەوە (لە پاش سلاو دانەوە) دوو کوڕنووشی هەڵەی برد (ش/د/ت/ن).

٦٤١- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ الْحُصَيْنِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَلَّمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي ثَلاَثِ رَكَعَاتٍ مِنَ الْعَصْرِ ثُمَّ قَامَ فَدَخَلَ الْحُجْرَةَ فَقَامَ رَجُلٌ بَسِيطُ الْيَدَيْنِ فَقَالَ: أَقُصِرَتِ الصَّلاَةُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَخَرَجَ مُغْضَبًا فَصَلَّى الرَّكْعَةَ الَّتِي كَانَ تَرَكَ ثُمَّ سَلَّمَ ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَي السَّهْوِ ثُمَّ سَلَّمَ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وَأَبُو دَاوُدَ وَأَحْمَد[٨].

---

(٧) مسلم. سهو الصلاة: ١٢٨١ — ١٢٩٠. بخاري: ٤٠٤. أبو داود. صلاة: ١٠١٩. ترمذي سجدة السهو: ٣٩٢. نسائي. سهو الصلاة: ١٢٥٣.

(٨) مسلم: ١٢٩٣ ، ١٢٩٤. أبو داود: ١٠١٨. نسائي: ١٢٣٦ ، ١٣٣٠.

**عیمرانی کوڕی حوصەین** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **نوێژی عەصری دەکرد، سێ ڕکاتی کردو سلاوی دایەوە، ئینجا هەڵساو چووە ناو هۆدەکەوە، جا پیاوێکی دەست شۆڕ هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا نوێژ کورت کراوەتەوە؟ پێغەمبەریش فەرمووی: خەیر! ئەم دوو شتە هیچیان ڕووی نەداوە، ئەویش** (دروودی خوای لەسەربێ) **بە تووڕەیی هاتە دەرەوەو ئەو ڕکاتەی کە پەڕاندبووی کردیەوە، ئینجا سلاوی دایەوە، لەپاشا دوو کوڕنووشی بەهەڵەدا چوونی برد، لەپاشا دیسانەوە سلاوێکی تری دایەوە (م/د/احمد).**

٦٤٢- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَلَّى الظُّهْرَ خَمْسًا فَقِيلَ لَهُ: أَزِيدَ فِي الصَّلاَةِ؟ فَقَالَ: وَمَا ذَاكَ قَالَ: صَلَّيْتَ خَمْسًا. فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ بَعْدَ مَا سَلَّمَ. وفي رواية: إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ أَذْكُرُ كَمَا تَذْكُرُونَ وَأَنْسَى كَمَا تَنْسَوْنَ. ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَي السَّهْوِ. رَوَاهُ الخمسة[٩].

**عەبدوڵلا** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **نوێژی نیوەڕۆی دەکرد، پێنج ڕکاتی کرد، یاران عەرزیان کرد: ئایا نوێژ لێی زیاد کراوە؟ پێغەمبەریش** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: بۆچی، چی بووە؟ گوتیان: پێنج ڕکاتت کرد، ئەویش لەپاش سلاو دانەوە دوو کوڕنووشی تری بردلە گێڕانەوەیەکا: فەرمووی: منیش ئادەمیزادێکم وەکوو ئێوە، چۆن ئێوە شتتان لەبیر دەبێ و شتیشتان لەبیر دەچێ منیش هەروەها ئنجا دوو کوڕنووشی هەڵەی برد (ش/د/ت/ن).**

٦٤٣- وَعَنْهُ قَالَ: صَلَّيْنَا مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَإِمَّا زَادَ أَوْ نَقَصَ، قَالَ: إِبْرَاهِيمُ: وَايْمُ اللّٰهِ مَا جَاءَ ذَاكَ إِلاَّ مِنْ قِبَلِي، قَالَ: فَقُلْنَا يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَحَدَثَ فِي الصَّلاَةِ شَيْءٌ؟ فَقَالَ: لاَ. فَقُلْنَا لَهُ الَّذِى صَنَعَ فَقَالَ: إِذَا زَادَ الرَّجُلُ أَوْ نَقَصَ فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ قَالَ: ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وَأَبُو دَاوُدَ[١٠].

---

(٩) بخاري: ٤٠١، ٤٠٤، ١٢٢٦ ، ٦٦٧١ ، ٧٢٤٩. مسلم: ١٢٨١. أبو داود: ١٠١٩. ترمذي: ٣٩٢. نسائي: ١٢٥٣.

(١٠) مسلم: ١٢٨٧. ترمذي: ٣٥٣. نسائي: ١٣٢٨.

(ئیبراهیم گوتی: عالقەمە گوتی:) عەبدوڵڵا (خوای لێ رازی بێ - رەزای خودایان لێبێ) گوتی: جارێ حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) بەرنوێژی بۆ دەکردین جا یا لێی زیاکرد، یا لێی کەم کرد، ئیبراهیم گوتی: سوێند بە خودا ئەم لێتێکچوونە لە منەوەیە لە عەلقەمەو عەبدوڵڵاوە نیە. عەبدوڵڵا گوتی: جا گوتمان ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا هیچ گۆڕانێ لە نوێژدا رووی داوە؟ فەرمووی: نەء ئەگەر شتێ رووی بدایە پێم دەگوتن جا ئێمەش چی کردبوو پێمان گوت، فەرمووی: ئەگەر کەسێ لە نوێژی زیاد کرد یا لێی کەم کردەوە با دوو کوڕنووش ببا، گوتی: ئینجا حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) دوو کوڕنووشی هەڵەی برد (م/د).

٦٤٤- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ الْحُصَيْنِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَلَّى بِهِمْ فَسَهَا فَسَجَدَ سَجْدَتَيِ السَّهْوِ ثُمَّ تَشَهَّدَ ثُمَّ سَلَّمَ. رَوَاهُ أصحاب السُّنن والحاكم وصحَّحه[11].

عیمرانی کوڕی حوصەین (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بەرنوێژیی بۆ دەکردین بە هەڵەدا چوو، جا دوو کوڕنووشی بەهەڵە داچوونی برد، ئینجا تەحیاتی خوێند، لە پاشا سڵاوی دایەوە (د/ت/ن- حاکم:ص).

## ١١٠) بەشی دووەم: باسی کوڕنووشی قورئانخوێندن
## (واتە: سەجدەی تیلاوەت): (الفصل الثاني: في سجدة التلاوة)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِآيَاتِنَا الَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِهَا خَرُّوا سُجَّدًا وَسَبَّحُوا بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ -٢٥/٣٢}.

**واتە:** بەراستی هەر ئەو کەسانە بەباشی باوەڕ دەکەن بە ئایەتەکانو نیشانەکانی ئێمە کە هەرکاتێ ئامۆژگاری بکرێن بە خوێندنەوەی ئەو ئایاتانە لەپەو ڕوو کوڕنووش دەبەن بۆ خواو دەکەون بەسەر تەوێڵو ناوەوچاندا، وە

---

(١١) صحيح عند الحاكم.

بەپاكی یادی خوداو پەروەردگاری خۆیان دەكەن‌و بە دووری دەگرن لە هەموو عەیب‌و نەنگیّ، وە سوپاس‌و ستایشی بە دڵ‌و بەدەم دەكەن، لەگەڵ ئەوەشا كەم‌و زۆر خۆیان بەزل نازانن‌و لە فەرمانبەریی خودا بەهیچ جۆر لاملی ناكەن!

٦٤٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا قَرَأَ ابْنُ آدَمَ السَّجْدَةَ فَسَجَدَ اعْتَزَلَ الشَّيْطَانُ يَبْكِي يَقُولُ: يَا وَيْلَهُ. وَفِي رِوَايَةٍ: يَا وَيْلِي أُمِرَ ابْنُ آدَمَ بِالسُّجُودِ فَسَجَدَ فَلَهُ الْجَنَّةُ وَأُمِرْتُ بِالسُّجُودِ فَأَبَيْتُ فَلِيَ النَّارُ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ[1].

ئەبو هورەیرە (خوای لیّ رازی بیّ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربیّ) فەرمووی: كاتیّ ئادەمیزاد كە ئایەتی سەجدە دەخوێنیّ‌و سەجدەی تیلاوەت دەبا بۆ خودا، شەیتان لە تاوانا كلا دەبیّ‌و كەنار دەگری‌و دەڵیّ: ئەی هاوار لە خۆی، لە گێڕانەوەیەكا: دەڵیّ: ئەی هاوار لەخۆم! فەرمان كرا بە ئادەمیزاد كوڕنووش بباو كە كوڕنووشی بردو بەهەشتی بۆ بوو، وە فەرمان كرا بە من كە كوڕنووش ببەم، بەلاّم من كوڕنووشم نەبردو ئاگری دۆزەخم بۆ مایەوە (م).

٦٤٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْرَأُ السُّورَةَ الَّتِي فِيهَا السَّجْدَةِ فَيَسْجُدُ وَنَسْجُدُ مَعَهُ حَتَّى مَا يَجِدُ أَحَدُنَا مَكَانًا لِنَوْضِعِ جَبْهَتِهِ. رَوَاهُ الثلاثة[2].

ئیبنو عومەر (خوایان لیّ رازی بیّ) گوتی: جاران كە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربیّ) ئەو سوورەتانەی دەخوێند كە ئایەتی كوڕنووش (ئایەتی سەجدە)یان تیایە، بۆ خۆی كوڕنووشی تیلاوەتی دەبردو ئێمەش لەگەڵیا ئەو كوڕنووشەمان دەبرد، جا لە بەرزۆری عەشاماتەكە هەندێكمان جێگەی دەست نەدەكەوت هەتا لە كاتی كوڕنووشەكەدا تەوێڵی لەسەر دانیّ (ش/د).

---

(١) مسلم. إيمان: ٢٤٠.

(٢) بخاري. سجود القرآن: ١٠٧٥ ، ١٠٧٩. مسلم. مساجد: ١٢٩٥ ، ١٢٩٦. أبو داود. صلاة: ١٤١٢.

٦٤٧- وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْرَأُ عَلَيْنَا الْقُرْآنَ فَإِذَا مَرَّ بِالسَّجْدَةِ كَبَّرَ وَسَجَدَ وَسَجَدْنَا مَعَهُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَالحاكم[٣].

**گوتی: یاسای پێغەمبەر وابوو (دروودی خوای لەسەربێ) کە قورئانی پێ دەخوێندین، کاتێ دەگەیشتە سەر ئایەتی کوڕنووش، ئەڵلاهو ئەکبەری دەکردو کوڕنووشی دەبرد، ئێمەش لەگەڵیا ئەو کوڕنووشەیەمان دەبرد! (د/حاکم).**

٦٤٨- عَنْ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قُلْتُ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَا رَسُولَ اللَّهِ فِي سُورَةِ الْحَجِّ سَجْدَتَانِ؟ قَالَ: نَعَمْ. وَمَنْ لَمْ يَسْجُدْهُمَا فَلاَ يَقْرَأْهُمَا. رَوَاهُ أبو داود والترمذي والحاكم وصححه[٤].

**عوقبەی کوڕی عامیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: بە پێغەمبەرم گوت (دروودی خوای لەسەربێ) ئەی پێغەمبەری خودا! سوورەتی حەج دوو ئایەتی سەجدەی تیایە؟ فەرمووی: بەڵێ: وە ئەوەی لەکاتی خوێندنی ئەو دوو ئایەتەدا کوڕنووش، نەبا با نەشیان خوێنێ (د/ت-حاکم:ص).**

٦٤٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ ألنَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْرَأُ فِي الْجُمُعَةِ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ أَلَم تَنْزِيلُ السَّجْدَةُ وَهَلْ أَتَى عَلَى الإِنْسَانِ حِينٌ. رَوَاهُ الشيخان والترمذي[٥].

**ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە نوێژی بەیانیی رۆژی هەینیدا ئەم دوو سوورەتەی دەخوێند: لە رکاتی یەکەما سوورەتی سەجدەی دەخوێند، وە لە رکاتی دووەما سوورەتی {هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ}ی دەخوێند (ش/ت).**

---

(٣) كست عن درجته الشارح (مترجم).

(٤) صحيح عند الحاكم.

(٥) بخاري: جمعه: ٨٩١ ، ١٠٦٨. مسلم: جمعه: ٢٠٢٨ ، ٢٠٣٢. أبو داود: جمعة: ١٠٧٤ ، ١٠٧٥. ترمذي. صلاة: ٥٢٠. نسائي: صبح يوم الجمعة: ٩٥٥.

٦٥٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُماَ) قَالَ: (ص) لَيْسَ مِنْ عَزَائِمِ السُّجُودِ وَقَدْ رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَسْجُدُ فِيهَا. رَوَاهُ البخاري والترمذي وأبو دَاوُدَ[٦].

ئیبنو عەبباس (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: ئایەتەکەی سوورەتی (ص) لە ئایەتە دامەزراوەکانی سەجدەی تیلاوەت نیە، لەگەڵ ئەمەشا من بە چاوی خۆم دیومە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کوڕنووشی تیا دەبردو دەیفەرموو: ئەمە بۆ داوود سەجدەی تەوبە بوو، بەلاّم بۆ ئێمە سەجدەی شوکرە، واتە: کوڕنووشی سوپاس، ئایەتەکەش ئەمەیە:

{وَظَنَّ دَاوُدَ انَّما فَتَنَّاهُ فَاسْتَغْفَرَ رَبَّهُ وَخَرَّ راَكِعاً وَأَناَبَ – ٣٨/٢٤}.

واتە: جا داوود حاڵی بوو کە ئێمە ئەومان بەم رووداوە گرفتار کردووە تا تاقی بکەینەوە، ئیتر بۆیە ئەویش دەس بەجێ دەستی کرد بە پاڕانەوە لە خودای خۆی و کەوت بەرووداو سەجدەی تەوبەی بردو گەڕایەوە بۆلای خودای گەورە (ب/ت/د).

٦٥١- وَقَرَأَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ عَلىَ الْمِنْبَرِ (ص) فَلَّماَ بَلَغَ السَّجْدَةَ نَزَلَ فَسَجَدَ وَسَجَدَ النَّاسُ مَعَهُ. فَلَماَ كَانَ يَوْمٌ آخَرُ قَرَأَهَا فَلَمَّا بَلَغَ السَّجْدَةَ تَشَزَّنَ النَّاسُ لِلسُّجُودِ فَقَالَ: رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إنَّمَا هِيَ تَوْبَةُ نَبِيّ وَلَكِنِّي رَأَيْتُكُمْ تَشَزَّنْتُمْ (تَأَهَّبْتُمْ – شرحه) لِلسُّجُودِ، فَنَزَلَ فَسَجَدَ وَسَجَدُوا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[٧].

رۆژێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەسەر دوانگە، (مینبەر) سوورەتی صادی خوێند، کە گەیشتە ئایەتەکەی کوڕنووش لە دوانگەکە دابەزی و کوڕنووشی برد، وە خەڵکەکەش لە گەڵیا کوڕنووشیان برد، رۆژێکی تریش ئەم سوورەتەی دەخوێند کە گەیشتەوە سەر ئایەتەکەی کوڕنووش خەڵکەکە گوێ قوڵاخ بوونەوەو خۆیان ئامادەکرد بۆ کوڕنووش بردن، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەم سەجدەیە سەجدەی تەوبەی داوود پێغەمبەرەو بەس، بەلاّم وا دەبینم کەوا ئێوە خۆتان ئامادەکردووە بۆ

(٦) بخاري. سجود القرآن: ١٠٦٩ ، ٣٤٢٢.

(٧) سكت عنه الشارح (مترجم).

كوڕنووش بردن لەبەر ئەوە قەیناكا با ئەم جارەش كوڕنووش ببەین، ئەگینا لەم ئایەتەدا مەرج نیە كە كوڕنووش ببەین، ئینجا حەزرەت لە مینبەرەكە دابەزی و كوڕنووشی بردو خەڵكەكەش كوڕنووشیان برد (د).

٦٥٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَرَأَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) النَّجْمَ بِمَكَّةَ فَسَجَدَ فِيهَا، وَسَجَدَ مَنْ مَعَهُ، غَيْرَ شَيْخٍ أَخَذَ كَفًّا مِنْ حَصًى أَوْ تُرَابٍ فَرَفَعَهُ إِلَى جَبْهَتِهِ وَقَالَ: يَكْفِينِي هَذَا. فَرَأَيْتُهُ بَعْدَ ذَلِكَ قُتِلَ كَافِرًا. رَوَاهُ الخمسة[٨].

عەبدوڵلا (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە مەككە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) سوورەتی نەجمی خوێندو كوڕنووشی تیابرد، ئەوانەیش كە لەوێ بوون لەگەڵیا كوڕنووشیان برد، تەنیا پیرەمێردێ نەبێ كە گوێلێ چەو یا لاگوێلێ خۆڵی هەڵگرت و بەرزی كردەوە بۆ تەوێڵی و گوتی: ئەمەم بەسە، لەوەدوا ئەم پیرەمێردەم دی بە كافری كوژرا (ش/د/ت/ن).

٦٥٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سَجَدَ بِالنَّجْمِ وَسَجَدَ مَعَهُ الْمُسْلِمُونَ وَالْمُشْرِكُونَ وَالْجِنُّ وَالإِنْسُ. رَوَاهُ البخاري واترمذي[٩].

ئیبنو عەبباس (خوایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە دوای ئایەتەكەی كوڕنووشی سوورەتی نەجمەوە كوڕنووشی برد، موسوڵمانەكان و هاوبەشپەیدا كارەكان و جنۆكەو ئادەمیزاد، ئەوەی لەوێ بوو، هەموو كوڕنووشیان برد لەگەڵیا، تەنانەت قاو دا كەوت كە خەڵكی سەرجەم موسوڵمان بوون! (ب/ت).

٦٥٤- عَنْ أَبِي رَافِعٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ الْعَتَمَةَ فَقَرَأَ (إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ) فَسَجَدَ فَقُلْتُ: مَا هَذِهِ قَالَ: سَجَدْتُ بِهَا خَلْفَ أَبِي الْقَاسِمِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلاَ أَزَالُ أَسْجُدُ بِهَا حَتَّى أَلْقَاهُ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ الترمذي[١٠].

---

(٨) بخاري: سجود القرآن: ١٠٦٧ ، ١٠٧٠ ، ٣٨٥٣ ، ٣٩٧٢ ، ٤٨٦٣. مسلم. سجود التلاوه: ١٢٩٧. أبو داود. صلاة: ١٤٠٦. نسائي. سجود القرآن: ٩٥٨.

(٩) بخاري. سجود القرآن: ١٠٧١ ، ٤٨٦٢.

ئـەبو رافیـع (خـوای لێ رازی بـێ) گـوتی: ئـەبو هـورەیرە بەرنوێـژیی نوێـژی خەوتنانی بۆ كردین، سوورەتی: {إِذَا السَّمَاء انـشَقَّتْ}ی خوێند كە گەیشتە ئابەتی: {وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنُ لَا يَسْجُدُونَ*} كوڕنووشی برد، كە لە نوێژ بووینەوە گوتم: ئەم كوڕنووشە چی بوو؟ گوتی: لە پشتی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەربێ) نوێژم كردووەو لە دوای ئەم ئایەتەوە لەناو ئەو نوێژەدا لەگەڵ حەزرەتدا سەجدەی تیلاوەتم بردووە، لەبەر ئەوە هەتا دەگەمەوە بە خزمەتی لەو دنیا لەم شوێنەدا ئەم كوڕنووشە هەر دەبەمو هەرگیز تەركی ناكەم (ش/د/ن).

٦٥٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَجَدْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي إِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ وَاقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ البخاري[11].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە سوورەتی {إِذَا السَّمَاء انشَقَّتْ}دا لە كاتی خوێندنی: {وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنُ لَا يَسْجُدُونَ*}دا وە، لە ئاخری سوورەتی {اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ}ەدا، لەگەڵ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) كوڕنووشی تیلاوەتمان دەبرد (م/د/ت/ن).

٦٥٦- عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَقْرَأَهُ خَمْسَ عَشْرَةَ سَجْدَةً فِي الْقُرْآنِ مِنْهَا ثَلاَثٌ فِي الْمُفَصَّلِ وَفِي سُورَةِ الْحَجِّ سَجْدَتَانِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَابْنَ ماجه[12].

عەمری كوڕی عاص (خودای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) لە قورئاندا پازدە كوڕنووشی قورئان خوێندنی پێ خوێندم، سێیان لەم سێ سوورەتەدان: یەكێ لە سوورەتی نەجمو یەكێ لە سوورەتی تینشیقاقو

---

(١٠) بخاري. أذان: ٧٦٦ ، ٧٦٨ ، ١٠٧٤ ، ١٠٧٨. مسلم. مساجد: ١٣٠٤ — ١٣٠٦. أبو داود. سجود التلاوة: ١٤٠٨. نسائي. سجود فى الفريضة: ٩٦٧.

(١١) مسلم. مساجد: ١٣٠١ — ١٣٠٣. أبو داود. سجود فى )إذا السما انشقت): ١٤٠٧. ترمذي. سجدات التلاوات: ٥٧٣. نسائي. إفتتاح: ٩٦٦.

(١٢) بسند صالح (شرحه).

یەکێ لە سوورەتی (إقرأ باسم ربك)ەدایە، وە لە سوورەتی حەجیشدا دوو سەجدەی تیادایە (د/ئینو ماجە-سند صالح).

٦٥٧- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَجَدْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِحْدَى عَشْرَةَ سَجْدَةً مِنْهَا الَّتِي فِي النَّجْمِ. رَوَاهُ الترمذي وأبو دَاوُدَ[١٣].

ئەبو دەرداء (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لەگەڵ پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خوای لەسەربێ) لە یازدە شوێن لە قورئاندا یازدە کوڕنووشی تیلاوەتم بردووە، یەکێکیان کوڕنووشەکەی سوورەتی نەجم بوو (ت/د).

## ١١١) حوکمی کوڕنووشی قورئانخوێندن: (حكم سجدة التلاوة)

٦٥٨- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَرَأْتُ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) والنَّجْمِ فَلَمْ يَسْجُدْ فِيهَا. رَوَاهُ الخمسة[١].

زەیدی کوڕی ثابت (خوای لێ رازی بێ) گوتی: سورەتی {وَالنَّجْمِ}م دەورکردەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کوڕنووشی تیا نەبرد (ش/د/ت/ن).

٦٥٩- عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَرَأَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَلَى الْمِنْبَرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ بِسُورَةِ النَّحْلِ فَلَمَّا جَاءَ السَّجْدَةَ نَزَلَ فَسَجَدَ وَسَجَدَ النَّاسُ، حَتَّى إِذَا كَانَتِ الْجُمُعَةُ الْقَابِلَةُ قَرَأَ بِهَا فَلَمَّا جَاءَ السَّجْدَةَ قَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا نَمُرُّ بِالسُّجُودِ فَمَنْ سَجَدَ فَقَدْ أَصَابَ، وَمَنْ لَمْ يَسْجُدْ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ. وَلَمْ يَسْجُدْ عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)[٢].

رەبیعەی کوڕی عەبدوڵڵا (خوای لێ رازی بێ) گوتی: ڕۆژێکی هەینی لەسەر دوانگە (مینبەر) عومەری کوڕی خەططاب سوورەتی نەحلی خوێندەوە، کە گەیشتە ئایەتەکەی کوڕنووش لە مینبەرەکە دابەزی و کوڕنووشی تیلاوەتی

(١٣) سكت عنه الشارح (مترجم)

(١) بخاري. سجود القرآن: ١٠٧٢ ، ١٠٧٣. مسلم. مساجد: ١٢٩٨. أبو داود. سجود: ١٤٠٤. ترمذي. سجود التلاوة: ٥٧٦. نسائي. سجود التلاوة: ٩٥٩.

(٢) بخاري. سجود القرآن: ١٠٧٧.

بردو خەڵکەکەش کوڕنووشیان برد، وە لە هەینی ئاییندەدا دیسانەوە ئەم سوورەتەی خوێندەوە، بەڵام کاتێ کە گەیشتە سەر ئایەتەکەی سەجدە گوتی: ئەی خەڵکینە! ئەوا دەگەینە سەر ئایەتی کوڕنووش جا ئەوی کوڕنووش دەبا ئەوە دەق بەپێی سوننەت و ڕەووشتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ڕەفتار دەکا، وە ئەوەشی کوڕنووش نەبا ئەوە تاوانی لەسەر نیەو گوناهی ناگا چونکە کوڕنووشی تیلاوەت بەرای من سوننەتەو واجب نیە وە عومەر خۆی کوڕنووشی نەبرد (ب).

٦٦٠- وَقَالَ: ابْنُ عَمَرَ (رَضيَ أللهُ عَنهُماَ) إِنَّ اللّٰهَ لَمْ يَفْرِضِ عَلَيْناَ السُّجُودَ إِلاَّ أَنْ نَشَاءَ رَوَاهُما البخاري[٣].

ئیبنو عومەر (خوایان لێ ڕازی بێ) گوتی: خودا کە سەجدەی تیلاوەتی داناوە بۆمان فەرزی نەکردووە لەسەرمان، بە ئارەزووی خۆمانە دەتوانین لەپاش ئایەتی سەجدە، سەجدە بەین، دەتوانین سەجدە نەبەین (ب).

٦٦١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ أللهُ عَنهَا) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ فِي سُجُودِ الْقُرْآن بِاللَّيْلِ يَقُولُ فِي السَّجْدَةِ مِرَارًا: سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِى خَلَقَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ بِحَوْلِهِ وَقُوَّتِهِ. رَوَاهُ أصحاب السنن[٤].

عائیشە (ڕەزای خودای لێبێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) بەشەو لە کوڕنووشی خوێندنی قورئان (سەجدەی تیلاوەت)دا چەند جار لە سەریەك دەیفەرموو:

{سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِى خَلَقَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ بِحَوْلِهِ وَقُوَّتِهِ}.

ڕووی خۆم دەنێمە سەر خاك و کوڕنووشی بەندەیی دەبەم بۆ ئەو خودایەی کە تەنیا بە هێزو تەوانایی خۆی ئەم دەمو چاوەی منی دروست کردووەو شەقڵ و کلێشەی گوێچکەو دیدەی پێوە ناوە! (د/ت/ن-س/ص).

---

(٣) بخاري. سجود القرآن: ١٠٧٧.

(٤) بسند صحيح (شرحه).

## ١١٢) كوڕنووشی سوپاس (سەجدەی شوكر): (سجدة الشكر)

٦٦٢- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ كَانَ إِذَا جَاءَهُ أَمْرُ سُرُورٍ أَوْ بُشِّرَ بِهِ خَرَّ سَاجِدًا شُكْرًا لِلَّهِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي. وَلَفْظُهُ أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَمْرٌ فَسُرَّ بِهِ فَخَرَّ لِلهِ سَاجِداً[1].

ئەبو بەكرە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وابوو كە باسێكی خۆشی بۆ دەهات یا مژدەیەكی خۆشیان دەدایە، دەكەوت بەڕووداو لەپەو ڕوو سەجدەیەكی شووكری دەبرد بۆ خودا (د/ت- س/ح) گفتەی (ت) ئاوایە: جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەنگو باسێكی خۆشی بۆهات، گەلێكی پێ خۆش بوو، ئیتر بەڕوودا كەوتو سەجدەیەكی بۆخودا برد.

٦٦٣- عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ مَكَّةَ نُرِيدُ الْمَدِينَةَ فَلَمَّا كُنَّا قَرِيبًا مِنْ عَزْوَرَا نَزَلَ ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ فَدَعَا اللَّهَ سَاعَةً ثُمَّ خَرَّ سَاجِدًا فَمَكَثَ طَوِيلاً ثُمَّ قَامَ فَرَفَعَ يَدَيْهِ فَدَعَا اللَّهَ سَاعَةً ثُمَّ خَرَّ سَاجِدًا فَمَكَثَ طَوِيلاً ثُمَّ قَامَ فَرَفَعَ يَدَيْهِ سَاعَةً ثُمَّ خَرَّ سَاجِدًا ثُمَّ قَالَ: إِنِّي سَأَلْتُ رَبِّي وَشَفَعْتُ لأُمَّتِي فَأَعْطَانِي ثُلُثَ أُمَّتِي فَخَرَرْتُ سَاجِدًا شُكْرًا لِرَبِّي ثُمَّ رَفَعْتُ رَأْسِي فَسَأَلْتُ رَبِّي لأُمَّتِي فَأَعْطَانِي ثُلُثَ أُمَّتِي فَخَرَرْتُ سَاجِدًا لِرَبِّي ثُمَّ رَفَعْتُ رَأْسِي فَسَأَلْتُ رَبِّي، لأُمَّتِي فَأَعْطَانِي الثُّلُثَ الآخَرَ فَخَرَرْتُ سَاجِدًا لِرَبِّي. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ. والله أعلم[2].

عامیری كوڕی سەعد (خوایان لێ ڕازی بێ) گوتی: باوكم گوتی: لە خزمەتیحەزرەتدا بووین (دروودی خوای لەسەربێ) لە مەككەوە دەچووین بۆ مەدینە، كە نزیكی عەزەورا بووینەوە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دابەزیو هەردوو دەستی بەرزكردەوەو تاوێ لەخودا پاڕایەوە، ئینجا كوڕنووشێكی بردو زۆرمایەوە لە كوڕنووشەكەدا، ئینجا هەڵسایەوەو دەستەكانی دیسان بەرزكردەوەو تاوێكی تریش پاڕایەوەو دیسانەوە لە پەورووو كوڕنوشێكی

(١) بسند حسن (شرحه).

(٢) بسند ضعيف (شرحه).

تــری بــردەوەو زۆر مایــەوە جــابۆ جــاری ســێیەم هەڵــسایەوە ســەرپێ و دەستەکانی بەرزکردەوەو تاوێکی تریش بەڕاوەستانەوە پاڕایەوە، لە پاشا کەوت بە سەر رووداو سەجدەیەکی تری بردەوە، ئینجا فەرمووی: لە خودا پاڕامەوەو تکامکرد بۆ ئۆمەتم، ئەویش سێیەکی ئۆمەتەکەمی بەخشی پێم، ئەوە بوو منیش بۆ سوپاسکردنی خودا کەوتم بەسەر رووداو کوڕنووشێکم بۆ برد، هەمدیسان سەرمم بەرزکردەوەو جارێکی تریش لە پەروەردگارم پاڕامەوەو تکام کردەوە بۆ ئۆمەتم ئەویش سێ یەکێکی تری ئۆمەتەکەمی بەخشی پێم. ئەوە بوو منیش بۆ سوپاسکردنی خودا پاڕامەوەو تکام کرد بۆ ئۆمەتم ئەویش سێیەکی ئۆمەتەکەمی بەخشی پێم، ئەوە بوو منیش بۆ سوپاسکردنی خودا کوڕنووشێکی ترم بۆ بردەوە، هەم دیسانەوە سەرم بەرز کردەوەو جارێکی تریش لە پەروەردگاری خۆم پاڕامەوەو تکام کردەوە بۆ ئۆمەتم، ئەویش ئەوتاقە سێیەکەی کە مابوو لە ئۆمەتم ئەویشی بەخشی پێم، ئەوە بوو منیش بۆ سوپاسکردنی خودا کەوتم بەرووداو سەجدەیەکی شوکری ترم بۆ بردەوە (د- بەسەنەدێکی ضەعیف).

## ١١٣) لەناو نوێژا لەکاتی ناچاریدا کاری سووکەڵە دروستە
## يجوز العمل الخفيف في الصلاة للحاجة

٦٦٤- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَؤُمُّ النَّاسَ وَأُمَامَةُ بِنْتُ أَبِي الْعَاصِ وَهِيَ ابْنَةُ زَيْنَبَ بِنْتِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى عَاتِقِهِ فَإِذَا رَكَعَ وَضَعَهَا وَإِذَا رَفَعَ مِنَ السُّجُودِ أَعَادَهَا. وفي رواية: فَإِذَا سَجَدَ وَضَعَهَا وَإِذَا قَامَ حَمَلَهَا. رَوَاهُ الخمسة إلاّ الترمذي[1].

ئەبو قەتادە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دی (دروودی خوای لەسەربێ) بەرنوێژیی بۆ مەردووم دەکرد، لەوکاتەدا ئومامەی کچی ئەبو

---

(١) بخاري. عمل في صلاة: ٥١٦ ، ٥٩٩٦. مسلم. مساجد: ١٢١٢ — ١٢١٤. أبو داود. صلاة: ٩١٨ ، ٩١٩ ، ٩٢٠. نسائي. عمل في الصلاة: ٨٢٦ ، ٧١٠ ، ١٢٠٤ ، ١٢٠٣.

عاصی بە سەرشانەوە بوو، کە کچی زەینەبی کچی پێغەمبەربوو، جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەکاتی چەمینەوە (روکوع)دا ئومامەی دادەنا تا کاتێ لە سەجدە هەڵدەسایەوە ئەوسا دەیکردەوە قەڵاندۆشکانی. لە گێڕانەوەیەکا: لەکاتی کوڕنووش بردندا دای دەنا تا هەڵدەسایەوە ئەوجا هەڵی دەگرتەوە!

٦٦٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَقْتُلُوا الأَسْوَدَيْنِ فِي الصَّلاَةِ الْحَيَّةُ وَالْعَقْرَبُ. رَوَاهُ أصحاب السنن والحاكم وصحَّحه[٢].

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێبێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەتا لەناو نوێژیشدا دوو ڕەشەکە، واتە: مارو دوو پشك، بکوژن! (د/ت/ن-حاکم:ص).

٦٦٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: جِئْتُ وَرَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي، فِي الْبَيْتِ وَالْبَابُ عَلَيْهِ مُغْلَقٌ فَمَشَى حَتَّى فَتَحَ لِي ثُمَّ رَجَعَ إِلَى مَكَانِهِ. وَوَصَفَتِ الْبَابَ فِي الْقِبْلَةِ. رَوَاهُ اصحاب السنن[٣].

عائیشە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: کە هاتمەوە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەماڵەوە نوێژی دەکرد، دەرگاکەش لەسەری داخرابوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خۆی هات تا دەرگاکەی کردەوە بۆم، ئینجا گەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی و نوێژەکەی تەواوکرد. عائیشە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: بەڵام دەرگاکە لە ڕووی قیبلەوە بوو (د/ت/ن-س/ح).

٦٦٧- (ب - ١ ز - ٧١ ژمارە - ٤٦٧/٥) وَفِي رواية: كُنْتُ أَمُدُّ رِجْلِي فِي قِبْلَةِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ يُصَلِّي فَإِذا سَجَدَ غَمَزَنِي فَرَفَعْتُهاَ فَإِذَا قَامَ مَدَدْتُهاَ[٤].

لە گێڕانەوەیەکا: ڕێ دەکەوت کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نوێژی دەکرد، منیش قاچم درێژ دەکرد لە ڕووگە کەیدا، جا کاتێ کە سوژدەی

---

(٢) صحيح عنه الحاكم.

(٣) بسند حسن (شرحه).

(٤) راجع رقم ٤٦٧.

دەبرد تێوەی دەژەندم‌و قاچم لا دەبرد تا بەباشی جێگە شوژدەکەی چۆڵ ببێ بەڵام کە ئەوهەڵ دەسایەوە قاچی رادەکێشایەوە وەك جاری پێشوو.

٦٦٨- عَنِ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: التَّسْبِيحُ لِلرِّجَالِ وَالتَّصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ. رَوَاهُ الخمسة[٥].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: سوبحانەڵلاکردن لەناو نوێژا، بۆ هۆشیارکردنەوە، بۆ پیاوانەو چەپڵەش بۆ ژنانە (ش/د/ت/ن).

٦٦٩- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ نَابَهُ شَيْءٌ فِي صَلاتِهِ فَلْيُسَبِّحْ فَإِنَّهُ إِذَا سَبَّحَ الْتُفِتَ إِلَيْهِ، وَإِنَّمَا التَّصفيق لِلنِّسَاءِ. رَوَاهُ الخمسة وَإِنَّمَا التَّصْفِيقُ لِلنِسَّاءِ[٦].

سەهلی کوڕی سەعد (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەرکەسێ لەناو نوێژدا شتێکی لێ روودا باسوبحانەڵلا بکا، چونکە کە سوبحانەڵلا دەکا تێدەگەن لە مەسەلەکە، بەڵام چەپڵە لێدان لە ناو نوێژدا بۆ ژنانە! (ش/د).

٦٧٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهُمَا) قَالَ: قُلْتُ لِبِلاَلٍ: كَيْفَ كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) يَرُدُّ عَلَيْهِمْ حِينَما كَانُوا يُسَلِّمُونَ عَلَيْهِ وَهُوَ فِي الصَّلاَةِ قَالَ: كَانَ يُشِيرُ بِيَدِهِ. رَوَاهُ الترمذي وأبو دَاوُدَ[٧].

ئیبنو عومەر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: بەبیلالم گوت: جاران کە لەناو نوێژا سڵاویان لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەکرد چۆن سڵاوی دەسەندەوە؟ گوتی: بە ئیشارەتی دەست دەیسەندنەوە نەوەك بەقسە (ت-س/ص-د).

---

(٥) بخاري. تصفيق في صلاة: ١٢٠٣. مسلم. صلاة: ٩٥٣. أبو داود. تصفيق: ٩٣٩. نسائي. سهو: ١٢٠٦.

(٦) بخاري. عمل في الصلاة: ١٢٠٤. مسلم. صلاة: ٩٥٣.

(٧) رواه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

٦٧١- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَبَعَثَنِي فِي حَاجَةٍ فَرَجَعْتُ وَهُوَ يُصَلِّي فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيَّ. زَادَ فِي رِوايةٍ: وَقَالَ: بِيَدِهِ هَكَذَا أَيْ أَشَارَ بِهَا، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: إِنَّهُ لَمْ يَمْنَعْنِي أَنْ أَرُدَّ عَلَيْكَ إِلاَّ أَنِّي كُنْتُ أُصَلِّي. رَوَاهُ البخاري بِدوُنِ الإِشَارَةِ ومُسْلِم وَأَبُو دَاوُدَ بتمامه[٨].

**جابیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ لە خزمەتی حەزرەت دا (دروودی خوای لەسەربێ) منی نارد بۆ کارێ، کە گەڕامەوە بۆ خزمەتی نوێژی دەکرد، سڵاوم لێ کرد سڵاوەکەی نەسەندمەوە. لە گێڕانەوەیەکا ئەمەی پترە: بە دەستێ ئاوەهای کرد، واتە: بە ئیشارەت بە دەست سڵاوەکەی سەندەوە، جا کە لە نوێژەکە بۆوە. فەرمووی: ئەوە بۆیە بەدەم سڵاوەکەتم نەسەندەوە چونکە نوێژم دەکرد قسەکردنیش لە نوێژدا دروست نیە (م/د/ب).**

٦٧٢- عَنْ عَلِيٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ لِي مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سَاعَةٌ آتِيهِ فِيهَا فَإِذَا أَتَيْتُهُ اسْتَأْذَنْتُ إِنْ وَجَدْتُهُ يُصَلِّي تَنَحْنَحَ دَخَلْتُ عَلَيْهِ وَإِنْ وَجَدْتُهُ فَارِغًا أَذِنَ لِي. رَوَاهُ النسائي وأحمد[٩].

**عەلی (خوای لێ رازی بێ) گوتی: کاتێکی تایبەتم هەبوو تیا دەچووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کە دەچووم لە پێشدا داوای رێگەی چوونە ژوورەوەم دەکرد، ئەگەر نوێژی بکردایە بۆم دەکۆکی و دەچوومە ژوورەوە، ئەگەر دەستیشی بەتاڵ بوایە خۆی رێگەی دەدام و دەچوومە ژوورەوە بۆ خزمەتی (د/ئەحمەد).**

٦٧٣- عَنْ عُقْبَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْعَصْرَ، فَلَمَّا سَلَّمَ قَامَ سَرِيعًا فَدَخَلَ عَلَى بَعْضِ نِسَائِهِ ، ثُمَّ خَرَجَ وَرَأَى مَا فِي وُجُوهِ الْقَوْمِ مِنْ تَعَجُّبِهِمْ لِسُرْعَتِهِ فَقَالَ: ذَكَرْتُ وَأَنَا فِي الصَّلاَةِ تِبْرًا عِنْدَنَا ، فَكَرِهْتُ أَنْ يُمْسِيَ أَوْ يَبِيتَ عِنْدَنَا فَأَمَرْتُ بِقِسْمَتِهِ[١٠].

---

(٨) بخاري. عمل فی صلاة: ١٢١٧. مسلم. مساجد: ١٢٠٥ – ١٢٠٨. أبو داود. صلاة: ٩٢٦.

(٩) وابن السكن وصححه (شرحه).

(١٠) بخاري. صفة الصلاة: ٨٥١ ، ١٢٢١ ، ١٤٣٠ ، ٦٢٧٥.

عوقبە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نوێژی عەصری بۆ کردین، کە سلاوی دایەوە بە پەلە هەڵساو چوو بۆ ماڵی یەکێ لە هاوسەرەکانی، لە پاشا کە هاتەوە تەماشای رووی خەڵکەکەی کرد روانی خەڵکەکە سەیریان دێ لەم پەلە کردنەی، جا فەرمووی: ئەوە بۆیە وامکرد چونکە لەناو نوێژەکەدا بیرم کەوتەوە کە شووشێ زێڕمان لە لاهەیە، جا حەزم نەکرد کە لەماڵی منا ئێوارەی بەسەردابێ یا فەرمووی: شەوی بە سەردابێ، وە لە ماڵەوە پێم گوتن کە دابەشی بکەن بەسەر هەژاراندا! (ب).

٦٧٤– وَقَالَ: عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) إِنِّي لأُجَهِّزُ جَيْشِي وَأَنَا فِي الصَّلاَةِ. رَوَاهُمَا البخاري[١١].

عومەر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جای وا هەیە من لەکاتی نوێژکردندا سوپای خۆم رێك دەخەم (ب).

## ١١٤) باسی هەشتەم: باسی مزگەوتە، ئەم باسە سێ بەشە.

### بەشی یەکەم: باسی گەورەیی‌و هاموشۆکردنی مزگەوتە:

### الباب الثامن: في المساجد وفيه فصول ثلاثة

### الفصل الأول: في فضل المساجد والسعي اليها

{قَالَ اللهُ جَلَّ شَأْنه – إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَاجِدَ اللّهِ مَنْ آمَنَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَأَقَامَ الصَّلاَةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلاَّ اللّهَ فَعَسَى أُوْلَئِكَ أَن يَكُونُواْ مِنَ الْمُهْتَدِينَ – ٩/١٨}.

واتە: بە راستی کەسێ مزگەوت کە ماڵی خودایە ئاوەدان دەکاتەوە، کە باوەڕی بەخوداو بە رۆژی دوایی هەبێ، وە نوێژ بکاو زەکات بداو لە خودانەبێ لە کەسی تر نەترسێ، جا ئەم جۆرە کەسانە ئومێدە کە خودا رێگەی راستیان نیشانبدا.

(١١) رواه البخاري تعليقا فى الباب/ ١٨ من كتاب العمل فى الصلاة قبل الرقم: ١٢٢١ مباشرة (مترجم).

**٦٧٥- عَنْ عُثْمَانَ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **يَقُولُ مَنْ بَنَى مَسْجِدًا يَبْتَغِي بِهِ وَجْهَ اللّٰهِ بَنَى اللّٰهُ لَهُ مِثْلَهُ فِي الْجَنَّةِ. وَفِي رِوَايَةٍ: بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ. رَوَاهُ الخمسة إلاّ أبا دَاوُدَ**[1].

**عوسمان** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو** (دروودی خوای لەسەربێ)**: هەر کەسێ بۆ ڕەزای خودا مزگەوتێ دروست بکا خودا لە بەهەشتا لە وێنەی ئەو مزگەوتە کۆشکێکی بۆ دروست دەکا لە گێڕانەوەیەکا: خانوویەکی لە بەهەشتا بۆ دروست دەکا، (ش/ت/ن).**

**٦٧٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: اجْعَلُوا فِي بُيُوتِكُمْ مِنْ صَلاَتِكُمْ ، وَلاَ تَتَّخِذُوهَا قُبُورًا. رَوَاهُ الخمسة**[2].

**ئیبنو عومەر** (خودای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەربێ) **دەفەرموێ: هەندێ لە نوێژەکانتان دابنێن بۆ ماڵەوەتانو لە ماڵەوە بیانکەنو ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕستان چونکە ئەو ماڵەی کە نوێژی تیا نەکرێ وەك گۆڕستانی چۆڵو هۆڵ وایە! (ش/د/ت/ن).**

**٦٧٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: أَمَرَ رَسُولُ اللّٰهِ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **بِبِنَاءِ الْمَسَاجِدِ فِي الدُّورِ وَأَنْ تُنَظَّفَ وَتُطَيَّبَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ واترمذي**[3].

**عائیشە** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمانی داوە کە لەناو گەڕەکەکاندا مزگەوت دروست بکرێ وەپاكو خاوێنو بۆن خۆش رابگیرێ (د/ت-سند صالح).**

**٦٧٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: فُضِّلْتُ عَلَى الأَنْبِيَاءِ بِسِتّ أُعْطِيتُ جَوَامِعَ الْكَلِمِ وَنُصِرْتُ بِالرُّعْبِ وَأُحِلَّتْ لِيَ الْغَنَائِمُ**

---

(١) بخاري. مساجد: ٤٥٠. مسلم. مساجد: ١١٩٠ ، ٧٣٩٦. ترمذي. مساجد: ٣١٨.

(٢) بخاري. صلاة: ٤٣٢. مسلم. صلاة: ١٨١٧. أبو داود. صلاة: ١٠٤٣.

(٣) بسند صالح (شرحه).

وَجُعِلَتْ لِيَ الأَرْضُ طَهُورًا وَمَسْجِدًا وَأُرْسِلْتُ إِلَى الْخَلْقِ كَافَّةً وَخُتِمَ بِيَ النَّبِيُّونَ. رَوَاهُ الخمسة إلاّ أبا دَاوُدَ[٤].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: خودا فەضڵی منی داوە بەسەر پێغەمبەرەكانی تردا بەم شەش شتە:

یەكەم: قسەی نەستەق و فەرموودەی پڕ مەعنای پێ بەخشیوم.

دووەم: تا ماوەی مانگە رێیەك دوژمن لەسام و شكۆی خۆم و لەشكرم زەندەقیان دەچێ و وڕەبەر دەدەن و ئەمە بووە بەهۆی سەركەوتن بۆ ئێمە.

سێیەم: ماڵی تالآنی (كافران)یش حەڵاڵ كراوە بۆ من و بۆ ئوممەتم.

چوارەم: رووی زەوی هەمووی بۆ ئێمە كراوە بە مزگەوت و خۆڵەكەی پاك و پاكەوەكەرەو لەكاتی پێویستیدا تەیەموومی پێ دەكەین.

پێنجەم: خودا كردوومی بە پێغەمبەرو رەوانەی كردووم بۆ سەر هەموو دروست كراوان بەگشتی.

شەشەم: خودا كردوومی بە دوا پێغەمبەرو لە دوامن پێغەمبەری تر نابێ (ش/ت/ن).

٦٧٩- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَحَبُّ الْبِلاَدِ إِلَى اللّٰهِ مَسَاجِدُهَا وَأَبْغَضُ الْبِلاَدِ إِلَى اللّٰهِ أَسْوَاقُهَا. رَوَاهُ مُسْلِمٌ[٥].

دیسان ئەو (رەزای خودای لێبێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: خۆشەویستترین شوێنی هەموو وڵاتێ لەلای خودا مزگەوتەكانێتی، وە درێوترین و ناخۆشەویستترین شوێنی هەموو وڵاتێ لەلای خودا بازاڕەكانێتی چونكە جێگەی فڕوفێڵ و درۆو دەلەسەو سوێندی درۆو دەستبڕینە (م).

---

(٤) راجع رقم: ٤٥/٢.

(٥) مسلم. مساجد: ١٥٢٦

٦٨٠- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ غَدَا إِلَى الْمَسْجِدِ أَوْ رَاحَ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُ فِي الْجَنَّةِ نُزُلاً كُلَّمَا غَدَا أَوْ رَاحَ. رَوَاهُ الشَّيْخان(٦).

**دیسان لەوەوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: گشت جارێ کە کەسێ دەچێ بۆ مزگەوت یا لە مزگەوت دگەڕێتەوە خودا لە بەهەشتا نانێ کە لایەقی میوان بێ بۆی دروست دەکا! (ش).**

٦٨١- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ: الإِمَامُ الْعَادِلُ وَشَابٌّ نَشَأَ فِي عِبَادَةِ اللَّهِ وَرَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ فِي الْمَسَاجِدِ وَرَجُلاَنِ تَحَابَّا فِي اللَّهِ اجْتَمَعَا عَلَيْهِ وَتَفَرَّقَا عَلَيْهِ وَرَجُلٌ دَعَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وَجَمَالٍ فَقَالَ: إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ. وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ فَأَخْفَاهَا حَتَّى لاَ تَعْلَمَ شِمَالُهُ مَا تُنْفِقُ يَمِينُهُ وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللَّهَ خَالِيًا فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ. رَوَاهُ الخمسة إلا ابا دَاوُدَ(٧).

**دیسان لەوەوە لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (دروودی خوای لەسەربێ): حەوت تاقم هەن خودا لە ڕۆژی قیامەتا دەیانخاتە سێبەری تەخت و بارەگا (عەرش)ی خۆیەوە، لەو ڕۆژەدا کە هیچ سایەو سێبەرێکی تر نیە بێجگە لە سایەو سێبەری خۆی.**

**یەکەم: پادشای عادڵ و پێشەوای دادپەروەرو کار بەدەست و سەرکاری بەداد.**

**دووەم: لاوێ کە لە عیبادەت و خوداپەرستیدا قاڵ بووبێ و پێ گەیشتبێ و بەرە بەرە گەورەبووبێ.**

**سێیەم: پیاوێ کە دڵی ئالوودەی مزگەوت بێ.**

**چوارەم: دوو پیاو کە لەبەر ڕەزای خودا یەکترییان خۆش بوێ، لەبەر ڕەزای خودا کۆببنەوەو لەبەر ڕەزای خودا لە یەکتری جیاببنەوە لەپاش تەواو بوونی کۆبوونەوەکەیان!.**

---

(٦) بخاري. مساجد: ٦٦٢. مسلم. مساجد: ١٥٢٢.

(٧) بخاري. مساجد: ٦٦٠ ، ١٤٢٣ ، ٦٢٧٩ ، ٩٨٠٦. مسلم. زكاة: ٢٣٧٧ ، ٢٣٧٨. ترمذي. زهد: ٢٣٩١ ، ٢٣٩٢.

پێنجەم: پیاوێ کە ئافرەتێکی خانەدانی خانوومانی شۆخی جوان داوای ئیشی خراپی لێ بکاو ئەویش نەیکاو پێی بڵێ: من ئەو ئیشە ناکەم چونکە لە خودا دەترسم.

شەشەم: پیاوێ خێرێ بە پەنامەکی بکا، کە ئەم دەستی بەو دەستی نەزانێ.

حەوتەم: پیاوێ کە بە تەنیا خۆی بێ و یادی خودا بکاو فرمێسك بە چاویا بێتە خوارەوەو لە ترسی خودا بگری (ش/ت/ن).

٦٨٢- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْمَلاَئِكَةُ تُصَلِّي عَلَى أَحَدِكُمْ مَا دَامَ فِي مُصَلاَّهُ الَّذِي صَلَّى فِيهِ مَا لَمْ يُحْدِثْ تَقُولُ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ. رَوَاهُ الأربعة(٨).

دیسان لەوەوە لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (دروودی خوای لەسەربێ): هەتا بە دەسنوێژەوە لەو جێگەدا بمێننەوە کە نوێژی تیا دەکەن فریشتە بۆتان دەپاڕێنەوەو دەڵێن: خودایە! هەڵەی بپۆشەو لە گوناهی خۆشبە، خودایە! میهرەبانی لەگەڵا بنوێنەو رەحمی پێ بکە (ش/د/ت).

٦٨٣- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الأَبْعَدُ فَالأَبْعَدُ مِنَ الْمَسْجِدِ أَعْظَمُ أَجْرًا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ ومُسْلِمٌ(٩).

دیسان لەوەوە لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (دروودی خوای لەسەربێ): هەتا دوور تر بن لە مزگەوتەوە خێرو پاداشتان گەورەتر دەبێ چونکە لەکاتی هامووشۆی مزگەوتا هەنگاو بە هەنگاو رێگەکەتان بۆ حلێب دەکرێ (د/م).

٦٨٤- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ تَطَهَّرَ فِي بَيْتِهِ ثُمَّ مَشَى إِلَى بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللَّهِ لِيَقْضِيَ فَرِيضَةً مِنْ فَرَائِضِ اللَّهِ كَانَتْ خَطْوَتَاهُ إِحْدَاهُمَا تَحُطُّ خَطِيئَةً وَالأُخْرَى تَرْفَعُ دَرَجَةً. رَوَاهُ مُسْلِمٌ والنسائي والترمذي(١٠).

---

(٨) بخاري. مساجد: ٤٧٧، ١٧٦. مسلم. مساجد: ١٥٠٤ - ١٥٠٩. ترمذي. صلاة: ٢١٥. أبو داود. فضل الجماعة: ٥٥٩.

(٩) مسلم. مساجد: ١٥١١. بخاري: جماعة: ٦٥١.

دیسان لەوەوە لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (درودی خوای لەسەربێ): هەر کەسێ لە ماڵەوە خۆی پاك بکاتەوەو بە پاکی بچێ بۆ خانەیێ لە خانەکانی خودا، بۆ ئەوەی فەرزێ لە فەرزەکانی خودا بەجی بێنێ، ئەوە هەر هەنگاوێ دەنێ بە قاچێکی گوناهێکی لێ هەڵ دەوەرێو بەو قاچەکەی تری پایەیێ بڵند دەبێتەوە (م/ن/ت).

٦٨٥- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ ثُمَّ رَاحَ فَوَجَدَ النَّاسَ قَدْ صَلَّوْا أَعْطَاهُ اللَّهُ جَلَّ وَعَزَّ مِثْلَ أَجْرِ مَنْ صَلاَّهَا وَحَضَرَهَا لاَ يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أَجْرِهِمْ شَيْئًا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنَسائي[١١].

دیسان گوتی: حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: کەسێ بەجوانی دەسنوێژ بگرێو بە نیازی نوێژی جەماعەت لەماڵ دەرچێ بەڵام کە گەیشتە ئەوێ سەیربکا کەوا خەڵکەکە لە جەماعەت بوونەتەوە، ئەوە خودای سەردارو سەروەر لە سەرنیازی پاکیو لەباتی ئەرکی جوانی کە کێشاویێتی بەقەد پاداشی ئەو کەسانەی دەداتێ کە حازری ئەو نوێژە بوونو بە کۆمەڵی بە جەماعەت کردوویانە وە ئەم پاداشەی ئەم لە پاداشی ئەوان هیچ کەم ناکاتەوە (د/ن/حاکم:ص).

٦٨٦- عَنْ جَابِرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَتْ دِيَارُنَا نَائِيَةً عَنِ الْمَسْجِدِ فَأَرَدْنَا أَنْ نَبِيعَ بُيُوتَنَا فَنَقْتَرِبَ مِنَ الْمَسْجِدِ فَنَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: إِنَّ لَكُمْ بِكُلِّ خُطْوَةٍ دَرَجَةً.وَفِي رواية: يَا بَنِي سَلِمَةَ دِيَارَكُمْ تُكْتَبْ آثَارُكُمْ، فَقَالُوا، مَا كَانَ يَسُرُّنَا أَنَّا كُنَّا تَحَوَّلْنَا. رَوَاهُ الشيخان (عليهما الرحمة والرضوان)[١٢].

جابیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: خانووەکانمان دوور بوون لە مزگەوتەوە، ویستمان بیان فرۆشینو لە مزگەوتەوە نزیك ببینەوە، بەڵام پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نەیهێشت فەرموی پێمان: هەر هەنگاوێکی بە پایەیەکە بۆتان. لە

---

(١٠) مسلم. مساجد: ١٥١٩.

(١١) والحاكم وصححه (شرحه).

(١٢) بخاري. صلاة الجماعة: ٦٥٦ ، ٦٥٥. مسلم. مساجد: ١٥١٧ ، ١٥١٨.

گێڕانەوەیەكا: فەرمووی: ئەی هۆزی بەنی سەلەمە! لە شوێنی خۆتان بمێننەوە، چونكە كە هاتوچۆی مزگەوت دەكەن شەقاو بە شەقاو پاداشتتان بۆ دەنووسرێ! جا ئەوانیش گوتیان: ئۆخەیش! بەس نەبوو نەمان گواستەوە! (ش).

٦٨٧- عَنْ بُرَيْدَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: بَشِّرِ الْمَشَّائِينَ فِي الظُّلَمِ إِلَى الْمَسَاجِدِ بِالنُّورِ التَّامِّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي[١٣].

بورەیدە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوانەی كەوا لە تاریكایی شەوا بە گەرمی هاموشۆی مزگەوت دەكەن لە زمانی منەوە مژدەی رۆشنایی تەواویان بدەرێ، بۆ رۆژی قیامەتیان! (د/ت- سەند غەریب).

٦٨٨- عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: حَضَرَ رَجُلاً مِنَ الأَنْصَارِ الْمَوْتُ فَقَالَ: إِنِّي مُحَدِّثُكُمْ حَدِيثًا مَا أُحَدِّثُكُمُوهُ إِلاَّ احْتِسَابًا سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلاَةِ لَمْ يَرْفَعْ قَدَمَهُ الْيُمْنَى إِلاَّ كَتَبَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ لَهُ حَسَنَةً وَلَمْ يَضَعْ قَدَمَهُ الْيُسْرَى إِلاَّ حَطَّ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَنْهُ سَيِّئَةً فَلْيُقَرِّبْ أَحَدُكُمْ أَوْ لِيُبَعِّدْ فَإِنْ أَتَى الْمَسْجِدَ فَصَلَّى فِي جَمَاعَةٍ غُفِرَ لَهُ فَإِنْ أَتَى الْمَسْجِدَ وَقَدْ صَلَّوْا بَعْضًا وَبَقِيَ بَعْضٌ صَلَّى مَا أَدْرَكَ وَأَتَمَّ مَا بَقِيَ كَانَ كَذَلِكَ فَإِنْ أَتَى الْمَسْجِدَ وَقَدْ صَلَّوْا فَأَتَمَّ الصَّلاَةَ كَانَ كَذَلِكَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[١٤].

سەعیدی كوڕی موسەییب (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ لە یاریدەدەران (ئەنصار) لەسەرە مەرگا گوتی: ئەم فەرموودەیەتان بە تەمای پاداشی گەورەی خودا بۆ دەگێڕمەوە، ئەگینا بۆم نەدەگێڕانەوە، جا گوتی: لە حەزرەتم بیست دەیفەرموو (دروودی خوای لەسەربێ): هەر كەسێ لە ئێوە بە جوانی دەسنوێژ بگرێ و بچێ بۆ نوێژ، لە هەموو شەقاوێكا كە قاچی راستی هەڵ

(١٣) بسند غريب (شرحه).

(١٤) بسند صالح (شرحه).

دەهێنێتەوە خودای سەردارو سەروەر چاكەیەكی بۆ دەنووسێ، وە كە قاچی چەپیشی دادەنێ خودای سەردارو سەروەر خراپەیەكی لێ هەڵ دەوەرێنێ، ئیتر كەیفی خۆتانە پاداشی كەم‌و زۆر بە دەستی خۆتانە، چونكە هەتا لە دوورترەوە بێن بۆ نوێژ پاداشتان گەورەترە، كەوابوو دوور دەكەونەوە لە مزگەوت یانزیك دەبنەوە كەیفی خۆتانە، جا ئەو كەسە كە چووە مزگەوت‌و بەكۆمەڵی نوێژی كرد بەتەواوی خودا لێی خۆش دەبێ، وە هەروەها ئەگەر گەیشتە مزگەوت‌و بە نوێژی جەماعەتا نەگەیشت، ئیتر خوا فریای هەندێكی بكەوێ‌و باقی مەندەكەی خۆی بە تەنیا تەواوی بكا یاخود فریای هیچی نەكەوێ‌و بە تەنها خۆی نوێژی خۆی بكات (د-سند صالح).

٦٨٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا مَرَرْتُمْ بِرِيَاضِ الْجَنَّةِ فَارْتَعُوا قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا رِيَاضُ الْجَنَّةِ؟ قَالَ: الْمَسَاجِدُ قُلْتُ: وَمَا الرَّتْعُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ[١٥].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: كاتێ دەڕۆنە ناو باخچەكانی بەهەشت ئاهەنگ بگێڕن. گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! باخچەی بەهەشت كوێیە؟ فەرمووی: (مزگەوتە!) گوتم: ئەی بەچی ئاهەنگ بگێڕین؟ فەرمووی: بە گوتنی:

{سُبْحَانَ اللَّهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَاللَّهُ أَكْبَرُ}.

خودا پاك‌و بێ عەیب‌و بێنەنگە، وە سوپاس‌و ستایش هەر بۆ خودایە، وە خودا نەبێ خودای تر نیە وە خودا لە هەموو شتێ گەورەترە! (ت-س/ح).

٦٩٠- وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا صَلَّى الْفَجْرَ قَعَدَ فِي مُصَلاَّهُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ. رَوَاهُمَا التِرمذي[١٦].

گوتی: یاسای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وابوو كە نوێژی بەیانیی دەكرد تا خۆر دەكەوت لەسەر جێ نوێژەكەی دادەنیشت (ت-س/ص).

---

(١٥) رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

(١٦) واه الترمذي بسند صحيح (شرحه).

**١١٥) باسی گەورەیی سێ مزگەوتەكە: (فضل المساجد الثلاثة)**

{قَالَ: اللهُ تَعَالَى – إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ – ٣/٩٦}.

**خودای گەورە دەفەرموێ: یەكەم خانەیێ كە بۆ خودا پەرستی دانرابێ ئەو خانەیەیە كە لە شاری مەككەدا دروست كراوە، كە جێگەیەكی گەلێ پیرۆزەو هۆی رانمایی و شارەزاكردنی خەڵكی هەموو جیهانە.**

٦٩١– عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ أَوَّلِ مَسْجِدٍ وُضِعَ فِي الأَرْضِ قَالَ: الْمَسْجِدُ الْحَرَامُ قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: الْمَسْجِدُ الأَقْصَى قُلْتُ: كَمْ بَيْنَهُمَا؟ قَالَ: أَرْبَعُونَ عَامًا، ثُمَّ الأَرْضُ لَكَ مَسْجِدٌ فَحَيْثُمَا أَدْرَكَتْكَ الصَّلاَةُ فَصَلِّ. رَوَاهُ الشيخان والنسائي[1].

**ئەبو ذەڕ (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە پێغەمبەرم پرسی (دروودی خوای لەسەربێ): كام مزگەوتە یەكەم مزگەوتە كە لەسەر زەوی دروست كراوە؟ فەرمووی: (مسیجدولحەرام) گوتم: ئەی لەپاش ئەو؟ فەرمووی: (مسیجدولئەقصا) گوتم: چەن ساڵیان بەین بووە؟ فەرمووی: (چل ساڵ پاش ئەمەش زەوی هەمووی بۆ تۆ مزگەوتەو لە هەركوێ نوێژت لێ بوو نوێژی خۆت بكە) (ش/ن).**

٦٩٢– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلاَّ إِلَى ثَلاَثَةِ مَسَاجِدَ: مَسْجِدِي هَذَا وَمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَسْجِدِ الأَقْصَى. رَوَاهُ الخمسة[2].

**ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بۆ ئەم سێ مزگەوتە نەبێ سەفەر ناكرێ: بۆ ئەم مزگەوتەی منو بۆ مەسجیدول حەرامو بۆ مەسیجدول ئەقصا (ش/د/ت/ن).**

---

(١) بخاري. أحاديث الانبياء: ٣٣٦٦ ، ٣٤٢٥. مسلم. مساجد: ١١٦١ ، ١١٦٢. نسائي. مساجد: ٦٨٩ ، ٨٩.

(٢) بخاري. حج: ١١٨٩. مسلم. حج: ٣٣٧ ، ٣٢٤٨. أبو داود. مناسك: ٢٠٣٣. نسائي. مساجد: ٦٩٩.

٦٩٣- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا بَيْنَ بَيْتِي وَمِنْبَرِى رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ وَمِنْبَرِى عَلَى حَوْضِى. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ أبا دَاوُدَ[٣].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرمویٚ: لە نێوانی گۆڕەکەمو دوانگەکەما باخێکە لە باخەکانی بەهەشتو بارانی رەحمەتی لێ دەبارێ، خۆشی لەو کەسەی کە لەم شوێنە پیرزەدا طاعەتو خوداپەرستی دەکا، وە مینبەرەکەشم لەسەر حەوزی کەوثەر دادەنرێتەوە بۆمو لە بەهەشتا لەسەری دادەنیشمو پێشوازی لە هاتووانی ئۆمەتم دەکەم کە بۆ نوشین لە ئاوەکەی دێن (ش/ت/ن).

٦٩٤- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: صَلاَةٌ فِي مَسْجِدِي هَذَا أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ صَلاَةٍ فِيمَا سِوَاهُ مِنَ الْمَسَاجِدِ إِلاَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ. وزاد في رواية: فَإِنِّي آخِرُ الأَنْبِيَاءِ وَإِنَّ مَسْجِدَى آخِرُ الْمَسَاجِدِ. رَوَاهُ الشيخان والترمذي وابن ماجه وزاد: وَصَلاَةٌ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامَ أَفْضَلُ مِنْ مِائَةِ أَلْفِ صَلاَةٍ فِيمَا سَوَاهُ[٤].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: مەسجیدول حەرامی لێ دەرچێ یەك نوێژ لەم مزگەوتەی مندا خێرترە لە هەزار نوێژی شوێنانی تر. لە گێڕانەوەیەکا ئەمەشی پترە: چونکە من خۆم دواترینی پێغەمبەرانمو مزگەوتەکەشم دواترینی مزگەوتانە (ش/ت/ئیبنو ماجە) ئیبنو ماجە ئەمەشی لێ پتر کردووە: (وە یەك نوێژیش لە مەسجیدول حەرامدا خێرترە لە سەد هەزار نوێژی شوێنانی تر!).

٦٩٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ سُلَيْمَانَ بْنَ دَاوُدَ (عَلَيْهِمَا السَّلاَمُ) لَمَّا بَنَى بَيْتَ الْمَقْدِسِ سَأَلَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ خِلاَلاً ثَلاَثَةً: حُكْمًا يُصَادِفُ حُكْمَهُ فَأُوتِيَهُ وَمُلْكًا لاَ يَنْبَغِى لأَحَدٍ مِنْ بَعْدِهِ

---

(٣) بخاري. مساجد: ١١٩٦ ، ١٨٨٨ ، ٦٥٨٨ ، ٧٢٣٥. مسلم. حج: ٢٣٥٧ ، ٢٣٥٥ ، ٢٣٥٦.

(٤) بخاري. صلاة في مسجدى مكة والمدينة: ١١٩٠. مسلم. حج: ٢٣٦١ ، ٢٣٦٢ – ٢٣٦٩. ابن ماجه. صلاة: ١٤٠٤م.

فَأُوتِيَهُ، وَسَأَلَ اللَّهَ تَعالَى حِينَ فَرَغَ مِنْ بِنَائِهِ أَلاَّ يَأْتِيَهُ أَحَدٌ لاَ يَنْهَزُهُ إِلاَّ الصَّلاَةُ فِيهِ أَنْ يُخْرِجَهُ مِنْ خَطِيئَتِهِ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ. رَوَاهُ النسائي(٥).

**عەبدوڵڵای کوڕی عەمر** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: کاتێ سولەیمانی کوڕی داوود** (درودی خوایان لێبێ) **کە بەیتولمەقدیسی دروست کرد، داوای ئەم سێ شتەی لە خودای گەورەو سەروەر کرد:**

**یەکەم: هەر حوکمێ کە دەیکا لە نێوانی خەڵکا ڕێکی فەرمانی خودابێ، خودا ئەمەی پێدا.**

**دووەم: موڵکێکی وا کە لەپاش خۆی بۆ کەسی تر دەست نەدات، خودا ئەمەشی پێدا.**

**سێیەم: کاتێ لە دروست کردنی لێ بۆوە داوای لە خودای گەورەکرد: کە هەرکەسێ بچێ بۆ ئەوێ بە نیازی ئەوەی کە نوێژی تیا بکا خودا لە گوناه پاکی بکاتەوە وەك ئەو ڕۆژەی کە لە دایك دەبێ وە خودای گەورە ئەمەشی پێدا** (ن).

٦٩٦- عَنْ مَيْمُونَةَ مَوْلاَةِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفْتِنَا فِي بَيْتِ الْمَقْدِسِ فَقَالَ: ائْتُوهُ فَصَلُّوا فِيهِ، فَإِنْ لَمْ تَأْتُوهُ وَتُصَلُّوا فِيهِ فَابْعَثُوا بِزَيْتٍ يُسْرَجُ فِي قَنَادِيلِهِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وابن ماجة(٦).

**مەیموونەی کارەکەری پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا دروستە سەفەر بکەین بۆ بەیتولمەقدیس؟ فەرمووی: بەڵێ بڕۆن بۆ ئەوێ‌و نوێژی تیا بکەن ئەگەر بۆشتان نەکرا کە بچن نوێژی تیا بکەن ڕۆن زەیت بنێرن بۆ گڕانی چراکانی!** (د/ئیبنو ماجە – س/ صالح).

---

(٥) سكت عن درجته الشارح (مترجم).

(٦) بسند صالح (شرحه).

## ١١٦) مزگەوتەكەی قوباء: (مسجد قباء)

٦٩٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُماَ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَأْتِي مَسْجِدَ قُبَاءٍ كُلَّ سَبْتٍ مَاشِيًا وَرَاكِبًا. وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَفْعَلُهُ. رَوَاهُ الشيخان والنسائي[1].

**ئیبنو عومەر** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: جاران پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **هەموو شەممەیەك بەپێ یا بە سواریی وڵاخ دەچوو بۆ مزگەوتەكەی قوباء، ئیبنو عومەر** (خوایان لێ رازی بێ) **خۆشی ئەمەی دەكرد (ش/ن).**

٦٩٨- عَنْ أُسَيْدِ بْنِ ظَهِيرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الصَّلاَةُ فِي مَسْجِدِ قُبَاءٍ كَعُمْرَةٍ. رَوَاهُ الترمذي والنسائي[2].

**ئوسەیدی كوڕی ظوهەیر** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: تاقە نوێژێ لە مزگەوتی قوبادا خێری یەك عەمرەی هەیە. (ت/ن-س/ح).**

## ١١٧) ڕۆیشتنی ئافرەت بۆ مزگەوت : (ذهاب النساء الى المساجد)

٦٩٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يُصَلِّى الصُّبْحَ بِغَلَسٍ فَيَنْصَرِفْنَ نِسَاءُ الْمُؤْمِنِينَ ، لاَ يُعْرَفْنَ مِنَ الْغَلَسِ[1].

**عائیشە** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: جاران پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **بە تاریكو لێڵەكە بەر نوێژیی نوێژی بەیانیی بۆ دەكردین، كاتێ ئافرەتانی موسوڵمانان لەپاش نوێژ دەگەڕانەوە بۆ ماڵەوە هێشتا لەبەر تاریكی نەدەناسرانەوە (ش).**

---

(١) بخاري مسجد قباء: ١١٩١. مسلم. حج: ٣٣٧٥ — ٣٣٨٣. نسائي. مساجد: ٦٩٧.

(٢) بسند حسن (شرحه).

(١) بخاري. أذان: ٨٦٧. مسلم. مساجد: ١٤٥٧ ، ١٤٥٥ — ١٤٥٩.

٧٠٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ أللهُ عَنهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا اسْتَأْذَنَكُمْ نِسَاؤُكُمْ بِاللَّيْلِ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَأْذَنُوا لَهُنَّ. رَوَاهُما الشيخان[٢].

ئیبنو عومەر (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ژنەكانتان ئەگەر بەشەو داوای روخصەتیان لێكردن كە بڕۆن بۆ مزگەوت رێگەیان پێ بدەن (ش).

٧٠١- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَمْنَعُوا إِمَاءَ اللهِ مَسَاجِدِ اللهِ. رَوَاهُ الشيخان وَأبو دَاوُدَ وزاد: وَلَكِنْ لِيَخرجْنَ وَهُنَّ تَفِلاَتٌ[٣].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: مزگەوتەكانی خودا قەدەغە مەكەن لە ژنانی بەندەگانی خودا (ش/د) ئەبو داوود ئەمەشی پتر كردووە: بەڵام ژنان كە دەچن بۆ مزگەوت، بە پەرپووتی بچن و خۆیان بۆن خۆش نەكەن و خۆیان نەڕازێننەوە.

٧٠٢- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِئذَنُوا لِلنِّسَاءِ بَاللَّيْلِ إِلَى الْمَسَاجِدِ فَقَالَ: أبْنٌ لَهُ يُقَالُ لَهُ وَاقِدٌ: إِذَنْ يَتَّخِذْنَهُ دَغَلاً قَالَ: فَضَرَبَ فِي صَدْرِهِ وَقَالَ: أَقُولُ قَالَ: رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَتَقُولُ لاَ. رَوَاهُ مسلم وأبو دَاوُدَ والترمذي[٤].

دیسان ئەو گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی: بەشەو رێگەی ئافرەت بدەن كە بچن بۆ مزگەوت واقیدی كوڕیشی گوتی: ئەگەر وابێ ژنان دەیكەن بە بیانووی لا مێژیی و بەد خوویی! گوتی: ئیبنو عومەریش كێشای بە سینگی كوڕەكەی خۆیداو گوتی: من دەڵێم پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ و تۆ دەڵێی وا نابێ (م/د/ت).

---

(٢) بخاري. نكاح: ٥٢٣٨. مسلم. صلاة: ٩٨٧.

(٣) مسلم. صلاة: ٩٨٩. بخاري. جمعه: ٩٠٠. أبو داود. صلاة: ٥٦٨.

(٤) مسلم. صلاة: ٩٩١ — ٩٩٤. أبو داود: ٥٦٨. ترمذي: ٥٧٠.

٧٠٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: لَوْ أَدْرَكَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَا أَحْدَثَ النِّساءُ لَمنَعَهُنَّ الْمَسْجِدَ كَماَ مُنِعَتْ نِساَءَ بَنِي إِسْرَائِيلَ. قُلْتُ لِعَمْرَةَ: أَوْ مُنْعْنَ؟ قَالَتْ: نَعَمْ. رَوَاهُ الثلاثة(٥).

**عائیشه** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: ئەمەی کە ئێستا ژنان بەرپایان کردووە ئەگەر پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فریای ئەمە بکەوتایە مزگەوتی لەژنان قەدەغە دەکرد، هەروەك لە ژنانی نەوەی ئیسرائیل قەدەغە کرابوو، منیش گوتم بەعمرە: بۆچی مزگەوت لە ژنانی نەوەی ئیسرائیل (لە دینی خۆیانا) قەدەغە کرابوو؟ گوتی: بەڵێ (ش/د).**

٧٠٤- عَنْ زَيْنَبَ امْرَأَةِ عَبْدِ اللّٰهِ قَالَتْ (رَضيَ اللهُ عَنْهُماَ) قَالَتْ: قَالَ: لَنَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا شَهِدَتْ إِحْدَاكُنَّ الْمَسْجِدَ فَلاَ تَمَسَّ طِيبًا. رَوَاهُ مُسْلِمٌ. وفي رواية: أَيُّمَا امْرَأَةٍ أَصَابَتْ بَخُورًا فَلاَ تَشْهَدْ مَعَنَا الْعِشَاءَ الآخِرَةَ(٦).

**زەینەبی ژنی عەبدوڵڵا** (ڕەزای خودایان لێبێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی پێمان: کاتێ دەچن بۆ مزگەوت بۆن لە خۆتان مەدەن (م) لە گێڕانەوەیەکا: هەر ئافرەتێ بۆنی خۆشی لە خۆی دا با لەگەڵمان نەیەت بۆ نوێژی خەوتنان.**

٧٠٥- عَنْ عَبْدِاللهِ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: صَلاَةُ الْمَرْأَةِ فِي بَيْتِها أَفْضَلُ مِنْ صَلاَتِها فِي حُجْرَتِهاَ، وَصَلاَتُهاَ فِي مَخْدَعِهَا أَفْضَلُ مِنْ صَلاَتِهَا فِي بَيْتِهاَ. وفي رواية: لاَ تَمْنَعُوا نِساَءِكُمُ الْمَسَاجِدَ، وَبُيُوتُهُنَّ خَيْرٌ لَهُنَّ. رَوَاهُماَ أَبُو دَاوُدَ(٧).

**عەبدوڵڵا** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: نوێژی ژن لەناو هۆدەکەی خۆیا خێرترە لە نوێژی ناو حەوشەکەی، وە نوێژی ژن لەناو کولێنو هۆدەی گەنجینەدا خێرترە لە نوێژی ناو هۆدەکەی**

---

(٥) بخاري. أذان: ٨٦٩. مسلم. صلاة: ٩٩٨. أبو داود. صلاة: ٥٦٩.

(٦) مسلم. صلاة: ٩٩٦ – ٩٩٧.

(٧) بسندين صالحين (شرحه).

خۆشی! لە گێڕانەوەیەکا: مزگەوت قەدەغە مەکەن لە ژنەکانتان، هەر چەند نوێژی ماڵەوە باشترە بۆ ئەوان (د-سەنەد صالح).

## ١١٨) بەشی دووەم: دەستوورو نەریتی مزگەوت
## الفصل الثاني: في آداب المساجد

{قَالَ: اللهُ تَعَالى - وَعَهِدْنَا إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْعَاكِفِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ - ٢/١٢٥}.

**واتە:** خودای گەورە دەفەرموێ: فەرمانماندا بە ئیبراهیمو ئیسماعیلی کوڕی کە ئەم خانووی کەعبەیە کە ماڵی منە پاك بکەنەوە لەهەر شتێ کەشایستەی پەرستشی خودا نەبێ، بۆ ئەو کەسانە کە بەشێوەی ئایین هەڵدەسووڕێن بە دەوریا، وە یا لەناویدا دەمێننەوە بۆ پەرستشیو بەندەیی خودا وە بۆ ئەو کەسانە کە نوێژی تیا دەکەنو روکوعو کوڕنووشی تیا دەبەن بۆ خودا.

٧٠٦- عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ أَوْ أَبِي أُسَيْدٍ (رَضِيَ أللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلْيُسَلِّمْ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ لْيَقُلِ اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ فَإِذَا خَرَجَ فَلْيَقُلِ اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وَأَبُو دَاوُدَ والنسائي[١].

ئەبو حومەید یا ئەبو ئوسەید (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: کە چوونە ناو مزگەوت لە پێشا سڵاو لە پێغەمبەر بکەن (دروودی خوای لەسەربێ) ئینجا بڵێن: {اللهم افتح لی ابواب رحمتك:خودایە! دەرگاکانی رەحمەتو میهرەبانی خۆتم لێ بکەرەوە} کە چوونە دەریشەوە بڵێن: (اللهم انی أسألك من فضلك): خودایە! داوای بەخششو بەهرەی خۆتت لێ دەکەم (م/د/ن).

---

(١) مسلم. صلاة: ١٦٤٩. أبو داود. صلاة: ٤٦٥. نسائي. مساجد: ٧٢٨.

٧٠٧- عَنْ فَاطِمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ صَلَّى عَلَى مُحَمَّدٍ وَسَلَّمَ وَقَالَ: رَبِّ اغْفِرْ لِي ذُنُوبِي وَافْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ، وَإِذَا خَرَجَ صَلَّى عَلَى مُحَمَّدٍ وَسَلَّمَ وَقَالَ: رَبِّ اغْفِرْ لِي ذُنُوبِي وَافْتَحْ لِي أَبْوَابَ فَضْلِكَ. رَوَاهُ الترمذي[٢].

**فاطیمە (ڕەزای خودای لێبێ) گوتی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وابوو كاتێ دەچووە ناو مزگەوتەوە دەیفەرموو: اللهم صل على محمد وسلم: بڕێژە خودا ڕەحمەتو دروود بەسەر موحەممەدا) ئینجا دەیفەرموو: (رب اغفر لی ذنوبی وافتح ابواب رحمتك) ئەی پەروەردگارم! گوناهەكانم ببۆشەو دەرگاكانی میهرەبانی خۆتم لێ بكەرەوە كە لە مزگەوتیش دەهاتە دەرەوە دەیفەرموو: رب اغفر لی ذنویی وافتح لی ابواب فضلك: ئەی خودایە! گوناهەكانم ببۆشەو دەرگای بەخششو بەهرەی خۆتم بۆ بكەرەوە (ت-س/ح).**

٧٠٨- وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ قَالَ: أَعُوذُ بِاللّٰهِ الْعَظِيمِ وَبِوَجْهِهِ الْكَرِيمِ وَسُلْطَانِهِ الْقَدِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، فَإِذَا قَالَ: ذَلِكَ قَالَ: الشَّيْطَانُ: حُفِظَ مِنِّي سَائِرَ الْيَوْمِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[٣].

**دەستووری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وابوو كە دەڕۆیشتە ناو مزگەوتەوە دەیفەرموو (أعوذ بالله العظیم بوجهه الكریم وسلطانه القدیم من الشیطان الرجیم: پەنا دەگرم بە یەزدانی مەزن، بەزاتی پیرۆزی، بە دەسەڵاتی دێرینی، لە شەڕی شەیتانی دەركراوی بەشبڕاو لە ڕەحمەت، وە ئەو كەسەی ئەمە بڵێ شەیتان دەڵێ: ئەمە لە ماوەی ئەمڕۆدا لەمن قەدەغەبوو (د-سند صالح).**

---

(٢) بسند حسن (شرحه).

(٣) بسند صالح (شرحه).

٧٠٩- وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَدْخُلُ الْمَسْجِدِ بِرِجْلِهِ الْيُمْنَى، وَيَخْرُجُ بِرِجْلِهِ الْيُسْرَى. رَوَاهُ البخاري(٤).

دەستووری ئیبنو عومەر (خوایان لێ رازی بێ) وابوو کە دەچووە ناو مزگەوتەوە قاچی راستی پێش دەخست و کە لەمزگەوتیش دەهاتە دەرەوە قاچی چەپی پێش دەخست (ب).

٧١٠- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ الْمَسْجِدَ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يَجْلِسَ. رَوَاهُ الخمسة(٥).

ئەبو قەتادە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەرکاتێ چوونە ناو مزگەوت لەپێش ئەوەدا کە دابنیشن دوو رکات نوێژی دیاری مزگەوت بکەن (ش/د/ت/ن).

٧١١- عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ بَدَأَ بِالْمَسْجِدِ فَصَلَّى فِيهِ. رَوَاهُ الشيخان ولفظ مُسْلِمٌ: كَانَ لاَ يَقْدَمُ مِنْ سَفَرٍ إِلاَّ نَهَارًا فِي الضُّحَى، فَإِذَا قَدِمَ بَدَأَ بِالْمَسْجِدِ فَصَلَّى فِيهِ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ جَلَسَ فِيهِ(٦).

کەعبی کوڕی مالیك (خوای لێ رازی بێ) گوتی: یاسای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وا بوو کە لە سەفەر دەهاتەوە لە پێشا دەچوو بۆ مزگەوت و نوێژی لێ دەکرد (ش) گفتەی موسلیم (رەحمەتی خوای لێبێ) ئاوایە: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وابوو کە لەسەفەر دەگەڕایەوە لە چێشتەنگاوا دەهاتەوە، کە دەگەیشتە جێ لە پێشا دەچووە مزگەوت و دوو رکات نوێژی تیا دەکردو ئینجا لەوێ دادەنیشت و خەڵکەکە دەچوون بۆ خزمەتی و بەخێرهاتنیان لێ دەکرد.

---

(٤) رواه البخاري تعليقا في بداية الباب/ ٤٧ من كتاب الصلاة بين رقم: ٤٢٥ و ٤٢٦.

(٥) بخاري. صلاة: ٤٤٤ ، ١١٦٣. مسلم. صلاة المسافرين: ١٦٥١. أبو داود. صلاة: ٤٦٧ ، ٤٦٨. ترمذي. صلاة: ٣١٦. نسائي. مساجد: ٧٢٩.

(٦) بخاري. بيوع: ٢٠٩٧. مسلم: ١٦٥٥.

٧١٢- عَنْ أَنَسَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْبُزَاقُ فِي الْمَسْجِدِ خَطِيئَةٌ، وَكَفَّارَتُهَا دَفْنُهَا. رَوَاهُ الأربعة(٧).

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: تف رۆكردن لەناو مزگەوتا گوناهە، كەفارەتەكەی ئەوەیە كە دایپۆشێ (ش/د/ت).

٧١٣- وَلمسلم: عُرِضَتْ عَلَيَّ أَعْمَالُ أُمَّتِي حَسَنُهَا وَسَيِّئُهَا فَوَجَدْتُ فِي مَحَاسِنِ أَعْمَالِهَا الأَذَى يُمَاطُ عَنِ الطَّرِيقِ وَوَجَدْتُ فِي مَسَاوِى أَعْمَالِهَا النُّخَاعَةَ تَكُونُ فِي الْمَسْجِدِ لاَ تُدْفَنُ(٨).

ئەبو ذەڕ (خوای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: چاك‌و خراپی كردەوەی ئۆمەتم رانوێنرا بۆم‌و هەموویان نیشاندام، دیتم كە لابردنی ئازاری سەرڕێگە یەكێ بوو لە كردەوە جوانەكانیان، وە چڵم‌و بەڵغەم رۆكردنیش لەناو مزگەوتا یەكێ بوو لە كردەوە خراپەكانیان، ئەگەر نەیشارنەوە (م).

٧١٤- (ب - ١ ز - ٩٧ ژمارە: ٥٧٩/١). في هذه الرواية: وَعَنْهُ (أي عن أنسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَأَى نُخَامَةً فِي الْقِبْلَةِ، فَحَكَّهَا بِيَدِهِ، وَرُئِيَ مِنْهُ كَرَاهِيَةٌ، أَوْ رُئِيَ كَرَاهِيَتُهُ لِذَلِكَ وَشِدَّتُهُ عَلَيْهِ وَقَالَ: إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا قَامَ فِي صَلاَتِهِ فَإِنَّمَا يُنَاجِي رَبَّهُ فَلاَ يَبْزُقَنَّ فِي قِبْلَتِهِ، وَلَكِنْ عَنْ يَسَارِهِ أَوْ تَحْتَ قَدَمِهِ، ثُمَّ أَخَذَ طَرَفَ رِدَائِهِ فَبَزَقَ فِيهِ، وَرَدَّ بَعْضَهُ عَلَى بَعْضٍ، وَقَالَ: أَوْ يَفْعَلُ هَكَذَا(٩).

دیسان ئەنەس (رەزای خودای لێبێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەناو مزگەوتا بە رووی قیبلەوە بەڵغەمێكی چاو پێكەوت، زۆری پێ ناخۆش بوو، یا گوتی گەلێكی پێ ناخۆش بوو، وە زۆری پێ گران بوو، بۆیە فەرمووی: ئێوە كە لەناو نوێژا رادەوەستن ئەوە لەگەڵ پەروەردگاری خۆتانا قسەی پەنهانی خۆتان

---

(٧) بخاري. صلاة: ٤١٥. مسلم. مساجد: ١٢٣٢. أبو داود. صلاة: ٤٧٤. ترمذي. صلاة: ٥٧٢. نسائي. مساجد: ٧٢٣.

(٨) مسلم. مساجد: ١٢٣٣.

(٩) بخاري. صلاة: ٤١٢ - ٤١٥. مسلم. مساجد: ١٢٢٣ - ١٢٣٠. أبو داود. صلاة: ٤٧٩.

دەکەن و گوفتوگۆ لەگەڵ ئەو زاتە مەزنەدا دەکەن، کەوابوو لە رووی رووگەوە تف و بەڵغەم و چڵم رۆمەکەن، بەڵام ئەگەر هەر چارتان نەبوو لەلای چەپتانەوە، یا لە ژێر پێتانا تف بکەن و بە خۆڵ و چەوی ناومزگەوتەکە داپۆشن ئینجا حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) چمکی لە شپۆشەکەی خۆی گرت و تفی تێ کردو وڵییەوە بە سەریەکاو فەرمووی: یاخود ئاوا بکەن وە حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) بەڵغەمەکەی رووی رووگەشی بە دەستی خۆی کڕاند (ش/د).

٧١٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) أَنَّ رَجُلاً أَسْوَدَ أَوِ امْرَأَةً سَوْدَاءَ كَانَ يَقُمُّ الْمَسْجِدَ ، فَمَاتَ ، فَسَأَلَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْهُ فَقَالُوا: مَاتَ، قَالَ: أَفَلاَ كُنْتُمْ آذَنْتُمُونِي بِهِ، دُلُّونِي عَلَى قَبْرِهِ، فَأَتَى قَبْرَهُ فَصَلَّى عَلَيْهِ. رَوَاهُما الثلاثة(١٠).

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێکی رەش (یا ئافرەتێکی رەش) مزگەوتی دەماڵی ئەمری خودای کردو فەرمانی هەقی بەجێ هێنا، رۆژێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هەواڵی پرسی، گوتیان: مرد! فەرمووی: ئەی نەدەبوو پێم بڵێن! گۆڕەکەیم نیشان بدەن ئینجا رۆیشتە سەر گۆڕەکەی و نوێژی لەسەری کرد (ش/د).

٧١٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: عُرِضَتْ عَلَيَّ أُجُورُ أُمَّتِي حَتَّى الْقَذَاةُ يُخْرِجُهَا الرَّجُلُ مِنَ الْمَسْجِدِ وَعُرِضَتْ عَلَيَّ ذُنُوبُ أُمَّتِي فَلَمْ أَرَ ذَنْبًا أَعْظَمَ مِنْ سُورَةٍ مِنَ الْقُرْآنِ أَوْ آيَةٍ أُوتِيَهَا رَجُلٌ ثُمَّ نَسِيَهَا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي(١١).

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەرچی پاداشی ئۆمەتم هەیە هەمووی رانوێنرا بۆم و پیشانمدرا، تەنانەت پاداشی ئەو پۆش و پەڵاشەش کەیەکێ لە مزگەوت دەیماڵێ و فرێی دەدا، وە هەرچی گوناهی ئۆمەتیشم هەیە رانوێنرا بۆم، کەسم نەدی کە گوناهی لە

---

(١٠) بخاري. صلاة: ٤٥٨ ، ٤٦٠ ، ١٣٣٧. مسلم. جنائز: ٢٢١٢. أبو داود. جنائز: ٣٢٠٣.

(١١) بسند غريب (شرحه).

گوناهی ئەو پیاوە گەورەتر بێ کە سوورەتێ، یا ئایەتێکی قورئانی لەبەر بووبێ و لەپاشا لەبیری بچێتەوە (د/ت).

٧١٧- عن عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ عَنْ عَمِّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُسْتَلْقِيًا فِي الْمَسْجِدِ وَاضِعًا إِحْدَى رِجْلَيْهِ عَلَى الأُخْرَى. رَوَاهُ الخمسة[١٢].

عەببادی کوڕی تەمیم گوتی: مامم (خوای لێ رازی بێ) گوتی: بە چاوی خۆم پێغەمبەرم دی (درووودی خوای لەسەربێ) لە مزگەوت لە سەرپشت راکشابوو، لنگی نابووە سەرلنگی (ش/د/ت/ن).

٧١٨- وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ وَهُوَ شَابٌّ أَعْزَبُ لاَ أَهْلَ لَهُ يَنَامُ فِي مَسْجِدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رَوَاهُ البخاري والترمذي[١٣].

جاران ئیبنو عومەر کە رەبەن[١] و بێ خێزان بوو لە مزگەوتەکەی پێغەمبەردا (درووودی خوای لەسەربێ) دەخەوت (ب/ت).

٧١٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَيْلاً قِبَلَ نَجْدٍ ، فَجَاءَتْ بِرَجُلٍ مِنْ بَنِي حَنِيفَةَ يُقَالُ لَهُ ثُمَامَةُ بْنُ أُثَالٍ، فَرَبَطُوهُ بِسَارِيَةٍ مِنْ سَوَارِي الْمَسْجِدِ، رَوَاهُ الثلاثة[١٤].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەربێ) دەستەیێ سواری نارد بۆلای نەجد، کە گەڕانەوە زەلامێکی بەنی حەنیفەییان هێنابو، ناوی ثومامەی کوڕی ئوثال بوو، بەستیانەوە بە یەکێك لە کۆڵەکەکانی مزگەوتەوە! (ش/د).

---

(١٢) بخاري. صلاة: ٤٧٥ ، ٥٩٦٩ ، ٦٣٨٧. مسلم. لباس: ٥٤٧١ ، ٥٤٦٨ — ٥٤٧٠. أبو داود ، أدب: ٤٨٦٦. ترمذي. أدب: ٢٧٦٥. نسائي. مساجد: ٧٢٠.

(١٣) بخاري. صلاة: ٤٤٠ ، ١١٢١ ، ١١٥٦ ، ٣٧٣٨ ، ٣٧٤٠ ، ٧٠١٥ ، ٧٠٢٨ ، ٧٠٣٠.

[١] رەبەن: زەلامی گەنجی بێ ژنو ماڵ (فەرهەنگی خاڵ)

(١٤) بخاري. صلاة: ٤٦٢ ، ٤٦٩ ، ٢٤٢٢ ، ٢٤٢٣ ، ٤٣٧٢. مسلم. جهاد: ٤٥٦٤.

٧٢٠- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ عِفْرِيتًا مِنَ الْجِنِّ تَفَلَّتَ عَلَيَّ الْبَارِحَةَ - أَوْ كَلِمَةً نَحْوَهَا - لِيَقْطَعَ عَلَيَّ الصَّلاَةَ ، فَأَمْكَنَنِي اللَّهُ مِنْهُ فَأَرَدْتُ أَنْ أَرْبِطَهُ إِلَى سَارِيَةٍ مِنْ سَوَارِي الْمَسْجِدِ ، حَتَّى تُصْبِحُوا وَتَنْظُرُوا إِلَيْهِ كُلُّكُمْ ، فَذَكَرْتُ قَوْلَ أَخِي سُلَيْمَانَ: رَبِّ هَبْ لِي مُلْكًا لاَ يَنْبَغِي لأَحَدٍ مِنْ بَعْدِي. فَرَدَّهُ خَاسِئًا. رَوَاهُ الشيخان[١٥].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: دوێ شەو دێوێكی جنۆكە لەپڕ پەلاماری دام یا ووشەیەكی ئاوای فەرمووبۆ ئەوە پەلاماری دام، تاكوو نوێژەكەم پێ ببڕێ، بەڵام لە سایەی خوداوە دەستم لێی گیربوو گرتم، ویستم كە بی بستمەوە بەیەكێ لە كۆڵەكەكانی مزگەوتەوە هەتا بەیانی هەمووتان سەیری بكەن، بەڵام كە قسەكەی سولەیمان پێغەمبەری برام بیركەوتەوە ئیتر خوێریم كرد، مەبەستم ئەو قسەیەتی كە فەرمویێ: رَبِّ هَبْ لِي مُلْكًا لاَ يَنْبَعي لِاَحَدٍ مِنْ بَعْدِي: ئەی پەروەردگارم! موڵكو سامانو دارایییەكی وام بدەرێ كە لەپاش من بۆ كەسی تر دەست نەدات (ش).

٧٢١- عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ قَائِمًا فِي الْمَسْجِدِ فَحَصَبَنِي رَجُلٌ ، فَنَظَرْتُ فَإِذَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ فَقَالَ: اذْهَبْ فَأْتِنِي بِهَذَيْنِ. فَجِئْتُهُ بِهِمَا. وَقَالَ: مِنْ أَيْنَ أَنْتُمَا؟ قَالاَ مِنْ أَهْلِ الطَّائِفِ. قَالَ: لَوْ كُنْتُمَا مِنْ أَهْلِ الْبَلَدِ لأَوْجَعْتُكُمَا، تَرْفَعَانِ أَصْوَاتَكُمَا فِي مَسْجِدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَوَاهُ البخاري[١٦].

سائیبی كوڕی یەزید (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە مزگەوت راوەستا بووم، پیاوێ زیخێكی تێ گرتم، كە تەماشام كرد عومەری كوڕی خەططاب بوو، گوتی: برۆ ئەو دوو كەسەم بۆبێنە، منیش چووم هێنامن بۆی پێی گوتن: ئێوە كوێندەرین؟ گوتیان: خەڵكی طائیفین. گوتی: ئەگەر نابەڵەد نەبوونایەو

---

(١٥) بخاري. صلاة: ٤٦١ ، ١٢١٠ ، ٣٢٨٤ ، ٣٤٢٣ ، ٤٨٠٨ ، ١٢٠٩.

(١٦) بخاري. صلاة: ٤٧٠

خەڵكی ئەم شارە بوونایە ئێشم پێ دەگەیاندن، چۆن لە مزگەوتی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەربێ) دەنگە دەنگ دەکەن! (ب).

٧٢٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ سَمِعَ رَجُلاً يَنْشُدُ ضَالَّةً فِي الْمَسْجِدِ فَلْيَقُلْ لاَ رَدَّهَا اللَّهُ عَلَيْكَ فَإِنَّ الْمَسَاجِدَ لَمْ تُبْنَ لِهَذَا. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وأَبُو دَاوُدَ[١٧].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەگەر گوێتان لێ بوو کە یەکێ لەناو مزگەوتا بانگەواز هەڵ دەدات بۆ دۆزینەوەی شتی گومبوو، بڵێن: یاخوا نەیدۆزیتەوە، چونکە مزگەوت بۆ خوا پەرستی دروست کراوە، بۆ ئەمە دروست نەکراوە (م/د).

٧٢٣- وَلِمُسلم: أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَمَّا صَلَّى، قَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: مَنْ دَعَا إِلَيَ الْجَمَلِ الأَحْمَر، فَقَالَ: (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ وَجَدْتَ. إِنَّمَا بُنِيَتِ الْمَسَاجِدُ لِمَا بُنِيَتْ لَهُ[١٨].

سولەیمانی کوڕی بورەیدە (خودا لێیان رازی بێ) گوتی: باوکم گوتی: کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە نوێژی بەیانی بووەوە پیاوێ هەڵسا گوتی: کێ وشترێکی نێری سووری دیوەتەوە؟ پێغەمبەریش فەرمووی: (دروودی خوای لەسەربێ): دەك نەیدۆزیتەوە، مزگەوت بۆ خودا پەرستی دروست کراوە. نەك بۆ ئەم جۆرە شتانە (م).

٧٢٤- وَلِلثلاثة: مَنْ مَرَّ فِي شَيْءٍ مِنْ مَسَاجِدِنَا أَوْ أَسْوَاقِنَا بِنَبْلٍ، فَلْيَأْخُذْ عَلَى نِصَالِهَا بِكَفِّهِ، لاَ يَعْقِرْ مُسْلِمًا[١٩].

حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر کەسێ تیرو شیرو نێزەو شتی وای پێبوو، وە چوو بۆ مزگەوت و بازاڕەکانمان با دەستی بگرێ بە نووکەکەیەوە، نەبادا موسوڵمانێ زامار بکات (ش/د).

---

(١٧) مسلم. مساجد: ١٢٦٠ – ١٢٦٣. أبو داود. صلاة: ٢١.

(١٨) مسلم. مساجد: ١٢٦٢.

(١٩) بخاري. مساجد: ٤٥٢ ، ٧٠٧٥.

٧٢٥- (ب – ١ ز – ٩٨ ذمارة: ٣/٥٨٥). في هذه الرواية: عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أَكَلَ الْبَصَلَ وَالثُّومَ وَالْكُرَّاثَ فَلاَ يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا. فَإِنَّ الْمَلاَئِكَةَ تَتَأَذَّى مِمَّا يَتَأَذَّى مِنْهُ بَنُو آدَمَ. وفي رواية: مَنْ أَكَلَ ثُومًا أَوْ بَصَلاً فَلْيَعْتَزِلْنَا أَوْ فَلْيَعْتَزِلْ مَسْجِدَنَا، وَلْيَقْعُدْ فِي بَيْتِهِ. وَفِي أُخرى: مَنْ أَكَلْ مَنْ هَذِهِ فَلاَ يَقْرَبَنَّ مَسَاجِدَنَا حَتَّى يَذْهَبَ رِيحُهَا. رَوَاهُ الخمسة[٢٠].

جابیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوەی پیاز دەخوا یاسیر دەخوا، یا کەوەر دەخوا، با توخنی مزگەوتمان نەکەوێ هەتا بۆنەکەی دەڕوا چونکە هەرچی ئازاری ئادەمیزاد بدات ئازاری فریشتەش دەدات، لە گێڕانەوەیەکا: ئەوی سیر یا پیازی خوارد با دوور بگرێ لێمان یا فەرمووی: با دوور بگرێ لە مزگەوتمان و لە ماڵی خۆی دابنیشێ. لە گێڕانەوەیەکی تردا: هەرکەسێ لەم گیایەی خوارد با توخنی مزگەوتەکانمان نەکەوێ تا بۆنەکەی دەڕوات (ش/د/ت/ن).

٧٢٦- ولمسلم والنسائي: قَالَ: عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) فِي خُطْبَةٍ أَيُّهَا النَّاسُ تَأْكُلُونَ شَجَرَتَيْنِ لاَ أُرَاهُمَا إِلاَّ خَبِيثَتَيْنِ، الْبَصَلَ وَالثُّومُ، رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا وَجَدَ رِيحَهُمَا مِنَ الرَّجُلِ فِي الْمَسْجِدِ أَمَرَ بِهِ فَأُخرِجَ إِلَى الْبَقِيعِ فَمَنْ آكِلَهَمَا فَلْيُمِتْهَا طَبْخًا[٢١].

عومەر (خوای لێ رازی بێ) لە دوان (خوطبە)یەکا گوتی: ئەی خەڵکینە! ئێوە دووگیا هەیە دەیانخۆن، من بەپیسیان دەزانم واتە پیازو سیر، بە چاوی خۆم دیومە ئەو کەسەی لە مزگەوتا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بۆنی ئەم دووەی لێ بکردایە فەرمانی دەدا لە مزگەوت دەریان دەکردو دەیان برد بۆ بەقیع، جا ئەوەی دەیانخوات با بیان کوڵێنێ تا بۆنەکەیان بمرێ! (م/ن).

---

(٢٠) راجع رقم: ٥٩٣.

(٢١) مسلم. مساجد: ١٢٥٨ ، ٤١٢٦. نسائي. مساجد: ٧٠٧.

٧٢٧- وَللترمذي والنسائي: نَهَى أَلنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ تَنَاشُدِ الأَشْعَارِ فِي الْمَسْجِدِ وَعَنِ الْبَيْعِ وَالاِشْتِرَاءِ فِيهِ وَأَنْ يَتَحَلَّقَ النَّاسُ فِيهِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ قَبْلَ الصَّلاَةِ(٢٢).

**گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **ئەم شتانەی لەناو مزگەوتا یاساخ كردووە: شەڕە شیعرو خوێندنەوەی هۆنراوو كڕینو فرۆشتنو ئەڵقەدانی خەڵكو دانیشتنیان بە ئەڵقە لەپێش نوێژی هەینیدا (چونكە ئەو جۆرە دانیشتنە ریزتێك دەدا (ت/ن-س/ح).**

## ١١٩) چۆنێتی مزگەوتەكەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر دەمی خۆیدا:

## صفة مسجد النبي ﷺ في عهده

٧٢٨- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ أَللهُ عَنْهُمَا) أَنَّ الْمَسْجِدَ كَانَ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَبْنِيًّا بِاللَّبِنِ وَسَقْفُهُ أَلْجَرِيدُ وَعُمُدُهُ خَشَبُ النَّخْلِ فَلَمْ يَزِدْ فِيهِ أَبُو بَكْرٍ شَيْئًا وَزَادَ فِيهِ عُمَرُ وَبَنَاهُ عَلَى بِنْيَانِهِ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِاللَّبِنِ وَالْجَرِيدِ، وَأَعَادَ عَمَدَهُ مِنْ خَشَبِ النَّخْلِ، ثُمَّ غَيَّرَهُ عُثْمَانُ فَزَادَ فِيهِ زِيَادَةً كَثِيرَةً وَبَنَى جِدَارَهُ بِالْحِجَارَةِ الْمَنْقُوشَةِ وَالْقَصَّةِ وَجَعَلَ عَمَدَهُ مِنْ حِجَارَةٍ مَنْقُوشَةٍ، وَسَقَّفَهُ بِالسَّاجِ. رَوَاهُ البخاري وأَبُو دَاوُدَ(١).

**ئیبنو عومەر** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: لە سەردەمی پێغەمبەر خۆیدا** (دروودی خوای لەسەربێ) **مزگەوتەكەی مەدینە بەخشتی كاڵ دروست كرابوو، دارە راكەیو پەردووەكەی پەلكە خورما بوو، كۆڵەكەو دەستەكەكانی لە دار خورما بوون، ئەبو بەكر هیچ دەستكاری نەكرد، بەڵام عومەر دەستكاری كردو لە پانیو لەبەرزی لێی زیاد كرد، وەلێ هەر وەك سەردەمی پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **دیوارەكەی بەخشتی كاڵو دارەڕاو پەردووەكەی بە پەلكە خورما دروست كردەوە وە كۆڵەكەو راژەكانیشی لە دار خورمای تازە دانایەوە، بەڵام لەپاشا**

---

(٢٢) بسند حسن (شرحه).

(١) بخاري. مساجد: ٤٤٦.

عوسمان دەستكارییەكی باشی كردو زۆر شتی گۆڕیو گەلێكی لێ زیاكرد، ئەوە بوو دیوارەكەی بە بەردی نەخشاوو گەچ دروست كرد، وە لەباتی كۆڵەكە پایەی بە بەردی نەخشین دانا، وە بە داری ساجیش بانەكەی دارە راكرد (ب/د).

٧٢٩- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَخْطُبُ إِلَى جِذْعٍ فَلَمَّا اتَّخَذَ الْمِنْبَرَ حَنَّ الْجِذْعُ حَتَّى أَتَاهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَالْتَزَمَهُ فَسَكَنَ. رَوَاهُ الترمذي والبخاري(٢).

جابیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە پێشدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) كە دووان (خوتبە)ی دەدا لەلای كۆڵەكەیەكی دارخورمادا رادەوەستاو لەكاتی خوتبەدانەكەدا شانی پێوە دەدا، لەپاشدا كە دووانگە (مینبەر)ە كەی دروست كردو چووە سەری بۆ خوتبەدان كۆڵەكەكە دڵی بەخۆی سووتاو دەستی كرد بە كوڵی گریان (وەك منداڵێ لەدایكی دابڕابێ ئاوا) تا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) چوو بۆ لای و دەستی كردە ملی ئەوجا داسەكناو كوڵی گریانی نیشتەوەو بێ دەنگ بوو (ت/ب).

٧٣٠- وَعَنْهُ أَنَّ امْرَأَةً قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ، أَلاَ أَجْعَلُ لَكَ شَيْئًا تَقْعُدُ عَلَيْهِ، فَإِنَّ لِي غُلاَمًا نَجَّارًا قَالَ: إِنْ شِئْتِ. فَعَمِلَتِ الْمِنْبَرَ. رَوَاهُ الثلاثة(٣).

دیسان گوتی: ئافرەتێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من رەنجبەرێكی دارتاشم هەیە ئەگەر دەفەرمووی بامینبەرێكت بۆ دروست بكا لەكاتی دووان و خوتبەدا لەسەری دابنیشە؟ فەرمووی: ئارەزووی خۆتە. جا ژنەكەش دووانگەكەی دروست كرد (ش/د).

---

(٢) بخاري. مناقب: ٣٥٨٣ ، ٣٥٨٤ ، ٣٥٨٥.

(٣) بخاري. صلاة: ٣٧٧ ، ٤٤٨ ، ٩١٧ ، ٢٠٩٤ ، ٢٥٦٩. مسلم. مساجد: ١٢١٧. أبو داود. صلاة: ١٠٨٠. نسائي. مساجد.٧٣٨.

## ١٢٠) هەڵخستنو زەڕكەشكردنو نەخشاندنی مزگەوت باش نیە: يكره تشييد المساجد وزخرفتها

٧٣١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا أُمِرْتُ بِتَشْيِيدِ الْمَسَاجِدِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[1].

**ئیبنو عەباس** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: خودا پێی نەگوتووم کە مزگەوتی بەرزو بەرچاویی دروست بکەم، (د/سند صالح).**

٧٣٢- وَقَالَ: ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُمَا) لَتُزَخْرِفُنَّهَا كَمَا زَخْرَفَتِ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى. رَوَاهُ البخاري وَأَبُو دَاوُدَ[2].

**ئیبنو عەبباس** (خوایان لێ رازی بێ) **گوتی: هەر وەك چۆن جوولەكەكان كە نیشتەی خۆیانو گاورەكان كڵێشەی خۆیان نەخشاندووەو زەڕكەشیان دەكەن ئێوەش ئاوەها چاو لەوان دەكەنو مزگەوتەكانی خۆتان دەنەخشێننو زەڕكەشیان دەكەن! (ب/د).**

٧٣٣- عَنْ أَنَسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَتَبَاهَى النَّاسُ فِي الْمَسَاجِدِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي[3].

**ئەنەس** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: قیامەت هەڵناسێ تا خەڵك شانازیو فیزدەكەن بە دروستكردنی مزگەوتەوەو مزگەوتی كەشخەو بەرزو رازاوە دروست دەكەن تا خەڵك بڵێن: ئەوە مزگەوتی فیسارەكەسە (د/ن-سەنەد صالح).**

٧٣٤- وللبخاري وابن خزيمة: يَتَبَاهَوْنَ بِالْمَسَاجِدِ ثُمَّ لاَ يَعْمُرُونَهَا إِلاَّ قَلِيلاً[4].

---

(١) بسند صالح (شرحه).

(٢) رواه البخاري تعليقا بعد رقم: ٤٤٥ فی الباب/ ٦٢ من كتاب الصلاة.

(٣) بسند صالح (شرحه).

(٤) هذا التعليق رواه البخاري فی الباب/ ٦٢ من كتاب الصلاة بعد رقم: ٤٤٥.

دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەربێ): رۆژێ دەبی موسوڵمانان فیزو شانازیی دەکەن بە دروست کردنی مزگەوتی کەشخەوەو کەچی بە دەگمەن نەبێ ئاوەدانیان ناکەنەوە (ب/ئیبنو خوزەیمە – غایەتولمەئموول).

## ١٢١) بەشی سێیەم: باسی ئەو شوێنانەی کە نوێژیان تیا باش نیە:
## الفصل الثالث: في المواضع التي تكره فيها الصلاة

٧٣٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللّٰهُ عَنهُا) أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ ذَكَرَتْ لِرَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَنِيسَةً رَأَتْهَا بِأَرْضِ الْحَبَشَةِ يُقَالُ لَهَا مَارِيَةُ، فَذَكَرَتْ لَهُ مَا رَأَتْ فِيهَا مِنَ الصُّوَرِ، فَقَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أُولَئِكَ قَوْمٌ إِذَا مَاتَ فِيهِمُ الْعَبْدُ الصَّالِحُ أَوِ الرَّجُلُ الصَّالِحُ بَنَوْا عَلَى قَبْرِهِ مَسْجِدًا، وَصَوَّرُوا فِيهِ تِلْكَ الصُّوَرَ، أُولَئِكَ شِرَارُ الْخَلْقِ عِنْدَ اللّٰهِ تَعَالَى[١].

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: ئوممو سەلەمە لە وڵاتی حەبەشە کلیسایەکی دیبوو، بەناوی مارییە، باسی ئەو پەیکەرو وێنانەی گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کە لەو کڵیسایەدا دیبوونی، فەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ): ئەوانە هۆزێکن کاتێ بەندەیەکی باش یا پیاو چاکێکیان لەناودا دەمرێ دەچن مزگەوت لەسەر گۆڕەکەی دروست دەکەن و ئەو وێنانەی تیا دەکێشن، ئەم جۆرە کەسانەش کە ئەم رەوشتە ناپەسەندەیان داهێناوە بەدترینی دروستکراوانی خودان لەلای خودای گەورەو مەزن (ش).

٧٣٦- وَعَنْهَا قَالَتْ: لَمَّا نُزِلَ بِرَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) طَفِقَ يَطْرَحُ خَمِيصَةً لَهُ عَلَى وَجْهِهِ ، فَإِذَا اغْتَمَّ بِهَا كَشَفَهَا عَنْ وَجْهِهِ ، فَقَالَ: وَهُوَ كَذَلِكَ: لَعْنَةُ اللّٰهِ عَلَى الْيَهُودِ وَالنَّصَارَى اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ، يُحَذِّرُ مَا صَنَعُوا. رَوَاهُمَا الشَّيْخَانِ[٢].

---

(١) بخاري. صلاة: ٤٢٧ ، ٤٣٤ ، ١٣٤١ ، ٣٥٧٣. مسلم. مساجد: ١١٨١.

(٢) بخاري. صلاة: ٤٣٥ ، ٤٣٦ ، ١٣٣٠ ، ٣٤٥٣ ، ٤٤٤٣ ، ٥٨١٥. مسلم. مساجد: ١١٨٧.

دیسان عائیشە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: کاتێ فریشتەی گیانکێشان هات بۆ خزمەتی حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) لەکاتی سەرەمەرگا، حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) پارچەیەکی گوڵ گوڵی دابوو بەسەر ڕووی خۆیا، ناو بەناو کە پارچەکە خەفەو تەنگە نەفەسی دەکرد ڕووی خۆی لادەدا، وە لەم کاتی سەرەمەرگەدا فەرمووی: لەعنەت و نەفرینی خودا لە جوولەکەو گاوربێ، کە گۆڕی پێغەمبەرەکانی خۆیان کردووە بە مزگەوت. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەمە هەرەشەی لەم کردارە ناپەسەندەیان دەکرد نەبادا موسوڵمانیش چاو لەوان بکەن و گۆڕی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بکەن بە مزگەوت و نوێژو پەرستشی تیا بکەن و بەرەبەرە لەپاش ڕۆژگارێکی درێژ گۆڕەکە خۆشی بپەرستن! (ش).

٧٣٧- عَنْ جُنْدَبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَبْلَ أَنْ يَمُوتَ بِخَمْسٍ وَهُوَ يَقُولُ إِنِّي أَبْرَأُ إِلَى اللّٰهِ أَنْ يَكُونَ لِي مِنْكُمْ خَلِيلٌ فَإِنَّ اللّٰهَ تَعَالَى قَدِ اتَّخَذَنِي خَلِيلاً كَمَا اتَّخَذَ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلاً، وَلَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا مِنْ أُمَّتِي خَلِيلاً لاتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ خَلِيلاً، أَلاَ وَإِنَّ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ كَانُوا يَتَّخِذُونَ قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ وَصَالِحِيهِمْ مَسَاجِدَ، أَلاَ فَلاَ تَتَّخِذُوا الْقُبُورَ مَسَاجِدَ، إِنِّي أَنْهَاكُمْ عَنْ ذَلِكَ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ والنسائي[٣].

لە جوندوبەوە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: بە پێنج شەو بەر لەمردنی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لێ یم ژنەوت دەیفەرموو: من لەلای خودا پاکانە بۆ خۆم دەکەم لەوەی کە یەکێ لەئێوە بگرم بە دۆست (خەلیل)ی خۆم، چونکە من خودای گەورە کردوومی بە دۆستی خۆی، هەر وەك چۆن ئیبراهیمی کردووە بە دۆستی خۆی، بەڵام ئەگەر لە ئۆمەتم یەکێکم بگرتایە بە دۆست بۆ خۆم، ئەبو بەکرم هەڵدەبژاردو دەمکرد بە دۆستی خۆم. ئاگادار بن کە نەتەوەکانی پێش ئێوە گۆڕی پێغەمبەران و پیاوچاکانی خۆیان دەکرد بە مزگەوت، ئاگادار بن کە ئێوە شتی وا نەکەن، ئەوا من ئەمە لە ئێوە یاساخ دەکەم (م/ن).

---

(٣) مسلم. مساجد: ١١٨٨.

٧٣٨- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدٌ إِلاَّ الْحَمَّامَ وَالْمَقْبُرَةَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي والحاكم وصححه[٤].

ئەبو سەعید (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: گەرماو (حەمام)و گۆڕستانی لێ دەرچێ سەر رووی زەوی هەمووی وەك مزگەوت نوێژگایە (د/ت/حا:ص).

٧٣٩- عَنِ الْبَرَاءِ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ الصَّلاَةِ فِي مَبَارِكِ الإِبِلِ فَقَالَ: لاَ تُصَلُّوا فِيهَا فَإِنَّهَا مِنَ الشَّيَاطِينِ وَسُئِلَ عَنِ الصَّلاَةِ فِي مَرَابِضِ الْغَنَمِ فَقَالَ: صَلُّوا فِيهَا فَإِنَّهَا بَرَكَةٌ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي ولفظه: صَلُّوا فِي مَرَابِضِ الغَنَمِ وَلاَ تُصَلُّوا فِي أَعْطَانِ الإِبِلِ[٥].

بەراء (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە پێغەمبەریان پرسی (دروودی خوای لەسەربێ) بۆ نوێژکردن لە مۆڵگە وشتردا فەرمووی نوێژی لێ مەکەن چونکە وشتر لە بنەڕەتا لە رەگەزی شەیاطینن وە لێشیان پرسی بۆ نوێژکردن لە پەچە رانا فەرمووی: نوێژی لێ بکەن چونکە مەڕو بزن پیتو بەرەکەتن (د/ت-س/ص) گفتەی تیرمیذی (رەحمەتی خودای لێبێ) ئاوایە: لە پەچە رانا نوێژی تیا بکەن، بەلام لە مۆڵگە وشتری سەرئاوا نوێژمەکەن.

٧٤٠- وَللشيخين والترمذي: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي فِي مَرَابِضِ الْغَنَمِ قَبْلَ أَنْ يُبْنَى الْمَسْجِدُ[٦].

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لەپێش دروستکردنی مزگەوتەکەی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەربێ) پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە پەچە رانیشا جاروبار نوێژی دەکرد. (ش/ت).

(٤) حديث صحيح عمه الحاكم.

(٥) بسند صحيح ·شرحه).

(٦) بخاري. وضوء: ٢٣٤، ٤٢٨، ٤٢٩، ١٨٦٨، ٢١٠٦، ٢٧٧١، ٢٧٧٤، ٢٧٧٩، ٣٩٣٢. مسلم. مساجد: ١١٧٤.

٧٤١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ أللهُ عَنْهُماَ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى أَنْ يُصَلِّى فِى سَبْعَةِ مَوَاطِنَ فِي الْمَزْبَلَةِ وَالْمَجْزَرَةِ وَالْمَقْبُـرَةِ وَقَارِعَـةِ الطَّرِيـقِ وَفِـى الْحَمَّامِ وَفِى مَعَاطِنِ الإِبِلِ وَفَوْقَ ظَهْرِ بَيْتِ اللّٰهِ الْحَرَامِ. رَوَاهُ الترمذي[٧].

ئیبنو عومەر (خوایان لێ رازی بێ) گـوتـی: پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەربێ) نـەهی کـردووە لـە نوێـژکردن لـەم حـەوت شـوێنەدا: لـە سـەلوێنك‌و قەسـابخانەو گۆڕسـتان‌و سـەرەڕێ‌و گـەرماوو مۆڵگـەی سـەر سەرچـاوەی ئـاو خواردنـەوەی وشترو سەر سەربانی کەعبە (ت-سند ضعيف).

٧٤٢- عَنْ عَلِيّ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَانِي حَبِيبِي (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ أُصَلِّيَ فِي الْمَقْبُرَةِ وَنَهَانِى أَنْ أُصَلِّيَ فِي أَرْضِ بَابِلَ فَإِنَّهَـا مَلْعُونَـةٌ. رَوَاهُ أَبُـو دَاوُدَ والبخـاري ولفظه: كَرِهَ عَلِيٌّ الصَّلاَةَ بِخَسْفِ بَابِلَ. والله أعلم[٨].

عەلی (خوای لێ رازی بێ) گـوتـی: خۆشەویستەکەم حـەزرەتی پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەربێ) پێـی گوتـووم کـە لـە گۆڕسـتان نوێـژ نەکـەم، هـەر وەهـا لـەخاکی بابلیـشدا نوێـژ نەکـەم چـونکە ئـەو خاکـە نـەفرین لێ کـراوە (د-سـند ضـعيف) بوخاریش (خوای لێ رازی بێ) ئیشارەی بۆ ئـەم فەرموودەیـە کـردووەو دەڵـێ: عـەلی نوێژکردنی لە شوێنی خاکەڕۆچووەکەی بابلدا پێ ناخۆش بوو.

## باسی نۆهەم: باسی نوێژ بەکۆمەڵی (نوێژی جەماعەت) ئەم باسە پێنج بەش‌و پاشەکییەکە

### ١٢٢) بەشی یەکەم: باسی خێرو گەورەیی نوێژی جەماعەت:

### الباب التاسع: في الجماعة. (وفيه خمسة فصول وخاتمة):

### الفصل الأول: في فضل الجماعة

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلاَةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَـكَ – ٤/١٠٢}.

(٧) بسند ضعيف (شرحه).

(٨) هذا التعليق ذكره البخاري في بداية الباب/ ٥٣ من كتاب الصلاة.

واتــه: خــودای مــەزن دەفــەرموێ: هــەركاتێ خــۆت لــەناویانا بــووی‌و ویستت نوێژ بكەی بۆیان، با دەستە یەكیان لەگەڵ خۆتا نوێژبكەن.

٧٤٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: صَـلاَةُ الرَّجُلِ فِي الْجَمَاعَةِ تُضَعَّفُ عَلَى صَلاَتِهِ فِي بَيْتِهِ وَفِي سُوقِهِ خَمْسًا وَعِشْرِينَ ضِعْفًا ، وَذَلِكَ أَنَّهُ إِذَا تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الْمَسْجِدِ لاَ يُخْرِجُهُ إِلاَّ الصَّلاَةُ ، لَمْ يَخْطُ خَطْوَةً إِلاَّ رُفِعَتْ لَهُ بِهَا دَرَجَةٌ ، وَحُطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةٌ ، فَـإِذَا صَـلَّى لَـمْ تَزَلِ الْمَلاَئِكَةُ تُصَلِّي عَلَيْهِ مَا دَامَ فِي مُصَلاَّهُ اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَيْهِ ، اللَّهُـمَّ ارْحَمْـهُ. وَلاَ يَزَالُ أَحَدُكُمْ فِي صَلاَةٍ مالَم يحدث: مَا انْتَظَرَ الصَّلاَةَ. رَوَاهُ الخمسة[1].

ئـەبو هـورەیرە (خـوای لێ رازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) فەرمووی: نوێژی پیاو بەكۆمەڵی بیست‌و پێنج جار پاداش‌و خێری زۆرترە لە نوێژی ماڵەوەو بازاڕی (كە بە تـەنیا دەیكا) ئـەوەش لەبەر ئەمەیە چونكە هـەركاتێ كـە دەسنوێژێكی جوان بگرێ‌و دەرچێ‌و بچێ بـۆ مزگـەوت‌و لـەو چـوونەی تـەنیا مەبەسـتی نوێـژ بـێ ئـەم بـەهرە گەورەیـەی بـۆ هەیـە: هـەر هەنگاوێ دەنێ پلەیێ پێی بەرز دەبێتەوەو گوناهێكی پـێ هـەڵ دەوەرێ لێـی، نوێژكـەریش كـە دەسـتی كـرد بـە نوێـژ ئـیتر فریـشتەكان هـەر دووعـاو نـزای خێـری بـۆ دەكـەن‌و رەحمـەتی لێ دەكـەن هـەتا لـەو شـوێنەدابێ كـە نوێـژی تیـا دەكـا، دەسـنوێژەكەی دەشـكێ، فریـشتەكان خـۆش خـۆش دەڵـێن: خودایـە! رەحمـەت بڕێـژە بەسـەریا، خودایـە! میهـری لەگـەڵ بنوێنـە، وە ئێـوە هـەتا چاوەنواڕی نوێژبكەن بە ئیعتیبار وان لەناو نوێژداو پاداشی نوێژكردنتان بـۆ حلیبە (ش/د/ت/ن).

٧٤٤- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهُماَ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: صَلاَةُ الْجَمَاعَةِ تَفْضُلُ صَلاَةَ الْفَـذِّ بِـسَبْعٍ وَعِـشْرِينَ دَرَجَـةً. رَوَاهُ الخمـسة إِلاَّ أَبـا دَاوُدَ[2].

(١) بخاري. أذان: ٦٤٨ ، ٦٤٩. مسلم. مساجد: ١٥٠٤ ، ١٤٧٢ — ١٤٧٨. نسائي. إمامة: ٨٣٦.

(٢) بخاري. أذان: ٦٤٥. مسلم. مساجد: ١٤٧٥. نسائي. إمامه: ٨٣٦.

**ئیبنو عومەر** (خوایان لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **دەفەرموێ: نوێژی جەماعەت بەبیستو حەوت پلە گەورەترە لە نوێژی کەسێ کە هەر بە تەنها خۆی بێ! (ش/ت/ن).**

**٧٤٥– عَنْ أَبِي مُوسَى** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: أَعْظَمُ النَّاسِ أَجْرًا فِي الصَّلاَةِ أَبْعَدُهُمْ فَأَبْعَدُهُمْ مَمْشًى، وَالَّذِي يَنْتَظِرُ الصَّلاَةَ حَتَّى يُصَلِّيَهَا مَعَ الإِمَامِ أَعْظَمُ أَجْرًا مِنَ الَّذِي يُصَلِّي ثُمَّ يَنَامُ. رَوَاهُ الثلاثة**[٣].

**لە ئەبو موساوە** (خوای لێ رازی بێ) **لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ** (دروودی خوای لەسەربێ): **مەردوم کاتێ دەڕۆن بۆ نوێژ هەتا رێگەکەیان دوور تربێ خێرو پاداشیان گەورە ترە، ئەو کەسەشی کە چاوەڕوانی نوێژ دەکا هەتا بە جەماعەت بیکا لەگەڵ پێشنوێژدا ئەوە پاداشی گەلێ گەورەترە لەو کەسەی کە نوێژەکەی دەکا دەخەوێ (ش/د).**

**٧٤٦– عَنْ عُثْمَانَ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: مَنْ صَلَّى الْعِشَاءَ فِي جَمَاعَةٍ فَكَأَنَّمَا قَامَ نِصْفَ اللَّيْلِ وَمَنْ صَلَّى الصُّبْحَ فِي جَمَاعَةٍ فَكَأَنَّمَا صَلَّى اللَّيْلَ كُلَّهُ. رَوَاهُ الثلاثة**[٤].

**عوسمان** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەربێ) **دەفەرموێ: هەر کەسێ نوێژی خەوتنان بە کۆمەڵی بکا ئەوە وەکوو تانیوەشەو شەو نوێژی بکا وایە، ئەگەر ئەو کەسە نێژی بەیانیشی بە جەماعەت بکا ئەوە وەکوو ئەوە وایە کە ئەو شەوە هەتا بەیانی هەر شەو نوێژ بکا** (م/د/ت).

**{ولفظ أبي دَاوُدَ والترمذي: مَنْ شَهِدَ الْعِشَاءَ فِي جَمَاعَةٍ كَانَ لَهُ قِيَامُ نِصْفِ لَيْلَةٍ، وَمَنْ صَلَّى الْعِشَاءَ وَالْفَجْرَ فِي جَمَاعَةٍ، كَانَ كَقِيَامِ لَيْلَةٍ}.**

**گفتەی ئەبو داوودو تیرمیذی ئاوایە: ئەوەی نوێژی خەوتنان بە کۆمەڵێ بکا پاداشی شەونوێژی نیو شەوی بۆ هەیە، وە ئەوەی نوێژی**

---

(٣) بخاري. آذان: ٦٥١. مسلم. مساجد: ١٥١١.

(٤) مسلم. مساجد: ١٤٨٩. أبو داود. صلاة: ٥٥٥ ترمذي. صلاة: ٢٢١.

خەوتنان و بەیانی بە كۆمەڵی بكا ئەوە پاداشی شەونوێژی شەوێكی تەواوی بۆ هەیە.

٧٤٧- عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ صَلاَةَ الرَّجُلِ مَعَ الرَّجُلِ أَزْكَى مِنْ صَلاَتِهِ وَحْدَهُ، وَصَلاَتُهُ مَعَ الرَّجُلَيْنِ أَزْكَى مِنْ صَلاَتِهِ مَعَ الرَّجُلِ وَمَا كَثُرَ فَهُوَ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ. رَوَاهُ أصحاب السنن وأحمد، وصححه ابن خزيمة[٥].

ئوبەییەی كوڕی كەعب (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: نوێژی دوو پیاو بە كۆمەڵی خێری زۆر ترە لە نوێژی یەك پیاو كە بە تەنها خۆی بێ، نوێژی سێ پیاو بە جەماعەت خێری زۆر ترە لە نوێژی دوو پیاو بە جەماعەت، ئیتر هەروا بەم پێیە نوێژی جەماعەت هەتا زۆر تربێ خۆشەویستترە لەلای خودای گەورەو سەروەر (د/ت/ن/ئەحمەد: ئیبنو خوزەیمە:ص).

٧٤٨- (ب - ١ ز - ٤٤ ژمارە: ٣٣٧). وروایة هنا: عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: احْتَبَسَ عَنَّا رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَاتَ غَدَاةٍ عَنْ صَلاَةِ الصُّبْحِ حَتَّى كِدْنَا نَتَرَاءَى عَيْنَ الشَّمْسِ فَخَرَجَ سَرِيعًا فَثُوِّبَ بِالصَّلاَةِ فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَتَجَوَّزَ فِي صَلاَتِهِ فَلَمَّا سَلَّمَ دَعَا بِصَوْتِهِ قَالَ: لَنَا: عَلَى مَصَافِّكُمْ كَمَا أَنْتُمْ ثُمَّ انْفَتَلَ إِلَيْنَا ثُمَّ وَقَالَ: أَمَا إِنِّي سَأُحَدِّثُكُمْ مَا حَبَسَنِي عَنْكُمُ الْغَدَاةَ إِنِّي قُمْتُ مِنَ اللَّيْلِ فَتَوَضَّأْتُ وَصَلَّيْتُ مَا قُدِّرَ لِي فَنَعَسْتُ فِي صَلاَتِي حَتَّى اسْتَثْقَلْتُ، فَإِذَا أَنَا بِرَبِّي تَبَارَكَ وَتَعَالَى فِي أَحْسَنِ صُورَةٍ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ. قُلْتُ: لَبَّيْكَ رَبِّ. قَالَ: فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قُلْتُ: لاَ أَدْرِى. (قَالَ:هَا ثَلاَثًا) قَالَ: فَرَأَيْتُهُ وَضَعَ كَفَّهُ بَيْنَ كَتِفَيَّ حَتَّى وَجَدْتُ بَرْدَ أَنَامِلِهِ بَيْنَ ثَدْيَيَّ فَتَجَلَّى لِي كُلُّ شَيْءٍ وَعَرَفْتُ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ. قُلْتُ: لَبَّيْكَ رَبِّ قَالَ: فِيمَ يَخْتَصِمُ الْمَلأُ الأَعْلَى؟ قُلْتُ: فِي الْكَفَّارَاتِ. قَالَ: مَا هُنَّ؟ قُلْتُ: مَشْيُ الأَقْدَامِ إِلَى الحَسَنَاتِ وَالْجُلُوسُ فِي الْمَسَاجِدِ بَعْدَ الصَّلَوَاتِ وَإِسْبَاغُ الْوُضُوءِ حِينَ الكَرِيهَاتِ. قَالَ: فِيمَ قُلْتُ إِطْعَامُ

---

(٥) صحيح عنه ابن خزيمة.

الطَّعَامِ وَلِينُ الْكَلَامِ وَالصَّلَاةُ بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ. قَالَ: سَلْ. قُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ فِعْلَ الْخَيْرَاتِ وَتَرْكَ الْمُنْكَرَاتِ وَحُبَّ الْمَسَاكِينِ وَأَنْ تَغْفِرَ لِي وَتَرْحَمَنِي وَإِذَا أَرَدْتَ فِتْنَةَ قَوْمٍ فَتَوَفَّنِي غَيْرَ مَفْتُونٍ أَسْأَلُكَ حُبَّكَ وَحُبَّ مَنْ يُحِبُّكَ وَحُبَّ عَمَلٍ يُقَرِّبُ إِلَى حُبِّكَ قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّهَا حَقٌّ فَادْرُسُوهَا ثُمَّ تَعَلَّمُوهَا. رَوَاهُ الترمذي[٦].

**موعاذی کوڕی جەبەل (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: ڕۆژێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) درەنگ هات بۆ لامان بۆ نوێژی بەیانی، تەنانەت ئەوەندە درەنگ هات خەریکبوو خۆر خۆی ببینین، لەپاشا بە پەلەهاتو قامەتی نوێژکراو نوێژی بە گورجی بۆ کردین، جا کە سڵاوی دایەوە بە دەنگی خۆی بانگی کردین پێی فەرموین: کەس لە جێگەی خۆی نەجووڵێ ئینجا ڕووی تێکردین و فەرمووی: با پێتان بڵێم کە بۆچی ئەم بەیانیە درەنگ هاتم بۆ ناوتان: ئەم شەو هەڵسام دەسنوێژم گرتو ئەوەندەی کە خودا لە چارەی نوسیبووم نوێژم کرد، تا بەدەم نوێژکردنەوە خەو بردمیەوە، تەنانەت لەشم قورس بوو، جا کاتێکم زانی کەوا پەروەردگاری گەورەم لە جوان ترین شێوەدا هاتۆتە خەوم، فەرمووی پێم: ئەی موحەممەد! گوتم: بفەرموو ئەی پەروەردگارم! فەرمووی: ئەنجوومەنی باڵا لەسەرچی مشتومڕو دەمەقاڵێیانە؟ گوتم: نازانم، حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) سێ جار ئەم پرسیارو وەڵامەی گوتەوە، ئینجا فەرمووی: جا چاوم لێ بوو خودا دەستی دانا لەسەر ناوشانم، ئیتر فێنکایی سەر پەنجەکانی گەیشت بەناو هەناوم و دڵم پڕبوو لە زانست و هەموو شتێکم بۆ ڕوون بووەوەو شت نەما کە نەیزانم جا خودا فەرموویەوە: ئەی موحەممەد! گوتم: بفەرموو ئەی بینایی چاوان! فەرموویەوە: ئەنجوومەنی باڵا لەسەرچی مشتومڕو دەمەقاڵێیانە؟ گوتم: لەسەر نووسین و تۆمارکردنی ئەو کردەوە باشانە مقۆمۆیانە کە دەبن بە مایەی گەیشتن بە پایە بەرزەکانی بەهەشت، یا دەبن بەهۆی سڕینەوەی گوناهو تاوان، فەرمووی: جا ئەوانە**

---

(٦) فی التفید بسند صحیح (شرحه).

چی و چین؟ گوتم: تێکۆشان و هەنگاونانە بۆ ڕێی خێرو چاکە، وە دانیشتنە لە مزگەوت لەپاش کردنی نوێژەکان، وە دەسنوێژگرتنی تێرو تەسەلە لەکاتی خۆشی و ناخۆشیدا، فەرموویەوە: لەسەر چی تریش؟ عەرزم کرد: لە بارەی نانبدەیی و قسە نەرمی و گفتارشیرینی و شەونوێژکردن لەو کاتانەدا کە خەڵك وان لە خەوی شیریندا، فەرمووی: داوابکە: بڵێ:

{اللّٰهُمَّ إِنّي أَسْأَلُكَ فِعْلَ الْخَيْرَاتِ وَتَرْكَ الْمُنْكَرَاتِ وَحُبَّ الْمَسَاكِينِ وَأَنْ تَغْفِرَ لِي وَتَرْحَمَنِي وَإِذَا أَرَدْتَ فِتْنَةَ قَوْمٍ فَتَوَفَّنِي غَيْرَ مَفْتُونٍ أَسْأَلُكَ حُبَّكَ وَحُبَّ مَنْ يُحِبُّكَ وَحُبَّ عَمَلٍ يُقَرِّبُ إِلَى حُبِّكَ}.

ئەی خودایە! داوات لێ دەکەم کە یاریدەم بدەی لەسەر کردنی کاری خێرو نەکردنی کاری خراپ، وە لەسەر خۆشەویستیی هەژاران و بێ نەوایان، وە داوات لێ دەکەم کە تاوانمبپۆشیت و ڕەحمم پێ بکەیت، هەر کاتێ ویستیشت کە هۆزێ تووشی فیتنەو ئاشووب و بشیوی بکەی بەر لەوەی کە من تووشی ئەو فیتنەیە بکەی گیانم بکێشەو بمبەرەوە بۆ لای خۆت! خودایە! داوای خۆشەویستیی خۆتت لێ دەکەم وە خۆشەویستیی ئەو کەسەش کە تۆی خۆش دەوێ، وە خۆشەویستیی ئەو کارەش کە دەبێ بەهۆی خۆشەویستیی تۆ، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەم خەون و فەرمایشت و شانە ڕاست و دروستن هەم لەبەریان بکەن و ڕەوانیان بکەن و هەم دوعاو نزایان پێ بکەن و هەم فێری خەڵکی تریان بکەن (ت–س/ص).

### ١٢٣) بەشی دووە: لەم باسە حوکمی نوێژی جەماعەتە:
### الفصل الثاني: في حكم الجماعة

٧٤٩– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَدَ نَاسًا فِي بَعْضِ الصَّلَوَاتِ فَقَالَ: لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ رَجُلاً يُصَلِّي بِالنَّاسِ ثُمَّ أُخَالِفَ إِلَى رِجَالٍ يَتَخَلَّفُونَ عَنْهَا فَآمُرَ بِهِمْ فَيُحَرِّقُونَ عَلَيْهِمْ بِحُزَمِ الْحَطَبِ بُيُوتَهُمْ وَلَوْ عَلِمَ أَحَدُهُمْ أَنَّهُ يَجِدُ عَظْمًا سَمِينًا لَشَهِدَهَا يَعْنِي صَلاَةَ الْعِشَاءِ. رَوَاهُ الخمسة. وفي رواية:

إنَّ أَثْقَلَ صَلاَةٍ عَلَى الْمُنَافِقِينَ صَلاَةُ الْعِشَاءِ وَصَلاَةُ الْفَجْرِ، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِيهِمَا لأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا، وَلَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ آمُرَ بِالصَّلاَةِ فَتُقَامَ ثُمَّ آمُرَ رَجُلاً فَيُصَلِّيَ بِالنَّاسِ ثُمَّ أَنْطَلِقَ مَعِي بِرِجَالٍ مَعَهُمْ حُزَمٌ مِنْ حَطَبٍ إِلَى قَوْمٍ لاَ يَشْهَدُونَ الصَّلاَةَ فَأُحَرِّقَ عَلَيْهِمْ بُيُوتَهُمْ بِالنَّارِ[١].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) تەماشای کرد کەوا چەن کەسێ لەچەن نوێژێکا بۆ ماوەیەکە دیار نین، جا حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) بە تووڕەیی فەرمووی: بەو کەسە کە گیانی منی بە دەسە نیازم هەبوو کە بە پیاوێ بڵێم لە جیاتی خۆم بەرنوێژییەکە بۆ خەڵکەکە بکا وەخۆشم بڕۆم بۆ سەر ئەو پیاوانە کە لە نوێژی جەماعەت دوادەکەون، وە فەرمان بدەم کە بەباوشەدارماڵەکانیان بە سەردا بسووتێنن، ئەوانە ئەگەر یەکی گرتکێکی چەوریان لە مزگەوت شك ببردایە دەهاتن بۆی واتە: دەهاتن بۆ نوێژی خەوتنان (بۆ مزگەوت هەتا بەبیانووی نوێژەکەوە گرتکەکە بخۆن!) (ش/د/ت/ن) لە گێڕانەوەیەکا: قورسترین نوێژ لەسەرشانی ناپاکان نوێژی خەوتنانو نوێژی بەیانییە خۆزگە دەیانزانی کە ئەم دوو نوێژە چی خێرو خۆشییەکیان تیا هەیە، ئەو حەلە ئەگەر بە گاگۆڵکەش بووایە دەهاتن بۆیان، بەراستی خەریکبووم کە فەرمان بدەم قامەتی نوێژبکرێ وە بە پیاوێ بڵێم کە بەرنوێژییەکە بکا وە خۆشم چەند پیاوێ بە باوشەدارەوە لەگەڵ خۆم ببەمو بڕۆم بۆ گیانی ئەو پیاوانە کە نایەن بۆ نوێژی جەماعەت، وە ماڵەکانیان بە ئاگر بسووتێنم بەسەریاندا.

٧٥٠- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مِنْ ثَلاَثَةٍ فِي قَرْيَةٍ وَلاَ بَدْوٍ لاَ تُقَامُ فِيهِمُ الصَّلاَةُ إِلاَّ قَدِ اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ الشَّيْطَانُ فَعَلَيْكَ بِالْجَمَاعَةِ فَإِنَّمَا يَأْكُلُ الذِّئْبُ الْقَاصِيَةَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَالنَسائي وَأَحمد والحاكم وصححَّه[٢].

---

(١) بخاري. أذان: ٦٤٤ ، ٦٥٧ ، ٢٤٢٠ ، ٧٢٢٤. مسلم. مساجد: ١٤٧٩ — ١٤٨٢. أبو داود. صلاة: ٥٤٩. ترمذي. صلاة: ٢١٧.

(٢) صحيح عنه الحاكم.

ئەبو دەرداء (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەرکاتێ سێ موسوڵمان یا پتر لەسێ موسوڵمان لە شوێنێکا یەکیان گرت، خوا گوندنیشن بن، خوا کۆچەری، وە نوێژی جەماعەت نەکەن، ئەوە بێگومان کەشەیتان زاڵ بووە بەسەریاناو فریوی داون، دەی ئەی پیاوی موسوڵمان! حازری جەماعەت بەو هەمیشە لەگەڵ کۆمەڵ بەو، لە گەل جێ مەمێنە چونکە گورگ ئەو مەڕە دەخوات کە لە گەلە بڕدەبێ! (د/ن/ئەحمەد/حاكم:ص).

٧٥١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلٌ أَعْمَى فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ لَيْسَ لِي قَائِدٌ يَقُودُنِي إِلَى الْمَسْجِدِ أَفَأُصَلِّي فِي بَيْتِي فَرَخَّصَ لَهُ فَلَمَّا وَلَّى دَعَاهُ فَقَالَ: هَلْ تَسْمَعُ النِّدَاءَ بِالصَّلَاةِ فَقَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَأَجِبْ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وَأَبُو دَاوُدَ والنسائي[٣].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پیاوێکی کوێر هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! چاوساقم نیە دەستم رابکێشێ بۆ مزگەوت ئایا دەبێ کە لەماڵەوە نوێژەکانم بکەم؟ پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) لە پێشەوە ڕێگەیدا کە لەماڵەوە نوێژەکەی بکا بەڵام لەپاشا کە پیاوەکە بەرەو ماڵ گەڕایەوە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بانگی کردەوەو پێی فەرموو: کە بانگ دەدرێ بۆ نوێژ گوێت لێیەتی یانا؟ گوتی: بەڵێ گوێم لێیەتی، فەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ): (دەوەرە بە دەنگی بانگەکەوە!). (م/د/ن).

## ١٢٤) بەهانەی ڕەوای نەچوون بۆ نوێژی جەماعەت : (أعذار الجماعة)

٧٥٢- عَنْ نَافِعٍ أَنَّ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) أَذَّنَ بِالصَّلَاةِ فِي لَيْلَةٍ ذَاتِ بَرْدٍ وَرِيحٍ ثُمَّ قَالَ: أَلاَ صَلُّوا فِي الرِّحَالِ ثُمَّ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَأْمُرُ الْمُؤَذِّنَ إِذَا كَانَتْ لَيْلَةٌ ذَاتُ برد وَمَطَرٍ يَقُولُ: أَلاَ صَلُّوا فِي الرِّحَالِ. رَوَاهُ الثلاثة[١].

---

(٣) مسلم. مساجد: ١٤٨٤. نسائي. إمامه: ٨٤٩.

(١) بخاري. أذان: ٦٦٦. مسلم. صلاة المسافرين: ١٥٩٨. أبو داود. صلاة: ١٠٦٣. نسائي. أذان: ٦٥٣.

**نـافیع** (خـودای لێ رازی بێ) **گـوتی: شـەوێ سـەرماو سـۆڵەبوو، ئیبنـو عومـەر** (خوایان لێ رازی بێ) **بانگیدا بۆ نوێژ، بەڵام لـەباتی حـی علـی الـصلاة كـە بەمـەعنا (خێـرا وەرن بـۆ نوێـژ)ە. گـوتی: الا صـلوا في الرحـال: ئاگـاداربن مەیـەن بـۆ جەماعەت لەبەر ئەم سەرماو سۆڵەیە بەڵكوو هەر لەماڵ و شوێنی خۆتان نوێژ بكەن. لە پاشا گوتی: جاران ئەگەر شـەوێ سـەرماو باران بووایە پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **بە بانگدەرەكەی دەفەرموو كە بڵی: (الا صلوا في الرحـال): ئاگـاداربن مەیـەن بـۆ جەماعـەت بـەڵكوو هـەر لـەماڵ و شـوێنی خۆتـان نویـۆژ بكەن.**

**٧٥٣- وَقَالَ: مَحْمُودِ بْنِ الرَّبِيعِ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **كَانَ عِتْبَانُ بْنَ مَالِكٍ يَؤُمُّ قَوْمَـهُ وَهُوَ أَعْمَى، فَقَالَ: لِرَسُولِ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **إِنَّهَا تَكُـونُ الظُّلْمَـةُ وَالـسَّيْلُ وَأَنَـا رَجُلٌ ضَرِيرُ الْبَصَرِ، فَصَلِّ يَا رَسُولَ اللَّهِ فِي بَيْتِـي مَكَانًـا أَتَّخِـذُهُ مُـصَلًّى ، فَجَـاءَهُ رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **فَقَالَ: أَيْنَ تُحِبُّ أَنْ أُصَلِّيَ، فَأَشَارَ إِلَى مَكَانٍ مِنَ الْبَيْتِ، فَصَلَّى فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). **رَوَاهُ الشيخان**[٢].

**مـەحموودی كـوڕی رەبیـع** (خـوای لێ رازی بێ) **گـوتی: عیتبـانی كـوڕی مالیـك پیـاوێكی كوێربـوو، بەرنوێـژیی بـۆ هۆزەكـەی خـۆی دەكـرد، رۆژێ گـوتی بـە پێغەمبـەر** (دروودی خـوای لەسـەربێ)**: گـەلێ جـار رێ دەكـەوێ دەبـێ بـە تاریكـستان و بـاران، منـیش پیـاوێكی كـوێرمو نـاتوانم بـەو بـاران و تاریكـە شـەوە بـڕۆم بـۆ مزگـەوت كـە وابـوو ئـەی پێغەمبـەری خـودا! تەشـریف بێنـە لـە ماڵەكـەما لـە شـوێنێكا نوێـژێ بكـە، تـا ئـەو شـوێن نوێـژی تـۆ بكـەم بـە نوێـژگای خـۆم، پێغەمبەریش** (دروودی خوای لەسەربێ) **هات بۆلای و فەرمووی: لەكوێدا حـەز دەكـەی نوێـژی لێ بكـەم؟ ئـەویش جێگـەیـەكی لـە ماڵەكەیـدا نیـشاندا، پێغەمبـەریش** (دروودی خوای لەسەربێ) **نوێژی تیاكرد (ش).**

---

(٢) بخاري. صلاة: ٤٢٤ ، ٤٢٥. مسلم. إيمان: ١٤٨ ، ١٤٩٤.

٧٥٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُماَ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ سَمِعَ الْمُنَادِيَ فَلَمْ يَمْنَعْهُ مِنَ اتِّبَاعِهِ عُذْرٌ لَمْ تُقْبَلْ مِنْهُ الصَّلاَةُ الَّتِي صَلَّى، قَالُوا: وَماَ الْعُذْرُ؟ قَالَ: خَوْفٌ أَوْ مَرَضٌ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وابن ماجه[٣].

ئیبنـو عـەبباس (خوایـان لێ رازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) دەفەرمویّ: هەرکەسێ گوێی لە بانگ بێ وە بەبێ بەهانەیەکی رەوا بە ئارەزوو نەچێ بۆ جەماعـەت ئەو نوێـژەی بـە تـەنیا دەیکـا خـودا لێـی قـەبووڵ ناکـا، گوتیـان: بەهانـەی رەوا وەك چـی؟ فـەرمووی: وەك تـرس یـا وەك نەخۆشـی (د/ئیبنو ماجە: سند ضعیف).

## ١٢٥) دەشێ نوێژکەر بەشێنەیی بڕوا بۆ نوێژو هەڵەشەیی و پەلەپەل نەکات: ينبغي المشي الى الصلاة بسكينة

٧٥٥- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ نُصَلِّى مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذْ سَمِعَ جَلَبَةَ رِجَالٍ فَلَمَّا صَلَّى قَالَ: مَا شَأْنُكُمْ؟ قَالُوا: اسْتَعْجَلْنَا إِلَى الصَّلاَةِ. قَالَ: فَلاَ تَفْعَلُوا، إِذَا أَتَيْتُمُ الصَّلاَةَ فَعَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا. رَوَاهُ الثلاثة وَفِي رِوَايَةٍ: إِذَا سَمِعْتُمُ الإِقَامَةَ فَامْشُوا إِلَى الصَّلاَةِ وَعَلَيْكُمْ بِالسَّكِينَةِ وَالْوَقَارِ وَلاَ تُسْرِعُوا، فَمَا أَدْرَكْتُمْ فَصَلُّوا وَمَا فَاتَكُمْ فَأَتِمُّوا. وَفِي أُخْرى: إِذَا ثُوِّبَ بِالصَّلاَةِ فَلاَ يَسْعَ لَهاَ أَحَدُكُمْ وَلكِنْ لِيَمْشِ وَعَلَيْهِ السَّكِينَةُ وَالْوَقَارُ، صَلِّ مَا أَدْرَكْتَ وَاقْضِ مَا سَبَقَكَ[١].

ئـەبو قـەتادە (خـوای لێ رازی بـێ) گـوتی: رۆژێ پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) بەرنوێژیی بۆ دەکردین لەوکاتەدا گوێی لێ بوو کەوا چەن پیاوێ کردوویانە بە گاڵەگاڵ و غەڵبە غەڵب و زرمەزرم، جا کە نوێژەکەی تەواو کرد فەرمووی: ئەوە چیتان بـوو بـۆ واتـان دەکـرد؟ گوتیـان: پەلـەی نوێـژمان بـوو کـە بگـەین بـە جەماعـەت دا، فـەرمووی: وامەکـەن، بـەڵکوو کـە دێـن بـۆ نوێـژ لەسـەرە خـۆو

(٣) بسند ضعيف (شرحه).

(١) بخاري. أذان: ٦٣٥. مسلم. مساجد: ١٣٦٢.

هیـدیی و شـێنەیی بـن، ئـیتر چـەندە فریـای كـەوتن بـە جماعـەت بیكـەن، وە ئەوەیــشی پیــا نەگەیــشتن خۆتــان بــە تــەنها تــەواوی بكــەن (ش/د) لــە گێڕانەوەیەكا: (كە گوێتان لە قامەت بوو بەشێنەیی و بە سەلاری بچن بەلای نوێـژەوەو پەلـە مەكـەن، جـا ئـەوەی بـە جەماعـەت فریـای كـەوتن بیكـەن و ئەویشی پیا نەگەیشتن خۆتان تەواوی بكەن) لە گێڕانەویەكی تردا: كاتـێ قامـەتی نوێـژ دەكرێ هـەڕا مەكـەن بۆی، بـەڵام بـە شـێنەیی و سـەلاری بـڕۆن، هەرچی فریا كەوتن بە جەماعەت بیكەن و ئەوەیشی پیا نەگەیشتن خۆتان بیكەنەوە!

٧٥٦- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَلاَ تَقُومُوا حَتَّى تَرَوْنِي. رَوَاهُ الشيخان والترمذي وزاد: حتَّى تروني خرجت(٢).

دیــسان ئــەو (خـودای لێ رازی بـێ) گــوتی: پێغەمبــەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) دەفـەرموێ: كاتـێ قامـەتی نوێـژ دەكـرێ هەڵمەسـن تـا مـن دەبیـنن (ش/ت) تیرمیذی ئەمەشی لێ پتر كردووە: تا من دەبینن كەوا دێم.

### ١٢٦) بەشی سێیەم: پێشنوێژ دەبێ چۆن بێ، بەهرەمەندان و پیاوچاكان شایانترن بەكردنی بەرنوێژی:

### الفصل الثالث: في صفة الامام، أهل الفضل أحق بالامامة

٧٥٧- عَنْ مَالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَا وَصَاحِبٌ لِي فَلَمَّا أَرَدْنَا الإِقْفَالَ مِنْ عِنْدِهِ قَالَ: لَنَا: إِذَا حَضَرَتِ الصَّلاَةُ فَأَذِّنَا ثُمَّ أَقِيمَا وَلْيَؤُمَّكُمَا أَكْبَرُكُمَا. رَوَاهُ الثلاثة(١).

مالیكی كوڕی حووەیریث (خوای لێ رازی بێ) گوتی: من و هاوڕێیەكم چووین بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) كە ویستمان لە خزمەتی بگەڕێینـەوە،

---

(٢) بخاري. أذان: ٦٣٧ ، ٦٣٨ ، ٩٠٩. مسلم. مساجد: ١٣٦٤.

(١) بخـاري. أذان: ٦٣٠ ، ٦٢٨ ، ٦٣١ ، ٦٥٨ ، ٦٨٥ ، ٨١٩ ، ٢٨٤٨ ، ٦٠٠٨ ، ٧٢٤٦ ، مـسلم. مـساجد: ١٥٣٣. أبـو داود. صلاة: ٥٨٩.

پێی فەرمووین: کاتێ کە نوێژ دەبێ بانگ بدەن لەپاشا قامەت بکەن، وەکێتان گەورە تربوو با ئەو بەرنوێژیتان بۆ بکا (ش/د).

٧٥٨- وَلأَبِي دَاوُدَ: لِيُؤَذِّنْ لَكُمْ خِيَارُكُمْ وَلْيَؤُمَّكُمْ قُرَّاؤُكُمْ[٢].

حەزرەت (دروودی خودای لەسەربێ) دەفەرموێ: (با هەرە باشەکانتان بانگتان بۆ بدەن، وە ئەوانەیشیان پێشنوێژیتان بۆ بکەن، کە زۆر بەجوانی قورئان دەخوێنن).

٧٥٩- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَؤُمُّ الْقَوْمَ أَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللَّهِ فَإِنْ كَانُوا فِي الْقِرَاءَةِ سَوَاءً فَأَعْلَمُهُمْ بِالسُّنَّةِ، فَإِنْ كَانُوا فِي السُّنَّةِ سَوَاءً فَأَقْدَمُهُمْ هِجْرَةً فَإِنْ كَانُوا فِي الْهِجْرَةِ سَوَاءً فَأَقْدَمُهُمْ سِنًّا وَلاَ يَؤُمَّنَّ الرَّجُلُ الرَّجُلَ فِي سُلْطَانِهِ وَلاَ يَقْعُدْ فِي بَيْتِهِ عَلَى تَكْرِمَتِهِ إِلاَّ بِإِذْنِهِ. رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ البخاري[٣].

ئەبو مەسعوود (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: کێ قورئانی پتر لەبەربوو ئەوە پێشنوێژیی بۆ گەل بکا، جا ئەگەر وەك یەك قورئانیان لەبەربوو با کامەیان باشتر شارەزای سووننەتی پێغەمبەر بوو ئەوەیان بەرنوێژییان بۆ بکا، جا ئەگەر لە مەیشا وەك یەك بوون باکێهەیان لە پێشتردا کۆچی کردبوو لە ولاتی کوفرەوە بۆ ولاتی ئیسلام ئەوەیان بەر نوێژییان بۆ بکا، جا ئەگەر لەوەیشا چوون یەك بوون با کامەیان بە تەمەنتربوو ئەوەیان، وە هەموو کەسێ لەقەڵمڕەوی خۆیا، دەبێ خۆی بەرنوێژیی بۆ کۆمەڵەکەی بکاو نابێ کەسی تر بەرنوێژییان بۆ بکا، مەگەر لەسەر رەزای ئەو، لەماڵەوەش لەسەر جێگەو تەختی تایبەتی یەکتریی دامەنیشن مەگەر بەرەزامەندیی خاوەنەکەی (م/د/ت/ن).

---

(٢) سكت عنه الشارح (مترجم).

(٣) تقدم تخريجه بمثل الحديث الذى قبله (الحديث ٧٦٤).

٧٦٠- عَنْ أَبِي عَطِيَّةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ مَالِكُ بْنُ الْحُوَيْرِثِ يَأْتِينَا فِي مُصَلاَّنَا يَتَحَدَّثُ فَحَضَرَتِ الصَّلاَةُ يَوْمًا فَقُلْنَا لَهُ: تَقَدَّمْ. فَقَالَ: لِيَتَقَدَّمْ بَعْضُكُمْ حَتَّى أُحَدِّثَكُمْ لِمَ لاَ أَتَقَدَّمُ. سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: مَنْ زَارَ قَوْمًا فَلاَ يَؤُمَّهُمْ وَلْيَؤُمَّهُمْ رَجُلٌ مِنْهُمْ. رَوَاهُ أصحاب السنن(٤).

ئەبو عەطییە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جاران مالیكی كوڕی حورەیریث دەهات بۆ لامان بۆ نویوژگاكەمان، لەوێ فەرموودەی دەخوێندەوە بۆمان، رۆژێ كە نوێژ بووپێمان گوت پێشكەوە بەر نوێژیی یەكەمان بۆ بكە، گوتی: بایەكێ لە خۆتان پێش بكەوێ و پشنوێژییەكە بكا، وە باپێشتان بڵێم بۆ من پێش ناكەوم: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خوای لەسەربێ): هەر كەسێ چوو بۆ سەردانی هۆزێ با بەر نوێژییان بۆ نەكا، با پیاوێ لە خۆیان بەرنوێژییان بۆ بكا (د/ت/ن-س/ح).

٧٦١- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: ثَلاَثَةٌ لاَ تُجَاوِزُ صَلاَتُهُمْ آذَانَهُمُ الْعَبْدُ الآبِقُ حَتَّى يَرْجِعَ وَامْرَأَةٌ بَاتَتْ وَزَوْجُهَا عَلَيْهَا سَاخِطٌ وَإِمَامُ قَوْمٍ وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ. رَوَاهُ الترمذي وَأَبُو دَاوُدَ(٥).

ئەبو ئەومامە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: نوێژی ئەم سێ كەسە لە گوێچكەیان رەت نابێ و بەرز نابێتەوە بۆ لای پەروەردگاری نازار:

یەكەم: نوێژی ئەو كۆیلەیەی لە ئاغاكەی هەڵهاتووە تا دەگەڕێتەوە ژێر ركێفی.

دووەم: نوێژی ئەو ژنەی كە مێردەكەی لێی زویرو دڵگیرە.

---

(٤) بسند حسن (شرحه).

(٥) رواه الترمذي بسند حسن (شرحه).

سێیەم: نوێژی ئەو بەرنوێژ (ئیمام)ە کە هۆزەکەی حەزیان لێی نیە (ت-س/ح-د) گفتەی ئەبو داوود کە لە شەرحەکەدا نەقڵ کراوە ئاوایە:

{ثَلاثَةٌ لاَ يَقْبَلُ اللّٰهُ مِنْهُمْ صَلاَةً مَنْ تَقَدَّمَ قَوْمًا وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ وَرَجُلٌ أَتَى الصَّلاَةَ دِبَارًا بَعْدَ فَواتِ أَوْقاتها وَرَجُلٌ اعْتَبَدَ مُحَرَّرَهُ}.

خودا نوێژی ئەم سێ کەسانە گیرا ناکا: کەسێ پێش کۆمەڵێ بکەوێ کە حەزی لێ نەکەن، وە کەسێ سارد نوێژبێ و لەکاتی خۆیا نوێژ نەکاو لەوە پاش بیکا، وە کەسێ یەکێکی ئازاد بە ناهەق بکا بە بەندەو کۆیلە.

٧٦٢- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهُماَ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: ثَلاَثَةٌ عَلَى كُثْبَانِ الْمِسْكِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَغْبِطُهُمُ الأَوَّلُونَ وَالآخِرُونَ: رَجُلٌ يُنَادِي بِالصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ فِي كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، وَرَجُلٌ يَؤُمُّ قَوْمًا وَهُمْ بِهِ رَاضُونَ وَعَبْدٌ أَدَّى حَقَّ اللّٰهِ وَحَقَّ مَوَالِيهِ. رَوَاهُ الترمذي وأحمد(٦).

ئیبنو عومەر (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: لە رۆژی قیامەتدا ئەم سێ دەستەیە وان لەسەر تەپۆڵکەی میسك و پێشینان و پاشینان خۆزگەیان پێ دەخوازن: ئەو پیاوەی کە هەموو رۆژێ بانگ دەدا بۆ هەر پێنج نوێژەکان، وە ئەو پیاوەی پێش نوێژیی بۆ کۆمەڵێك دەکاو کۆمەڵەکە لێی رازین، وە ئەو بەندەیەی کە هەم مافی خوداو هەم مافی گەورەی خۆی بەجێ دێنێ (ت/ئەحمەد-س/ح).

## ١٢٧) نوێژی سووکەڵەی رێك و پێك پەسەندە : (التخفيف مع الإتقان)

٧٦٣- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً قَالَ: وَاللّٰهِ يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنِّي لأَتَأَخَّرُ عَنْ صَلاَةِ الْغَدَاةِ مِنْ أَجْلِ فُلاَنٍ مِمَّا يُطِيلُ بِنَا، فَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي مَوْعِظَةٍ أَشَدَّ غَضَبًا مِنْهُ يَوْمَئِذٍ ثُمَّ قَالَ: إِنَّ مِنْكُمْ مُنَفِّرِينَ، فَأَيُّكُمْ مَا صَلَّى

---

(٦) بسند حسن (شرحه).

بِالنَّاسِ فَلْيَتَجَوَّزْ، فَإِنَّ فِيهِمُ الضَّعِيفَ وَالْكَبِيرَ وَذَا الْحَاجَةِ، وَإِذَا صَلَّى لِنَفْسِهِ فَلْيُطَوِّلْ مَاشَاءَ. رَوَاهُ الخمسة(١).

ئەبو مەسعوود (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پیاوێ گوتی: بەخودا ئەی پێغەمبەر خودا! من لەبەر فیسارە كەس لە نوێژی بەیانی دوا دەكەوم، چونكە ئەوەندەی درێژدەكاتەوە پێمان! ئەبو مەسعوود گوتی: هەرگیز لە پەندان و ئامۆژگاری كرندا وەك ئەو رۆژە پێغەمبەرم ئاوا بە تووڕەیی نەبینیوە، ئینجا فەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ): هەندێ لە ئێوە مەردوم دەرەوێننەوەو بە نوێژی دوورو درێژ خەڵك لە مزگەوت و نوێژی جەماعەت دەتەكێننەوە جا هەر كامێكتان پێشنوێژیی هەر نوێژێ دەكا بۆ ئەم خەڵكە با نوێژێكی كورتی پوختیان بۆ بكا، چونكە ئەوانە هەیانە لازەبوونە، هەیانە پیرە، هەیانە ئیش و كاری تری هەیەو پەلەیەتی بەڵام ئەگەر یەكێكتان بە تەنیا بۆ خۆی نوێژی دەكرد ئەوە چەنێ حەز دەكا ئەوەندەی درێژبكاتەوە (ش/د/ت/ن).

٧٦٤- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَا صَلَّيْتُ وَرَاءَ إِمَامٍ قَطُّ اَخَفَّ صَلاَةً وَلاَ أَتَمَّ مِنَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَإِنْ كَانَ لَيَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ فَيُخَفِّفُ مَخَافَةَ أَنْ تُفْتَنَ أُمُّهُ. وَفِي رواية: إِنِّي لأَقُومُ فِي الصَّلاَةِ أُرِيدُ أَنْ أُطَوِّلَ فِيهَا، فَأَسْمَعُ بُكَاءَ الصَّبِيِّ، فَأَتَجَوَّزُ فِي صَلاَتِي كَرَاهِيَةَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمِّهِ. رَوَاهُ الخمسة(٢)

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە پشت هیچ بەرنوێژێكەوە قەت نوێژم نەكردووە كە وەك پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ئاوا نوێژی هەم سووكەڵەو كورت و هەم پوخت و تەواوبێ، جاری وا دەبوو، لەناو نوێژاگریانی منداڵی لە دوورەوە بەر گوێ دەكەوت، لەبەر ئەوە نوێژەكەی بەكورتی دەكرد، نەبادا دایكی ئەو منداڵە سەری لێ بشێوێ لەناو نوێژەكەیدا كە لەپشتی

---

(١) بخاري. علم: ٩٠ ، ٧٠٢ ، ٧٠٤ ، ٦١١٠ ، ٧١٥٩. مسلم. صلاة: ١٠٤٤.

(٢) بخاري. أذان: ٧٠٨ ، ٧٠٧ ، ٧٠٩ ، ٧١٠. مسلم. صلاة: ١٠٥٤ ، ١٠٥٥ ، ١٠٥٦.

پێغەمبەرەوە دەیکرد، لە گێڕانەوەیەکا: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: رێ دەکەوێ کە دەست دەکەم بەنوێژ دەمەوێ درێژی بکەمەوە، بەڵام کە دەنگی گریانی منالێ دەبیستم ئیتر نوێژێکی سووکەڵەی پوخت دەکەمو درێژی ناکەمەوە، مەبادا دایکی ئەو منداڵە سەخڵەت بکەم (ش/د/ت/ن).

٧٦٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يُصَلُّونَ لَكُمْ، فَإِنْ أَصَابُوا فَلَكُمْ، وَإِنْ أَخْطَئُوا فَلَكُمْ وَعَلَيْهِمْ. رَوَاهُ البخاري وأبو داود[٣].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بەرنوێژ (ئیمام)ەکانتان بەرنوێژیتان بۆ دەکەن، جا ئەگەر بەباشی کردیان ئەوا پاداشی باشی بۆ ئێوەش‌و بۆ ئەوانیشە، خۆ ئەگەر بەباشی نەیانکرد ئەوا پاداشی باشی بۆ ئێوەیەو گوناهەکەی بۆ ئەوانە! (ب/د).

٧٦٦- عَنْ ثَوْبَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَحِلُّ لِامْرِيءٍ أَنْ يَنْظُرَ فِي جَوْفِ بَيْتِ امْرِيءٍ حَتَّى يَسْتَأْذِنَ، فَإِنْ نَظَرَ فَقَدْ دَخَلَ، وَلاَ يَؤُمُّ قَوْمَاً فَيَخُصُّ نَفْسَهُ بِالدُّعَاءِ دُونَهُمْ، فَإِنْ فَعَلَ فَقَدْ خَانَهُمْ، وَلاَ يَقُومُ إِلَى الصَّلاةِ وَهُوَ حَقِنٌ. رَوَاهُ الترمذي وأبو داود[٤].

ثەوبان (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بۆکەس رەوا نیە کە تەماشای ناو ماڵی کەس بکا، مەگەر خاوەن ماڵ رێگەی بدا، خۆ ئەگەر لە خۆیەوە تەماشای کرد ئەوە بەمەعنا بەبێ ئیزن پێدان چووەتە ماڵەوە، وە نابێ کەسێ بەرنوێژیی بۆ کۆمەڵی بکاو بە تایبەتی هەر بۆخۆی بپاڕێتەوەو گوێ بەوان نەدا، خۆ ئەگەر شتی وا بکا ئەوە گزی‌و ناپاکی لە کۆمەڵەکەی دەکا، نابێ کەسیش بە تەنگەتاوی واتە: بە دەسنوێژی گرانەوە - نوێژبکا (ت/غد -س/ح).

(٣) بخاري. أذان: ٦٩٤.

(٤) بسند حسن (شرحه).

**١٢٨) بەرنوێژیی ئەمانە دروستە: بەندەو بەندەی ئازادكراوو كوێرو منالی فامیدە : (إمامة العبد والمولى والأعمى والمرأة والصغير)**

٧٦٧- كَانَتْ عَائِشَةُ يَؤُمُّهَا عَبْدُهَا ذَكْوَانُ مِنَ الْمُصْحَفِ. رَوَاهُ البخاري والشافعي[1].

جاران عائیشە ذەكوانی بەندەی خۆی بەرنوێژیی بۆ دەكرد، لەكاتی بەرنوێژییەكەدا ذەكوان لەناو قورئاندا قورئانی ناو نوێژەكەی دەخوێند (بوخاری/شافیعی- رەحمەتی خودایان لێبێ).

٧٦٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) قَالَ: لَمَّا قَدِمَ الْمُهَاجِرُونَ الأَوَّلُونَ الْعُصْبَةَ مَوْضِعٌ بِقُبَاءٍ قَبْلَ مَقْدَمِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَؤُمُّهُمْ سَالِمٌ مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ، وَكَانَ أَكْثَرَهُمْ قُرْآنًا. رَوَاهُ البخاري وأَبُو دَاوُدَ[2].

ئیبنو عومەر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لەپێش تەشریف هێنانی حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) بۆ مەدینە، كۆچكەرە پێشینەكان كە هاتن بۆ عەصبە، كە شوێنەێكە لە قوباء، لەوێ سالم پێشنوێژی بۆ دەكردن، ئەوكاتە سالم لە هەموویان پتر قورئانی لەبەربوو، سالم بەندەی ئازاد كراوی ئەبوو حوذەیفە بوو (ت/د).

٧٦٩- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اسْتَخْلَفَ ابْنَ أُمِّ مَكْتُومٍ يَؤُمُّ النَّاسَ وَهُوَ أَعْمَى. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وأحمد وابن حبان[3].

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) (چوو بۆ غەزاو) ئیبنو ئوممی مەكتوومی كرد بەجێ نیشنی خۆی لەسەر شاری مەدینە هەتا خۆی لەو غەزایە گەڕایەوە، ئیبنو ئوممی مەكتووم پیاوێكی

(١) رواه البخاري: في بداية الباب/ ٥٤ من كتاب الأذان تعليقاً.

(٢) بخاري. أذان ٦٩٢ ، ٧١٧٥.

(٣) بسند حسن (شرحه).

كوێربوو، وە لەو ماوەیەدا هەر ئەو بەرنوێژی بۆ خەڵك دەكرد (د/ئەحمەد/ئیبنو حەببان-س/ح).

٧٧٠- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ خَلَّادٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَزُوُر أُمَّ وَرَقَةَ فِي بَيْتِهاَ فَاسْتَأْذَنَتْهُ فِي مُؤَذِّن، فَجَعَلَ لَهَا مُؤَذِّنًا، يُؤَذِّنُ لَهَا وَأَمَرَهَا أَنْ تَؤُمَّ أَهْلَ دَارِهَا. قَالَ: عَبْدُ الرَّحْمَنِ: فَأَنَا رَأَيْتُ مُؤَذِّنَهَا شَيْخًا كَبِيرًا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والحاكم وابن خزيمة وصححه[٤].

عەبدوررەحمانی كوڕی خەللاد (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) گەلێ جار دەچوو بۆ دیدەنی ئوم وەرەقە بۆ ماڵەوە، ئوم وەرەقە داوای لە پێغەمبەر كرد كە بانگدەرێكی بۆ دابنێ، ئەویش بانگدەرێكی بۆ دانا، وە فەرمانیشی پێكرد كە ئوم وەرەقە خۆی پێشنوێژیی بكا بۆ دانیشتوانی خانووەكەی، عەبدوررەحمان دەیگوت: من خۆم ئەو بانگدەرەم دیبوو پیرە مێردێكی ئیختیار بوو (د/حاكم/ ئیبنو خوزەیمە: ئیبنو خوزەیمە ئەم حەدیثەی بەصەحیح داناوە).

٧٧١- عَنْ عَمْرُو بْنُ سَلِمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُمْ وَفَدُوا إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَمَّا أَرَادُوا أَنْ يَنْصَرِفُوا قَالُوا: يَا رَسُولَ اللّٰهِ مَنْ يَؤُمُّنَا؟ قَالَ: أَكْثَرُكُمْ جَمْعًا لِلْقُرْآن، أَوْ أَخْذًا لِلْقُرْآن، فَكُنْتُ أَكْثَرُهُمْ جَمْعاً لِلْقُرْآن، فَقَدَّمُونِي وَأَنَا غُلَامٌ وَعَلَيَّ شَمْلَةٌ لِي فَمَا شَهِدْتُ مَجْمَعًا مِنْ جَرْمٍ إِلاَّ كُنْتُ إِمَامَهُمْ، وَكُنْتُ أُصَلِّي عَلَى جَنَائِزِهِمْ إِلَى يَوْمِي هَذَا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والبخاري والنسائي[٥].

عەمری كوڕی سەلەمە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: وەفدێكی بەنی جەرمی چوون بۆلای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) كاتێ ویستیان بگەڕێنەوە گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! كێ بەرنوێژیمان بۆ بكا؟ فەرمووی: ئەوەتان كە لە هەمووتان زۆرتر قورئانی لەبەرە یا فەرمووی: كە لە هەمووتان پتر قورئانی وەرگرتووە منیش هەرچەند منداڵكاریش بووم بەڵام لەوان پتر قورئانم

---

(٤) صحيح عند ابن خزيمة (مترجم).

(٥) بخاري.

لەبەربوو، ئیتر لەبەر ئەوە منیان کرد بە پێشنوێژی خۆیان ئەوکاتە دیزداشەیەکی گوڵ گوڵم لەبەردا بوو، ئیتر لەو ساکەوە حازری هەر کۆمەڵێکی بەنی جەرم بووبێتم خۆم بەرنوێژیم بۆ کردوون، وە تا ئەمڕۆ نوێژیشم لەسەر تەرمی مردوویان کردووە (د/ب/ن).

٧٧٢- ولأبي داود والدار قطني: الصَّلاَةُ الْمَكْتُوبَةُ وَاجِبَةٌ خَلْفَ كُلِّ مُسْلِمٍ بَرًّا كَانَ أَوْ فَاجِرًا وَإِنْ عَمِلَ الْكَبَائِرَ(٦).

حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: نوێژی فەرز بەجەماعەت لە پشتی هەموو موسوڵمانێکەوە دروستەو پێویستە کە هەربکرێ، خوا ئەو موسوڵمانە پیاوچاك بێ خوا پیاو خراپ بێ، گریمان ئەگەر گوناهی کەبیرەیش بکا نوێژ لە پشتیەوە دروستە (د/دارە قوطنی).

## ١٢٩) پاشنوێژ (مەئمووم) لە کوێی پێشنوێژەوە دەوەستێ: (موقف المأموم من الإمام)

٧٧٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَ: بِتُّ عِنْدَ خَالَتِي مَيْمُونَةَ فَقَامَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ، فَقُمْتُ أُصَلِّي مَعَهُ عَنْ يَسَارِهِ، فَأَخَذَنِي بِرَأْسِي، فَأَقَامَنِي عَنْ يَمِينِهِ. رَوَاهُ الخمسة(١).

ئیبنو عەبباس (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: شەوێ لە ماڵی مەیموونەی پوورم بووم کە هاوسەری پێغەمبەر بوو (درودی خوای لەسەربێ) لەشەودا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هەڵسا بۆ شەونوێژ، منیش هەڵسام کە لەلای چەپییەوە نوێژ بکەم، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) سەری گرتمو بردمی لەلای راستی خۆیەوە رای وەستانم (ش/د/ت/ن).

---

(٦) مؤيد بالصحاح زوالعمل على ذلك (مترجم).

(١) بخاري. دعوات: ٦٣١٦ ، ١١٧ ، ١٣٨ ، ١٨٣ ، ٦٩٧ ، ٦٩٩ ، ٧٢٦ ، ٧٢٨ ، ٨٥٩ ، ٩٩٢ ، ٤٥٦٩ ، ١١٩٨ ، ٤٥٧١ ، ٤٥٧٠ ، ٤٥٧٢ ، ٥٩١٩ ، ٦٢١٥ ، ٧٤٥٢ ، ٦٣١٦. مسلم. صلاة المسافرين: ١٩٧٤. أبو داود. أدب: ٥٠٤٣. نسائي. تطبيق: ١١٢٠.

٧٧٤- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا كُنَّا ثَلاثَةً أَنْ يَتَقَدَّمَنَا أَحَدُنَا. رَوَاهُ الترمذي[٢].

سەمموورەی کوڕی جوندوب (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمانی پێ کردووین کە بووین بە سێ کەس یەکێکمان پێش کەوین و پێشنوێژیی بکەین بۆ ئەوانی ترمان (ت-س/ح).

٧٧٥- عَنْ أَنَسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي بَيْتِ أُمِّ سُلَيْمٍ، فَقُمْتُ وَيَتِيمٌ خَلْفَهُ، وَأُمُّ سُلَيْمٍ خَلْفَنَا. رَوَاهُ الأربعة[٣].

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە ماڵی ئوم سولەیمی دایکم نوێژی کرد، من و هەتیوەکەیش لە پشتیەوە وەستاین و بووین بەڕیزێ، ئوم سولەیمیش لە پشتی ئێمەوە وەستا، وە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دوو رکات نوێژی بۆ کردین (ش/د/ت).

٧٧٦- وَعَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَمَّهُ وَامْرَأَةً مِنْهُمْ، فَجَعَلَهُ عَنْ يَمِينِهِ وَالْمَرْأَةَ خَلْفَ ذَلِكَ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وأَبُو دَاوُدَ[٤].

دیسان ئەنەس گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بەرنوێژیی کرد بۆ من و بۆ ئافرەتێکی ئێمە، منی خستە لای راستی خۆیەوە، ئافرەتەکەشی خستە پشتی من و خۆیەوە! (م/د).

## ١٣٠) بەشی چوارەم: باسی پەیڕەویی کردنی بەرنوێژو چاولێکردنی:
## الفصل الرابع: في الاقتداء بالامام

٧٧٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّمَا جُعِلَ الإِمَامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَإِذَا قَالَ: سَمِعَ اللّٰهُ لِمَنْ

---

(٢) بسند حسن (شرحه).

(٣) بخاري. صلاة: ٣٨٠ ، ٧٢٧ ، ٨٦٠ ، ٨٧١ ، ٨٧٤ ، ١١٦٤. مسلم. مساجد: ١٤٩٧. أبو داود. صلاة: ٦١٢. ترمذي. صلاة: ٢٣٤. نسائي. إمامه: ٨٠٠.

(٤) مسلم. مساجد: ١٥٠٠. أبو داود. صلاة: ٦٠٩.

حَمِدَهُ فَقُولُوا اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ، وَإِذَا صَلَّى قَائِمًا فَصَلُّوا قِيَامًا وَإِذَا صَلَّى قَاعِدًا فَصَلُّوا قُعُودًا أَجْمَعُونَ. رَوَاهُ الخمسة ولفظ أبي دَاوُدَ: إِنَّماَ جُعِلَ الإِمامُ لِيُؤْتَمَّ بِهِ، فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا وَلاَ تُكَبِّرُوا حَتَّى يُكَبِّرَ، وَإِذَا رَكَعَ فَارْكَعُوا، وَلاَ تَرْكَعُوا حَتَّى يَرْكَعَ، وَإِذَا سَجَدَ فَاسْجُدُوا وَلاَ تَسْجُدُوا حَتَّى يَسْجُدَ. قَالَ: الْحُمَيْدِيُّ: قَوْلُهُ إِذَا صَلَّى جَالِسًا فَصَلُّوا جُلُوسًا هُوَ فِي مَرَضِهِ الْقَدِيمِ، ثُمَّ صَلَّى النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَعْدَ ذَلِكَ جَالِسًا وَالنَّاسُ خَلْفَهُ قِيَامًا، لَمْ يَأْمُرْهُمْ بِالجُلُوسِ، وَإِنَّمَا يُؤْخَذُ بِالآخِرِ فَالآخِرِ مِنْ فِعْلِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَوَاهُ البخاري[1].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بەرنوێژ (ئیمام) بۆ ئەوە کراوە بە بەرنوێژ، کە پەیرەوی بکرێو چاوی لێ بکرێ، جا کە ئەو گوتی ئەڵڵاهو ئەکبەر ئێوەش بڵێن ئەڵڵاهو ئەکبەر، کە ئەو چەمییەوە (واتە: روکوعی برد) ئێوەش بچەمێنەوە، کە ئەو گوتی: (سمع الله لمن حمده) ئێوە بڵێن (اللهم ربنا ولك الحمد) کە ئەو بەراوەستانەوە نوێژی کرد ئێوەش بە راوەستانەوە نوێژبکەن، کە ئەو بە دانیشتنەوە نوێژی کرد ئێوەش هەمووتان بە دانیشتنەوە نوێژبکەن (ش/د/ت/ن) گفتەی ئەبو داوود ئاوایە: بەرنوێژ بۆیە کراوە بە بەرنوێژ تا پەیرەوی بکرێو ببێ بەسەر مەشق، جا کە ئەو ئەڵڵاهو ئەکبەری کرد ئێوەش ئەڵڵاهو ئەکبەر بکەن، وە هەتا ئەو نەڵێ ئەڵڵاهو ئەکبەر ئێوە مەڵێن ئەڵڵاهو ئەکبەر، کە ئەو چوو بۆ چەمینەوە (روکووع) ئێوەش بچن بۆ چەمینەوە، وە هەتا ئەو نەچەمێتەوە ئێوەش مەچەمێنەوە، کە ئەو کڕنووشی برد ئێوەش کڕنووش بەرن، وە هەتا ئەو کڕنووش نەبا ئێوەش کڕنووش مەبەن حومەیدی (مامۆستای شێخی بوخاری (رەحمەتی خودایان لێبێ) گوتی: ئەوە کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: (کە ئەو بەدانیشتنەوە نوێژی کرد ئێوەش بە دانیشتنەوە نوێژبکەن) ئەمە حەزرەت لە نەخۆشینە کۆنەکەیدا ئەمەی فەرمووە، ئەگینا لەوە دوا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لە نەخۆشیدا

---

(١) بخاري. أذان: ٨٠٥. مسلم. صلاة: ٩٢٠. نسائي. إمامة: ٧٩٢ ، ١٦٠.

خۆی بەدانیشتنەوە نوێژی کردووەو خەڵکەکە لە پشتیەوە بە پێوە نوێژیان کردووە، وە حەزرەت نەشی گوتووە پێیان کە دابنیشن، وە کردارەکانی پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) کامیان لە پاشتربێ بەوەیان رەفتار دەکرێ(ب).

٧٧٨- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَمَا يَخْشى الَّذِي يَرْفَعُ رَأْسَهُ قَبْلَ الإِمَامِ أَنْ يُحَوِّلَ اللهُ رَأْسَهُ رأْسَ حِمَارٍ. وفي روايـة: أَنْ يُحَوِّلَ اللهُ صُورَتَهُ في صُورَةِ حِمَارٍ. رَوَاهُ الخمسة(٢).

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوکەسەی کە لەپێش بەرنوێژدا سەر بەرزدەکاتەوە لە چەمینەوەو کوڕنووش، ئەدی ئەوە چۆن ناترسێ لەوە کە خودا سەری بکا بەسەری کەر! لە گێڕانەوەیەکا: کە خودا شکڵی بکا بە شکڵی کەر (ش/د/ت/ن) لە گێڕانەوەیەکی شەرحەکەدا: کە خودا سەری بکا بەسەری سەگ!

٧٧٩- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَاتَ يَوْمٍ فَلَمَّا قَضَى الصَّلاَةَ أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ فَقَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي إِمَامُكُمْ فَلاَ تَسْبِقُونِي بِالرُّكُوعِ وَلاَ بِالسُّجُودِ وَلاَ بِالْقِيَامِ وَلاَ بِالاِنْصِرَافِ فَإِنِّي أَرَاكُمْ أَمَامِي وَمِنْ خَلْفِي. ثُمَّ قَالَ: وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَوْ رَأَيْتُمْ مَا رَأَيْتُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا. قَالُوا: وَمَا رَأَيْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: رَأَيْتُ الْجَنَّةَ وَالنَّارَ. رَوَاهُ الشيخان(٣).

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: رۆژێکیان پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بەرنوێژیی بۆ دەکردین، کە نوێژەکەی تەواوکرد رووی تێ کردین و فەرمووی: ئەی خەڵکینە! من بەرنوێژو پێشنوێژی ئێوەم، کەوابوو نەبەچەمینەوە، نە بە کوڕنووش، نە بە وەستان و هەڵسانەوە، نە بە سەلامدانەوە، نە بە هیچی تر پێشم مەکەون، ئێوە چ لە پێشمەوە بن چ لە پاشمەوە بن وەك یەك دەتان بینم چونکە خودا بەهرەیەکی وای پێم داوە

---

(٢) مسلم. صلاة: ٩٦٢-٩٦٤. بخاري. أذان: ٦٩١. أبو داود. صلاة: ٥٠٦. ترمذي. صلاة: ٥٨٢. نسائي. إمامة: ٨٢٧.

(٣) مسلم. صلاة ٩٦٠.

كە لە هەرچوارلای خۆمەوە لەیەك كاتدا شت وەك یەك دەبینم. ئینجا فەرمووی: بەو كەسە كە گیانی موحەممەدی وا لە دەسا ئەوەی من دیتم لەم نوێژەدا ئەگەر ئێوە بتان دیتبایە كەم پێ دەكەنین و زۆر دەگریان، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! چیت دی؟ فەرمووی: بەهەشت و دۆزەخم بە چاوی خۆم دی! (ش).

٧٨٠- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُ الرِّجَالَ عَاقِدِي أُزُرِهِمْ فِي أَعْنَاقِهِمْ مِثْلَ الصِّبْيَانِ مِنْ ضِيقِ الأُزُرِ خَلْفَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: قَائِلٌ: يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ لاَ تَرْفَعْنَ رُءُوسَكُنَّ حَتَّى يَرْفَعَ الرِّجَالُ. رَوَاهُ الثلاثة[٤].

سەهلی كوڕی سەعد (خوای لێ رازی بێ) گوتی: بەچاوی خۆم دیومە كە پیاوان بەركۆش (ئیزار)ەكانیان لەبەر تەسك و تورسكی و نەبوونی جل و بەرگ وەك بەروانكەی منالان گرێ دەدا بە بەرۆكیانەوە، لەكاتی نوێژی جەماعەتدا كە لە پشتی پێغەمبەرەوە دەیانكرد، جا پیاوێ دەیگوت: ژنان! ئێوە سەر بەرز مەكەنەوە تا پیاوەكان هەڵ دەسنەوە نەوەك لە داوێنەوە شەرمیان دەركەوێ! (ش/د/ت).

٧٨١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا جِئْتُمْ إِلَى الصَّلاَةِ وَنَحْنُ سُجُودٌ فَاسْجُدُوا وَلاَ تَعُدُّوهَا شَيْئًا وَمَنْ أَدْرَكَ الرَّكْعَةَ فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلاَةَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والدار قطني[٥].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: كاتێ دێن بۆ نوێژ ئەگەر ئێمە لە كوڕنووشدا بووین، ئەوا نوێژ دابەستن و یەكسەر كوڕنووش ببەن، بەڵام بەهیچی مەژمێرن واتە: بە ركاتێ حلێبی مەكەن، وەلێ ئەوەی فریای چەمینەوە (روكوع) بكەوێ لەگەڵ بەرنوێژدا ئەوە فریای ئەو ركاتە دەكەوێ (د/دارە قوطنی – سند صالح).

---

(٤) بخاري. صلاة: ٣٦٢ ، ٨١٤ ، ١٢١٥. مسلم. صلاة: ٩٨٦. أبو داود. صلاة: ٦٣٠.

(٥) بسند صالح (شرحه).

٧٨٢- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا أَتَى أَحَدُكُمُ الصَّلَاةَ وَالإِمَامُ عَلَى حَالٍ فَلْيَصْنَعْ كَمَا يَصْنَعُ الإِمَامُ. رَوَاهُ الترمذي(٦).

موعاذی كوڕی جەبەل (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: كاتێ دێن بۆ نوێژی جەماعەت لەوكاتەدا پێشنوێژ خەریكی چی بوو ئێوەش وەك ئەو خەریكی ئەوەبن و ئەو چی دەكرد ئێوەش وەك ئەو ئەوە بكەن (ت-سند غریب).

## ١٣١) خێرو گەورەیی ڕیزی یەكەم و ڕیزەكانی پاشی
## فضل الصف الأول وما يليه

٧٨٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ وَجَدَ غُصْنَ شَوْكٍ عَلَى الطَّرِيقِ فَأَخَّرَهُ فَشَكَرَ اللّٰهُ لَهُ فَغَفَرَ لَهُ، ثُمَّ قَالَ: الشُّهَدَاءُ خَمْسَةٌ الْمَطْعُونُ وَالْمَبْطُونُ وَالْغَرِيقُ وَصَاحِبُ الْهَدْمِ وَالشَّهِيدُ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ وَقَالَ: لَوْ يَعْلَمُ النَّاسُ مَا فِي النِّدَاءِ وَالصَّفِّ الأَوَّلِ، ثُمَّ لَمْ يَجِدُوا إِلاَّ أَنْ يَسْتَهِمُوا عَلَيْهِ لاَسْتَهَمُوا، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي التَّهْجِيرِ لاَسْتَبَقُوا إِلَيْهِ ، وَلَوْ يَعْلَمُونَ مَا فِي الْعَتَمَةِ وَالصُّبْحِ لأَتَوْهُمَا وَلَوْ حَبْوًا. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ أبا دَاوُدَ(١).

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: جارێ پیاوێ بە ڕێگەیەكا دەڕۆیشت، تەڵێ دڕكی دی لەسەر ڕێگەكە كەوتبوو، هەڵی گرت و دووری خستەوە، خوداش لەسەر ئەوە چاكەی دایەوەو لێی خۆش بوو، ئینجا فەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ): ئەم پێنج كەسە شەهیدن و لەكاتی مردندا فریشتەی ڕەحمەت دێنە دیاریان.

یەكەم: كەسێ بە پەتا (تاعوون) بمرێ.

دووەم: كەسێ بە دەردی ناوسك بمرێ.

---

(٦) بسند غريب (شرحه).

(١) بخاري. أذان: ٦١٥ ، ٦٥٤ ، ٧٢١ ، ٢٦٨٩. مسلم. صلاة: ٩٨٠. ترمذي. صلاة: ٢٢٥. نسائي. مواقيت: ٥٣٩.

**سێیەم:** کەسێ لەئاوا بخنکێ.

**چوارەم:** کەسێ شت بڕووخێ بە سەریا، یا ببێ بەژێر شتەوە.

**پێنجەم:** کەسێ لە ڕێگەی خوادا شەهیدببێ، وە حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووشی: ئەگەر ئەم مەردومە دیانزانی خێری بانگدان و ریزی یەکەمی جەماعەت چەنێ گەورەیە، وە چاری تریان نەبوایە جگە لەوە کە تیرو پشکیان لەسەر بکەن، ئەوا تیرو پشکیان لێ دەکردن، جا پشکی کێ دەربچوایە ئەوە بانگی دەدا یا لە ریزی یەکەما دەوەستا، ئەگەر دەشیانزانی کە خێری چوون بۆ نوێژی قرچەی گەرمای نیوەڕۆ چەندە گەورەیە بە هەڕاکردن دەچوون بۆی، ئەگەر دەشیانزانی خێری جەماعەتی خەوتنان و بەیانی چەنێ گەورەیە ئەگەر بە گاگۆڵکەش بوایە دەهاتن بۆیان (ش/ت/ن).

٧٨٤- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: خَيْرُ صُفُوفِ الرِّجَالِ أَوَّلُهَا وَشَرُّهَا آخِرُهَا، وَخَيْرُ صُفُوفِ النِّسَاءِ آخِرُهَا وَشَرُّهَا أَوَّلُهَا. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ البخاريَّ[٢].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: باشترینی ریزی پیاوان ریزی یەکەمیانە، خراپترینیشیان دوا ریزیانە، باشترین ریزی ژنان دواریزیانە، خراپترین ریزیشیان یەکەم ریزیانە (م/د/ت/ن).

٧٨٥- (ب - ١ ز - ٥ سبق في رقم: ٣٦ راجع رقم: ٦٧٨). وفي هَذِهِ الرواية: عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: فُضِّلْنَا عَلَى النَّاسِ بِثَلَاثٍ جُعِلَتْ صُفُوفُنَا كَصُفُوفِ الْمَلَائِكَةِ، وَجُعِلَتْ لَنَا الأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدًا، وَجُعِلَتْ تُرْبَتُهَا لَنَا طَهُورًا إِذَا لَمْ نَجِدِ الْمَاءَ، وَذَكَرَ خَصْلَةً أُخْرَى. رَوَاهُ مُسْلِمٌ والنسائي[٣].

---

(٢) مسلم. صلاة: ٩٨٤. نسائي. إمامة: ٨١٩. تحفة الأشراف: ١٢٥٩٦.

(٣) راجع رقم: ٣٧ و ٦٨٦.

**حوذەیفە** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: خودا بەسێ خەڵات رێزو فەزڵی داوین بەسەر خەڵكی تردا:**

**یەكەم: بەوە كە ریزەكانمان (لە نوێـژدا) وەك ریـزی فریشتەی ئاسمان وایە.**

**دووەم: بەوە كە خاكی سەر رووی زەوی هەمووی بۆ ئێمە وەك مزگەوت وایە.**

**سێیەم: بەوە كە خۆڵەكەی بۆ ئێمە پاكو پاككەرەوەیەئەگەر ئاو نەبوو یا لە حوكمی نەبوودا بوو، ئەوكاتە لەباتی دەسنوێژ یا لەباتی غوسڵ تەیەمموومی پێ دەكەین بۆ نوێژو قورئانخوێندنو زیارەتو طەوافو شتی وا، وە گێڕەرەوەی ئەم فەرموودەیە باسیی خەلاتێكی تریشی كرد ئەویش ئەمەیە كە نەسائی گێڕاوییەتەوە لەسەر فەرموودەی غایەتولمەئموولی شەرحی تاجول ئوصول:**

{وَأُوتِيتُ هَذِهِ الْآيَاتِ مِنْ خَوَاتِمِ الْبَقَرَةِ مِنْ كَنْزٍ تَحْتَ الْعَرْشِ، وَلَمْ يُعْطَهُنَّ أَحَدٌ قَبْلِي وَلاَ يُعْطَاهُنَّ أَحَدٌ بَعْدِي}

**ئەم ئایەتانەی كۆتایی سوورەتی (بەقەرە)شم پێ خەڵات كراون، كە لە گەنجی ئەو گەنجینەیەن كەوا لە ژێر تەختو بارەگا (عەرش)ی خودادا، لەپێش مندا شتی وا گرانو گران بەها بەكەسی تر خەڵات نەكراوە، وە لەپاش منیش بە كەسی تر خەڵات ناكرێ (م/ن).**

٧٨٦– عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى وَمَلاَئِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الَّذِينَ يَصِلُونَ الصُّفُوفَ الأُوَلَ وَمَا مِنْ خَطْوَةٍ أَحَبَّ إِلَى اللَّهِ مِنْ خَطْوَةٍ يَمْشِيهَا العَبْدُ يَصِلُ بِهَا صَفًّا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي[٤].

**بەراء** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: خودای گەورەو فریشتەكانی خودا صەڵاوات دەدەن لە دیاری ئەو كەسانە كە**

---

(٤) وابن حبّان والبزار بسند حسن (شرحه). {أبو داود: ٦٦٤. رياض/٩/١٠٩٠-مترجم}.

ریزەکانی پێشەوە پڕ دەکەنەوە، خۆشەویستترین هەنگاوێ کە بەندە دەینێ بۆ کاری خێر هەنگاوی ئەو بەندەیە کە دەینێ بۆ پڕکردنەوەی ریزێ لە ریزی نوێژی جەماعەت! (د/ن/ئیبنو حەببان/بەزار-س/ح).

٧٨٧- عَنِ الْعِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يُصَلِّي عَلَى الصَّفِّ الأَوَّلِ ثَلاَثًا وَعَلَى الثَّانِي وَاحِدَةً. رَوَاهُ النسائي والحاكم وصححّه(٥).

عیرباضی کوڕی سارییە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) سێ جار دووعاو نزای خێری بۆ ریزی یەکەم دەکردو یەك جار بۆ ریزی دووەم (ن/حاکم:ص).

٧٨٨- روى أبُو دَاوُدَ: إِنَّ اللَّهَ وَمَلاَئِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى مَيَامِنِ الصُّفُوفِ(٦).

حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: خوداو فریشتەکانی خودا صەڵاوات دەدەن لەسەر لای راستی ریزەکانی نوێژ (شەرحی غایەتول مەئموول).

## ١٣٢) پیاوچاکان لە پێشترن بۆ ریزی یەکەم
## خيار الناس أولى بالصف الاول

٧٨٩- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لِيَلِنِي مِنْكُمْ أُولُو الأَحْلاَمِ وَالنُّهَى ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثَلاَثاً وَإِيَّاكُمْ وَهَيْشَاتِ الأَسْوَاقِ. رَوَاهُ الخمسة إلاّ البخاري(١).

عەبدوڵلا (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) سێ جار فەرمووی: با سەلارو هۆشیارو فامیدەکانتان لەمنەوە نزیك ببنەوە،

---

(٥) صحيح عنه الحاكم.

(٦) رواه أبو داود بإسناد على شرط مسلم،وفيه رجل مختلف فى توثيقه. رياض/١٣/١٠٩٤ (مترجم).

(١) مسلم. صلاة: ٩٧١. أبو داود. صلاة. ٦٧٤. نسائى. إمامة: ٨٠٦، ٨١١. ابن ماجه. صلاة: ٩٧٦. تحفة الأشراف: ٩٩٩٤.

ئینجا ئەوانەی کە لە زرنگی و هۆشیاریدا لەوانی نزیك دەکەنەوە وە فەرمووشی: خۆشتان دوور بگرن لە بگرەو بەردەو چەقە چەقی بازاڕ! (م/د/ت/ن).

٧٩٠- عَنْ أَبِي مَالِكٍ الأَشْعَرِيُّ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيَّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَصُفُّ الرِّجَالَ أَوَّلاً ثُمَّ الْغِلْمَانَ خَلْفَهُمْ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وأحمد ولفظه: وَيَجْعَلُ الرّجَالَ قُدَّامَ الْغِلْمَانِ وَالغِلْمَانَ خَلْفَهُمْ وَالنّسَاءَ خَلْفَ الْغِلْمَانِ[٢].

ئبو مالیکی ئەشئعەری (خوای لێ رازی بێ) گوتی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وابوو: پیاوانی لە پێشەوە ریز دەکردو کوڕوکاڵیش لە پشتی ئەوانەوە! (د/ئەحمەد) گفتەی ئەحمەد (بەر رەحمەتی خودا کەوێ) ئاوایە: پیاوانی دەخستە پێش کوڕانەوەو کوڕانی دەخستە پاش پیاوانەوەو ژنانی دەخستە پاش کوڕانەوە.

٧٩١- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَأَى فِي أَصْحَابِهِ تَأَخُّرًا فَقَالَ: لَهُمْ: تَقَدَّمُوا فَائْتَمُّوا بِي وَلْيَأْتَمَّ بِكُمْ مَنْ بَعْدَكُمْ لاَ يَزَالُ قَوْمٌ يَتَأَخَّرُونَ حَتَّى يُؤَخِّرَهُمُ اللَّهُ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وأبُو دَاوُدَ والنسائي[٣].

ئەبو سەعیدی خودری (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) تەماشای کرد هەندێ کەس لە یارانی لە ریزدا چوونەتە دواوە، فەرمووی: وەرنە پێشەوەو ئێوە پەیڕەویی من بکەن، وە با ئەوانەشی لە پشتی ئێوەوەن پەیڕەویی ئێوە بکەن و بەهۆی جموجووڵی ئێوەوە پەیڕەوی من بکەن، کۆمەڵێ دەیکەن بە پیشەو هەر دوا دەکەون، هەتا خوداش (لە پایەو پاداشی باشدا دەیانخاتە دواوە! (م/د/ن).

(٢) رواه أبو داود بسند فيه شهر بن حوشب (شرحه).

(٣) مسلم. صلاة: ٩٨١. أبو داود. صلاة: ٦٨٠. نسائي. إمامة: ٧٩٤. ابن ماجه صلاة: ٩٧٨.

## ١٣٣) ئەگەر پێشنوێژ نوێژ خوێندنی لێ شێوا دەشێ سەری باسەكەی بۆ دەربخرێ: (ينبغي الفتح على الامام)

٧٩٢– عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهُماَ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَلَّى صَلاَةً فَقَرَأَ فِيهَا فَلُبِسَ عَلَيْهِ فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: لأُبَيِّ بِنْ كَعْبٍ: أَصَلَّيْتَ مَعَنا قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: فَمَا مَنَعَكَ؟ رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وابن حبان ولفظه: فَماَ مَنَعَكَ أَنْ تَفْتَحَ عَلَيَّ"[1].

ئیبنو عومەر (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نوێژی دەكرد، قورئانخوێندنەكەی لێ شێوا، كە لێبووەوە بە ئوبەیی كوڕی كەعبی فەرموو: ئەوەتۆش لەم نوێژەدا لەگەڵمانا بوویت؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: ئەی بۆ پێت نەگوتمەوە (د/ئیبنو حەببان) گفتەی ئیبنو حەببان ئاوایە: ئەی بۆ سەری باسكەت بۆ دەرنەخستم‌و ئەو ئایەتەی كە لێم شێوابوو بۆت راست نەكردمەوە.

## ١٣٤) بەشی پێنجەم: باسی رێكخستنی ریزو گوتەی پێشنوێژ لەم بارەیەوە الفصل الخامس: في تسوية الصفوف وقول الامام فيها

٧٩٣– عَنْ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَتُسَوُّنَّ صُفُوفَكُمْ أَوْ لَيُخَالِفَنَّ اللَّهُ بَيْنَ وُجُوهِكُمْ. رَوَاهُ الخمسة[1].

نوعمانی كوڕی بەشیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: یا ریزەكانتان رێك دەخەن‌و لە ریزی نوێژا رێك‌و راست رادەوەستن یاخود خودا رووتان تاقولۆق دەكاو دژایەتی‌و ناكۆكی‌و دووبەرەكی دەخاتە ناوتانەوە! (ش/د/ت/ن).

---

(١) سكت عن درجته الشارح (مترجم).

(١) بخاري. أذان: ٧١٧. مسلم. صلاة: ٩٧٧. أبو داود. صلاة: ٦٦٣ ، ٦٦٥. ترمذي. صلاة: ٢٢٧. نسائي. إمامة: ٨٠٩. ابن ماجه. صلاة: ٩٩٤.

٧٩٤- وَلِمُسْلِمٍ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُسَوِّى صُفُوفَنَا حَتَّى كَأَنَّمَا يُسَوِّى بِهَا الْقِدَاحَ[٢].

**دیسان نوعمان** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەربێ) **جاران وەها بەرێكو پێكی ریزەكانی لە نوێژدا رێك دەخستین دەتگوت دووخە (م).**

٧٩٥- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَأَقْبَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِوَجْهِهِ فَقَالَ: أَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ وَتَرَاصُّوا، فَإِنِّي أَرَاكُمْ مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِي. رَوَاهُ الثلاثة[٣].

**ئەنەس** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: قامەتی نوێژ كرا پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **رووی تێ كردینو فەرمووی: ریزەكانتان راست بكەنەوەو پاڵ بدەن بە یەكترییەوە، چونكە من لەپشتی سەریشمەوە چاوم لێتانە (ش/د).**

٧٩٦- وللبخاري: أَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ، فَإِنِّي أَرَاكُمْ مِنْ وَرَاءِ ظَهْرِي، وَكَانَ أَحَدُنَا يُلْزِقُ مَنْكِبَهُ بِمَنْكِبِ صَاحِبِهِ وَقَدَمَهُ بِقَدَمِهِ.وفي رواية: سَوُّوا صُفُوفَكُمْ فَإِنَّ تَسْوِيَةَ الصَّفِّ مِنْ تَمَامِ الصَّلاَةِ. وفي أخرى: اَقِيمُوا الصَّفَّ فِي الصَّلاَةِ فَإِنَّ إِقَامَةَ الصَّفِّ مِنْ حُسْنِ الصَّلاَةِ[٤].

**حەزرەت** (دروودی خوای لەسەربێ) **دەفەرموێ: ریزەكانتان راست بكەنەوە، چونكە من لە پشتی سەریشمەوە چاوم لێتانە، ئیتر ئێمەش شانمان دەنووسان بە شانی یەكترییەوەو قاچیشمان دەلكان بە قاچی یەكترییەوە (ب) لە گێڕانەوەیەكا: ریزەكانتان رێك بكەن چونكە رێككردنی ریز بەشێكە لە تەواویی نوێژ، لە گێڕانەوەیەكی ترا: (لە نوێژدا ریز راست بكەنەوە، چونكە راست كردنەوەی ریز نیشانەی جوانیی نوێژە).**

---

(٢) مسلم. صلاة: ٩٧٨ أبو داود. صلاة: ٦٦٣ ، ٦٦٥.

(٣) مسلم. صلاة: ٩٧٥. بخاري. أذان: ٧١٨ (٧١٩). ٧٢٥ تحفة الأشراف: ١٠٣٩.

(٤) مسلم. صلاة: ٩٧٤ ، ٩٧٦. بخاري. جماعة: ٧١٩، ٧١٨ ، ٧٢٥.

٧٩٧– عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَخَلَّلُ الصَّفَّ مِنْ نَاحِيَةٍ إِلَى نَاحِيَةٍ، يَمْسَحُ صُدُورَنَا وَمَنَاكِبَنَا وَيَقُولُ: لاَ تَخْتَلِفُوا فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ. وَكَانَ يَقُولُ: إِنَّ اللّٰهَ وَمَلاَئِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى الصُّفُوفِ الأُوَلِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي[٥].

**بەراء (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەم پەڕی ریزەوە تا ئەوپەڕی ریز دەكەوتە ناو ریزەكەوەو دەستی دەهێنا بە سینگو بەشانماناو رێكی دەخستینو دەیفەرموو: ناڕێك مەوەستن ئەگینا ناڕێكیو ناكۆكیتان تێ دەكەوێ، وە گەلێ جاریش دەیفەرموو خوداو فریشتەكانی خودا رەحمەت دەرێژن بەسەر ریزەكانی پێشەوەدا (د/ن–سند صالح).**

٧٩٨– عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ أَخَذَهِ عُوداً بِيَمِينِهِ ثُمَّ الْتَفَتَ فَقَالَ: اعْتَدِلُوا، سَوُّوا صُفُوفَكُمْ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[٦].

**ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: گەلێ جار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) كە هەڵدەسا بۆ نوێژ، تەلێ داری دەگرت بە دەستی راستیەوەو بە پێش ریزەكەدا بەلای راستا تا ئەو سەر دەڕۆیشتو ریزەكەی راست دەكردەوەو دەیفەرموو: رێك راوەستنو ریزەكانتان رێكخەن ئینجا تەڵەدارەكەی دەگرت بە دەستی چەپییەوەو بەلای چەپیشا هەمان شتی دەكردو هەمان قسەی دەگوتەوە (د–سند صالح).**

٧٩٩– وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: رُصُّوا صُفُوفَكُمْ وَقَارِبُوا بَيْنَهَا وَحَاذُوا بِالأَعْنَاقِ فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنِّي لأَرَى الشَّيَاطِين تَدْخُلُ مِنْ خَلَلِ الصَّفِّ كَأَنَّهَا الْحَذَفُ[٧].

---

(٥) مسلم. صلاة: ٩٧١. أبو داود. صلاة: ٦٧٤. نسائي. إمامة: ٨٠٦ ، ٨١١. ابن ماجه. صلاة: ٩٧٦.

(٦) بسند صالح (شرحه).

(٧) بسند صالح (شرحه). (حديث صحيح رواه أبو داود بإسناد على شرط مسلم (رياض الصالحين، رقم: ١٠٩٢/١١). (مترجم).

دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ریزەکانتان رێك خەن و پاڵ بدەن بە یەکەوەو نێوانی ریزەکان لە یەکەوە نزیك بکەنەوەو شان و ملتان لە ئاستی یەك بگرن، دەسا بەو کەسە کە گیانی منی وا لە دەسا شەیاطینی دەبینم خۆیان دەکەن بە ناو کەلەبەرو بۆشایی ناو ریزەکانا، دەڵێی کارژۆڵەو بەرخۆلەی رەشەکەڵەن! (د/ن–س/صالح).

٨٠٠– عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَقِيمُوا الصُّفُوفَ وَحَاذُوا بَيْنَ الْمَنَاكِبِ، وَسُدُّوا الْخَلَلَ، وَلِينُوا بِأَيْدِي إِخْوَانِكُمْ، وَلاَ تَذَرُوا فُرُجَاتٍ لِلشَّيْطَانِ، وَمَنْ وَصَلَ صَفًّا وَصَلَهُ اللَّهُ وَمَنْ قَطَعَ صَفًّا قَطَعَهُ اللَّهُ. رَوَاهُمَا أَبُو دَاوُدَ والنَسائي[٨].

ئیبنو عومەر (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ریزەکان راست بکەنەوەو شان لە ئاستی شانی یەکتری بگرن و کەلەبەرو بۆشایی پڕبکەنەوەو مەیەڵن ریزەکان کەل بن، یا کەلەبەریان تیابێ، وە بە نەرمی بچن بە دەستی برای خۆتانەوە ئەگەر دنیابوو لە دواوە رایانکێشان بۆلای خۆیان تابەتەنیا نەوەستن لەکاتی نوێژی جەماعەتدا، وە هیچ کەلێ و بۆشایی مەهێڵنەوە بۆ شەیتان، وە ئەو کەسەی کەلیی ریزێ پڕبکاتەوە خوداش بەرەحمەتی خۆی ئەو بەسەر دەکاتەوە، وە ئەو کەسەی ریزێ بپچڕێ خوداش پەیوەندی لەگەڵ ئەودا دەپچڕێنێ (د/ن–سند صالح).

## ١٣٥) تەواوکردنی ریز پێویستەو باش نییە: وەستان بەتەنیا لە نوێژی جەماعەتدا: (إتمام الصفوف وكراهة الإنفراد)

٨٠١– عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَتِمُّوا الصُّفُوفَ، فَإِنِّي أَرَاكُمْ خَلْفَ ظَهْرِي. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وَأَبُو دَاوُدَ ولفظه. أَتِمُّوا الصَّفَّ الْمُقَدَّمَ ثُمَّ الَّذِي يَلِيهِ، فَمَا كَانَ مِنْ نَقْصٍ فَلْيَكُنْ فِي الصَّفِّ الْمُؤَخَّرِ[١].

---

(٨) أبو داود بإسناد صحيح: ٦٦٦ (رياض رقم: ١٠٩١/١٠).

(١) بخاري. أذان: ٧١٨ ، ٧١٩ ، ٧٢٥. مسلم. صلاة: ٩٧٥.

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ریزەکان یەك لە دوای یەك تەواو بکەن، چونکە من لە پشتی سەریشمەوە چاوم لێتانە (م/د) گفتەی ئەبو داوود ئاوایە: ریزی پێشەوە تەواو بکەن، ئینجا ریزەکانی پاش ئەو، جا ئەگەر ناتەواوییەك هەبوو با بکەوێتە ریزی هەرە پاشەوە.

٨٠٢- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَلاَ تَصُفُّونَ كَمَا تَصُفُّ الْمَلاَئِكَةُ عِنْدَ رَبِّهَمْ! قُلْنَا: وَكَيْفَ تُصَفُّ الْمَلاَئِكَةُ عِنْدَ رَبِّهَمْ؟ قَالَ: يُتِمُّونَ الصُّفُوفَ الْمُقَدَّمَةَ وَيَتَرَاصُّونَ فِي الصَّفِّ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنَسائي(٢).

جابیری کوڕی سەموورە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەرێ بۆ ریز نابەستن لە چەشنی ریزبەستنی فریشتەکان لەلای پەروەردگاریان! عەرزمان کرد: فریشتەکان لەلای پەروەردگاریان چۆن ریزدەبەستن؟ فەرمووی: ریزەکانی پێشەوە ریزبەریز تەواو دەکەن و لە ریزا پاڵ دەدەن بەیەکەوە! (د/ن-سند صالح).

٨٠٣- عَنْ عَبْدِ الْحَمِيدِ بْنِ مَحْمُودٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّيْنَا خَلْفَ أَمِيرٍ مِنَ الأُمَرَاءِ، فَاضْطَرَبَ النَّاسُ فَصَلَّيْنَا بَيْنَ السَّارِيَتَيْنِ، فَلَمَّا صَلَّيْنَا قَالَ: أَنَسٌ: كُنَّا نَتَّقِي هَذَا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَوَاهُ أصحاب السُّنن(٣).

عەبدولحەمیدی کوڕی مەحموود (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لەپشت فەرمانڕەوایەکەوە نوێژمان دەکرد، لەبەر زۆری عەشامەتاکە خەڵکەکە شەڵەژان و لەریزا رێك نەوەستان، وە هەندێکمان لەناوەندی دوو کۆڵەکەدا نوێژمان کرد، کە نوێژەکەمان تەواوکرد ئەنەس گوتی: لە سەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەربێ) خۆمان لەم جۆرە نوێژە لە نێوانی دوو کۆڵەکەدا دەپاراست چونکە ریزەکە دەبڕێ (د/ت/ن-س/ح).

---

(٢) رواه مسلم: ٤٣٠ رياض. رقم: ١٠٨٢/١ (أبو داود بإسناد حسن: ٦٧١. رياض/١٢/١٠٩٣ — مترجم).

(٣) بسند حسن (شرحه).

٨٠٤– عَنْ وَابِصَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَأَى رَجُلاً يُصَلِّي خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهُ فَأَمَرَهُ أَنْ يُعِيدَ الصَّلاَةَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وأحمد والترمذي[٤].

**وابیصه** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **پیاوێکی دی بە تەنها لە پشت ریزەکەوە نوێژی دەکرد فەرمانی پێکرد کە نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە (د/ئەحمەد/ت–س/ح).**

٨٠٥– عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ وَنَبِيُّ اللهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَاكِعٌ، فَرَكَعْتُ دَوُنَ الصَّفِّ فَقَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): زَادَكَ اللّٰهُ حِرْصًا وَلاَ تَعُدْ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والبخاري[٥].

**ئەبو بەکرە** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: رۆژێ کە چوومە ژوورەوە بۆ ناومزگەوت پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **لە روکوعا بوو، منیش هەر لە دوورەوە پێش ئەوەی بگەمە ریزەکە روکوعم برد و ئینجا بە چەماوەیی رۆیشتم تا گەیشتمە ریزەکە جا لەپاش نوێژەکە پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی پێم: خودا زیاتر حەریص و شێرەت بکا لەسەرکردنی کاری خێر بەڵام ئیتر وامەکەرەوە! (د/ب).**

## ١٣٦) باسی لێبوونەوەی پێشنوێژ لە نوێژو رووتێکردنی لەخەڵکەکە
## إنصراف الإمام من الصلاة واستقباله للناس

٨٠٦– عَنِ عَبْدُ اللّٰهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لاَ يَجْعَلْ أَحَدُكُمْ لِلشَّيْطَانِ شَيْئًا مِنْ صَلاَتِهِ، يَرَى أَنَّ حَقًّا عَلَيْهِ أَنْ لاَ يَنْصَرِفَ إِلاَّ عَنْ يَمِينِهِ، لَقَدْ رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَثِيرًا يَنْصَرِفُ عَنْ يَسَارِهِ. رَوَاهُ الثلاثة[١].

---

(٤) بسند حسن (شرحه).

(٥) بخاري. أذان: ٧٨٣.

(١) بخاري. أذان: ٨٥٢. مسلم. صلاة المسافرين: ١٦٣٦. أبو داود. صلاة: ١٠٤٢. نسائي. سهو: ١٣٥٩.

عەبدوڵڵا (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: کەستان کارێکی وامەکەن کە بەشی شەیتان بکەوێتە نوێژەکەتانەوە، لەبەر ئەوەی کەوا بزانێ دەبێ هەر لەلای ڕاستەوە لەنوێژ دەرچێ، بەچاوی خۆم دیومە کە زۆرجار پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەلای چەپیەوە لە نوێژ دەرچووەو جێ نوێژەکەی بەجێ هێشتووە (ش/د).

٨٠٧- وَلمسلم: قَالَ: السُّدّي: سَأَلْتُ أَنَساً كَيْفَ أَنْصَرِفُ إِذَا صَلَّيْتُ عَنْ يَمِينِي أَوْ عَنْ يَسَارِي؟ قَالَ: اَمَّا اَنَا فَأَكْثَرُ مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَنْصَرِفُ عَنْ يَمِينِهِ[٢].

سوددی (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە ئەنەسم پرسی: کە لەنوێژ بوومەوە لەکام لامەوە بڕۆم، لەلای ڕاستمەوە بڕۆم یا لەلای چەپمەوە؟ گوتی: ئەوەی من دیومە زۆرتر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەلای ڕاستیەوە دەڕۆی (م).

٨٠٨- عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ هُلْبٍ عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ أَللّٰهُ عَنْهُمَا) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَؤُمُّنَا فَيَنْصَرِفُ عَلَى جَانِبَيْهِ جَمِيعًا، عَلَى يَمِينِهِ وَعَلَى شِمَالِهِ. رَوَاهُ الترمذي وأَبُو دَاوُدَ[٣].

قوبەیصەی کوڕی هەلیب (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: باوکم گوتی: جاران پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کە نوێژی بۆ دەکردین لەهەردوولای خۆیەوە کە نوێژەکەی تەواو دەکرد دەڕۆیشت، چ لای ڕاستی، چ لای چەپی (ت/د-س/ح).

٨٠٩- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا صَلَّى أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ. رَوَاهُ البخاري وأَبُو دَاوُدَ[٤].

---

(٢) مسلم. صلاة المسافرين: ١٦٢٨. نسائي. سهو: ١٣٥٨. تحفة الأشراف: ٢٢٧.

(٣) بسند حسن (شرحه).

(٤) بخاري. أذان: ٨٤٥ ، ١١٤٣ ، ١٣٨٦ ، ٢٠٨٥ ، ٢٧٩١ ، ٣٢٣٦ ، ٣٣٥٤ ، ٤٦٧٤ ، ٦٠٩٦ ، ٧٠٤٧.

سەموورەی كوڕی جوندوب (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وابوو لەپاش نوێژكردن بە تایبەتی لەپاش نوێژی بەیانی رووی تێ دەكردین و گوفتوگۆی لەگەڵ دەكردین (بوخاری و ئەبو داوود، رەحمەتی خودایان لێبێ).

٨١٠- عَنِ الْمُغِيرَةِ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يُصَلِّي الإِمَامُ فِي الْمَوْضِعِ الَّذِى صَلَّى فِيهِ حَتَّى يَتَحَوَّلَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وابن ماجه[٥].

موغیرە (خوای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: بەرنوێژ لەو شوێنەدا كە نوێژەكەی تیا كردووە نوێژی تر نەكا تا دەگوێزێتەوە بۆ جێگەیەكی تر (د/ئیبنو ماجە-بەسەندی ضەعیف).

٨١١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ إِذَا صَلَّى أَنْ يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ أَوْ عَنْ يَمِينِهِ أَوْ عَنْ شِمَالِهِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وأحمد[٦].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوە ناتوانن كە لە نوێژ بوونەوە، ئەگەر ویستتان نوێژێكی تر بكەن كەمێ بڕۆنە پێشەوە یا بچنە دواوە، یا بڕۆن بۆ لای ڕاست یا بۆ لای چەپ وە جێ گۆڕكێیەك بكەن تا هەر نوێژەی لە جێگەیەكا بكەن، وە جێگە نوێژەكان زۆربن، چونكە لە ڕۆژی قیامەتا دەبن بە شایەت بۆ نوێژكەر (د/ئەحمەد).

## ١٣٧) پەسەندە كە نوێژ بە جەماعەت دووبارە بكرێتەوە: (تعاد الصلاة جماعة)

٨١٢- عَنْ جَابِرٍ أَنَّ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) كَانَ يُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْعِشَاءِ ثُمَّ يَأْتِي قَوْمَهُ فَيُصَلِّي بِهِمْ تِلْكَ الصَّلاَةَ. رَوَاهُ الأربعة[١].

---

(٥) بسند ضعيف (شرحه).

(٦) بسند ضعيف (شرحه).

جابیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: موعاذی کوڕی جەبەل (خوای لێ رازی بێ) گەلێ جار لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەربێ) نوێژی خەوتنانی بە جەماعەت دەکرد، ئەوجا دەگەڕایەوە بۆلای هۆزەکەی و لەوێ بەرنوێژیی نوێژی ئەو خەوتنانەی بۆ دەکردن (ش/د/ت).

٨١٣- عَنْ يَزِيدَ بْنِ الأَسْوَدِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ صَلَّى مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ غُلاَمٌ شَابٌّ، فَلَمَّا صَلَّى إِذَا رَجُلاَنِ لَمْ يُصَلِّيَا فِي نَاحِيَةِ الْمَسْجِدِ فَدَعَا بِهِمَا فَجِيءَ بِهِمَا تُرْعَدُ فَرَائِصُهُمَا فَقَالَ: مَا مَنَعَكُمَا أَنْ تُصَلِّيَا مَعَنَا؟ قَالاَ: قَدْ صَلَّيْنَا فِي رِحَالِنَا، فَقَالَ: لاَ تَفْعَلُوا إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ فِي رَحْلِهِ ثُمَّ أَدْرَكَ الإِمَامَ وَلَمْ يُصَلِّ فَلْيُصَلِّ مَعَهُ فَإِنَّهَا لَهُ نَافِلَةٌ. رَوَاهُ أصحاب السنن[٢].

یەزیدی کوڕی ئەسوەد (خوای لێ رازی بێ) گوتی: کوڕێکی گەنج و جەهێڵ بووم، جارێ لەگەڵ پێغەمبەرا (درودی خوای لەسەربێ) بەجەماعەت نوێژمان کرد، کە نوێژەکەی تەواوکرد سەیری کرد کەوا دوو پیاو لەگۆشەیەکی مزگەوتەکەدا دانیشتوون و لەگەڵ ئێمە نوێژەکەیان نەکرد، جا ناردی بە دوایانا کە هێنایانن لە ترسانا لاتەریزەیان دەلەرزی فەرمووی (درودی خوای لەسەربێ): لەبەرچی لەگەڵ ئێمە نوێژتان نەکرد؟ گوتیان: لە جێگەی خۆمان نوێژمان کردووە، فەرمووی: شتی وا مەکەن، ئەگەر لە شوێنی خۆتان نوێژتان کردبوو، وە لە پاشا فریای پێشنوێژیش کەوتن کە هێشتا نوێژی نەکردبوو دیسان لەگەڵ ئەویشا نوێژەکەتان بە جەماعەت بکەنەوە، چونکە ئەمە دەبێ بە نوێژی سوننەت بۆتان (د/ت/ن-س/ص).

---

(١) بخاريز الجماعة والإمامة: ٧٠١ ، ٧٠٥ ، ٧٠٠، ٦١٠٦. مسلم. صلاة: ١٠٤٠ — ١٠٤٢. أبو داود.صلاة: ٦٠٠، ٧٩٠. نسائي. إمامة: ٨٣٤. تحفة الأشراف: ٢٥٣٢.

(٢) بسند صحيح (شرحه).

## ١٣٨) پاشەكی - دروستە پێشنوێژ جێ نشین بۆ خۆی دابنێ
## (خاتمة - يجوز الإمام أن يستخلف غيره)

**٨١٤- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَهَبَ إِلَى بَنِي عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ لِيُصْلِحَ بَيْنَهُمْ فَحَانَتِ الصَّلاَةُ فَجَاءَ الْمُؤَذِّنُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ فَقَالَ: أَتُصَلِّي لِلنَّاسِ فَأُقِيمَ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَصَلَّى أَبُو بَكْرٍ ، فَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَالنَّاسُ فِي الصَّلاَةِ ، فَتَخَلَّصَ حَتَّى وَقَفَ فِي الصَّفِّ ، فَصَفَّقَ النَّاسُ - وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ لاَ يَلْتَفِتُ فِي صَلاَتِهِ - فَلَمَّا أَكْثَرَ النَّاسُ التَّصْفِيقَ الْتَفَتَ فَرَأَى رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَأَشَارَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنِ امْكُثْ مَكَانَكَ ، فَرَفَعَ أَبُو بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يَدَيْهِ ، فَحَمِدَ اللَّهَ عَلَى مَا أَمَرَهُ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ ذَلِكَ ، ثُمَّ اسْتَأْخَرَ أَبُو بَكْرٍ حَتَّى اسْتَوَى فِي الصَّفِّ ، وَتَقَدَّمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَصَلَّى ، فَلَمَّا انْصَرَفَ قَالَ: يَا أَبَا بَكْرٍ مَا مَنَعَكَ أَنْ تَثْبُتَ إِذْ أَمَرْتُكَ فَقَالَ: أَبُو بَكْرٍ: مَا كَانَ لاِبْنِ أَبِي قُحَافَةَ أَنْ يُصَلِّيَ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَا لِي رَأَيْتُكُمْ أَكْثَرْتُمُ التَّصْفِيقَ مَنْ نَابَهُ شَيْءٌ فِي صَلاَتِهِ فَلْيُسَبِّحْ ، فَإِنَّهُ إِذَا سَبَّحَ الْتُفِتَ إِلَيْهِ، وَإِنَّمَا التَّصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ. رَوَاهُ الثلاثة والنسائي[1].**

**سەهلی كوڕی سەعد (خوای لێ رازی بێ) گوتی: رۆژێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) چوو بۆ هۆزی بەنی عەمەری كوڕی عەف، بۆ ناوبژیی هەتا ئاشتیان بكاتەوە، كاتێ نوێژ بوو بانگدەر (كە بیلال بوو) هات بۆلای ئەبو بەكرو گوتی: ئەگەر قامەت بكەم بەرنوێژییەكە دەكەی بۆ خەڵكەكە؟ گوتی: بەڵێ دەیكەم، جا كە ئەبو بەكر نوێژی دابەست پاش كەمێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) هاتەوە، هێشتا نوێژەكەیان تەواو نەكردبوو، جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) یەكە یەكە دڕی بە ریزەكاندا تاخۆی گەیاندە ریزی یەكەمو لەوێ وەستا، خەڵكەكە دەستیان كرد بە چەپڵە لێدان ئەبو بەكریش عادەتی**

---

(١) بخاري. أذان: ٦٨٤ ، ١٢٠١ ، ١٢٠٤ ، ١٢١٨ ، ١٢٣٤ ، ٢٦٩٠ ، ٢٦٩٣ ، ٢٦٩٠ ، ٢٦٩٣ ، ٧١٩٠. مسلم. صلاة: ٩٤٨. تحفة الأشراف: ٤٧٤٣.

نەبوو کە لەناو نوێژدا لابکاتەوە، بەڵام کە دی خەڵکەکە چەپڵەیەکی زۆر لێ دەدەن ئەویش ئاوڕی دایەوەو پێغەمبەری دی، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ئیشلرەتی بۆ کرد: کە لە شوێنی خۆت بمێنەوەو نوێژەکەمان بۆ تەواو کە. بەڵام ئەبو بەکر هەردوو دەستی خۆی بەرزکردەوەو سوپاسی خودای کرد لەسەر ئەو دەستی خێرەی کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بەو فەرمانە لەوی نا، ئینجا پاشەو پاش گەڕایە دواوە هەتا رێك چووە ناو ریزەکەوەو لەوێ وەستا، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) پێشکەوت و بەرنوێژییەکەی کرد، کە لە نوێژەکە بووەوە فەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ) ئەی ئەبو بەکر! کە فەرمانم پێکردیت بۆ نەمایتەوە لە شوێنی خۆت؟ ئەبو بەکریش (خوای لێ رازی بێ) گوتی: بۆ من نەهاتووە کە پێش تۆ بکەوم ئەی پێغەمبەری خودا! ئینجا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوە بۆ ئەو هەموو چەپڵەیاتان لێدا، هەر کەسێ لەناو نوێژدا شتێکی لێ روودا با بڵێ سوبحانەڵڵاە، چونکە کە سوبحانەڵڵای کرد ئیتر تێ دەگەن لە مەسەلەکە، وەلێ چەپڵەلێدان لەناو نوێژدا بۆ ژنانە (ش/د/ن).

٨١٥- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَرِضَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاشْتَدَّ مَرَضُهُ، فَقَالَ: مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ قَالَتْ عَائِشَةُ: إِنَّهُ رَجُلٌ رَقِيقٌ، إِذَا قَامَ مَقَامَكَ لَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يُصَلِّيَ بِالنَّاسِ. قَالَ: مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ، فَعَادَتْ فَقَالَ: مُرِي أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ، فَإِنَّكُنَّ صَوَاحِبُ يُوسُفَ، فَأَتَاهُ الرَّسُولُ، فَصَلَّى بِالنَّاسِ فِي حَيَاةِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)(٢).

ئەبو مووسا (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نەخۆش کەوت و نەخۆشییەکەی گران بوو فەرمووی: فەرمان بکەن بە ئەبو بەکر با لە جیاتی من بەرنوێژییەکە بکا بۆ مەردومەکە، عائیشەش (خوای لێ رازی بێ) گوتی: ئەبو بەکر پیاوێکی دڵ نەرمە ئەگەر لە جێگەی تۆدا رابوەستێ لەبەر گریان خۆی بۆ راناگیرێ و ناتوانێ بەرنوێژیی بۆ خەڵکەکە بکا بەڵام عائیشە لە

---

(٢) بخاري. أذان ٦٨٧ ، ١٩٨. مسلم. صلاة: ٩٣٥ – ٩٤٠. نسائي. إمامة: ٨٣٣.

دڵەوە مەبەستی ئەوە بوو كە باوكی لەم سەرەمەرگەدا لە جێگەكەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نەوەستێ، نەبادا خەڵكەكە بڵێن: ئەبو بەكر پێی رەش بوو پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) فەرموویەوە: فەرمان بكەن بە ئەبو بەكر با بەرنوێژییەكە بكا بۆ خەڵكەكە عائیشەیش دیسان قسەكەی خۆی دووبارە كردەوە، جا بۆیە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: پێی: بە ئەبو بەكر بڵی لە زمانی منەوە كە بەرنوێژییەكە بكا بۆ مەردوومەكە، ئێوە وەك زڵێخای یووسف وان، قسەی دەمتان‌و نیازی دڵتان لەیەك جیان! ئینجا رابەر چوو بۆلای ئەبو بەكرو راسپاردەكەی پێغەمبەری پێ راگەیاند، ئیتر لەوە بەدواوە تا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە جیهان دەرچوو هەر ئەبو بەكر بەرنوێژی دەكرد بۆ موسوڵمانان (ش/ت).

٨١٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ ألله عَنْهُاَ) قَالَتْ: أَمَرَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَبَا بَكْرٍ أَنْ يُصَلِّيَ بِالنَّاسِ فِي مَرَضِهِ، فَكَانَ يُصَلِّي بِهِمْ ، قَالَ: عُرْوَةُ: فَوَجَدَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي نَفْسِهِ خِفَّةً، فَخَرَجَ فَإِذَا أَبُو بَكْرٍ يَؤُمُّ النَّاسَ، فَلَمَّا رَآهُ أَبُو بَكْرٍ اسْتَأْخَرَ ، فَأَشَارَ إِلَيْهِ أَنْ كَمَا أَنْتَ، فَجَلَسَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِذَاءَ أَبِي بَكْرٍ إِلَى جَنْبِهِ ، فَكَانَ أَبُو بَكْرٍ يُصَلِّي بِصَلاَةِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَالنَّاسُ يُصَلُّونَ بِصَلاَةِ أَبِي بَكْرٍ. رَوَاهُماَ الشيخان والترمذي[٣].

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە نەخۆشییەكەیدا فەرمانی كرد بە ئەبو بەكر كە پێشنوێژیی بكا بۆ مەردوم، ئەویش بەرنوێژیی بۆ كردن، عورەوە گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) رۆژێ روانی كەمێ لەشی سووك بووە، جارێ‌یشت بۆ نوێژ، كە چوو لەو كاتەدا ئەبو بەكر بەرنوێژیی دەكرد بۆ خەڵكەكە، ئیتر كە ئەبو بەكر چاوی بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) كەوت ویستی جێگەكەی بۆ چۆڵ بكاو بكشێتە دواوە، بەڵام حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) ئیشارەتی بۆ كرد: وەزع لە خۆت تێك مەدەو خەریكی كاری خۆت بە، ئینجا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) رێك لە

---

(٣) بخاري. أذان: ٦٦٤ ، ٧١٢ ، ٧١٣. مسلم. صلاة: ٩٤٠.

ئاستی ئەبو بەكر لە تەنیشتیەوە دانیشت و دەستی كرد بە نوێژكردن ئیتر ئەبو بەكر بۆ نوێژی خۆی پەیڕەویی پێغەمبەری دەكردو خەڵكەكەی تریش بۆ نوێژی خۆیان پەیڕەویی نوێژەكەی ئەبو بەكریان دەكرد وە لەیەك نوێژدا دوو پێشنوێژ هەبوو (ش/ت).

٨١٧- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي مَرَضِهِ خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ قَاعِدًا فِي ثَوْبِهِ، مُتَوَشِّحًا بِهِ. رَوَاهُ الترمذي والنسائي ولفظه: آخِرُ صَلاَةٍ صَلاَّهَا رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَعَ الْقَوْمِ صَلَّي فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ مُتَوَشِّحَاً بِهِ خَلْفَ أَبِي بَكْرٍ[٤].

ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە نەخۆشیینەكەیدا لە پشت ئەبو بەكرەوە بە دانیشتنەوە نوێژی كرد، جلێكی لەبەردا بوو ئاڵاندبووی لە خۆیەوە (ت-س/ص-ن) گفتەی (ن) ئاوایە: ئاخرەمین نوێژێ كە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەگەڵ گەلدا بە جەماعەت كردبێتی لە پشتی ئەبو بەكرەوەبوو، لەو نوێژەدا یەك لۆ جلی لەبەردا بوو ئاڵاندبووی بە خۆیەوە.

٨١٨- وَعَنْهُ أَنَّ أَبَا بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) كَانَ يُصَلِّي لَهُمْ فِي وَجَعِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَّذِي تُوُفِّيَ فِيهِ، حَتَّى إِذَا كَانَ يَوْمُ الاِثْنَيْنِ وَهُمْ صُفُوفٌ فِي الصَّلاَةِ، فَكَشَفَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سِتْرَ الْحُجْرَةِ يَنظُرُ إِلَيْنَا، وَهْوَ قَائِمٌ كَأَنَّ وَجْهَهُ وَرَقَةُ مُصْحَفٍ، ثُمَّ تَبَسَّمَ يَضْحَكُ ، فَهَمَمْنَا أَنْ نَفْتَتِنَ مِنَ الْفَرَحِ بِرُؤْيَةِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَنَكَصَ أَبُو بَكْرٍ عَلَى عَقِبَيْهِ لِيَصِلَ الصَّفَّ، وَظَنَّ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَارِجٌ إِلَى الصَّلاَةِ، فَأَشَارَ إِلَيْنَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِيَدِهِ أَنْ أَتِمُّوا صَلاَتَكُمْ، وَأَرْخَى السِّتْرَ، فَتُوُفِّيَ مِنْ يَوْمِهِ. رَوَاهُ الشيخان[٥].

دیسان ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: لەو نەخۆشینەدا كە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وەفاتی كرد، ئەبو بەكر بەرنوێژیی بۆ مەردوم دەكرد، ڕۆژی دوو شەممە لە

---

(٤) بسند صحيح (شرحه).

(٥) بخاري. أذان: ٦٨٠ ، ٦٨١ (٦٨٣) ٧٥٤ ، ١٢٠٥ ، ٤٤٤٨. مسلم. صلاة: ٩٤٢. تحفة الأشراف: ١٦٩٧٩.

نوێـژدا ریـز بـوو بـووین، لـەو كاتـەدا پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێ) پـەردەی دەرگـای هۆدەكەی خۆی لادا كە لەسەرماڵی مزگەوت بوو تەماشایەكی بەدڵو بە كوڵی كردین دیمەنێكی گەلێ شیرینو رەنگین بوو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بە پێوە وەستابوو سەرنجی ئێمەی دەدا دیار بوو بۆ دواجار ئۆمەتەكەی لە ژیانیا بە سەردەكردەوەو مالاوایی لە یارانی دەكرد رەنگو روخساری لەبەر گەشیو نازداری لە رەنگو روخساری نەخۆشی نەدەكرد بەڵكوو دەتگوت پەرەی گوڵو رووپەرەی قورئانە نوور لە رووی دەتكاو گوڵو گەوهەری لێ دەباریّ! ئینجا زەردەخەنیەكی كردو پێكەنی، جا كە پێغەمبەرمان دی لەسەر ئەم حاڵە لە خۆشییانا خەریك بووین بپەشۆكێینو وەختەبوو گەشكە بمان گریّو نوێژەكە بەجیّ بێڵین! جا ئەبو بەكر (خوای لێ رازی بێ) وایزانی كەوا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دیّ بۆ نوێژ، لەبەر ئەوە پاشەوپاش گەڕایە دواوە تا بچێتە ناو ریزەكەوەو میحرابەكە چۆڵ بكا بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بەلام پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نەهاتو بەدەستی ئیشارەتی بۆ كردین: كە نوێژەكەتان تەواوكەن، ئینجا پەردەكەی دیسانەوە دادایەوە، ئیتر هەر ئەو رۆژە گوڵ لە گوڵشەن بڕاو یار لە یاران دابڕاو خۆری زانستو حیكمەت مالاوایی كرد لە گۆی زەوی‌و دانیشتووە بەرێزەكانی، وەسەر رووی خاك خۆزگەی خواست بەناو تویێی خاك، وە گوڵ خۆزگەی خواست بەگڵ، وە پێغەمبەری نازدار، ئەو كێوی نوورو عیلمو عیرفانە كۆچی دواییی كردو نوبووەتو پێغەمبەرایەتی كۆتایی هاتو دەرگای وەحی‌و سرووش كۆركرا (ش).

## ١٣٩) باسی دەهەم: باسی هەینی (جومعە)

### (ئەم باسە چوار بەشو پاشەكییەكە)

**بەشی یەكەم: باسی خێروگەورەیی رۆژی هەینی‌و پێویستی (ووجوب)ی نوێژەكەی:**

### الباب العاشر: في الجمعة – (وفيه أربعة فصول وخاتمة):

### الفصل الأول: في فضلها ووجوبها:

قَالَ اللهُ جَلَّ شَأنُهُ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ مِن يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ – ٩/٦٢}.

خودای پایەبەرزو بەقەدر دەفەرموێ: ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان بە خوداو پێغەمبەری خودا کردووە! کاتێ کە بانگ درا بۆ نوێژی هەینی لە ڕۆژی هەینیدا بەزوویی بچن بۆ یادی خودا، کە گوێ گرتنە لە دوان و نوێژکرنە بە کۆمەڵی، وە واز لە کڕین و فرۆشتن و مامەڵە بێنن! ئەمە بۆ خۆتان باشترە لەوە کە خۆتان بەو شتانەوە خەریك بکەن ئەگەر تێبگەن.

٨١٩- عَنِ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: خَيْرُ يَوْمٍ طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ يَوْمُ الْجُمُعَةِ فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ أُدْخِلَ الْجَنَّةَ وَفِيهِ أُخْرِجَ مِنْهَا وَلاَ تَقُومُ السَّاعَةُ إِلاَّ فِي يَوْمِ الجُمُعَةِ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ البخاريَّ وزاد أَبُو دَاوُدَ: وَفِيهِ تِيبَ عَلَيْهِ، وَفِيهِ مَاتَ، وَفِيهِ تَقُومُ السَّاعَةُ، وَمَا مِنْ دَابَّةٍ إِلاَّ وَهِيَ مُسِيخَةٌ يَوْمَ الْجُمُعَةِ مِنْ حِينَ تُصْبِحُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ شَفَقًا مِنَ السَّاعَةِ إِلاَّ الْجِنَّ وَالإِنْسَ[1].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ڕۆژی هەینی گەورەترین ڕۆژە کە هەتاوی لێ هەڵدێ، ئادەم لە ڕۆژی هەینیدا خودا دروستی کردووە، هەر لەم ڕۆژە شا براوەتە بەهەشت، هەر لە میشا لە بەهەشت دەرکراوە، قیامەتیش هەر لە ڕۆژی هەینیدا هەڵدەستێ (م/د/ت/ن) ئەبو داوود (ڕەزای خودای لێبێ) ئەمەشی لێ پتر کردووە: هەر لەویشا تۆبەی لێ گیراکراوە، هەر لەوێشا مردووە، هەر لەوێشا قیامەت هەڵدەستێ وە هەرچی گیان لەبەر هەیە (جنۆکەو ئادەمیزادی لێ دەرچێ) هەموویان لە ڕۆژی هەینیدا لەو کاتەوە کە بەیان دەدا تا ئەو کاتەی کە خۆرهەڵدێ، گوێ هەڵدەخەن لە ترسی هەڵسانی قیامەت!.

٨٢٠- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: نَحْنُ الآخِرُونَ السَّابِقُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بَيْدَ أَنَّهُمْ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِنَا وَأُوتِينَاهُ مِنْ بَعْدِهِمْ ثُمَّ هَذَا يَوْمُهُمُ الَّذِى فُرِضَ عَلَيْهِمْ فَاخْتَلَفُوا فِيهِ فَهَدَانَا اللَّهُ لَهُ فَالنَّاسُ لَنَا فِيهِ تَبَعٌ فَالْيَهُودُ غَدًا وَالنَّصَارَى بَعْدَ غَدٍ. رَوَاهُ الشيخان والنسائي[2].

---

(١) مسلم. جمعة: ١٩٧٣ ، ١٩٧٤. نسائي. جمعة: ١٣٧٢. تحفة الأشراف: ١٣٩٥٩. ترمذي. صلاة: ٤٨٨.

(٢) مسلم. جمعة: ١٩٧٥ — ١٩٧٩.

دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئێمە هەرچەند لە هاتن بۆ جیهان لە دواوەین بەڵام لە قیامەتا لەهەرە پێشەوەین، ئەوەندە هەیە کە ئەوان لە پێش ئێمەوە نامەی خودایان بۆ هاتووە، وە ئێمە لەپاش ئەوانەوە نامەی خوداییمان بۆ هاتووە، لەپاش ئەمەیش ئەمە ئەو رۆژەیانە کە خودا داینابوو لە سەریان کە لەم رۆژەدا بەجوانی بیپەرستن کەچی ئەوان لێیان گۆڕا بەڵام لە سایەی خوداوە، ئێمە رێمان پێ بردو دۆزیمانەوەو رێزو قەدری ئەم رۆژە دەگرین و کردوومانە بە جەژن خەڵکەکەی تریش لە دوا ئێمەوەن: سبەینێ رۆژی جوولەکەیەو دوو سبەینێش رۆژی گاورانە (ش/ن).

٨٢١- وَلمسلم: نَحْنُ الآخِرُونَ الأَوَّلُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَنَحْنُ أَوَّلُ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ[٣].

حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەرچەند لە جیهاندا ئێمە قڕەو دواهەمینین بەڵام لە قیامەتا خۆمان بەکەمینین، وە ئێمە بەکەم کەسین کە لە پێش هەموو نەتەوەکانی تردا دەچینە بەهەشت (م).

٨٢٢- وَعَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ عَلَى أَعْوَادِ مِنْبَرِهِ لَيَنْتَهِيَنَّ أَقْوَامٌ عَنْ وَدْعِهِمُ الْجُمُعَاتِ، أَوْ لَيَخْتِمَنَّ اللّٰهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ. ثُمَّ لَيَكُونُنَّ مِنَ الْغَافِلِينَ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ والنسائي وأحمد[٤].

دیسان ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەسەر داری دووانگەی خۆی دەیفەرموو: ئەو کەسانەی کە نیوۆژی هەینی ناکەن یا دەبێ وازبێنن لەم کارە ناپەسەندە یاخود خودا دڵیان مۆر دەکا، ئینجا بەرە بەرە بێ ئاگاو نابەڵەد دەبن لە دین و لە رێی رەهبەرو وردە وردە (ئەم کارەیان سەر دەکێشێ بۆ کوفرو بێ دینی) (م/ن/ئەحمەد).

٨٢٣- عَنْ أَبِي الْجَعْدِ الضَّمْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ تَرَكَ ثَلاثَ جُمَعٍ تَهَاوُنًا بِهَا طَبَعَ اللّٰهُ عَلَى قَلْبِهِ. رَوَاهُ أصحاب السنن والحاكم[٥].

---

(٣) مسلم. جمعة: ١٩٧٧.

(٤) مسلم. جمعة: ١٩٩٩. نسائي. جمعة: ١٣٦٩.

**ئەبولجەعدی ئەل-ضەمری** - (خوایان لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: ئەوەی لەبەر کەمتەرخەمی سێ نوێژی هەینی نەکا خودا مۆردەنێ بەسەر دڵیا** (د/ت/ن/حاكم-س/ح).

٨٢٤- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ أَللهُ عَنْهُماَ) عَنِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ تَرَكَ الْجُمُعَةَ مِنْ غَيْرِ ضَرُورَةٍ كُتِبَ مُنَافِقاً فِي كِتَابٍ لاَ يُمْحىَ وَلاَ يُبَدَّلُ رَوَاهُ الشافعي[٦].

**ئیبنو عەباس** (خوایان لێ رازی بێ) **لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ** (دروودی خوای لەسەربێ): **هەر کەسێ بەبی بەهانەیەکی رەوا تەرکی نوێژی جومعە بکا ئەوە ئەو کەسە بە ناپاكو دوو روو لەقەڵەم دەدرێ، وە ناوی لە دەفتەری ناپاکان دەنوسرێ، وە هەتا هەتایە نەدەکۆژێتەوەو نە دەسڕێتەوە! (شافیعی** - رەحمەتی خودای لێبێ).

٨٢٥- ولأبي دَاوُدَ والنسائي: مَنْ تَرَكَ الْجُمُعَةَ بِغَيْرِ عُذْرٍ فَلْيَتَصَدَّقَ بِدِينَارٍ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَبِنِصْفِ دِيناَرٍ[٧].

**حەزرەت** (دروودی خوای لەسەربێ) **دەفەرموێ: (هەرکەسێ بەبێ بەهانەیەکی رەوا نوێژێکی هەینیی نەکرد بایەك دیناری زێڕ بکا بەخێر، ئەگەر نەیبوو نیو دنیار بکا بەخێر!) (د/ن-سند صالح).**

## ١٤٠) نوێژی هەینی لەسەرکێ پێویستە: (الذين تجب عليهم الجمعة)

٨٢٦- عَنْ حَفْصَةَ (رَضيَ أَللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ رَوَاحُ الْجُمُعَةِ وَعَلَى كُلِّ مَنْ رَاحَ إِلَى الْجُمُعَةِ الْغُسْلُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي[١].

---

(٥) بسند حسن (شرحه).

(٦) سكت عنه الشارح (مترجم).

(٧) بسند صالح (شرحه)

(١) بسند حسن (شرحه) راجع البخاري. جمعة: رقم: ٨٨٠ = ٤٦٦ تجريد بوخاري بەكوردی (مترجم).

حەفصە (خوای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: نوێژی هەینی لەسەر هەموو نێرینەیەکی رەسییدە فەرزو پێویستە، ئەوەشی دەچێ بۆ نوێژی هەینی غوسڵ (خۆ شۆردن)ی لەسەرە (د/ن–س/ح).

٨٢٧– عَنْ طَارِق بْنِ شِهَابٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْجُمُعَةُ حَقٌّ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ فِي جَمَاعَةٍ إِلاَّ أَرْبَعَةً، عَبْدٌمَمْلُوكٌ أَوِ امْرَأَةٌ، أَوْ صَبِيٌّ أَوْ مَرِيْضٌ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والبيهقي والحاكم[٢].

طاریقی کوڕی شیهاب (خوای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەربێ): نوێژی هەینی فەرزی تەواوە لەسەر هەموو موسوڵمانێ کە بە کۆمەڵ بیکا ئەم چوار تاقمەی لێ دەرچێ: بەندەی زەڕخڕیدەو ژنو منداڵو نەخۆش (د/بەیهەقی/حاکم).

٨٢٨– عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضيَ أللهُ عَنهُماَ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْجُمُعَةُ عَلَى كُلِّ مَنْ سَمِعَ النِّدَاءَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والدار قطني[٣].

عەبدوڵلای کوڕی عەمر (خوایان لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەربێ): ئەوەی کە گوێی لە بانگ بێ نوێژی هەینی لەسەرە، (د/دارە قوطنی–س/ضعیف).

## ١٤١) نوێژی هەینی لە شارو لە دێهات دەکرێ، ژمارەی ئەوانەی هەینییان پێ دادەمەزرێ دەبێ چەندبێ: (تصلى الجمعة في المدن والقرى. وبيان العدد)

٨٢٩– عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ أللهُ عَنهُماَ) قَالَ: إِنَّ أَوَّلَ جُمُعَةٍ جُمِّعَتْ بَعْدَ جُمُعَةٍ فِي مَسْجِدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي مَسْجِدِ عَبْدِ الْقَيْسِ بِجُوَاثَى مِنَ الْبَحْرَيْنِ. رَوَاهُ البخاري وأبو دَاوُدَ[١].

---

(٢) فالحديث صحيح (شرحه).

(٣) بسندين ضعيفين (شرحه).

(١) بخاري. جمعة: ٨٩٢ ، ٤٣٧١.

ئیبنو عەبباس (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: لەپاش مزگەوتەکەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) یەکەم شوێن کە نوێژی جومعەی لێ کرا مزگەوتەکەی عەبدولقەیس بوو، کە لە گوندی جووانا بوو لە وڵاتی بەحرین (ب/د).

٨٣٠- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) وَكَانَ يَقُود أَبَاهُ بَعْدَ ذِهَاب بَصِرِه، قَالَ: كَانَ أَبِي إِذَا سَمِعَ النِّدَاءَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ تَرَحَّمَ لأَسْعَدَ بْـنِ زُرَارَةَ. فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ: لأَنَّهُ أَوَّلُ مَنْ جَمَّعَ بِنَا فِي هَزْمِ النَّبِيتِ مِنْ حَرَّةِ بَنِـي بَيَاضَـةَ فِي نَقِيعٍ يُقَالُ لَهُ نَقِيعُ الْخَضِمَاتِ. قُلْتُ كَمْ أَنْتُمْ يَوْمَئِذٍ؟ قَـالَ: أَرْبَعُـونَ. رَوَاهُ أَبُـو دَاوُدَ وابن حبان والبيهقي والحاكم وصححَّه[٢].

ئەو رەحمانی کوڕی کەعبی مالیك (خوایان لێ رازی بێ) (کە باوکی چاوی کوێربوو، بوو بوو بە چاوساغی باوکی) گوتی: باوکم دەستووری وابوو کە رۆژی هەینی گوێی لە بانگ دەبوو رەحمەتی دەنارد بۆ ئەسعەدی کوڕی زوراره، کە لەم بارەیەوە پرسیارم لێ کرد گوتی: چونکە ئەم یەکەم کەس بوو کە نوێژی هەینیی بۆ دەکردین لە دێی هەزمولنەبیت لە هەواری بەنی بەیاضە لە نەقیعول خەضیمات کە ناوی شوێنێکە دەورێ میلێ دوورە لە مەدینەوە. گوتم: چەن کەس دەبوون؟ گوتی: چل کەس بووین (د/ئیبنو حەببان/بەیهەقی/حاکم-حاکم بە صەحیحی داناوە).

## ١٤٢) بە بەهانەی رەوا نوێژی هەینی لەکۆڵ دەکەوێ: (تسقط الجمعة بالعذر)

قَالَ اللهُ تَعالى: {وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ - ٢٢/٧٨}.

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: خودای گەورە لە کاروباری ئەم ئایینەدا نایەوێ زەحمەت بخاتە سەرتانو ناهەموارو باری هەڵنەگیراوو کردەوەی نەکراو بدا بە سەرتانا.

٨٣١- وَقَالَ: ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اَللّٰهُ عَنْهُمَا) لِمُؤَذِّنِهِ فِي يَوْمٍ مَطِيرٍ: إِذَا قُلْتَ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّٰهِ. فَلاَ تَقُلْ حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ، قُـلْ صَـلُّوا فِـي بُيُـوتِكُمْ،

---

(٢) صحيح عنه الحاكم.

فَكَأَنَّ النَّاسَ اسْتَنْكَرُوا، ذَالِكَ، فَقَالَ: فَعَلَهُ مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنِّي، إِنَّ الْجُمُعَةَ عَزْمَةٌ، وَإِنِّي كَرِهْتُ أَنْ أُخْرِجَكُمْ ، فَتَمْشُونَ فِي الطِّينِ وَالمطَرِ. رَوَاهُ الثلاثة[1].

**ئیبنو عەبباس** (خوایان لێ رازی بێ) **لە ڕۆژێكی باراندا بە بانگدەرەكەی خۆی گوت: كە گوتت: {أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسول الله} مەڵێ: {حَيَّ عَلىَ ألـصَّلاة} لە جیاتی ئەوە بڵێ: {صلوا في بيـوتكم: لـە ماڵی خۆتـان نوێـژەكانتان بكـەن وەك بڵێی خەڵكەكە ئەم قسەیەیان لـەلا پەسـەند نـەبێ وابـوو، بۆیـە ئیبنـو عـەبباس گوتی: ئەمـە قسـەی من نیـە، ئەمـە قسـەو فـەرمانی كەسـێكە كـە لـەمن باشـترو چـاكترە چـونكە ئەمـە پێغەمبـەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **خـۆی وای دەكـرد ئینجـا گوتی: هەرچـەند كـە نوێـژی هـەینی فـەرزەو پێویـستە بـەڵام چـونكە بەهانـەی ڕەواهەیـە حـەز ناكـەم كـە تۆشـی سـەخڵەتی و زەحمـەتتان بكـەمو بـەناو ئـەم قوڕاوو بارانەدا هاموشۆ بكەنو بێنو بچن (ش/د).**

٨٣٢- عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ عَنْ أَبِيهِ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) أَنَّهُ شَهِدَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) زَمَنَ الْحُدَيْبِيَةِ فِي يَوْمِ جُمُعَةٍ وَأَصَابَهُمْ مَطَرٌ لَمْ تَبْتَلَّ أَسْفَلُ نِعَالِهِمْ، فَأَمَرَهُمْ أَنْ يُصَلُّوا فِي رِحَالِهِمْ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[2].

**ئـەبو مـەلیح گـوتی: بـاوكم** (خوای لێ رازی بێ) **گـوتی: لـە سـەردەمی حودەیبییـەدا لـە ڕۆژێكـی هەینیـدا لـە خزمـەتی پێغەمبـەردا بـووم** (دروودی خوای لەسەربێ) **ڕشـێنەیەك بـاران باری، بنی پڵاوی تەڕ نـەدەكرد، كەچی پێغەمبـەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمانی پێكـردن كە لە جێگەو شوێنی خۆیان نوێژبكەن (د-سند صلح).**

## ١٤٣) بەشی دووەم: خێرو گەورەیی زوو چوون بۆ نوێژی هەینیو خۆشۆردنی هەینی:

## الفصل الثاني: في فضل التبكير والغسل

٨٣٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِـيِّ (صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: مَـنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ غُسْلَ الْجَنَابَةِ ثُمَّ رَاحَ فِى السَّاعة الأوَلَى فَكَأَنَّمَـا قَـرَّبَ بَدَنَـةً،

---

(١) بخاري. أذان: ٦١٦ ، ٦٦٨ ، ٩٠١. مسلم. صلاة المسافرين: ١٦٠٢ ، ١٦٠٣. أبو داود. صلاة: ١٠٦٦.

(٢) بسند صالح (شرحه).

وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّانِيَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَقَرَةً وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّالِثَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ كَبْشًا أَقْرَنَ، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الرَّابِعَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ دَجَاجَةً، وَمَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الْخَامِسَةِ فَكَأَنَّمَا قَرَّبَ بَيْضَةً، فَإِذَا خَرَجَ الإِمَامُ حَضَرَتِ الْمَلائِكَةُ يَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ. رَوَاهُ الخمسة(١).

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (درودی خوای لەسەربێ): رۆژی هەینی ئەوەی خۆی بشوێ (لە چەشنی خۆشوۆردنی لەشپیسی) ئینجا لە کاژێری یەکەما بڕوا بۆ نوێژی هەینی و لە مزگەوت چاوەڕوانی نوێژی هەینی بکا یاخود خۆی خەریك بکا بە طاعەت و ذیکرو یادی خوداوە تا کاتی نوێژەکە ئەوەی ئەمە بکا وەك وشترێ بکا بەخێر وایە، وە ئەوەی لە کاژێری دووەما جچێ وەك رشە ولاخی بکا بە خێر وایە، وە ئەوەی لە کاتژمێری سێیەما بچێ وەك بەرانێکی شاخدار بکا بەخێر وایە، وە ئەوەی لە کاژێری چوارەما بچێ وەك مریشکێ بکا بە خێر وایە، وە ئەوەی لە کاژێری پێنجەما بچێ وەك هیلکەیێ بکا بەخێر وایە، کە بەر نوێژیش دەرچوو کە بچێ بۆ سەرمینبەر بۆ خوتبە خوێند نەوە ئیتر فریشتەکانیش دەچن گوێ لە دوان و خوطبەکە دەگرن و ئەوەی لەوە دوا بێ ناوی لە دەفتەری ئەوانا نانووسرێ (ش/دت/ن).

٨٣٤- وَعَنْهُ عَنْ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا كَانَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ كَانَ عَلَى كُلِّ بَابٍ مِنْ أَبْوَابِ الْمَسْجِدِ مَلَائِكَةٌ يَكْتُبُونَ الأَوَّلَ فَالأَوَّلَ فَإِذَا جَلَسَ الإِمَامُ طَوَوُا الصُّحُفَ وَجَاءُوا يَسْتَمِعُونَ الذِّكْرَ، وَمَثَلُ الْمُهَجِّرِ كَمَثَلِ الَّذِي يُهْدِي الْبَدَنَةَ ثُمَّ كَالَّذِي يُهْدِي بَقَرَةً، ثُمَّ كَالَّذِي يُهْدِي الْكَبْشَ، ثُمَّ كَالَّذِي يُهْدِي الدَّجَاجَةَ، ثُمَّ كَالَّذِي يُهْدِي الْبَيْضَةَ. رَوَاهُ الشيخان(٢).

دیسان لەوەوە لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (درودی خوای لەسەربێ): کە رۆژی هەینی هات لەبەر دەرگاکانی هەموو مزگەوتێ فریشتە ئامادە دەبن و قەڵەم و

---

(١) بخاري. جمعة: ٨٨١. مسلم. جمعة: ١٩٦١.

(٢) بخاري. جمعة: ٩٢٩ ، ٣٢١١. مسلم. جمعة: ١٩٨١ – ١٩٨٣.

دەفتەر بە دەستەوە دەگرن یەك لە دوای یەك بەریز ناوی ئەوانە دەنووسن كە دێن بۆ نوێژی هەینی، تا ئەو كاتەی كە پێش نوێژ دێ و دەچێتە سەر دوانگە ئیتر ئەوانیش دەفتەرەكانیان دەپێچنەوەو دەچن گوێ لە خوطبەكە دەگرن! ئەوەیشی كە زوو بچێ بۆ نوێژی هەینی وەك ئەوە وایە كە وشترێ ببەخشێتەوە، ئەنجا وەك ئەوە وایە كە رەشە ولاخێ ببەخشێتەوە، ئینجا وەك ئەوە وایە كە بەرانێ ببەخشێتەوە، ئینجا وەك ئەوە وایە كە مامرێ ببەخشێتەوە، ئینجا وەك ئەوە وایە كە هێلكەیێ ببەخشێتەوە (ش).

٨٣٥- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ الْجُمُعَةَ فَلْيَغْتَسِلْ. رَوَاهُ الخمسة[٣].

ئیبنو عومەر (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: كاتێ دەچن بۆ نوێژی هەینی خۆتان بشۆرن (ش/د/ت/ن).

٨٣٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْغُسْلُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ. رَوَاهُ الخمسة الا الترمذيَّ[٤].

ئەبو سەعید (خوای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەربێ): خۆشۆردنی رۆژی هەینی پێویستە لەسەر هەموو پیاوێكی رەسیدە (ش/د/ن).

٨٣٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لِلهِ تَعَالَى عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ حَقٌّ أَنْ يَغْتَسِلَ فِي كُلِّ سَبْعَةِ أَيَّامٍ يَوْمًا يَغْسِلُ فِيهِ رَأْسَهُ وَجَسَدَهُ. رَوَاهُ الشيخان والنسائي ولفظه: عَلَى كُلِّ رَجُلٍ مُسْلِمٍ فِي كُلِّ سَبْعَةِ أَيَّامٍ غُسْلُ يَوْمٍ وَهُوَ يَوْمُ الْجُمُعَةِ[٥].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەربێ): مافی خودای گەورەیە لەسەر هەموو موسوڵمانێ كە هەموو حەفتەیێ

---

(٣) بخاري. جمعة: ٨٨٢. مسلم. جمعة: ١٩٥٣.

(٤) بخاري. أذان: ٨٥٧ (٨٥٨) ٨٧٩ ، ٨٨٠ ، ٨٩٥ ، ٢٦٦٥. مسلم. جمعة: ١٩٥٤.

(٥) بخاري. جمعة: ٨٩٦ ، ٨٩٧ ، ٨٩٨ ، ٣٤٨٧ ، ١٩٦٠.

جارێ سەرو لەشی خۆی بشۆرێ (ش/ن) گفتەی نەسائی ئاوایە: پێویستە لەسەر هەموو پیاوێکی موسوڵمان کە هەموو هەفتەیێ رۆژی هەینی خۆی بشۆرێ.

٨٣٨- عَنْ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ تَوَضَّأَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَبِهَا وَنِعْمَتْ وَمَنِ اغْتَسَلَ فَالْغُسْلُ أَفْضَلُ. رَوَاهُ أصحاب السنن[٦].

سەموورە (خوای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەربێ): ئەوەی لە رۆژی هەینیدا بۆ نوێژی هەینی تەنیا دەسنوێژ دەگرێ ئەوە بەپێی سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) رەفتار دەکا، ئەمەیش ئیشێکی گەلێ جوانو شیرینە، ئەوەیشی خۆی دەشوا دیارە کە خۆشۆردن خێرترە (د/ت/ن-س/ح).

## ١٤٤) خۆ بۆنخۆشکردنو سەرو ریش چەورکردنو خۆرازاندنەوەو جلی جوان لەبەرکردن: (الطيب والدهن والتجميل)

٨٣٩- عَنْ سَلْمَانَ الْفَارِسِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَغْتَسِلُ رَجُلٌ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، وَيَتَطَهَّرُ مَا اسْتَطَاعَ مِنْ طُهْرٍ، وَيَدَّهِنُ مِنْ دُهْنِهِ، وَيَمَسُّ مِنْ طِيبِ بَيْتِهِ، ثُمَّ يَخْرُجُ فَلاَ يُفَرِّقُ بَيْنَ اثْنَيْنِ، ثُمَّ يُصَلِّي مَا كُتِبَ لَهُ، ثُمَّ يُنْصِتُ إِذَا تَكَلَّمَ الإِمَامُ، إِلاَّ غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الأُخْرَى. قَالَ: أَبُوهُرَيْرَةَ: وَزِيَادَةُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ، فَإِنَّ الْحَسَنَةَ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا. رَوَاهُ الشيخان وأبو دَاوُدَ بِلَفْظِ: مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَلَبِسَ مِنْ أَحْسَنِ ثِيَابِهِ وَمَسَّ مِنْ طِيبٍ إِنْ كَانَ عِنْدَهُ ثُمَّ أَتَى الْجُمُعَةَ فَلَمْ يَتَخَطَّ أَعْنَاقَ النَّاسِ، ثُمَّ صَلَّى مَا كَتَبَ اللَّهُ لَهُ، ثُمَّ أَنْصَتَ إِذَا خَرَجَ إِمَامُهُ حَتَّى يَفْرُغَ مِنْ صَلاَتِهِ كَانَتْ كَفَّارَةً لِمَا بَيْنَهَا وَبَيْنَ جُمُعَتِهِ الَّتِي قَبْلَهَا[١].

لە سەلمانەوە (خوای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەربێ): ئەو پیاوەی لە رۆژی هەینیدا خۆی بشۆرێو تابۆی دەکرێ خۆی

---

(٦) بسند حسن (شرحه). {أبو داود: ٣٥٤. ترمذي: ٤٩٧ – رياض – ز: ٢١٠ ژ: ٧ ، ١١٥٣}.

(١) بخاري. جمعة: ٨٨٣ ، ٩١٠ {ومسلم: ٩١٠ – رياض ز: (٢١١) ژمارە: ١١٥٤/٨}.

پاك‌و خاوێن رابگرێ‌و سەرو ریشی خۆی شانە بكاو لە رۆنی قژ رۆنیان لێ داو لەو بۆنە خۆشەی كە لەماڵەوە هەیانە خۆی بۆن خۆش بكا، ئینجا لەماڵ دەرچێ‌و بچێ بۆ مزگەوت‌و لەوێ نەبێ بە زەحمەت بۆ كەس‌و خۆی نەترنجێنێتە نێوانی دوو كەسەوەو سەخڵەتیان نەكا، ئینجا ئەوەندەی كە خودا لە چارەی نووسیوە نوێژی سوننەت بكا، وە كاتێ كە پێشنوێژ دەست دەكا بەقسەو دوان بێ دەنگ بێ‌و گوێ بگرێ لە قسەكانی، ئەو پیاوەی ئەمە بكا بێگومان كە خودا خۆش دەبێ لە گوناهی نێوانی هەینیی پێشووی‌و ئەم هەینییەی. لە گێرانەوەی ئەبو هورەیرەدا: وە زیادەی سێ رۆژیش چونكە پاداشی چاكە یەك بەدەیە (ش/د) گفتەی (د) ئاوایە: ئەوەی رۆژی هەینی خۆی بشۆرێ‌و جلی جوان لەبەركاو ئەگەر بۆنی خۆشی هەبوو لەخۆی بدا، ئینجا بڕوا بۆ نوێژی هەینی‌و لە مزگەوت هەنگاو هەڵنەنێ بەسەر سەری كەساو ئەوەندەی خودا لە چارەی نووسیوە نوێژی سوننەت بكا، وە كاتێ پێشنوێژ هات‌و دەستی كرد بە وتاری هەینی بێ دەنگ ببێ‌و گوێ رابگرێ تا پێشنوێژ لە نوێژ دەبێتەوە، ئەوەی ئاوا بكا ئەوە دەبێ بە كەفارەتی گوناهی نێوانی ئەم هینیی‌و هەینییەكەی پێشی.

## ١٤٥) خێرو گەورەیی رۆیشتن بۆ نوێژی هەینی : (فضل المشي للجمعة)

٨٤٠- عَنْ أَوْسِ بْنُ أَوْسٍ الثَّقَفِيُّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ غَسَّلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاغْتَسَلَ ثُمَّ بَكَّرَ وَابْتَكَرَ، وَمَشَى وَلَمْ يَرْكَبْ، وَدَنَا مِنَ الإِمَامِ فَاسْتَمَعَ وَلَمْ يَلْغُ كَانَ لَهُ بِكُلِّ خُطْوَةٍ عَمَلُ سَنَةٍ، أَجْرُ صِيَامِهَا وَقِيَامِهَا. رَوَاهُ اصحاب السنن[1].

لە ئەوسی كوڕی ئەوسی ثەقەفییەوە (خوای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر كەسێ (لە رۆژی هەینیدا) لەشی خۆی بشۆرێ‌و زۆر زوو بەپێ (نەك بە سواریی) بڕوا بۆ نوێژی هەینی‌و لە

(١) بسند حسن (شرحه).

پێشنوێژ نزیك ببێتەوەو گوێ بگرێ و لەکاتی وتاری هەینیدا قسە نەکا، ئەوە ئەو کەسە هەر هەنگاوێکی، خێری کردەوەی یەك ساڵی هەیە، کە بە ڕۆژ بەڕۆژووبێ و بەشەو شەو نوێژ بکا! (د/ت/ن–س/ح).

## ١٤٦) کاتی بانگی نوێژی هەینی: (وقت الجمعة والنداء)

٨٤١– عَنْ أَنَسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ تُصَلِّي الْجُمُعَةَ، حِينَ تَمِيلُ الشَّمْسُ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ مسلماً[١].

ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: جاران پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەوکاتە نوێژی هەینیی دەکرد کە خۆر بە دیمەن لایدەدا لەناو ڕاستی ئاسمان (ب/د/ت/ن) پڕ گۆڕەکانیان لە نووری ڕەحمەت بێ).

٨٤٢– عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْجُمُعَةَ، فَنَرْجِعُ وَمَا نَجِدُ لِلْحِيطَانِ فَيْئاً نَسْتَظِلُّ بِهِ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وأبُو دَاوُدَ والنسائي[٢].

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: جاران لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەربێ) کە نوێژی هەینیمان دەکرد کە دەگەڕاینەوە لە نوێژ بۆ ماڵەوە هێشتا دیوار ئەوەندە سێبەری نەبوو کە بە سێبەرەکەیا بڕۆین! (م/د/ن).

٨٤٣– عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النِّدَاءُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ أَوَّلُهُ إِذَا جَلَسَ الإِمَامُ عَلَى الْمِنْبَرِ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُمَا) فَلَمَّا كَانَ عُثْمَانُ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) وَكَثُرَ النَّاسُ زَادَ النِّدَاءَ الثَّالِثَ عَلَى الزَّوْرَاءِ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ مسلماً. وزاد في روايةٍ: وَثَبَتَ الْأَمْرُ عَلَى ذَلِكَ[٣].

---

(١) بخاري. جمعة: ٩٠٤.

(٢) بخاري. مغازي: ٤١٦٨. مسلم جمعة: ١٩٩٠. أبو داود. صلاة: ١٠٨٥. نسائي. جمعة: ١٣٩٠. ابن ماجه: ١١٠٠.

(٣) بخاري. جمعة: ٩١٢ ، ٩١٣ ، ٩١٥ ، ٩١٦.

سائیبی کوڕی یەزید (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: جاران لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا (درودی خوای لەسەربێ) و لە سەردەمی ئەبو بەکرو عومەردا (ڕەزای خودایان لێبێ) سەرەتای بانگ ئەوکاتە بوو کە پێشنوێژ لەسەر مینبەر دادەنیشت، بەڵام کاتێ کە عوسمان بوو بە جێنشین و خەڵك زۆر بوون بانگی سێهەمی لەسەر زەوراء زیادکرد[1]، (ب/د/ت/ن) لە گێڕانەوەیەکا ئەمەشی هەیە: ئیتر هەروا مایەوە لەسەر ئەم شێوەیە.

## ١٤٧) بەشی سێیەم: باسی وتاری هەینی: (الفصل الثالث: في الخطبة)

٨٤٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَخْطُبُ قَائِمًا ثُمَّ يَقْعُدُ، ثُمَّ يَقُومُ كَمَا تَفْعَلُونَ الآنَ. رَوَاهُ الخمسة. ولفظ أبي داود: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَجْلِسُ إِذَا صَعِدَ الْمِنْبَرَ حَتَّى يَفْرُغَ الْمُؤَذِّنُ ثُمَّ يَقُومُ فَيَخْطُبُ، ثُمَّ يَجْلِسُ فَلاَ يَتَكَلَّمُ، ثُمَّ يَقُومُ فَيَخْطُبُ. وفي رواية: كَانَتْ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خُطْبَتَانِ يَجْلِسُ بَيْنَهُمَا، يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَيُذَكِّرُ النَّاسَ[1].

ئیبنو عومەر (خوایان لێ ڕازی بێ) گوتی: جاران پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هەمیشە بە پێوە وتاری هەینی دەدا، لەپاشا کەمێ دادەنیشت، ئینجا هەڵدەسایەوە بۆ خوێندنەوەی وتاری دووەم دەق وەك ئەمەی کە ئێستا ئێوە دەیکەن! (ش/د/ت/ن) گفتەی (د) ئاوایە: جاران حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) کەسەر دەکەوتە سەر دووانگە دادەنیشت هەتا بانگدەر لەبانگ دەبۆوە، ئینجا هەڵدەسا وتارێکی دەدا، ئینجا دادەنیشتەوەو هیچ قسەی نەدەکرد، دیسان هەڵدەسایەوەو وتارێکی تری دەدایەوە لە گێڕانەوەیەکا: دەستووری

---

[1] زەوراء ناوی خانوویەك بووە بانگدەر بانگی لەسەر دەدا، ئەم بانگی سەر زەورایە بەپێی پەیدابوونی سێهەمە، بەڵام بەپێی گوتنی یەکەمە نەك سێهەمە، ئەمەیش بەم شێوەیە: بەپێی پەیدابوون یەکەم بانگی نیوەڕۆ لەکاتی پێغەمبەرو ئەبو بەکرو عومەردا بووە، دووەم قامەت، سێهەم بانگی سەرزەورا کە عوسمان زیادی کردووە تا خەڵك خۆیان کۆبکەنەوە، بەپێی گوتنیش یەکەم بانگی سەرزەوراء، دووەم بانگی نیوەڕۆ، سێیەم قامەت. - وەرگێڕ- ١٩٨٧/٢/٤

(١) بخاري. جمعة: ٩٢٠ ، ٩٢٨. مسلم. جمعة: ١٩٩١. ترمذي. صلاة: ٥٠٦. تحفة الأشراف: ٧٨٧٩.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وابوو دوو وتاری دەخوێندەوە، لە نێوانیانا دادەنیشت، لەو دوو وتارەدا قورئانی دەخوێندو ئامۆژگاری موسوڵمانانی دەكرد. سوننەتە كە ماوەی ئەم دانیشتنی نێوانی دوو وتارە بەقەی سوورەتی {قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ}بێ وە ئەم سوورەتەشی تیا بخوێنرێ.

٨٤٥- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ أُصَلِّي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَكَانَتْ صَلاَتُهُ قَصْدًا وَخُطْبَتُهُ قَصْدًا. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ البخاريَّ[٢].

جابیری كوڕی سەمووره (خوای لێ رازی بێ) گوتی: هەمیشە كە نوێژم لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەربێ) دەكرد بە كۆمەڵی، سەرنجم دەدا هەم نوێژەكەی و هەم وتارو دوانەكەی میانەكارو مامناوەندیی بوون (م/د/ت/ن).

٨٤٦- قَالَ: أَبُو وَائِلٍ: (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) خَطَبَنَا عَمَّارٌ فَأَوْجَزَ وَأَبْلَغَ فَلَمَّا نَزَلَ قُلْنَا: يَا أَبَا الْيَقْظَانِ لَقَدْ أَبْلَغْتَ وَأَوْجَزْتَ فَلَوْ كُنْتَ تَنَفَّسْتَ. فَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: إِنَّ طُولَ صَلاَةِ الرَّجُلِ وَقِصَرَ خُطْبَتِهِ مَئِنَّةٌ مِنْ فِقْهِهِ فَأَطِيلُوا الصَّلاَةَ وَاقْصُرُوا الْخُطْبَةَ، وَإِنَّ مِنَ الْبَيَانِ سِحْرًا. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وأحمد[٣].

ئەبو وائیل (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ عەممار (خوای لێ رازی بێ) وتارێكی كورت و پوخت و رەوان و دڵگیری خوێندەوە بۆمان، جا كە لە دوانكە كە دابەزی گوتمان: ئەی ئەبو یەقظان! بەراستی وتارەكەت دڵگیرو رێك و پێك و قەدبڕ بوو پڕواتابوو، خۆزگایە كەمێ درێژەت پێ دەدا! گوتی: بۆیە وەهام كرد چونكە بۆ خۆم ژنەوتوومە لە حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) دەیفەرموو: نوێژی درێژو وتاری كورتی پیاو نیشانەی ئەوەیە كە پیاوێكی زاناو شارەزایە، كەواتە درێژە بە نوێژبدەن و وتار كورت بكەنەوە، بشزانن كە هەندێ پەخشان و قسەی نەستەق و رەوان وەك جادوو وان كار لەدڵ و مێشكی ئادەمیزاد دەكەن و كاری جوانی لەلا جوانتر دەكەن (م/ئەحمەد).

---

(٢) مسلم. جمعة: ٢٠٠٠ ، ٢٠٠١. ترمذي. صلاة: ٥٠٧. نسائي. عيدين: ١٥٨١ تحفة الأشراف: ٢١٦٧.

(٣) مسلم. جمعة: ٢٠٠٦. تحفة الأشراف: ١٠٣٥٣.

٨٤٧- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا خَطَبَ احْمَرَّتْ عَيْنَاهُ وَعَلاَ صَوْتُهُ وَاشْتَدَّ غَضَبُهُ حَتَّى كَأَنَّهُ مُنْذِرُ جَيْشٍ يَقُولُ: صَبَّحَكُمْ وَمَسَّاكُمْ. وَيَقُولُ: بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةَ كَهَاتَيْنِ، وَيَقْرُنُ بَيْنَ إِصْبَعَيْهِ السَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى وَيَقُولُ أَمَّا بَعْدُ فَإِنَّ خَيْرَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللَّهِ وَخَيْرُ الْهُدَى هُدَى مُحَمَّدٍ وَشَرُّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُهَا وَكُلُّ مَحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُلُّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا أَوْلَى بِكُلِّ مُؤْمِنٍ مِنْ نَفْسِهِ مَنْ تَرَكَ مَالاً فَلأَهْلِهِ، وَمَنْ تَرَكَ دَيْنًا أَوْ ضَيَاعًا فَإِلَيَّ وَعَلَيَّ رَوَاهُ مُسْلِمٌ والنسائي(٤).

**جابیر** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **كاتێ وتاری دەدا چاوی سوور هەڵدەگەڕا دەنگی بەرز دەكردەوە، تەواو تووڕە دەبوو، بەشێوەیەكی دەتگوت ترسێنەر (مونذیر)ی سوپایەو سوپا دەترسێنێ لە دوشمنو دەڵێ: وا سوپای دوژمن، سەر لەبەیانی، یا سەر لە ئێوارێ بەم زووانە دەدا بەسەرتانا،لە هەندێ وتارا پەنجەی شایەتمانو پەنجەی بەرزەلووتەی خۆیی جووت دەكردو دەیفەرموو** (درودی خوای لەسەربێ): **لەپاش ئەمە بزانن كە باشترین فەرمایشت نامەی خودایە كە قورئانی پیرۆزە وە باشترین رێبازو رێگەی چاكە رێبازگەی موحەممەدە وەخراپترین كاروبارو فەرمانیش لە ئاییندا ئەو كاروبارانەن كە نوێباوو تازەقەڵلان، وە هەموو كارێكی ناشایستەیش سەر گەردانیو گومڕاییە لەپاشا دەیفەرموو** (درودی خوای لەسەربێ): **من بۆ هەموو موسوڵمانێ لەخۆی لە پێشترم بۆی! چونكە دەیخەمە سەر رێی رزگاریی ئیجگاریی بەڵام ئەوەی بمرێو ماڵی لە پاش بەجێ بمێنێ ئەوە ماڵەكەی بۆ كەسوكارەكەیەتی، وەلێ ئەوەی بمرێو قەرزاربێ، یاخود خێزانێكی بێ داڵدەی لەپاش بەجێ بمێنێ ئەوە قەرزەكەی رووبەرووی من دەبێتەوە خۆم دەیبژێرمەوە بۆیو سەرەوكاریی كەسوكارەكەشی لەسەر منە (م/ن).**

٨٤٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: عَلَّمَنَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خُطْبَةَ الْحَاجَةِ الْحَمْدُ لِلَّهِ نَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَسَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ

---

(٤) مسلم. جمعة: ٢٠٠٢ ، ٢٠٠٣. نسائي. عيدين: ١٥٧٧. ابن ماجه. مقدمة: ٤٥. تحفة الأشراف: ٢٥٩٩.

اللّٰهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، ثُمَّ يَقْرَأُ ثَلاَثَ آيَاتٍ (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللّٰهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ) (يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِى خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللّٰهَ الَّذِى تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّٰهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا) (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللّٰهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيدًا) الآية. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ البخاريَّ واللفظ للنسائي[٥].

**عەبدوڵڵا** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **فێری وتاری نیاز (خوطبەی حاجە)ی كردین ئەگەر فەرمانێكی گرنگمان هەبوو وەك ژن مارەبڕینو ناوبژیی كردنو شتی وا ئەوە لە پێشەوە بڵێین:**

{الْحَمْدَ لِلّٰهِ نَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ وَنَعُوذُ بِاللّٰهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَسَيِّئَاتِ أَعْمَالِنَا، فَمَنْ يَهْدِهِ اللّٰهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ}.

**سوپاسو ستایش هەر بۆ خودایە، داوای كۆمەكیو لێخۆشبوون هەر لەخودا دەكەین پەنا دەگرین بەخودا لە هەموو خراپەیەكو زیانی دەروونی خۆمان، هەروەها لە كردەوەی ناپەسەندی خۆمان، دیارە ئەوەی خودا رێگەی چاكەی نیشان بدا بە كەسی تر لە رێگە دەرناچێ، وە ئەوەی خودا سەری لێ بشێوێنێو لەڕێ دەریكا بەكەسی تر ناخرێتەوە سەر ڕێی راست، گەواهو شایەتی دەدەم كە هەر خودا خودایەو خودای ترنیە، وە موحەممەدیش هەم بەندەو هەم پێغەمبەری خودایە ئینجا ئەم سێ ئایەتانەش بە دوایا بخوێنین:**

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّٰهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ — ٣/١٠٢}.

**واتە: ئەی كەسانێ كە باوەڕو ئیمانتان هێناوە بە خوداو بە پێغەمبەری خودا! لە خودا بترسنو تەقوای خودا بكەن، ترسانو**

(٥) مسلم. زكاة: ٢٣٤٨.

تەفوایـەكی وا كـە شایـستەی شـانی ئـەوبێ، وە كـارێكی وا بكـەن كـە هـەركاتێ مـردن لەسـەر ئایینی ئیـسلام بمـرن، لـە پـێش مردنـدا لـە حـاڵی ژیاندا ئەوەندە بە ساغی تێ بكۆشن بۆ خودا كە لـەكاتی مردنـدا نیشانەی موسوڵمانەتیتان پێوە دیار بێ:

{يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا – ٤/١}.

ئەی مەردوم! ئەی نەوەی ئادەم! لـە تۆڵـەی سـەختی پـەروەردگارتان بترسن و خۆتـانی لێ بپارێزن ئـەو پـەروەردگارەی كـە ئێـوەی هـەموو لەیـەك كەسێ خستۆتەوە كە ناوی ئادەمە، وە هاوسـەری لـە پەراسووی خـۆی بـۆ دروست كرد كـە نـاوی حەووایە، ئینجا لـەم دوو كەسـە پیـاوو ژنێكـی زۆر زۆری خـستەوەو بـڵاوی كردنـەوە بەسـەر رووی زەویـدا، وە لـە خـودا بترسن و ناهـەقی و زۆرو ستەم لـە یـەكتری مەكـەن، چونكە ئێـوە هـەمووتان لەماف و حوقووقا چون یەكەن چونكە هەمووتان لـە ئـادەم و ئـادەم لـە گڵـە، خودا ئەو خودایە كە ئاشكراو نمایانـەو هـەموو هۆشمەنـدێ دان دەنـێ بـە بوونیاو ئەوەتانێ ئێوە كاتێ داوای شتێ لـە یـەكتری دەكـەن دەڵێن لەبـەر خاتری خـودا ئـەوەم بدەرێ، یـا ئـەوە مەكـە، وە خۆتـان بپـارێزن لـە بڕینـی رشتەی میهرەبانی و مـافی خـزم و كەسوكار بـەجێ بێـنن، بەراسـتی خـودا هەمیشە ئاگادارە لێتان و چاودێرە بەسەرتانەوە:

{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا، يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا – ٣٣/٧٠-٧١}.

واتــە: ئـەی كەسـانێ كـە باوەڕتـان هێنـاوە! لـە خـودا بترسـن و خۆتـان بپارێزن لە نافەرمانی ئەو، قسەیێ بكەن كـە راست بـێ و بەسوود بـێ، ئەگـەر وابكـەن كردەوەكانتـان گـیرا دەكـاو لـە گوناهـەكانتان خـۆش دەبـێ، وە هـەر

كەسێ بەگوێی خوداو پێغەمبەری خودا بكا ئەوە بەكامی خۆی دەگاو بەمەبەستو مرازی خۆی شاد دەبێ (ن/م/د/ت).

٨٤٩- عَنْ بِنْتٍ لِحَارِثَةَ بْنِ النُّعْمَان (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: مَا حَفِظْتُ (ق) إِلاَّ مِنْ فِي رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَخْطُبُ بِهَا كُلَّ جُمُعَةٍ. قَالَتْ: وَكَانَ تَنُّورُنَا وَتَنُّورُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَاحِدًا. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وأَبُو دَاوُدَ[٦].

كچێكی حاریثەی كوڕی نوعمان (خوای لێ رازی بێ) گوتی: سوورەتی قافم لە دەمی پێغەمبەر خۆیەوە (درودی خوای لەسەربێ) لەبەر كردووە، چونكە هەموو هەینییەك لە وتاری هەینیدا دەیخوێندەوە، كچەكە زرنگیو نزیكیی خۆیی لە پێغەمبەرەوە دەست نیشان كردو گوتی: ئەوساكە سەر تەندووری ماڵی ئێمەو سەر تەندووری ماڵی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) یەك بوو (م/د).

٨٥٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: كُلُّ خُطْبَةٍ لَيْسَ فِيهَا تَشَهُّدٌ فَهِيَ كَالْيَدِ الْجَذْمَاءِ. رَوَاهُ أصحاب السنن[٧].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (درودی خوای لەسەربێ): هەر وتارێ كە شایەتمانی تیا نەبێ وەك دەستێ كە گول بێ وایە! (د/ت/ن-س/ص).

## ١٤٨) نوێژی هەینی: (صلاة الجمعة)

٨٥١- قَالَ: عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) صَلاَةُ الْجُمُعَةِ رَكْعَتَان، وَصَلاَةُ الْفِطْرِ رَكْعَتَان، وَصَلاَةُ الأَضْحَى رَكْعَتَان، وَصَلاَةُ السَّفَرِ رَكْعَتَان تَمَامٌ غَيْرُ قَصْرٍ عَلَى لِسَانِ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رَوَاهُ النسائي وأحمد وابن ماجه[١].

---

(٦) مسلم. جمعة: ٢٠١١. أبو داود: صلاة: ١١٠٠ ، ١١٠٢ ، ١١٠٣. نسائي. إفتتاح: ٩٤٨.

(٧) بسند صحيح (شرحه).

(١) باسانيد صحيحة (شرحه).

عومەر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە دەمی پێغەمبەر خۆیم ژنەوتووە دەیفەرموو (درودی خوای لەسەربێ): نوێژی هەینی دوو ركاتە، وە نوێژی جەژنی رەمەزان دوو ركاتە، وە نوێژی جەژنی قوربان دوو ركاتە، وە نوێژی سەفەر دوو ركاتە ئەم نوێژانە كە بە دوو ركات دەكرێن تەواون، نەوەك بلێی كورتەوەكراون (ن/ئەحمەد/ئیبنو ماجە-باسانید صحیحە).

٨٥٢- وَللنسائي والترمذي: مَنْ أَدْرَكَ مِنْ صَلاَةِ الْجُمُعَةِ رَكْعَةً فَقَدْ أَدْرَكَ الصَّلاَةَ[٢].

دەفەرموێ (درودی خوای لەسەربێ): هەر كەسێ بە جەماعەت فریای یەك ركات لە دوو ركاتەكەی نوێژی هەینی بكەوێ ئەوە فریای ئەو نوێژە بە تەواوی دەكەوێ بەلام دەبێ كە پێشنوێژ سلاوی دایەوە ئەو بە تەنها ركاتێكی تربكا (ن/ت-سند صحیح).

٨٥٣- وللدار قطنيّ: مَنْ أَدْرَكَ رَكْعَةً مِنَ الْجُمُعَةِ فَلْيُصَلِّ إِلَيْهَا أُخْرَى وَمَنْ فَاتَتْهُ الرَّكْعَتَانِ فَلْيُصَلِّ أَرْبَعًا[٣].

حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەوەی فریای یەك ركات دەكەوێ لە نوێژی هەینی، با ركاتێكی تریشی لە پالا بكا، بەلام ئەگەر كەسێ بەهەردوو ركاتەكەدا نەگەیشت با چوار ركاتەكەی نوێژی نیوەڕۆ بكا (دارە قوطنی).

٨٥٤- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقْرَأُ فِي صَلاَةِ الْفَجْرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ سُورَةَ الْجُمُعَةِ وَالْمُنَافِقِينَ[٤].

ئیبنو عەباس (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: گەلێ جار پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لە نوێژی هەینیدا سوورەتی جومعەو سوورەتی مونافیقونەی دەخوێند (م/د/ت/ن).

---

(٢) بسند صحيح (شرحه).

(٣) قال الترمذي وعليه الكثر الصحب والتابعين.. ومالك والشافعي وأحمد (شرحه).

(٤) مسلم. جمعة: ٢٠٢٨. أبو داود. صلاة: ١٠٧٤. ترمذي. صلاة: ٥٢٠. نسائي. إفتتاح: ٩٥٥.

٨٥٥- عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقْرَأُ فِي الْعِيدَيْنِ وَفِي الْجُمُعَةِ بِسَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى وَهَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ قَالَ: وَإِذَا اجْتَمَعَ الْعِيدُ وَالْجُمُعَةُ فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ يَقْرَأُ بِهِمَا أَيْضًا فِي الصَّلاتَيْنِ[٥].

نوعمانی کوڕی بەشیر (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: گەلێ جار پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لە نوێژی هەردوو جەژنەکان و لە نوێژی هەینیدا سوورەتی {سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى} و سوورەتی {وَهَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الفَاشِيةِ}ی دەخوێند، گوتی: ئەگەر جەژنیش ڕێکەوتی ڕۆژی هەینیی بکردایە ئەوە لەهەر دوو نوێژەکاندا هەر ئەم دوو سوورەتەی دەخوێند! (م/د/ت/ن).

٨٥٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا صَلَّيْتُمْ بَعْدَ الْجُمُعَةِ فَصَلُّوا أَرْبَعًا. روى هذه الثلاثة الأصول الخمسة إلاَّ البخاريَّ[٦].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (درودی خوای لەسەربێ): ئەگەر ویستتان لەپاش نوێژی هەینی نوێژی سوننەت بکەن ئەوا چوار ڕکات بکەن (م/د/ت/ن).

٨٥٧- (ب - ١ ز - ١٠٣ ژ: ٦٠٣)[٧].

٨٥٨- وروى عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ كَانَ يُصَلِّي قَبْلَ الْجُمُعَةِ ارْبَعاً وَبَعْدَهَا أَرْبَعاً. رَوَاهُ الترمذي[٨].

دەگێڕنەوە کە عەبدوڵڵا (خوای لێ ڕازی بێ) لە پێشی نوێژی هەینییە وە چوار ڕکات و لەپاشیەوە چوار ڕکاتی دەکرد (ت).

---

(٥) مسلم. جمعة: ٢٠٢٥ - ٢٠٢٧. أبو داود. صلاة: ١١٢٢. ترمذي. صلاة: ٥٣٣. نسائي. جمعة: ١٤٢٣.

(٦) مسلم. جمعة: ٢٠٣٣ - ٢٠٣٥. نسائي. جمعة: ١٤٢٥.

(٧) راجع رقم: ٦١١.

(٨) سكت عنه الشارح (مترجم).

## ١٤٩) بەشی چوارەم: دەستوورەكانی دواندەرو وتاربێژ (خطیب)و ئامادەبووەكان (الحاضرین):

## الفصل الرابع: في آداب الخطيب والحاضرين

٨٥٩- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ سَلَامٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ عَلَى الْمِنْبَرِ فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ: مَا عَلَى أَحَدِكُمْ لَوِ اشْتَرَى ثَوْبَيْنِ لِيَوْمِ الْجُمُعَةِ سِوَى ثَوْبِ مِهْنَتِهِ. رَوَاهُ ابن ماجه وأَبُو دَاوُدَ[1].

**عەبدوڵڵای كوڕی سەلام (خوای لێ رازی بێ) گوتی: رۆژی هەینی بوو لەسەر دووانگە لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خوای لەسەربێ) چی تێ دەچێ ئەگەر یەكی سەرو دوو پارچە جل بكڕن بۆ لەبەركردنی رۆژی هەینیتان، جگە لە بەرگی جلكارتان (ئیبنو ماجە/د-سند ضعیف).**

٨٦٠- عَنْ الْحَكَمِ بْنِ حَزَنٍ الْكُلَفِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: شَهِدْنَا الْجُمُعَةَ مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَامَ مُتَوَكِّئًا عَلَى عَصًا أَوْ قَوْسٍ، فَحَمِدَ اللّٰهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ بِكَلِمَاتٍ خَفِيفَاتٍ طَيِّبَاتٍ مُبَارَكَاتٍ، ثُمَّ قَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّكُمْ لَنْ تُطِيقُوا وَلَنْ تَفْعَلُوا كُلَّ مَا أُمِرْتُمْ بِهِ وَلَكِنْ سَدِّدُوا وَأَبْشِرُوا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وأحمد وصححه ابن السَّكن[2].

**حەكەمی كوڕی حەزنی كولەفی (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەربێ) ئامادەی نوێژی هەینی بووین، كاتێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) هەڵسایەوە بۆ وتار خوێندنەوە خۆی دا بەسەر دار دەست (عەسایە)كا، یا خۆی بە كەوانێ گرت ئینجا سوپاسی خودای كردو بەچەند وشەیەكی سووكەڵەی پوختی پیرۆز وەسپی خودای دایەوە، ئەوجا فەرمووی: ئەی موسوڵمانینە! ئێوە نەدەرەقەتی ئەوە دێن كە ئەو فەرمانانەی دراوە بە سەرتانا هەموویان بكەن وە نەئەوەتان بۆ دەكرێ، كەواتە چەندەتان**

(١) بسند ضعيف (شرحه).

(٢) صحيح عنه ابن السكن (شرحه).

لێ هەڵدەستێ لە كردنی درێغی مەكەن و لەسەر ئەوە موژدەبێ لێتان (د/ئەحمەد/ئیبنو سەكەن: ح/ص).

٨٦١- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: إنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جَلَسَ ذَاتَ يَوْمٍ عَلَى الْمِنبَرِ وَجَلَسْنَا حَوْلَهُ. رَوَاهُ الشيخان[٣].

ئەبو سەعید (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) رۆژێ لەسەر دوانگەكە دانیشت ئێمەش لە دەوری لە خوارەوە دانیشتین (ش).

٨٦٢- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إذَا صَعِدَ الْمِنْبَرَ سَلَّمَ. رَوَاهُ ابن ماجه والشافعي[٤].

جابیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) كەسەر دەكەوتە سەر دووانگە كە لەوێ سڵاوی دەكرد لە كۆمەڵەكە (ئیبنو ماجە/ شافیعی).

٨٦٣- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَأَخَذَ رَجُلٌ بِيَدِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَمَا زَالَ يُكَلِّمُهُ حَتَّى نَعَسَ بَعْضُ الْقَوْمِ. رَوَاهُ الترمذي وصححه[٥].

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ قامەت كرا بۆ نوێژی هەینی، لەو كاتەدا پیاوی دەستی پێغەمبەری گرت، ئیتر هەر قسەی لەگەڵ كرد هەتا هەندێ كەس خەو بردنیەوە (ت:ص).

٨٦٤- وللبيهقي والطبراني: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إذَا دَنَا مِنَ الْمِنْبَرِ سَلَّمَ عَلَىَ مَنْ عِنْدَهُ، ثُمَّ صَعَدَ، فَاستَقْبَلَ الْقَوْمَ، ثُمَّ سَلَّمَ، ثُمَّ قَعَد (شرحه)[٦].

گوتی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وابوو كە دەگەیشتە نزیكی دوانگەكە سڵاوی دەكرد لەوانەی لەوێ بوون، ئینجا سەر دەكەوتو لەسەر دووانگەكە رووی دەكردە خەڵكەكەو ئینجا سڵاوێكی تری دەكردەوە،

---

(٣) مسلم. زكاة: ٢٤١٩ – ٢٤٢٠. بخاري. زكاة: ١٤٦٥.

(٤) سكت عنه الشارح.

(٥) صحيح عن الترمذي.

(٦) وعليه الجمهور (شرحه).

ئینجا دادەنیشت هەتا بانگدەر بانگی دەداو لە بانگ دەبووەوە، ئەوسا هەڵدەساو وتاری یەكەمی دەدا (بەیهەقی/طەبەرانی. نەقڵ كراوە لەشەرحەكەیەوە).

٨٦٥- وَلأصحاب السُّنن: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَتَكَلَّمُ بِالْحَاجَةِ إِذَا نَزَلَ مِنْ الْمِنْبَرِ، ولفظ أبي دَاوُدَ: قَالَ: أنسٌ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَنْزِلُ عَنِ الْمِنْبَرِ، فَيَعْرِضُ لَهُ الرَّجُلُ فِي الْحَاجَةِ فَيَقُفُ مَعَهُ حَتَّى يَقْضِيَ حَاجَتَهُ، ثُمَّ يَقُومُ فَيُصَلِّي[٧].

گوتی: جاران پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) كە لە دووانگەكە دادەبەزی، هەندێ كەس لەوكاتەدا ئیشیان پێی دەبوو، ئەویش لەو بابەتەوە قسەی لەگەڵ دەكردن (د/ت/ن). گفتەی ئەبو داوود وەك لەشەرحەكەدا دەڵێ ئاوایە: ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) دەیگوت: دیومە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) كە لە دوانگەكە دادەبەزی هەندێ كەس بەرەنگاری دەبوون و بۆ ئیشی خۆیان یەخەیان پێ دەگرت و ڕویان لێ دەنا، ئەویش لە گەڵیان دەوەستا تا ئیشەكەی بۆ جێ بەجێ دەكردن، ئنجا دەچوو نوێژەكەی دەكرد.

٨٦٦- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ سُلَيْكٌ الْغَطَفَانِيُّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَخْطُبُ فَجَلَسَ فَقَالَ: يَا سُلَيْكُ قُمْ فَارْكَعْ رَكْعَتَيْنِ وَتَجَوَّزْ فِيهِمَا، ثُمَّ قَالَ: إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ وَلْيَتَجَوَّزْ فِيهِمَا. رَوَاهُ الخمسة[٨].

جابیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: رۆژێكی هەینی لەوكاتەدا كە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وتاری دەدا سولەیكی غەطەفانی هات و دانیشت، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) پێی فەرمووی: ئەی سولەیك! هەڵسە دوو ركات نوێژی سووكەڵە بكە ئینجا فەرمووی: رۆژی هەینی ئەگەر یەكێكتان لەو كاتەدا هات

---

(٧) سكت عن درجته الشارح (مترجم).

(٨) بخاري. جمعة: ٩٣٠، ٩٣١، ١١٦٦. مسلم. جمعة: ٢٠١٥ – ٢٠٢١. أبو داود. صلاة: ١١١٥. نسائي. جمعة: ١٤٠٨. تحفة الأشراف: ٢٥١١.

بۆ مزگەوت کە پێشنوێژ وتاری دەخوێندەوە با بەگورجی دوو رکات نوێژی سووکەڵە بکا (ش/د/ت/ن– هەزاران رەحمەتیان لێبێ).

٨٦٧– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ ثُمَّ أَتَى الْجُمُعَةَ فَدَنَا وَاسْتَمَعَ وَأَنْصَتَ غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ وَزِيَادَةُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ وَمَنْ مَسَّ الْحَصَى فَقَدْ لَغَا. رَوَاهُ الترمذي ومسلم(٩).

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ دەسنوێژێکی جوان بگرێ‌و ئینجا بچێ بۆ نوێژی هەینی‌و خۆی لە پێشنوێژ نزیك بکاتەوە هەتا بە جوانی گوێ لە قسەکانی بگرێ‌و لەوکاتەدا بێ دەنگ‌و خامۆش بێ ئەوە خودا خۆش دەبێ لە گوناهی نێوانی ئەو هەینییەو هەینییەکەی پێشووی‌و زیادەی سێ رۆژیش، هەر کەسێکیش لەوکاتەدا کە وتارخوێن وتاری هەینی دەخوێنێتەوە دەست لە وردەبەردوزیخ‌و چەوو شتی وا بدا واتە: خۆی بەشتی بێ هوودەوە خەریك بکا ئەوە نابەجێی دەکا (ت/م).

٨٦٨– وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ أَنْصِتْ. وَالإِمَامُ يَخْطُبُ فَقَدْ لَغَوْتَ. رَوَاهُ الخمسة(١٠).

دیسان ئەو گوتی: حەزرەت فەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ) رۆژی هەینی لەوکاتەدا کە پێشنوێژ وتار دەخوێنێتەوە ئەگەر بەهاونشینی خۆت بڵێی وس، بێدەنگبە، ئەوە خۆشت قسەی بێجا دەکەی! (ش/د/ت/ن).

{وفي رواية في الشرح: ولا جمعة: ومن قال: صه فقد تكلم، ومن تكلم فلا جمعة له}.

لە گێرانەوەیەکی شەرحەکەدا (کە ئیمامی ئەحمەد (خوای لێ رازی بێ) ریوایەتی دەکا) دەڵێ: حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەوەی

---

(٩) مسلم. جمعة: ١٩٨٥. ترمذي. صلاة:٤٩٨. أبو داود. صلاة: ١٠٥٠.

(١٠) بخاري. جمعة: ٩٣٤. مسلم. جمعة: ١٩٦٢. ترمذي. صلاة: ٥١٢. نسائي. جمعة: ١٤٠٠.

بەیەكێكی تریش بڵـێ: وس، بێ دەنگ بـە، ئـەوە خۆشـی قسەی كـردووە، وە ئەوەی لەوكاتەدا قسەبكا جومعەی بۆ حلێب ناكرێ.

٨٦٩- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَحْضُرُ الْجُمُعَةَ ثَلاَثَةُ نَفَرٍ: رَجُلٌ حَضَرَهَا يَلْغُو وَهُوَ حَظُّهُ مِنْهَا، وَرَجُلٌ حَضَرَهَا يَدْعُو، فَهُوَ رَجُلٌ دَعَا اللّٰهَ عَزَّ وَجَلَّ إِنْ شَاءَ أَعْطَاهُ وَإِنْ شَاءَ مَنَعَهُ، وَرَجُلٌ حَـضَرَهَا بِإِنْصَاتٍ وَسُكُوتٍ، وَلَمْ يَتَخَطَّ رَقَبَةَ مُسْلِمٍ، وَلَمْ يُؤْذِ أَحَدًا فَهِيَ كَفَّارَةٌ إِلَى الْجُمُعَـةِ الَّتِي تَلِيهَا وَزِيَادَةُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ وَذَلِكَ بِقَوْلِ اللّٰهِ تَعَالَى: (مَنْ جَاءَ بِالْحَـسَنَةِ فَلَـهُ عَـشْرُ أَمْثَالِهَا). رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وابْنِ خزيمة في صحيحه[١١].

عبـدوڵڵای كـوڕی عـامر (خوایـان لێ ڕازی بێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسەربێ) فەرموویـەتی: ئەوانـەی كـە دەچن بۆ نوێـژی هـەینی یـەكێكن لـەم سـێ كەسە: هەندێ پیاو دەچن لەوێ دەست دەكەن بە چەڵتەو چەنەدان، ئەمانەلەو هەینییە تەنیا ئەو چەنەدانەیان پێ دەبڕێ، هەندێ پیاوی تریش دەچن لـەوێ دەسـت دەكـەن بـە نزاكـردن‌و پاڕانـەوە، ئەمانـەیش كەسـانێكن لـە خـودای گەورەو سەروەری خۆیـان دەپاڕێنـەوە، حـەزكا بەشیان دەداو حـەزكا بەشـیان نادا، پیاو گەلێكیش هەن كە دەچن بۆ هەینی لەوێ مات‌و بێ دەنگ دەبن‌و بە جوانی گوێ دەگرن‌و لە هەمان كاتدا هەنگاو بەسەر سەری كەسدا هـەڵنانێن‌و بەهیچ جۆرێ نابن بە ئازارو مەینەت بۆ كەس، جا جومعەی ئەم جۆرە كەسانە دەبێ بە كەفارەت‌و برێتیی گوناهی دە ڕۆژیان لەم جومعەیەوە هـەتا جومعـەی ئاییندە لەگەڵ زیادەی سێ ڕۆژدا ئەمەیش بەپێی فەرمایشتی خـودای گـەورە كە لەم ئایەتەدا دەفەرموێ:

{مَن جَاء بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا – ٦/١٦٠}.

**واتە:** هەر كەسێ چاكەیێ بكا دە قاتی ئەو چاكەیە پاداشی باشـی بۆ هەیـە (د-سند صالح، ئیبنو خوزەیمەش لە (صەحیحی) خۆیدا ڕیوایەتی كردووە).

---

(١١) رواه أبو داود بسند صالح (شرحه).

٨٧٠- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ بُسْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ يَتَخَطَّى رِقَابَ النَّاسِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَالنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَخْطُبُ، فَقَالَ: لَهُ: اجْلِسْ فَقَدْ آذَيْتَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي والحاكم وصَحَّحَهُ[١٢].

عەبدوڵڵای كوڕی بوسر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: رۆژی هەینی بوو لەوكاتەدا كە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وتاری دەدا پیاوێ هات دەستی كرد بە هەنگاونان بەسەر سەری خەڵكەكەدا هەتا جێگەیێ بدۆزێتەوە بۆ خۆی تیا دانیشێت جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پێی فەرموو: دانیشە، لەوە زیاتر ئازاری مەردومەكە مەدە! (د/ن-حاكم بەصەحیی داناوە).

٨٧١- وللترمذي: مَنْ تَخَطَّى رِقَابَ النَّاسِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ اتَّخَذَ جِسْرًا إِلَى جَهَنَّمَ[١٣].

حەزرەت دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەربێ): هەر كەسێ لە رۆژی هەینیدا لە مزگەوت هەنگاو هەڵنێ بەسەر سەری خەڵكدا، ئەوە پرد هەڵ دەبەستێ بۆ ناو دۆزەخ! (ت).

٨٧٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ أللّٰهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ فَلْيَتَحَوَّلْ مِنْ مَجْلِسِهِ ذَلِكَ إِلَى غَيْرِهِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وأحمد والترمذي ولفظه: إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَلْيَتَحَوَّلْ مِنْ مَجْلِسِهِ[١٤].

ئیبنو عومەر (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی: ئەگەر كەسێكتان لەناو مزگەوتدا وەنەوزی دەدا باجێ گۆڕكێ بكا (د/ئەحمەد/ ت-س/ص) گفتەی تیرمیذی: ئەگەر یەكێكتان لە رۆژی هەینیدا وەنەوزی دەدا باجێگە دانیشتنەكەی بگۆڕێ.

٨٧٣- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا اسْتَوَى عَلَى الْمِنْبَرِ اسْتَقْبَلْنَاهُ بِوُجُوهِنَا. رَوَاهُ الترمذي وابن ماجه[١٥].

---

(١٢) صحيح عنه الحاكم.

(١٣) سكت عن درجته الشارح (مترجم).

(١٤) بسند صحيح (شرحه).

عەبدوڵڵا (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کەسەر دەکەوتە سەر مینبەر رووومان تێ دەکرد (ت/ئیبنو ماجە).

٨٧٤- رَأَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجَلاً يَتَخَطَّى الرِّقَابَ فَقَالَ: لَهُ: رَأَيْتُكَ تَتَخَطَّى رِقَابَ النَّاسِ وَتُؤْذِيهُمْ، مَنْ آذى مُسْلِمَاً فَقَدْ آذانِي، وَمَنْ آذَانِي فَقَدْ آذى اللهَ عَزَّ وَجَلَّ. رَوَاهُ الطبراني (شرحه)[١٦].

گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) چاوی لێ بوو پیاوێ هەنگاوی هەڵ دەنا بەسەر سەری خەڵکەکەدا فەرمووی پێی: چاوم لێتە هەنگاو هەڵ دەنێی بەسەر سەری مەردومەکەداو بەم کردەوەیە ئازاریان دەدەی! ئەوەی ئازاری موسوڵمانێ دەدا ئەوە ئازاری من دەدا، ئەوەشی ئازاری من دەدا ئەوە ئازاری خودای گەورەو سەروەر دەدا (طەبەرانی لەسەر ریوایەتی شەرحەکە).

٨٧٥- ولأبي دَاوُدَ وابن خزيمة: وَمَنْ تَخَطَّى رِقَابَ النَّاسِ كَانَتْ لَهُ ظُهْرَاً (شرحه)[١٧].

حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەوەی کە لەکاتی نوێژی هەینیدا هەنگاو هەڵنێ بەسەر خەڵکا، نوێژی هەینییەکەی بە نیوەڕۆ بۆ حلێب دەکرێ (د/ئیبنو خوزەیمە).

## ١٥٠) پاشەکی - کاتی گیرابوونی نزاو پاڕانەوە: (خاتمة – في ساعة الإجابة)

٨٧٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ذَكَرَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَقَالَ: فِيهِ سَاعَةٌ لاَ يُوَافِقُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ وَهْوَ قَائِمٌ يُصَلِّي يَسْأَلُ اللَّهَ شَيْئًا إِلاَّ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ – وَأَشَارَ بِيَدِهِ يُقَلِّلُهَا – رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ أبا دَاوُدَ[١].

---

(١٥) وعليه جمهور اسلف والخلف (شرحه).

(١٦) سكت عن درجته.

(١٧) سكت عن درجته.

(١) بخاري. طلاق: ٩٣٥ ، ٦٤٣١. مسلم. جمعة: ١٩٦٦.

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) باسی رۆژی هەینیی دەکرد فەرمووی: کاژێرێکی تیادایە، هەر بەندەیەکی موسوڵمان بۆی رێ بکەوێ لەوکاتەدا راوەستابێ نوێژ بکا، یاخود بەکوڵ و بەدڵ لە خودا بپاڕێتەوە ئیتر داوای هەرشتێ لە خێری دین و دنیا لە خودا بکا خودا بێ دڵی ناکاو دەیداتی! گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بە دەستی پیشانیدا کە ئەو ماوەیە گەلێ کەمە (ش/ت/ن).

٨٧٧- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: هِيَ مَا بَيْنَ أَنْ يَجْلِسَ الإِمَامُ إِلَى أَنْ تُقْضَى الصَّلاَةُ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وأَبُو دَاوُدَ والترمذي ولفظه: إنَّ فِي الْجُمُعَةِ سَاعةً لاَ يَسْأَلُ اللهَ الْعَبْدُ فِيهاَ شَيْئاً إِلاَّ آتَاهُ اللهُ إِيَّاهُ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ أَيَّةُ سَاعَةٍ هِيَ؟ قَالَ: حِينَ تُقَامُ الصَّلاَةُ إِلَىَ الإِنْصِرافِ مِنْهَا[٢].

ئەبو مووسا (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خوای لەسەربێ): ئەوکاژێرە لەو حەلەوەیە کە پێشنوێژ دادەنیشێ لەسەر مینبەر هەتا نوێژ تەواو دەبێ (م/د/ت) گفتەی (ت): کاژێرێ لە رۆژی هەینیدا هەیە دووعای تیا گیرا دەبێ هەر بەندەیێ هەر شتێکی تیا لە خودا داوا بکا خودا ئەو شتەی دەداتێ عەرزیان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو کاژێرە لە کەیەوەیە بۆ کەی؟ فەرمووی: لەو حەلەوەیە کە نوێژدادەبەسترێ تا تەواو دەبێ.

٨٧٨- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَوْمُ الْجُمُعَةِ ثِنْتَا عَشْرَةَ سَاعَةً مِنْهَا سَاعَةٌ لاَ يُوجَدُ مُسْلِمٌ يَسْأَلُ اللَّهَ شَيْئًا إِلاَّ آتَاهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فَالْتَمِسُوهَا آخِرَ سَاعَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي والحاكم وصححَّه[٣].

جابیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: رۆژی هەینی دوانزە کاژێرە، کاژێرێکیان تیادایە، هەر بەندەیەکی موسوڵمان داوای هەر شتێ لە خودا بکا لەو کاژێرەدا، مسۆگەر کە خودای گەورەو

---

(٢) مسلم. ١٩٧٢. أبو داود. صلاة: ١٠٤٩.

(٣) صحيح عن الحاكم.

سـەروەر ئەوشـتـەی دەداتـێ، لـە دوا كـاژێردا بـۆی بگـەڕێن، لـەپاش عەسـر (د/ن/حاكم:ص).

٨٧٩- (➡ (ب – ١ ز – ١٣٩ ژمارە: ٨١٩/١). في هذه الرواية: عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: خَيْرُ يَوْمٍ طَلَعَتْ فِيهِ الشَّمْسُ يَوْمُ الْجُمُعَةِ، فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ أُدْخِلَ الْجَنَّةَ وَفِيهِ أُهْبِطَ مِنْهَا وَفِيهِ سَاعَةٌ لاَ يُوَافِقُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ يُصَلِّي فَيَسْأَلُ اللّٰهَ فِيهَا شَيْئًا إِلاَّ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ قَالَ: أَبُو هُرَيْرَةَ: فَلَقِيتُ عَبْدَ اللّٰهِ بْنَ سَلاَمٍ، فَذَكَرْتُ لَهُ هَذَا الْحَدِيثَ فَقَالَ: أَنَا أَعْلَمُ بِتِلْكَ السَّاعَةِ، فَقُلْتُ أَخْبِرْنِي بِهَا وَلاَ تَضْنَنْ بِهَا عَلَيَّ قَالَ: هِيَ بَعْدَ الْعَصْرِ إِلَى أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ، فَقُلْتُ كَيْفَ تَكُونُ بَعْدَ الْعَصْرِ وَقَدْ قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ يُوَافِقُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ وَهُوَ يُصَلِّي، وَتِلْكَ السَّاعَةُ لاَ يُصَلِّى فِيهَا؟ فَقَالَ: عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ سَلاَمٍ: أَلَيْسَ قَدْ قَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَنْ جَلَسَ يَنْتَظِرُ الصَّلاَةَ فَهُوَ فِي صَلاَةٍ؟ قُلْتُ: بَلَى قَالَ: فَهُوَ ذَاكَ. رَوَاهُ الترمذي وأَبُو دَاوُدَ والنسائي وَقَالاَ: هِيَ آخِرُ سَاعَةٍ قَبْلَ أَنْ تَغِيبَ الشَّمْسُ[٤].

لـە گێڕانـەوەی ئێـرەدا: دەڵـێ: لـە ئـەبو هـورەیرەوە (خوای لێ رازی بێ) لـە پێغەمبەرەوە دەفـەرموێ (دروودی خوای لەسەربێ): ڕۆژی هـەینی گـەورەترین ڕۆژە کە هەتاوی تیا هەڵدێ، ئادەم لـەم ڕۆژەدا خـودا دروسـتی کـردووە، هـەر لـەم ڕۆژەیشا براوەتە ناو بەهەشت، هەر لەم ڕۆژەیشا دایـان پەڕانـد لـە بەهەشـت بۆ سەر زەوی ئەم ڕۆژە تاوێکی تیادایە هەر بەندەیەکی موسوڵمان بـۆی ڕێ بکەوێ لەوکاتەدا نوێژ بکا، ئیتر داوای هەرشتێ لە خودا بکا دەیـداتێ ئـەبو هورەیرە گوتی: کە تووشی عەبدوڵڵای کوڕی سەلام بووم، ئـەم فەرمایشتەم گێڕاوەیەوە بۆی، گوتی: من دەزانم ئەو تاوەکەیە، گوتم: دە بەمنیشی بڵـێ و لەمنی مەشارەوە، گوتی: ئەو تاوە لەپاش عەسرەوەیە هەتا خۆر ئاوادەبێ، گوتی: چۆن لەپاش عاسرەوە دەبێ، ئەگەر وابێ چۆن پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هـەر بەندەیـەکی موسـوڵمان بـۆی ڕێ بکـەوێ لـەو کاتـەدا

---

(٤) تقدم فى رقم: ٨١٩/١. رواه الترمذى وصححه، وللشيخين شطره الأول (شرحه).

نوێـژ بکـا چـونکە کـاتی پـاش عەسـر نوێـژی تیـا نـاکرێ؟ عەبـدوڵڵای کـوڕی سەلامیش گوتی: باشە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نافـەرموێ: هـەر کەسـێ دانیشێ چاوەنواڕی نوێژ بکا بە نوێژ حلێبە بۆی؟ گـوتم: بـا، وا دەفـەرموێ، گـوتی: مەبەسـت لـە نوێـژکردن لـەم شـوێنەدا ئەم چاوەڕوانییەیە! (ت:ص-د/ن) ئـەبو داوودو نەسـائی کـە ئـەم فـەرموودەیان گێڕاوەتـەوە گوتوویانـە: ئەوتاوە دوا تاوە لە ڕۆژی هەینی لە پێش خۆرئاوا بووندایە.

٨٨٠- (ب - ١ ز - ١٨١ ژمارە: ٣/٩٦٧).

## ١٥١) زۆر سەڵاوات دان لە دیاری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) لە شەوو ڕۆژی هەینیدا:

## الإكثار من الصلاة على النبي ﷺ في يوم الجمعة وليلتها

٨٨١- عَنْ أَوْسِ بْنِ أَوْسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ مِنْ أَفْضَلِ أَيَّامِكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ قُبِضَ، وَفِيهِ النَّفْخَةُ، وَفِيهِ الـصَّعْقَةُ، فَأَكْثِرُوا عَلَيَّ مِنَ الصَّلاَةِ فِيهِ، فَإِنَّ صَلاَتَكُمْ مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ، قَـالُوا: يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ وَكَيْفَ تُعْرَضُ صَلاَتُنَا عَلَيْكَ وَقَدْ أَرِمْتَ؟ فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ حَرَّمَ عَلَى الأَرْضِ أَجْسَادَ الأَنْبِيَاءِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي[1].

ئەوسی کوڕی ئەوس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فـەرمووی: ڕۆژی هـەینی یەکێکـە لـە ڕۆژە هـەرە باشـەکانتان، لـەودا ئـادەم دروسـت کـراوە، وە هـەر لەویـشدا مـردووە، وە هـەر لەویـشدا نـەفخی سـوور دەبێ و فوودەکرێ بـە کـەرەنا (صـوور)دا، وە هـەر لەویـشدا نەعرەتە گەورەکە دەبـێ کە هەرچی زیندەوەرە لـەوەی لـە ئاسمـان و زەویدایە هـەموو لە سـامی زەنـدەقیان دەچـێ و بێهـۆش دەکـەون و دەمـرن جـا کـەواتـە لـەم ڕۆژەدا زۆر سەڵاوات لەسەرمن بدەن، چونکە صەڵاواتەکەتان دەگاتـەوە پـێم و ڕادەنوێنرێ بۆم یارانیش گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ کە جەستەت پۆرتکاو لەشت ڕزی لـە گـۆڕدا چـۆن چـۆنی صـەڵاوات و دروودی ئێمـەت پـێ دەگاتـەوە؟

(١) بسند صحيح (شرحه).

فەرمووی: (درودی خوای لەسەربێ) خودای گەورەو سەروەر جەستەی پێغەمبەرانی حەرام كردووە لە زەوی‌و لەشیان لە خاكا ناڕزێ! (د/ن-س/ص).

٨٨٢- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي أَوْفِى عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: أَكْثِـرُوا الصَّلاَةَ عَلَيَّ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَإِنِّي أَبْلُغُ وَأَسْمَعُ. رَوَاهُ الشافعي وابن ماجه[٢].

عەبدوڵلای كوڕی ئەبو ئەوفا (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: لە رۆژی هەینیدا سەڵاوات لەسەر من بدەن، چونكە یا پێم دەگاتەوە یا بۆ خۆم بەگوێی خۆم دەیبیستم (شافیعی/ئیبنو ماجە).

٨٨٣- وَقَالَ: رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَقْرَبُكُمْ مِنّـي في الجَنَّـةِ أَكْثَـرُكُمْ عَلَيَّ صَلاَةً، فَأَكْثِرُوا الصَّلاَةَ عَلَيَّ فِي اللَّيْلَةِ الْغَـرَّاءِ زالْيَـوْمِ الأَزْهِـر. رَوَاهُ الـشافعي والبيهقي. والله أعلم[٣].

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: لە بەهەشتا ئەو كەسەتان گەلێ نزیكە لەمنەوە كە زۆر تر صەڵاوات لەسەر من دەدا، كەواتە لەشەوە پرشنگدارەكەو لە رۆژە درەخشانەكەدا واتە: لە شەوو رۆژی هەینیدا زۆر سەڵاوات لەسەر من بدەن (شافیعی/بەیهەقی — رەحمەتی خودایان لێبێ).

## ١٥٢) باسی یازدەهەم: باسی نوێژی ترس‌و نوێژی سەفەر، (ئەم باسە دەبێ بە دوو بەشەوە):

### بەشی یەكەم: باسی نوێژی ترس:

### الباب الحادي عشر: في صلآة الخوف وصلاة السفر وفيه فصلان.

### الفصل الأول: في صلاة الخوف

{قَالَ: اللهُ تَعالى - وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلاَةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُواْ فَلْيَكُونُواْ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَى لَمْ يُصَلُّواْ فَلْيُصَلُّواْ مَعَكَ - ٤/١٠٢}.

---

(٢) سكت عن شارح.

(٣) سكت عن شارح.

**واتە:** خودای گەورە دەفەرموێ: كاتێ تۆ لەناویانا بووی و بەرنوێژیت بۆ كردن، ئەوە با تاقمێكیان بەرەو رووی دوژمن راوەستێ و تاقمێ لەوان راست ببنەوە دەس بكەن بە نوێژ لەگەڵ تۆداو با هەركەسەی چەكی خۆی وەربگرێ، جاكاتێ ئەم تاقمەیە سەجدەكانی ركاتی یەكەمیان برد لە پشتی تۆوە با تۆ بەجێ بهێڵن و بڕۆن لە دواوە بەرەو رووی دوشمن راوەستن لە جێگەی تاقمەكەی ترداو ئاگاداربن لە دوژمن پاش ئەوە تاقمی یەكەم چوونە داوە با تاقمێ تر كە لە پاشەوە راوەستابوون و نوێژیان نەكردووە با ئەوانەبێن لەگەڵ تۆدا نوێژ بكەن.

## ١٥٣) كاتێ كە دوژمن لە رووی رووگەوە نەبێ نوێژی ترس لەسەر یەكێ لەم شێوەیانە دەكرێ: (إذا كان العدو في غير جهة القبلة)

٨٨٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَلاَةَ الْخَوْفِ فِي بَعْضِ أَيَّامِهِ فَقَامَتْ طَائِفَةٌ مَعَهُ وَطَائِفَةٌ بِإِزَاءِ الْعَدُوِّ فَصَلَّى بِالَّذِينَ مَعَهُ رَكْعَةً ثُمَّ ذَهَبُوا وَجَاءَ الآخَرُونَ فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً ثُمَّ قَضَتِ الطَّائِفَتَانِ رَكْعَةً رَكْعَةً قَالَ: وَقَالَ: ابْنُ عُمَرَ: فَإِذَا كَانَ خَوْفٌ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ فَصَلِّ رَاكِبًا أَوْ قَائِمًا تُومِئُ إِيمَاءً. رَوَاهُ الخمسة[١].

ئیبنو عومەر (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەیەكێ لە غەزاكانیا لەسەر ئەم شێوەیە نوێژی ترسی بۆ كردین: دەستەیەك لەگەڵ خۆیا نوێژیان دەكردو دەستەیەكیش بەرامبەری دوژمن بەچەكەوە رادەوەستان تا ركاتێكی بەوانیش تەواو كرد. هەردوو دەستەكەیش سەربەخۆیەكی ركاتێكی بەو دەستەیە تەواو كرد كە لەگەڵیا بوون، ئینجا ئەوانە رۆیشتن و چوون بۆ ئێشك گرتن و دەستەكەی ترهاتن، وە ركاتێكی تریان كرد (گێڕەرەوە: راوی) گوتی: ئیبنو عومەر گوتی: ئەگەر ترس لەمە زۆر تر بوو هەرچۆنێ بۆتان دەلوا نوێژبكەن، بە سواریی بوو، بە پیادەیی بوو

(١) مسلم. صلاة الخوف: ١٩٣٩ – ١٩٤١ بخاري. صلاة الخوف: ٩٤٢.

نوێـژی خـۆت بکـە، وە هەرچـیت بـۆ نـەدەکرا لـە کردارەکـانی نوێـژ وەك چەمینەوەو کوڕنووش بە ئیشارەت بیکە (ش/د/ت/ن).

٨٨٥- ولمسلم وأبي دَاوُدَ: صَلَّى رَسُـولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَـوْمَ ذَاتِ الرِّقَاعِ صَلاَةَ الْخَوْفِ أَفَطَائِفَةً صَلَّتْ مَعَهُ، وَطَائِفَةٌ وُجَاهَ الْعَدُوِّ ، فَصَلَّى بِالَّذِينَ مَعَـهُ رَكْعَةً ، ثُمَّ ثَبَتَ قَائِمًا ، وَأَتَمُّوا لأَنْفُسِهِمْ ثُـمَّ انْـصَرَفُوا ، فَـصَفُّوا وُجَـاهَ الْعَـدُوِّ ، وَجَاءَتِ الطَّائِفَةُ الأُخْرَى فَصَلَّى بِهِمِ الرَّكْعَةَ الَّتِي بَقِيَتْ مِنْ صَلاَتِهِ ، ثُمَّ ثَبَتَ جَالِسًا ، وَأَتَمُّوا لأَنْفُسِهِمْ ، ثُمَّ سَلَّمَ بِهِمْ[٢].

گـوتی: لـە ڕۆژی غـەزای ذاتولریقاعـدا پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) لەسەر ئەم شێوەیە نوێژی ترسـی بـۆ موسـوڵمانەکان کـرد: موسـوڵمانەکان بـوون بـە دوو تاقمـە: تاقمەیـەکیان لەگـەڵ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) نوێـژیان دەکـردو تاقمەکـەی تریـشیان بەرامبـەر دوژمـن ڕاوەسـتابوون، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) یەك ڕکاتی تەواو کرد بەو تاقمەی کە لەگەڵیا نوێژیان دەکرد، ئینجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) خۆی لە شوێنی خۆیا بەپێوە ڕاوەستاو مایەوە تا ئەوان نوێـژی خۆیـان تـەواو کـرد واتـە: سـەرو ڕکاتی تریـان کـرد، ئینجـا ڕۆیـشتن و چـوون بەرامبـەری دوشمـن ڕیـز بـوون ئینجـا تاقمەکـەی تـریش هـاتن، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەربێ) ڕکـاتێکی مابوو لەگەڵ ئەم تاقمـەدا کـردی، ئینجـا خـۆی بـە دانیـشتنەوە چاوەڕوانی کـردن، تـا ئـەوانیش سـەرو ڕکـاتی تریـان کـرد بـۆ خۆیـان، ئینجـا سـەلامی بەمانە دایەوە! (م/د).

٨٨٦- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي خَوْفِ الظُّهْرَ، فَصَفَّ بَعْضَهُمْ خَلْفَهُ وَبَعْضَهُمْ بِإِزَاءِ الْعَدُوِّ، فَصَلَّى بِمَنْ خَلْفَهُ رَكْعَتَـيْنِ، ثُـمَّ سَلَّمَ، فَانْطَلَقَ الَّذِينَ صَلَّوْا مَعَهُ فَوَقَفُوا مَوْقِفَ أَصْحَابِهِمْ ثُمَّ جَاءَ أُولَئِكَ فَصَلَّوْا خَلْفَهُ، فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ سَلَّمَ فَكَانَتْ لِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَرْبَعًـا وَلأَصْـحَابِهِ رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ ومسلم[٣].

---

(٢) مسلم. صلاة المسافرين: ١٩٤٥. بخاري. غزوة ذات الرقاع: ٤١٢٩. أبو داود. صلاة: ١٢٣٧.

(٣) أنظر مسلم. صلاة الخوف مكن: ١٩٣٩ — ١٩٤٧.

ئەبو بەكر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەكاتی ترسدا نوێژی نیوەڕۆی لەسەر ئەم شێوەیە بۆ كردین: هێندێكمانی لە پشتی خۆیەوە ریزكردو هێندێكیشمانی روو بەرووی دوشمن ریزكرد، ئینجا دوو ركات نوێژی بە جەماعەت كرد بەوانەی كە لە پشتیەوە بوون‌و سەلامی پێ دانەوەو ئەمانە چوون لە شوێنی هاوڕێكانیان روو بە رووی دوشمن راوەستان ئینجا ئەوانیش هاتن‌و لە پشتیەوە دەستیان كرد بە نوێژكردن‌و دوو ركات نوێژی بەمانیش كردو سلاوی پێ دانەوە، جا نوێژەكەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بوو بە چوار ركات، هاوڕێكانیشی یەكی دوو ركاتیان كرد (د/م).

## ١٥٤) كاتێ كە دوژمن لە رووی رووگەوە بێ

٨٨٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَامَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ فَكَبَّرَ وَكَبَّرُوا مَعَهُ، وَرَكَعَ وَرَكَعَ نَاسٌ مِنْهُمْ، ثُمَّ سَجَدَ وَسَجَدُوا مَعَهُ، ثُمَّ قَامَ لِلثَّانِيَةِ فَقَامَ الَّذِينَ سَجَدُوا وَحَرَسُوا إِخْوَانَهُمْ، وَأَتَتِ الطَّائِفَةُ الأُخْرَى فَرَكَعُوا وَسَجَدُوا مَعَهُ ، وَالنَّاسُ كُلُّهُمْ فِي صَلاَةٍ ، وَلَكِنْ يَحْرُسُ بَعْضُهُمْ بَعْضًا. رَوَاهُ الخمسة إلاّ الترمذي[١].

ئیبنو عەبباس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) راوەستا بۆ نوێژی ترس‌و خەڵكەكەیش لە پشتیەوە راوەستان، جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) خۆی ئەڵلاهو ئەكبەری كردو نوێژی دابەست‌و موسوڵمانەكانیش لە گەڵیا ئەڵلاهو ئەكبەریان كردو هەموویان لەگەڵ ئەودا نوێژیان دابەست ئینجا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) روكوع‌و كوڕنووشی بردو دەستەیەكیش لەوان لەگەڵیا روكوع‌و كوڕنووشیان بردو ركاتی یەكەمیان لەگەڵ پێغەمبەردا تەواو كرد ئینجا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) هەڵسایەوە بۆ ركاتی دووەم، ئەو دەستەیەشی كە لەگەڵیا ركاتی یەكەمیان كردبوو هەڵسانەوەو بوون

(١) بخاري. صلاة الخوف: ٩٤٤.

بە پاسەوانی براكانی تریان، ئینجا دەستەكەی تریش كە هەتا ئێستا پاسەوانی پێغەمبەرو دەستەی یەكەم بوون هاتن لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەربێ) ركاتێكیان تەواكرد، ئیتر بەم پێیە خەڵكەكە هەموویان لەناو نوێژدا بوون، بەڵام بە نۆرە ئاگاداریی یەكتریان دەكرد (ش/د/ن).

٨٨٨- عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِي حَثْمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَلَّى بِأَصْحَابِهِ فِي الْخَوْفِ فَصَفَّهُمْ خَلْفَهُ صَفَّيْنِ، فَصَلَّى بِالَّذِينَ يَلُونَهُ رَكْعَةً، ثُمَّ قَامَ فَلَمْ يَزَلْ قَائِمًا حَتَّى صَلَّى الَّذِينَ خَلْفَهُمْ رَكْعَةً، ثُمَّ تَقَدَّمُوا وَتَأَخَّرَ الَّذِينَ كَانُوا قُدَّامَهُمْ فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً، ثُمَّ قَعَدَ حَتَّى صَلَّى الَّذِينَ تَخَلَّفُوا رَكْعَةً ثُمَّ سَلَّمَ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وأَبُو دَاوُدَ والله أعلم[٢].

سەهلی كوڕی ئەبو حەثمە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەكاتی ترسدا نوێژی ترسی بە هاوڕێكانی بەم شێوەیە كرد: لە پشتی خۆیەوە كردنی بە دووریز، لەپێشدا ركاتێكی بەریزی یەكەم كرد، ئینجا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) هەڵسا بەپێوە راوەستا هەتا ریزی دووەم لە شوێنی خۆیان ركاتی یەكەمیان بۆ خۆیان كرد، ئینجا ریزی یەكەم كە هەتا ئێستا لە پێشەوە بوون چوونە دواوە، وەریزی دووهەم كە هەتا ئێستا لە پاشەوە بوون هاتنە پێشەوە، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ركاتێكی بەمانیش كرد، ئینجا دانیشتن هەتا ریزی یەكەم كە چوو بوونە دواوە ركاتی دووەمیان كرد، ئەوجا سڵاوی بە هەموویان دایەوە (م/د).

## ١٥٥) بەشی دووەم: باسی نوێژی سەفەر باسی كورت كردنەوەی نوێژو ئەو ماوەیەی كە نوێژی تیا كورت دەكرێتەوە:

## الفصل الثاني: في صلاة السفر. القصر ومسافته

قَالَ اللهُ تَعالى: {وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ الصَّلاَةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُواْ – ٤/١٠١}.

---

(٢) بخاري. مغازي: ٤١٢٩ ، ٤١٣١. مسلم. صلاة الخوف: ١٩٤٤. أبو داود. صلاة: ١٢٣٧.

واتــە: كاتــێ چــوون بــۆ ســەفەر ئەگــەر نوێــژەكانتان كــورت بكەنــەوە گوناحتان لەسەر نیە، واتە چوار ركاتی بكەن بە دوو ركات ئەگەر ترستان بوو كە كافرەكان نارەحەتتان بكەن و تووشی ئاژاوەیەكتان بكەن.

٨٨٩- عَنْ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ قَالَ: قُلْتُ لِعُمَرَ بْـنِ الْخَطَّـابِ (رَضِيَ اللهُ عَنـهُ) لَـيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلاَةِ إِنْ خِفْتُمْ أَنْ يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا، فَقَـدْ أَمِـنَ النَّاسُ؟ فَقَالَ: عَجِبْتُ مِمَّا عَجِبْتَ مِنْهُ فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللَّـهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) عَـنْ ذَلِكَ. فَقَالَ: صَدَقَةٌ تَـصَدَّقَ اللَّـهُ بِهَـا عَلَـيْكُمْ فَـاقْبَلُوا صَـدَقَتَهُ. رَوَاهُ الخمـسة إِلاَّ البخاري[1].

یـەعلای كـوڕی ئومەییـە (خوای لێ رازی بێ) گـوتی: گـوتم بەعومـەری كـوڕی خەطاب (خوای لێ رازی بێ): خودا لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ:

{لَّيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ الصَّلاَةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُواْ}:

خـۆ ئێـستا تـرس نـەماوەو مـەردووم هـێمن بوونەتـەوە كـەوابوو چـۆن دروستە بۆ ئێمە نوێژ كورت بكەینـەوە؟ ئـەویش گـوتی: ئەمـەی سـرنجی تـۆی راكێـشاوە سـرنجی منیـشی راكێـشاو منیـش وەكـوو تـۆ لەمـە سەرسـام بـووم، بەڵام كە لەمبارەیەوە لە پێغەمبەرم پرسی فـەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ): ئەمـە خەڵاتێكەو خودا پێتانی بەخـشیوە، دەی ئێـوەش خەڵاتەكـەی وەربگـرن رەتـی مەكەنەوە (م/د/ت/ن).

٩٠ ٨- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِـيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) مِـنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ، فَكَانَ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ حَتَّى رَجَعْنَـا إِلَـى الْمَدِينَـةِ، قُلْـتُ: أَقَمْتُمْ بِمَكَّةَ شَيْئًا قَالَ: أَقَمْنَا بِهَا عَشْرًا. رَوَاهُ الخمسة[2].

یـەحیای كـوڕی ئـەبو ئیـسحاق گـوتی: ئەنـەس (خوای لێ رازی بێ) گـوتی: لـە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەربێ) لـە مەدینـەوە چووین بـۆ مەككـە، ئیتر

(١) مسلم. صلاة المسافرين: ١٥٧١. أبو داود. صلاة: ١١٩٩ ، ١٢٠٠. ترمذي. تفسير: ٣٠٣٤. نسائي تقصير الصلاة في سفر: ١٤٣٢.

(٢) بخاري. تقصير الصلاة: ١٠٨١ ، ٤٢٩٨ ، ٤٢٩٩.

هەر بە دوو ركات دوو ركات نوێژە چوارینەكانی دەكرد هەتا گەڕاینەوە بۆ مەدینە، گوتم بە ئەنەس: لە مەككە هیچ مانەوە؟ گوتی: دە شەو لەوێ ماینەوە (ش/د/ت/ن).

٨٩١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَقَامَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تِسْعَةَ عَشَرَ يَقْصُرُ، فَنَحْنُ إِذَا سَافَرْنَا تِسْعَةَ عَشَرَ قَصَرْنَا، وَإِنْ زِدْنَا أَتْمَمْنَا. رَوَاهُ البخاري وأَبُو دَاوُدَ والترمذي وَلَفْظُهُ: نَحْنُ نُصَلِّي فِيمَا بَيْنَنَا وَبَيْنَ تِسْعَ عَشْرَةَ رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ فَإِذَا أَقَمْنَا أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ صَلَّيْنَا أَرْبَعًا[٣].

ئیبنو عەبباس (خوایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) كە شاری مەككەی گرت نۆزدەشەو لەوێ مایەوە، لەو ماوەیەدا نوێژی كورت دەكردەوە واتە: نوێژە چوارینەكانی بە دوو ركات دەكرد. جا لەبەر ئەمە ئێمەیش هەر كاتێ چووین بۆ سەفەر هەتا نۆزدەشەو لە شوێنێ دەمێنینەوە هەر هەقمان هەیە كە نیوێژ كورت بكەینەوە، بەلاّم ئەگەر لە شوێنێ لەمە پتر ماینەوە ئیتر نوێژی تەواو دەكەین (ب/د/ت) گفتەی (ت): جا ئێمەش هەتا نۆزدە شەو دوو ركات دوو ركات نوێژ دەكەین، بەلاّم ئەگەر لە شوێنێ نۆزدە شەو زیاتر ماینەوە ئەوجا چوار ركات نوێژی تەواو دەكەین.

٨٩٢- عَنْ ابْنُ عُمَرَ (رَضيَ أللهُ عَنهُمَا) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِمِنِىً رَكْعَتَيْنِ وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ، وَمَعَ عُثْمَانَ صَدْراً مِنْ إِمَارَتِهِ ثُمَّ أَتَمَّهَا. رَوَاهُ الشيخان والنسائي[٤].

ئیبنو عومەر (خوایان لێ ڕازی بێ) گوتی: لەمینا لە ڕۆژەكانی جەژنی قوربانیدا لەگەڵ پێغەمبەر خۆیو لەگەڵ ئەبو بەكرو لەگەڵ عومەردا نوێژە چوار ركاتییەكانمان دەكرد بە دوو ركات، وە هەروەها لەگەل عوسمانیشدا لە سەرەتای فەرمانڕەواییەكەیدا بە هەمان چەشن دەمانكردن، بەلاّم عوسمان لە

(٣) بخاري: تقصير الصلاة: ١٠٨٠ ، ٤٢٩٨ ، ٤٢٩٩.

(٤) بخاري. تقصير الصلاة: ١٠٨٤ ، ١٦٥٧. أبو داود، مناسك الحج: ١٩٦٠. نسائي. تقصير الصلاة: ١٤٤٧ ، ١٤٤٨. تحفة الأشراف: ٩٣٨٣ و ٩٨٢٤.

دواییدا چوار ركاتی تەواوی دەكردو لە مینا نوێژی كورت نەدەكردەوە (ش/ن).

٨٩٣- وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ وأبْنُ عَبَّاسٍ (رَضيَ أللهُ عَنْهُمْ) يَقْصُرَانِ وَيُفْطِرَانِ فِي أَرْبَعَةِ بُرُدٍ وَهْيَ سِتَّةَ عَشَرَ فَرْسَخًا. رَوَاهُ البخاري(٥).

ئیبنو عومەرو ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێبێ) دەستووریان وابوو بۆ چوار بەرید (كە دەكاتە شانزە فرسەق) هەم نوێژیان كورت دەكردەوەو هەم رۆژوویان دەشكاند.

٨٩٤- عَنْ يَحْيَى بَنِ يَزِيدَ الْهُنَائِيِّ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ عَنْ قَصرِ الصَّلاَةِ فَقَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا خَرَجَ ثَلاَثَةَ أَمْيَالٍ أوْ ثَلاَثَةِ فَرَاسِخَ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وأَبُو دَاوُدَ وَأَحْمَد(٦).

یەحیای كوڕی یەزیدی ئەل هونائی (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لەبارەی كورت كردنەوەی نوێژەوە لە ئەنەسی كوڕی مالیكم پرسی، گوتی: دەستووری پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وابوو ئەگەر ماوەی سێ میل (یا گوتی: ماوەی سێ فرسەق) رێگەی بكردایە نوێژی كورتەوە دەكردو نوێژی چوار ركاتی بە دوو ركات دەكرد (م/د/ئەحمەد).

## ١٥٦) كۆكردنەوەی نوێژ (جەمع): (الجمع)

٨٩٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ أللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَجْمَعُ بَيْنَ صَلاَةِ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، إِذَا كَانَ عَلَى ظَهْرِ سَيْرٍ، وَيَجْمَعُ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ. رَوَاهُ البخاريُّ ومُسْلِمٌ ولفظه: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا عَجِلَ بِهِ السَّفَرُ يُؤَخِّرُ الظُّهْرَ إِلَى وَقْتِ الْعَصْرِ، فَيَجْمَعُ بَيْنَهُمَا، وَيُؤَخِّرُ الْمَغْرِبَ حَتَّى يَجْمَعَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ الْعِشَاءِ(١).

---

(٥) تعليق ذكره البخاري في بداية الباب/ ٤ من كتاب تقصير الصلاة قبل الرقم: ١٠٨٦ مباشرة (مترجم).

(٦) مسلم صلاة المسافرين: ١٥٨١. أبو داود. قصر المسافر: ١٢٠١. تحفة الأشراف: ١٦٧١.

(١) بخاري. تقصير الصلاة: ١١٠٧. مسلم. جمع بين الصلاتين: ١٦١٩، ١٦٢٠ ، ١٦٢٥.

ئیبنو عەبباس (خوایان لێ ڕازی بێ) گوتی: یاسای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وابوو، ئەگەر لە سەفەردا بووایە نوێژی نیوەڕۆو عەصری پێکەوە کۆ دەکردەوە، وە نوێژی شێوان و خەوتنانیش پێکەوە کۆ دەکرەوە (ش) گفتەی موسلیم (پڕ گۆڕەکەی لە نوورو ڕەحمەتی خودابێ) ئاوایە: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ئاوا بوو: ئەگەر زوو بچوایە بۆ سەفەرو پەلەی بووایە نوێژی نیوەڕۆی دوا دەخست تا کاتی عەصر، ئەوجا هەر دووکیانی پێکەوە بە جەمعە تەئخیر: بە کۆکردنەوەی دواخراو دەکرد، وە هەروەها شێوانیشی دوا دەخست تا لەگەڵ خەوتناندا پێکەوە کۆی دەکردنەوە.

٨٩٦- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ إِذَا زَاغَتِ الشَّمْسُ قَبْلَ أَنْ يَرْتَحِلَ جَمَعَ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَإِنْ يَرْتَحِلْ قَبْلَ أَنْ تَزِيغَ الشَّمْسُ أَخَّرَ الظُّهْرَ حَتَّى يَنْزِلَ لِلْعَصْرِ، وَفِي الْمَغْرِبِ مِثْلَ ذَلِكَ إِنْ غَابَتِ الشَّمْسُ قَبْلَ أَنْ يَرْتَحِلَ جَمَعَ بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ وَإِنْ يَرْتَحِلْ قَبْلَ أَنْ تَغِيبَ الشَّمْسُ أَخَّرَ الْمَغْرِبَ حَتَّى يَنْزِلَ لِلْعِشَاءِ ثُمَّ جَمَعَ بَيْنَهُمَا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وأحمد والترمذي وحسنه[٢].

موعاذەی کوڕی جەبەل (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە غەزای تەبووکدا عادەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وابوو: ئەگەر لە پێش ئەوەدا کە بکەوێتە ڕێ و دەرچێ بۆ سەفەر خۆر لای بدایەو نێوەڕۆ ببوایە ئەوا نوێژی نیوەڕۆو عەسری کۆ دەکردەوەو بە جەمعە تەقدیم: بە کۆکردنەوەی پێشخراو دەیکردن ئەگەر لە پێش نیوەڕۆشدا بکەو تایەتەڕێ ئەوا نوێژی نیوەڕۆی دوا دەخست هەتا دادەبەزی بۆ نوێژی عەصر ئەو کاتە هەردوو نوێژەکەی پێکەوە بە کۆکردنەوەی دواخراو دەکرد لە شێوانیشا هەروەها: ئەگەر لەپاش ئاوابوونی خۆر بەکەوتایەتە ڕێ نوێژی شێوان و خەوتنانی کۆ دەکردەوە واتە: نوێژی خەوتنانی دەهێنا لەگەڵ نوێژی شێوانا بە جەمع دەیکرد ئەگەر لەپێش ئاوابوونی

(٢) حديث حسن عند الإمام الترمذي.

خۆریشدا بكەوتایەتە رێ نوێژی شێوانی دوا دەخست هەتا دادەبەزی بۆ نوێـژی خـەوتنان، ئـەو كاتـە هـەردوو نوێژەكـەی بـە كۆكردنـە (بـە جـەمع) دەكرد (د/ئەحمەد/ت:ح).

## ١٥٧) شێوان‌و بەیانی كورت ناكرێنەوەو سوننەتە دامەزراوەكانیش (الرواتب) لەسەفەرا ناكرێن

### (لا تقصر المغرب والصبح ولا تصلى الرواتب في السفر)

٨٩٧– عَنِ ابْنُ عُمَرَ (رَضِيَ أَللهُ عَنْهُماَ) قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) إِذَا أَعْجَلَهُ السَّيْرُ. يُؤَخِّرُ الْمَغْرِبَ، فَيُصَلِّيهَا ثَلاَثًا ثُمَّ يُسَلِّمُ، ثُمَّ قَلَّمَا يَلْبَثُ حَتَّى يُقِيمَ الْعِشَاءَ فَيُصَلِّيَهَا رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ يُسَلِّمُ، وَلاَ يُسَبِّحُ بَعْدَ الْعِشَاءِ حَتَّـى يَقُـومَ مِـنْ جَـوْفِ اللَّيْلِ. رَوَاهُ البخاري[1].

ئیبنو عومەر (خوای لێ رازی بێ) گـوتی: لـە سـەفەردا سـەرنجی پێغەمبـەرم دەدا (درودی خودای لەسەربێ) ئەگەر پەلەی رۆیشتنی بوایە نوێـژی شێوانی دوا دەخـست لـە پاشـا سـێ ركـاتی تـەواوی نوێـژی شـێوانی دەكـردو سـڵاوی دەدایەوە ئیتر ئەوەندەی نەدەخایاند كە نوێژی خەوتنانی دادەبەست‌و بە دوو ركـات دەیكـردو سـڵاوی دەدایـەوە، پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەربێ) لەسـەفەردا لەپاش نوێـژی خەوتنانـەوە نوێـژی سـوننەتی نـە دەكـرد هـەتا نیوەشەو هەڵدەسا بۆ شەو نوێژ! (ب).

## ١٥٨) باسی دەوانزەهەم: باسی نوێژە سوننەتەكان، باسی نوێژی هەردوو جەژن

### (الباب الثاني: عشر في الصلوات المسنونة، صلاة العيدين)

{قَالَ: أَللهُ تَعالى – إِنَّا أَعْطَيْنَاكَ الْكَوْثَرَ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ – ١٠٨ – ١ – ٢}.

---

(١) بخاري. تقصير الصلاة: ١١٠٩.

واتــه: خــودای گــەورە دەفــەرموێ: ئێمــە کەوســەرمان دا بــەتۆ، کــە جۆبارێکە لـە بەهەشتدا، دەی نوێژە فەرزەکانت لەکاتی خۆیاندا بۆ خودای خۆت بکە... وە یاخود نوێژی جەژن بکە بۆ خودای خۆت، وە قوربانیی بۆ سەر ببڕە.

## ١٥٩) دەرچوون بۆ نوێژی جەژن‌و کاتی ئەم نوێژە
## الخروج لصلاة العيد ووقتها

٨٩٨- عَنْ عَلِيٍّ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: مِنَ السُّنَّةِ أَنْ تَخْرُجَ إِلَى الْعِيدِ مَاشِيًا وَأَنْ تَأْكُلَ شَيْئًا قَبْلَ أَنْ تَخْرُجَ. رَوَاهُ الترمذي[١].

عەلی (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: وا سوننەتە کە بەپێ بچیت بۆ نوێژی جەژن، وە لەپێش دەرچوونیشدا شتێ بخۆی (ت-س/ح).

٨٩٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا خَرَجَ يَوْمَ الْعِدِ فِي طَرِيقٍ رَجَعَ فِي غَيْرِهِ. رَوَاهُ الترمذي وأَبُو دَاوُدَ والبخاري[٢].

ئــەبو هــورەیرە (خــوای لێ ڕازی بــێ) دەڵــێ: لــە ڕۆژی جەژنــدا عــادەتی پێغەمبــەر (درودی خوای لەسەربێ) وابــوو: کــە دەردەچــوو بــۆ نوێــژی جــەژن لــە ڕێگەیەکەوە دەڕۆی، کــە دەش گەڕایــەوە لــە ڕێگەیــەکی تــرەوە دەگەڕایــەوە (ت/د/ب).

٩٠٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ يَغْدُو يَوْمَ الْفِطْرِ حَتَّى يَأْكُلَ تَمَرَاتٍ وَيَأْكُلُهُنَّ وِتْرًا. رَوَاهُ البخاري واترمذي. وفي رواية: كَانَ لاَ يَخْرُجَ يَوْمَ الْفِطْرِ حَتَّى يَطْعَمَ وَلاَ يَأْكُلُ يَوْمَ الأَضْحَى حَتَّى يُصَلِّيَ[٣].

---

(١) بسند حسن (شرحه).

(٢) بخاري. عيدين: ٩٨٦.

(٣) بخاري. عيدين: ٩٥٣. تجريد البخاري: ٤٩٩.

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) دەڵێ: دەستووری پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا – وابوو هەتا چەند دەنكێ خورمای تاكی نەخواردایە نە دەچوو بۆ نوێژی جەژن (ب/ت) لە گێڕانەوەیەكا: لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا تا نانی نەخواردایە نەدەچوو بۆ نوێژی جەژن، لە ڕۆژی جەژنی قوربانیشا تا نوێژی جەژنی نەكردایە نانی نەدەخوارد.

٩٠١– عَنِ الْبَرَاءِ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ أَضْحَى إِلَى الْبَقِيعِ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْنَا بِوَجْهِهِ وَقَالَ: إِنَّ أَوَّلَ نُسُكِنَا فِي يَوْمِنَا هَذَا أَنْ نَبْدَأَ بِالصَّلاَةِ ، ثُمَّ نَرْجِعَ فَنَنْحَرَ. رَوَاهُ البخاري والنسائي[٤].

بەراء (خوای لێ رازی بێ) گوتی: بۆ نوێژی جەژنی قوربان پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەرچوو بۆ دەرەوەی شارو ڕۆیشت بۆ بەقیع كە گۆڕستانی شاری مەدینەیە لەوێ دوو ركات نوێژی جەژنی كرد، لە پاشان رووی كردە ئێمەو فەرمووی: یەكەم طاعەتی دامەزراوی ئێمە – لەم ڕۆژەماندا – ئەوەیە كە لە پێشدا نوێژی جەژن بكەن، ئینجا بگەڕێینەوەو قوربانی سەر ببڕین (ب/ن).

٩٠٢– وَقَالَ: أَبُو هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) أَصَابَهُمْ مَطَرٌ فِي يَوْمِ عِيدٍ فَصَلَّى بِهِمُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَلاَةَ الْعِيدِ فِي الْمَسْجِدِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والحاكم.

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ لە ڕۆژی جەژنا باران بوو، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) نوێژی جەژنی لەناو مزگەوتا بۆ كردین (د/حاكم).

٩٠٣– عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (رَضيَ اللّهُ عَنهَا) قَالَتْ: أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الْفِطْرِ وَالأَضْحَى أَنْ نُخْرِجَ الْعَوَاتِقَ وَالْحُيَّضَ وَذَوَاتِ الْخُدُورِ، وَلَكِنَّ الْحُيَّضُ يَعْتَزِلْنَ الصَّلاَةَ وَيَشْهَدْنَ الْخَيْرَ وَدَعْوَةَ الْمُسْلِمِينَ. قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِحْدَانَا لاَ يَكُونُ لَهَا جِلْبَابٌ قَالَ: لِتُلْبِسْهَا أُخْتُهَا مِنْ جِلْبَابِهَا. رَوَاهُ الخمسة[٦].

---

(٤) بخاري. عيدين: ٩٥١ ، ٩٥٥ ، ٩٦٨ ، ٩٧٦ ، ٩٨٣ ، ٥٥٤٥ ، ٥٥٥٦ ، ٥٥٥٧ ، ٥٥٦٠ ، ٥٥٦٣ ، ٦٦٧٣.

(٦) بخاري. عيدين: ٩٧٤. مسلم. عيدين: ٢٠٥١ – ٢٠٥٣. أبو داود. صلاة: ١١٣٦ و ١١٣٧. نسائي. عيدين: ١٥٥٨.

ئوممو عەطییە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە رۆژی جەژنی رەمەزان و قوربانا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمانی پێ دەکردین: کە گەورە کچ و ئافرەتی بێنوێژو کەیبانۆی ناومالْ لەگەلْ خۆمان ببەین بۆ ئەو دەشتە بۆ نوێژی جەژن، بەلاّم ئافرەتە بێنوێژەکان نوێژەکە ناکەن، تەنیا حازری کۆڕی پڕ فەڕو نزای کۆمەلّی موسولْمانان دەبن، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر وارێکەوت یەکێکمان چارشێوی نەبوو ئایا بەبێ چارشێویش هەر بێ بۆ نوێژگاکە بۆ دەرەوەی شار یانا؟ فەرمووی: با لەخوشکێکی موسولْمانی چارشێوێ بخوازێ (ش/ت/ن).

٩٠٤- عَنْ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ بُسْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: كُنَّا قَدْ فَرَغْنَا فِي هَذِهِ السَّاعَةِ، وَذَلِكَ حِينَ التَّسْبِيحِ. رَوَاهُ البخاري وأَبُو دَاوُدَ ولفظه: خَرَجَ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ بُسْرٍ صَاحِبُ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَعَ النَّاسِ فِي يَوْمِ عِيدٍ فَأَنْكَرَ إِبْطَاءَ الإِمَامِ وَقَالَ: إِنَّا كُنَّا فَرَغْنَا سَاعَتَنَا هَذِهِ وَذَلِكَ حِينَ التَّسْبِيحِ[٧].

عەبدوللاّی کوڕی بوسر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە سەردەمی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەربێ) ئەم حەلە لە نوێژی جەژن دەبووینەوە، واتە: ئەو کاتە کە نوێژی سوننەت دەبێ و کاتی کەراهەتی نامێنێ (ب/د) گفتەی ئەبو داوود (خوای لێ رازی بێ) ئاوایە: عەبدوللاّی کوڕی بوسر کە هاوڕێی پێغەمبەر بوو (درودی خوای لەسەربێ) لە رۆژی جەژندا لەگەلْ خەلْکەکەدا دەرکەوتن بۆ نوێژی جەژن عەبدوللاّ دەرەنگهاتنی پێشنوێژی پەسەند نەکردو گوتی: جاران ئێمە ئەم حەلە لە نوێژ دەبووینەوە، واتە: ئەو کاتە کە خۆر بەقەد رمێ بەرز دەبێتەوەو کاتی کردنی نوێژی سوننەت دەبێ و ئیتر کەراهەتی نامێنێ.

(٧) تعليق ذكره البخاري في بداية الباب الرقم: ١٠ من كتاب العيدين، قبل الرقم: ٩٩٨ مباشرة (مترجم).

## ١٦٠) نوێژی جەژنو وتاری نوێژی جەژن: (صلاة العيد والخطبة)

**٩٠٥-** عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْعِيدَيْنِ غَيْرَ مَرَّةٍ وَلاَ مَرَّتَيْنِ بِغَيْرِ أَذَانٍ وَلاَ إِقَامَةٍ رواه الأربعة[1].

**جابیری کوڕی سوموورە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: نەك جارو دووجار بەڵکوو جارەها نوێژی هەردوو جەژنەکانم کردووە لەگەڵ پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خوای لەسەربێ) بەبێ بانگو قامەت (ش/د/ت).**

**٩٠٦-** عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) يُصَلُّونَ الْعِيدَيْنِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ[2].

**ئیبنو عومەر (خوایان لێ ڕازی بێ) گوتی: جاران پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ئەبو بەکرو عومەر (خوایان لێ ڕازی بێ) لەپێش خوێندنەوەی وتار (خوتبە)دا نوێژی هەردو جەژنەکەیان دەکرد (ش/د/ت/ن).**

**٩٠٧-** عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ الْفِطْرِ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ لَمْ يُصَلِّ قَبْلَهَا وَلاَ بَعْدَهَا. رَوَاهُمَا الخمسة[3].

**ئیبنو عەبباس (خوایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ڕۆژی جەژن، بۆ نوێژی جەژن، لە شارچووە دەرەوە، لەو دەشتە دووڕکات نوێژی جەژنی کرد، نە لە پێشیەوەو نە لە پاشیەوە نوێژی تری نەکرد (ش/د/ت/ن).**

**٩٠٨-** ➡ (ب - ١ ز - ١٤٨ بڕ: ژمارە: ٨٥١)[4].

---

(١) بخاري. عيدين: ٩٦٠ ، ٩٥٩. مسلم. عيدين: ٢٠٤٤ - ٢٠٤٨. أبو داود. صلاة: ١٠٧٢ ، ١١٤٨. ترمذي صلاة: ٥٣٢. تحفة الأشراف: ٢١٦٦.

(٢) بخاري. عيدين: ٩٦٢ ، ٩٦٣ مسلم. عيدين: ٢٠٤٩. نسائي. عيدين: ١٥٦٣. ترمذي. صلاة: ٥٣١.

(٣) بخاري. عيدين: ٩٦٤ ، ٩٨٩ ، ١٤٣١ ، ٥٨٨١. مسلم. عيدين: ٢٠٥٤. أبو داود. صلاة: ١١٥٩. ترمذي. صلاة: ٥٣٧. نسائي. عيدين: ١٥٨٦

(٤) انظر رقم: ٨٥١ (تقدم).

٩٠٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ أللهُ عَنها) اَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يُكَبِّرُ فِي الْفِطْرِ وَالأَضْحَى فِي الأُولَى سَبْعَ تَكْبِيرَاتٍ وَفِي الثَّانِيَةِ خَمْسًا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَأَحمد والترمذي ولفظه: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُكَبِّرَ فِي الْعِيدَيْنِ فِي الأُولَى سَبْعًا قَبْلَ الْقِرَاءَةِ وَفِي الآخِرَةِ خَمْسًا قَبْلَ الْقِرَاءَةِ(٥).

**عائیشە** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **هەمیشە لە رکاتی یەکەمی نوێژی جەژنی رەمەزان و نوێژی جەژنی قوربانا حەوت ئەڵڵاهو ئەکبەری دەکرد، وە لە رکاتی دوومیانا پێنج ئەڵڵاهو ئەکبەری دەکرد (د/ئەحمەد/ت-سند حسن) گفتەی (ت):جاران پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **لە رکاتی یەکەمی هەردوو جەژنەکانا لە پێش قورئانخوێندندا حەوت جار ئەڵڵاهو ئەکبەری دەکرد، وە لە رکاتی دووهەمیانا لە پێش قورئانخوێندندا پێنج جار ئەڵڵاهو ئەکبەری دەکرد.**

٩١٠- وَسَأَلَ عُمَرَ بْنُ الْخَطَّابِ أَبَا وَاقِدٍ اللَّيْثِيَّ مَا كَانَ يَقْرَأُ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الأَضْحَى وَالْفِطْرِ فَقَالَ: كَانَ يَقْرَأُ فِيهِمَا بِ (ق وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ) وَ (اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ). رَوَاهُ الخمسة إلاَّ البخاري(٦).

**عومەری کوڕی خەتاب** (خوایان لێ رازی بێ) **لە ئەبو واقیدی لەیثیی پرسی، گوتی: جاران پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **کام سوورەتانەی دەخوێند لە نوێژی جەژنی قوربان و جەژنی رەمەزانا؟ گوتی: لە رکاتی یەکەمیاندا سوورەتی {ق وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ}ی دەخوێند، وە لە رکاتی دووهەمیاندا سوورەتی {اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ}ی دەخوێند** (م/د/ت/ن).

٩١١- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: شَهِدْتُ الصيد مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَبَدَأَ بِالصَّلاَةِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ بِغَيْرِ أَذَانٍ وَلاَ إِقَامَةٍ، ثُمَّ قَامَ مُتَوَكِّئًا عَلَى بِلاَلٍ فَأَمَرَ بِتَقْوَى اللَّهِ وَحَثَّ عَلَى طَاعَتِهِ وَوَعَظَ النَّاسَ وَذَكَّرَهُمْ ثُمَّ مَضَى حَتَّى أَتَى النِّسَاءَ

---

(٥) بسند حسن (شرحه).

(٦) مسلم. عيدين: ٢٠٥٦ ، ٢٠٥٧. أبو داود. صلاة: ١١٥٤. ترمذي. صلاة: ٥٣٤ و ٥٣٥. نسائي. عيدين: ١٥٦٦. ابن ماجه. إقامة الصلاة: ١٢٨٢.

فَوَعَظَهُنَّ وَذَكَّرَهُنَّ فَقَالَ: تَصَدَّقْنَ فَإِنَّ أَكْثَرَكُنَّ حَطَبُ جَهَنَّمَ، فَقَامَتِ امْرَأَةٌ مِنْ سِطَةِ النِّسَاءِ سَفْعَاءُ الْخَدَّيْنِ فَقَالَتْ: لِمَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: لأَنَّكُنَّ تُكْثِرْنَ الشَّكَاةَ وَتَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ. قَالَ: فَجَعَلْنَ يَتَصَدَّقْنَ مِنْ حُلِيِّهِنَّ يُلْقِينَ فِي ثَوْبِ بِلاَلٍ مِنْ أَقْرِطَتِهِنَّ وَخَوَاتِمِهِنَّ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ الترمذي[٧].

جابیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە خزمەتی حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) ئامادەی نوێژی جەژن بووم، بەبێ بانگو قامەت لە پێش وتاردا دەستی کرد بە نوێژ، لە پاشان هەڵسایە سەرپێ و خۆی دا بە سەرشانی بیلالداو وتارێکی داو فەرمانی پێ کردین بە تەقوای خودا، وە هانی داین لەسەر طاعەتو فەرمانبەریی خودا، وە پەندو ئامۆژگاری مەردوومەکەی کردو لەم بارەیەوە ئاگاداری کردنەوە، ئینجا چوو بۆلای ژنەکانو پەندو ئامۆژگاری ئەوانیشی کردو هۆشیاری کردنەوە فەرمووی: ئەی ژنگەل! خێرو خێرات زۆر بکەن چونکە زوربەتان گزرەداری سووتەمەنی دۆزەخن! جا ژنێکی فرە باشی سەرگۆنا ئاڵ هەستا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە لەبەرچی؟ فەرمووی: لەبەر ئەوە کە ئێوە زۆر دەم بە هاوارنو بە هەقو ناهەق هەر سکاڵا دەکەنو سپڵەیی لەگەڵ مێرددا دەکەنو چاکەی ئەوتان لەبەر چاونیە گوتی: جا ژنەکان دەستیان کرد بە خێرکردن، ئیتر خشڵو گوارەو ئەنگوستیلەی خۆیان دەکرد بە خێرو هەڵیان دەدانە ناو کۆشی بیلالەوە! (ش/د/ن).

### ١٦١) ئەگەر لە رۆژی سیی رەمەزاندا دیتنی مانگی نوێی شەشەڵان ساغ بۆوە رۆژوو دەشکێننو بۆ سبەینێ دەرۆن بۆ نوێژی جەژن:
### (لو ثبت الهلال يوم الثلاثين من رمضان أفطروا وخرجوا في الغد لصلاة العيد)

٩١٢- عَنْ أَبِي عُمَيْرِ بْنِ أَنَسٍ عَنْ عُمُومَةٍ لَهُ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّ رَكْبًا جَاءُوا إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَشْهَدُونَ أَنَّهُمْ رَأَوُا

---

(٧) بخاري. حيض: ٣٠٤ ، ٩٥٦ ، ١٤٦٢ ، ١٩٥١ ، ٢٦٥٨. مسلم. إيمان: ٢٣٨ ، ٢٣٩ ، ٢٠٥٠. نسائي. عيدين: ١٥٧٥ و ١٥٧٨. ابن ماجه. إقامة الصلاة: ١٢٨٨.

الْهِلاَلَ بِالأَمْسِ فَأَمَرَهُمْ أَنْ يُفْطِرُوا وَإِذَا أَصْبَحُوا أَنْ يَغْدُوا إِلَى مُصَلاَّهُمْ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي وأحمد(١).

**ئەبو عومەیری کوڕی ئەنەس گوتی: مامەکانم کە لە هاوڕێیانی پێغەمبەر بوون** (دروودی خوای لەسەربێ) **گوتیان: کاروانێ هاتنە خزمەتی حەزرەت** (دروودی خوای لەسەربێ) **شایەتیان دا گوتیان: دوێنێ ئێوارێ مانگمان دیوە، پێغەمبەریش** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمانی دا بە موسوڵمانان کە ڕۆژوو بشکێنن و بۆ سبەینێ بەیانی دەرچن و بچن بۆ نوێژگاکەیان تا لەوێ نوێژی جەژن بکەن (د/ن- ئەحمەد-س/ص).**

## ١٦٢) لە جەژنا خۆ جوانکردن و خۆ ڕازاندنەوە پەسەندە

## (ینبغی التجمل في العید)

٩١٣- عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رَضيَ اللّهُ عَنْهُمَا) قَالَ: أَخَذَ عُمَرُ جُبَّةً مِنْ إِسْتَبْرَق تُبَاعُ فِي السُّوق فَأَخَذَهَا، فَأَتَى بِهَا رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللّهِ، ابْتَعْ هَذِهِ، الْحُلَّةَ فَتَجَمَّلْ بِهَا لِلْعِيدِ وَلِلْوُفُودِ، فَقَالَ: لَهُ رَسُولُ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) إِنَّمَا هَذِهِ لِبَاسُ مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ، فَلَبِثَ عُمَر مَا شَاءَ اللّهُ أنْ يَلْبَثَ ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) بِجُبَّةِ دِيبَاجٍ، فَأَقْبَلَ بِهَا عُمَرُ إِلَىَ رَسُولَ اللّهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللّهِ، إِنَّكَ قُلْتَ إِنَّمَا هَذِهِ لِبَاسُ مَنْ لاَ خَلاَقَ لَهُ،وَأَرْسَلْتَ إِلَيَّ بِهَذِهِ الْجُبَّةِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلّمَ): تَبِيعُهَا وَتُصِيبُ بِهَا حَاجَتِكَ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ الترمذي(١).

**ئیبنو عومەر** (خوایان لێ ڕازی بێ) **گوتی: جبەیەکی ئاوریشمیان لە بازاڕ دەفرۆشت عومەریش کڕی و هێنای بۆ پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **و عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە بکڕە، وە بۆ جەژن و بۆ پێشوازی وەفد (بۆ**

---

(١) بسند صحيح (شرحه).

(١) بخاري. جمعة: ٨٨٦ ، ٩٤٨ ، ٢١٠٤ ، ٢٦١٢ ، ٢٦١٩ ، ٣٠٥٤ ، ٥٨٤١ ، ٥٩٨١ ، ٦٠٨١. مسلم. لباس: ٢٣٦٨ ، ٥٣٧٥. أبو داود. صلاة: ١٠٧٦. نسائي. جمعة: ١٣٨١.

جـوانی و پۆشــتەیی) لەبــەری بكــە، پێغەمبــەریش (دروودی خـوای لەســەربێ) پێــی فەرموو: ئەمە بەرگی ئەو كەسانەیە كە بەش‌و بارەیان بە رەحمەتی خواوە نیەو بەشیان بە بەهەشتەوە نیە. جا چەندەی خوا حەزكا ئەوندەی پێ چوو، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) جبەیەكی ئاوریشمنی نارد بۆ عومەر، عومەریش جبەكەی هێنایەوە بۆ لای پێغەمبەرو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ خۆت ئەوجارە نەتفەرموو: ئەمە بەرگی ئەو كەسانەیە كە بەش‌و بارەیان نیە لە بەهەشتا كەچی ئێستا تۆ خۆت ئەم جبەیەت بۆ من ناردووە؟ پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) پێی فەرموو: بیفرۆشەو بە پارەكەی كارێكی خۆتی پێ جێبەجێ بكە، خۆ مەرج نیە كە هەر لەبەری بكەی (ش/د/ن).

٩١٤- عَنْ أَبِي رِمْثَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَخْطُبُ وَعَلَيْهِ بُرْدَانِ أَخْضَرَانِ. رَوَاهُ النسائي[٢].

ئەبو رەمثە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەرم دی (دروودی خوای لەسەربێ) خوتبەی دەدا، لەوكاتەدا دوو باڵا پۆشی سەوزی لەبەرا بوو! (ن).

## ١٦٣) لە جەژنا یاری‌و شادی‌و وازی رەوا دروستە
### (يجوز في العيد اللهو المباح)

٩١٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: دَخَلَ أَبُو بَكْرٍ وَعِنْدِي جَارِيَتَانِ مِنْ جَوَارِي الأَنْصَارِ تُغَنِّيَانِ بِمَا تَقَاوَلَتِ الأَنْصَارُ يَوْمَ بُعَاثَ، قَالَتْ: وَلَيْسَتَا بِمُغَنِّيَتَيْنِ، فَقَالَ: أَبُو بَكْرٍ: أَمَزَامِيرُ الشَّيْطَانِ فِي بَيْتِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟!! وَذَلِكَ فِي يَوْمِ عِيدٍ. فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَا أَبَا بَكْرٍ إِنَّ لِكُلِّ قَوْمٍ عِيدًا، وَهَذَا عِيدُنَا. وَفِي رِوَايَةٍ: أَنَّ أَبَا بَكْرٍ دَخَلَ عَلَيْهَا وَعِنْدَهَا جَارِيَتَانِ فِي أَيَّامِ مِنًى تُغَنِّيَانِ وَتَضْرِبَانِ وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُسَجًّى بِثَوْبِهِ فَانْتَهَرَهُمَا أَبُو بَكْرٍ، فَكَشَفَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْهُ وَقَالَ: دَعْهُمَا يَا أَبَا بَكْرٍ فَإِنَّهَا أَيَّامُ عِيدٍ[١].

---

(٢) سكت عنه.

(١) بخاري. عيدين: ٩٥٢. مسلم. عيدين: ٢٠٥٨.

**عائیشە** (خوای لێ رازی بێ) **دەڵێ: رۆژی جەژن بوو، دوو کەنیشکم لەلا بوون لە یاریدە دەران بوون، ئەو گۆرانییانەیان دەگوت کە کاتی خۆی یاریدەدەران هەڵیان دابوون بەسەر هەراکەی رۆژەکەی بوعاثدا عائیشە گوتی: بەڵام ئەو دوو کچە گۆرانی بێژ نەبوون، جا لەم کاتەدا ئەبو بەکر هاتە ژوورەوەو ئەم حاڵەی دی‌و گوتی: هەی هەی! بلوێرو بالۆرەی شەیتان‌و ماڵی پێغەمبەریان نەگوتووە، ئەمە چییە؟! پێغەمبەریش** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: ئەی ئەبو بەکر! وازیان لێ بێنە، چونکە هەموو گەلێ جەژنێکیان هەیەو ئەمەش جەژنی ئێمەیەو گۆرانی‌و شادی‌و خۆشی کردن لە وێنەی ئەمرۆژەدا قەیدی نیە، بەمەرجێ سەر نەکێشێ بۆ بێ شەرعی‌و ناڕەوایی. لە گێڕانەوەیەکدا: لە رۆژەکانی مینادا دوو کەنیشکم لەلا بوو، گۆرانییان دەگوت‌و دەفیان لێ دەدا، پێغەمبەریش** (دروودی خوای لەسەربێ) **پشتی لە ئێمە کردبوو وە خۆی بە جلەکەی داپۆشیبوو، جا لەم کاتەدا ئەبو بەکر هات بەسەرماناو بە کچەکانا هەڵشاخاو لێیان تووڕە بوو، پێغەمبەریش** (دروودی خوای لەسەربێ) **سەری خۆی لاداو فەرمووی: ئەی ئەبو بەکر! وازیان لێ بێنە، چونکە ئەم سێ رۆژەیش هەر بە جەژن حلێبن! (ش/ن).**

**٩١٦- وَعَنْهاَ قَالَتْ: كَانَ يَوْمَ عِيدٍ يَلْعَبُ السُّودَانُ بِالدَّرَقِ وَالْحِرَابِ فَإِمَّا سَأَلْتُ النَّبِيَّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **وَإِمَّا قَالَ: تَشْتَهِينَ تَنْظُرِينَ؟ فَقُلْتُ نَعَمْ. فَأَقَامَنِي وَرَاءَهُ، خَدِّى عَلَى خَدِّهِ وَهُوَ يَقُولُ: دُونَكُمْ يَا بَنِي أَرْفِدَةَ، حَتَّى إِذَا مَلِلْتُ قَالَ: حَسْبُكِ، قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: فَاذْهَبِي. وَفِي رَوَايَةٍ:جَاءَ حَبَشٌ يَزْفِنُونَ فِي يَوْمِ عِيدٍ فِي الْمَسْجِدِ فَدَعَانِي النَّبِيَّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **فَوَضَعَتُ رَأْسِي عَلَى مَنْكِبِهِ فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ إِلَى لَعِبِهِمْ حَتَّى كُنْتُ أَنَا الَّتِي انْصَرَفْتُ عَنِ النَّظَرِ إِلَيْهِمْ. رَوَاهُماَ الشيخان والنسائي**[٢].

**دیسان عائیشە** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: کات رۆژی جەژن بوو، حەبەشییەکان بە قەڵغان‌و نێزە یارییان دەکرد، یا خۆم داوام لە پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **کرد یاخود خۆی فەرمووی: حەزدەکەی تەماشا بکەی؟ منیش گوتم: بەڵێ، جا**

(٢) بخاري. عيدين ٩٤٩ ، ٩٥٠ ، ٢٩٠٦. مسلم. عيدين: ٢٠٦٢ – ٢٠٦٦.

منـی لـە پـشتی خۆیـەوە وەسـتان و چـەناگەم نایـە سەرشـانی و رووەمـەتم نـا بـە رووەمـەتیـەوە، جـا حـەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) فـەرمووی: ئـەی نـەوەی ئـەرفیـدە! خـەریکی یـاریی خۆتـان بـن ئـیتر منـیش تەماشـام كـرد تـا خـۆم تاقـەتم نـەما، حـەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) فـەرمووی: ئـیتر بەسـتە؟ گـوتم: بـەڵێ، فـەرمووی: دەبـڕۆ. لـە گێڕانەوەیـەكدا: جاریێکیـان رۆژی جـەژن بـوو، حەبەشـییەكان هـاتن بـۆ مزگەوت دەستیان كرد بە نێرەبازی، پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەربێ) بـانگی كـردم و سەرم لە سەرشانی داناو دەستم كرد بە تەماشاكردنی یارییەكەیان تـا خـۆم وازم هێنا لە تەماشاكردنیان (ش/ن).

٩١٧- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَدِينَـةَ وَلَهُمْ يَوْمَانِ يَلْعَبُونَ فِيهِمَا فَقَالَ: مَا هَذَانِ الْيَوْمَانِ؟ قَالُوا: كُنَّا نَلْعَبُ فِي الْجَاهِلِيَّـةِ. فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَبْدَلَكُمْ بِهِمَا خَيْرًا مِنْهُمَا يَوْمَ الأَضْحَى وَيَوْمَ الْفِطْرِ. رَوَاهُ أصحاب السنن[٣].

ئەنـەس (خوای لێ رازی بێ) گـوتی: كـە پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەربێ) هـات بـۆ مەدینـە، خـەڵكی مەدینـە دوو رۆژیـان هـەبوو، یـاری و وازییـان تیـا دەكـردن، فەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ): ئەم دوو رۆژە چین؟ گوتیان: جاران لە سـەردەمی نەزانیـدا لـەپێش هـاتنی ئیـسلامدا گەمـەو یاریمـان تیـا دەكـردن، فـەرمووی: خـودا لـە جیـاتی ئـەو دووانـە چـەن رۆژێكـی چاكتری پـێ داون، كـە جـەژنی قوربان و جەژنی رەمەزانە (د/ت/ن-سنـد صالح).

## ١٦٤) نوێژی خۆرگیران و مانگ گیران: (صلاة الكسوف)

٩١٨- عَنْ الْمُغِيرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ) قَالَ: انْكَسَفَتْ الشَّمْسُ يَوْمَ مَاتَ إِبْـرَاهِيمَ. فَقَالَ: النَّاسُ: انْكَسَفَتْ لِمَوْتِ إِبْرَاهِيمَ، فَقَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنَّ الـشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، لاَ يَنْكَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ، فَـإِذَا رَأَيْتُمُوهُمَـا فَادْعُوا اللَّهَ وَصَلُّوا حَتَّى تَنْجَلِيَ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ الترمـذي. وَفِي رِوَايَـةٍ: إِنَّ أَهْـلَ

---

(٣) بسند صالح (شرحه).

الْجَاهِلِيَّةِ كَانُوا يَقُولُونَ إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لاَ يَنْخَسِفَانِ إِلاَّ لِمَوْتِ عَظِيمٍ مِنْ عُظَمَاءِ أَهْلِ الأَرْضِ، وَإِنَّهُمَا لاَ يَنْخَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ وَلَكِنَّهُمَا خَلِيقَتَانِ مِنْ خَلْقِهِ، يُحْدِثُ اللَّهُ فِي خَلْقِهِ مَا يَشَاءُ، فَأَيُّهُمَا انْخَسَفَ فَصَلُّوا حَتَّى يَنْجَلِيَ»[1].

موغیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: ئەو رۆژەی کە ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) مرد، رۆژگیرا، خەڵك گوتیان: ئەوە لەبەر مردنی ئیبراهیم خۆرگیراوە! پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: خۆرو مانگ دوو نیشانەی گەورەن لە نیشانە گەورەکانی خودا، نە لەبەر مردنی کەس و نە لەبەر ژیانی کەس ناگیرێن، ئەگەر دیتانن کە واگیراون ئەوا لە خودا بپاڕێنەوەو دووعاو نزا بکەن تا بەر دەبن! (ش/د/ن) لە گێڕانەوەیەکدا: خەڵکی سەردەمی نەزانی دەیانگوت گوایە خۆرو مانگ لەبەر مردنی گەورە پیاوێ لە گەورەپیاوانی سەر رووی زەوی دەگیرێن! بەڵام ئەم قسەیە راست نیە، چونکە ئەم دووانە نە لەبەر مردنی کەس و نە لەبەر ژیانی کەس ناگیرێن، بەڵکوو ئەمانیش دوو دروستکراون لە دروستکراوانی خودا، خوداش هەرچی حەزکا دەیکا لە مەخلوقاتی خۆی، جا هەر کامێکیان گیران ئێوە نوێژبکەن هەتا بەردەبێ.

### ١٦٥) بانگەواز بۆ ئەم نوێژە: (النداء لها)

٩١٩- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَمْرٍو (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: لَمَّا كَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نُودِيَ إِنَّ الصَّلاَةَ جَامِعَةً. رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ الترمذي[1].

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: لە سەردەمی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەربێ) کە خۆر گیرا بانگەوازیان هەڵدا: (الصَّلاَةَ جَامِعَةً: وا نوێژی جەماعەت دەکرێ بە بۆنەی خۆرگیرانەوە لە دەستی مەدەن!) (ش/د/ن).

---

(١) بخاري. علم: ٨٦ ، ١٨٤ ، ٩٢٢ ، ١٠٥٣ ، ١٠٥٤ ، ١٠٦١ ، ١٢٣٥ ، ١٣٧٣ ، ٢٥١٩ ، ٢٥٢٠ ، ٧٢٨٧ (١٠٥٣). مسلم. كسوف: ٢١٠٠. رواه البخاري تعليقا في الباب الرقم: ١٣ من كتاب الكسوف.

(١) بخاري. كسوف: ١٠٦٦. مسلم. كسوف: ٢٠٨٩. نسائي. كسوف: ١٤٦٤، ١٤٧٢. بخاري. كسوف: ١٠٤٥، ١٠٦٠.

## ١٦٦) نوێژی خۆرگیران‌و مانگ گیران چەن جۆرێكی هەیە:
## (أنواع صلاة الكسوف)

٩٢٠- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَانْكَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَقَامَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَجُرُّ رِدَاءَهُ حَتَّى دَخَلَ الْمَسْجِدَ، فَدَخَلْنَا فَصَلَّى بِنَا رَكْعَتَيْنِ، حَتَّى انْجَلَتِ الشَّمْسُ رَوَاهُ البخاري والنسائي[١].

ئەبو بەكرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە خزمەتی حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) بوین لەو كاتەدا خۆر گیرا، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) هەڵسا بە پەلە چوو بۆ مزگەوت‌و ئێمەش لەگەڵی دا چووین بۆ ئەوێ، جا لەناو مزگەوتەكەدا دوو ركات نوێژی بۆ كردین تا خۆرەكە بەربوو (ب/ن).

٩٢١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: خَسَفَتِ الشَّمْسُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَصَلَّى بِالنَّاسِ، فَأَطَالَ الْقِيَامَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ قَامَ فَأَطَالَ الْقِيَامَ وَهُوَ دُونَ الْقِيَامِ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، وَهُوَ دُونَ الرُّكُوعِ الأَوَّلِ، ثُمَّ سَجَدَ فَأَطَالَ السُّجُودَ (كَالرُكعِ الأَوَّلْ كَالأَوَّلِ وَالثَّانِي كَالثَّانِي- شرحه)، ثُمَّ فَعَلَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ مِثْلَ مَا فَعَلَ فِي الرُكْعة الأُولَى، ثُمَّ انْصَرَفَ وَقَدِ انْجَلَتِ الشَّمْسُ، فَخَطَبَ النَّاسَ، فَحَمِدَ اللَّهَ، وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ: إِنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَانِ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ، لاَ يَنْخَسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَادْعُوا اللَّهَ وَكَبِّرُوا، وَصَلُّوا وَتَصَدَّقُوا ثُمَّ قَالَ: يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، وَاللَّهِ مَا مِنْ أَحَدٍ أَغْيَرُ مِنَ اللَّهِ أَنْ يَزْنِيَ عَبْدُهُ أَوْ تَزْنِيَ أَمَتُهُ، يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، وَاللَّهِ لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلاً وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا. رَوَاهُ الخمسة. وَفِي رِوَايَةٍ: ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَقَالَ: سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ رَبَّنَا وَلَكَ الْحَمْدُ[٢].

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە سەردەمی حەزرەتدا (دروودی خوای لەسەربێ) رۆژ گیرا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) هەڵسا نوێژی بۆ موسوڵمانەكان كرد،

(١) بخاري. كسوف: ١٠٦٣.

(٢) بخاري. كسوف: ١٠٤٤ ، ١٠٤٦ ، ١٠٤٧ ، ١٠٥٠ ، ١٠٥٦ ، ١٠٥٨ ، ١٠٦٤ ، ١٠٦٥ ، ١٠٦٦ ، ١٢١٢ ، ٣٢٠٣ ، ٤٦٢٤ ، ٥٢٢١ ، ٦٦٣١. مسلم. كسوف: ٢٠٨٦ - ٢٠٨٨. نسائي. كسوف: ١٤٧٣ ، ١٤٧١. أبو داود. صلاة: ١١٨٠.

ماوەیەكی دوورو درێژ لە ناو نوێژەكەدا بەراوەستانەوە هەر قورئانی دەخوێند، ئینجا چەمییەوەو روكووعی بردو درێژەی دا بە چەمینەوەكەشی، ئینجا لە چەمینەوەو روكوع هەڵسایەوەو گەلێ بەپێوە راوەستایەوە بەڵام لە راوەستانی یەكەمی كەمتر، ئینجا دووبارە روكووعێكی دوورو درێژی تریشی بردەوە بەڵام لە روكووعی یەكەمی كورتتر، ئینجا دوو كڕنووشی دوورو درێژی برد لە چەشنی دوو روكووعەكەی، یەكەم وەك یەكەمو دووەم وەك دووەم، ئینجا چی كرد لە ركاتی یەكەمدا لە دوو هەمیشدا ئەوەی كردەوە، ئەوجا لە نوێژ بۆوەو خۆریش بەربوو بوو، ئینجا وتارێكیدا بۆ مەردوومەكەو سوپاس و ستایشی خودای كردو فەرمووی: ئەم خۆرو مانگە دوو نیشانەی گەورەن لە نیشانە گەورەكانی خودا، نە لەبەر مردنی كەس و نە لەبەر ژیانی كەس ناگیرێن، جا ئەگەر شتی واتان دی ئەوا لە خودا بپاڕێنەوەو ئەڵلاهو ئەكبەر بكەن و نوێژبكەن و خێرو خێرات بكەن لە پاشا فەرمووی: (درودی خوای لەسەربێ) ئەی ئۆمەتی موحەممەد! سوێندم بەخودا كەس وەك خودا ئاوا خیرەت و دەمار نایگرێ، كاتێ كە بەندەیەكی زینا بكا، یا كەنیزێكی زینابكا، ئەی گەلی موحممەد! بەو خودایە ئەوەی كەمن دەیزانم ئەگەر ئێوە بیزانن زۆر كەم پێ دەكەنین و گەلێ زۆر دەگریان (ش/د/ت/ن) لە گێڕانەوەیەكا: ئینجا سەری لە روكووع هەڵبڕی و فەرمووی: (سمع الله لمن حمده ربنا ولك الحمد) هەركەسێ سوپاسی خودا بكا بە نیازی پاداشی باش، خودا هەم سوپاس و هەم نیازەكەی قەبووڵ دەكا، پەروەردگارا! خوداوەندا! سوپاس بۆ تۆ لەسەر ئەوە كە سوپاس و نیازمان گیرا دەكەی!.

٩٢٢- وَعَنْهاَ أَنَّ نَبِيَّ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَلَّى سِتَّ رَكَعَاتٍ وَأَرْبَعَ سَجَدَاتٍ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وأَحمد وأَبُو دَاوُدَ والترمذي ولفظه: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي كُسُوفٍ، فَقَرَأَ ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ قَرَأَ ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ قَرَأَ ثُمَّ رَكَعَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ وَالأُخْرَى مِثْلُهَا[٣].

---

(٣) مسلم. كسوف: ٢٠٩٤. نسائي. كسوف: ١٤٧٠.

دیسان عائیشە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەری خودا (درودی خوای لەسەربێ) جـارێ لـە نوێـژی ڕۆژگیرانـا شـەش ڕوکـووعو چـوار کوڕنووشـی بـرد (م/ئەحمەد/د/ت) گفتەی (ت) ئاوایە: ئیبنو عەبباس (خوایان لێ ڕازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نوێژی خۆرگیرانی بەم شێوەیە کرد: جاری یەکەم قورئانی خوێندو ڕوکووعی برد، ئینجا بۆ جاری دووەم قورئانی خوێندەوەو ڕوکووعی بردەوە، ئینجا بۆ جاری سێیەم قورئانی خوێندەوەو ڕوکووعی بردەوە، لە پاش ئەم سێ جارە ئەوجا دوو کوڕنووشی بردو ڕکاتی یەکەمی لەسەر ئەم شێوەیە تەواوکرد، وە لە ڕکاتی دووەمیشدا هەمان شتی کرد.

٩٢٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُما) قَالَ: صَلَّى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي كُسُوفٍ قَرَأَ ثُمَّ رَكَعَ ثُمَّ قَرَأَ ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ قَرَأَ ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ قَرَأَ ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ سَجَدَ. قَالَ: وَالأُخْرَى مِثْلُهَا. رواه الخمسة إلا البخاري[٤].

دیسان ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نوێژی خۆرگیرانی لەسەر ئەم شێوەیەکرد: لە ڕکاتی یەکەما چوار جار قورئانی خوێندو چوار جار ڕوکووعی تیا برد، ئینجا دوو سەجدەی برد، وەرکاتی دووەمیش هەروەها (م/د/ت/ن).

## ١٦٧) نوێژی مانگ گیران بە دەنگی بەرز دەکرێو نوێژی خۆرگیرانیش بە پەنامەکی دەکرێ:

### (الجهر بالخسوف والاسرار بالكسوف)

٩٢٤- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهَا) قَالَتْ: جَهَرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي صَلاَةِ الْخُسُوفِ بِقِرَاءَتِهِ. رَوَاهُ الشيخان والنسائي[١].

---

(٤) مسلم. كسوف: ٢١٠٩. أبو داود. صلاة: ١١٨٣. ترمذي. صلاة: ٥٦٠. نسائي. كسوف: ١٤٦٦ و ١٤٦٧.

(١) بخاري. كسوف: ١٠٦٥. مسلم. كسوف: ٢٠٩٠. أبو داود. صلاة: ١١٩٠. نسائي. كسوف: ١٤٩٣ ، ١٤٩٦.

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) دەڵێ: لە نوێژی مانگ گیرانا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فاتیحاو سوورەتەکەی پاشی بە دەنگی بەرز خوێند (ش/ن).

٩٢٥- عَنْ سَمُرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَـلَّى بِنـَا النَّبِـيُّ (صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ) فِي كُسُوفٍ لا نَسْمَعُ لَهُ صَوْتاً. رَوَاهُ أصحاب السنن[٢].

سەمووره (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نوێژی خۆرگیرانی بۆ کردین، لە نوێژەکەدا گوێمان لە دەنگی نەبوو (د/ت/ن-س/ص).

### ١٦٨) خوێندنی سوورەت لە نوێژی خۆرگیرانا: (القراءة في صلاة الكسوف)

٩٢٦- عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: انْكَـسَفَتِ الـشَّمْسُ عَلَـى عَهْـدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَصَلَّى بِهِمْ، فَقَرَأَ بِسُورَةٍ مِـنَ الطُّـوَلِ. رَوَاهُ أَبُـو دَاوُدَ والحاكم ووثقه[١].

ئوبەیی کوڕی کەعب (خوای لێ رازی بێ) دەڵێ: لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەربێ) ڕۆژێ خۆرگیرا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نوێژی خۆرگیرانی بۆ کردن، سوورەتێ لە سوورەتە درێژەکانی تیا خوێند (د/حاکم- حاکم ئەم حەدیثەی بە مەوثووق داناوە).

٩٢٧- وَقَالَتْ عَائِشَةَ: كُنَّا فِي صَلاَةِ كُسُفٍ. فَحَزَرْتُ قِرَاءَتَـهُ فِي الرَّكْعِـةِ الأُلى بِسُورَةِ الْبَقَرَةِ وَفِي الثَّانِيَةِ بِسُورَةِ آلِ عِمْرَانَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[٢].

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) دەڵێ: جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نوێژی خۆرگیرانی بۆ کردین قورئان خوێندنەکەی پێغەمبەرم قەبلاند، لە رکاتی یەکەما بەقەد سوورەتی بەقەرە دەبوو، وە لە رکاتی دووەما بەقەد سوورەتی ئالی عیمران دەبوو (د).

---

(٢) بسند صحيح (شرحه).

(١) موثق عند الحاكم.

(٢) سكت عنه الشارح.

## ١٦٩) وتاری نوێژی خۆرگیرانو مانگ گیران: (الخطبة)

٩٢٨- عَنْ أَسْمَاءَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: فَانْصَرَفَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقَدْ تَجَلَّتِ الشَّمْسُ، فَخَطَبَ وَحَمِدَ اللّٰهَ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ. رَوَاهُ الشيخان[1].

ئەسماء (خوای لێ رازی بێ) دەڵێ: كاتێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لە نوێژەكە بۆوە خۆرەكە بەر بوو بوو، ئینجا حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) وتارێكی دا، لە پێشا بەو شێوەیەی شایستەی خودای گەورە بێ سوپاسو ستایشێكی جوانی خودای كرد ئینجا فەرمووی: لەپاش ئەمە (ش).

٩٢٩- (ب - ١ ز - ١٦٦ بڕ: ژمارە:٢/٩٢١٢)[2].

## ١٧٠) هانا بردنە بەر خودا برێتیی ئەم نوێژە دەكەوێ، هەروەها كردنی چاكەو خێریش: (يكفى عن الصلاة الفزع الى الله وفعل الخير)

٩٣٠- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ هَذِهِ الآيَاتِ الَّتِي يُرْسِلُ اللّٰهُ لاَ تَكُونُ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ وَلَكِنَّ اللّٰهَ يُرْسِلُهَا يُخَوِّفُ بِهَا عِبَادَهُ فَإِذَا رَأَيْتُمْ مِنْهَا شَيْئًا فَافْزَعُوا إِلَى ذِكْرِ اللهِ وَدُعَائِهِ وَاسْتِغْفَارِهِ. رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ الترمذي[1].

ئەبو مووسا (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەم نیشانەو عەلاماتانەی كە خودا دەیان نێرێ وەك خۆرو مانگ گیرانو بوو مەلەرزەو گەردەلوولو ئەمانە خودا بۆ ئەوەیان دەنێرێ كە بەندەكانی خۆی هۆشیار بكاتەوەو بەوانە بیان ترسێنێ، ئەگینا ئەم جۆرە نیشانانە، نە لەبەر مردنی كەسو نە لەبەر ژیانی كەس روو نادەن، جا ئەگەر دیتان شتێ لەمانە رووی دا ئەوا پەلاماری یادو

---

(١) بخاري راجع رقم: ٩٢٦/١. مسلم. كسوف: ٢١٠٠.

(٢) ر: رقم/ ٩٢١/٢ ←

(١) بخاري. كسوف: ١٠٤٠ - ١٠٤٣ ، ١٠٥٩ ، ١٠٦٠ ، ٦١٩٩. مسلم. كسوف: ٢١١٤. نسائي. كسوف: ١٥٠٢.

ذیکری خودا بدەن لە خودا بپاڕێنەوەو داوای لێ خۆشبوونی لێ بکەن! (ش/د/ن).

٩٣١- عَنِ أَسْمَاءَ (رَضيَ اللهُ عَنهُا) قَالَتْ: لَقَدْ أَمَرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالْعَتَاقَةِ فِي كُسُوفِ الشَّمْسِ. رَوَاهُ البخاري وأبو دَاوُدَ[٢].

ئەسماء (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لەخۆر گیرانەکەدا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمانی کرد بە بەندە ئازادکردن تا خودا دەرووی رەحمەتیان لێ بکاتەوە (ب/د).

## ١٧١) ئەو شتە غەیبییانەی کە لەناو نوێژی خۆر گیرانا دەرکەوتوون‌و بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کەشف بوون:

### (ما كشف للنبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) في صلاة الكسوف)

٩٣٢- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُما) قَالَ: انْخَسَفَتِ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَصَلَّى فَقَامَ قِيَامًا طَوِيلاً، إلى أَنْ قَالَ: فَقَالَ: (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إنَّ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ آيَتَان مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لاَ يَخْسِفَانِ لِمَوْتِ أَحَدٍ وَلاَ لِحَيَاتِهِ، فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَاذْكُرُوا اللَّهَ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، رَأَيْنَاكَ تَنَاوَلْتَ شَيْئًا فِي مَقَامِكَ ، ثُمَّ رَأَيْنَاكَ كَعْكَعْتَ فَقَالَ: (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِنِّي رَأَيْتُ الْجَنَّةَ، (مُصَوَّرَةٍ أَمَامِي فِي عَرْضِ هَذَا الْحَائِطِ – شرحه) فَتَنَاوَلْتُ عُنْقُودًا، وَلَوْ أَصَبْتُهُ لأَكَلْتُمْ مِنْهُ مَا بَقِيَتِ الدُّنْيَا، وَأُرِيتُ النَّارَ، فَلَمْ أَرَ مَنْظَرًا كَالْيَوْمِ قَطُّ أَفْظَعَ، وَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ، قَالُوا بِمَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: بِكُفْرِهِنَّ قَالُوا: أَيَكْفُرْنَ بِاللَّهِ؟ قَالَ: يَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ، وَيَكْفُرْنَ الإِحْسَانَ، لَوْ أَحْسَنْتَ إِلَى إِحْدَاهُنَّ الدَّهْرَ كُلَّهُ ثُمَّ رَأَتْ مِنْكَ شَيْئًا قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ مِنْكَ خَيْرًا قَطُّ. رَوَاهُ الشيخان والنسائي[١].

---

(٢) بخاري. كسوف: ١٠٥٣. تجریدی بخاري بە کوردی: ٥٣٥.

(١) بخاري. كسوف: ١٠٥٢ (ر: ٢٩ = ٢٧ تجريد). ٥١٩٧ ، ٤٣١ ، ٧٤٨. مسلم. كسوف: ٢١٠٦. أبو داود. صلاة: ١١٨٩. نسائي. كسوف: ١٤٩٢.

ئیبنو عەبباس (خوایان لێ ڕازی بێ) گوتی: لە سەردەمی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەربێ) خۆرگیرا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نوێژی خۆرگیرانی کرد، وە لە نوێژەکەدا گەلێ ڕاوەستاو ماوەیەکی دوورو درێژ لەناو نوێژەکەدا بە ڕاوەستانەوە هەر قورئانی دەخوێند بگرە بەقەد سوورەتی بەقەرەی خوێند ئیتر هەموو فەرموودەکەی گێڕایەوە تا گەیشتە ئەوێ کە ئیبنو عەبباس دەڵێ: جا حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: خۆرو مانگ دوو نیشانەی گەورەن لە نیشانە گەورەکانی خودا کە دەبن بە بەڵگەو نیشانە لەسەر بوونی خوداو هەروا دەبن بە گەورەترین بەڵگە لە سەریەکتایی و تاك‌و تەنیایی خودا، نە لەبەر مردنی کەس‌و نە لەبەر ژیانی کەس ناگیرێن بەڵام ئەگەر شتێکی ئاوەهاتان دی ئەوا ذیکرو یادی خودا بکەن یاران (خوایان لێ ڕازی بێ) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! لەم جێگەیە تا چاومان لێت بوو دەستت برد بۆ شتێ کە بیهێنیت کەچی هەڵسڵەمێتەوەو وەك کەسێ لە شتێ بترسێ وابوو، ئیتر کشایتە دواوە!؟ فەرمووی: (درودی خوای لەسەربێ): ئەوە لەوکاتەدا بەهەشتم دی، وە دەستم برد بۆ هێشوویێ ترێ لە مێوەکەی هەتا بیهێنم بۆتان، بەڵام بۆم نەکرایەوە ئەگەر بۆم بکرایەتەوە تا جیهان دەما هەر لێتان دەخواردو تەواو نەدەبوو، چونکە میوەی بەهەشت کە دەنکێکی لێ دەکەیتەوە دەنکێکی تر لە لایەنی خوداوە دێتەوە جێگەی! هەروەها ئاگری دۆزەخیشم دی! هەر گیزاو هەر گیز دیمەنی وا دزیوو بێ ڕەزام نەدیوە، سەرنجم دا زوربەی خەڵکەکەی ناوی ژنان بوون عەرزیان کرد: لەبەرچی؟ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: چونکە ناسوپاسن‌و لەبەر ئەوە کە ناسوپاس‌و ناشوکرن. گوتیان: ئایا ناشوکری‌و نا سوپاسی خودا دەکەن؟ فەرمووی: نەء، مەبەست ئەوە نیە، بەڵام ناسوپاسی‌و ناشوکریی هاوسەرو هاوڕێ دەکەن‌و پێنەزانن‌و چاکەیان لەبەر چاونیە، گریمان بە درێژایی ساڵ چاکەو پیاوەتی لەگەڵ ژندا بکەی، بەڵام ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان شتێکی لێ دێت (کە بەدڵی نەبێ) دەڵێ: ئەوەتی من هەم خێرم لەتۆ نەدیوە! (ش/ن).

٩٣٣- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: انْكَسَفَتِ الشَّمْسُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَسَاقَ حِدَيْثاً طَوِيلاً إِلى أَنْ قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مَا مِنْ شَيْءٍ تُوعَدُونَهُ إِلاَّ قَدْ رَأَيْتُهُ فِي صَلاَتِي هَذِهِ، لَقَدْ جِيءَ بِالنَّارِ وَذَلِكُمْ حِينَ رَأَيْتُمُونِي تَأَخَّرْتُ مَخَافَةَ أَنْ يُصِيبَنِي مِنْ لَفْحِهَا، وَحَتَّى رَأَيْتُ فِيهَا صَاحِبَ الْمِحْجَنِ، يَجُرُّ قُصْبَهُ فِي النَّارِ، كَانَ يَسْرِقُ الْحَاجَّ بِمِحْجَنِهِ فَإِنْ فُطِنَ لَهُ قَالَ: تَعَلَّقَ بِمِحْجَنِي. وَإِنْ غُفِلَ عَنْهُ ذَهَبَ بِهِ، وَحَتَّى رَأَيْتُ فِيهَا صَاحِبَةَ الْهِرَّةِ الَّتِي رَبَطَتْهَا فَلَمْ تُطْعِمْهَا وَلَمْ تَدَعْهَا تَأْكُلُ مِنْ خَشَاشِ الأَرْضِ حَتَّى مَاتَتْ جُوعًا ثُمَّ جِيءَ بِالْجَنَّةِ وَذَلِكُمْ حِينَ رَأَيْتُمُونِي تَقَدَّمْتُ حَتَّى قُمْتُ فِي مَقَامِي، وَلَقَدْ مَدَدْتُ يَدِي وَأَنَا أُرِيدُ أَنْ أَتَنَاوَلَ مِنْ ثَمَرِهَا لِتَنْظُرُوا إِلَيْهِ، ثُمَّ بَدَا لِي أَنْ لاَ أَفْعَلَ فَمَا مِنْ شَيْءٍ تُوعَدُونَهُ إِلاَّ قَدْ رَأَيْتُهُ فِي صَلاَتِي هَذِهِ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ والنسائي(٢).

**جابیر** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: لە سەردەمی پێغەمبەردا** (دروودی خوای لەسەربێ) **رۆژ گیرا، ئینجا جابیر درێژەی دا بە گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیە تا هاتە سەر باسی ئەوە کە دەڵێ: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: لەناو ئەم نوێژەمدا دۆزەخیان هێنایە بەرچاوم بە خۆیو ئاگرو سزاو ئێشو ئازاریەوە! وە ئەو هەرەشەو گوڕەشانەی کە لێتان دەکرێن هەمووم دیتن بە چاوی خۆم، ئەوکاتە کە منتان دی، کشامەدواوە ئەوە لە ترسی بڵێسەی ئاگری دۆزەخ بوو کەوا پشتاو پشت گەڕامە دواوە، گەلێ کەسم لە دۆزەخا دی کابرای خاوەن گۆچانیشم لەوێ دیتن، ئەوەی کە عادەتی وابوو بە گۆچانەکەی دزی لە حاجیان دەکرد، جا ئەگەر پێیان بزانیبایە دەیگوت: خۆی گیربوو لە گۆچانەکەم، ئەگەر کەسیش ئاگای لێی نەبوایە ئەوا دەیبرد بۆ خۆی! ئەم کابرایەم دی ریخۆڵەی خۆی بەکێش دەکرد بەناو ئاگرەکەدا، هەروەها ئەو ژنەشم لە دۆزەخا دیتن کە پشیلەیەکی بەستبۆوە تا لەبرسانا مردبوو، نەخۆی خۆراکی پێ دابوو، وە نە بەرەڵاشی کردبوو**

---

(٢) مسلم. كسوف: ٢٠٩٩. أبو داود. صلاة: ١١٧٨.

هەتا بۆخۆی لە جرووجانەوەری زەوی بخوات، لە پاشا ئەوكاتەی كە دیتان چووومەوە پێشەوەو لە شوێنەكەی خۆم وەستامەوە، ئەوە لەوكاتەدا بەهەشتیان هێنا، ئەوەبوو دەستم درێژكرد بۆ شتێ، ئەوە بۆیە بوو ویستم هەنێ لە میوەی بەهەشت بهێنم هەتا ئێوەش تەماشای بكەن، بەڵام وام بە باش زانی كە نەیكەم، ئیتر ئەو گفتو بەڵێنانەی كە پێتان دەدرێن هەمووم دیتن بە چاوی خۆم لەناو ئەم نوێژەدا (م/ن).

## ١٧٢) كورنووش بردن سوننەتە لەكاتی ڕوودانی نیشانەكانو قەومانی كارەساتی گەورەدا: (السجود لمطلق الآيات)

٩٣٤- عَنْ عِكْرِمَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قِيلَ لاِبْنِ عَبَّاسٍ: مَاتَتْ فُلاَنَةُ - بَعْضُ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ - (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَخَرَّ سَاجِدًا فَقِيلَ لَهُ: تَسْجُدُ هَذِهِ السَّاعَةَ؟ فَقَالَ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا رَأَيْتُمْ آيَةً فَاسْجُدُوا وَأَىُّ آيَةٍ أَعْظَمُ مِنْ ذَهَابِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي[1].

عیكریمە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: بە ئیبنو عەبباس گوترا (خوای لێ ڕازی بێ) فیسارە هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وەفاتی كرد، ئەویش كەوت بەڕووداو كوڕنووشێكی برد بۆ خودا، پێیان گوت: لەم كاتەدا بۆ كوڕنووش دەبەی؟ گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەركاتێ نیشانەو ئایەتێكتان دی كوڕنووش ببەن وە چی نیشانەو ئایەتێكیش هەیە كە لە كۆچكردنی هاوسەرەكانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) گەورەتربێ! (د/ت- س/ح).

## ١٧٣) نوێژە بارانە (صلاتول ئیستیسقاء): (صلاة الاستسقاء)

{قَالَ: اللهُ تَعالى - وَإِذِ اسْتَسْقَى مُوسَى لِقَوْمِهِ فَقُلْنَا اضْرِب بِّعَصَاكَ الْحَجَرَ فَانفَجَرَتْ مِنْهُ اثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْناً - ٢/٦٠}.

(١) بسند حسن (شرحه).

خودای گەورە دەفەرموێ: باسی ئەو نیعمەتە بکە کاتێ کە مووسا داوای ئاوی کرد بۆ گەلەکەی، ئێمەش پێمان گوت: گۆچانەکەت بماڵە بەو تاشە بەردەدا، کەوا لە پێش چاوتا، کە پیاماڵی دوانزە کانی لێ هەڵقوولا بۆ دوازدە تیرەی نەوەی ئیسرائیل.

٩٣٥- عَنْ إِسْحَاقَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَرْسَلَنِي الْوَلِيدُ بْنُ عُتْبَةَ وَهُوَ أَمِيرَ الْمَدِينَةِ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ أَسْأَلُهُ عَنْ صَلاَةِ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الإسْتِسْقَاءِ، فَقَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُتَبَذِّلاً مُتَوَاضِعًا مُتَضَرِّعًا حَتَّى أَتَى الْمُصَلَّى، فَرَقِيَ الْمِنْبَرِ، وَلَمْ يَخْطُبْ خُطَبَكُمْ هَذِهِ، وَلَكِنْ لَمْ يَزَلْ فِي الدُّعَاءِ وَالتَّضَرُّعِ وَالتَّكْبِيرِ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ كَمَا يُصَلِّي فِي الْعِيدِ. رَوَاهُ أصحاب السنن[١].

ئیسحاق (خوای لێ رازی بێ) دەڵێ: وەلیدی کوڕی عوتبە – لەوکاتەدا کە فەرمانڕەوای مەدینەبوو – ناردمی بۆ لای ئیبنو عەبباس (خوایان لێ رازی بێ) هەتا لە بارەی چۆنێتیی نوێژە بارانەی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەربێ) لێی بپرسم، کە لێم پرسی گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بە پەڕپووتی و بە کزۆڵەیی و بە ملکەچی لەشار دەرچوو، لەڕێ هەر دەپاڕایەوەو دەلالایەوە تا گەیشتە نوێژگاکە (کە لە دەرەوەی شاربوو) جا لەوێ سەرکەوتە سەر مینبەرەکە، بەڵام ئەو خوتبەیەی ئەو دای وەك ئەم خوتبانەی ئێوە دەیان دەن وا نەبوو بەڵکوو حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) هەر دووعاو نزای دەکردو دەلالایەوەو دەپاڕایەوەو ئەڵلاهو ئەکبەری دەکرد، تا لە دواییدا دوو رکات نوێژی کرد لە چەشنی نوێژی جەژنی (د/ت/ن–س/ص).

٩٣٦- وَخَرَجَ عَبْدُ اللّٰهِ بْنُ يَزِيدَ الأَنْصَارِيُّ مَعَهُ الْبَرَاءُ بْنُ عَازِبٍ وَزَيْدُ بْنُ أَرْقَمَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَ) فَاسْتَسْقَى، فَقَامَ لَهُمْ عَلَى رِجْلَيْهِ عَلَى غَيْرِ مِنْبَرٍ فَاسْتَغْفَرَ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، يَجْهَرُ بِالْقِرَاءَةِ، وَلَمْ يُؤَذِّنْ، وَلَمْ يُقِمْ. رَوَاهُ البخاري[٢].

---

(١) بسند صحيح (شرحه).

(٢) بخاري استسقاء: ١٠٢٢.

عەبدوڵلای کوڕی یەزیدی ئەنصاری (لەو کاتەدا کە فەرمانڕەوای کوفەبوو) لەشار دەرچوو، بەرائی کوڕی عازیبو زەیدی کوڕی ئەرقەمیش (خوایان لێ ڕازی بێ) لە گەڵیا دەرچوون، جا عەبدوڵلا گەلێ پاڕایەوە بۆ بارانو لەسەر هەردوو پیا ڕاوەستا، بەڵام لەسەر مینبەر نەبوو ئیتر لەسەر ئەو حاڵە زۆر پاڕایەوە بۆ بارانو داوای لێ خۆشبوونی لە خوداکرد، لە دواییدا دوو رکات نوێژی کرد، بە دەنگی بەرز قورئانی لەناویانا خوێند، بەڵام نە بانگیدا، وە نەقامەتی کرد بەڵام دەشێ کەسێ ڕایان پەڕێنێو بڵێ: الصلاة جامعةٌ: وا نوێژی جەماعەت دەکرێ بە بۆنەی نوێژە بارانەوە لە دەستی مەدەن (ب).

٩٣٧- عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ خَرَجَ يَسْتَسْقِي قَالَ: فَحَوَّلَ إِلَى النَّاسِ ظَهْرَهُ وَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ يَدْعُو، ثُمَّ حَوَّلَ رِدَاءَهُ، ثُمَّ صَلَّى لَنَا رَكْعَتَيْنِ جَهَرَ فِيهِمَا بِالْقِرَاءَةِ. رَوَاهُ الخمسة[٣].

لە عەببادی کوڕی تەمیمەوە لە مامەیەوە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەو ڕۆژە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەرچوو بۆ نوێژە بارانێ دیتم، گوتی: لەکاتی وتار خوێندنەوەکەدا پشتی کردە خەڵکەکەو ڕووی کردە ڕووگەو دەستی کرد بە پاڕانەوەو نزاکردن، لەپاشا پۆشاکەکەی هەڵسووڕاند واتە: ڕاستو چەپی کرد ئینجا دوو رکات نوێژی نوێژە بارانەی بە جەماعەت بۆ کردین قورئانی بە دەنگی بەرز لەناویانا خوێند (ش/د/ت/ن).

٩٣٨- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ نَبِيَّ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ لاَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ فِي شَيْءٍ مِنْ دُعَائِهِ إِلاَّ فِي الاِسْتِسْقَاءِ، حَتَّى يُرَى بَيَاضُ إِبْطَيْهِ. رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ الترمذي[٤].

---

(٣) بخاري. استسقاء: ١٠٢٣ ، ١٠١١ ، ١٠١٢. مسلم. استسقاء: ٢٠٦٧ – ٢٠٧٠. أبو داود. صلاة: ١١٦١ – ١١٦٤. ١١٦٦ ، ١١٦٧. ترمذي. صلاة: ٥٥٦. نسائي. استسقاء: ١٥٠٤.

(٤) بخاري. إستسقاء: ١٠٣١ ، ٣٥٦٥ ، ٦٣٤١. مسلم. استقاذ: ٢٠٧٤. أبو داود. رفع يدين في الاستسقاء: ١١٧٠. نسائي. استقاذ: ١٥١٢. ابن ماجه. اقامة الصلاة: ١١٨٠.

ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەری خودا (دروودی خوای لەسەربێ) لە هیچ نزایەكیدا دەستی بەرز نەدەكردەوە، لە نزاكەی داواكردنی باراندا نەبێ، بەڵام لە كاتی داواكردنی باراندا ئەوەندە دەستی هەڵدەبڕی سپێدەی هەر دوو بنباخەڵی دەردەكەوت (ش/د/ن).

٩٣٩- ولأبي يَعلي والبزار: مَهْلاً عَنِ اللّٰهِ مَهْلاً، فَإِنَّهُ لَوْلاَ شَبَابٌ خُشَّعٌ وَبَهَائِمُ رُتَّعٌ وَشُيُوخٌ رُكَّعٌ وَأَطْفَالٌ رُضَّعٌ لَصُبَّ عَلَيْكُمُ الْعَذَابُ صَبًّا، وفي رواية: لَوْ لاَ عِبَادٌ لِلهِ رُكَّعٌ[٥].

حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هێواش كەن هێواش، خودا بەسەبرە! ئەگینا ئەگەر لەبەر لاوی لە خودا ترس و ماڵاتی بستەزمانی گیاخۆرو منداڵی شیرە خۆر نەبێ خودا بە قەمچی سزاو تۆڵە داتان دەگرێ! لە گێڕانەوەیەكا: ئەگەر لەبەر خاتری هەندێ لە بەندەگانی خودا نەبێ كە هەمیشە سەر گەرمی نوێژو خودا پەرستنین.. (ئەبو یەعلا/بەزار/لەسەر فەرموودەی غایەتولمەئموول شەرحی تاجول ئوصول).

٩٤٠- ولأبي نعيم (في شرحه): مَا مِنْ يَوْمٍ إِلاَّ وَيُنَادِي مُنَادٍ: مَهْلاً أَيُّهَا النَّاسُ مَهْلاً، فَإِنَّ لِلهِ سَطوات، لَوْلاَ رِجَالٌ خَشَّعٌ وَصِبْيَانٌ رَضَّعٌ وَدَوَّابُّ رَتَّعٌ لَصُبَّ عَلَيْكُمُ الْعَذَابُ صَبًّا ثُمَّ لَتُرَضُّنَّ رَضًّا[٦].

گوتی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ڕۆژ نیە لەلای خودا كە جاڕچییەك جاڕ نەدا: ئەی مەردوم! مۆڵەت بگرن كەمێ خودا بەسەبرەو بەجەبرە هاكا كە خودا زەبرو زەنگی خۆی نواندو بەسەختی دەستی خۆی وەشاند! خۆ ئەگەر لەبەر خاتری پیاو خاسەكان و منداڵە مەمكە خۆرەكان و ئاژەڵە گیاخۆرەكان نەبێ، خوداوەند لەناكاو بە تۆپزی تۆڵەو سزا دایدەگرتن و سەرو گۆیلاكتانی باش باش پێ دەكوتایەوە! (ئەبو نەعیم - لەسەر فەرموودەی غایەتولمەئمووڵ شەرحی تاجول ئوصول).

---

(٥) منقول من الشرح.

(٦) (شرحه).

## ١٧٤) دەقی وتارێكی داوای بارانكردن : (نص خطبة في الاستسقاء)

٩٤١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: شَكَا النَّاسُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قُحُوطَ الْمَطَرِ، فَأَمَرَ بِمِنْبَرٍ، فَوُضِعَ لَهُ فِي الْمُصَلَّى. وَوَعَدَ النَّاسَ يَوْمًا يَخْرُجُونَ فِيهِ. قَالَتْ: عَائِشَةُ فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِينَ بَدَا حَاجِبُ الشَّمْسِ فَقَعَدَ عَلَى الْمِنْبَرِ فَكَبَّرَ وَحَمِدَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّكُمْ شَكَوْتُمْ جَدْبَ دِيَارِكُمْ وَاسْتِئْخَارَ الْمَطَرِ عَنْ إِبَّانِ زَمَانِهِ عَنْكُمْ وَقَدْ أَمَرَكُمُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ تَدْعُوهُ وَوَعَدَكُمْ أَنْ يَسْتَجِيبَ لَكُمْ ثُمَّ قَالَ: (الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ مَلِكِ يَوْمِ الدِّينِ) لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ، اللَّهُمَّ أَنْتَ اللَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ الْغَنِيُّ وَنَحْنُ الْفُقَرَاءُ أَنْزِلْ عَلَيْنَا الْغَيْثَ وَاجْعَلْ مَا أَنْزَلْتَ لَنَا قُوَّةً وَبَلاَغًا إِلَى حِينٍ، ثُمَّ رَفَعَ يَدَيْهِ فَلَمْ يَزَلْ فِي الرَّفْعِ حَتَّى بَدَا بَيَاضُ إِبْطَيْهِ، ثُمَّ حَوَّلَ إِلَى النَّاسِ ظَهْرَهُ وَقَلَّبَ رِدَاءَهُ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ وَنَزَلَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، فَأَنْشَأَ اللَّهُ سَحَابَةً فَرَعَدَتْ وَبَرَقَتْ، ثُمَّ أَمْطَرَتْ بِإِذْنِ اللَّهِ، فَلَمْ يَأْتِ مَسْجِدَهُ حَتَّى سَالَتِ السُّيُولُ فَلَمَّا رَأَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سُرْعَتَهُمْ إِلَى الْكِنِّ ضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ وَأَنِّي عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَابْن حبان والحاكم وصححه[1].

**عائیشە** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: موسوڵمانان لەلای حەزرەت** (دروودی خوای لەسەربێ) **سكالاّیان لە دەستی بێ بارانی كرد، حەزرەتیش** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمانی كرد دووانگەیەكیان لە نوێژگاكە لە دەشتەكە بۆ دانا، بەڵێنیشی دا بەخەڵكەكەو رۆژێكی بۆ دیاریكردن كە لەو رۆژووكاتەدا هەموو دەرچن بۆ ئەوێو لەوێ ئامادە بن عائیشە** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: جا لەگەڵ گزنگی خۆردا حەزرەت** (دروودی خوای لەسەربێ) **لە شار دەرچوو وە رۆیشت لەسەر دووانگەكە دانیشتو دەستی كردبە ئەڵڵاهو ئەكبەر كردنو سوپاسی خودای گەورەو سەروەری كردو ئینجا فەرمووی: ئێوە**

---

(١) صحيح عند الحاكم

دادو هاوارتانـە لـە دەسـتی قـاتو قڕیـی وڵاتەكـەتانو لـە دەسـتی بـێ بـارانیو هــەڵبواردنی لــەكاتو ســاتی خــۆی، وە خــودای گــەورەو سەروەریش فەرمانی پێ كردوون كە لێی بپاڕێنەوەو بەڵێنیشی پێ داون كە لێتان گیرا بكا، ئینجا فەرمووی: سوپاسو ستایش هـەر بۆ خودایـە، كـە پـەروەردگاری هـەموو جیهانیانـە، خودایـەكی بەخشندەو میهرەبانـە، خـاوەنی رۆژی تۆڵـەو سـزادانە، بێجگـە لـە یـەزدان خـودای تـر نیـە، خودایەكی وایە ئەوەی بیەوێ دەیكا، ئەی خودایە! هەر خۆت خودایتو بێجگە لـە تۆ خودایـەكی تـر نیـە، تۆ دەوڵەمەنـدو داراو بـێ نیازیـت، وە ئێمە هەژارو نەدارایـن، خودایە! بارانمان فریا خەو بیكـە بـە مایـەی هێـزو دەستمایەی مـاوەی ژیانمـان! ئینجا پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەربێ) بەدەم دووعـاو پاڕانـەوە بـەرە بـەرە هـەر دەسـتەكانی بـەرز دەكـردەوە، هـەتا سپیدەی هەردوو بنباخەڵی دەركەوت ئینجا پشتی كردە خەڵكەكەو ئەو بەرماڵەی دا بووی بە شانیا ئاوە ژووی كردو ئینجا راستو چەپیشی كرد لەپاشا رووی كردەوە خەڵكەكەو لە دووانگەكە دابەزیو دوو ركات نوێژی بە جەماعەت بۆ كردن ئیتر خودا گورج پەڵـەیێ هـەوری پێكهێنـاو هەورەكە دەستی كرد بە گرماندنو تریشقەو بروسكەدان، وە بەفـەرمانی خـودا بـاران بـاری! هێـشتا پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەربێ) نەگەیـشتبووە مزگەوتەكـەی خـۆی كـە لافـاو هەڵـسا، پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) سـەرنجی دا كـەوا خەڵكەكـە بـە پەلـە پـڕووزە خۆیـان دەكـەن بـەكونی ژوورداو لـەتاو بارانەكە هـەڕا دەكـەن لەبـەر ئـەوە پێكـەنی بەرادەیـەكی وا كـە كاكیلـەكانی دەركـەوتن. جـا فـەرمووی: شـایەتی دەدەم كـە خـودا تـەوانای هـەموو شـتێكی هەیـە، وە منـیش بەنـدەو پێغەمبـەری خـودام. (د/ئیبنو حەبان/حاكم: حاكم ئەم حەدیسەی بە صەحیح داناوە).

## ١٧٥) كاتێ مەردوم داوای نوێژە بارانەیان لە پێشنوێژ (یا لە فەرمانڕەوا)كرد دەشێ داواكەیان بەجێ بێنێ:

### (يجيب الإمام طلب الناس في الاستسقاء)

٩٤٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ يَخْطُبُ يَوْمَ الجُمُعَةِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ هَلَكَتِ الْمَوَاشِي وَانْقَطَعَتِ السُّبُلُ فَادْعُ اللّٰهَ، فَدَعَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). وفي رواية: فَرَفَعَ يَدَيْهِ ثُمَّ قَالَ: اللّٰهُمَّ أَغِثْنَا، اللّٰهُمَّ أَغِثْنَا، اللّٰهُمَّ أَغِثْنَا، فَمُطِرُوا مِنْ جُمُعَةٍ إِلَى جُمُعَةٍ، فَجَاءَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ تَهَدَّمَتِ الْبُيُوتُ وَتَقَطَّعَتِ السُّبُلُ ، وَهَلَكَتِ الْمَوَاشِي، فَقَالَ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): اللّٰهُمَّ عَلَى رُءُوسِ الْجِبَالِ وَالآكَامِ وَبُطُونِ الأَوْدِيَةِ وَمَنَابِتِ الشَّجَرِ. وفي رواية: اللّٰهُمَّ حَوَالَيْنَا وَلاَ عَلَيْنَا، فَانْجَابَتْ عَنِ الْمَدِينَةِ انْجِيَابَ الثَّوْبِ فَجَعَلَتْ تُمْطِرُ حَوْلَهَا وَلاَ تُمْطِرُ بِهَا قَطْرَةً، فَنَظَرْتُ إِلَى الْمَدِينَةِ وَإِنَّهَا لَفِي مَثْلِ الإِكْلِيلِ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ الترمذي[1].

ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: ڕۆژی هەینی بوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وتاری دەدا، پیاوێ هات پێی گوت! ئەی پێغەمبەری خودا! لەبەر بێ بارانی ماڵاتو ئاژاڵ قڕبوونو ڕێگەوبان بڕا چونكە وڵاخی سواری نەماوە جا كەوایە لە خودا بپاڕێرەوە بۆمان، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) پارایەوە. لە گێڕانەوەیەكا: هەردوو دەستی بەرز كردەوەو فەرمووی: ئەی خودایە! بارانمان فریاخە، ئەی خودایە بارانمان فریاخە، ئەی خودایە! بارانمان فریاخە ئیتر لەم هەینییەوە تا ئەو هەینی هەر باران باری، جا لە هەینی ئایندەدا پیاوێ هات وتی: ئەی پێغەمبەر خودا! خانووان ڕووخان، ڕێگاوبان بڕانو ئاژەڵو پادار نەمان لەبەر زۆری باران! كەواتە لە خودا داوا بكە كە ئەم بارانە بگرێتەوە! پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی خودایە! بەسەر سەری كێوو یاڵو ناوشیوو دۆڵو لەوەڕگاكانا بیبارێنە. لە گێڕانەوەیەكی تردا: ئەی خودایە! لە دەوروبەرمان بیبارێنەو بەسەر سەرمانا

---

(١) بخاري. استسقاء: ١٠١٣ ، ٩٣٣. مسلم. استقاء: ٢٠٧٥. أبو داود. صلاة: ١١٧٥. نسائي. استقاء: ١٥٠٣، ١٥١٤.

نا! گوتی: ئیتر هەورەكە (وەك جلیٚ دایكەنی) ئاوا لەسەر مەدینە رەوییەوەو لە دەورو بەری دەباری، وە لەناو مەدینە یەك دڵۆپ نەدەباری، جا كە سەیری سەرمەدینەم كرد هەورەكە وەك تاجە گوڵینە چۆن ئەڵقەدەدا بە دەوری سەردا ئاوا ئەڵقەی لە مەدینەدا بوو! (ش/د/ن).

## ١٧٦) گوتەی كاتی بارینی بارانو هەڵكردنی با:
## (ما يقال عند المطر والريح)

٩٤٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهَا) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ إِذَا رَأَى الْمَطَرَ قَالَ: اَللَّهُمَّ صَيِّبًا نَافِعًا. رَوَاهُ البخاري والنسائي ولفظه: اَللَّهُمَّ اجْعَلْهُ صَيِّبًا نَافِعًا[1].

عائیشە (خوای لیٚ رازی بیٚ) دەڵیٚ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربیٚ) كە بارانی دەدی دەیفەرموو: ئەی خودایە! بارانێكی خورزمو سوودمەند (ب/ن) گفتەی (ن): ئەی خودایە! بیگێری بە بارانێكی لێزمەی بە خوڕی بە سوود: اللهم اجعله صيبا نافعا.

٩٤٤- وَتَمَثَّلَ ابْنُ عُمَرُ بِشِعْرِ أَبِي طَالِبٍ فَقَالَ: رُبَّمَا ذَكَرْتُ قَوْلَ الشَّاعِرِ وَأَنَا أَنْظُرُ إِلَى وَجْهِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَسْتَسْقِي، فَمَا يَنْزِلُ حَتَّى يَجِيشَ كُلُّ مِيزَابٍ، وَهُوَ قَوْلُ أَبِي طَالِبٍ.

وَأَبْيَضَ يُسْتَسْقَى الْغَمَامُ بِوَجْهِهِ ثِمَالَ الْيَتَامَى عِصْمَةً لِلأَرَامِلِ[2].

رواه البخاري

ئیبنو عومەر (خوایان لیٚ رازی بیٚ) هۆنراوەكەی ئەبو طالیبی دەخوێندەوەو دەیگوت: زۆر جاران كە تەماشای روخساری حەزرەتم دەكرد لەو كاتانەدا كە دووعای داوای بارانی دەكرد، كە هێشتاكە لە مینبەرەكە دانە دەبەزی هەتا

(١) بخاري. استقاء: ١٠٣٢.

(٢) بخاري. استسقاء: ١٠٠٩ = تجريد: ٥١٩.

هەموو پلووسکەکان دەخورۆشان و چۆڕاوگە هەڵ دەسا، ئیبنو عومەر (خوایان لێ رازی بێ) دەیگوت: زۆر جاران کە تەماشای ئەم حاڵەم دەکرد ئەم شیعرەی ئەبو طالیبم وەبیر دەکەوتەوە کەلە مەدحی حەزرەتدا دەڵێ:

وَابيَضُ يَسْتَسْقَى الْغَمامُ بِوَجْهِهِ ثِمَالُ الْيَتَامى عِصْمَةٌ لِلأَرَامِلِ

واتە:

سپیکارێکە هەور بەروخساری دەبارێنێ باران

ئەوە پشت و پەنای هەتیوان و دالدەی بێوەکان (ب).

٩٤٥- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: صَلَّى لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) صَلَاةَ الصُّبْحِ بِالْحُدَيْبِيَةِ عَلَى إِثْرِ سَمَاءٍ كَانَتْ مِنَ اللَّيْلَ، فَلَمَّا انْصَرَفَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: هَلْ تَدْرُونَ مَاذَا قَالَ: رَبُّكُمْ؟ قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ ،قَالَ: أَصْبَحَ مِنْ عِبَادِي مُؤْمِنٌ بِي وَكَافِرٌ، فَأَمَّا مَنْ قَالَ: مُطِرْنَا بِفَضْلِ اللَّهِ وَرَحْمَتِهِ فَذَلِكَ مُؤْمِنٌ بِي وَكَافِرٌ بِالْكَوَاكَبِ، وَأَمَّا مَنْ قَالَ: بِنَوْءِ كَذَا وَكَذَا فَذَلِكَ كَافِرٌ بِي وَمُؤْمِنٌ بِالْكَوَاكَبِ. رَوَاهُ الشيخان[٣].

زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە حودەیبییە بووین، شەوباران باریبوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نوێژی بەیانی بۆ کردین، کە سڵاوی دایەوە رووی کردە خەڵکەکەو فەرمووی: ئایا دەزانن کە پەروەردگارتان چی دەفەرموێ؟ گوتیان: خوداو پێغەمبەری خودا خۆیان باش دەزانن، فەرمووی: دەفەرموێ: ئەم بەیانییە بەهۆی ئەم بارانەوە بەندەکانم بوون بە دووتاقم: تاقمێکیان باوەڕیان بەمن بوو، وە تاقمێکیان باوەڕیان بە من نەبوو ئەوەی بڵێ لە سایەی خوداوەو بە رەحمەتی ئەو بارانمان بۆ باریوە، ئەوە باوەڕی تەواوی بەمن هەیەو باوەڕی بە بورج و ئەستێرەو شتی وانیە، بەڵام ئەو کەسەی بڵێ: لە فیسارە بورجا بارانمان بۆ

(٣) بخاري. صلاة: ٨٤٦ ، ١٠٣٨ ، ٤١٤٧ ، ٧٥٠٣. مسلم. إيمان: ٢٢٨ ، ٢٢٩.

باریوە ئەوە باوەڕی بەمن نیەو بەڵكوو باوەڕی بە بورج و ئەستێران هەیە (ش))،

٩٤٦- وَلِمُسْلِمٍ أَلَمْ تَرَوْا إِلَى مَا قَالَ: رَبُّكُمْ قَالَ: مَا أَنْعَمْتُ عَلَى عِبَادِي مِنْ نِعْمَةٍ إِلاَّ أَصْبَحَ فَرِيقٌ مِنْهُمْ بِهَا كَافِرِينَ. يَقُولُونَ: الْكَوَاكِبُ وَبِالْكَوَاكِبِ[٤].

حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: سەرنجی ئەم فەرمایشتەی پەروەردگارتان نادەن كە دەفەرموێ: هەرچاكەیێ دەكەم لەگەڵ بەندەكانما دەستەیەكیان خۆیانی پێ پێنەزان دەكەن و سپڵەیی پیشان دەدەن بەرابەر بەو چاكەیەی منە، من باران دەبارێنم بۆیان كەچی ئەوان دەڵێن: ئەستێرەو بورج بارانی بۆ باراندین و لە فیسارە بورجا بارانمان بۆ باری! (م- غەریقی رەحمەتی خودا بێ).

٩٤٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا عَصَفَتِ الرِّيحُ قَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا وَخَيْرَ مَا فِيهَا وَخَيْرَ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ مَا فِيهَا وَشَرِّ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ، قَالَتْ وَإِذَا تَخَيَّلَتِ السَّمَاءُ تَغَيَّرَ لَوْنُهُ وَخَرَجَ وَدَخَلَ وَأَقْبَلَ وَأَدْبَرَ، فَإِذَا أَمطَرَتْ سُرِّيَ عَنْهُ، فَعَرَفْتُ ذَلِكَ فِي وَجْهِهِ. فَسَأَلْتُهُ فَقَالَ: لَعَلَّهُ يَا عَائِشَةُ كَمَا قَالَ: قَوْمُ عَادٍ فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا: هَذَا عَارِضٌ مُمْطِرُنَا). رَوَاهُ مُسْلِمٌ والترمذي[٥].

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) دەڵێ: جاران كە بای توند هەڵی دەكرد پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەیفەرموو:

{اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا وَخَيْرَ مَا فِيهَا وَخَيْرَ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ مَا فِيهَا وَشَرِّ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ}.

داوات لێ دەكەم كە بەشم بدەی لە خێرو سوودی ئەم بایە خۆی، وە هەر وەها لەو خێرو سوودەیش كە لەناو ئەم بایەدا هەیە، وە هەروەها لەو خێرو

---

(٤) مسلم. إيمان: ٢٣٠ ، ٢٢٩.

(٥) مسلم. استقاء: ٢٠٨١ — ٢٠٨٣. ترمذي. دعوات: ٣٤٤٩. بخاري. تفسير: ٤٨٢٨ ، ٣٢٠٦ ، ٤٨٢٩ = تجريد رقم: ١٢٩٣ ، ١٦٩٥.

سوودەیش كە ئەم بایەی بۆ رەوانە كراوە، وە پەنا دەگرم بەتۆ لە شەڕی ئەم بایە خۆی، وە هەوەها لەو شەڕەیش كە لەناو ئەم بایەدا هەیە، وە هەروەها لەو شەڕەیش كە ئەم بایەی بۆ رەوانە كراوە! عائیشە دەیگووت: كە بەری ئاسمان لێڵ دەبوو، رەنگی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەگۆڕاو دەچووە دەرەوەو دەهاتە ژوورەوەو دەهات و دەچوو، جا كاتێ كە دەباری ئیتر حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) فەرامۆشی بۆ دەهات، منیش كە شارەزای ئەم حاڵەی بووم لەم بارەیەوە پرسیارم لێ كرد، فەرمووی: ئەی عائیشە! مەترسی ئەوەم هەیە كە ئەم هەورو هەڵایە وەك رۆژەكەی گەلی عاد وابێ، ئەوان بە تەمای باران بوون، كەچی بوو بە هەوری عەزاب وسزا، وەك خودا لە قورئانا دەفەرموێ:

{فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا: هَذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُم بِهِ: رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ – ٤٦/٢٤}.

**واتە:** جا كاتێ كە دییان وا پەڵە هەورێ لە ئاسۆی ئاسمانەوە بەرەو ئەوان دەكشێ، گوتیان: ئەمە هەوری بارانە، بارانمان بۆ دەبارێنێ! نەخەیر! هەور نیە، بەڵكوو ئەوە ئەو تۆڵەو سزایەیە كە ئێوە پەلەپەلتان بوو بۆهاتنی وا هات بۆتان ئەوە بایەك و شەپۆلە هەوایەكی ئاسمانیە سزایەكی سەختی تیا هەیە (م/ت).

## ١٧٧) باران موفەڕكە: (يتبرك بالمطر)

٩٤٨– عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَصَابَنَا وَنَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَطَرٌ، قَالَ: فَحَسَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثَوْبَهُ حَتَّى أَصَابَهُ مِنَ الْمَطَرِ. فَقُلْنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ لِمَ صَنَعْتَ هَذَا؟ قَالَ: لأَنَّهُ حَدِيثُ عَهْدٍ بِرَبِّهِ تَعَالَى. رَوَاهُ مُسْلِمٌ[1].

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جارێ لەگەڵ پێغەمبەر بووین (دروودی خوای لەسەربێ) باران باری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) جلەكانی خۆی هەڵماڵی و

---

(١) مسلم. استسقاء: ٢٠٨٠. أبو داود. أدب: ٥١٠٠.

سەری خۆی قوت کردو قۆڵ ولاقی خۆی رووت کردو خۆی دایە بەربارانەکە، ئێمەش گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆ وا دەکەی؟ فەرمووی: چونکە ئەم بارانە تازە لەلای پەروەردگاری گەورەوە هاتووە لەبەر ئەوە مووفەڕکە (م).

## ١٧٨) دروستە کە دۆستانی خودا بکرێن بە دەستگیرو دەستکەلا لەلای خودای گەورەو سەروەر: (يجوز التوسل الى الله بأحبابه)

٩٤٩- عَنْ أَنَسٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) كَانَ إِذَا قَحَطُوا اسْتَسْقَى بِالْعَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنَّا كُنَّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّنَا فَتَسْقِينَا وَإِنَّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِعَمِّ نَبِيِّنَا فَاسْقِنَا. قَالَ: فَيُسْقَوْنَ. رَوَاهُ البخاري[1].

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جاران کە تووشی بێ بارانی دەبوون عومەری کوڕی خەتاب (خوای لێ رازی بێ) بە خاتری عەباسی کوڕی عەبدولموطەلیب لە خودا دەپاڕایەوە بۆ باران و دەیگوت: خودایە! ئێمە لەمەوپێش لەکاتی پێویستیی باراندا، کاتێ کە پێغەمبەر خۆی (دروودی خوای لەسەربێ) لە ژیاندا بوو ئەو زاتەمان دەکرد بە دەستگیرو دەسکەلا لەلای تۆ، وە بە خاتری ئەو لە تۆ دەپاڕاینەوە تۆیش خاتری ئەوت دەگرت و دەهاتیت بە هاوارمانەوەو بارانت بۆ دەبارانین، ئێستایش بیکە بە خاتری عەباسی مامەی پێغەمبەری خۆشەویستمان بارانمان بۆ بڕەخسینە! گوتی: ئیتر بارانیان بۆ دەباری (ب).

٩٥٠- وَقَالَ: مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ إِنَّ أَبِي رَاى لَهُ فَضْلاً عَلَى مَنْ دُونَهُ فَقَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هَلْ تُنْصَرُونَ وَتُرْزَقُونَ إِلاَّ بِضُعَفَائِكُمْ. رَوَاهُ الخمسة إلاّ مسلماً ولفظ النسائي: إِنَّمَا يَنْصُرُ اللَّهُ هَذِهِ الأُمَّةَ بِضَعِيفِهَا بِدَعْوَتِهِمْ وَصَلاَتِهِمْ وَإِخْلاَصِهِمْ. وَسَيَأْتِي فِي الْجِهَادِ إِنْ شَاءَ اللهُ تَعالَى[2].

---

(١) بخاري. استسقاء: ١٠١٠ ، ٣٧١.

(٢) بخاري. جهاد: ٢٨٩٦.

موصعەبی کوڕی سەعد (خوایان لێ ڕازی بێ) گوتی: باوکم خۆی بە گەورەتر دەزانــی بەرابــەر بــە خواردەســتەکانی، پێغەمبــەریش (دروودی خــوای لەســەربێ) فـەرمووی: ئێـوە کـە خـودا نەصـرەتتان دەداو سـەرتان دەخـاو ڕۆژیتـان دەدا تەنیا لەبەر خاتری لازەبوونو بێ هێزو هەژارەکانتانە ئیتر چۆن خۆتـان لـەوان بە زلترو باشتر دەزانن! (ب/ت/د/ن) گفتەی (ن): خودای گەورە کە ئەم ئۆمـەتی ئیسلامە سەر دەخاو زاڵی دەکا ئەوە لەبەر خاتری لازەبوونو بێنەواکانیـەتی: بەهۆی ئەو نزاو پاڕانەوەو نوێژەوە کە ئەوان بە دڵێکی پاك دەیکەن.

٩٥١- عَنْ عُثْمَانَ بْنِ حُنَيْفٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَجُلاً ضَرِيرَ الْبَصَرِ أَتَـى النَّبِـيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: ادْعُ اللَّهَ أَنْ يُعَـافِيَنِي قَـالَ: إِنْ شِـئْتَ دَعَـوْتُ، وَإِنْ شِـئْتَ صَبَرْتَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ، قَالَ: فَادْعُهُ، فَأَمَرَهُ أَنْ يَتَوَضَّأَ فَيُحْسِنَ وُضُوءَهُ وَيَـدْعُوَ بِهَـذَا الدُّعَاءِ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ وَأَتَوَجَّهُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّكَ مُحَمَّدٍ نَبِيِّ الرَّحْمَةِ إِنِّي تَوَجَّهْتُ بِكَ إِلَى رَبِّي فِي حَاجَتِي هَذِهِ لِتُقْضَى لِي اللَّهُمَّ فَشَفِّعْهُ فِيَّ. رَوَاهُ الترمذي وابن ماجه[٣].

عوسمانی کوڕی حەنیف (خوای لێ ڕازی بێ) گـوتی: پیـاوێکی بـێ چـاو هاتـە خزمەتی حـەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) گـوتی: دووعـام بـۆ بکـە کـە خـودا چـاوم چاك بکاتـەوە، فـەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ): ئەگـەر حـەز دەکـەی دووعـات بـۆ دەکەم، ئەگـەر حـەزیش دەکـەی دیـان بـەخۆتا بگرەو ئـارام بگـرە لـە ژێـر بـاری خودادا ئارامگرتنەکەشت باشترە بۆت گوتی: قەیناکا لە خودا بپاڕێرەوە بۆم، جا پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەربێ) پێـی گـوت کـە لـە پێشا دەسنوێژێکی جـوان بگریو ئینجا بەم نزایە نزا بکا:

{اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ وَأَتَوَجَّهُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّكَ مُحَمَّدٍ نَبِيِّ الرَّحْمَةِ إِنِّي تَوَجَّهْتُ بِكَ إِلَى رَبِّي فِي حَاجَتِي هَذِهِ لِتُقْضَى لِي اللَّهُمَّ فَشَفِّعْهُ فِيَّ}.

ئــەی خوایــە! داوات لێ دەکــەمو ڕووت لێ دەنــێم کــە لەبــەر خــاتری موحەممەدی پێغەمبەری خۆت (کە پێغەمبـەری ڕەحمەتـە) مـرازم بدەی، ئـەی موحەممەد! تـۆ دەکـەم بـە دەستگیرو بـە دەسـکەلاو بـە تکاکـار لـەلای خودای

(٣) بسند حسن صحيح (شرحه).

خوٚم كە ئەم مرازەم بێنیتەجێ، ئەی خودایە! تكای محمد گێراكە بوٚمن! (ت/ئیبنو ماجە – سند حسن صحیح).

٩٥٢– عَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: اسْتَأْذَنْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الْعُمْرَةِ فَأَذِنَ لِي وَقَالَ: لاَ تَنْسَنَا يَا أُخَيَّ مِنْ دُعَائِكَ، فَقَالَ: عُمَرُ: كَلِمَةٌ مَا يَسُرُّنِي أَنَّ لِيَ بِهَا الدُّنْيَا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي ولفظه: اسْتَأْذَنْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الْعُمْرَةِ فَقَالَ: أَيْ أُخَيَّ أَشْرِكْنَا فِي دُعَائِكَ وَلاَ تَنْسَنَا. والله أعلم[٤].

عومەر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: روخصەتم خواست لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) كە بچم بوٚ عەمرە، ئەویش رێگەی دام و فەرمووی: برالە! فەراموٚشمان مەكە لە نزای خێرت. عومەر دەیگوت: ئەم وشەیەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) كە بەمنی فەرموو: برالە فەراموٚشمان مەكە لە نزای خێرت، بە هەموو سامان و موڵكی دنیا ناگوٚڕمەوە! (د/ت – سند حسن صحیح).

## ١٧٩) نوێژی چێشتەنگاو: (صلاة الضحى)

٩٥٣– عَنْ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ رَأَى قَوْمًا يُصَلُّونَ مِنَ الضُّحَى فَقَالَ: أَمَا لَقَدْ عَلِمُوا أَنَّ الصَّلاَةَ فِي غَيْرِ هَذِهِ السَّاعَةِ أَفْضَلُ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: صَلاَةُ الأَوَّابِينَ حِينَ تَرْمَضُ الْفِصَالُ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وأحمد[١].

زەیدی كوڕی ئەرقەم (خوای لێ رازی بێ) كوٚمەڵێكی دی لە كاتی خوٚركەوتندا چێشتە نوێژ (صلاة الضحى)یان دەكرد، گوتی: ئەدی ئەمانە خوٚشیان باش باش دەزانن كە ئەم نوێژە لە كاتێكی تردا بكرێ باشترە، چونكە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: نوێژی توبەكاران واتە: چێشتە نوێژ ئەوكاتە دەبێ كە خوٚر گەرم دەبێ و چەوو لم تاو دەسەنێ و سم و قاچی پارێنە وشتر داخ دەبێ! (م/ئەحمەد).

---

(٤) بسند حسن صحيح (شرحه).

(١) مسلم. صلاة الأوابين: ١٧٤٣ ، ١٧٤٤.

٩٥٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَوْصَانِي خَلِيلِي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِثَلَاثٍ: بِصِيَامِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، وَرَكْعَتَيِ الضُّحَى وَأَنْ أُوتِرَ قَبْلَ أَنْ أَنَامَ. رَوَاهُ الخمسة[٢].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: دۆستی ئازیزم پێغەمبەری خۆشەویست (درودی خوای لەسەربێ) ئەم سێ ئامۆژگارییەی کردووم: کە هەموو مانگێ سێ رۆژ بە رۆژوو بم، وە هەموو رۆژێ دوو رکات چێشتە نوێژ بکەم، وە هەموو شەوێ لەپێش خەوتندا نوێژی وەتر بکەم (ش/د/ت/ن).

٩٥٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي الضُّحَى أَرْبَعًا وَيَزِيدُ مَا شَاءَ اللَّهُ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ والنسائي وأحمد[٣].

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: یاسای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) وابوو، هەموو چێشتەنگاوێ چوار رکات نوێژی چێشتەنگاوی دەکرد، گەلێ جارانیش چەندەی خودا لە چارەی نوسیبوو زیاتری دەکرد! (د/م/ن/ئەحمەد).

٩٥٦- عَنْ هَانِئٍ بِنْتِ أَبِي طَالِبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) إِنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ الْفَتْحِ صَلَّى سُبْحَةَ الضُّحى ثَمَانِيَ رَكَعَاتٍ يُسَلِّمُ مِنْ كُلِّ رَكْعَتَيْنِ. وَفِي رِوَايَةٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دَخَلَ بَيْتَها يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ. فَاغْتَسَلَ وَصَلَّى ثَمانَ رَكَعاتٍ. رَوَاهُ الأربعة[٤].

ئومو هانیئ کچی ئەبو طالیب (خوای لێ رازی بێ) گوتی: رۆژی گرتنی شاری مەککە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هەشت رکات نوێژی سوننەتی چێشتەنگاوی کرد، لە هەموو دوو رکاتێکا سڵاوی دەدایەوە لە گێرانەوەیەکا:

---

(٢) بخاري. تهجد: ١١٧٦. مسلم. ضحى: ١٦٦٩. نسائي. قيام اليل: ١٦٧٦ ، ١٦٧٧.

(٣) مسلم. صلاة ضحى: ١٦٦١. ابن ماجه: ١٣٨١.

(٤) بخاري. تقصير الصلاة: ١١٠٣، ١١٧٦، ٤٢٩٢. مسلم. صلاة المسافرين: ١٦٦٤. أبو داود. صلاة: ١٢٩١. ترمذي. صلاة:٤٧٤.

ڕۆژی فەتحی مەککە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) هات بۆ ماڵی ئێمە، جا خۆی شۆردو هەشت ڕکات نوێژی چێشتەنگاوی کرد (ش/د/ت).

٩٥٧- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يُصْبِحُ عَلَى كُلِّ سُلاَمَى مِنْ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ، فَكُلُّ تَسْبِيحَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَحْمِيدَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَهْلِيلَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلُّ تَكْبِيرَةٍ صَدَقَةٌ، وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ صَدَقَةٌ، وَنَهْيٌ عَنِ الْمُنْكَرِ صَدَقَةٌ، وَيُجْزِئُ مِنْ ذَلِكَ رَكْعَتَانِ يَرْكَعُهُمَا مِنَ الضُّحَى. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وأبُو دَاوُدَ وأحمد(٥).

ئەبو ذەڕ (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەموو ڕۆژێ گشت جومگەو ئێسکێکی ئادەمیزاد خێرێکی دەکەوێتە سەر جا لەبەر ئەوەی کە هەموو کەسێ، سێ سەدو شەست ئێسك‌و ئەندامی هەیە سێ سەدو شەست خێری دەکەوێتەسەر: هەموو تەسبیحات‌و یادی خودا کردنێ خێرێکە، هەموو حەمدو سوپاسکردنێکی خودا خێرێکە، هەموو تەلیلەو (لا الـه الا الله) کردنـێ خێرێکـە، هـەموو ئـەڵلاهو ئەکبـەر کردنـێ خێرێکـە، فـەرمانکردنێ بـە چاکەیێ خێرێکـە نـەهی کردنـێ لـە خراپـەیێ خێرێکـە، وە کردنـی دوو ڕکـات نوێـژی چێـشتەنگاویش برێتیـی ئـەم خێرانـە سـەرجەم دەکەوێ (م/د/ئەحمەد).

٩٥٨- وَلَهُمَا: يُصْبِحُ عَلَى كُلِّ سُلاَمَى مِنِ ابْنِ آدَمَ صَدَقَةٌ: تَسْلِيمُهُ عَلَى مَنْ لَقِيَ صَدَقَةٌ وَأَمْرُهُ بِالْمَعْرُوفِ صَدَقَةٌ، وَنَهْيُهُ عَنِ الْمُنْكَرِ صَدَقَةٌ وَإِمَاطَتُهُ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ صَدَقَةٌ وَبُضْعَةُ أَهْلِهِ صَدَقَةٌ، وَيُجْزِئُ مِنْ ذَلِكَ كُلِّهِ رَكْعَتَانِ مِنَ الضُّحَى(٦).

دیـسان ئـەبو ذەڕ (خـوای لێ ڕازی بـێ) گـوتی: حـەزرەت (دروودی خـوای لەسـەربێ) دەفـەرموێ: هـەموو ڕۆژێ گـشت ئەنـدامێکی ئـادەمیزاد خێرێکـی دەکەوێتـە سەر: تووشی کەسێ ببێ‌و سڵاوی لێ بکا خێرێکە، فەرمانێ بکا بە چاکەیێ خێرێکە، نـەهی بکـا لـە خراپـەیێ خێرێکـە، ئازارێ لـە ڕێگـەیێ دوور بخاتـەوە

---

(٥) مسلم. صلاة ضحى: ١٦٦٨ – ١٦٧١. أبو داود. صلاة الضحى: ١٢٨٥ ، ١٢٨٦ ، ٥٢٤٣.

(٦) مسلم. صلاة ضحى: ١٦٦٨. رياض رقم: ١١٤٠/٢. أبو داود. صلاة: ١٢٨٥ ، ١٢٨٦ ، ٥٢٤٣ ، ٥٢٤٤.

خێرێکە، دروست ببێ لەگەڵ حەڵاڵی خۆیا خێرێکە، وە کردنی دوو رکات نوێژی چێشتنەگاویش برێتیی ئەم خێرانە سەرجەم دەکەوێ! (م/د).

٩٥٩- عَنْ نُعَيْمِ بْنِ هَمَّارٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: قَالَ: اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: يَا ابْنَ آدَمَ لاَ تُعْجِزْنِي مِنْ أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ فِي أَوَّلِ نَهَارِكَ أَكْفِكَ آخِرَهُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَأحمد والترمذي. ولفظه: ابْنَ آدَمَ ارْكَعْ لِي مِنْ أَوَّلِ النَّهَارِ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ أَكْفِكَ آخِرَهُ[٧].

نوعەیمی کوڕی هەممار (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خوای لەسەربێ): خودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: ئەی ئادەمیزاد! سەر لەبەیانیان چوار رکات نوێژم بۆ بکەو یادم بکە، ئیتر ماوەی ئەو رۆژەت لەسەرخۆم! (د/ئەحمەد/ت-س/ح) گفتەی (ت): ئەی ئادەمی! سەر لەبەیانی چوار رکات نوێژم بۆ بکە، ئیتر ماوەی ئەو رۆژەت لەسەر خۆم.

٩٦٠- عَنْ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ الْجُهَنِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ قَعَدَ فِي مُصَلاَّهُ حِينَ يَنْصَرِفُ مِنْ صَلاَةِ الصُّبْحِ حَتَّى يُسَبِّحَ رَكْعَتَيِ الضُّحَى لاَ يَقُولُ إِلاَّ خَيْرًا غُفِرَ لَهُ خَطَايَاهُ وَإِنْ كَانَتْ أَكْثَرَ مِنْ زَبَدِ الْبَحْرِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَالتِّرْمِذِي. ولفظه: مَنْ صَلَّى الْغَدَاةَ فِي جَمَاعَةٍ، ثُمَّ قَعَدَ يَذْكُرُ اللَّهَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ كَانَتْ لَهُ كَأَجْرِ حَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ تَامَّةً تَامَّةً تَامَّةً[٨].

موعاذی کوڕی ئەنەسی جوهەنی (دروودی خوای لەسەربێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەرکەسێ (کە لە نوێژی بەیانی دەبێتەوە) لەسەر جێگە نوێژەکەی خۆی دانیشێ و قسەی چاك و باش نەبێ قسەی تر نەکا هەتا دوو رکاتە سوننەتەکەی چێشتەنگاویش دەکا، هەر کەسێ ئاوا بکا ئیتر خودا لە گوناەو تاوانەکانی خۆش دەبێ، ئەگەر چی لە کەفی دەریاش زۆر تر بن! (د/ت-س/ح) گفتەی (ت): هەر کەسێ نوێژی بەیانی بە کۆمەڵی بەجەماعەت بکا، ئینجا دابنیشێ و خەریکی یادی خودا بێ تا خۆر هەڵدێ،

---

(٧) بسند حسن (شرحه).

(٨) بسند حسن (شرحه).

لەپاشا دوو ركات نوێژی سوننەتی چێشتەنگاو بكا ئەوە پاداشی حەجێكی تەواو تەواو تەواوو عەمرەیەكی تەواو تەواو تەواوی بۆ هەیە.

٩٦١- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ خَرَجَ مِنْ بَيْتِهِ مُتَطَهِّرًا إِلَى صَلاَةٍ مَكْتُوبَةٍ. فَأَجْرُهُ كَأَجْرِ الْحَاجِّ الْمُحْرِمِ، وَمَنْ خَرَجَ إِلَى تَسْبِيحِ الضُّحَى لاَ يُنْصِبُهُ إِلاَّ إِيَّاهُ فَأَجْرُهُ كَأَجْرِ الْمُعْتَمِرِ، وَصَلاَةٌ عَلَى أَثَرِ صَلاَةٍ لاَ لَغْوَ بَيْنَهُمَا كِتَابٌ فِي عِلِّيِّينَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[٩].

ئەبو ئومامە (خوای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ: (دروودی خوای لەسەربێ): هەر كەسێ بە پاكی و بە دەسنوێژەوە لەماڵ دەرچێ بەنیازی چوون بۆ نوێژی فەرز، ئەوە وەك ئەو حاجییەی كە لە ئیحرام دابێ پاداشی باشی بۆ هەیە، وە هەر كەسێ بە تایبەتی بچێ بۆ نوێژی سوننەتی چێشتە نوێژ ئەوە بەقەد پاداشی عەمرەكەرێ پاداشی بۆ هەیە، نوێژ لەسەر نوێژیش (كە قسەی پڕوپوچیان لە نێواندا نەبێ) دەكرێ بە شانامەو لە روو پەڕەی دیوانی عیلیین تۆمار دەكرێ، عیلیین ناوی دەفتەرێكی گەورەی پیرۆزە، ناوی هەر كەسێكی تیا دانرا ئەوە نیشانەی هات و خۆشبەختیەتی، ئەو دەفتەرە دەستە دەستە فریشتەو نزیكانی بارەگا دەچن تەماشای دەكەن! (د-سند صالح).

٩٦٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ حَافَظَ عَلَى شُفْعَةِ الضُّحَى غُفِرَ لَهُ ذُنُوبُهُ وَإِنْ كَانَتْ مِثْلَ زَبَدِ الْبَحْرِ. رَوَاهُ الترمذي[١٠].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەركەسێ ئاگاداری دوو ركاتەكەی نوێژی چێشتەنگاو بكاو نەیان فەوتێنێ خودا لە گوناهەكانی خۆش دەبێ، ئەگەر چی وەك كەفی دەریاش ئاوا زۆربن!(ت).

---

(٩) بسند صالح (شرحه).

(١٠) سكت عنه الشارح.

## ١٨٠) نوێژی سوننەتی لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان (سوننەتی زەوال): (سنة الزوال)

٩٦٣- عَنْ أَبِي أَيُّوبَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَرْبَعٌ قَبْلَ الظُّهْرِ لَيْسَ فِيهِنَّ تَسْلِيمٌ تُفْتَحُ لَهُنَّ أَبْوَابُ السَّمَاءِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي. ولفظه: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي أَرْبَعًا بَعْدَ أَنْ تَزُولَ الشَّمْسُ قَبْلَ الظُّهْرِ وَقَالَ: إِنَّهَا سَاعَةٌ تُفْتَحُ فِيهَا أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَأُحِبُّ أَنْ يَصْعَدَ لِي فِيهَا عَمَلٌ صَالِحٌ. والله أعلم[1].

ئەبو ئەییوب (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرمویٚ: چوار ركات نوێژ هەیە بەسەریەكەوە دەكرێن، بەیەك سلاٌودانەوە، لەپێش نیوەڕۆ وەن ئەوەندە پەسەندو گەورەن هەموو دەرگاكانی ئاسمانیان بۆ دەخرێتە سەرپشت! (د/ت-س/ح) گفتەی (ت): جاران پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) كە خۆر لای دەدا لەناوەڕاستی ئاسمان لە پێش نیوەڕۆدا چوار ركات نوێژی دەكرد، وە دەیفەرموو (دروودی خوای لەسەربێ): لەم حەلەدا هەموو دەرگاكانی ئاسمان دەكرێنەوە لەبەر ئەوە حەز دەكەم كە كردەوەیەكی باشی منیان لێوە سەركەوێ!

٩٦٤- عَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَرْبَعٌ قَبْلَ الظُّهْرِ بَعْدَ الزَّوَالِ تُحْسَبُ بِمِثْلِهِنَّ مِنْ صَلاَةِ السَّحَرِ وَلَيْسَ مِنْ شَيْءٍ إِلاَّ وَهُوَ يُسَبِّحُ اللَّهَ تِلْكَ السَّاعَةَ ثُمَّ قَرَأَ (يَتَفَيَّأُ ظِلاَلُهُ عَنِ الْيَمِينِ وَالشَّمَائِلِ سُجَّدًا لِلَّهِ وَهُمْ دَاخِرُونَ) رَوَاهُ الترمذي بسندٍ غريب. سَيَرِدَ نص هذا الحديث في تفسير سورة النحل في المجلد الرابع[2].

لە عومەرەوە (خوای لێ ڕازی بێ) پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: چوار ركات نوێژی سوننەت هەن، لەپێش بوونی نوێژی نیوەڕۆدا دەبن، لەپاش لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان دەكرێن، خۆیان دەدەن لە

---

(١) بسند حسن (شرحه).

(٢) رواه الترمذي بسند غريب.

چوار ركات نوێژی بەرەبەیان، لەوكاتەو حەلەدا شت نیە كە یادی پاكی یەزدان نەكا ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە:

{يَتَفَيَّأُ ظِلاَلُهُ عَنِ الْيَمِينِ وَالْشَّمَآئِلِ سُجَّدًا لِلَّهِ وَهُمْ دَاخِرُونَ – ١٦/٤٨}.

ئایا تەماشای ئەو شتانە ناكەن كە خودا دروستی كردوون، كە چۆن سێبەرەكانیان بەهۆی خۆرەوە ئەم دیوو ئەو دیو دەكەن‌و جارێ بەلای راست‌و جارێ بەلای چەپا لار دەبێتەوە، لە حاڵێكا ئەو شتانە هەموو كڕنووشی سەر دانەواندنی خۆیان پێشكەشی بارەگای پەروەردگاری جیهان دەكەن، وە هەموو رام‌و داماون لەژێر باری خوداو بە فەرمانی ئەو بەملكەچی دێن‌و دەچن! (ت/سند غریب).

### ١٨١) باسی شەو نوێژو گەورەیی شەو نوێژ: (صلاة الليل وفضلها)

{قَالَ: أللهُ تَعالى – وَمِنَ اللَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِ نَافِلَةً لَّكَ عَسَى أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا – ١٧/٧٩}.

خودای گەورە دەفەرموێ: سەرەڕای نوێژە فەرزەكان بەشەو واز لە خەوبێنە هەندێ شەو نوێژ بكەو قورئانی تیا بخوێنە، هیوا هەیە لە نوورو بەرەكەتی ئەم طاعەتە جوانەوە خودا لە رۆژی قیامەتا بتباتە پایەو مەقامە پەسەندەكە، كە پایەی تكاو شەفاعەتی گەورەیە لەدوا رۆژدا.

٩٦٥– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَنْزِلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرُ يَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ، مَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ مَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ. رَوَاهُ الأربعة[١].

---

(١) بخاري. توحيد: ١١٤٥ ، ٦٣٢١ ، ٧٤٩٤. مسلم. صلاة المسافرين: ١٧٦٩ – ١٧٧٥. أبو داود. صلاة: ١٣١٥ ، ٤٧٣٣. ترمذي. دعوات: ٣٤٩٨.

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: لە سێیەکی دواییی شەودا، هەموو شەوێ، خودای پەروەردگاری پیرۆزو گەورەمان دێتە خوارەوە بۆ ئاسمانی خواروو، دەفەرموێ: کێ لەم دەمەدا لێم دەپاڕێتەوە تا بچم بەهاواریەوە، کێ لەم دەمەدا داوای شتم لێ دەکا تا بەشی بدەمو بێ بەشی نەکەم، کێ داوای لێخۆشبوونم لێ دەکا تا لێی خۆش بم! (ش/د/ت).

٩٦٦- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَنْزِلُ اللَّهُ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا كُلَّ لَيْلَةٍ حِينَ يَمْضِي ثُلُثُ اللَّيْلِ الأَوَّلُ فَيَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ أَنَا المَلِكَ، مَنْ ذَا الَّذِي يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ، مَنْ ذَا الَّذِي يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ، مَنْ ذَا الَّذِي يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ، فَلاَ يَزَالُ كَذَلِكَ حَتَّى يُضِيءَ الْفَجْرُ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وَالتِّرْمِذِي(٢).

دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەموو شەوێ (کە سێیەکی یەکەمی شەو دەڕوا) خودا دێتە خوارەوە بۆ ئاسمانی خواروو کە یەکەم ئاسمانە بەنیسبەت دنیاوە، دەفەرموێ: پادشای راستەقینە هەر خۆمم کێیە ئەو کەسەی لەم کاتی بارانی نوورو رەحمەتەدا بانگم لێ دەکا تابچم بەدەنگیەوە، کێیە ئەو کەسەی داوام لێ دەکا تا بەشی بدەم، کێیە ئەو کەسەی کە داوای لێخۆشبوونم لێ دەکا تا لێی خۆش بم، ئیتر هەروا دەفەرموێ لەوێ تاڕۆژی رووناك دەبێتەوە (م/ت).

٩٦٧- وَلِمُسْلِمٍ: إِنَّ فِي اللَّيْلِ لَسَاعَةً لاَ يُوَافِقُهَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ يَسْأَلُ اللَّهَ خَيْرًا مِنْ أَمْرِ الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ إِلاَّ أَعْطَاهُ إِيَّاهُ وَذَلِكَ كُلَّ لَيْلَةٍ(٣).

حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەموو شەوێ ماوەیەکی تیا هەیە هەرپیاوێکی موسوڵمان بۆی رێ بکەوێ لەو حەلەدا داوای هەرچی بکا لە خودا لە خێرو بێری هەردوو جیهان خودا بێ دڵی ناکاو ئەو شتەی دەداتێ (م- خودای لێ رازی بێ).

---

(٢) مسلم. صلاة المسافرين: ١٧٦٩ — ١٧٧٥. ترمذي. صلاة: ٤٤٦.

(٣) مسلم. صلاة المسافرين: ١٧٦٧ ، ١٧٦٨.

٩٦٨- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ رَمَضَانَ شَهْرُ اللَّهِ الْمُحَرَّمُ. وَأَفْضَلُ الصَّلاَةِ بَعْدَ الْفَرِيضَةِ صَلاَةُ اللَّيْلِ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ البخاري[٤].

دیسان ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: لەپاش رۆژووی رەمەزان گەورەترین رۆژوو رۆژووی موحەڕەمە کە مانگی خودایە، لەپاش نوێژی فەرزیش گەورەترین نوێژ نوێژی شەو نوێژە (م/د/ت/ن).

٩٦٩- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ عَلَى قَافِيَةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ، إِذَا هُوَ نَامَ ثَلاَثَ عُقَدٍ يَضْرِبُ كُلَّ عُقْدَةٍ: عَلَيْكَ لَيْلٌ طَوِيلٌ فَارْقُدْ، فَإِنِ اسْتَيْقَظَ فَذَكَرَ اللَّهَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِنْ تَوَضَّأَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِنْ صَلَّى انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَأَصْبَحَ نَشِيطًا طَيِّبَ النَّفْسِ، وَإِلاَّ أَصْبَحَ خَبِيثَ النَّفْسِ كَسْلاَنَ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ الترمذي[٥].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: کە دەخەون شەیتان سێ گرێ دەدا لە پشتی سەرتانو یەکە یەکە دەست دەماڵێ بە گرێکانا و دەڵێ: بخەوە شەوگارێکی دوورو درێژ لەسەرت بێ، جا ئەگەر خەوتوو خەبەری بۆوەو یادی خودای کرد گرێیەکیان دەکرێتەوە، خۆ ئەگەر دەسنوێژیشی گرت ئەوا گرێیەکی تریشیان دەکرێتەوە، وە ئەگەر نوێژیشی کرد ئیتر هەموو گرێکان بە تەواوی دەکرێنەوە، وە خۆشی گورجو گۆڵو دڵخۆش دەبێتەوە، ئەگینا بە پەستیو دڵگرانیو تەمبەڵی دەمێنێتەوە! (ش/د/ن).

٩٧٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: ذُكِرَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلٌ فَقِيلَ: مَا زَالَ نَائِماً حَتَّى أَصْبَحَ مَا قَامَ إِلَى الصَّلاَةِ فَقَالَ: بَالَ الشَّيْطَانُ فِي أُذُنَيْهِ. رَوَاهُ الشيخان والنسائي[٦].

---

(٤) مسلم. صيام: ٢٧٤٧ ، ٢٧٤٨. أبو داود. صوم: ٢٤٢٩. ترمذي. صلاة: ٤٣٨. نسائي. قيام الليل: ١٦١٢ ، ١٦١٣.

(٥) بخاري قيام الليل: ١١٤٢ ، ٣٢٦٩. مسلم. صلاة المسافرين: ١٨١٦. نسائي. قيام الليل: ١٦٠٦.

(٦) بخاري. تهجد: ١١٤٤ ، ٣٢٧٠. مسلم. صلاة المسافرين: ١٨١٤. نسائي. قيام الليل: ١٩٠٧ ، ١٦٠٨.

عەبدوڵڵا (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەربێ) باسی کابرایەك کرا، گوترا: هەتا بەیانەکی هەر نوستبوو، وە نەچوو بوو بەلای شەونوێژەوە! پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوە شەیتان گمێزی کردووەتە ناو گوێچکەیەوە (ش/ن).

٩٧١- عَنْ الْمُغِيرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: إِنْ كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَيَقُومُ لِيُصَلِّيَ حَتَّى تَرِمُ قَدَمَاهُ أَوْ سَاقَاهُ، فَيُقَالُ لَهُ: فَيَقُولُ: أَفَلاَ أَكُونُ عَبْدًا شَكُورًا؟ رَوَاهُ الشيخان والنسائي والترمذي ولفظه: صَلَّى رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَتَّى انْتَفَخَتْ قَدَمَاهُ فَقِيلَ لَهُ: أَتَتَكَلَّفُ هَذَا وَقَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ؟ فَقَالَ: أَفَلاَ أَكُونُ عَبْدًا شَكُورًا[٧].

موغیرە (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ئەوەندە لەشەو نوێژدا بە پێوە ڕاوەستابوو هەردوو قاچی (یا هەردوو لاقی) پەنەمابوون، جا یاران (خوایان لێ ڕازی بێ) پێیان دەگوت: ئەی خۆشەویستی خودا! بۆ ئەوەندە خۆت ماندوو دەکەی خۆ تۆ خودا لە هەموو گوناهێکت خۆش بووە کەواتە بۆ وا لەخۆت دەکەیتو ئەوەندە خۆت ماندوو دەکەیت!؟ ئەویش (دروودی خوای لەسەربێ) دەیفەرموو: ئەدیی نابێ کەمنیش بەندەیەکی شوکرکەرو عەبدێکی سوپاسگوزاربم؟ (ش/ن/ت) گفتەی (ت): پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ئەوەندە زۆر شەو نوێژی دەکرد تا هەر دوو پێی ئاوسابوون، جا عەرزیانکرد: ئەم هەموو ئەرکە بۆ دەکێشی، خۆ تۆ خودا لە گوناهی بەرو دوات خۆش بووە!؟ ئەویش دەیفەرموو: ئاخر دەبێ منیش بەندەیەکی سوپاس بژێربم!

٩٧٢- أُمِّ سَلَمَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اسْتَيْقَظَ لَيْلَةً فَقَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ مَاذَا أُنْزِلَ اللَّيْلَةَ مِنَ الْفِتَنِ؟ مَاذَا أُنْزِلَ مِنَ الْخَزَائِنِ؟ مَنْ يُوقِظُ صَوَاحِبَ الْحُجُرَاتِ؟ يَا رُبَّ كَاسِيَةٍ فِي الدُّنْيَا عَارِيَةٍ فِي الآخِرَةِ. رَوَاهُ البخاري[٨].

---

(٧) بخاري. تهجد: ١١٣٠ ، ٤٨٣٦ ، ٦٤٧١. مسلم. صفات المنافقين: ٧٠٥٥ — ٧٠٥٧. ترمذي. صلاة: ٤١٢. نسائي. قيام الليل: ١٦٤٣.

(٨) بخاري. تهجد: ١١٢٦.

ئوممو سەلەمە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: شەوێ لە شەوان حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) لە خەو هەستا، فەرمووی: نامە خوا لەکاری خوا! ئەم شەو چی ئاژاوەو ئاشووب داباری؟ وەچی گەنج و خەزنە داباری؟ خۆزگە یەکێ دایکانی موسولمانان (أُمَّهَاتُ الْمُؤْمنِينَ)ی لە خەوهەڵدەستان بۆ شەو نوێژو خودا پەرستی، ئای کە چەندەها کەس هەن لەم جیهانەدا پۆشتەو پەرداخن، کەچی لە دوا ڕۆژدا رووت و قووتن! (ب).

٩٧٣- عَنْ عَبْدَ اللّٰهِ بْنَ عَمْرٍو (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَحَبُّ الصَّلاَةِ إِلَى اللّٰهِ صَلاَةُ دَاوُدَ (عَلَيْهِ السَّلاَمُ) وَأَحَبُّ الصِّيَامِ إِلَى اللّٰهِ صِيَامُ دَاوُدَ، وَكَانَ يَنَامُ نِصْفَ اللَّيْلِ وَيَقُومُ ثُلُثَهُ، وَيَنَامُ سُدُسَهُ، وَيَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا. رَوَاهُ الثلاثة[٩].

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوایان لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: پەسەندترین نوێژ لەلای خودا ئەو نوێژەیە کە لەسەر دەستووری نوێژی داوودبێ (دروودی خوای لەسەربێ) وە هەروەها ڕۆژووش، وە یاسای داوودیش ئاوابوو: نیوەی شەو دەخەوت، سێ یەکێکی شەویش شەو نوێژی دەکرد ئەمە دەکاتە پێنج بەش لە شەش بەش وە ئەو شەشیەکەکەی تریشی دەخەوتەوە! وە ڕۆژ نا ڕۆژێکیش بەڕۆژوو دەبوو (ش/د).

٩٧٤- عَنْ عَلِيٍّ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) طَرَقَهُ وَفَاطِمَةَ لَيْلَةً فَقَالَ: أَلاَ تُصَلِّيَان. فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ، أَنْفُسُنَا بِيَدِ اللّٰهِ، فَإِذَا شَاءَ أَنْ يَبْعَثَنَا بَعَثَنَا. فَانْصَرَفَ حِينَ قُلْنَا ذَلِكَ وَلَمْ يَرْجِعْ إِلَيَّ شَيْئًا، ثُمَّ سَمِعْتُهُ وَهْوَ مُوَلٍّ يَضْرِبُ فَخِذَهُ وَهْوَ يَقُولُ: (وَكَانَ الإِنْسَانُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلاً). رَوَاهُ الشيخان والنسائي[١٠].

عەلی (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: شەوێ حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) تەشریفی هێنا بۆ لای من و فاطیمە (سەیری کرد نووستووین) فەرمووی: ئەرێ بۆ شەو

---

(٩) بخاري. تهجد: ١١٣١ ، ١١٥٢ ، ١١٥٣ ، ١٩٧٥ ، ١٩٧٦ ، ١٩٧٧ ، ١٩٧٨ ، ١٩٧٩ ، ١٩٨٠ ، ٣٤١٨ ، ٣٤١٩ ، ٣٤٢٠ ، ٥٠٥٢ ، ٥٠٥٣ ، ٥٠٥٤ ، ٥١٩٩ ، ٦١٣٤ ، ٦٢٧٧. مسلم. صيام: ٢٧٣١ ، ٢٧٣٢. نسائي. قيام الليل: ١٦٢٩ ، ٢٤٤٣.

(١٠) بخاري. تهجد: ١١٢٧ ، ٤٧٢٤ ، ٧٣٤٧ ، ٧٤٦٥. مسلم. صلاة المسافرين: ١٨١٥. نسائي. قيام الليل: ١٦١٠ ، ١٦١١.

نوێژناكەن، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! گیانمان وا لە دەستی خودا خۆیدایە، هەركاتێ خۆی حەزكا هەڵمان بسێنێ ئەوا هەڵمان دەسێنێ! جا كەوام گوت گەڕایەوە هیچ وەڵامی نەدامەوە، لەپاشا كە دوور كەوتەوە گوێم لێ بوو دەیدا بە رانی خۆیداو دەیفەرموو:

{وَكَانَ الْإِنسَانُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا — ١٨/٥٤}.

**واتە:** ئادەمیزاد لە راستیدا بۆ دەمبارزیو دەمە دەمێو دەمە وەری لە هەموو گیانلەبەرێكی تر زیاتر حەزی لێیە كە بەناحەق شۆرو غەوغای زۆر بەرپابكا! (ش/ن).

٩٧٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا أَيْقَظَ الرَّجُلُ أَهْلَهُ مِنَ اللَّيْلِ فَصَلَّيَا جَمِيعًا كُتِبَا فِي الذَّاكِرِينَ وَالذَّاكِرَاتِ[11].

ئـەبو هـورەیرە (خـوای لێ رازی بـێ) دەڵـێ: حـەزرەت (دروودی خـوای لەسـەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر پیاو (لەشەودا) خێزانەكەی خۆی خەبەر بكاتەوەو پێكەوە شەو نوێژ بكەن ناویان لەناو پیاوو ژنە ذیكر كەرەكاندا دەنووسرێ خودای گەورەش دەفەرموێ:

{وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا — ٣٣/٣٥}.

ئەو پیاوو ژنانەی كە بەزمانو دڵ هەمیشە ذیكری خودا دەكەن بە پەنامەكیو ئاشكرا، ئەوانە خودا لێخۆشبوونی خۆیو پاداشی گەورەی بۆ ئامادە كردوون (د/ن/ئیبنو ماجە).

٩٧٦- وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: رَحِمَ اللَّهُ رَجُلاً قَامَ مِنَ اللَّيْلِ فَصَلَّى وَأَيْقَظَ امْرَأَتَهُ، فَإِنْ أَبَتْ نَضَحَ فِي وَجْهِهَا الْمَاءَ. رَحِمَ اللَّهُ امْرَأَةً قَامَتْ مِنَ

(١١) سكت عن درجته الشارح.

اللَّيْلِ فَصَلَّتْ وَأَيْقَظَتْ زَوْجَهَا فَإِنْ أَبَى نَضَحَتْ فِي وَجْهِهِ الْمَاءَ. رَوَاهُمَا أَبُو دَاوُدَ وَالنَسائي وابن ماجه[١٢].

دیسان دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: رەحمەتی خودا لەو پیاوەبێ کە بەشەو هەڵدەستی شەو نوێژ دەکاو ژنەکەشی هەڵدەسێنێ، خۆ ئەگەر ژنەکەی بە گوێی نەکردو هەڵ نەسا با ئاو بپرژێنێ لە دەمو چاوی، رەحمەتی خودا لەو ژنەبێ کە بەشەو هەڵدەسێ شەو نوێژ دەکاو مێردەکەشی هەڵدەسێنێ، خۆ ئەگەر مێردەکەی بە گوێی نەکردو هەڵنەسا با ئاو بپرژێنێ لەدەمو چاوی! (د/ن/ ماجە. ماجە = ئیبنو ماجە).

٩٧٧- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: عَلَيْكُمْ بِقِيَامِ اللَّيْلِ فَإِنَّهُ دَأْبُ الصَّالِحِينَ قَبْلَكُمْ وَهُوَ قُرْبَةٌ إِلَى رَبِّكُمْ وَمَكْفَرَةٌ لِلسَّيِّئَاتِ وَمَنْهَاةٌ لِلإِثْمِ. وَفِي رِوَايَةٍ: وَمَطْرَدَةٌ لِلدَّاءِ عَنِ الْجَسَدِ. رَوَاهُ الترمذي وأحمد والحاكم[١٣].

ئەبو ئومامە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: خووبگرن بەشەو نوێژەوە، چونکە شەونوێژ پیشەی پیاو چاکانە لە مێژەوە، وە هەروەها دەبێ بەهۆی نزیکبوونەوە لە خوداوە، وە دەبێ بە کەفارەتی خراپەو هەروەها لە گوناهیش دەتانگێرێتەوە! لە گێرانەوەیەکدا: وە دەردیش لە لەش دەردەکا (ت/ئەحمەد/حاکم).

## ١٨٢) ژمارەو چۆنیێتی شەو نوێژ : (عدد صلاة الليل وكيفيتها)

٩٧٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ مِنَ اللَّيْلِ فَلْيَفْتَتِحْ صَلاتَهُ بِرَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وَأَبُو دَاوُدَ وَأَحمد[١].

---

(١٢) سكت عن درجته الشارح.

(١٣) كست عن درجته الشارح.

(١) مسلم. صلاة المسافرين: ١٨٠٤.

**ئـەبو هـورەیرە** (خـوای لێ رازی بـێ) **گـوتی: پێغەمبـەر** (دروودی خـوای لەسـەربێ) **دەفەرمویّ: کە شەو هەڵسان بۆ شەونوێژ، لە پێشا بە دوو رکاتی سووکەڵە دەست پێ بکەن (م/د/ئەحمەد).**

**٩٧٩- عَنِ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ أللهُ عَنْهُمَا) إنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، كَيْفَ صَلاَةُ اللَّيْلِ؟ قَالَ: مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خِفْتَ الصُّبْحَ فَأَوْتِرْ بِوَاحِدَةٍ. رَوَاهُ الخمسة[٢].**

**ئیبنو عومەر** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! شەونوێژ چۆنە؟ فەرمووی: دوو رکاتە دوو رکات، کە ترسی بەیانت هەبوو تاقە یەك رکات بکە (ش/د/ت/ن).**

**٩٨٠- وَسُأَلْتُ عَائِشَةَ (رَضِيَ أللهُ عَنْهَا) عَنْ صَلاَةِ رَسُولِ اللهِ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **بِاللَّيْلِ فَقَالَتْ: سَبْعٌ وَتِسْعٌ وَإِحْدَى عَشْرَةَ سِوَى رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ. رَوَاهُ البخاري[٣].**

**پرسیار کرا لە عائیشە** (خوای لێ رازی بێ) **لەبارەی شەونوێژی پێغەمبەرەوە** (دروودی خوای لەسەربێ) **گوتی: جگە لە دوو رکاتە سوننەتەکەی بەیانی، جاری وا دەبوو حەوت رکاتی دەکرد، جاری وا دەبوو نۆ رکاتی دەکرد، جاری وا دەبوو یازدە رکاتی دەکرد** (ب- بەر شەپۆلی رەحمەتی خودای گەورە کەوێ).

**٩٨١- وَعَنْهَا قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، مِنْهَا الْوِتْرُ وَرَكْعَتَا الْفَجْرِ[٤].**

**دیسان لە عائیشەوە** (خوای لێ رازی بێ) **دەڵێ: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **بە وەترو دوو رکاتە سوننەتەکەی بەیانییەوە بەشەو سیازدە رکات نوێژی سوننەتی دەکرد! (ش/د/ت/ن).**

---

(٢) بخاري. وتر: ٩٩٠. مسلم. صلاة المسافرين: ١٧٤٥ ، ١٧٤٦ ، ١٧٤٧. أبو داود. صلاة الليل: ١٣١٦. نسائي. قيام الليل: ١٦٩٣. تحفة الأشراف: ٧٢٢٥.

(٣) بخاري. تهجد: ١١٣٩.

(٤) بخاري. تجهد: ١١٤٠. مسلم. صلاة المسافرين: ١٧١٧ – ١٧١٩. ترمذي. وتر: ٤٥٩. أبو داود. صلاة الليل: ١٣٦٠.

٩٨٢- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) كَيْفَ كَانَتْ صَلاَةُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي رَمَضَانَ؟ فَقَالَتْ: مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَزِيدُ فِي رَمَضَانَ وَلاَ فِي غَيْرِهِ عَنْ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، يُصَلِّي أَرْبَعًا فَلاَ تَسَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي أَرْبَعًا فَلاَ تَسَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي ثَلاَثًا، فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَتَنَامُ قَبْلَ أَنْ تُوتِرَ؟ فَقَالَ: يَا عَائِشَةُ! إِنَّ عَيْنَيَّ تَنَامَانِ وَلاَ يَنَامُ قَلْبِي. رَوَاهُمَا الخمسة[٥].

ئەبو سەلەمەی کوڕی ئەورەحمان (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: لە عائیشەم پرسی: لە ڕەمەزانا نوێژی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) چۆن بوو وەچەن رکات بوو؟ گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نە لە ڕەمەزان و نە لە غەیری ڕەمەزانا لە یازدە رکات زیاتری نەدەکرد، لە پێشا چوار رکاتی دەکرد مەپرسە لە جوانی و درێژییان، ئینجا چوار رکاتی تریشی دەکرد مەپرسە لە جوانی و درێژییان، ئینجا سێ رکاتی تریشی دەکرد، عائیشە گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! بەر لەوە کە وەتر بکەی دەتبینم جارە جارە دەخەوی؟ فەرمووی: ئەی عائیشە! چاوەکانم دەخەون بەڵام دڵم ناخەوێ! (ش/د/ت/ن).

٩٨٣- عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: لأَرْمُقَنَّ صَلاَةَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اللَّيْلَةَ. وَفِي رِوَايَةٍ: فَتَوَسَّدْتُ عَتَبَتَهُ أَوْ فُسْطَاطَهُ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ طَوِيلَتَيْنِ طَوِيلَتَيْنِ طَوِيلَتَيْنِ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَهُمَا دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَهُمَا دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَهُمَا دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَهُمَا دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا ثُمَّ أَوْتَرَ، فَذَلِكَ ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً. رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ البخاري[٦].

---

(٥) بخاري. تهجد: ١١٤٧ ، ٢٠١٣ ، ٣٥٦٩. مسلم. صلاة المسافرين: ١٧٢٠ — ١٧٢٢. ترمذي. وصف صلاة النبي: ٤٣٩. نسائي. قيام الليل: ١٦٩٦. أبو داود. صلاة الليل: ١٣٤١.

(٦) مسلم. صلاة المسافرين: ١٨٠١. أبو داود. صلاة الليل: ١٣٦٦.

زەیدی كوڕی خالیدی جوهەنی (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: گوتم: دەبێ ئەم شەو سەرنجی شەونوێژی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بدەم. لە گێڕانەوەیەكا: گوتی: ئینجاكو سەرم كردە سەر بەردەرگاكەی (یا گوتی: سەرم كردە سەر ساباتەكەی) جا سەرنجمدا لە پێشا دوو ركات نوێژی سووكەڵەی كرد، لە پاشا دوو ركات نوێژی درێژ درێژ درێژی كرد، ئینجا دوو ركاتی تریشی كرد، ئینجا دوو ركاتی تریشی كرد، ئینجا دوو ركاتی تریشی كرد، ئینجا دوو ركاتی تریشی كرد، جار لەگەڵ جارا دوو ركاتەكەی كورتتر دەكردەوە، ئینجا كە وەتریشی كرد، كە ئەمەیش سەرجەمی دەكاتە سیازدە ركات (م/د/ت/ن).

## ١٨٣) لەشەو نوێژدا قورئانخوێندن هەم بە دەنگی بەرزو هەم بە دەنگی نزم دروستە: (صلاة الليل بين الجهر والإسرار)

٩٨٤- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) خَرَجَ لَيْلَةً فَإِذَا هُوَ بِأَبِي بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) يُصَلِّي يَخْفِضُ مِنْ صَوْتِهِ قَالَ: وَمَرَّ بِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ وَهُوَ يُصَلِّي رَافِعًا صَوْتَهُ قَالَ: فَلَمَّا اجْتَمَعَا عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَا أَبَا بَكْرٍ مَرَرْتُ بِكَ وَأَنْتَ تُصَلِّي تَخْفِضُ صَوْتَكَ قَالَ: قَدْ أَسْمَعْتُ مَنْ نَاجَيْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: وَقَالَ: لِعُمَرَ: مَرَرْتُ بِكَ وَأَنْتَ تُصَلِّي رَافِعًا صَوْتَكَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أُوقِظُ الْوَسْنَانَ وَأَطْرُدُ الشَّيْطَانَ، فَقَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَا أَبَا بَكْرٍ ارْفَعْ مِنْ صَوْتِكَ شَيْئًا وَقَالَ: لِعُمَرَ: اخْفِضْ مِنْ صَوْتِكَ شَيْئًا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي (وفي رواية له: كلكم قد أصاب)[1].

ئەبو قەتادە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: شەوێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەردەچێ، لەلای ئەبو بەكرەوە ڕەت دەبێ، دەبینێ خەریكی شەو نوێژەو دەنگی خۆی كپ كردووە، لەلای عومەری كوڕی خەطابیشەوە تێ دەپەڕێ دەبینێ ئەویش خەریكی شەونوێژە بەڵام بە دەنگی بەرز، كاتێ كە هەر

(١) بسند غريب (شرحه).

دووكیان یەكیان گرت لە خزمەتی حەزرەتدا (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەی ئەبو بەكر! بەلاتا تێ پەڕیم بە دەنگی نزم شەونوێژت دەكرد ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو كەسە كە رازو گوفتوگۆم بوو لەگەڵی گوێی لێم بوو. بە عومەریشی فەرموو: لەلای تۆیشەوە رەت بووم شەو نوێژت دەكرد بە دەنگی بەرز ئەویش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! هەم خەوتوو خەبەر دەكەمەوەو هەم شەیتان لەخۆم دوور دەخەمەوە! پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) بە ئەبو بەكری فەرموو: تۆ كەمێ دەنگت بەرز كەرەوە بە عومەریشی فەرموو: تۆش كەمێ لە دەنگت نزم بكەرەوە، (د/ت-سند غریب) لە گێڕانەویەكی تیرمیذیدا كە لەشەرحەكەدایە: فەرمووی: هەر دوولاتان شتەكەتان پێكاوە.

٩٨٥- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ قَيْسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قُلتُ لِعَائِشَةَ: كَيْفَ كَانَ قِرَاءَةُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِاللَّيْلِ أَكَانَ يُسِرُّ بِالْقِرَاءَةِ أَمْ يَجْهَرُ؟ فَقَالَتْ: كُلُّ ذَلِكَ قَدْ كَانَ يَفْعَلُ رُبَّمَا أَسَرَّ بِالْقِرَاءَةِ وَرُبَّمَا جَهَرَ. فَقُلْتُ: الْحَمْدُ لِلّٰهِ الَّذِى جَعَلَ فِي الأَمْرِ سَعَةً. رَوَاهُ الترمذي[٢].

عەبدوڵڵای كوڕی قەیس (خوای لێ رازی بێ): دەڵێ: گوتم بە عائیشە (خوای لێ رازی بێ): قورئانخوێندنی شەونوێژی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) چۆن بوو، مەبەستم ئەوەیە ئایا لە شەونوێژدا بە پەنامەكی قورئانی دەخوێند یا بە ئاشكرا، گوتی: هەر دوو لای دەكرد گەلێ جار بە پەنامەكی دەیخوێندو گەلێ جاریش بە ئاشكرا. منیش گوتم: سوپاس و ستایش بۆ خودا كە ئەم كارەی وا ئاسان و گوشاد كردووە (ت).

## ١٨٤) خوێندنی قورئان و نزاو پاڕانەوە لە شەودا
## (القراءة والدعاء في الليل)

٩٨٦- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ يَتَهَجَّدُ، قَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ قَيِّمُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ

---

(٢) راجع رقم: ٢٨٦.

وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ لَكَ مُلْكُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمِنْ فِيهِنَّ وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ الْحَقُّ ، وَوَعْدُكَ الْحَقُّ ، وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ، وَقَوْلُكَ حَقٌّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ ، وَالنَّارُ حَقٌّ ، وَالنَّبِيُّونَ حَقٌّ ، وَمُحَمَّدٌ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَقٌّ وَالسَّاعَةُ حَقٌّ، اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ ، وَبِكَ خَاصَمْتُ ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ ، فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ. رَوَاهُ الخمسة الا ابا دَاوُدَ[1].

**ئیبنو عەبباس** (خوای لێ ڕازی بێ) **دەڵێ: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **كە بەشەو هەڵدەسا بۆ نوێژ دەیفەرموو:**

{اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ قَيِّمُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ لَكَ مُلْكُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ وَلَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ الْحَقُّ ، وَوَعْدُكَ الْحَقُّ ، وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ، وَقَوْلُكَ حَقٌّ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ ، وَالنَّارُ حَقٌّ ، وَالنَّبِيُّونَ حَقٌّ ، وَمُحَمَّدٌ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَقٌّ وَالسَّاعَةُ حَقٌّ، اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ ، وَبِكَ خَاصَمْتُ ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ ، فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ}.

**ئەی خودایە: سوپاس و ستایش هەر بۆ تۆیە، تۆ هەتا هەتایە پایەداریو مایەی بوونو مانی هەموو شتێکیو پارێزەرو ڕاگری ئاسمانەکانو زەویو ئەوەشی لەوانا هەیە (هەرچی هەیەو نیە سەر ڕشتەی بوونو نەبوونی بە دەستی تۆیە) دیسان سوپاسو ستایش بۆ تۆ، هەر خۆتی خاوەنو پادشای ڕاستەقینەی ئاسمانەکانو زەویو ئەوەشی لەوانا هەیە، دیسان سوپاسو ستایش بۆ تۆ، هەر تۆی ڕووناک کەرەوەی ئاسمانەکانو زەمینو ئەوەشی لەوانا هەیە، دیسان سوپاسو ستایش بۆ تۆ، تۆ هەقیو ڕاستو دروستیو بەڵێنت هەقەو ڕاستە،**

(١) بخاري. تهجد: ١١٣٠ ، ٦٣١٧ ، ٧٣٨٥ ، ٧٤٤٢ ، ٧٤٩٩. مسلم. صلاة المسافرين: ١٨٠٥.

فەرموودەت راستەو شادبوونو گەیشتن بە دیداری تۆ، لە پاش مردن هەقەو راستە، بەهەشت راستە، دۆزەخ راستە، پێغەمبەران هەقنو راستن، موحەممەد (درودی خوای لەسەربێ) هەقەو راستە، قیامەت راستە، ئەی خودایە! خۆم سپارد بە تۆ باوەڕم هەیە بەتۆ، پشتو پەنام هەرتۆی، دالْدەم هێناوەتە بەرتۆ، بەپشتی تۆ دەچم بە گژ ناحەزی خۆما، مەحکەمەو دادی خۆم دێنمەلای تۆو تۆ دەکەم بە حەکەم لە نێوانی خۆمو نەیارما، سا تۆش بەکەرەمو گەورەیی خۆت) لە گوناهی بەرو دوام خۆش بە، هەروا لە گوناهی نەهێنیو ئاشکرام، پەروەردگار! پێشخستنو پاشخستن بە دەستی خۆتە، خودای راستو رەوان هەر تۆی، بزووتنو هێزو تەوانایی هەر بە دەستی خودا خۆیەتیو بەس (ش/ت/ن).

٩٨٧- وَعَنْهُ أَنَّهُ رَقَدَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَاسْتَيْقَظَ فَتَسَوَّكَ وَتَوَضَّأَ وَهُوَ يَقُولُ: (إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لأُولِي الأَلْبَابِ) فَقَرَأَ هَؤُلاَءِ الآيَاتِ حَتَّى خَتَمَ السُّورَةَ ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ فَأَطَالَ فِيهِمَا الْقِيَامَ وَالرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ. وَفِي رِوَايَةٍ: قَالَ: اللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُورًا وَفِي لِسَانِي نُورًا وَفِي سَمْعِي نُورًا وَفِي بَصَرِي نُورًا وَاجْعَلْ مِنْ فَوْقِي نُورًا وَمِنْ تَحْتِي نُورًا. وَعَنْ يَمِينِي نُوراً وَعَنْ شَمَالِي نُوراً زَمِنْ بَيْنَ يَدَيَّ نُورًا وَمِنْ خَلْفِي نُورًا، وَاجْعَلْ فِي نَفْسِي نُورًا وَأَعْظِمْ لِي نُورًا. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وأَبُو دَاوُدَ والتِّرْمِذِي[٢].

دیسان لەوەوە دەڵێ: شەوێ لەلای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نووستبووم، حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) شەو هەڵسا لە خەوو سیواکی کردو دەسنوێژی گرتو ئەم ئایەتانەی هەتا کۆتایی سوورەتەکە خوێندو فەرمووی:

{إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لآيَاتٍ لِّأُوْلِي الأَلْبَابِ – ٣/ ١٩٠ – ٢٠٠}.

---

(٢) مسلم. صلاة الليل: ١٧٦٩. أبو داود. طهارة: ٥٨ ، ١٣٥٣ ، ١٣٥٤. نسائي. قيام الليل: ١٧٠٣ ، ١٧٠٤. تحفة الأشراف: ٦٢٨٧.

واتە: بەڕاستی لە دروستکردنی ئاسمانەکانو لە ئەوزاعی زەمینو لە جیاوازی شەوو ڕۆژدا بە کورتیو درێژی، گەلێ ئایەتو عەلاماتو بەڵگەو نیشانە هەن بۆ ئەو کەسانە کە دارای هۆشو گۆشنو بە چاوی دڵ تەماشای ئەم بوونەوەرە دەکەنو بەووردی سەرنجی لێ دەدەن، جا ئەوکاتە هەم لە خۆیو هەم لە خاوەنی تێ دەگەن، ئینجا حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) هەڵسایەوە دوو ڕکات نوێژی کرد، درێژەی دا بە ڕاوەستانو بە ڕوکوعو بە کوڕنووش تیایانا لە گێڕانەوەیەکا: فەرمووی:

{اللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُورًا وَفِي لِسَانِي نُورًا فِي سَمْعِي نُورًا فِي بَصَرِي نُورًا مِنْ فَوْقِي نُورًا وَمِنْ تَحْتِي نُورًا. وَعَنْ يَمِينِي نُوراً وَعَنْ شَمَالِي نُوراً زَمِنْ بَيْنَ يَدَيَّ نُورًا وَمِنْ خَلْفِي نُورًا، وَاجْعَلْ فِي نَفْسِي نُورًا وَأَعْظِمْ لِي نُورًا}.

ئەی پەروەردگارم! پڕدڵو زمانو گوێچکەو چاوم لە نوورو ڕۆشنایی بکە، هەروەها سەرو ژێرو ڕاستو چەپو بەردەمو پشتم، هەروەها دڵو دەروونم لە نوور کەیل کەو غەرقی نوورم کە! (م/د/ت).

## ١٨٥) نوێژی سوننەت هەم قەزا دەگرێتەوەو هەم بە دانیشتنەوە دروستە: (تقضى الصلوات المسنونة كما تجوز من قعود)

٩٨٨- عَنْ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ نَامَ عَنْ حِزْبِهِ أَوْ عَنْ شَيْءٍ مِنْهُ فَقَرَأَهُ فِيمَا بَيْنَ صَلاَةِ الْفَجْرِ وَصَلاَةِ الظُّهْرِ كُتِبَ لَهُ كَأَنَّمَا قَرَأَهُ مِنَ اللَّيْلِ. رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ البخاري[1].

عومەری کوڕی خەتاب (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ ئەگەر کەسێ شەوخەوی لێ کەوتو بەشەو طاعەتی سوننەتی شەوی نەکرد (خوا هەمووی نەکرد، خوا هەندێکی) بەڵام بەڕۆژ قەزای

---

(١) مسلم. صلاة المسافرين: ١٧٤٢. أبو داود. صلاة ١٣١٣. ترمذي. قضاء النوافل: ٥٨١. نسائي. قيام الليل: ١٧٨٩، ١٧٩٠، ١٧٩١، ١٧٩٢.

بكاتـەوە لـە ناوەنـدی نوێـژی بـەیانیو نوێـژی نیـوەڕۆدا ئـەوە وەك بەشـەو كردبێتی وەهای بۆ دەنووسرێ (م/د/ت/ن).

٩٨٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ نَامَ عَنِ الْوِتْرِ أَوْ نَسِيَهُ فَلْيُصَلِّ إِذَا ذَكَرَ وَإِذَا اسْتَيْقَظَ. رَوَاهُ الترمذي وابُو دَاوُدَ[٢].

لە ئەبو سەعیدەوە (خوای لێ رازی بێ) لـە پێغەمبـەرەوە دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەربێ): ئەگەر كەسێ بۆ نوێژی وەتر خەوی لێ كـەوت یـاخود لـەبیری چوو، با كەیادی كەوتەوە، یا كە خەبەری بۆوە با بیگێڕێتـەوە (ت/د-س/ صالح).

٩٩٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا عَمِلَ عَمَلاً أَثْبَتَهُ، وَكَانَ إِذَا نَامَ مِنَ اللَّيْلِ أَوْ مَرِضَ صَلَّى مِنَ النَّهَارِ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً. قَالَتْ: وَمَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَامَ لَيْلَةً حَتَّى الصَّبَاحِ وَمَا صَامَ شَهْرًا مُتَتَابِعًا إِلاَّ رَمَضَانَ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ والنسائي[٣].

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەستووری وابوو هەركارێكی خێری بكردایە دەیكرد بە پیشەو بەردەوام دەیكرد، ئەگەر بە شەویش خەوی لێ بكەوتایە یا نەخۆش بوایەو بەشەو شەو نوێژی ئەو شەوەی بچوایە، بە رۆژ دەیگێڕایەوەو لەباتی ئەوە بەڕۆژ دوازدە ركارت نوێژی دەكرد، عائیشە گوتیشی بەش بە حاڵی: خۆم من نەمدیوە كە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) هیچ شەوێ شەو تا بەیانی سەرانسەر نەخەوێو دانیشی تا بەیانی شەو نوێژو طاعەت بكا، یا مانگێ سەرانسەر بە رۆژوو بێ جگە لە مانگی رەمەزان (م/ن).

٩٩١- وَرُئِيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُصَلِّي بَعْدَ الْعَصْرِ فَسُئِلَ فَقَالَ: أَتَانِي نَاسٌ مِنْ عَبْدِ الْقَيْسِ فَشَغَلُونِي عَنِ الرَّكْعَتَيْنِ اللَّتَيْنِ بَعْدَ الظُّهْرِ فَهُمَا هَاتَانِ. رَوَاهُ الثلاثة[٤].

---

(٢) بسند صالح (شرحه).

(٣) مسلم. صلاة المسافرين: ١٧٤٠ ، ١٧٤١. نسائي: ١٧٤١نيائي. قيام الليل: ١٧٨٨. ترمذي. صلاة: ٤٤٥.

(٤) بخاري. مواقيت الصلاة: تعليق ذكره في الباب/ ٣٣ من كتاب مواقيت الصلاة.

بینرا کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەپاش نوێژی عەصرەوە نوێژی سوننەت دەکا، کە پرسیاریان لێ کرد لە بارەی ئەم نوێژەوە فەرمووی: چەند کەسێ (لە هۆزی عەبدولقەیس) ئەم نیوەڕۆیە لەلام بوون، بەهۆی ئەو وەفدەی ئەوانەوە نەم پەرژا کە دوو رکاتە سوننەتەکەی پاش نیوەڕۆ بکەم، جا ئەم دوو رکاتەیە کە ئێستا کردم ئەو دووە بوون قەزام کردنەوە (ش/د).

٩٩٢- وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا فَاتَتْهُ الأَرْبَعُ قَبْلَ الظُّهْرِ صَلاَّهُنَّ بَعْدَ الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ الظُّهْرِ. رَوَاهُ ابن ماجه والترمذي وحسَّنه[٥].

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەستووری وابوو: ئەگەر چوار رکاتە سونەتەکەی پێش نوێژی نیوەڕۆی بچوایە لەپاش دوو رکاتە سوننەتەکەی پاش نیوەڕۆوە دەیکردنەوە! (ماجە/ت- تیرمیذی بەحەسەنی داناوە).

٩٩٣- وللترمذي: مَنْ لَمْ يُصَلِّ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ فَلْيُصَلِّهِمَا بَعْدَ مَا تَطْلُعُ الشَّمْسُ[٦].

حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ هەر کەسێ لەکاتی خۆیدا دوو رکاتە سوننەتەکەی بەیانی بۆ نەکرا با لەپاش خۆرکەوتن بیانکاتەوە! (ت).

٩٩٤- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِيُصَلِّ أَحَدُكُمْ نَشَاطَهُ، فَإِذَا فَتَرَ فَلْيَقْعُدْ. رَوَاهُ الثلاثة[٧].

لە ئەنەسەوە (خوای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەربێ): ئەوەندە خەریکی نوێژی سوننەت بن تا چالاكو گورجو گۆڵن، بەڵام کە سارد بوونەوەو شەکەت بوون ئیتر دانیشنو نوێژ مەکەن هەتا ماندووتان دەردەچێ (ش/د).

---

(٥) حسنه الترمذي.

(٦) سكت عنه.

(٧) بخاري. تهجد: ١١٥٠. مسلم. صلاة المسافرين: ١٨٢٨ ، ١٨٢٩. أبو داود. صلاة: ١٣١٢. نسائي. قيام الليل: ١٦٤٢.

٩٩٥- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) وَكَانَ رَجُلاً مَبْسُورًا قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ صَلاَةِ الرَّجُلِ وَهُوَ قَاعِدٌ، فَقَالَ: مَنْ صَلَّى قَائِمًا فَهُوَ أَفْضَلُ، وَمَنْ صَلَّى قَاعِدًا فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ الْقَائِمِ ، وَمَنْ صَلَّى نَائِمًا فَلَهُ نِصْفُ أَجْرِ الْقَاعِدِ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ مسلماً[٨].

**عیمرانی كوڕی حوصەین (خوای لێ ڕازی بێ) (كە خۆی پیاوێكی مەیاسیری داربوو) دەڵێ: لە پێغەمبەرم پرسی (دروودی خوای لەسەربێ): ئەگەر پیاوی ساخ بە دانیشتنەوە نوێژی سوننەت بكا چۆنە؟ فەرمووی: ئەوەی بەپێوە نوێژ بكات ئەوە خێرترە، بەڵام ئەوەی بە دانیشتنەوە بیكات ئەوە نیوەی پاداشی راوەستاوی بۆ هەیە، وە ئەوەی بەراكشانەوە نوێژ بكات ئەوە نیوەی پاداشی دانیشتووی بۆ هەیە (ب/د/ت/ن).**

٩٩٦- سَأَلْتُ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) عَنْ صَلاَةِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِاللَّيْلِ فَقَالَتْ: كَانَ يُصَلِّى لَيْلاً طَوِيلاً قَائِمًا وَلَيْلاً طَوِيلاً قَاعِدًا، وَكَانَ إِذَا قَرَأَ قَائِماً رَكَعَ قَائِماً وَإِذَا قَرَأَ قَاعِدًا رَكَعَ قَاعِداً. رَوَاهُ مُسْلِمٌ والترمذي والنسائي[٩].

**پرسیار كرا لە عائیشە (خوای لێ ڕازی بێ) لە بارەی شەو نوێژی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەربێ) گوتی: گەلێ جار شەونوێژێكی دوورو درێژی بەراوەستانەوە دەكرد، وە گەلێ جاریش شەونوێژێكی دورو درێژی بە دانیشتنەوە دەكرد، جا ئەگەر بە پێوە فاتیحاو سوورەتی بخوێندایە ئەوا بەپێوەیش روكووعی دەبرد، بەڵام ئەگەر بە دانیشتنیشەوە فاتیحاو سوورەتی بخوێندایە ئەوا بە دانیشتنەوە روكوعی دەبرد (م/ت/ن).**

٩٩٧- وَعَنْهَا قَالَتْ: لَمَّا بَدَّنَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَثَقُلَ كَانَ أَكْثَرُ صَلاَتِهِ جَالِسًا. وَفِي رِوَايَةٍ: لَمْ يَمُتْ حَتى كَانَ كَثِيرٌ مِنْ صَلاَتِهِ وَهُوَ جَالِسٌ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ[١٠].

---

(٨) بخاري. تقصير الصلاة: ١١١٥ ، ١١١٦ ، ١١١٧.

(٩) مسلم. صلاة المسافرين: ١٦٩٦ — ١٦٩٩.

دیسان عائیشە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: كە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) گۆشتن بوو، وە لەشی لەبەر گۆشت گرتن كەمێ قورس بوو، ئیتر زوربەی شەونوێژی بە دانیشتنەوە دەكرد. لە گێڕانەوەیەكا: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وەفاتی نەكرد تا زۆر لە نوێژە سوننەتەكانی بە دانیشتنەوە دەكرد (م).

## ١٨٦) نوێژی سوننەت لە ماڵەوە خێرترە! : (النوافل في البيت أفضل)

٩٩٨- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: عَلَيْكُمْ بِالصَّلاَةِ فِي بُيُوتِكُمْ، فَإِنَّ خَيْرَ صَلاَةِ الْمَرْءِ فِي بَيْتِهِ، إلاَّ الصَّلاَةَ الْمَكْتُوبَةَ. رَوَاهُ الشيخان والترمذي[1].

زەیدی كوڕی ثابیت (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بیكەن بە پیشە شەونوێژو نوێژی سونەت لە ماڵەوەتان بكەن، چونكە نوێژی فەرزی لێ دەرچێ خێرترین نوێژی پیاو، ئەو نوێژەیەتی كە لە ماڵی خۆیا دەیكا (ش/ت).

٩٩٩- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إذَا قَضَى أَحَدُكُمُ الصَّلاَةَ فِي مَسْجِدِهِ فَلْيَجْعَلْ لِبَيْتِهِ نَصِيبًا مِنْ صَلاَتِهِ، فَإِنَّ اللَّهَ جَاعِلٌ فِي بَيْتِهِ مِنْ صَلاَتِهِ خَيْرًا[2].

جابیر (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ كاتێ لە مزگەوت نوێژ دەكەن بەشی ماڵەوەش دابنێن، چونكە خودا ئەو نوێژەی ماڵەوەتان دەكا بە مایەی خێر (م).

---

(١٠) مسلم. صلاة المسافرين: ١٧٠٧ ، ١٧٠٨. نسائي. قيام الليل: ١٦٥٦.

(١) بخاري. تهجد: ١١٨٧. مسلم. صلاة المسافرين: ١٨١٧ — ١٨١٩. أبو داود. تطوع: ١٠٤٣ ، ١٤٤٨.

(٢) مسلم. صلاة المسافرين: ١٨١٩.

١٠٠٠- عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَثَلُ الْبَيْتِ الَّذِي يُذْكَرُ اللَّهُ فِيهِ وَالْبَيْتِ الَّذِي لاَ يُذْكَرُ اللَّهُ فِيهِ مَثَلُ الْحَيِّ وَالْمَيِّتِ. رَوَاهُمَا مسلم[٣].

**ئەبو موسا** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: ئەوماڵەی کە ذیکرو یادی خودای گەورەی تیا دەکرێ، وەك دڵی پڕ نووری ئادەمیزادی زیندوو وایە. ئەو ماڵەشی کە ذیکرو یادی خودای تیا ناکرێ وەك گۆڕی چۆڵو هۆڵی مردوو وایە! (م).**

١٠٠١- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: صَلاَةُ الْمَرْءِ فِي بَيْتِهِ أَفْضَلُ مِنْ صَلاَتِهِ فِي مَسْجِدِي هَذَا إِلاَّ الْمَكْتُوبَةَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وصححه العراقي[٤].

**زەیدی کوڕی ثابیت** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: نوێژی پیاو لە ماڵی خۆیا خێرترە لە نوێژی مزگەوت، تەنانەت لە نوێژی مزگەوتەکەی منیش خێرترە، وەلێ نوێژی فەرز لە مزگەوت خێرترە (د- عیراقی بە صەحیحی داناوە).**

## ١٨٧) نوێژی ئیستیخارە (واتە: نوێژی نیشاندانی خێر) : (صلاة الإستخارة)

١٠٠٢- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُعَلِّمُنَا الاِسْتِخَارَةَ فِي الأُمُورِ كُلِّهَا كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ يَقُولُ: إِذَا هَمَّ أَحَدُكُمْ بِالأَمْرِ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ مِنْ غَيْرِ الْفَرِيضَةِ ثُمَّ يَقُولُ اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ أَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيمِ فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلاَ أَقْدِرُ وَتَعْلَمُ وَلاَ أَعْلَمُ وَأَنْتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ، اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الأَمْرَ خَيْرٌ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي أَوْ قَالَ: عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ فَاقْدُرْهُ لِي وَيَسِّرْهُ لِي ثُمَّ بَارِكْ لِي فِيهِ،

---

(٣) مسلم. صلاة المسافرين: ١٨٢٠.

(٤) صححه العراقي.

وَإِنْ كُنتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الأَمْرَ شَرٌّ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي أَوْ قَالَ: فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ فَاصْرِفْهُ عَنِّي وَاصْرِفْنِي عَنْهُ، وَاقْدُرْ لِي الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ ثُمَّ أَرْضِنِي بِهِ قَالَ: وَيُسَمِّي حَاجَتَهُ. رَوَاهُ الخمسة[1].

جابیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەستووری وابوو، بۆ هەموو کاروفرمانێ فێری ئیستیخارەی دەکردین، وەك چۆن فێری سوورەتەکانی قورئانی دەکردین، دەیفەرموو: ئەگەر یەکێکتان نیازی کارێکی هەبوو وە نەیدەزانی باشە یا خراپە با لەپێشا دوو رکات نوێژی سوننەت بکا، ئینجا بڵێ:

{اللّٰهُمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيمِ فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلاَ أَقْدِرُ وَتَعْلَمُ وَلاَ أَعْلَمُ وَأَنْتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ، اللّٰهُمَّ إِنْ كُنتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الأَمْرَ خَيْرٌ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي}.

یا فەرمووی:

{فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ فَاقْدُرْهُ لِي وَيَسِّرْهُ لِي ثُمَّ بَارِكْ لِي فِيهِ، وَإِنْ كُنتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الأَمْرَ شَرٌّ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي}.

یا فەرمووی:

{فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ فَاصْرِفْهُ عَنِّي وَاصْرِفْنِي عَنْهُ، وَاقْدُرْ لِي الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ ثُمَّ أَرْضِنِي بِهِ قَالَ: وَيُسَمِّي حَاجَتَهُ}.

ئەی خودایە! داوات لێ دەکەم کە بە عیلمو زانستی خۆتو بە دەستەڵاتو تەوانایی خۆت، چاکەو خێرم نیشان بدەو، ئەوەی باشە بۆم بەسەرکردنیا زاڵم بکە، وە داوای بەشو بارەو بەخششی گەورەی خۆتت لێ دەکە، چونکە تۆ تەواناای هەموو شتێکت هەیەو من بێ دەسەڵاتمو تەوانام نیە، وە تۆ هەموو شت دەزانیو من نازانم، وە هەرخۆت داناو زانایی بەهەموو نێهنیو ئاشکرایەك، پەروەردگارم! تۆ دەزانی ئەگەر ئەم کارە باشە بۆ من،

---

(١) بخاري. أبواب النوافل: ١١٦٦ ، ٦٣٨٢ ، ٧٣٩٠.

باشە بۆ دینو ئاینمو باشە بۆ ژیانمو بۆ سەرەنجامی کارم، یا فەرمووی: باشە بۆ ئێستامو باشە بۆ پاشەڕۆژم ئەوا لە چارەمی بنووسەو ئاسانی بکە بۆمو لە پاشیشا پیتو بەرەکەتی تێخە بۆم، وە تۆ دەزانی ئەگەر ئەم ئیشە خراپە، بۆ من، خراپە بۆ دینو ئاینمو خراپە بۆ گوزەرانمو بۆ سەرەنجامی کارم یا فەرمووی: خراپە بۆ ئێستامو بۆ پاشەڕۆژم ئەوا ئەو لە من لادەو منیش لەو لادە، وەچی چاکە ئەوە لە چارەم بنووسە لە پاشا ڕازیم بکەپێی! حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: وە ناوی نیازەکەشی بهێنێ واتە: لەوێدا کە دەڵێ: تۆ دەزانی ئەم کارە.. بڵێ: ئەم کارە کە ژنهێنانە یا خانوو کڕینە، یا ئەمەیە، یا ئەوەیە باشە بۆ من... تاد (ب/د/ت/ن).

١٠٠٣- قَالَ: الْمُصَنِّفْ (عَليه الرحمة) في الشرح: فَيُصَلِّيَ الرَّكْعَتَيْنِ وَيَقْرَأُ الدُّعَاءَ وَيَعْمَلُ بِمَا يَنْشَرِحُ لَهُ صَدْرَهُ، وَإِلاَّ كَرَّرَ الصَّلاَةَ وَالدُّعَاءَ سَبْعَاً لِحَدِيْث ابْنِ السني الحسن: إِذَا هَمَمْتَ بِأَمرٍ فَاسْتَخِرْ رَبَّكَ فِهِ سَبْعَ مَرَّاتٍ ثُمَّ أنْظُرْ إِلَىَ الَّذي يَسْبِقُ إِلَىَ قَلْبِكَ فَإِنَّ الْخَيْرَ فِيهِ، ثُمَّ قَالَ: الْمُؤَلِفُ: وَيَنْبَغي أَنْ يَكُونَ وَقْتَهَا تَارِكاً لِهَوَاهُ نَاسِيَاً لَهُ بالْكُلية مُنْتَظِراً لِماَ يَخْتَارَهُ اللهُ لَهُ فَإِنَّ الْخَيْرَ بِيَدِ اللهِ وَحْدَهُ يُعْطِيهِ مَنْ يَشَاءُ. انتهى كلامه. ترجمة[٢].

دانەر (پڕ گۆڕە موبارەکەکەی لە نوورو ڕەحمەتی خودا بێ) لە شەرحەکەدا دەڵێ: خاوەن نیاز ئەم دوو ڕکاتە دەکاو ئەم دووعایە دەخوێنێو لەپاشا دڵی بۆچی چوو، وە بەکام لایەنی ئەو کارە دڵی کرایەوە ئەوە بکا، بەلام ئەگەر هەروەك خۆی مایەوە ئەوا حەوت جار ئەم نوێژو نزایە دووبارە دەکاتەوە، بەپێی ئەم حدیثە حەسەنەی کە (ابن السنی) ڕیوایەتی کردووە: حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ ئەگەر نیازی کارێکت هەبوو هەتا حەوت جار پرسو ڕاوێژ بە خودای خۆت بکە کەچی باشە بیکا بە بارەوبەشت، لەپاشا دڵت بۆ چی چوو، وە دڵت بە چی کرایەوە ئەوە بکە چونکە خێر لەوەدایە، هەروەها دانەر دەڵێ: دەشێ خاوەن نیاز

---

(٢) حديث ابن السنى حسن.

لەو كاتەدا بە هیچ كولۆجێ بەلای هەوای نەفس و ئارەزوو بازیدا نەچێ، وە چاوەنواڕی ئەو خێرە بێ كە خوا دەیخاتە ناو دڵی، چونكە لە راستیدا خێرو خۆشی وا لە دەستی خودادا، بە كێ مەیلی لێبێ دەیداتێ. قسەكەی دانەر تەواو.

## ١٨٨) نوێژی سەلاتوتەسبیح: (الصلاة التسابيح)

١٠٠٤- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لِلعَبَّاسِ بَنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ: يَا عَبَّاسُ يَا عَمَّاهْ، أَلاَ أُعْطِيكَ، أَلاَ أَمْنَحُكَ، أَلاَ أَحْبُوكَ، أَلاَ أَفْعَلُ بِكَ عَشْرُ خِصَالٍ إِذَا أَنْتَ فَعَلْتَ ذلِكَ غَفَرَ اللّهُ لَكَ ذَنْبَكَ أَوَّلَهُ وَآخِرَهُ قَدِيمَهُ وَحَدِيثَهُ، خَطَأَهُ وَعَمْدَهُ صَغِيرَهُ وَكَبِيرَهُ سِرَّهُ وَعَلاَنِيتَهُ، عَشْرُ خِصَالٍ أَنْ تُصَلِّيَ أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ تَقْرَأُ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ فَاتِحَةَ الْكِتَابِ وَسُورَةً فَإِذَا فَرَغْتَ مِنَ الْقِرَاءَةِ فِي أَوَّلِ رَكْعَةٍ وَأَنْتَ قَائِمٌ قُلْتَ سُبْحَانَ اللّهِ وَالْحَمْدُ لِلّهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاّ اللّهُ وَاللّهُ أَكْبَرُ خَمْسَ عَشْرَةَ مَرَّةً ثُمَّ تَرْكَعُ فَتَقُولُهَا وَأَنْتَ رَاكِعٌ عَشْرًا ثُمَّ تَرْفَعُ رَأْسَكَ مِنَ الرُّكُوعِ فَتَقُولُهَا عَشْرًا ثُمَّ تَهْوِى سَاجِدًا فَتَقُولُهَا وَأَنْتَ سَاجِدٌ عَشْرًا ثُمَّ تَرْفَعُ رَأْسَكَ مِنَ السُّجُودِ فَتَقُولُهَا عَشْرًا ثُمَّ تَسْجُدُ فَتَقُولُهَا عَشْرًا ثُمَّ تَرْفَعُ رَأْسَكَ فَتَقُولُهَا عَشْرًا فَذَلِكَ خَمْسٌ وَسَبْعُونَ فِى كُلِّ رَكْعَةٍ تَفْعَلُ ذَلِكَ فِى أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ إِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ تُصَلِّيَهَا فِي كُلِّ يَوْمٍ مَرَّةً فَافْعَلْ فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِي كُلِّ جُمُعَةٍ مَرَّةً فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِي كُلِّ شَهْرٍ مَرَّةً فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِي كُلِّ سَنَةٍ مَرَّةً فَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَفِى عُمُرِكَ مَرَّةً. وَزِيدَ فِي رِوَايَةٍ: فَإِنَكَ لَوْ كُنْتَ أَعْظَمَ أَهْلِ الأَرْضِ ذَنْبًا غُفِرَ لَكَ بِذَلِكَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي وعبارته: فَلَوْ كَانَتْ ذُنُوبُكَ مِثْلَ رَمْلِ عَالِجٍ لَغَفَرَهَا اللهُ لَكَ[1].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بە عەباسی كوڕی عەبدولموططەلیب: ئەی عەباس! ئەی مامەی خۆم! با بەشت بدەم، با خەڵاتت بكەم، با شاباشت بدەمێ، با دە چاكەت لەگەڵ بكەم، با نوێژێكت فێربكەم ئەگەر بیكەیت خودا ئەم دە چاكەیەت

(١) رواه البخارى فى جزء القرآن وابن ماجه وابن خزيمة والحاكم والبيهقى وصححه. (شرحه).

دەداتێ: لە گوناهت خۆش دەبێ، لەپێشین و پاشینی، لە کۆن و نوێی، لە هەڵەو دەسەنقەستی، لە بچووك و گەورەو وردو درشتی، لە نهێنی و ئاشکرای، کە ئەمانەش دەکەنە دە جۆرە گوناه، ئەو نوێژەیش بەم شێوەیە: چواررکات نوێژ بکە بە نیاز (نییەت)ی نوێژی (صلاه التسبیح) لە هەموو رکاتێکا سوورەتی فاتیحاو سوورەتێکی تر بخوێنە، جا کە لە خوێندنی فاتیحاو سوورەتەکە لێ بوویتەوە ئەوسا لە رکاتی یەکەما هەر بەراوەستانەوە پانزە جار بڵێ:

{سُبْحَانَ اللّهِ وَالْحَمْدُ لِلّهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاّ اللّهُ وَاللّهُ أَكْبَرُ}.

پاکی و بێگەردی هەر بۆ خودایە، وە سوپاس و ستایش هەر بۆ خودایە، وە لە خودا بەولاوە خودای تر نیە، وە خودا لە هەموو کەسێ گەورەترە، ئینجا بچەمێرەوە واتە: روکوع بەرەو لە چەمینەوەشا دە جاری تری بڵێ، ئینجا سەربەرزکەرەوە لە چەمینەوەو دە جاریتر بیلێ، ئینجا دانەوێرەوە بۆ کوڕنووش و لەناو کوڕنووشیشا دە جاری تر بیلێ، ئینجا سەر هەڵبڕە لە کوڕنووش و لە دانیشتنی نێوانی دوو کوڕنووشەکاندا دە جاری تر بیلێ، ئینجا کوڕنووشێکی تر ببەو دەفەرموێ دە جاری تر بیلێ، ئینجا سەر بەرزکەرەوەو لە دانیشتنی وچانی پێش هەڵسانەوەدا دە جاری تر بیلێ، کە ئەمەش دەکاتە حەفتاو پێنج جار لە هەموو رکاتێکا ئیتر لەهەر چوار رکاتەکەدا هەر ئەمە بکە، جا ئەگەر دەتوانیت و بۆت دەکرێ ئەوا هەموو رۆژێ یەکجار ئەم نوێژە بکە، ئەگەر هەموو رۆژێ بۆت ناکرێ، ئەوا حەفتەی یەك جار بیکە، ئەگەر هەموو حەفتەیێ بۆت ناکرێ ئەوا مانگی یەك جار بیکە، ئەگەر هەموو مانگێ بۆت نەکرا ئەوا ساڵی جارێ بیکە، خۆ ئەگەر هەر بۆت نەکرا لە ژیانتا یەك جار بیکە لە گێڕانەوەیەکا ئەمەشی پترە. گریمان لەسەر رووی زەوی لەتۆ گوناهبارتری تیا نەبێ بەهۆی ئەم نوێژەوە خوا لێت خۆش دەبێ (د/ت) عیبارەتی تیرمیذی (غەیریقی رەحمەتی خودای گەورە بێ)

ئاوایە: گریمان تاوانەکانت وەك چەوو لمی دەشتی عالیج زۆر بێ، خودا لە هەمووی خۆش دەبێ لێت.

١٠٠٥- قَالَ: المؤلف (رحمه الله تعالى) في شرحه على التاج: قَالَ: أَبُو عثمان الحيري الزاهد: مَا رَأَيْتُ لِلشَّدَائِدِ وَالْهُمُومِ أَحْسَنَ مِنْ صَلاَةِ التَّسَابِيحِ[٢].

دانەر (ڕەحمەتی خودای گەورەی لێبێ) لە شەرحەکەدا دەڵێ: ئەبو عوسمانی حیری مەشهوور بە زاهید دەڵێ: نەم دیوە هیچ شتێ وەك نوێژی سەلاتوتەسبیح باش بێ بۆ کاتی لێ قەومان و تووشبوونی خەم و خەفەت و پەژارە.

## ١٨٩) نوێژی تەوبە: (صلاة التوبة)

١٠٠٦- عَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ رَجُلاً إِذَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَدِيثًا نَفَعَنِي اللَّهُ مِنْهُ بِمَا شَاءَ أَنْ يَنْفَعَنِي وَإِذَا حَدَّثَنِي أَحَدٌ مِنْ أَصْحَابِهِ اسْتَحْلَفْتُهُ فَإِذَا حَلَفَ لِي صَدَّقْتُهُ، وَإِنَّهُ حَدَّثَنِي أَبُو بَكْرٍ وَهُوَ صَادِقٌ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: مَا مِنْ رَجُلٍ يُذْنِبُ ذَنْبًا، ثُمَّ يَقُومُ فَيَتَطَهَّرُ، ثُمَّ يُصَلِّي ثُمَّ يَسْتَغْفِرُ اللَّهَ إِلاَّ غَفَرَ اللَّهُ لَهُ، ثُمَّ قَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ (وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ) الآيَةَ رَوَاهُ الترمذي وابن ماجه[١].

عەلی (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: دەستوورم وابووە ئەگەر بۆ خۆم فەرمایشتێکم لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بیستبێ، ئەوا چەندە حەزی خودای لەسەر بووبێ سوودم لێ وەرگرتووە، ئەگەر کەسێکی تریش (لە یارانی حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمایشتێکی ئەوی بۆم گێڕابێتەوە ئەوا سوێندم داوەو لەپاش سوێند خواردن باوەڕم پێ کردووە، ئەبو بەکریش (کە خۆی پیاوێکی ڕاستگۆیەو لەبەر ئەوە پێویست بە سوێند ناکا) بۆی گێڕامەوە گوتی: لە پێغەمبەرم ژنەوت دەیفەرموو (دروودی خوای لەسەربێ): هەر کەسێ هەر

---

(٢) أثر صحيح مجرب.

(١) بسند حسن (شرحه).

گوناهێ بكا، لەپاشا هەڵستێ دەسنوێژێ بگرێو خۆی پاك بكاتەوەو ئینجا دوو ركات نوێژی سوننەتی تەوبە بكا، یا هەرنوێژێكی تر بكا، ئەوجا ئیستیغفار بكاو لەخودا داوای لێخۆشبوون بكا، بێگومان كە خودا لێی خۆش دەبێ ئینجا ئەم ئایەتەی تاسەر خوێندەوە:

{وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُواْ أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُواْ اللّهَ فَاسْتَغْفَرُواْ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ اللّهُ وَلَمْ يُصِرُّواْ عَلَى مَا فَعَلُواْ وَهُمْ يَعْلَمُونَ – ٣/١٣٥}.

واتە: ئەو خاوەن تەقوایانە كە حاڵیان وایە هەركاتێ كارێكی شەرم ئاوەری ناشیرینیان كرد، وەكوو داوێنپیسی بێ، یا ستەمیان لە خۆ یان كرد، وەكوو گوناهێ نەگاتە رادەی فەحشكاریو شەرم ئاوەری ئەوا بیری قاری خودای گەورە دەكەنەوەو دەپاڕێنەوە لە خوداو داوای لێخۆشبوونی لێ دەكەنو لەسەر كردەوە نابارەكەی خۆیان دەوام ناكەن، بەڵكوو بە هیچ كولۆجێ توخنی ناكەونەوە، لەبەر ئەوە كە دەزانن ئەوە تاوانو گوناهەو خودا پێی ناخۆشە، وە لە راستیدا كارێكی زۆر پیاوانە دەكەن كە داوای بەخشین لە خودا دەكەن، چونكە كێ هەیە كە تاوان پۆش بێ بۆ بەندەكان جگە لە یەزدانی میهرەبان... تاد (ت/ماجه – س/ح).

## ١٩٠) نوێژی گیرابوونی مراز: (صلاة قضاء الحاجة)

١٠٠٧– عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ بْنِ أَبِي أَوْفَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ كَانَتْ لَهُ إِلَى اللّٰهِ حَاجَةٌ أَوْ إِلَى أَحَدٍ مِنْ بَنِي آدَمَ فَلْيَتَوَضَّأْ وَلْيُحْسِنِ الْوُضُوءَ ثُمَّ لْيُصَلِّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ لْيُثْنِ عَلَى اللّٰهِ وَلْيُصَلِّ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ لْيَقُلْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ الْحَلِيمُ الْكَرِيمُ سُبْحَانَ اللّٰهِ رَبِّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ الْحَمْدُ لِلّٰهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، أَسْأَلُكَ مُوجِبَاتِ رَحْمَتِكَ، وَعَزَائِمَ مَغْفِرَتِكَ وَالْغَنِيمَةَ مِنْ كُلِّ بِرٍّ، وَالسَّلاَمَةَ مِنْ كُلِّ إِثْمٍ لاَ تَدَعْ لِي ذَنْبًا إِلاَّ غَفَرْتَهُ وَلاَ هَمًّا إِلاَّ فَرَّجْتَهُ، وَلاَ حَاجَةً هِيَ لَكَ رِضًا إِلاَّ قَضَيْتَهَا يَا أَرْحَمَ الرَّاحِمِينَ. رَوَاهُ الترمذي وابن ماه والله أعلم[١].

---

(١) بسند حسن (شرحه).

عەبدوڵڵا کوڕی ئەبو ئەوفا (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر کەسێ کارێ، فرمانێکی هەبوو، خوا ئەوکارە لەلای خووابێ یاخود لەلای بەندەی خودا بێ، با دەسنوێژێکی جوان بگرێ، ئینجا دوو رکات نوێژی سوننەت بکاو نیازی کار ساز بوونی لێ بێنێ، ئینجا لەسەر شێوەیەکی جوان وەسپو ستایشی خودا بکا، وە چاکتروایە کە ئەو وەسپو ستایشە بەم شێوەیە بێ: دەوری سەد جار بڵێ: أستغفر الله، وە دەوری سەد جاریش بڵێ: سبحان الله والحمد لله ولا اله الا الله والله أكبر، وە دەوری سەد سەڵاوات لە دیاری پێغەمبەر بدا (دروودی خوای لەسەربێ) ئینجا بڵێ:

{لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ الْحَلِيمُ الْكَرِيمُ سُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، أَسْأَلُكَ مُوجِبَاتِ رَحْمَتِكَ، وَعَزَائِمَ مَغْفِرَتِكَ وَالْغَنِيمَةَ مِنْ كُلِّ بِرٍّ، وَالسَّلاَمَةَ مِنْ كُلِّ إِثْمٍ لاَ تَدَعْ لِي ذَنْبًا إِلاَّ غَفَرْتَهُ وَلاَ هَمًّا إِلاَّ فَرَّجْتَهُ، وَلاَ حَاجَةً هِيَ لَكَ رِضًا إِلاَّ قَضَيْتَهَا يَا أَرْحَمَ الرَّاحِمِينَ}.

هەر خودا خودایەو بەس، خودایەکی پیرۆزو بەمۆڵەتو ئارامە، پاکیو بێگەردی بۆ ئەو خودایەیە کە پەروەردگاری بارەگای مەزنە، سوپاسو ستایش بۆ خودای پەروەردگاری جیهانیان ئەی خودایە! ئەی پەروەردگاری کردگار! ئەی کەریمی کارساز! داوای ئەو شتانەت لێ دەکەم کە دەبن بەهۆی میهرەبانیو مایەی رەحمەتی تۆ، وە هەروەها ئەو شتانەش کە دەبن بە هەوێنی لێبوردنی تۆ، داوای بەشە خەڵات لە هەموو چاکەیەكو رزگار بوون لە هەموو گوناهێکت لێ دەکەم، خودایە! یەك بەیەك لە تاوانەکانم خۆش بە، وە هەموو خەمێکم بڕەوێنەوە، وە هەر مرازێکیشم هۆی خۆشنوودییو رەزامەنیی تۆیە بۆم بیهێنەدی، ئەی خودایە! ئەی ئەو کەسەی کە لە هەموو کەسێ میهرەبانترو بەرەحمتری! ت/ماجە- س/ح).

## باسی سیانزەهەم: باسی تەرم (جەنازە)
## (ئەم باسە حەوت بەش و پاشەكییەكە)

### ١٩١) بەشی یەكەم: مەرگ بە ئاوات ناخوازرێ و دەبێ نومێدیش بەرەحمەتی خودا قەوی بێ:

### الباب الثاث عشر: في الجنائز. وفيه سبعة فصول وخاتمة:

### الفصل الأول: في النهي عن تمني الموت وفي حسن الظن بالله (تعالى):

١٠٠٨- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدٌ مِنْكُمُ الْمَوْتَ لِضُرٍّ نَزَلَ بِهِ، فَإِنْ كَانَ لاَ بُدَّ مُتَمَنِّيًا لِلْمَوْتِ فَلْيَقُلِ اللَّهُمَّ أَحْيِنِي مَا كَانَتِ الْحَيَاةُ خَيْرًا لِي، وَتَوَفَّنِي إِذَا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْرًا لِي. رَوَاهُ الخمسة. وَفِي رِوَايَةٍ: قَالَ قَيْسٌ: أَتَيْتُ خَبَّابًا وَقَدِ اكْتَوَى فِي بَطْنِهِ سَبْعًا فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: لَوْلاَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَانَا أَنْ نَدْعُوَ بِالْمَوْتِ لَدَعَوْتُ بِهِ[1].

لە ئەنەسەوە (خوای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەربێ): ئەگەر یەكێكتان دوو چاری زیانێ بوو با مەرگ بە ئاوات نەخوازێ، ئەگەر هەر زۆری بۆ هات و چاری نەبوو مەرگی خۆی بە ئاوات خواست با بڵێ: ئەی خودایە! هەتا ژیانم باشترە بۆم بم ژێنە، كەییش مردنم باشتربوو بۆم، بم مرێنە! (ش/د/ت/ن) لە گێڕانەوەیەكا: قەیس گوتی: چووم بۆ لای خەبباب، لە حەوت لاوە سكی خۆی داخ كردبوو، ژنەوتم لێی دەیگوت: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) یاساخی كردووە لێمان كە مەرگ بە ئاوات بخوازین، ئەگینا مەرگی خۆم بە ئاوات دەخواست.

١٠٠٩- وللبخاري: لاَ يَتَمَنَّى أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ إِمَّا مُحْسِنًا فَلَعَلَّهُ يَزْدَادُ، وَإِمَّا مُسِيئًا فَلَعَلَّهُ يَسْتَعْتِبُ[2].

---

(١) بخاري. مرض: ٥٦٧١ (٥٦٧٢) ٦٣٤٩ ، ٦٣٥٠ ، ٦٤٣٠ ، ٦٤٣١ ٧٢٣٤. مسلم. الذكر والدعاء: ٦٧٥٨. نسائي. جنائز: ١٨٢٢.

(٢) بخاري. مرضى: ٢٥٦٣ ، ٣٩ ، ٦٤٦٣ ، ٧٢٣٥.

**حـەزرەت** (دروودی خـوای لەسـەربێ) **دەفـەرموێ: كەسـتان مـەرگ بـە ئـاوات نـەخوازێ، چـونكە ئـەوەی باشـەو پیـاو چـاكە سـا بـەڵكوو باشـتر دەبـێ و پـتر چاكە دەكا، ئەوەشـی خـۆی خراپـەو پیـاو خراپـە سـا بەشـكوو خـودای گـەورە مۆڵەتی بدا تا تەوبە دەكاو دەگەڕێتەوە! (ب).**

١٠١٠- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَبْلَ مَوْتِهِ بِثَلاَثَةِ أَيَّامٍ يَقُولُ: لاَ يَمُوتَنَّ أَحَدُكُمْ إِلاَّ وَهُوَ يُحْسِنُ الظَّنَّ بِاللّٰهِ تِعالى. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ ومسلم[٣].

**جابیر** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: لە پێغەمبەرم بیست لە پێش مردنیا بە سێ رۆژ دەیفەرموو** (دروودی خوای لەسەربێ)**: مەمرن تا ئومێدی باشتان قەوی دەبێ بە كەرەمی خودای گەورە! (د/م).**

١٠١١- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللّٰهِ أَحَبَّ اللّٰهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللّٰهِ كَرِهَ اللّٰهُ لِقَاءَهُ فَقَالَتْ عَائِشَةُ أَوْ بَعْضُ أَزْوَاجِهِ: إِنَّا لَنَكْرَهُ الْمَوْتَ قَالَ: لَيْسَ ذَاكِ وَلَكِنَّ الْمُؤْمِنَ إِذَا حَضَرَهُ الْمَوْتُ بُشِّرَ بِرِضْوَانِ اللّٰهِ وَكَرَامَتِهِ ، فَلَيْسَ شَيْءٌ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا أَمَامَهُ، فَأَحَبَّ لِقَاءَ اللّٰهِ وَأَحَبَّ اللّٰهُ لِقَاءَهُ، وَإِنَّ الْكَافِرَ إِذَا حَضَرَهُ الْمَوْتُ بُشِّرَ بِعَذَابِ اللّٰهِ وَعُقُوبَتِهِ، فَلَيْسَ شَيْءٌ أَكْرَهَ إِلَيْهِ مِمَّا أَمَامَهُ، فَكَرِهَ لِقَاءَ اللّٰهِ وَكَرِهَ اللّٰهُ لِقَاءَهُ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ أبا دَاوُدَ[٤].

**عوبـادەی كـوڕی صـامیت** (خـوای لێ رازی بـێ) **گـوتی: پێغەمبـەر** (دروودی خـوای لەسـەربێ) **فـەرمووی: هەركەسـێ حـەز بـە دیـداری خـودا بكـا خـوداش حـەز بـە دیداری ئەو دەكا، وە هەر كەسێ حەز لە دیداری خودا نەكا خوداش حەز لە دیداری ئەو ناكا عائیشە (یا یەكێكی تر لە ژنەكانی) گوتی: جاخۆ كەسمان حەز لەمردن ناكەین گوایە دەبێ خوداش حەز لە ئێمە نەكا فەرمووی:** (دروودی خوای لەسەربێ) **مەبەست ئەمە نیە كە تۆ تێی گەیشتوویت بەڵام موسوڵمان لەسەرە مەرگا فریشتە مژدەی رەزامەندیی و رێزلێ گرتنی خودای دەدەنێ،**

(٣) مسلم. الجنة ونعيمها: ٧١٦٠. أبو داود. جنائز: ٣١١٣. ابن ماجه. زهد: ٤١٦٧.

(٤) بخاري. رقاق: ٦٥٠٧. ترمذي. جنائز: ١٠٦٧. نسائي. جنائز: ١٨٣٧. مسلم. الذكر والدعاء: ٦٧٦٣.

ئیتر ئەویش هیچی تری وەك ئەو دنیا پێ خۆش نابێ، وە حەز لە دیداری خودا دەکاو خوداش حەز بە دیداری ئەو دەکا، کافرو بێ بڕواش کاتێ کە مردن قورتمی دەگرێ، وە مژدەی سزاو تۆڵە لێ سەندنی خودای پێ دەدرێ ئیتر هیچی تری وەك ئەو دنیا پێ ناخۆش نابێ، وە حەز لە دیداری خودا ناکاو خوداش حەز بە دیداری ئەو ناکا (ش/ت/ن).

١٠١٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) دَخَلَ عَلَى شَابٍّ وَهُوَ فِي الْمَوْتِ فَقَالَ: كَيْفَ تَجِدُكَ، فَقَالَ: أَرْجُو اللَّهَ يَا رَسُولَ اللهِ، وَإِنِّي أَخَافُ ذُنُوبِي. فَقَالَ: (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لاَ يَجْتَمِعَانِ فِي قَلْبِ عَبْدٍ فِي مِثْلِ هَذَا الْمَوْطِنِ إِلاَّ أَعْطَاهُ اللَّهُ مَا يَرْجُو وَآمَنَهُ مِمَّا يَخَافُ. رَوَاهُ الترمذي وحسَّنه[٥].

ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) چوو بۆ لای لاوێ، گیانی دەدا، فەرمووی: خۆت چۆن دەبینیت؟ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! سەرو ماڵو گیان بە قوربانت بێ هیوام بە لوتفو کەرەمی خودا هەیە، وە ترسیشم لە گوناهەکانم هەیە. فەرمووی: (درودی خوای لەسەربێ): لەم کاتی سەرە مەرگەدا ئەم دوو شتە لە دڵی هەر بەندەیەکا کۆببنەوە، بێگومان کە خودا هیواکەی دەهێنێتەدیو ترسەکەی دەرەوێنێتەوە (ت:ح/ح).

١٠١٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَكْثِرُوا مِنْ ذِكْرِ هَاذِمِ اللَّذَّاتِ. رَوَاهُ الترمذي والنسائي[٦].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: زۆر یادی مەرگ بکەن، ئەو مەرگەی کە هەموو خۆشییەك تێك دەدات! (ت/ن-س/ح).

---

(٥) حديث حسن.

(٦) بسند حسن (شرحه).

## ١٩٢) ناوی خودا هێنان و پاڕانەوەو قورئان خوێندن لەلای کەسێ کە لەگیانەلاّدا بێ: (الذكر والدعاء والقرآن عند المحتضر)

١٠١٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَقِّنُوا مَوْتَاكُمْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ البخاريَّ[١].

**ئەبو سعيد** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: ئەو کەسانەتان کە لەسەرەمەگدان {لا اله الا الله} یان بدەن بەگوێداو ئەم وشە پیرۆزەیان لەوکاتە ناسکەدا یاد بخەنەوەو لەبەرچاویان بیلێن سا بەشکوو ئەوانیش چاو لە ئێوە بکەن و بیلێن و بەر ئەو فەرموودە پیرۆزەیە بکەون کە دەفەرموێ:**

{مَن كَانَ آخِرُ كَلاَمِهِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ}.

**کەسێ دواقسەی { لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ} بێ دەچێتە بەهەشت** (م/د/ت/ن).

١٠١٥- عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ كَانَ آخِرُ كَلاَمِهِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي والحاكم وصححَّه[٢].

**موعاذی کوڕی جەبەل** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **دەفەرموێ: هەر کەسێ دواقسەی { لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ} بێ دەچێتە بەهەشت** (د/ت/حاکم:ح/ص).

١٠١٦- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رَضيَ اللهُ عَنهُا) قَالَتْ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا حَضَرْتُمُ الْمَرِيضَ أَوِ الْمَيِّتَ فَقُولُوا خَيْرًا، فَإِنَّ الْمَلاَئِكَةَ يُؤَمِّنُونَ عَلَى مَا تَقُولُونَ، قَالَتْ: فَلَمَّا مَاتَ أَبُو سَلَمَةَ أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبَا سَلَمَةَ قَدْ مَاتَ قَالَ: قُولِي اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَلَهُ وَأَعْقِبْنِي مِنْهُ عُقْبَى حَسَنَةً

---

(١) مسلم. جنائز: ٢١٢٠. أبو داود. جنائز: ٣١١٧. ترمذي. جنائز: ٩٧٦. نسائي. جنائز: ١٨٢٥.

(٢) صحيح عند الحاكم.

قَالَتْ: فَقُلْتُ فَأَعْقَبَنِي اللَّهُ مَنْ هُوَ خَيْرٌ لِي مِنْهُ مُحَمَّدًا (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَوَاهُ الخمسة إلاَّ البخاري[٣].

ئوممو سەلەمە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: کە دەچن بۆ لای نەخۆش و ئەو کەسانەی کە لە گیانەلأدان قسەی باش بکەن و قسەی خراپ مەکەن چونکە ئێوە هەرچی بڵێن: فریشتەکان ئامینی لەسەر دەکەن! ئوممو سەلەمە گوتی: جا کە ئەبو سەلەمەی مێردم مردو ئەمری هەقی بەجێ هێنا چوومە لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەبو سەلەمە مرد. فەرمووی: بڵێ:

{اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَلَهُ وَأَعْقِبْنِي مِنْهُ عُقْبَى حَسَنَةً}.

ئەی خودایە! لەمنیش و لەویش خۆش بەو تۆڵەیەکی باشم بۆ بکەرەوە، گوتی: منیش وام گوت، ئەوە بوو خودا لە تۆڵەی ئەودا موحەممەدی داوە پێم کە زۆر زۆر لە ئەبو سەلەمە باشترە بۆم (بۆ دین و دونیام) (م/د/ت/ن).

١٠١٧- وَعَنْهَا قَالَتْ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى أَبِي سَلَمَةَ وَقَدْ شَقَّ بَصَرُهُ فَأَغْمَضَهُ ثُمَّ قَالَ: إِنَّ الرُّوحَ إِذَا قُبِضَ تَبِعَهُ الْبَصَرُ، فَضَجَّ نَاسٌ مِنْ أَهْلِهِ فَقَالَ: لاَ تَدْعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ إِلاَّ بِخَيْرٍ فَإِنَّ الْمَلاَئِكَةَ يُؤَمِّنُونَ عَلَى مَا تَقُولُونَ. ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لأَبِي سَلَمَةَ وَارْفَعْ دَرَجَتَهُ فِي الْمَهْدِيِّينَ وَاخْلُفْهُ فِي عَقِبِهِ فِي الْغَابِرِينَ، وَاغْفِرْ لَنَا وَلَهُ يَا رَبَّ الْعَالَمِينَ وَافْسَحْ لَهُ فِي قَبْرِهِ. وَنَوِّرْ لَهُ فِيهِ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ[٤].

دیسان ئوممو سەلەمە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) هات بۆ لای ئەبو سەلەمە ئەبو سەلەمە گیانی دەرچوو بوو، چاوی داچەقابوو، جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) چاوەکانی لێکنان و فەرمووی: کاتێ گیان دەکێشرێ چاو شوێنی دەکەوێ تا بزانێ بۆ کوێ دەچێ جا لەم کاتەدا هەندێ لە کەس و کارەکەی کردیان بە قیژەو هەراو نزای خراپیان لە خۆیان

(٣) مسلم. جنائز: ٢١٢٦ ، أبو داود. جنائز: ٣١١٥. ترمذي. جنائز: ٩٧٧. نسائي. جنائز: ١٨٢٤.

(٤) مسلم. جنائز: ٢١٢٧. أبو داود. جنائز: ٣١١٨.

کرد حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: نزای باش بکەن، نزای خراپ لە خۆتان مەکەن، چونکە ئێوە هەرچی بڵێن فریشتە ئامینی لەسەر دەکەن ئینجا فەرمووی:

{اللَّهُمَّ اغْفِرْ لأَبِي سَلَمَةَ وَارْفَعْ دَرَجَتَهُ فِي الْمَهْدِيِّينَ وَاخْلُفْهُ فِي عَقِبِهِ فِي الْغَابِرِينَ، وَاغْفِرْ لَنَا وَلَهُ يَا رَبَّ الْعَالَمِينَ وَافْسَحْ لَهُ فِي قَبْرِهِ. وَنَوِّرْ لَهُ فِيهِ}.

ئەی خودایە! لە ئەبو سەلەمە خۆش بەو پلەو پایەی (لەناو ئەو کەسانەدا کە خۆت رێگەی راستت نیشان داون) بەرزبکەرەوە، وە خۆت سەروەرکاری ئەو کەس و کارەی بکە کە لەپاشی بەجێماون، وە لە ئێمەش و لەویش بەمیهرەبانی خۆت خۆشبە، ئەی پەروەردگاری جیهانیان! وە گۆڕەکەشی گوشاد کەو پڕیکە لە نوور بۆی (م).

١٠١٨- عَنْ مَعْقِلِ بْنِ يَسَارٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِقْرَءُوا (يس) عَلَى مَوْتَاكُمْ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنسائي وأحمد وابن حبان وصححَّه[٥].

مەعقیلی کوڕی یەسار (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: سوورەتی یاسین لەسەر مردووەکانتان بخوێنن و لەسەر ئەوانەشتان کە وان لە حاڵەتی سەرەمەرگا (د/ن/ئەحمەد/ئیبنو حەببان. ئیبنو حەبان بە صەحیحی داناوە).

## ١٩٣ نیشانەی مردنی موسوڵمان لەسەر ئیمانو تەمەنی ئەم ئۆمەتی موحەممەدە (درودی خوای لەسەربێ) بە تێکڕایی چەندە: (علامة موت المؤمن وأعمار الأمة)

١٠١٩- عَنْ بُرَيْدَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْمُؤْمِنَ يَمُوتُ بِعَرَقِ الْجَبِينِ. رَوَاهُ الترمذي والنسائي واحمد[١].

---

(٥) حديث صحيح.

(١) بسند حسن (شرحه).

**بوریدە** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **دەفەرموێ: موسوڵمان كاتێ دەمرێ ناوچەوانی ئارەق دەكا (ت/ن/ئەحمەد-س/ح).**

**١٠٢٠- عَنْ عَبْدَ اللّٰهِ** (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: إِنَّ نَفْسَ الْمُؤْمِنِ تَخْرُجُ رَشْحًا وَلاَ أُحِبُّ مَوْتًا كَمَوْتِ الْحِمَارِ. قِيلَ وَمَا مَوْتُ الْحِمَارِ؟ قَالَ: مَوْتُ الْفَجْأَةِ. رَوَاهُ الترمذي[2].**

**عەبدوڵڵا** (خوای لێ رازی بێ) **دەڵێ: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **دەفەرموێ: گیانی موسوڵمان لەگەڵ جواناو رشتندا دەردەچێ، حەزیشم لەو مردنە نیە كە وەك مردنی كەر وایە، یاران دەڵێن: مردنی كەر كامەیە؟ دەفەرموێ: مردنی كوتوپڕییە! (ت).**

**١٠٢١- وَلأَبِي دَاوُدَ: مَوْتُ الْفَجْأَةِ أَخْذَةُ أَسَفٍ[3].**

**حەزرەت** (دروودی خوای لەسەربێ) **دەفەرموێ: مردنی كوتوپڕ داخی دڵ پێ رشتنە (د).**

**١٠٢٢- وَلِإِبْنُ أَبِي شَيْبَةَ (كما في الشرح): مَوْتُ الْفَجْأَةِ رَاحَةٌ لِلْمُؤْمِنِ وَأَسَفٌ عَلَى الْفَاجِرِ[4].**

**لە شەرحەكەدا دەڵێ: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەربێ) **دەفەرموێ: مەرگی كوتوپڕ (مەرگی موجافات) بۆ خاوەن ئیمان بارسووكییە كە بۆ خۆی! بەڵام بۆ بەدكاری ناهەموار نیشانەی رق و داخی دڵ پێ رشتنە. (ئیبنو ئەبی شەیبە).**

**١٠٢٣- عَنْ عَبْدِ اللهِ بَنِ عُمَرَو (رَضيَ أللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَمُوتُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ أَوْ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ إِلاَّ وَقَاهُ اللهُ فَتْنَةَ الْقَبْرِ[5].**

---

(٢) سكت عنه الشارح.

(٣) سكت عنه الشارح.

(٤) سكت عنه الشارح.

(٥) سكت عنه الشارح.

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەر موسوڵمانێ لەشەوو رۆژی هەینیدا بمرێ بێگومان کە خودا لە ئاژەوەو فیتنەی گۆڕ دەیپارێزێ (ت).

١٠٢٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَعْمَارُ أُمَّتِي مَا بَيْنَ السِّتِّينَ إِلَى السَّبْعِينَ، وَأَقَلُّهُمْ مَنْ يَجُوزُ ذلِكَ. رَوَاهُما الترمذي[٦].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) دەڵێ: حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: تەمەنی ئۆمەتی من لەناوەندی شەست تا حەفتایە، کەمیان لەمە تێ دەپەڕن! (ت).

## ١٩٤) بەهەر حاڵ مردن مایەی حەسانەوەی بەندەکانە:
## (في الموت راحة للعباد)

١٠٢٥- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مُرَّ عَلَيْهِ بِجِنَازَةٍ فَقَالَ: مُسْتَرِيحٌ، وَمُسْتَرَاحٌ مِنْهُ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا الْمُسْتَرِيحُ وَالْمُسْتَرَاحُ مِنْهُ؟ فَقَالَ: الْعَبْدُ الْمُؤْمِنُ يَسْتَرِيحُ مِنْ نَصَبِ الدُّنْيَا وَالْعَبْدُ الْفَاجِرُ يَسْتَرِيحُ مِنْهُ الْعِبَادُ وَالْبِلاَدُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ. رَوَاهُ الشيخان والنسائي[١].

ئەبو قەتادە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: تەرمێ بەلای پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەربێ) تێ پەڕی فەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ): یا بۆ خۆی رزگاری بوو، یاخود خەڵك لە دەستی رزگاریان بوو، گوتیان: چۆن چۆنی ئەی پێغەمبەری خودا!؟ فەرمووی: بەندەی خاوەن ئیمان کە دەمرێ بۆ خۆی لە کێشەو بەرەی جیهان قوتاری دەبێ و دەحەوێتەوە، بەندەی بەدکاریش کە دەمرێ عالەمێ دەحەوێتەوە: بەندەگان و وڵات و درەخت و زیندەوەران لەدەست زیان و وەزەنی رزگاریان دەبێ! (ش/ن).

---

(٦) سكت عنه الشارح.

(١) بخاري. رقاق: ٦٥١٢ ، ٦٥١٣. مسلم. جنائز: ٢١٩٩. نسائي. جنائز: ١٩٢٩.

## ١٩٥) بەشی دووەم: شینو زاریو شیوەنو شتی وا دروست نیە:
## الفصل الثاني: في تحريم النياحة ونحوها

١٠٢٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الْخُدُودَ، وَشَقَّ الْجُيُوبَ، وَدَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ أبا دَاوُدَ(١).

عەدوڵڵا (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەوەی روومەت بڕنێتەوەو یەخە دابدڕێو بانگەوازی سەردەمی نەزانی پێش هاتنی ئیسلام هەڵبدات لە ئێمە نیە (ش/ت/ن).

١٠٢٧- عَنْ أَبِي مُوسى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بَرِيءَ مِنَ الصَّالِقَةِ وَالْحالِقَةِ وَالشَّاقَّةِ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ الترمذي(٢).

ئەبوو مووسا (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بێزارو بەرییە لەو ژنەی كە شینو شەپۆڕ دەكاو سەری خۆی دەتاشێو یەخەی خۆی دادەڕێ لەكاتی رووداني فەلاكەتێكدا (ش/د/ن).

{ولفظ أبي داود (كما في الشرح): لَيْسَ مِنَّا مَنْ حَلَقَ وَمَنْ سَلَقَ وَمَنْ خَرَقَ.

گفتەی ئەبو داود: وەك لە شەرحەكەدا دەڵێ ئاوایە: حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەوی قژی خۆی بتاشێو شیوەن بگێڕێو جلی خۆی دادڕێ لە ئێمە نیە.

١٠٢٨- عَنْ أَبِي مَالِكٍ الأَشْعَرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَرْبَعٌ فِي أُمَّتِي مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ لاَ يَتْرُكُونَهُنَّ: الْفَخْرُ فِي الأَحْسَابِ وَالطَّعْنُ فِي الأَنْسَابِ وَالاِسْتِسْقَاءُ بِالنُّجُومِ وَالنِّيَاحَةُ، وَقَالَ: النَّائِحَةُ إِذَا لَمْ تَتُبْ قَبْلَ مَوْتِهَا تُقَامُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَعَلَيْهَا سِرْبَالٌ مِنْ قَطِرَانٍ وَدِرْعٌ مِنْ جَرَبٍ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ والترمذي ولفظه: أَرْبَعٌ فِي أُمَّتِي مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ لَنْ يَدَعَهُنَّ النَّاسُ النِّيَاحَةُ وَالطَّعْنُ فِي

---

(١) بخاري. جنائز: ١٢٩٧ ، ١٢٩٨ ، ٣٥١٩. مسلم. إيمان: ٢٨١. نسائي. جنائز. ١٨٥٩.

(٢) بخاري. جنائز: ١٢٩٦. مسلم. إيمان: ٢٨٣ ، ٢٨٤.

الأَحْسَابِ وَالْعَدْوَى أَجْرَبَ بَعِيرٌ، فَأَجْرَبَ مِائَةَ بَعِيرٍ مَنْ أَجْرَبَ الْبَعِيرَ الأَوَّلَ؟ وَالأَنْوَاءُ، مُطِرْنَا كَذَا وَكَذَا[٣].

ئەبو مالیكی ئەشعەری (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: چوار خووی ناشیرین ماون لەناو ئۆمەتما لەگەڵ ئەوەشا كە لە رەفتارو پیشەی بەدی سەردەمی نەزانین كەچی هێشتا ئۆمەتم هەر دەست بەرداریان نابن.

یەكەم: نازین و شانازیكردن بەرەسەنیی باوباپیرەوە.

دووەم: توانج و تانەدان لە رەچەڵەك و بنەچەی خەڵك.

سێیەم: بارانی باران دەدەنە پاڵ بورج و ئەستێران.

چوارەم: شیوەنكردن، وە فەرمووشی: سەردولكەبێژ (ئەگەر لە پێش مردنیا) تەوبە نەكاو پەشیمان نەبێتەوە، لە رۆژی قیامەتا كە زیندوو دەبێتەوە كراسی قەتران و دیزداشەی گەڕیی لەبەردایە (م/ت) گفتەی (ت): چوار خووی ناشیرین هەن لەناو ئۆمەتما، هەرچەند لە رەفتاری سەردەمی نەفامیشن كەچی ئەو خەڵكە هەروازیان لێ نایەنن چونكە وەها دەقیان بەستووە لە دڵی میللەتا.

یەكەم: شیوەنكردن.

دووەم: تانەو تەشەر لەبنەچەو رەچەڵەك.

سێیەم: باوەڕ بەوەكە نەخۆشی لەخۆیەوە دەتەنێتەوە، راستە وشترێ گەڕ دەبێ و سەد وشتری تر گەڕ دەكا، راستە كە ئەمە وایە، بەڵام ئەمە بە فەرمانی خودایەو بەپێی ئەو دەستوورو باوەیە كە خودای داناو زانا دایناوەو رێكی یاسای خودایییە، نەوەك گەڕییەكە لە خۆیەوە بەبێ فەرمانی خودا دەتەنێتەوە، ئەگینا ئەگەر وایە ئەی كێ یەكەم وشتر گەڕ دەكا؟

چوارەم: ئەو قسەیە كە دەڵێن: لە فیسارە بورجا بارانمان بۆ دەبارێ.

---

(٣) مسلم. جنائز: ٢١٥٧.

١٠٢٩- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: نَهانا رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِ النِّيَاحَةِ. رَوَاهُ الثلاثة[٤].

**ئوممو عەطییە** (خوای لێ رازی بێ) **دەڵێ: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **رێگەی شیوەنكردنی نەداوین (ش/د).**

١٠٣٠- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) النَّائِحَةَ وَالْمُسْتَمِعَةَ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ.

**ئەبو سەعید** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **لەعنەتو نەفرینی كردووە لەسەر دۆلكە بێژو لەو ژنەیش كە گوێی لێ دەگرێ سەردولكە بێژ: ژنی شیوەنگێڕ.(د).**

## ١٩٦) كەسێ راسپێرێ كە لەپاش مردنی شینو شتی وای بۆ بكرێ لەسەر كردنەكەی سزا دەدرێ: (يعذب الميت بالنوح ونحوه اذا أوصى به)

١٠٣١- عَنِ الْمُغِيرَةِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ نِيحَ عَلَيْهِ يُعَذَّبُ بِمَا نِيحَ عَلَيْهِ. رَوَاهُ الشيخان والترمذي[١].

**موغیرە** (خوای لێ رازی بێ) **دەڵێ: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **دەفەرموێ ئەو كەسەی شیوەنی لەسەر بكرێ لەسەر ئەو شیوەنەی كە لەسەری دەكرێ ئازارو سزا دەدرێ! (ش/ت).**

١٠٣٢- عَنْ أَبِي مُوسى قَالَ: لَمَّا أُصِيبَ عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) جَعَلَ صُهَيْبٌ يَقُولُ: وَاأَخَاهُ فَقَالَ: عُمَرُ: أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الْمَيِّتَ لَيُعَذَّبُ بِبُكَاءِ الْحَيِّ. وفي رواية: إِنَّ الْمَيِّتَ لَيُعَذَّبُ بِبَعْضِ بُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ. رَوَاهُ الخمسة[٢].

---

(٤) بخاري. حيض: ٣١٣. مسلم. جنائز: ٢١٦٤.

(١) بخاري. جنائز: ١٢٩١. مسلم. جنائز: ٢١٥٤.

(٢) بخاري. جنائز: ١٢٨٧ ، ١٢٩٠ — ١٢٩٢. مسلم: ٢١٤٦ — ٢١٤٩. نسائي. جنائز: ١٨٥٧.

ئەبو مووسا (خوای لێ رازی بێ) گوتی: کاتێ عومەر (خوای لێ رازی بێ) پێکرا، صوهەیب هاواری لێ هەڵسا، دەیگوت: ئای براڕۆ! عومەریش گوتی: ئەوە چۆن وا دەڵێیت ئەدی نازانی کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: مردوو لە سەرگریانی زیندوو ئێش و ئازار دەدرێ لە گێڕانەوەیەکا: هەندێ مردوو سزادەدرێ بەهۆی هەندێ لەو گریانەوە کە کەس و کارەکەی لەسەری دەگرین (ش/د/ت/ن–غەریقی بەحری رەحمەتی خودابن).

١٠٣٣- ذُكِرَ لِعَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَوْلُ عُمَرَ إِنَّ الْمَيِّتَ يُعَذَّبُ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ، فَقَالَ: رَحِمَ اللَّهُ عُمَرَ، وَاللَّهِ مَا حَدَّثَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِذَلِكَ وَلَكِنْ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ لَيَزِيدُ الْكَافِرَ عَذَابًا بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ. وَقَالَتْ: حَسْبُكُمُ الْقُرْآنُ (وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى) وَفِي رِوَايَةٍ: سَمِعَتْ عَائِشَةَ بِقَوْلِ ابْنَ عُمَرَ: الْمَيِّتَ لَيُعَذَّبُ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ فَقَالَتْ: يَغْفِرُ اللَّهُ لأَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ إِنَّهُ لَمْ يَكْذِبْ وَلَكِنَّهُ نَسِيَ أَوْ أَخْطَأَ إِنَّمَا مَرَّ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى يَهُودِيَّةٍ يَبْكَى أَعْلُهَا، فَقَالَ: إِنَّهُمْ لَيَبْكُونَ عَلَيْهَا وَإِنَّهَا لَتُعَذَّبُ فِي قَبْرِهَا. رَوَاهُ الخمسة[٣].

کاتێ قسەکەی عومەریان گێڕایەوە بۆ عائیشە: گوایە مردوو سزا دەدرێ لەسەر ئەو گریانەی کە کەس و کارەکەی بۆی دەکەن،، عائیشە گوتی: (رەحمەتی خودا لە عومەر بێ) عومەر پیاوی درۆ نەبوو، بەڵام یاباش لە یادی نەماوە یا بە هەڵەدا چووە، چونکە بەخودا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وەهای نەفەرموو، بەڵام فەرمووی: (دروودی خوای لەسەربێ): کافرو بێ بڕوا کە کەس و کارەکەی بۆی دەگرین خودا بەهۆی ئەوەوە ئەوەندەی تر ئێش و ئازاری گرانتر دەکا، عائیشە گوتی: قورئانتان بەسە بۆ شایەتی راستیی ئەم قسەی منە کە دەفەرموێ:

{وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى – ٦/١٦٤}.

هیچ کەسێ (با گوناهباریش بێ) باروگوناهی کەسێکی تر هەڵناگرێ. لە گێڕانەوەیەکا: کە عائیشە ئەم قسەی ئیبنو عومەری بیستەوە کە دەڵێ: گوایە مردوو ئێش و ئازار دەدرێ بەهۆی گریانی کەسو کاریەوە، گوتی: ئەبو

(٣) بخاري. مغازي: ٣٩٧٨. مسلم. جنائز: ٢١٥٠ ، ٢١٥١. أبو داود. جنائز: ٢١٢٩.

عەبدورڕەحمان خوا لێی خۆش بێ پیاوی درۆ نیە، بەڵام یا باش لە یادی نەماوە یا بە هەڵەدا چووە، چونکە شتەکە خۆی ئاوابو: جارێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەلای گۆڕی ژنە جوولەکەیەکەوە ڕەت بوو، کەس و کارەکەی لە سەری دەگریان فەرمووی: ئەوان لەسەری دەگرین، کەچی ئەویش لە کۆڕەکەیدا سزا دەدرێ (ش/د/ت/ن).

**١٠٣٤- عَنْ أَبِي مُوسَى** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنِ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: مَا مِنْ مَيِّتٍ يَمُوتُ فَيَقُومُ بَاكِيهِ فَيَقُولُ: وَاجَبَلاَهُ وَاسَنَدَاهُ أَوْ نَحْوَ ذَلِكَ إِلاَّ وُكِّلَ بِهِ مَلَكَانِ يَلْهَزَانِهِ أَهَكَذَا كُنْتَ. رَوَاهُ الترمذي وأحمد**[٤].

ئەبو مووسا (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ کەسێ دەمرێ ئەگەر یەکێ لەوە دوا هەڵسێتەوەو بە گریانەوە بیلاوێنێتەوەو بڵێ:کێوم ڕۆ، پشتیوانم ڕۆ، یا شتی وا بڵێ، بێگومان کە ئەو مردووە دەدەنە دەست دوو فریشتە، خۆش خۆش دەماڵن بەهەر دوو بنا گوێیداو بە تەوسەوە پێی دەڵێن: ئایا تۆ وەك ئەمە دەڵێ، وا بووی!! (ت/ئەحمەد-س/ح).

## ١٩٧) گریان (بەبێ دەنگ بەرزکردنەوە) دروستە : (يجوز البكاء بغير رفع صوت)

**١٠٣٥- عَنْ أَنَسٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **قَالَ: دَخَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **عَلَى أَبِي سَيْفٍ الْقَيْنِ وَكَانَ ظِئْرًا لإِبْرَاهِيمَ (عَلَيْهِ السَّلاَمُ) فَأَخَذَ رَسُولُ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **إِبْرَاهِيمَ فَقَبَّلَهُ وَشَمَّهُ، ثُمَّ دَخَلْنَا عَلَيْهِ بَعْدَ ذَلِكَ، وَإِبْرَاهِيمُ يَجُودُ بِنَفْسِهِ، فَجَعَلَتْ عَيْنَا رَسُولِ اللَّهِ** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **تَذْرِفَانِ، فَقَالَ: لَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ** (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) **وَأَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ: يَا ابْنَ عَوْفٍ إِنَّهَا رَحْمَةٌ ثُمَّ أَتْبَعَهَا بِأُخْرَى، فَقَالَ:** (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **إِنَّ الْعَيْنَ تَدْمَعُ ، وَالْقَلْبَ يَحْزَنُ، وَلاَ نَقُولُ إِلاَّ مَا يَرْضَى رَبُّنَا، وَإِنَّا بِفِرَاقِكَ يَا إِبْرَاهِيمُ لَمَحْزُونُونَ. رَوَاهُ الأربعة**[١].

---

(٤) بسند حسن (شرحه).

(١) بخاري. جنائز: ١٣٠٣. مسلم. فضائل: ٥٩٧٩ ، ٥٩٨٠. أبو داود. جنائز: ٢١٢٦.

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) فەرمووی: لە خزمەتی پێغەمبەردا (درودی خوای لەسەربێ) چوین بۆ ماڵی ئەبو سەیفی ئاسنگەر، کە مێردی دایەنەکەی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر بوو (درودی خوایان لەسەربێ) واتە: باوکی شیری ئیبراهیم بوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئیبراهیمی هەڵگرت و گرتیە باوەش و تێر تێر ماچی کردو بۆنی کرد، لە پاشان چووینەوە بۆ ماڵیان، ئەم جارە کە چووین ئیبراهیم (درودی خوای لەسەربێ) گیانی دەدا، جا چاوەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) هۆن هۆن فرمێسکیان پیا دەهاتە خوارەوە، جا عەبدورڕەحمانی کوڕی عەوف پێی گوت: ئەوە تۆیش دەگریت؟ ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی (درودی خوای لەسەربێ): ئەی کوڕی عەوف! رێگەی رەحم ناگیرێ ئەمە نیشانەی رەحم و میهرەبانییە ئینجا فرمێسکێکی تری بە شوێنا رێژاو فەرمووی (درودی خوای لەسەربێ): چاو پڕ دەبێ لە ئەسرو دڵ کەیل دەبێ لە خەم و خەفەت بەڵام بەزمان ئەوەی رەزای خودای پەروەردگارمانی لەسەر نەبێ نایڵێین لە راستیدا ئەی ئیبراهیم! ئێمە لە دووریی تۆ خەمگین و خەمبارین و بە کۆچی بێ وەختت پەرۆشین! (ش/د/ت).

١٠٣٦- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ أللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: اشْتَكَى سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ شَكْوَى لَهُ فَأَتَاهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَعُودُهُ مَعَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ وَسَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ، (رَضِيَ أللهُ عَنْهُمْ) فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيْهِ وَجَدَهُ فِي غَاشِيَةٍ فَقَالَ: أَقَدْ قَضَى؟ قَالُوا: لاَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَبَكَى النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَلَمَّا رَأَى الْقَوْمُ بُكَائَهُ بَكَوْا فَقَالَ: أَلاَ تَسْمَعُونَ إِنَّ اللَّهَ لاَ يُعَذِّبُ بِدَمْعِ الْعَيْنِ ، وَلاَ بِحُزْنِ الْقَلْبِ، وَلَكِنْ يُعَذِّبُ بِهَذَا أَوْ يَرْحَمُ. رَوَاهُ الشيخان[٢].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ خۆش نوود بێ) دەڵێ: جارێ سەعدی کوڕی عوبادە نەخۆش بوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) رۆیشت بۆ سەرلێدانی، عەبدورڕەحمانی کوڕی عەوف و سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص و عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودیشی لەگەڵ بوون، کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) رۆیشتە

---

(٢) بخاري. جنائز: ١٣٠٤. مسلم. جنائز: ٢١٣٤. تحفة الأشراف: ٧٠٧٠.

ژوورەوە بۆ لای، روانی بووراوەتەوەو پەل و پۆی شكاوەو كەسوكارەكەی دەورەیان لێ داوە، جا فەرمووی: ئایا ماوە یا مردووە؟ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! هێشتا ماوە، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەستی كرد بە گریان، كە خەڵكەكەیش دییان وا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) دەگری، ئەوانیش گریان، ئەویش فەرمووی: (دروودی خوای لەسەربێ) گوێتان لێ بێ: خودا لەسەر فرمێسكی چاوو لەسەر خەمو پەژارەی دڵ ئازارو سزاتان نادا، بەڵام بەهۆی ئەم زمانەوە سزاتان دەدا ئەگەر شیوەن و ناسوپاسیی پێ بكەن یا رەحمتان پێ دەكا ئەگەر لەكاتی سەختی و قۆرت وكۆستدا قسەی باشی پێ بكەن، وەك ئەوە بڵێن: {إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعونَ – ٢/١٥٦}.

ئێمە هەموو دەست نێژی خوداین و دیسانەوە دەچینەوە بەردەستی خۆی. (شەیخان – واتە: بوخاری و موسلیم، پڕ گۆڕەكەیان لە نوور بێ) ئەم فەرموودە پیرۆزەیان ریوایەت كردووە لە صەحیحەیندا، واتە: ئیمامی بوخاری ریوایەتی كردووە لە صەحیحی بوخاریداو ئیمامی موسلیم ریوایەتی كردووە لە صەحیحی موسلیمدا.

١٠٣٧– عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَخَذَ الرَّايَةَ زَيْدٌ فَأُصِيبَ، ثُمَّ أَخَذَهَا جَعْفَرٌ فَأُصِيبَ، ثُمَّ أَخَذَهَا بْنُ رَوَاحَةَ فَأُصِيبَ، وَإِنَّ عَيْنَيْ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَتَذْرِفَانِ ثُمَّ أَخَذَهَا خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ مِنْ غَيْرِ إِمْرَةٍ فَفُتِحَ لَهُ. رَوَاهُ البخاري والنسائي[٣].

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە غەزای مۆتەدا، ئەو رۆژەی كە سەركردەكانی لەشكری ئیسلام شەهیدبوون، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) هەواڵی شەهید بوونی ئەوانی پێ گوتین و فەرمووی: لە پێشا زەید ئاڵای لەشكری ئیسلامی هەڵگرت، تا شەهیدكرا، ئینجا جەعفەر هەڵی گرت تا ئەویش شەهیدكرا، ئینجاعەبدوڵڵای كوڕی رەواحە هەڵی گرت تا ئەویش پێكراو شەهیدبو لە پاشا خالیدی كوڕی وەلید لە خۆیەوە بەبێ فەرمانی

(٣) بخاري. مغازي: ٤٢٦١ ، ٤٢٦٠ ، (١٤٧٨ تجريد = ٣٧٥٧) ١٢٤٦ ، ٢٧٩٨ ، ٣٠٦٣ ، ٣٦٣٠ ، ٣٧٥٧ ، ٦٢٤٢.

کەس ئاڵاکەی هەڵگرت، وە خودا سەری خستو خەڵاتی سەرکەوتنی پێ بەخشی لەکاتی گێڕانەوەی باسی داستانی شەهیدبوونی ئەم پاڵەوانانەدا چاوەکانی حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) هۆن هۆن ئەسریان دەڕشت (ب/ن).

١٠٣٨- وَعَنْهُ قَالَ: قَنَتَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شَهْرًا حِينَ قُتِلَ الْقُرَّاءُ، فَمَا رَأَيْتُ حَزِنَ حُزْنًا قَطُّ أَشَدَّ مِنْهُ. رَوَاهُ الشيخان[٤].

دیسان گوتی: لەو سەردەمەدا کە قورئانخوێنەکان شەهیدکران کە ژمارەیان حەفتا کەس بوو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) تا ماوەی مانگێ لە نوێژی بەیانیدا لەپاش روکوعی دووەمەوە قونووتی دەخوێندو نزای خراپی لە بکوژەکانی قورئانخوێنەکان دەکرد هەرگیز نەمدیوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) وەك ئەو ماوەیە ئاوا خەمباربێ (ش).

## ١٩٨) بەشی سێیەم: ئارامو خۆڕاگرتنو رازی بوون بە بەشی خودای گەورە بەهرەیەکی گەلێ گەورەیە:

## (الفصل الثالث: في الصبر والرضا وما أجعلهما!)

قَالَ اَللّٰهُ تَعالى: {خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا — ٢/٦٧}.

خودا مردنو ژیانی دروست کردووە بۆ ئەوە تاقیتان بکاتەوە هەتا بزانێ کە کردەوەی کامتان باشترو جوانترە.

{قَالَ: اَللّٰهُ تَعالى – {وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ، الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُواْ: إِنَّا لِلّٰهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعونَ أُولَئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَاتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُهْتَدُونَ — ٢/١٥٥ - ١٥٧}.

واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! مژدە بدە بەوانەی کە کاتێ مەینەتێکیان پێ دەگا، یا ئێشێ دەگات بە دڵیان، یا تووشی کۆست کەوتنێ دەبن، یا چورتمێ دێتە رێیان، خۆ دەگرن لەبەر باری خوداداو دەڵێن: {إِنَّا لِلّٰهِ

---

(٤) بخاري. وتر: ١٠٠٢. مسلم. مساجد: ١٠٤٣ — ١٥٥٢.

وَإِنَّا إِلَيْـهِ رَاجِعـونَ} ئێمـه هـەموو دەسنیێژی خـوداین، لاریمـان نیـه لـه ئاسـتی فەرمانی، وە لەو دنیا دیسانەوە دەچێنەوە بەر دیوانی خۆی. ئەوانـه کـه ئەمـه حاڵو قسەیانە لە لایەنی خودایانەوە دروودی زۆرو جۆر بەجۆردا دەبارێ بـه سەریانا، وە بەخشش‌و رەحمەت‌و پایەو مایەی خێر لە لایـەنی خـوداوە دێتـه خـوارەوە بـۆ سـەریان، وە ئەمانـه گەیـشتوون بـه مـرازی خۆیـان‌و رێگـەی راستیان گرتووە.

١٠٣٩– قَالَ: عُمَرُ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) نِعْمَ الْعِدْلاَنِ، وَنِعْمَ الْعِلاَوَةُ فِي هَـذِهِ الآيَـةِ. رَوَاهُ البخاري[1].

عومـەر (خـوای لێ رازی بێ) لـه بـارەی ئـەم ئایەتـەوە دەڵـێ: بەراسـتی لـەم ئایەتەدا مژدەی دوو تاباری چاك‌و سەربارێکی چاکی تیایـه دوو تابارەکـەی بـرێتین لـه (صـلوات) و (رحمـه)ەکـه، سـەربارەکەیش برێتییـه لـه گەیـشتن بـه مرازی خۆیان‌و گرتنی رێی هیدایەت (ب).

١٠٤٠– عَنْ أَنَسٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِامْرَأَةٍ تَبْكِـي عِنْدَ قَبْرٍ فَقَالَ: اتَّقِي اللَّهَ وَاصْبِرِي فَقَالَتْ: إِلَيْكَ عَنِّى ، فَإِنَّكَ لَمْ تُصَبْ بِمُصِيبَتِى ، وَلَمْ تَعْرِفْهُ. فَقِيلَ لَهَا: إِنَّهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَتَتْ بَابَهُ فَلَمْ تَجِـدْ عِنْـدَهُ بَـوَّابِينَ فَقَالَتْ: لَمْ أَعْرِفْكَ فَقَالَ: إِنَّمَا الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الأُولَى. رَوَاهُ الخمسة[2].

ئەنـەس (خـوای لێ رازی بێ) گـوتی: ئافرەتـێ لەسـەر گـۆڕی منـاڵێکی خـۆی دەگریا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەلایەوە رەت بوو پێی فەرموو: لـه خـودا بترسـەو ددان بـەخۆتا بگـرەو ئـارام بگـره لەبـەر بـاری خـودادا، ژنەکـەیش نەیناسی کە ئەوە پێغەمبەرە، گوتی: بەولاوە! تۆ ئاگات لە دەردی من نیـه، لـه پاشا پێیان گوت: کـه ئـەوە پێغەمبـەر بـوو، ژنەکـەش چـوو بـۆ مـاڵی پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەربێ) روانی دەرکەوانی لێ نیە، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا لێم

---

(١) روى البخاري هذا الأثر تعليقاً فی بدء الباب/ ٤٢ من كتاب الجنائز (مترجم).

(٢) بخاري. جنـائز: ١٢٥٢ ، ١٢٨٣ ، ١٣٠٢ ، ٧١٥٤. مـسلم. جنـائز: ٢١٣٦ ، ٢١٣٧. ابـو داود. جنـائز: ٣١٢٤. ترمـذی. جنائز: ٩٨٨. نسائي. جنائز: ١٨٦٨.

مەگرە کە ئەو قسە زەق و رەقەم لە رووی تۆدا کرد، چونکە نەم ناسیت، فەرمووی: (دروودی خوای لەسەربێ): ئەو صەبرو ئارام و خۆراگرتنەی کە خودا پێی خۆشە دەشێ لە سەرەتای خورپە لێ کەتنەوە بێ! (ش/د/ت/ن).

١٠٤١- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ أَللهُ عَنْهُا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يُصِيبُ الْمُؤْمِنَ مِنْ شَوْكَةٍ فَمَا فَوْقَهَا إِلاَّ رَفَعَهُ اللَّهُ بِهَا دَرَجَةً أَوْ حَطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةً. رَوَاهُ الترمذي ومسلم(٣).

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ هەرچی تووشی موسوڵمان دەبێ (لە دڕکێکەوە بیگرە تا زیاتر) بێگومان کە خودا دەیکا بە مایەی پایەی بەرزیی بۆی و دەیکا بەهۆی هەڵوەرینی تاوان و گوناهەکانی (ت/م).

١٠٤٢- قال المؤلف في شرحه غاية المأمول على تاج الأصول: وَكَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جَالِساً فَطُفِيءَ الْمِصْبَاحُ فَاسْتَرْجَعَ فَقَالَتْ عَائِشَةُ: تَسْتَرْجِع لِلمِصْبَاحِ؟ فَقَالَ: كُلُّ مَا سَاءَ الْمُؤْمِنُ فَهُوَ مُصِيبَةٌ.

دانەر (رەحمەتی خودای لێبێ) لەشەرحەکەیدا دەڵێ: جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دادەنیشێ، چراکە دەکوژێنێتەوە، دەفەرموێ {إِنَّا لِلّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعونَ} عائیشەیش دەڵێ: بۆ چرا کوژانەوەش {إِنَّا لِلّه} دەکەیت! حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) وەڵامی دەداتەوە، دەفەرموێ: هەر شتێ ئازاری دڵی موسوڵمان بدا ئەوە بەمەینەت و موصیبەت حلێبە! (غایە المامول).

١٠٤٣- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ خَالِدٍ السُّلَمِيُّ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ (رَضِيَ أَللهُ عَنهُمْ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا سَبَقَتْ لَهُ مِنَ اللَّهِ مَنْزِلَةٌ لَمْ يَبْلُغْهَا بِعَمَلِهِ، ابْتَلاَهُ اللَّهُ فِي جَسَدِهِ أَوْ فِي مَالِهِ أَوْ فِي وَلَدِهِ، ثُمَّ صَبَّرَهُ عَلَى ذَلِكَ حَتَّى يُبْلِغَهُ الْمَنْزِلَةَ الَّتِي سَبَقَتْ لَهُ مِنَ اللَّهِ تَعَالَى(٥).

---

(٣) ریاض/١ زەکات-٣ رقم/٣٧/١٣. بخاری/٥٦٤١. مسلیم/٢٥٧٣

(٥) بسند صالح (شرحه).

موحەممەدی کوڕی خالیدی ئەل(سولەمی لە باوکییەوە، لە باپیرییەوە) (خوایان لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەو بەندەیەکە خودا لە پێشا پایەیەکی بەرزی بۆ دانابێ، وە ئەو بەندەیە بە کردەوەی خۆی نەگاتە ئەو پایەیە، ئەوە خودای گەورە یا لەشی یا ماڵی یا منداڵی دووچاری ئێش و ئازارو زیان دەکا، وە لە هەمان کات دا سەبووریشی دەداو سەبرو ئارامی دەداتێ هەتا دەیگەیەنێتە ئەو پایەیەی کە لە ڕابووردوودا خودای گەورە بۆی بڕیار داوە (د–سند صالح).

١٠٤٤– عَنْ أُمِّ الْعَلاَءِ (رَضيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: عَادَنِي رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَنَا مَرِيضَةٌ فَقَالَ: أَبْشِرِي يَا أُمَّ الْعَلاَءِ فَإِنَّ مَرَضَ الْمُسْلِمِ يُذْهِبُ اللّٰهُ بِهِ خَطَايَاهُ كَمَا تُذْهِبُ النَّارُ خَبَثَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ. رَوَاهُمَا أَبُو دَاوُدَ[٦].

ئوممو عەلا (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: نەخۆش بووم حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) هات بۆ سەرلێدانم، فەرمووی: ئەی ئوم عەلاء! مژدەبێ لێت: کە خودا بە نەخۆشی گوناهی موسوڵمان پاك دەکاتەوە، وەك چۆن زێڕو زیو بە ئاگری کوورە زاخاو دەدرێن و ژەنگ و چڵکیان پاك دەبێتەوە ئاوا! (د–سند صالح).

١٠٤٥– عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا مَرِضَ الْعَبْدُ أَوْ سَافَرَ، كُتِبَ اللهُ تَعَالى لَهُ مِنَ الأَجْرِ مِثْلُ مَا كَانَ يَعْمَلُ صَحِيحًا مُقِيماً. رَوَاهُ أحمد والبخاري وأبو دَاوُدَ[٧].

ئەبو مووسا (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: بەندە ئەگەر نەخۆش بوو یا چوو بۆ سەفەر خودای گەورە بە کەرەمی خۆی ئەو ئەجرو پاداشەی بۆ دەنووسێ کە لەوەپێش لە حاڵەتی لەش ساخیدا بۆی دەنووسێ، یا بەنیشتەجێیی لە ماڵەوە بۆی دەنووسێ (ئەحمەد/ب/د).

---

(٦) بسند صالح (شرحه).

(٧) بخاري. جنائز: ١١٢٤، ١١٢٥، ٤٩٥٠، ٤٩٨٣.

## ١٩٩) پاداشی مناڵ مردن: (جزاء موت الاولاد)

١٠٤٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مِنَ النَّاسِ مِنْ مُسْلِمٍ يُتَوَفَّى لَهُ ثَلاثٌ لَمْ يَبْلُغُوا الْحِنْثَ ، إِلاَّ أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ إِيَّاهُمْ. رَوَاهُ البخاري والنسائي وفي رواية للنسائيّ: مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَمُوتُ بَيْنَهُمَا ثَلاثَةُ أَوْلادٍ لَمْ يَبْلُغُوا الْحِنْثَ إِلاَّ أَدْخَلَهُمَا اللَّهُ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ إِيَّاهُمُ الْجَنَّةَ. قَالَ: يُقَالُ لَهُمُ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ فَيَقُولُونَ حَتَّى يَدْخُلَ آبَاؤُنَا فَيُقَالُ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ أَنْتُمْ وَآبَاؤُكُمْ[(١)].

ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر موسوڵمانێ سێ منداڵێ بمرن ڕەسیدە نەبووبن، بێگومان کە خودا لەبەر خاتری ئەو مندالانە دەیباتە بەهەشت (ب/ن) لە گێڕانەوەیەکی نەسائیدا: ئەو دوو موسوڵمانەی کە سێ منالی نەباڵقیان بمرێ، بێگومان کە خودا لەبەر خاتری منداڵەکانیان خۆشیان دەباتە بەهەشت، فەرمووی: پێیان دەڵێن: بچنە بەهەشتێ، دەڵێن: بەبێ باوكو دایكمان ناچین! ئەوجا پێیان دەڵێن: باشە خۆتانو باوكو دایكتان پێكەوە بچنە بەهەشتێ!

١٠٤٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لاَ يَمُوتُ لِمُسْلِمٍ ثَلاثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ ، فَيَلِجَ النَّارَ إِلاَّ تَحِلَّةَ الْقَسَمِ. رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ أبا دَاوُدَ[(٢)].

لە ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: هەر موسوڵمانێ سێ منالی بمرن مەگەر بۆ ئاهی سوێن بچێتە دۆزەخ! (ش/ت/ن).

١٠٤٨- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النِّسَاءَ قُلْنَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اجْعَلْ لَنَا يَوْمًا، فَوَعَظَهُنَّ وَقَالَ: أَيُّمَا امْرَأَةٍ مَاتَ لَهَا ثَلاثَةٌ مِنَ الْوَلَدِ كَانُوا لَهَا حِجَابًا مِنَ النَّارِ قَالَتِ امْرَأَةٌ: وَاثْنَانِ؟ قَالَ: وَاثْنَانِ. رَوَاهُ الشيخان والنسائي[(٣)].

---

(١) بخاري. جنائز: ١٢٤٨ ، ١٣٨١.

(٢) بخاري. ايمان ونزور: ٦٦٥٦ ، ١٢٥١. مسلم. البرو الصلة: ٦٦٣٩.

ئەبو سەعید (خوای لێ رازی بێ) گوتی: ژنان گوتیان بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ): رۆژێکمان بۆ دابنێ، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) رۆژێکی تایبەتی بۆ دیاری کردن و لەو رۆژەدا پەندی دادان و ئامۆژگاری کردن و فەرمووشی: هەر ژنێ سێ جگەر گۆشەی بمرن دەبن بە شووراو پەرژین بۆی بەدەور ئاگری دۆزەخدا، ئافرەتێکیش گوتی: ئەی ئەگەر دوانی بمرێ چۆنە؟ فەرمووی: ئەگەر دوانیشی بمرێ هەروا! (ش/ن).

١٠٤٩- وَجَاءَتِ امْرَأَةٌ بِابْنٍ لَهَا يَشْكِي فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ أَخَافُ عَلَيْهِ وَقَدْ قَدَّمَتُ ثَلاثَةً فَقَالَ: رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): لَقَدِ احْتَظَرْتِ بِحِظَارٍ شَدِيدٍ مِنَ النَّارِ. رَوَاهُ النسائي ومسلم[٤].

ئافرەتێ کورێکی نەخۆش بوو هێنای بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! سێ مندالی ترم مردوون ترسم لەمەش هەیە، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بەراستی شوورایەکی گەلێ قایم و مەحکەمەت بۆ خۆت کێشاوە بە دەوری ئاگری دۆزەخا (ن/م).

١٠٥٠- عَنْ عَبْدِ اللّٰهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ قَدَّمَ ثَلاثَةً لَمْ يَبْلُغُوا الْحُلُمَ كَانُوا لَهُ حِصْنًا حَصِينًا مِنَ النَّارِ. قَالَ: أَبُو ذَرٍّ قَدَّمْتُ اثْنَيْنِ. قَالَ: وَاثْنَيْنِ فَقَالَ: أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ سَيِّدُ الْقُرَّاءِ: قَدَّمْتُ وَاحِدًا قَالَ: وَوَاحِدًا وَلَكِنْ إِنَّمَا ذَاكَ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الأُولَى[٥].

عەبدوڵلا (خوای لێ رازی بێ) گوتی: حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ سێ منالی نابالقی لە پێش خۆیەوە بمرن دەبن بە قەلایەکی قایم بۆی و لە ئاگر پەنای دەدەن، ئەبو ذەرریش گوتی: من دوو منالم مردوون فەرمووی: دوو منالیش هەروایە! ئوبەی کوری کەعبیش (کە سەرگەورەی

---

(٣) بخاري. علم: ١٠١ ، ١٠٢ ، ١٢٤٩ ، ٧٣١. مسلم. البر والصلة: ٦٦٤٢.

(٤) مسلم. البر والصلة: ٦٦٤٥ ، ٦٦٤٦. نسائي. جنائز: ١٨٧٦.

(٥) بسند غريب (شرحه).

قورئان خوێنەکانە) گوتی: منیش منداڵێکم لە پێش خۆمەوە ڕەت کردووە، فەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ): یەك منداڵیش هەروایە، بەڵام بەمەرجێ باوك و دایك ئەمەیان بۆ هەیە کە لەکاتی ڕوودانی خورپەدا ورەبەرنەدەن[1] (تیرمیذی – هەزار ڕەحمەتی لێبێ – بەسەنەدێکی غەریب).

١٠٥١– عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ كَانَ لَهُ فَرَطَانِ مِنْ أُمَّتِي أَدْخَلَهُ اللَّهُ بِهِمَا الْجَنَّةَ. فَقَالَتْ عَائِشَةُ: فَمَنْ كَانَ لَهُ فَرَطٌ مِنْ أُمَّتِكَ قَالَ: وَمَنْ كَانَ لَهُ فَرَطٌ يَا مُوَفَّقَةُ قَالَتْ: فَمَنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ فَرَطٌ مِنْ أُمَّتِكَ؟ قَالَ: فَأَنَا فَرَطُ أُمَّتِي لَنْ يُصَابُوا بِمِثْلِي[6].

ئیبنو عەباس (خوایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەر کەسێ لە ئۆمەتم لە پێش خۆیەوە دوو منداڵی بمرن دەبن بە پێشڕەو بۆی لەبەهەشتا، جێگەی بۆ خۆش دەکەن چونکە خودا لەبەر خاتری ئەو دوو منداڵەی خۆشی دەباتە بەهەشت عائیشەش (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئەی ئەوەی لە ئۆمەتت یەك منداڵی پێشڕەوی هەبێ؟ فەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ): ئەی خوداپێداو! ئەوەشی یەك منداڵی پێشڕەوی هەبێ هەروا گوتی: ئەی باشە، ئەی ئەوەی لە ئۆمەتت کە هیچ منداڵی پێشڕەوی نەبێ؟ فەرمووی: خۆم پێشڕەوی هەموو ئۆمەتمم، هەرگیزاو هەرگیز ئۆمەتم بەمەرگی کەسی تر وەك مەرگی من وا کۆستی قەوییان ناکەوێ! (ت–س/ح).

١٠٥٢– عَنْ أَبِي مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا مَاتَ وَلَدُ الْعَبْدِ قَالَ: اللَّهُ لِمَلاَئِكَتِهِ قَبَضْتُمْ وَلَدَ عَبْدِي. فَيَقُولُونَ نَعَمْ. فَيَقُولُ قَبَضْتُمْ ثَمَرَةَ فُؤَادِهِ. فَيَقُولُونَ نَعَمْ. فَيَقُولُ مَاذَا قَالَ: عَبْدِي فَيَقُولُونَ حَمِدَكَ وَاسْتَرْجَعَ. فَيَقُولُ اللَّهُ ابْنُوا لِعَبْدِي بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ وَسَمُّوهُ بَيْتَ الْحَمْدِ. روى هذه الثلاثة الترمذي[7].

---

[1] هەزار ڕەحمەت لە تۆش نووری. وەرگێڕ

(٦) بسند حسن (شرحه).

(٧) بسند حسن (شرحه).

ئەبو مووسا (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ کە بەندەیێ منالێکی دەمرێ، خودا بەفریشتەکانی دەفەرموێ: گیانی منالی بەندەکەمتان کێشا؟ دەڵێن: بەلێ، دەفەرموێ: جگەر گۆشەکەیتان لێ سەندو بەش‌و بارەی دلتان لێ وەرگت؟ دەڵێن: بەلێ، جا دەفەرموێ: بەندەکەم چی گوت؟ دەڵێن: حەمدو سوپاسی تۆی کردو گوتی: {إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعونَ} جا خودای گەورە دەفەرموێ: کۆشکێ لە بەهەشتا دروست بکەن بۆ ئەو بەندەیەم‌و ناوی لێ بنێن کۆشکی حەمدو سوپاس (ت-س/ح).

## ٢٠٠) سەرلێدانی نەخۆش‌و نزاکردن بۆی : (عيادة المريض والدعاء له)

١٠٥٣- عَنِ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: حَقُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ خَمْسٌ رَدُّ السَّلاَمِ ، وَعِيَادَةُ الْمَرِيضِ ، وَاتِّبَاعُ الْجَنَائِزِ ، وَإِجَابَةُ الدَّعْوَةِ ، وَتَشْمِيتُ الْعَاطِسِ. رَوَاهُ الخمسة[1].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: مافی موسوڵمان لەسەر موسوڵمان پێنجن: وەڵام دانەوەی سڵاو، سەرلێدانی نەخۆش، شوێن کەوتنی تەرم، چوون بۆ سەر دەعوەت‌و بانگێشتن، نزاکردن بۆ پژمیو (ش/د/ت/ن).

١٠٥٤- عَنْ ثُوَيْرِ ابْنُ أَبِى فَاخِتَةَ عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَخَذَ عَلِيٌّ بِيَدِى قَالَ: انْطَلِقْ بِنَا إِلَى الْحَسَنِ نَعُودُهُ. فَوَجَدْنَا عِنْدَهُ أَبَا مُوسَى، فَقَالَ: عَلِيٌّ عَلَيْهِ السَّلاَمُ: أَعَائِدًا جِئْتَ يَا أَبَا مُوسَى أَمْ زَائِرًا فَقَالَ: لاَ بَلْ عَائِدًا. فَقَالَ: عَلِيٌّ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَعُودُ مُسْلِمًا غُدْوَةً إِلاَّ صَلَّى عَلَيْهِ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ حَتَّى يُمْسِيَ وَإِنْ عَادَهُ عَشِيَّةً إِلاَّ صَلَّى عَلَيْهِ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ حَتَّى يُصْبِحَ وَكَانَ لَهُ خَرِيفٌ فِي الْجَنَّةِ. رَوَاهُ الترمذي وابو داود[2].

---

(١) بخاري. جنائز: ١٢٤٠. مسلم. سلام: ٥٦١٥. أبو داود أدب: ٥٠٣٠.

(٢) واحمد وابن حبان والحاكم وصححه (شرحه).

تووەیری كوڕی ئەبو فاخیتە لە باوكیەوە (خوای لێ ڕازی بێ) (گوتی: عەلی دەستی گرتم و گوتی: بابچین بۆ هەواڵپرسیی حەسەنی كوڕم، نەخۆشە كە ئێمە چووین ئەبو مووسای لەلا بوو، عەلی (خوای لێ ڕازی بێ) پێی گوت: ئەی ئەبو مووسا! بۆ سەرلێدانی نەخۆش هاتوویت یا بۆ دیدەنی پەتێ؟ گوتی: نەء، بەناوی سەرلێدانی نەخۆشەوە هاتووم. عەلی گوتی: لە حەزرەتم بیستووە (دروودی خوای لەسەربێ) دەیفەرموو: هەر موسوڵمانێ سەر لەبەیانی بچێت بۆ سەرلێدانی موسوڵمانێكی نەخۆش، حەفتا هەزار فریشە تا ئێوارێ ڕەحمەتی بۆ دەنێرن، ئەگەر سەر لە ئێوارێ بچێت بۆ سەرلێدانی حەفتا هەزار فریشە تا سبەینێ ڕەحمەتی بۆ دەنێرن، وە بێستانێكیشی دەدەنێ لە بەهەشتا بۆ خۆی (ت/د/ئەحمەد:ص).

١٠٥٥- عَنْ زَيْدِ بَنِ أَرْقَمَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: عَادَنِي رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) مِنْ وَجَعٍ كَانَ بِعَيْنَيَّ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وأحمد والحاكم وصححَّه(٣).

زەیدی كوڕی ئەرقەم (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: چاوم دەئێشا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بە بۆنەی ئەوەوە هات بۆ سەرلێدانم (د/ئەحمەد/حاكم:ص).

١٠٥٦- عَنْ ثَوْبَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الْمُسْلِمَ إِذَا عَادَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ لَمْ يَزَلْ فِي خُرْفَةِ الْجَنَّةِ. رَوَاهُ الترمذي ومسلم وزاد: حَتَّى يَرْجِعَ، قِيْلَ يَا رَسُولَ اللهِ: وَمَا خُرْفَةِ الْجَنَّةِ؟ قَالَ: جَنَّاهَا(٤).

ثەوبان (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: كاتێ موسوڵمان دەچێ بۆ هەواڵپرسینی برای موسوڵمانی نەخۆش، ئەوە دەچێت بۆ ڕنینی میوەی بەهەشت! (ت/م) موسلیم ئەمەشی پترە: ئەوە میوەی بەهەشت دەچنێ هەتا دەگەڕێتەوە گوترا: ئەی پێغەمبەری خودا! چنین یانی چی؟ فەرمووی: یانی بەری باخەكەی دەڕنێ!

---

(٣) صحيح عند الحاكم

(٤) مسلم. البر والصلة: ٦٤٩٩.

١٠٥٧- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الْوُضُوءَ وَعَادَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ مُحْتَسِبًا، بُوعِدَ مِنْ جَهَنَّمَ مَسِيرَةَ سَبْعِينَ خَرِيفًا قِيْلَ: يَا أَبَا حَمْزَةَ مَا الْخَرِيفُ؟ قَالَ: الْعَامُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[٥].

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرمویێ: هەر كەسێ دەسنوێژێكی جوان بگرێو ساخ لەبەر رەزای خودا بچێ بۆ هەواڵپرسینیی برایەكی موسوڵمانی نەخۆشی ئەوە حەفتا پاییز لە دۆزەخ دوور دەخرێتەوە گوترا: ئەی ئەبو حەمزە! پاییز یانی چی؟ گوتی: یانی ساڵ(د).

١٠٥٨- عَنْ عَائِشَةَ بِنْتِ سَعْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) أَنَّ أَبَاهَا قَالَ: اشْتَكَيْتُ بِمَكَّةَ، فَجَاءَنِي النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَعُودُنِي وَوَضَعَ يَدَهُ عَلَى جَبْهَتِي ثُمَّ مَسَحَ صَدْرِي وَبَطْنِي ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ اشْفِ سَعْدًا وَأَتْمِمْ لَهُ هِجْرَتَهُ. رواه أَبُو دَاوُدَ والبُخاري[٦].

عائیشەی كچی سەعد (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: باوكم گوتی: لەمككە نەخۆش كەوتم پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) هات بۆ هەواڵ پرسینم، دەستی لەسەر تەوێڵم دانا، ئینجا دەستی هێنا بە سینگو سكماو فەرمووی: خودایە! شیفای سەعد بدەو كۆچەكەی بۆ تەواوكەو لە مەككە مەیمرێنە كە وڵاتو شوێنەزای خۆیەتی (د/ب).

١٠٥٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ عَادَ مَرِيضًا لَمْ يَحْضُرْ أَجَلُهُ فَقَالَ: عِنْدَهُ سَبْعَ مِرَارٍ: أَسْأَلُ اللَّهَ الْعَظِيمَ رَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ أَنْ يَشْفِيَكَ إِلاَّ عَافَاهُ اللَّهُ مِنْ ذَلِكَ الْمَرَضِ. رَوَاهُ أصحاب السنن[٧].

ئیبنو عەبباس (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەر كەسێ بچێ بۆ سەرلێدانی نەخۆشێ كە ئاكام (ئەجەل)ی نەهاتبێ وە حەوت جار لەلای بڵێ:

---

(٥) سكت عنه.

(٦) بخاري. مرضى: ٥٦٥٩.

(٧) وراواه ابن جبان والكاحم وصححه (شرحه).

{أَسْأَلُ اللهَ الْعَظِيمَ رَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ أَنْ يَشْفِيَكَ}:

داوا دەکەم لە خودای گەورە کە پەروەردگاری بارەگای گەورەیە، کە چاکت بکاتەوەو شیفات بدات. ئیتر بێگومان کە خودا لەو نەخۆشییە چاکی دەکاتەوە (د/ت/ن/حاکم:ص).

١٠٦٠- قَالَ: الشارح (رحمه الله تعالى) في الفصل الثالث من هذا البـاب: فَالْمَرَضُ يَكُونُ لِرَفْعِ الدَّرَجَاتِ إِنْ كَانَ الْمَرِيضُ طَاهِرًا وَإِلاَّ طَهَّرَهُ مِنَ السَّيِّئَاتِ الَّتِي لَوْلاَهُ (أَيِ الْمَرَضَ) لَطَهَّرَ (أَيِ الْمَرِيضَ) بِالنَّار. ومنه حديث الترمذي: إِنَّمَا مَثَلُ الْمَرِيضِ إِذَا بَرَأَ وَصَحَّ مَنْ مَرَضِهِ كَالْبَرْدَةِ الَّتِي تَقَعُ مِنَ السَّمَاءِ فِي صَفَائِهَا وَلَوْنِهَا. بَلْ وَيَكُونُ الْمَرِيضُ عِبْرَةً لحديث أبي داود وأحمد: إِنَّ الْمُؤْمِنَ إِذَا أَصَابَهُ السَّقَمُ ثُمَّ أَعْفَاهُ اللَّهُ مِنْهُ كَانَ كَفَّارَةً لِمَا مَضَى مِنْ ذُنُوبِهِ وَمَوْعِظَةً لَهُ فِيمَا يَسْتَقْبِلُ وَإِنَّ الْمُنَافِقَ إِذَا مَرِضَ ثُمَّ أُعْفِيَ كَانَ كَالْبَعِيرِ عَقَلَهُ أَهْلُهُ ثُمَّ أَرْسَلُوهُ فَلَمْ يَدْرِ لِمَ عَقَلُوهُ وَلَمْ يَدْرِ لِمَ أَرْسَلُوهُ. فَقَالَ: رَجُلٌ مِمَّنْ حَوْلَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا الأَسْقَامُ؟ وَاللَّهِ مَا مَرِضْتُ قَطُّ. فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قُمْ عَنَّا فَلَسْتَ مِنَّا. (غاية المأمول)[٨].

شاریح (غەرقی رەحمەتی خودا بێ) لەشەرحەکەدا لە بەشی سێیەمی ئەم بابەتەدا دەڵێ: جاری وا هەیە نەخۆشی بۆ گەیشتن بە پایەی بەرزو پلەی بڵندە، وەك نەخۆشینی ئەو کەسانە کە خۆیان پاكو بێگوناهن، وە جاری وا هەیە بۆ سڕینەوەی گوناهە، چونکە گوناهبار ئەگەر ئەو نەخۆشییە پاکی نەکردایەتەوە بە ئاگری دۆزەخ پاك دەکرایەوە لێی. وە لەم بابەتەیە ئەم فەرموودەیە کە تیرمیذی گێڕاویەتیەوە کە دەفەرموێ: کاتێ موسوڵمان لە نەخۆشین چاك دەبێتەوە وەك ئەو دەنکە تەرزەیە وایە کە تازە لە ئاسمان باریبێ، ئەوەندە پاكو بێگەردو رۆشنو سپییە!. وە دەڵێ: بەڵکوو لەگەڵ ئەوەشا دەبێ بە پەندو تەمێ، بەڵگەی ئەم قسەیەش ئەم فەرموودەیەیە کە ئەبو داوودو ئەحمەد دەیگێڕنەوە، کە حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: موسوڵمان کاتێ تووشی دەردێ دەبێ و لەپاشا خودا چاکی دەکاتەوە لەو

(٨) منقول من الشرح.

دەردە ئەوە دەبێ بە كەفارەتی گوناهە رابووردووەكانی، سەرەڕای ئەوەیش دەبێ بە پەندو تەمێ و ئامۆژگاری بۆ ڕۆژانی لەوە دوای، بەڵام ئادەمیزادی ناپاك كاتێ نەخۆش دەكەوێ و چاك دەبێتەوە وەك وشترێ وایە كە خاوەنەكەی ناو بەناو دەیبەستێتەوەو ناو بەناو بەرەڵای دەكا نازانێ بۆچی بەستوویانەتەوە، هەروەك نازانێ لەبەرچی بەرەڵایان كردووە پیاوێ گوتی لەوێ بوو: ئەی پێغەمبەری خودا! نەخۆشی چییە؟ بەخودا من هەتا ئێستا نازانم نەخۆشی چییە؟ چونكە نەخۆش نەكەوتووم. پێغەمبەر پێی فەرموو: (هەڵسە لەگەڵ ئێمە دامەنیشە تۆ لە ئێمە نیت. (غایەتول مەئموول شەرحی تاجول ئوصول).

**٢٠١) دروستە سەری مردوو لاببرێ و ماچ بكرێ: (يجوز كشف الميت وتقبيله)**

١٠٦١- عَنِ عَائِشَةَ (رَضيَ أللهُ عَنْهُا) قَالَتْ: أَقْبَلَ أَبُو بَكْرٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَلَى فَرَسِهِ مِنْ مَسْكَنِهِ بِالسُّنْحِ حَتَّى نَزَلَ ، فَدَخَلَ الْمَسْجِدَ ، فَلَمْ يُكَلِّمِ النَّاسَ ، حَتَّى نَزَلَ فَدَخَلَ عَلَى عَائِشَةَ (رَضيَ أللهُ عَنْهُا) فَتَيَمَّمَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ مُسَجًّى بِبُرْدِ حِبَرَةٍ ، فَكَشَفَ عَنْ وَجْهِهِ ، ثُمَّ أَكَبَّ عَلَيْهِ فَقَبَّلَهُ ثُمَّ بَكَى فَقَالَ: بِأَبِي أَنْتَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ ، لاَ يَجْمَعُ اللَّهُ عَلَيْكَ مَوْتَتَيْنِ ، أَمَّا الْمَوْتَةُ الَّتِي كُتِبَتْ عَلَيْكَ فَقَدْ مُتَّهَا. رَوَاهُ البخاري والنسائي[١]

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: ئەبو بەكر لەماڵەكەی سونحیەوە بە سواری ماینێ هات، كە دابەزی یەكسەر ڕۆیشتە ناو مزگەوت، قسەی لەگەڵ كەس نەكرد تا چووە هۆدەكەی عائیشە (دروودی خوای لەسەربێ)، یەكسەر چووە سەر تەرمەكەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) كە لەوێ بوو وە بەشاڵی یەمەنی داپۆشرابوو، جا رووی پێغەمبەری هەڵدایەوەو باوەشی پیا كردو ماچی كردو گریاو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! باوكم بە سەرگەردانت بێ ئەو مردنەی كە خودا لەسەری نووسیبوویت ئەوا مردیت، ئیتر جارێكی تر نامریتەوە

(١) بخاري. جنائز: ١٢٤١ ، ١٢٤٢ ، ٣٦٦٧ ، ٣٦٦٩ ، ٤٤٥٧ ، ٣٦٦٩ ، ٤٤٥٢ ، ٤٤٥٥ ، ٥٧١٠.

چونكه ئەگەر وەك هەندێ كەس دەڵێن وابێ جارێكی تریش بمرێتەوە، هەندێ كەس دەیانگوت گوایە پێغەمبەر زیندوو دەبێتەوەو دەستو پای ئەو كەسانە دەبڕێ كە دەڵێن پێغەمبەر مردووە (ب/ن).

١٠٦٢- وَعَنهاَ قَالَتْ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يُقَبِّلُ عُثْمَانَ بْنَ مَظْعُونٍ وَهُوَ مَيِّتٌ حَتَّى رَأَيْتُ الدُّمُوعَ تَسِيلُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي(٢).

دیسان گوتی: دیتم كە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) عوسمانی كوڕی مەظعوونی بە مردوویی ماچ دەكرد، وە هۆن هۆن فرمێسك بە چاویا دەهاتە خوارەوە (د/ت-س/ص).

## ٢٠٢) ئەوەی بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) كراوە لەكاتی مردنیدا:

## ما فعل بالنبي ﷺ حين موته

١٠٦٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُا) قَالَتْ: سُجِّيَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِينَ مَاتَ بِثَوْبِ حِبَرَةٍ. رَوَاهُ الثلاثة(١).

عائیشە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) كەمرد بە شاڵی یەمەنی دایانپۆشی (ش/د).

١٠٦٤- عَنْ عَامِرِ الشَّعْبِيّ (رَضيَ اللّٰهُ عَنهُ) قَالَ: غَسَّلَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلِيٌّ وَالْفَضْلُ وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، وَهُمْ أَدْخَلُوهُ فِي قَبْرِهِ، فَلَمَّا فَرَغَ عَلِيٌّ قَالَ: إِنَّمَا يَلِي الرَّجُلَ أَهْلُهُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ(٢).

عامیری ئەل-شەعبی (خوای لێ رازی بێ) گوتی: عەلیو فەضلو ئوسامەی كوڕی زەید تەرمەكەی پێغەمبەریان شۆرد، هەر ئەوانیش دایان هێلایە ناو قەبرەكەیەوە، جا عەلی كەلێ بووە گوتی: پیاو دەبێ كەسو كاری خۆی سەرەو كاری بكەن (د).

---

(٢) بسند صحيح (شرحه).

(١) بخاري. لباس: ٥٨١٤. مسلم. جنائز: ٢١٨٠. أبو داود. جنائز: ٣١٢٠.

(٢) سكت عنه

١٠٦٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ أللهُ عَنهُا) قَالَتْ: لَمَّا أَرَادُوا غَسْلَ النَّبِيِّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالُوا: مَا نَدْرِى أَنُجَرِّدُ رَسُولَ اللّٰهِ مِنْ ثِيَابِهِ كَمَا نُجَرِّدُ مَوْتَانَا أَمْ نُغَسِّلُهُ وَعَلَيْهِ ثِيَابُهُ، فَلَمَّا اخْتَلَفُوا أَلْقَى اللّٰهُ عَلَيْهِمُ النَّوْمَ حَتَّى مَا مِنْهُمْ رَجُلٌ إلاَّ وَذَقْنُهُ فِي صَدْرِهِ ثُمَّ كَلَّمَهُمْ مُكَلِّمٌ مِنْ نَاحِيَةِ الْبَيْتِ لاَ يَدْرُونَ مَنْ هُوَ: أَنِ اغْسِلُوا النَّبِيَّ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعَلَيْهِ ثِيَابُهُ، فَقَامُوا إِلَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَغَسَلُوهُ وَعَلَيْهِ قَمِيصُهُ يَصُبُّونَ الْمَاءَ فَوْقَ الْقَمِيصِ وَيُدَلِّكُونَهُ بِالْقَمِيصِ دُونَ أَيْدِيهِمْ وَكَانَتْ عَائِشَةُ تَقُولُ: لَوِ اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِى مَا اسْتَدْبَرْتُ مَا غَسَّلَهُ إِلاَّ نِسَاؤُهُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وابن حبَّان والحاكم[٣].

**عائیشه** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: کەویستیان تەرمەکەی پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **بشۆرن گوتیان: نازانین ئایا پێغەمبەریش** (دروودی خوای لەسەربێ) **رووت بکەینەوە وەك چۆن مردووی ترمان رووت دەکەینەوە یاخود ئەم هەر بەجلەکانیەوە بێ شۆرین، جا لەسەر ئەمە کەقسەیان یەکی نەگرت خودا خەوی لێ خستن، خەوێکی وا قورس کە یەك بەیەك سەریان بەسەر سینگیانا شۆڕبۆوە، ئینجا قسەکەرێ (لە گۆشەیەکی ماڵەکەوە) قسەی لەگەڵ کردن (بەبێ ئەوەی کە بزانن کێیە) گوتی: پێیان: تەرمی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەربێ) هەر بە جلەکانی خۆیەوە بیشۆرن، جا ئەوانیش هەڵسان و چوون بەلای تەرمەکەوەو هەر بە جلەکانیەوە شۆردیان (دروودی خودای لەسەربێ) ئاوەکەیان دەکرد بەسەر کراسەکەداو لەسەر کراسەکەوە دەستیان لە لەشی دەخست، عائیشە دەیگوت: تازە لە دەستم چوو ئەگەر ئەقڵی ئێستام ئەوسابوایە دەبوو ژنەکانی بیان شۆردایە! (د/ئیبنو حەببان/ حاکم-س/ص).**

١٠٦٦- وَعَنْهَا قَالَتْ: كُفِّنَ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي ثَلاَثَةِ أَثْوَابٍ يَمَانِيَةٍ، بِيضٍ سَحُولِيَّةٍ مِنْ كُرْسُفٍ ، لَيْسَ فِيهِنَّ قَمِيصٌ وَلاَ عِمَامَةٌ. رَوَاهُ الخمسة[٤].

---

(٣) بسند صحيح (شرحه).

(٤) بخاري. جنائز: ١٢٦٤ ، ١٢٧١ ، ١٢٧٢ ، ١٢٧٣ ، ١٣٨٧. مسلم. جنائز: ٢١٧٧ – ٢١٧٩. أبو داود. جنائز: ٣١٥٢. ترمذي. جنائز: ٩٩٦. نسائي. جنائز: ١٨٩٨.

دیسان گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەسێ لۆ جلی یەمەنی سپی خاوێنی لۆکەدا کفن کرا، نەکراس و نە مێزەریان تیا نەبوو! (ش/د/ت/ن).

١٠٦٧- وَعَنْهاَ قَالَتْ: لَمَّا قُبِضَ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اخْتَلَفُوا فِي دَفْنِهِ فَقَالَ: أَبُو بَكْرٍ: سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) شَيْئًا مَا نَسِيتُهُ قَالَ: مَا قَبَضَ اللّٰهُ نَبِيًّا إِلاَّ فِي الْمَوْضِعِ الَّذِي يُحِبُّ أَنْ يُدْفَنَ فِيهِ، ادْفِنُوهُ فِي مَوْضِعِ فِرَاشِهِ[٥].

دیسان گوتی: (خوای لێ رازی بێ) کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کۆچی دوایی کرد، لەسەر جێگەی ناشتنەکەی قسەیان یەکی نەگرت، تا ئەبو بەکر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لەم بارەیەوە شتێکم لە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ژنەوتووە هەر لە یادم ماوە، فەرمووی: (درودی خوای لەسەربێ) خودا گیانی هیچ پێغەمبەرێ ناکێشێ، مەگەر لەو شوێنەدا کە خۆی حەزی لێبێ کە لەوێ بنێژرێ کەوابوو لە شوێنی نوێنەکەی خۆیدا بینێژن (ت- سند غريب).

١٠٦٨- عَنْ جَعْفَرَ ابْنِ مُحَمَّدٍ عَنْ أَبِيهِ (رَضيَ اللّٰهُ عَنْهُمْ) قَالَ: الَّذِي أَلْحَدَ قَبْرَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَبُو طَلْحَةَ، وَالَّذِي أَلْقَى الْقَطِيفَةَ تَحْتَهُ شَقْرَانُ مَوْلَى رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الَّذِي قَالَ: اَنَا وَاللّٰهِ طَرَحْتُ الْقَطِيفَةَ تَحْتَ رَسُولِ اللّٰهِ فِي الْقَبْرِ. رَوَاهُما الترمذي[٦].

لە جەعفەری کوڕی موحەممەدەوە لە باوکیەوە (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: ئەبو طەلحە لادڕ (ئەڵحەدی گۆڕ)ەکەی پێغەمبەری دروست کرد (درودی خوای لەسەربێ) واتە: لەبەری قیبلەی گۆڕەکەوە قومووشێکی بۆ شوێنی تەرمەکە دروست کرد، جا کە لاشەی پێغەمبەریان لە ناوا دانا بە نۆخشتی کاڵ لای پشتیان هەڵچنی. گوتی: شەقرانی نۆکەری

---

(٥) رواه الترمذي بسند غريب (شرحه).

(٦) بسند حسن (شرحه).

پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) قەیفەکەی لە گۆڕەکەیدا لە ژێر تەرمەکەیدا راخست ئەو شەقرانەی کە خۆی دەیگوت: بەخودا خۆم پارچە قەیفەکەم لەناو گۆڕەکەدا لەژێر تەرمەکەی پێغەمبەردا راخست (ت-س/ح).

## ٢٠٣) بەشی چوارەم: باسی ئەوشتانە کە پێویستین بۆ مردوو بکرێن
## الفصل الرابع: فيما يلزم للميت

١٠٦٩- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُا) قَالَتْ: قَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي غُسْلِ ابْنَتِهِ ابْدَأْنَ بِمَيَامِنِهَا وَمَوَاضِعِ الْوُضُوءِ مِنْهَا. رَوَاهُ الخمسة[1].

ئوممو عەطییە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بۆ شۆردنی تەرمی زەینەبی کچی فەرمووی پێمان: لە ئەندامە راستەکانیەوە لە ئەندامەکانی دەس نوێژیەوە دەست پێبکەن بە شۆردنی (ش/د/ت/ن).

١٠٧٠- وَعَنْهاَ قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَنَحْنُ نَغْسِلُ ابْنَتَهُ فَقَالَ: اغْسِلْنَهَا ثَلاَثًا أَوْ خَمْسًا أَوْ أَكْثَرَ مَنْ ذَلِكَ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَاجْعَلْنَ فِي الآخِرَةِ كَافُورًا، فَإِذَا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي فَلَمَّا فَرَغْنَا آذَنَّاهُ، فَأَلْقَى إِلَيْنَا حِقْوَهُ فَقَالَ: أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ. وَزَادَتْ فِي رِوَايَةٍ: فَضَفَرْنَا شَعَرَهَا ثَلاَثَةَ قُرُونٍ وَأَلْقَيْنَاهَا خَلْفَهَا. وَفِي رِوَايَةٍ: اغْسِلْنَهَا وِتْرًا ثَلاَثًا أَوْ خَمْسًا أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ إِنْ رَأَيْتُنَّ ذَلِكَ. رَوَاهُ الخمسة[2].

دیسان گوتی: خەریك بووین زەینەبی کچی پێغەمبەرمان دەشۆرد، پێغەمبەر خۆی (دروودی خوای لەسەربێ) هاتە ژوورەوە بۆ لامان فەرمووی: بە ئاوو مۆرد سێ جار بیشۆرن، یا پێنج جار، یا زیاتریش، وە لەدوا دەستا

---

(١) بخارى. جنائز: ١٢٥٤ ، ١٢٥٥ ، ١٢٥٦. مسلم. جنائز: ٢١٧٢ ، ٢١٧٣. أبو داود. جنائز: ٣١٤٥. ترمذي. جنائز: ٩٩٠.

(٢) بخاري. جنائز: ١٢٥٣. مسلم. جنائز: ٢١٦٥ — ٢١٧١. أبو داود. جنائز: ٣١٢٤ ، ٣١٤٦. نسائي. جنائز: ١٨٨٠ ، ١٨٨٥ ، ١٨٨٦ ، ١٨٨٧ ، ١٨٨٩ ، ١٨٩٢.

كافووریشی تێ بكەن، كاتێكیش لێ بوونەوە لە شۆردنەكەی ئاگادارم بكەن جا كەلێ بووینەوە پێمان گوت، جا حەزرەت كراس (ازار)ەكەی خۆی هەڵدا بۆمان و فەرمووی: بیكەن بەژێر كراسی واتە: لەسەر گۆشتەوە بیكەنە بەری، لە گێڕانەوەیەكا ئوم عەطییە ئەمەشی پتر كردووە: قژەكەشیمان شانە كردو كردمان بەسێ پەلكو بە پشتیا شۆڕمان كردەوە لە گێڕانەوەیەكی تردا: فەرمووی: (دروودی خوای لەسەربێ) سێ جار یا پێنج جار سەراپا هەمو لەشی بشۆرن، ئەگەر بە پێوستتان زانی زیاتریش بیشۆرن، بەڵام باجاری شۆردنەكانی تاك بێ (ش/د/ت/ن).

## ٢٠٤) شەهید نەدەشۆرریّو نە نوێژی لەسەر دەكرێ: الشهيد لا يغسل ولا يصلى عليه

١٠٧١ – عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَجْمَعُ بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ مِنْ قَتْلَى أُحُدٍ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ ثُمَّ يَقُولُ: أَيُّهُمَا أَكْثَرُ أَخْذًا لِلْقُرْآنِ؟ فَإِذَا أُشِيرَ لَهُ إِلَى أَحَدِهِمَا قَدَّمَهُ فِي اللَّحْدِ، وَقَالَ: أَنَا شَهِيدٌ عَلَى هَؤُلاَءِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَأَمَرَ بِدَفْنِهِمْ فِي دِمَائِهِمْ، وَلَمْ يُغَسَّلُوا وَلَمْ يُصَلَّ عَلَيْهِمْ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ مسلماً[1].

جابیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) شەهیدەكانی غەزای ئوحودی دووپیاو، دوو پیاو، دەخستە ناو یەك لۆ جلەوە لەباتی كفن ئینجا دەیفەرموو: كامەیان زیاتر قورئانی لەبەر بوو؟ جا كە نیشانیان دەدا كامەیان پتر قورئانی لەبەر بووە ئەوەیانی لە ئەڵحەدەكەدا دەخستە لای قیبلەوە! وە فەرمووی: لە رۆژی قیامەتا من خۆم ئاگاداری ئەمانە دەكەمو دەبم بە شایەت بۆیانو شایەتییان بۆ دەدەم كە گیانی شیرینی خۆیان بەخت كردووە لە پێناوی خودادا، لە پاشا فەرمانی كرد هەر بەخوێنو خۆڕەكەی خۆیانەوە ناشتیانن، نە شۆردرانو نە نوێژیان لەسەر كرا (ب/د/ت/ن).

---

(١) بخاري. غزوة أحد: ٤٠٧٩.

## ٢٠٥) كفنكردن: (التكفين)

١٠٧٢- عَنْ جَابِرٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا كَفَّنَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَلْيُحَسِّنْ كَفَنَهُ. رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ البخاري[1].

**جابیر** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: کە یەکێتان برای موسوڵمانی خۆی کفن دەکا با بەجوانی کفنی بکا** (م/د/ت/ن).

١٠٧٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ أللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الْبَسُوا مِنْ ثِيَابِكُمُ الْبَيَاضَ فَإِنَّهَا مِنْ خَيْرِ ثِيَابِكُمْ، وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ. رَوَاهُ الترمذي وصاحباه[2].

**لە ئیبنو عەبباسەوە** (خوایان لێ رازی بێ) **دەگێڕنەوە، ئەویش لە پێغەمبەرەوە** (دروودی خوای لەسەربێ) **دەفەرموێ: جل و بەرگی سپیش لەبەر بکەن، چونکە ئەویش گەلێ جلی چاکە بۆ ئێوە، وە هەروەها بیکەن بە کفنیش بۆ مردووەکانیشتان** (ت/د/ن-س/ص).

١٠٧٤- وَلأَبِي دَاوُدَ: لاَ تَغَالَوْا فِي الْكَفَنِ فَإِنَّهُ يُسْلَبُهُ سَلْبًا سَرِيعًا[3].

**حەزرەت دەفەرموێ** (دروودی خوای لەسەربێ): **زیادەڕەوی مەکەن لە کفندا چونکە بەزوویی رووت دەکرێتەوە، بەبێ سوود خاك دەیڕزێنێ** (د).

١٠٧٥- عَنْ جَابِرٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) اَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَفَّنَ حَمْزَةَ ابْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِبْ فِي نِمْرَةٍ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ. رَوَاهُ الترمذي[4].

**جابیر** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **حەمزەی کوڕی عەبولموططەلیبی لەیەك لۆ شاڵی میلدارا کفن کرد** (ت-س/ص).

١٠٧٦- ➡ (ب - ١ ز - ٢٠٢ رقم: ١٠٦٦/٤)[5].

---

(١) مسلم. جنائز: ٢١٨٢. ابو داود. جنائز: ٢١٤٨. نسائي. جنائز: ١٨٩٤ ، ٢٠١٣.

(٢) بسند صحيح (شرحه).

(٣) سكت عنه الشارح.

(٤) بسند صحيح (شرحه).

(٥) راجع رقم: ١٠٦٦/٤ (تقدم).

١٠٧٧- عَنْ لَيْلَى بِنْتِ قَانِفٍ الثَّقَفِيَّةِ (رَضيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كُنْتُ فِيمَنْ غَسَّلَ أُمَّ كُلْثُومٍ بِنْتَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عِنْدَ وَفَاتِهَا، فَكَانَ أَوَّلُ مَا أَعْطَانَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْحِقَاءَ ثُمَّ الدِّرْعَ ثُمَّ الْخِمَارَ ثُمَّ الْمِلْحَفَةَ ثُمَّ أُدْرِجَتْ بَعْدُ فِي الثَّوْبِ الآخِرِ قَالَتْ: وَرَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جَالِسٌ عِنْدَ الْبَابِ مَعَهُ كَفَنُهَا يُنَاوِلُنَاهَا ثَوْبًا ثَوْبًا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وَأَحمد[٦].

لەیلای کچی قانیفی ئەل-ثەقەفییە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: ئوممو کولثومی کچی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) کە کۆچی دوایی کرد، خۆم یەکێك بووم لەو ژنانەی کە دەیان شۆرد، پێغەمبەر خۆی (درودی خوای لەسەربێ) لەکن دەرگاکە دانیشتبوو، کفنەکەی ئومو کولثوومی پێ بوو، پارچە پارچە دەیدایە دەستمان: لە پێش پیشا کراسەکەی دایە دەستمان، ئینجا سەرکراس، ئینجا سەرپۆش، ئینجا سەردەریی، لەپاش ئەمانە هەموو چەرچەفێکی ئاودامانیان تێوە پێچا (د/ئەحمەد-سند صالح).

١٠٧٨- ولابن ماجه (علي في الشرح): أَحْسَنُ مَا زُرْتُمُ اللَّهَ بِهِ فِي قُبُورِكُمْ وَمَسَاجِدِكُمُ الْبَيَاضُ[٧].

حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: باشترین جل و بەرگێ کە لە مزگەوت و گۆڕدا دیدەنێ خودای پێوە بکەن جل و بەرگی سپییە (ماجە-غایة المامول).

١٠٧٩- قَالَتْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهَا) نَظَرَ أَبُو بَكْرٍ إِلَى ثَوْبِهِ الَّذِي كَانَ يُمَرَّضُ فِيهِ وَبِهِ بَقَعٌ مَنْ زَعَفْرَانَ فَقَالَ: اغْسِلُوا ثَوْبِي هَذَا، وَزِيدُوا عَلَيْهِ ثَوْبَيْنِ فَكَفِّنُونِي فِيهَا. قُلْتُ: إِنَّ هَذَا خَلَقٌ. قَالَ: إِنَّ الْحَيَّ أَحَقُّ، بِالْجَدِيدِ، إِنَّمَا هُوَ لِلْمُهْلَةِ. (شرحه)[٨].

---

(٦) بسند صالح (شرحه).

(٧) منقول من الشرح.

(٨) منقول من الشرح.

**عائیشە** (خوای لێ رازی بێ) **دەڵێ: ئەبو بەكر** (خوای لێ رازی بێ) **لەسەرە مەرگا تەماشای جلەكەی بەر خۆی كرد، چەن پەڵەیێ زەعفەرانی پێوەبوو، گوتی: ئەم جلەم بشۆرن و لەگەڵ دوو پارچە جلی تردا بیكەن بەكفن بۆم، گوتم: ئاخر ئەمە كۆنە! گوتی: ئاخر زیندوو لەبەرترە بە بەرگی تازە، كفن بۆ زووخاوو جەرەتاوە! (نەقڵ كراوە لەشەرحەكەوە).**

**٢٠٦) كفنی كەسێ كە ئیحرامی حەج یا عەمرەی دابەستێ: (كفن المحرم)**

**١٠٨٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُماَ) أَنَّ رَجُلاً وَقَصَهُ بِعِيرُهُ وَنَحْنُ مَعَ مَعَ رَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَهُوَ مُحْرِمٌ فَقَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَكَفِّنُوهُ فِي ثَوْبَيْنِ، وَلاَ تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ، فَإِنَّ اللّٰهَ يَبْعَثُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُلَبِّيًا. رَوَاهُ الخمسة[1].**

**ئیبنو عەبباس** (خوایان لێ رازی بێ) **گوتی: پیاوێ لە ئیحرامدابوو، لە وشترەكەی كەوتە خوارەوەو ئەستۆی شكاو مرد، ئێمەش لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین** (دروودی خوای لەسەربێ) **پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **خۆشی لە ئیحرامدا بوو، فەرمووی: بە ئاوو بە مۆرد بیّ شۆرن و لە دوو لۆ جلا كفنی بكەن، بەلام بۆنی خۆشی لێ مەدەن و سەریشی دامەپۆشن، چونكە رۆژی قیامەت كە خودا زیندووی دەكاتەوە بە بەرگی ئیحرامەوە زیندووی دەكاتەوەو وەك حاجیان لە ببەیكە دەكا! (ش/د/ت/ن).**

**٢٠٧) لەكاتی شۆردن و كفنكردندا بخوردو بۆنی خۆش پێویستە، هەروەك باسكردنی چاكەكانی مردووش پێویستە:**
**(ينبغي البخور وقت الغسل والتكفين وذكر المحاسن)**

**١٠٨١- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَطْيَبُ طِيبِكُمُ الْمِسْكُ. رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ البخاري[1].**

---

(١) بخاري. جنائز: ١٢٦٥ ، ١٢٦٦ ، ١٢٦٧ ، ١٢٦٨ ، ١٨٣٩ ، ١٨٥١. مسلم. حج: ٢٨٨٣ — ٢٨٩٣. نسائي. حج: ٢٧١٢ ، ٢٨٥٣ ، ٢٨٥٤ ، ٢٨٥٧. ترمذي. حج: ٩٥١. أبو داود جنائز: ٣٢٣٨.

(١) راجع صحيح مسلم رقم: ٢٨٣١ ، ٢٨٣٣.

**ئـەبو سـەعید** (خـوای لێ رازی بـێ) **گـوتی: پێغەمبـەر** (دروودی خـوای لەسـەربێ) **فەرمووی: باشترین بۆنی خۆشتان میسکە (م/د/ت/ن).**

**١٠٨٢- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ أللهُ عَنْهَا) عَنِ النّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: لاَ تَسُبُّوا الأَمْوَاتَ، فَإِنَّهُمْ قَدْ أَفْضَوْا إِلَى مَا قَدَّمُوا. رَوَاهُ البخاري والنسائي[٢].**

**عائیشە** (خوای لێ رازی بێ) **دەڵێ: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: جنێو بە مردووان مەدەن، چونکە ئەوان روو بەروو بوونەتەوە لەگەڵ کردەوەی خۆیان چ چاك، چ خراپ، وە بەپێی ئەوە پاداشی خۆیان وەردەگرن (ب/ن).**

**١٠٨٣- ذُكِرَ عِنْدَ النَّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **هَالِكٌ بِسُوءٍ فَقَالَ: لاَ تَذْكُرُوا هَلْكَاكُمْ إِلاَّ بِخَيْرٍ. رواه النسائي[٣].**

**لە خزمەتی پێغەمبەردا** (دروودی خوای لەسەربێ) **بە خراپ ناوی مردوویەکیان هێنا، فەرمووی** (دروودی خوای لەسەربێ)**: بە چاکە نەبێ باسی مردووی خۆتان مەکەن (ن).**

**١٠٨٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ أللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النّبِيِّ** (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: اذْكُرُوا مَحَاسِنَ مَوْتَاكُمْ، وَكُفُّوا عَنْ مَسَاوِيهِمْ. رَوَاهُ الترمذي وأبو داود[٤].**

**ئیبنو عومەر** (خوایان لێ رازی بێ) **گوتی: حەزرەت** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: باسی چاکەی مردووتان بکەن‌و باسی خراپەیان مەکەن (ت-سند غریب).**

## ٢٠٨) نوێژی مردوو: (الصلاة على الميت)

**١٠٨٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) **عَنِ النّبِيِّ** (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) **قَالَ: إِذَا صَلَّيْتُمْ عَلَى الْمَيِّتِ فَأَخْلِصُوا لَهُ الدُّعَاءَ. رَوَاهُ ابو داود وابن حبّان وصححّه[١].**

---

(٢) بخاري: جنائز: ١٣٩٣.

(٣) سكت عنه الشارح.

(٤) بسند غريب (شرحه).

(١) صحيح عند ابن حبان.

ئـەبو هـورەیرە (خـوای لێ رازی بـێ) گـوتی: پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەربێ) فـەرمووی: كاتـێ نوێـژ دەكـەن لەسـەر مـردوو بـەدڵێكی پـاك بـۆی بپاڕێنـەوە! (د/ئیبنو حەببان:ص).

١٠٨٦- وَعَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَعَى النَّجَاشِيَّ فِي الْيَوْمِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ، وَخَرَجَ بِهِمْ إِلَى الْمُصَلَّى فَصَفَّ بِهِمْ، وَكَبَّرَ عَلَيْـهِ أَرْبَـعَ تَكْـبِيرَاتٍ. رَوَاهُ الخمسة[٢].

دیسان گوتی: لەو رۆژەدا كە نەجاشی تیـامرد كـە پاشـای حەبەشـەبوو، وە پاشایەكی باش بوو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) پـەیامی مردنـی ئـەوی بـە یارانی راگەیانـد فـەرمووی: ئەصـحەمە كـە بەندەیـەكی باشـی خودابـوو ئـەمڕۆ مرد، جا حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) لەگـەڵ هاوڕێیانـا دەرچـوون، وە رۆیـشتن بۆ نوێژگاكـە، لـەوێ لـە پـشت خۆیـەوە ریـزی كـردن و نوێـژی نادیـار: (صـلاة الغائب)ی بە كۆمەڵی لەسـەر كـرد، لـە نوێژەكـەدا چـوار ئـەڵلاهو ئەكبـەری كـرد (ش/د/ت/ن).

١٠٨٧- وَكَبَّرَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى جَنَازَةٍ فَرَفَعَ يَدَيْهِ فِـي أَوَّلِ تَكْبِيرَةٍ وَوَضَعَ الْيُمْنَى عَلَى الْيُسْرَى. رَوَاهُ الترمذي والدار قطني[٣].

جارێ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەسەر تەرمێ نوێژی كرد، لـە یەكـەم ئـەڵلاهو ئەكبـەردا هـەردوو دەسـتی بـەرز كـردەوە، وە دەسـتی راسـتی لەسـەر دەستی چەپی دانا (ت/دارە قوطنی- سند ضعیف).

١٠٨٨- وَقَالَ: طَلْحَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ: صَلَّيْتُ خَلْفَ ابْـنِ عَبَّـاسٍ (رَضِـيَ أللهُ عَنْهُمَا) عَلَى جَنَازَةٍ فَقَرَأَ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ، فَقَالَ: لِيَعْلَمُوا أَنَّهَا سُـنَّةٌ. رَوَاهُ البخـاري

---

(٢) بخـاري. جنـائز: ١٢٤٥ ، ١٣١٨ ، ١٣٢٧ ، ١٣٢٨ ، ١٣٣٣ ، ٣٨٨٠ ، ٣٨٨١. مـسلم. جنـائز: ٢٢٠١ – ٢٢٠٧. أبـو داود. جنائز: ٣٢٠٤. نسائي. جنائز: ١٩٧٠ ، ١٩٧٩.

(٣) بسند ضعيف (شرحه).

وابو داود والترمذي والنسائي ولفظه: فَقَرَأَ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَسُورَةٍ وَجَهَرَ، فَلَمَّا فَرَغَ قَالَ: سُنَّةٌ وَحَقٌّ[٤].

طەلحەی کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێ: لەسەر تەرمێ لە پشتی ئیبنو عەبباسەوە نوێژم کرد، سوورەتی فاتیحای تیا خوێند، کە دێباچەی قورئانە، وە ئیبنو عەبباس گوتی: بۆیە وام کرد تا موسوڵمانان بزانن کە خوێندنی فاتیحا لە نوێژی مردوودا یاساو، ڕەفتاری پێغەمبەر خۆیەتی (ب/د/ت/ن) گفتەی (ن): سوورەتی فاتیحاو سوورەتێکی تری بە دەنگی بەرز خوێند، کە لێ بووەوە گوتی: ئەمەی من کردم لەم نوێژەدا هەم یاساو کرداری حەزرەت خۆیەتی، هەم شتێکی ڕاستو دروستە.

١٠٨٩- عَنْ عَوْفَ بْنَ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى جَنَازَةٍ فَحَفِظْتُ مِنْ دُعَائِهِ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ وَارْحَمْهُ وَعَافِهِ وَاعْفُ عَنْهُ، وَأَكْرِمْ نُزُلَهُ وَوَسِّعْ مُدْخَلَهُ، وَاغْسِلْهُ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ. وَنَقِّهِ مِنَ الْخَطَايَا كَمَا نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الأَبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ، وَأَبْدِلْهُ دَارًا خَيْرًا مِنْ دَارِهِ وَأَهْلاً خَيْرًا مِنْ أَهْلِهِ، وَزَوْجًا خَيْرًا مِنْ زَوْجِهِ وَأَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ، وَأَعِذْهُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، أَوْ مِنْ عَذَابِ النَّارِ. رواه مسلم والنسائي والترمذي[٥].

عەوفی کوڕی مالیك (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەسەر تەرمێ نوێژی دەکرد ئەمەم لە نزاکەی لەبەرکرد:

{اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ وَارْحَمْهُ وَعَافِهِ وَاعْفُ عَنْهُ، وَأَكْرِمْ نُزُلَهُ وَوَسِّعْ مُدْخَلَهُ، وَاغْسِلْهُ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ. وَنَقِّهِ مِنَ الْخَطَايَا كَمَا نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الأَبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ، وَأَبْدِلْهُ دَارًا خَيْرًا مِنْ دَارِهِ وَأَهْلاً خَيْرًا مِنْ أَهْلِهِ، وَزَوْجًا خَيْرًا مِنْ زَوْجِهِ وَأَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ، وَأَعِذْهُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، أَوْ مِنْ عَذَابِ النَّارِ}.

---

(٤) بخاري. جنائز: ١٣٣٥.

(٥) مسلم. جنائز: ٢٢٢٩ – ٢٢٣١. ترمذي. جنائز: ١٠٢٥. نسائي. طهارة: ٦٢ ، ١٩٨٢ ، ١٩٨٣.

خودایە! پەروەردگار! لێی خۆش بەو ڕەحمی پێ بکەو سەر ئاسوودەی هەردوو جیهانی کەو لێی ببورەو میوانەو ڕێزی بگرەو گۆڕی گوشادکەو بە ئاوو بەفرو تەرزە بیشۆرەو لە گوناه پاك پاکی بکەرەوە، وەك چۆن جلێکی سپی پاك ڕابگری و لە چڵك دووری بگری ئاوا، وە ماڵێ لە ماڵەکەی خۆی باشترو خێزانێ لە خێزانەکەی خۆی باشترو هاوسەرێ لە هاوسەرەکەی خۆی باشتری بدەرێ، بیبەرە بەهەشت و پەنای بدە لە سزای گۆڕو لە سزای ئاگری دۆزەخ. عەوف گوتی: تەنانەت ئەم نزایەم ئەوەندە بەدڵ بوو خۆزگەم خواست کە ئەو مردووە من بوومایە! (م/ن/ت).

١٠٩٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى جَنَازَةٍ فَقَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِحَيِّنَا، وَمَيِّتِنَا، وَصَغِيرِنَا، وَكَبِيرِنَا، وَذَكَرِنَا، وَأُنْثَانَا، وَشَاهِدِنَا، وَغَائِبِنَا، اللَّهُمَّ مَنْ أَحْيَيْتَهُ مِنَّا فَأَحْيِهِ عَلَى الإِيمَانِ وَمَنْ تَوَفَّيْتَهُ مِنَّا فَتَوَفَّهُ عَلَى الإِسْلاَمِ اللَّهُمَّ لاَ تَحْرِمْنَا أَجْرَهُ وَلاَ تُضِلَّنَا بَعْدَهُ. رَوَاهُ أصحاب السُّنن[٦].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەسەر تەرمێ نوێژی دەکرد فەرمووی:

{اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِحَيِّنَا، وَمَيِّتِنَا، وَصَغِيرِنَا، وَكَبِيرِنَا، وَذَكَرِنَا، وَأُنْثَانَا، وَشَاهِدِنَا، وَغَائِبِنَا، اللَّهُمَّ مَنْ أَحْيَيْتَهُ مِنَّا فَأَحْيِهِ عَلَى الإِيمَانِ وَمَنْ تَوَفَّيْتَهُ مِنَّا فَتَوَفَّهُ عَلَى الإِسْلاَمِ اللَّهُمَّ لاَ تَحْرِمْنَا أَجْرَهُ وَلاَ تُضِلَّنَا بَعْدَهُ}.

ئەی خودایە! لەزیندوو مردوومان خۆش بە، هەروا لە گچکەو گەورەمان و لە نێرو مێمان و لە دیارو نادیارمان، پەروەردگارا! ئەوی لە ئێمە دەیژێنی لەسەر ئیمان و باوەڕ بی ژێنەو ئەوەی لە ئێمە دەیمرینی لەسەر ئیسلامەتی بیمرێنە، خودایە! لە پاداشی ئەو بێ بەشمان مەکەو لەپاش ئەویش گومڕامان مەکە (د/ت/ن-س/ص).

---

(٦) بسند صحيح (شرحه).

١٠٩١- وَلأبي داود والنسائي: اللَّهُـمَّ أَنْتَ رَبُّهَـا وَأَنْتَ خَلَقْتَهَـا وَأَنْتَ هَدَيْتَهَا لِلإِسْلاَمِ وَأَنْتَ قَبَضْتَ رُوحَهَا، وَأَنْتَ أَعْلَمُ بِسِرِّهَا وَعَلاَنِيَتِهَا، جِئْنَاكَ شُفَعَاءَ فَاغْفِرْ لَهُ[٧].

حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) لەسەر تەرمێ فەرمووی:
{اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبُّهَا وَأَنْتَ خَلَقْتَهَا وَأَنْتَ هَدَيْتَهَا لِلإِسْلاَمِ وَأَنْتَ قَبَضْتَ رُوحَهَا، وَأَنْتَ أَعْلَمُ بِسِرِّهَا وَعَلاَنِيَتِهَا، جِئْنَاكَ شُفَعَاءَ فَاغْفِرْ لَهُ}.

خودایە! تۆ خۆت خودای ئەم مردووەیو خۆت ئەوت لە نوبوون دروست كردووەو خۆت ڕێگەی ئیسلامەتیت نیشان داوەو خۆت گیانیت كێشاوەو خۆت زۆر چاك ئاگات لە نهێنیو ئاشكرای هەیە لە هەموو كەسێ تر زیاتر، ئێمە هاتووین تكاكارین، دەساتۆیش بە لوتفو كەرەمی خۆت دەست بە روومانەوە مەنێو بەمیهرەبانی بێ پایانی خۆت لێی خۆشبە (د/ن).

١٠٩٢- عَنْ سَعِيدِ الْمَقْبُرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ كَيْفَ تُصَلِّي عَلى الْجَنَازَةِ؟ فَقَالَ: أَنَا لَعَمْرُ اللَّهِ أُخْبِرُكَ: أَتْبَعُهَا مِنْ أَهْلِهَا، فَإِذَا وُضِعَتْ كَبَّرْتُ، وَحَمِدْتُ اللَّهَ، وَصَلَّيْتُ عَلَى نَبِيِّهِ، ثُمَّ أَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنَّهُ عَبْدُكَ وَابْنُ عَبْدِكَ وَابْنُ أَمَتِكَ، كَانَ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ، وَأَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ، اللَّهُمَّ إِنْ كَانَ مُحْسِنًا فَزِدْ فِي إِحْسَانِهِ وَإِنْ كَانَ مُسِيئًا فَتَجَاوَزْ عَنْ سَيِّئَاتِهِ، اللَّهُمَّ لاَ تَحْرِمْنَا أَجْرَهُ وَلاَ تَفْتِنَّا بَعْدَهُ. رَوَاهُ الإِمامان مالكٌ والشافعي (رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُمَا)[٨].

ئەبو سەعیدی ئەل-مەقبووری (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پرسیارم كرد لە ئەبو هورەیرە: لەسەر تەرمی مردوو چۆن نوێژ دەكەی؟ گوتی: بەخودا بەچاكی پێت دەڵێم: لەلای كەسو كاری مردووەكەوە شوێنی تەرمەكەی

---

(٧) سكت عنه الشارح.

(٨) هذا العاء هو الأفضل عند الامام الشافعي رحمه الله وعليه العمل (مترجم).

دەکەوم هەتا دایدەنێن لە سەرزەوی ئەوجا ئەڵڵاهو ئەکبەری نوێژ دابەستن دەکەمو سوپاس‌و ستایشی خودا دەکەم بە خوێندنی سوورەتی فاتیحەو سەڵاوات دەدەم لەسەر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئینجا دەڵێم:

{اللّٰهُمَّ إِنَّهُ عَبْدُكَ وَابْنُ عَبْدِكَ وَابْنُ أَمَتِكَ، كَانَ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ، وَأَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ، اللّٰهُمَّ إِنْ كَانَ مُحْسِنًا فَزِدْ فِي إِحْسَانِهِ وَإِنْ كَانَ مُسِيئًا فَتَجَاوَزْ عَنْ سَيِّئَاتِهِ، اللّٰهُمَّ لاَ تَحْرِمْنَا أَجْرَهُ وَلاَ تَفْتِنَّا بَعْدَهُ}.

ئەی خودایە! ئەمە بەندەی خۆتەو کوڕی بەندەو کەنیزەکی خۆتە، ئەمە شایەتی دەدا کە جگە لەتۆ خودایەکی ترنییە، وە موحەممەد بەندەو پێغەمبەری تۆیە، وە خۆت لە هەموو کەسێ باشتر ئاگات لە حاڵیەتی، ئەی خودایە! ئەم مردووە ئەگەر خۆی باشە ئەوا باشتری بۆ بکە، وە ئەگەر خۆی خراپە ئەوا چاو پۆشیی لێ بکەو چاو بپۆشە لە خراپەکانی، خودایە! لە پاداشی ئەو بێبەشمان مەکەو لەپاش ئەویش گیرۆدەمان مەکەو سەرمان لێ مەشێوێنە! (مالیك/ شافیعی – ڕەزای خودایان لێبێ).

## ٢٠٩) منداڵ ئەگەر جووڵە یا دەنگی لێوەهات نوێژی لەسەر دەکرێ: (يصلى على الطفل إذا إستهل)

١٠٩٣– عَنِ الْمُغِيرَةِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الرَّاكِبُ خَلْفَ الْجَنَازَةِ، وَالْمَاشِي حَيْثُ شَاءَ مِنْهَا وَالطِّفْلُ يُصَلَّى عَلَيْهِ. رَوَاهُ اصحاب السنن. وزاد أبو داود: والسّقط يصلّى عليه ويدعى لوالديه بالمغفرة والرحمة[1].

موغیرە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: سوار لە پشتی تەرمەوە دەڕواتو، پیادە بە ئارەزووی خۆیەتی لە کوێوە دەڕوات یا بڕوات، منداڵیش نوێژی لەسەر دەکرێ (د/ت/ن–س/ص) ئەبو داوود ئەمەشی پتر کردووە: منداڵی لەبارچووی نەبەکامیش نوێژی لەسەر

---

(١) بسند صحيح (شرحه).

دەكرێ، بەڵام منداڵ لەباتی خۆی داوای لێخۆشبوون و میهرەبانی خودا بۆ باوك و دایكی دەكرێ.

١٠٩٤- وللترمذي: الطِّفْلُ لاَ يُصَلِّى عَلَيْهِ وَلاَ يَرِثُ وَلاَ يُورَثُ حَتَّى يَسْتَهِلَّ(٢).

حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: منداڵ نە نوێژی لەسەر دەكرێ وە نەمیرات و كەلەپوور دەگرێ، وە نە كەلەپووری لێ دەگیرێ هەتا جووڵەیێ یا دەنگێكی لێوە نەیێ یا نیشانەی ژیانی پێوە نەبێ. (ت-مرفوعا وموقوفا).

١٠٩٥- وَقَالَ: الْحَسَنُ: يَقْرَأُ عَلَى الطِّفْلِ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ وَيَقُولُ اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ لَنَا فَرَطًا وَسَلَفًا وَأَجْرًا. رَوَاهُ البخاري(٣).

حەسەن (خوای لێ رازی بێ) دەڵێ: (نوێژ خوێن) سوورەتی فاتیحا لەسەر منداڵ دەخوێنێ و لە نزای نوێژەكەدا دەڵێ:

{ اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ لَنَا فَرَطًا وَسَلَفًا وَأَجْرًا}.

خودایە! بیكە بە پێشڕەو و پێشەنگ و مایەی پاداشی گەورە بۆمان(ب).

١٠٩٦- قال المؤلف (رحمة الله عليه) في شرحه على التاج في هذا المبحث ما يلي: فَالصَّلاَةُ عَلىَ الصَّبِيِّ وَاجِبَةٌ لِهَذِهِ (أى الاحاديث المذكورة في هذا المبحث) ولحديث ابن ماجه: صَلُّوا عَلَى أَطْفَالِكُمْ فَإِنَّهُمْ مِنْ أَفْرَاطِكُمْ. ولحديث أبي داود: صَلَّى النَّبِيُّ (صَلَّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلى وَلَدِهِ إِبْرَاهِيمَ فِي الْمَقَاعِدِ(٤).

دانەری بەهەشتی لەشەرحەكەدا لەم شوێنەدا دەڵێ: نوێژی مردوو لەسەر منداڵ فەرزە لەبەر ئەم فەرموودانە كە لێرەدا باس كراون، وە لەبەر ئەم حەدیثەیش كە ئیبنو ماجە دەیگێڕێتەوە، كە حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ)

---

(٢) روى مرفوعا وموقوفا وهو أصح (شرحه).

(٣) بخاري. جنائز: تعليق ذكره البخاري فى بداية الباب الرقم: ٦٥ من كتاب الجنائز قبل رقم: ١٣٣٥ مباشرة. (مترجم).

(٤) منقول من الشرح.

دەفەرموێ: نوێـژی مـردوو لەسـەر منداڵتان بکەن، چونکە ئەوان بەشێکن لەو پێـشڕەوانەی کـە لەبەهەشـتـا شـوێنتان بـۆ خـۆش دەکـەن، وە لەبـەر ئـەم فەرمایـشتەیش کـە ئـەبو داوود گێڕاویەتـەوە کـە دەڵـێ: لـە مەقاعیـد (نـاوی شوێنێکە لە مەدینە) پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) نوێژی مردووی کرد لەسـەر ئیبراهیمی کوڕی کاتێ مرد. (غایەتول مەئموول).

## ٢١٠) گەورەیی نوێژ لەسەر مردوو، وە نوێژکەرەکە لە کوێی تەرمەکەوە دەوەستێ: (فضل الصلاة على الجنازة ومقام المصلي منها)

١٠٩٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: مَـنْ شَهِدَ الْجَنَازَةَ حَتَّى يُصَلِّيَ عَلَيْهَا فَلَهُ قِيرَاطٌ ، وَمَنْ شَهِدَ حَتَّى تُدْفَنَ كَانَ لَهُ قِيرَاطَانِ، قِيلَ وَمَا الْقِيرَاطَـانِ؟ قَـالَ: مِثْـلُ الْجَبَلَـيْنِ الْعَظِيمَـيْنِ. رَوَاهُ الخمـسة. وفي روايـة: أَصْغَرُهُمَا مِثْلُ أُحُدٍ وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يُصَلِّي عَلَيْهَا ثُمَّ يَنْصَرِفُ. فَلَمَّا بَلَغَهُ حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: لَقَدْ ضَيَّعْنَا قَرَارِيطَ كَثِيرَةً[١].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێ) فـەرمووی: هەر کەسێ لەگەڵ تەرمێکا بێ تا نوێژی لەسـەر دەکا قیراطیکی بۆ هەیـە، وە هـەر کەسـێ لەگـەڵیا بـێ هـەتا دەنێـژرێ ئـەوە دوو قـیراطـی بـۆ هەیـە گـوترا: ئـەو دوو قـیراطـە چـەند دەبـن؟ فـەرمووی: بـە قـەد دوو کێـوی گـەورە دەبـن (ش/د/ت/ن) لـە گێڕانەوەیەکا: بچکۆلەکەیان بەقەد چیای ئوحود دەبێ. لە پێشا ئیبنو عومەر کە نوێـژی لەسـەر مـردوو دەکـرد ئـیتر دەگەڕایـەوە، بەڵام کـە ئـەم فـەرموودەی ئـەبو هورەیرەی پێ گەیشت گوتی: قیراتگە لێکی فرەمان لە کیس خۆمان داوە.

١٠٩٨- عَنْ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّيْتُ وَرَاءَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلى امْرَأَةٍ مَاتَتْ فِي نِفَاسِهاَ، فَقَامَ عَلَيْهاَ وَسَطَهاَ. رَوَاهُ الخمسة[٢].

---

(١) بخاري. جنائز: ١٣٢٥. مسلم. جنائز: ٢١٨٦ – ٢١٩٤. نسائي. جنائز: ١٩٩٤ ، ١٩٩٣. أبو داود. جنائز: ٣١٦٩.

(٢) بخاري. حيض: ٣٣٢ ، ١٣٣١ ن ١٣٣٢. مسلم. جنائز: ٢٢٣٢ ، ٢٢٣٣. أبو داود. جنـائز: ٣١٩٥. ترمذي. جنـائز: ١٠٣٥. نسائي. حيض: ٣٩١ ، ١٩٧٥ ، ١٩٧٨.

سەمووره (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە پشتی پێغەمبەرەوە (درودی خوای لەسەربێ) بە جەماعەت نوێژی مردووم لەسەر تەرمی ژنێ کرد، لە زەیستانیدا مردبوو، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لە نوێژەکەدا لە ناوەڕاستی تەرمەکەدا راوەستابوو (ش/د/ت/ن- بەر شەپۆلی رەحمەتی خوداکەون).

١٠٩٩- عَنْ أَبِي غَالِبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ عَلَى جَنَازَةِ رَجُلٍ، فَقَامَ حِيَالَ رَأْسِهِ، ثُمَّ جَاءُوا بِجَنَازَةِ امْرَأَةٍ مِنْ قُرَيْشٍ، فَقَالُوا: يَا أَبَا حَمْزَةَ صَلِّ عَلَيْهَا، فَقَامَ حِيَالَ وَسَطِ السَّرِيرِ، فَقَالَ: لَهُ الْعَلاَءُ بْنُ زِيَادٍ: هَكَذَا رَأَيْتَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَامَ عَلَى الْجَنَازَةِ مُقَامَكَ مِنْهَا وَمِنَ الرَّجُلِ مُقَامَكَ مِنْهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، فَلَمَّا فَرَغَ قَالَ: احْفَظُوا. رَوَاهُ الترمذي وأبو داود وأحمد[٣].

ئەبو غالیب (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە پشتی ئەنەسی کوڕی مالیکەوە لەسەر تەرمی پیاوێ نوێژم کرد، ئەنەس لە ئاستی سەری راوەستابوو، لە پاشا تەرمی ژنێکی قورەیشییان هێنا، گوتیان بە ئەنەس: ئەی ئەبو حەمزە! نوێژی لەسەر بکە، ئەمجارە ئەنەس لە ئاستی ناوەڕاستی دارە تەرمەکەدا راوەستاو نوێژی لەسەر کرد عەلائی کوڕی زییادیش پێی گوت: دیارە بۆ خۆت پێغەمبەرت دیوە (درودی خوای لەسەربێ) کە لەسەر تەرمی ژن لە نوێژا لە ئاستی ناوەڕاستی و لەسەر تەرمی پیاو لە نوێژا لە ئاستی سەری بوەستێ وەك ئەم راوەستانەی تۆ؟ گوتی: ئا. جا کاتێ لێ بووە گوتی: ئاگاداری ئەم یاسایە بکەن (ت/د/ئەحمەد-س/ح).

## ٢١١) لە مزگەوتیشا نوێژ لەسەر تەرم دەکرێ: (يصلى على الجنازة في المسجد)

١١٠٠- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا تُوُفِّيَ سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ قَالَتِ: عَائِشَةُ ادْخُلُوا بِهِ الْمَسْجِدَ حَتَّى أُصَلِّيَ عَلَيْهِ. فَأُنْكِرَ ذَلِكَ عَلَيْهَا،

(٣) بسند حسن (شرحه).

فَقَالَتْ: مَا أَسْرَعَ مَا نَسِيَ النَّاسُ! وَاللهِ لَقَدْ صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى ابْنَيْ بَيْضَاءَ فِي الْمَسْجِدِ سُهَيْلٍ وَأَخِيهِ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ البخاري[1].

**ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: کە سەعدی کوڕی ئەبو وەققاس مرد، عائیشە گوتی: بیبەن بۆ ناو مزگەوت تا نوێژی لەسەر بکەم، هەندێ کەس ئەم قسەیان پەسەند نەکرد، عائیشەش گوتی: چ زوو ئەم خەڵکە لە بیریان چوو! بەخودا پێغەمبەر خۆی** (دروودی خوای لەسەربێ) **لەناو مزگەوتا نوێژی کرد لەسەر سوهەیل و براکەی، کە هەردووکیان کوڕی بەیضاء بوون (م/د/ت/ن–** ڕەحمەتی خودایان لێبێ).

## ٢١٢) نوێژ لەسەر گۆڕو لەسەر مردووی نادیار دروستە
## (تجوز الصلاة على القبر وعلى الغائب)

١١٠١– ➡ (ب – ١ ز – ١١٨ رقم: ٧١٥/١٠) وفي هذه الرواية عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ امْرَأَةً سَوْدَاءَ كَانَتْ تَقُمُّ الْمَسْجِدَ أَوْ شَابًّا فَفَقَدَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَأَلَ عَنْهَا أَوْ عَنْهُ فَقَالُوا: مَاتَ. قَالَ: أَفَلاَ كُنْتُمْ آذَنْتُمُونِي قَالَ: فَكَأَنَّهُمْ صَغَّرُوا أَمْرَهَا أَوْ أَمْرَهُ فَقَالَ: دُلُّونِي عَلَى قَبْرِهِ فَدَلُّوهُ فَصَلَّى عَلَيْهَا ثُمَّ قَالَ: إِنَّ هَذِهِ الْقُبُورَ مَمْلُوءَةٌ ظُلْمَةً عَلَى أَهْلِهَا وَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُنَوِّرُهَا لَهُمْ بِصَلاَتِي عَلَيْهِمْ. رَوَاهُ الثلاثة[1].

**ئەبو هورەیرە** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: ژنێکی ڕەش (یا لاوێ) مزگەوتی دەماڵی کە دەمرێ پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **ئاگای لێ نابێ، تا ڕۆژێ هەواڵی دەپرسێ، دەڵێن: مردووە، دەفەرموێ: ئەی بۆ هەواڵتان بەمن نەدا گوتی: وەك بڵێی کاری ئەو مردووەیان بەسووك گرتبێ وابوو، پێغەمبەر** (دروودی خوای لەسەربێ) **فەرمووی: گۆڕەکەیم پێ نیشان بدەن جا کە گۆڕەکەیان پێ نیشاندا نوێژی لەسەر کرد، ئینجا فەرمووێ** (دروودی خوای لەسەربێ) **ئەم گۆڕانە**

---

(١) مسلم. جنائز: ٢٢٤٩ – ٢٢٥١. ترمذي. جنائز: ١٠٣٣. نسائي. جنائز: ١٩٦٦ ، ١٩٦٧. أبو داود. جنائز: ٣١٩٠.

(١) راجع رقم: ٧١٥/١٠ (قتدم ←).

سـيخناخن لــه تــاريكى و لەبــەر تــاريكى زۆر، خاوەنــەكانيان وەك لــه تاريكستانابن وايــه بــەڵام خــوداى تــەواناو شــكۆمەند بــه مەرحەمــەتى خــۆى بەهۆى ئەم نوێژەوه كه من كردم لەسەريان بۆيـان رۆشـن و روونـاك دەكاتـەوە! (ش/د– نوقمى دەرياى رەحمەتى خودابن).

١١٠٢– ➡ (ب – ١ ز – ٢٠٨رقم: ١٠٨٦/٢) وفي هذه الرواية: عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: قَدْ تُوُفِّيَ الْيَوْمَ رَجُلٌ صَالِحٌ مِنَ الْحَبَشِ فَهَلُمَّ فَصَلُّوا عَلَيْهِ، قَالَ: فَصَفَفْنَا، فَصَلَّى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَيْهِ وَنَحْنُ صُفُوفٌ. قَالَ: جَابِرٍ: كُنْتُ فِي الصَّفِّ الثَّانِي. أَوِ الثالِثِ. رَوَاهُ الخمسة[٢].

لـه گێڕانــەوەی ئێـرەدا: جـابیر (خـوای لێ رازی بـێ) گـوتـی: رۆژێ پێغەمبــەر (دروودی خوای لەسەربێ) فـەرمووی: ئـەمڕۆ پیـاوێکی باشـی حەبەشـەیی مـردووە، وەرن بابچین نوێژی لەسەر بکەین. گوتی: ئینجا بووین بە چەند ریزێك و لە پشتی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەربێ) نوێژی (صلاه الغائب)مان لەسەر کرد، جـابیر (خـوای لێ رازی بـێ) گـوتـی: مـن خـۆم یـا لـەریزی دووەمـابووم یـا لـه ریـزی سێیەما بووم (ش/د/ت/ن–سەد هەزار رەحمەت لە گۆڕیان).

### ٢١٣) تاقه نوێژێ بۆ چەن تەرمێ دەبێ : (تكفي الصلاة على جنائز)

١١٠٣– عَنْ عَمَّارٌ مَوْلَى الْحَارِثِ بْنِ نَوْفَلٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ شَـهِدَ جَنَـازَةَ أُمِّ كُلْثُومٍ وَابْنِهَا، فَجُعِلَ الْغُلاَمُ مِمَّا يَلِي الإِمَامَ فَأَنْكَرْتُ ذَلِكَ وَفِي الْقَوْمِ ابْنُ عَبَّاسٍ وَأَبُو سَعِيدٍ الْخُـدْرِيُّ وَأَبُـو قَتَـادَةَ وَأَبُـو هُرَيْـرَةَ، فَقَـالُوا: هَـذِهِ الـسُّنَّةُ. رَوَاهُ أَبُـو دَاوُدَ والنسائي[١].

عەمماری نۆکەری حاریثـی کوڕی نەوفەل (خـوای لێ رازی بـێ) گـوتـی: لەگەڵ تــەرمی ئوممــو کــولثــووم و کوڕەکــەیا بــووم، تــەرمی کوڕەکــەیان لەبــەردەم پێشنوێژەوە داناو تەرمی دایکەکەشی لە پاڵیا لە رووی رووگەوە دانا منیش

(٢) راجع رقم: ١٠٨٦/٢.

(١) سكت عنه الشارح.

ئەمەم پەسەند نەكرد، ئیبنو عەبباس و ئەبو قەتادەو ئەبو هورەیرە (خوایان لێ رازی بێ) لەوێ بوون لەگەڵ پیاوگەلا، جا گوتیان: خۆی ئاوا سوننەتە كە نێرینە لەلای مەلاكەوە بێ و مێیینەش لەلای رووگەوە بێ، وەك حاڵی ئێستای ئەم كوڕو دایكە. (د/ن-س/ص).

١١٠٤- وَقَالَ: ابْنُ جُرَيْجٍ: سَمِعْتُ نَافِعًا يَزْعُمُ أَنَّ ابْنَ عُمَرَ صَلَّى عَلَى تِسْعِ جَنَائِزَ جَمِيعًا، فَجَعَلَ الرِّجَالَ يَلُونَ الإِمَامَ وَالنِّسَاءَ يَلِينَ الْقِبْلَةَ فَصَفَّهُنَّ صَفًّا وَاحِدًا. رَوَاهُ النسائي[٢].

ئیبنو جورەیج گوتی: لە نافیعم ژنەوت دەیگوت گوایە ئیبنو عومەر نوێژی لەسەر نۆتەرم پێكەوە كردووە، تەرمی پیاوەكانی دەخستە لای پێشنوێژەوەو تەرمی ئافرەتەكانیشی دەخستە لای رووگەوە، وە هەموو شیانی كردبوو بە یەك ریز لە پێش خۆیەوە یەك لەپاڵ یەكا بەرەو قیبلە دانابوون و ئینجا یەك نوێژی لەسەر هەرنۆیان كرد (ن).

## ٢١٤) ریزەكان تا زۆرتربن هیوای گیرابوون زۆر ترە
## (كثرة الصفوف أرجى للقبول)

١١٠٥- عَنْ مَالِكِ بْنِ هُبَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مِنْ مَيِّتٍ يَمُوتُ فَيُصَلِّي عَلَيْهِ ثَلاَثَةُ صُفُوفٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ إِلاَّ أَوْجَبَ قَالَ: ابْنُ هُبَيْرَةَ: فَكَانَ مَالِكٌ إِذَا اسْتَقَلَّ أَهْلَ الْجَنَازَةِ جَزَّأَهُمْ ثَلاَثَةَ صُفُوفٍ لِهَذَا الْحَدِيثِ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والترمذي[١].

مالیكی كوڕی هوبەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەر موسوڵمانێ بمرێ و سێ ریز لە موسوڵمانان نوێژی لەسەر بكەن، بێگومان بەهەشت مسۆگەر دەكا بۆخۆی. ئیبنو هوبەیرە دەیگوت: یاسای مالیك وابوو ئەگەر خەڵكی ئامادەبووی سەر

(٢) بسند صحيح (شرحه).

(١) بسند حسن (شرحه).

تەرمەكەی بەكەم بزانیایە، لەبەر بەركەوتنی مژدەی ئەم فەرموودە پیرۆزەیە دەیكردن بە سێ ڕیزو ئەوسا نوێژیان لەسەری دەكرد (د/ت-س/ح).

١١٠٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مِنْ مَيِّتٍ يُصَلِّي عَلَيْهِ أُمَّةٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ يَبْلُغُونَ مِائَةً كُلُّهُمْ يَشْفَعُونَ لَهُ إِلاَّ شُفِّعُوا فِيهِ. رَوَاهُ مسلم والترمذي والنسائي[٢].

عائیشە (خوای لێ ڕازی بێ) دەڵێ: حەزرەت دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەربێ): هەر مردوویێ كە كۆمەڵێ موسوڵمان ژمارەیان بگاتە سەد كەس نوێژی لەسەر بكەن، وە هەموویان تكای بۆ بكەن، بێگومان كە تكاكەیان گیرا دەبێ (م/ت/ن).

١١٠٧- عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضيَ أَللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَا مِنْ رَجُلٍ مُسْلِمٍ يَمُوتُ، فَيَقُومُ عَلَى جَنَازَتِهِ أَرْبَعُونَ رَجُلاً لاَ يُشْرِكُونَ بِاللَّهِ شَيْئًا إِلاَّ شَفَّعَهُمُ اللَّهُ فِيهِ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وأَبُو دَاوُدَ[٣].

ئیبنو عەبباس (خوایان لێ ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر دەفەرموێ (دروودی خوای لەسەربێ): هەر پیاوێ لە موسوڵمانان، كە دەمرێ، چل پیاو (كە هیچ شەریك‌و هاوبەش بۆ خودا پەیدا نەكەن) نوێژ لەسەر تەرمەكەی بكەن، بێگومان كە خودا تكایان لێ گیرا دەكا بۆی (م/د).

١١٠٨- وَقَالَ: الإِمَامُ مَالِكٍ: بَلَغَنِي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تُوُفِّيَ يَوْمَ الاِثْنَيْنِ، وَدُفِنَ يَوْمَ الثُّلاَثَاءِ، وَصَلَّى النَّاسُ عَلَيْهِ أَفْذَاذًا، أي فُرَادَى لاَ يَؤُمُّهُمْ أَحَدٌ. أَيْ لِمَا عَرَاهُمْ مِنْ عَظِيمِ الهَوْلِ وَلِعَدَمِ الْخَلِيفَةِ حِينَئِذٍ[٤].

ئیمامی مالیك (ڕەحمەتی خودای لەسەربێ) دەڵێ: وەك زانیومە كە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە ڕۆژی دووشەممەدا مردووەو لە ڕۆژی سێ شەممەدا

---

(٢) مسلم. جنائز: ٢١٩٦. ترمذي. جنائز: ١٠٢٩. نسائي. جناذز: ١٩٩٠.

(٣) مسلم. جنائز: ٢١٩٥. أبو داود. جنائز: ٣١٧٠.

(٤) أثر صحيح (مترجم).

نێژراوە، خەڵکیش یەکە یەکە نوێژیان لەسەر کردووە، واتە: هەر کەسێ بەتەنیا خۆی نوێژی لەسەر کردووەو کەس بەرنوێژی بۆ نەکردوون لەکاتی نوێژکردن لەسەری، ئەویش لەبەر ئەو سامە قورس و گرانەی کە لێیان نیشتبوو بەهۆی وەفاتیەوە، وە لەبەر ئەوەیش کە هێشتا جێنشین دانەنرا بوو.

## ٢١٥) وەسپدانەوەی موسوڵمانان هی مردوو گیرایە

## ثناء المسلمين على الميت مقبول

١١٠٩- عَنْ أَنَسَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مُرَّ بِجَنَازَةٍ فَأَثْنَوْا عَلَيْهَا خَيْرًا ، فَقَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): وَجَبَتْ وَجَبَتْ وَجَبَتْ، وَمَرَّ بِأُخْرَى فَأَثْنَوْا عَلَيْهَا شَرًّا فَقَالَ: نَبِيُّ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): وَجَبَتْ، وَجَبَتْ، وَجَبَتْ، فَقَالَ: عُمَرُ: فِدًى لَكَ أَبِي وَأُمِّي مَا وَجَبَتْ؟ فَقَالَ: رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَنْ أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ خَيْرًا وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ، وَمَنْ أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ شَرًّا فَوَجَبَتْ لَهُ النَّارُ. أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللَّهِ فِي الأَرْضِ. أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللَّهِ فِي الأَرْضِ. أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللَّهِ فِي الأَرْضِ. رَوَاهُ الخمسة. ولفظ النسائي: الْمَلاَئِكَةُ شُهَدَاءُ اللهِ فِي السَّمَاءِ، وَأَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللَّهِ فِي الأَرْضِ[1].

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: تەرمێ تێ پەڕی، خەڵکەکە وەسپی باشییان کرد، پێغەمبەری خودایش (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بوو بەماڵ، بوو بەماڵ، بوو بەماڵ تەرمێکی تریش تێ پەڕی، خەڵکەکە بە خراپە ناویان هێنا" پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەوە: بوو بەماڵ. بوو بەماڵ، بوو بەماڵ! عومەریش گوتی: باوك و دایکم بەسەرگەردانت بن چی بوو بەماڵ؟ فەرمووی: ئەو کەسەی ئێوە وەسپی باشیی ئەو بکەن بەهەشت دەبێ بە ماڵی، وە ئەو کەسەی ئێوە باسی خراپیی ئەو بکەن دۆزەخ دەبێ بەماڵی، ئێوە شایەتانی خودان لەسەر رووی زەوی، ئێوە شایەتی خودان لەسەر رووی زەوی، ئێوە شایەتانی خودان لەسەر رووی زەوی (ش/د/ت/ن) گفتەی

---

(١) بخاري. شهادات: ٢٦٤٢. مسلم. جنائز: ٢١٩٨.

(ن): فریشتە لە ئاسمان شایەتی خودانو ئێوەش لە زەوی شایەتی خودانو شایەتی بۆ هەر کەس (یا لەسەر هەرکەس) بدەن، خودا بەپێی ئەوە پاداشی دەداتەوە.

١١١٠- عَنْ أَبِي الأَسْوَدِ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) قَالَ: قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ وَقَدْ وَقَعَ بِهَا مَرَضٌ ، فَجَلَسْتُ إِلَى عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) فَمَرَّتْ بِهِمْ جَنَازَةٌ، فَأُثْنِيَ عَلَى صَاحِبِهَا خَيْرًا فَقَالَ: عُمَرُ: (رَضيَ اللهُ عَنهُ) وَجَبَتْ، ثُمَّ مُرَّ بِأُخْرَى فَأُثْنِيَ عَلَى صَاحِبِهَا خَيْرًا، فَقَالَ: عُمَرُ: (رَضيَ اللهُ عَنهُ) وَجَبَتْ. ثُمَّ مُرَّ بِالثَّالِثَةِ، فَأُثْنِيَ عَلَى صَاحِبِهَا شَرًّا فَقَالَ: وَجَبَتْ. فَقَالَ: أَبُو الأَسْوَدِ: فَقُلْتُ وَمَا وَجَبَتْ يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ؟ قَالَ: قُلْتُ كَمَا قَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَيُّمَا مُسْلِمٍ شَهِدَ لَهُ أَرْبَعَةٌ بِخَيْرٍ أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ. فَقُلْتُ: وَثَلاَثَةٌ؟ قَالَ: وَثَلاَثَةٌ، فَقُلْتُ وَاثْنَانِ؟ قَالَ: وَاثْنَانِ. ثُمَّ لَمْ نَسْأَلْهُ عَنِ الْوَاحِدِ. رَوَاهُ البخاري والترمذي والنسائي.

ئەبولئەسوەد (خوای لێ رازی بێ) گوتی: چووم بۆ مەدینە، پەتایێ داکەوتبوو لە خزمەتی عومەردا دانیشتم (خوای لێ رازی بێ) تەرمێ لەوێوە رەت بوو، خەڵکەکە وەسپی باشییان دەکرد، عومەریش گوتی: مسۆگەربوو، لە پاشا تەرمێکی تریش تێ پەڕبوو، خەڵکەکە باسی خاوەنەکەیان بە باشە دەکرد، عومەریش گوتیەوە: مسۆگەربوو، لەپاشا تەرمێکی تریش رەت بوو، خەڵکەکە باسی خاوەنەکەیان بەخراپە دەکرد عومەریش گوتیەوە: مسۆگەر بوو، ئەبولئەسوەد دەڵێ: منیش گوتم: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! چی مسۆگەر بوو؟ گوتی: ئەوە دەڵێم کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی: هەر موسوڵمانێ چوار کەس شایەتی بۆ بدەن خودا دەیباتە بەهەشت: منیش عەرزم کرد: ئەی سێ کەس شایەتی بۆ بدەن چۆنە؟ فەرمووی: سێ کەسیش شایەتی بۆ بدەن هەروا. گوتم: ئەی دوان؟ فەرمووی: دوانیش هەروا بەڵام بۆیەکێ لێمان نەپرسی. (ب/ت/ن- سەد هەزار رەحمەتی خودایان لێبێ).

## ٢١٦) خۆكوژ، واتە: ئەوەی خۆی خۆی بكوژێ نوێژی لەسەر ناكرێ (لا يصلى على قاتل نفسه)

١١١١- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أُتِيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِرَجُلٍ قَتَلَ نَفْسَهُ بِمَشَاقِصَ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْهِ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ البخاري[1].

**جابیری كوڕی سەمووره (خوای لێ رازی بێ) گوتی: تەرمی پیاوێكیان هێنا بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بەپەیكانێ خۆی كوشتبوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نوێژی لەسەرنەكرد (م/د/ت/ن).**

١١١٢- سيأتي في المجلد الرابع مبحث: (الْجِهَادُ فَرْضٌ كِفَايَةٌ) ما نصُّه ولأبي داود: الْجِهَادُ وَاجِبٌ عَلَيْكُمْ مَعَ كُلِّ أَمِيرٍ بَرًّا كَانَ أَوْ فَاجِرًا وَالصَّلَاةُ وَاجِبَةٌ عَلَيْكُمْ خَلْفَ كُلِّ مُسْلِمٍ بَرًّا كَانَ أَوْ فَاجِرًا وَإِنْ عَمِلَ الْكَبَائِرَ وَالصَّلَاةُ وَاجِبَةٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ بَرًّا كَانَ أَوْ فَاجِرًا وَإِنْ عَمِلَ الْكَبَائِرَ[2].

**لە بەرگی چوارەما لەسەربا سی (الجهاد فَرض كفاية)دا دەقی ئەم فەرموودەیە دێ: حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: غەزاو تێكۆشان و خەباتگێران فەرزە لەسەرتان، لەگەڵ هەموو فەرمانڕەوایەكا، ئیتر ئەو فەرمانڕەوایە باش بێ یا خراب، وە نوێژ فەرزە لەسەرتان لە پشتی هەموو موسوڵمانێكەوە، ئیتر ئەو موسوڵمانە باش بێ یا خراپ ئەگەر چی ئەو پێشنوێژە گوناهە گەورەكانیش بكا نوێژ لە پشتیەوە هەر فەرزە، وە فەرزە لەسەرتان كە نوێژی مردوو بكەن لەسەر هەموو موسوڵمانێكی مردوو، ئیتر ئەو مردووە باش بێ یا خراپ، گریمان ئەو موسوڵمانە لەژیانیا گوناهە گەورەكانیشی كردبێ، فەرزە هەر نوێژی لەسەربكرێ (د).**

---

(١) بخاري. شهادات: ٢٦٤٣.

(٢) مسلم. جنائز: ٢٢٥٩. نسائي. جنائز: ١٩٦٣.

## ٢١٧) بەرێكردنی مردوو زووبەزوو، وە مردن لە غەریبی:
## (التعجيل بأمر الميت وموت الغربة)

١١١٣- ➡ (ب – ١ ز – ٤٧ رقم: ٣٦٢/١٥)[1].

١١١٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: مَاتَ رَجُلٌ بِالْمَدِينَةِ مِمَّنْ وُلِدَ بِهَا فَصَلَّى عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) ثُمَّ قَالَ: يَا لَيْتَهُ مَاتَ بِغَيْرِ مَوْلِدِهِ، قَالُوا وَلِمَ ذَاكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا مَاتَ بِغَيْرِ مَوْلِدِهِ قِيسَ لَهُ مِنْ مَوْلِدِهِ إِلَى مُنْقَطَعِ أَثَرِهِ فِي الْجَنَّةِ. رَوَاهُ النسائي[2].

عەبدوڵڵای كوڕی عەمر (خوایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پیاوێ لە مەدینە لە دایك بوو بوو وە هەر لەوێش مرد، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) كە نوێژی لەسەر كرد فەرمووی: خۆزگە لە شوێنێكی تر دەمرد نەك لەم شوێنەزای خۆیە. گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە لە بەرچی؟ فەرمووی: لەبەر ئەوە ئەگەر پیاوێ لە شوێنەزای خۆی نەمرێ، لە شوێنەزاكەیەوە بۆی دەپێون تا ئەو شوێنەی كە دەمرێو شوێنەواری كوێر دەبێتەوە، بەقەد ئەوەی لە بەهەشتا مردنی غەریبی دەدەنێ! (ن).

## ٢١٨) بەشی پێنجەم: دەستووری ڕۆیشتن لەگەڵ تەرمدا:
## (الفصل الخامس: في آداب السير في الجنازة)

١١١٥- ➡ (ب – ١ ز – ٢٠٠ رقم: ١٠٥٣/١) في هذه الرواية: عَنِ الْبَرَاءَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَمَرَنَا النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِسَبْعٍ، وَنَهَانَا عَنْ سَبْعٍ، أَمَرَنَا بِاتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ، وَعِيَادَةِ الْمَرِيضِ، وَإِجَابَةِ الدَّاعِي، وَنَصْرِ الْمَظْلُومِ، وَإِبْرَارِ الْقَسَمِ، وَرَدِّ السَّلَامِ،

---

(١) راجع رقم: ٣٦٢/١٥.

(٢) سكت عنه.

وَتَشْمِيتِ الْعَاطِسِ. وَنَهَانَا عَنْ آنِيَةِ الْفِضَّةِ ، وَخَاتَمِ الذَّهَبِ ، وَالْحَرِيرِ ، وَالدِّيبَاجِ ، وَالْقَسِّيِّ ، وَالإِسْتَبْرَقِ وَعَنِ الْمَيَاثِرِ. رَوَاهُ الخمسة إلا أبا دلود[1].

لە گێڕانەوەی ئێرەدا: بەراء (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمانی پێکردین بە حەوت شت و جڵەوگیریی لە حەوت شت لێ کردین" فەرمانی پێ کردین بەم حەوت شتە:

**یەکەم:** شوێن کەوتنی تەرم.

**دووەم:** سەرلێدانی نەخۆش.

**سێیەم:** چوون بۆ سەر دەعوەت و بانگێشتن.

**چوارەم:** یاریدەدان و پشتگرتنی ستەمبار.

**پێنجەم:** سوێند بردنە سەر.

**شەشەم:** سەند نەوەی سلاو.

**حەوتەم:** دووعای خێرکردن بۆ پژمیو. وە جڵەوگیریشی لەم حەوت شتە لێ کردین:

**یەکەم:** لە قاپ و قاچاخی زیوو زێڕ.

**دووەم:** لە ئەنگوستیلەی زێڕ.

**سێیەم:** لە ئاورێشم.

**چوارەم:** لە دیباج.

**پێنجەم:** لە قەسسی کە جۆرە کاڵایێ بووە، لە گوندی قەسس لە وڵاتی میصر دروست دەکرا، یاخود قەسسی بەگەندە ئاورێشم دەڵێن، یاخود برێتییە لە کاڵایێ تێکەڵە لە ئاوریشم و کەتان.

**شەشەم:** لە ئیستەبرەق.

---

(١) بخاري. جنائز: ١٢٣٩ ، ٢٤٤٥ ، ٥١٧٥ ، ٥٦٣٥ ، ٥٦٥٠ ، ٥٨٣٨ ، ٥٨٤٩ ، ٥٨٦٣ ، ٦٢٢٢ ، ٦٦٥٤. مسلم. لباس: ٥٣٥٦. ترمذي. لباس: ١٧٦٠. نسائي. جنائز: ١٩٣٨ ، ٣٧٨٧ ، ٥٣٢٤.

**حەوتەم: لە دۆشەكەڵەی سەرزینی ئاوریشمین (ش/ت/ن).**

١١١٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ يَمْشُونَ أَمَامَ الْجَنَازَةِ. رَوَاهُ أصحاب السُّنن وأحمد وابن حبَّان وصححه[٢].

ئیبنو عومەر (خودایان لێ خۆشنوود بێ) گوتی: دیومە كە پێغەمبەر لە پێشی تەرمەوە رۆیشتووە، هەروا ئەبو بەكرو عومەریشم دیوە كە ئەوانیش لە پێشی تەرمەوە رۆیشتوون (د/ت/ن/ئیبنو حەببان:ص).

١١١٧- عَنِ الْمُغِيرَةِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: الرَّاكِبُ يَسِيرُ خَلْفَ الْجَنَازَةِ وَالْمَاشِي يَمْشِي خَلْفَهَا، وَأَمَامَهَا، وَعَنْ يَمِينِهَا، وَعَنْ يَسَارِهَا قَرِيبًا مِنْهَا. رَوَاهُ أصحاب السنن والحاكم وصححَّه[٣].

موغیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: سوار لە پشتی تەرمەوە دەڕوات، پیادە بە ئارەزووی خۆیەتی، لە پشتیەوە، لە پێشیەوە، لە راستیەوە، لە چەپیەوە دەڕاوات بە ئارەزووی خۆیەتی، ئەوەندە هەیە لە نزیكی تەرمەكەوە دەڕۆن! (د/ت/ن/حاكم:ص).

١١١٨- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أُتِيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِفَرَسٍ مُعْرَوْرًى فَرَكِبَهُ حِينَ انْصَرَفَ مِنْ جَنَازَةِ ابْنِ الدَّحْدَاحِ وَنَحْنُ نَمْشِي حَوْلَهُ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ البخاري[٤].

جابیری كوڕی سەموورە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) كە لە ناشتنی تەرمی ئیبنو دەحداح گەڕایەوە ئەسپێكیان بە پشتی رووتی بۆ هێنا، سواری بوو، ئەو بەسواری و ئێمەش بەپێ لە دەوری بەرەوماڵ رۆیشتینەوە (م/د/ت/ن).

---

(٢) صحيح عند ابن حبان.

(٣) صحيح عنه الحاكم.

(٤) مسلم. جنائز: ٢٢٣٥. نسائي. جنائز: ٢٠٢٥.

١١١٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَسْرِعُوا بِالْجَنَازَةِ فَإِنْ تَكُ صَالِحَةً فَخَيْرٌ تُقَدِّمُونَهَا إِلَيْهِ وَإِنْ تَكُنْ غَيْرَ ذَلِكَ فَشَرٌّ تَضَعُونَهُ عَنْ رِقَابِكُمْ. رَوَاهُ الخمسة[٥].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: دەست و برد لە بەرێكردنی تەرم بكەن و زوو بە زوو بیبەن بۆ گۆڕستان و لە رێ خێرا بڕۆن چونكە ئەگەر خۆی مرۆڤێكی باش بێ ئەوا ئێوە دەیبەن بەسەر خێرو خۆشیدا، وە ئەگەر خۆی مرۆڤێكی باش نەبێ ئەوا شەڕێكەو لە كۆڵی خۆتانی دەكەنەوە (ش/د/ت/ن).

١١٢٠- عَنْ عُيَيْنَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَنْ أَبِيهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُماَ) أَنَّهُ كَانَ فِي جَنَازَةِ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ وَكُنَّا نَمْشِي مَشْيًا خَفِيفًا فَلَحِقَنَا أَبُو بَكْرَةَ فَرَفَعَ سَوْطَهُ، فَقَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُنَا وَنَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَرْمُلُ رَمَلاً. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والنَسائي[٦].

لە عویەینەی كوڕی عەبدوڕەحمانەوە لە باوكیەوە (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: خۆم لەگەڵ تەرمی عوسمانی كوڕی ئەبولعاصدا بووم، سووك سووك لەسەر خۆمان دەڕۆیشتین، بەڵام ئەبو بەكرەمان پێ گەیشت بە دەنگێكی بەرز گوتی: بۆخۆم لە خزمەتی حەزرەتدا بووم (دروودی خوای لەسەربێ) تەرمێكمان رەت دكرد بە تەكان دەڕۆیشتین (د/ن-س/ص).

١١٢١- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: نُهِينَا عَنِ اتِّبَاعِ الْجَنَائِزِ وَلَمْ يُعْزَمْ عَلَيْنَا. رَوَاهُ الثلاثة[٧].

---

(٥) بخاري. جنائز: ١٣١٥. مسلم. جنائز: ٢١٨٣. أبو داود. جنائز: ٣١٨١. ترمذي. جنائز: ١٠١٥. نسائي. جناشز: ١٩٠٩.

(٦) بسند صحيح (شرحه).

(٧) بخاري. حيض: ١٢٧٨. مسلم. جنائز: ٢١٦٣.

ئوممو عەطییە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: ئێمەی ژنان نەهیمان لێ کراوە لە شوێن کەوتنی تەرم کە لەگەڵیا بچین بۆ سەر گۆڕستان بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا یاساغ نەکراوە لێمان کە لەگەڵ تەرمدا بڕۆین بۆ سەر قەبران! (ش/ن).

١١٢٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا وُضِعَتِ الْجِنَازَةُ وَاحْتَمَلَهَا الرِّجَالُ عَلَى أَعْنَاقِهِمْ ، فَإِنْ كَانَتْ صَالِحَةً قَالَتْ: قَدِّمُونِي وَإِنْ كَانَتْ غَيْرَ صَالِحَةٍ قَالَتْ: يَا وَيْلَهَا أَيْنَ يَذْهَبُونَ بِهَا؟ يَسْمَعُ صَوْتَهَا كُلُّ شَيْءٍ إِلاَّ الإِنْسَانَ، وَلَوْ سَمِعَهُ لَصَعِقَ. رَوَاهُ البخاري والنسائي[٨].

ئەبو سەعید (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: کاتێ تەرمی مردوو دادەنرێ لەناو دارە تەرما وە پیاوان هەڵی دەگرن و دەینێنە سەرشانیان تابیبەن بۆ سەر گۆڕستان، لەوکاتەدا مردووەکە ئەگەر مرۆڤێکی باش بێ دەڵێ: زووکەن زوو بمبەن! وەلێ ئەگەر مردووەکە مرۆڤێکی باش نەبێ دەڵێ: هەی هاوار! خۆم ڕۆ! بۆ کوێم دەبەن؟ حەزرەت (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: لەم کاتەدا هەموو شتێ دەنگی دەبیستێ ئادەمیزاد نەبێ ئەگەر ئادەمیزاد گوێی لەم هاتو هاوارەی بێ لە ترسانا دەتۆقێ و زەندەقی دەچێ (بوخاری و نەسائی - ڕەحمەتی خودایان لێبێ - ئەم فەرموودەیان گێڕاوەتەوە).

### ٢١٩) فریشتەی ڕەحمەتیش تەرم بەرێ دەکەن لەگەڵیا دەڕۆن بۆ سەر قەبران، کردەوەی مردووش هەرچێ بێ، خاس بێ یا خراپ لەگەڵ خۆیا دەچێتە ناو گۆڕەکەیەوە! (ملائكة الرحمة تشيع الجنازة ويلزمها عملها)

١١٢٣- عَنْ ثَوْبَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أُتِيَ بِدَابَّةٍ وَهُوَ مَعَ الْجَنَازَةِ فَأَبَى أَنْ يَرْكَبَ فَلَمَّا انْصَرَفَ أُتِيَ بِدَابَّةٍ فَرَكِبَ فَقِيلَ لَهُ فَقَالَ: إِنَّ الْمَلاَئِكَةَ كَانَتْ تَمْشِي، فَلَمْ أَكُنْ لأَرْكَبَ وَهُمْ يَمْشُونَ، فَلَمَّا ذَهَبُوا رَكِبْتُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ[١].

---

(٨) بخاري. جنائز: ١٣١٤ ، ١٣١٦ ، ١٣٨٠.

(١) بسند صحيح (شرحه).

ثەوبان (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لەگەڵ تەرمێكا دەچوو بۆ سەر گۆڕستان، وڵاخێكیان بۆ هێنا كە سواری بێ، بەڵام سواری نەبوو، لەو سەرەوە كە گەڕایەوە وڵاخێكیان بۆ هێنا ئەمجار سواربوو، كە بۆ ئەمە قسەیان لەگەڵی كرد فەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ): ئەوسا فریشتەكان لەگەڵ تەرمەكەدا بەپێ دەڕۆیشتن، جا نەدەبوو من بە سواریو ئەوان بەپێ، بەڵام ئێستا ئەوان رۆیون، لەبەر ئەوە منیش سوار بووم (ئەبو داوود ئەم حەدیثەی بەسەندێكی صەحیح ریوایەت كردووە).

١١٢٤- وَخَرَجَ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي جَنَازَةٍ فَرَأَى رُكْبَانًا، فَقَالَ: أَلاَ تَسْتَحْيُونَ! إِنَّ مَلاَئِكَةَ اللَّهِ عَلَى أَقْدَامِهِمْ وَأَنْتُمْ عَلَى ظُهُورِ الدَّوَابِّ. رَوَاهُ الترمذي وابن ماجه[٢].

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) جارێ دەرچوو تەرمێ بەڕێ بكا، دەستەیێ سواری دی لەگەڵ تەرمەكەدا دەڕۆیشتن، فەرمووی: نابێ شەرمو شكۆبكەن! فریشتەی خودا بەپێو ئێوە بەسەر پشتی وڵاخەوە چۆن دەبێ! (ت/ماجە - بەر شەپۆلی میهرەبانیی خودا كەون).

١١٢٥- عَنْ أَنَسَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: يَتْبَعُ الْمَيِّتَ ثَلاَثَةٌ، فَيَرْجِعُ اثْنَانِ وَيَبْقَى مَعَهُ وَاحِدٌ، يَتْبَعُهُ أَهْلُهُ وَمَالُهُ وَعَمَلُهُ، فَيَرْجِعُ أَهْلُهُ وَمَالُهُ ، وَيَبْقَى عَمَلُهُ. رَوَاهُ الشيخان والترمذي[٣].

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: سێ شت شوێن مردوودەكەونو تاسەر لێواری گۆڕ لەگەڵی دەچن، بەڵام لەوێ دوانیان دەگەڕێنەوەو یەكێكیان لەگەڵی دەمێنێتەوە: كەسوكاروماڵو كردەوی لەگەڵی دەچن، بەڵام كەسوكاروماڵەكەی دەگەڕێنەوە، تەنیا كردەوەكەی لەگەڵی دەمێنێ! (ش/ت).

(٢) سكت عنه.

(٣) بخاري. رقاق: ٦٥١٤. مسلم. زهد: ٧٣٥٠. ترمذي. زهد: ٢٣٧٩. نسائي. جنائز: ١٩٣٦.

## ٢٢٠) هەڵسان لەبەر تەرم: (القيام للجنازة)

١١٢٦- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا رَأَيْتُمُ الْجَنَازَةَ فَقُومُوا ، فَمَنْ تَبِعَهَا فَلاَ يَقْعُدْ حَتَّى تُوضَعَ. وفي رواية: إِذَا رَأَيْتُمُ الْجَنَازَةَ فَقُومُوا حَتَّى تُخَلِّفَكُمْ أَوْ تُوضَعَ. رَوَاهُ الخمسة[١].

**ئەبو سەعید** (ڕەزای خودای لێبێ) **دەڵێ: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **دەفەرموێ: کە تەرمتان دی هەڵسن لەبەری تا تێ دەپەڕێ ئەو کەسەشی دوای دەکەوێ با دانەنیشێت تا تەرمەکە دادەنرێ لەلای گۆڕەکەی، لە گێڕانەوەیەکا: کاتێ تەرم دەبینن هەڵسن لەبەری تاڕەت دەبێ لێتان یا هەتا دادەنرێ لە گوێی گۆڕەکەی (ش/د/ت/ن).**

١١٢٧- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَرَّتْ جَنَازَةٌ فَقَامَ لَهاَ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَقُمْنَا مَعَهُ، فَقُلْنَا: يا رَسُولَ اللهِ إِنَّهَا يَهُودِيَّة، فَقَالَ: إِنَّ الْمَوتَ فَزَعٌ فَإِذَا رَأَيْتُمُ الْجَنَازَةَ فَقُومُوا. رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ الترمذي[٢].

**جابر** (خوای لێ ڕازی بێ) **گوتی: تەرمێ ڕەت بوو، پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **لەبەری هەڵسا، ئێمەش لەگەڵیا لەبەری هەڵساین، ئینجا گوتمان: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆ ئەمە تەرمی جوولەکەبوو؟ فەرمووی** (درودی خوای لەسەربێ): **مردن بە سامە! لەبەر ئەوە کە تەرمتان دی لە بەری هەڵسن! (ش/د/ن).**

١١٢٨- عَنْ عَلِيّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: رَأَيْنَا رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَامَ فَقُمْنَا، وَقَعَدَ فَقَعَدْنَا. رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ البخاريَّ[٣].

**عەلی** (خوای لێ ڕازی بێ) **دەڵێ: لەسەرە تاوە دەمان دی پێغەمبەر خۆی** (درودی خوای لەسەربێ) **لەبەر تەرم هەڵدەسێ لەبەر ئەوە ئێمەیش لەبەری هەڵدەساین، بەڵام لە دواییدا پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **وازی لەمە هێناو دانیشتنی لە**

(١) بخاري. جنائز: ١٣٠٧ (١٣٠٨). مسلم. جنائز: ٢٢١٦ — ٢٢١٩.

(٢) بخاري. جنائز: ١٣١١. مسلم. جنائز: ٢٢١٩.

(٣) مسلم. جنائز: ٢٢٢٧. أبو داود. جنائز: ٣١٧٥. ترمذي. جنائز: ١٠٤٤. نسائي. جنائز: ١٩٩٨ ، ١٩٩٩.

خۆی تێك نەدەدا لەبەر ئەوە ئێمەش وازمان لێ هێناوەو دانیشتن لە خۆمان تێك نادەین (م/د/ت/ن).

## ٢٢١) باسی گۆڕو بەخاك سپاردنو كاتی مردوو ناشتن: (القبر والدفن ووقته)

قَالَ اللهُ تَعَالَى: {ثُمَّ أَمَاتَهُ فَأَقْبَرَهُ ثُمَّ إِذَا شَاءَ أَنشَرَهُ - ٨٠/ ٢١ - ٢٢}.

واتە: خودای گەورە دەفەرموێ: ئینجا لەپاش ماوەی ژیانی دنیا خودا دەیمرێنێ و دەیخاتە ناو گۆڕەوە، لەپاشا كاتێ كەویستی زیندووی دەكاتەوە وەك جاری جاران!.

١١٢٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: اللَّحْدُ لَنَا وَالشَّقُّ لِغَيْرِنَا. رَوَاهُ أصحاب السنن وأحمد[1].

ئیبنو عەبباس (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: لادڕ (ئەلحەد) بۆ ئێمەیەو گۆڕیچەش بۆ خەڵكانی تر (د/ت/ن/ئەحمەد-س/ح).

١١٣٠- قَالَ: سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) فِي مَرَضِهِ الَّذِى هَلَكَ فِيهِ الْحِدُوا لِي لَحْدًا، وَانْصِبُوا عَلَيَّ اللَّبِنَ نَصْبًا كَمَا صُنِعَ بِرَسُولِ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ). رَوَاهُ مُسْلِمٌ وأحمد والنسائي[2].

سەعدی كوڕی ئەبو وەققاص (خوای لێ رازی بێ) لەو نەخۆشییەدا كە تیامرد رایسپارد گوتی: لادڕم بۆ لێ دەنو بەخشتی كاڵ لای پشتم بگرن، پێغەمبەریان چۆن لێكرد منیش ئاوا (م/ئەحمەد/ن).

---

(١) بسند حسن (شرحه).

(٢) مسم. جنائز: ٢٢٣٧. نسائي. جنائز: ٢٠٠٧.

١١٣١- عَنْ أَبِي الْهَيَّاجِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: لِي عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ أَلاَّ أَبْعَثُكَ عَلَى مَا بَعَثَنِي عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ لاَ تَدَعَ تِمْثَالاً إِلاَّ طَمَسْتَهُ وَلاَ قَبْرًا مُشْرِفًا إِلاَّ سَوَّيْتَهُ. رَوَاهُ الخمسة إلاّ البخاريّ(٣).

ئەبولهەیياج (خوای لێ رازی بێ) گوتی: عەلی كوڕی ئەبو طاليب گوتی پێی: بزانە! لەسەر ئەو ڕێبازە راستە دەتنێرم كە كاتی خۆی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) منی لەسەر نارد: كە ئەمەیە: كە هەرچی پەیكەرێكت دی كوێری بكەرەوە، وە هەرچی گۆڕێكی قنج و قیتت دی تەختی بكەو متی بكە بەزەوییەكەوە (م/د/ت/ن).

١١٣٢- عَنْ فَضَالَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَأْمُرُ بِتَسْوِيَةِ الْقُبُورِ. رَوَاهُ مُسْلِمٌ وَأَبُو دَاوُدَ(٤).

فەضاله (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە پێغەمبەر خۆیم بیستووه (درودی خوای لەسەربێ) فەرمانی دەكرد بەوە كە گۆڕ تەخت بكرێ لەگەڵ زەویدا (م/د).

١١٣٣- عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَتِ الأَنْصَارُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَوْمَ أُحُدٍ فَقَالُوا: أَصَابَنَا قَرْحٌ وَجَهْدٌ فَكَيْفَ تَأْمُرُنَا قَالَ: احْفِرُوا وَاعْمِقُوا وَأَوْسِعُوا وَاجْعَلُوا الرَّجُلَيْنِ وَالثَّلاَثَةَ فِي الْقَبْرِ. قِيلَ فَأَيُّهُمْ يُقَدَّمُ؟ قَالَ: أَكْثَرُهُمْ قُرْآنًا. رَوَاهُ أصحاب السنن(٥).

هیشامی كوڕی عوروه (خوای لێ رازی بێ) گوتی: ڕۆژی غەزای ئوحود یاریدەدەران (ئەنصار) هاتن بۆلای حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆت دەزانی ماندوو و شەكەتین و تووشی شكستەیی بووین و زامارو شەهیدیشمان زۆره لەبەر ئەوه فریاناكەوین كه هەر شەهیدەی گۆڕێكی سەربەخۆی بۆ هەڵكەنین جا تۆ فەرمانت بەچییە پێمان؟ فەرمووی: گۆڕی قووڵی پان و پۆڕ هەڵكەنن و دوو پیاوو سێ پیاو بەیەكەوه بیانخەنە ناو

(٣) مسلم. جنائز: ٢٢٣٩ ، ٢٢٤٠. أبو داود. جنائز: ٣٢١٩ ، ٣٢١٨. ترمذي. جنائز: ١٠٤٩. نسائي. جنائز: ٢٠٣٠.

(٤) مسلم. جنائز: ٢٢٣٩.

(٥) بسند صحيح (شرحه).

یـەك گـۆڕەوە گـوترا: كامیـان بخەینـەلای پێـشەوە واتـە: كامـەیان لەبـەری رووگـەوە بـێ؟ فـەرمووی: هـەر كامێكیـان كـە قورئـانی زۆر تـر لەبـەر بـێ! (د/ت/ن-س/ص).

١١٣٤- عَنِ الْمُطَّلِبِ بْنِ أَبِي وَدَاعَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَمَّا مَاتَ عُثْمَانُ ابْنُ مَظْعُونٍ أُخْرِجَ بِجَنَازَتِهِ فَدُفِنَ، أَمَرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلاً أَنْ يَأْتِيَهُ بِحَجَرٍ، فَلَمْ يَسْتَطِعْ حَمْلَهُ فَقَامَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَحَسَرَ عَنْ ذِرَاعَيْهِ ثُمَّ حَمَلَهَا فَوَضَعَهَا عِنْدَ رَأْسِهِ وَقَالَ: أَتَعَلَّمُ بِهَا قَبْرَ أَخِي، وَأَدْفِنُ إِلَيْهِ مَنْ مَاتَ مِنْ أَهْلِي[٦].

مـوطـطـەلیبـی كـوڕی ئـەبو وەداعـە (خوای لێ رازی بێ) گـوتـی: كـە عوسمـانـی كوڕی مەظموون مرد، تەرمەكەیان بردو ناشتیان، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فـەرمانی كـرد بـە پیاوێ كـە كیلـە بـەردێكی بـۆ بێنـێ، پیاوەكـە بەردەكـەی بـۆ هەڵنـەگیرا، پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەربێ) خـۆی هەڵساو چـوو بـۆی‌و هـەردوو قـۆڵی خـۆی هـەڵماڵی‌و بەردەكـەی هـەڵگرت‌و هێنـای‌و لـەلای سـەریا داینـاو فەرمووی: دەیكەم بە نیشانەو گۆڕی براكەمی پێ دەناسمەوە، وە ئەوەشی لـە كەس‌و كارم بمرن لەلایدا دەیان نێژم. عوسمانی كوڕی موظعوون برای شیری پێغەمبـەر بووە (دروودی خوای لەسەربێ) (د-سند صالح).

١١٣٥- عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَوْصَى الْحَارِثُ أَنْ يُصَلِّيَ عَلَيْهِ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يَزِيدَ فَصَلَّى عَلَيْهِ ثُمَّ أَدْخَلَهُ الْقَبْرَ مِنْ قِبَلِ رِجْلَيِ الْقَبْرِ وَقَالَ: هَـذَا مِـنَ السُّنَّةِ. رَوَاهُمَا أَبُو دَاوُدَ[٧].

ئـەبو ئیـسحاق (خوای لێ رازی بێ) گـوتی: حاریـث رایـسپارد كـە عەبـدوڵڵای كـوڕی یـەزیـد نوێـژی لەسـەر بكـا، عەبـدوڵا كـە نوێـژی لەسـەر كـرد لـە پێیینـی گۆڕەكەوە دایهێڵایە ناو گۆڕەكەوەو گوتی: ئەمە سوننەتە (د-سند صالح).

---

(٦) بسند صالح (شرحه).

(٧) بسند صالح (شرحه).

١١٣٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ أللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إذَا وَضَعَ الْمَيِّتُ فِي الْقَبْرَ قَالَ: بِسْمِ اللهِ وَعَلَى سُنَّةِ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَوَاهُ أصحاب السنن ولفظ الترمذي: بِسْمِ اللهِ وَبِاللهِ وَعَلَى مِلَّةِ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)(٨).

**ئیبنو عومەر** (خودایان لێ رازی بێ) **گوتی: پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **كە مردووی دادەنا لەناو گۆڕەكەیا دەیفەرموو:**

{بِإسْمِ أللهِ وَبِاللهِ وَعلى مِلةِ رسَوُلِ اللهِ}:

**بە پیرۆزی ناوی خوداو لەسەر سوننەتی پێغەمبەری خودا** (درودی خوای لەسەربێ) **(د/ت/ن) گفتەی (ت) ئاوایە:**

**بەناوی خوداو بەپشتی خوداو لەسەر ئایین و دینی ئوممەتی موحەممەدی پێغەمبەری خودا (د).**

١١٣٧- عَنْ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ (رَضيَ اللهُ عَنهُ) يَقُولُ: ثَلاَثُ سَاعَاتٍ كَانَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَنْهَانَا أَنْ نُصَلِّيَ فِيهِنَّ أَوْ نَقْبُرَ فِيهِنَّ مَوْتَانَا: حِينَ تَطْلُعُ الشَّمْسُ بَازِغَةً حَتَّى تَرْتَفِعَ، وَحِينَ يَقُومُ قَائِمُ الظَّهِيرَةِ حَتَّى تَمِيلَ الشَّمْسُ وَحِينَ تَضَيَّفُ الشَّمْسُ، لِلْغُرُوبِ حَتَّى تَغْرُبَ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ البخاريَّ(٩).

**عوقبەی كوڕی عامیر** (خوای لێ رازی بێ) **گوتی: جاران پێغەمبەر** (درودی خوای لەسەربێ) **لەم سێ كاتەدا نەهی لێ دەكردین كە نوێژیان تیا بكەین یا مردوومانیان تیا بنێژین:**

**یەكەم: ئەو كاتە كە خۆر هەڵدێ و گزنگ دەدا هەتا بەقەد رمێك بەرز دەبێتەوە.**

**دووەم: ئەو كاتەش كە قرچەی نیوەڕۆ هەڵدەستێ و راوەستاو لەبەر خۆر سێبەری نامێنێ هەتا خۆر لار دەبێتەوەو بە دیمەن لە ناوەراستی ئاسمان لا دەدات.**

---

(٨) بسند حسن (شرحه).

(٩) مسلم. صلاة المسافرين: ١٩٢٦. أبو داود. جنائز: ٣١٩٢. ترمذي. جنائز: ١٠٣٠. نسائي. مواقيت: ٥٥٩ ، ٥٦٤ ، ٢٠١٢.

**سـێیەم: ئەوکاتـەش کـە خـۆر شـۆڕ دەبێتـەوە بـەرەو ئـاوابوون هـەتا ئاوادەبێ (م/د/ت/ن).**

١١٣٨- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: رَأَى نَاسٌ نَارًا فِي الْمَقْبَرَةِ نَاراً فَأَتَوْهَا، فَإِذَا رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي الْقَبْرِ، وَإِذَا هُوَ يَقُولُ: نَاوِلُونِي صَاحِبَكُمْ، فَإِذَا هُوَ الرَّجُلُ الَّذِي كَانَ يَرْفَعُ صَوْتَهُ بِالذِّكْرِ. رواه أبو دَاوُدَ والترمذي. ولفظه: فَأَخَذَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ قِبَلِ الْقِبْلَةِ وَقَالَ: رَحِمَكَ اللّٰهُ إِنْ كُنْتَ لأَوَّاهًا تَـلاَّءً لِلْقُرْآنِ[١٠].

**جابیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: شەوێ خەڵك ئاگرێکیان دی لە گۆڕخانەکە دەگڕا، کە چوون بە سۆراخیەوە تەماشایان کرد وا پێغەمبەر خۆی (دروودی خوای لەسەربێ) لـەناو گۆڕەکەدایـەو دەفـەرموێ: هاوڕێکـەتانم بدەنـە دەسـت کـە تەماشایان کرد تومەز ئەمە خوی ئەو پیاوەبوو کە بە دەنگی بەرز ذیکرو یادی خودای دەکرد (د-س/ح-ت) گفتەی (ت): جا پێغەمبەر خۆی (دروودی خوای لەسەربێ) لەڕووی رووگەوە مردووەکەی وەرگرت و فەرمووی: (بەر سۆزو رەحمەتی خودا کەویت)! بە راستی تۆ سۆزکەرو دڵنەرمو قورئانخوێنی چاك بووی!.**

## ٢٢٢) نابێ گۆڕ برازێتەوە، یا خانووی لەسەر بکرێ یا لەسەری دابنیشی: (لا يزين القبر ولا يبنى ولا يجلس عليه)

١١٣٩- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهى رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ يُجَصَّصُ الْقَبْرُ وَأَنْ يُقْعَدَ عَلَيْهِ وَأَنْ يُبْنَى عَلَيْهِ.. رواه الخمسة إلا البخاري. ولفظ الترمذي: نهى النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنْ تُجَصَّصَ القُبُور وَأَنْ يُكْتَبَ عَلَيْهاَ وَأَنْ يُبْنى عَلَيْها وَأَنْ تُوطَأَ[١].

---

(١٠) رواه أبو داود بسند حسن (شرحه).

(١) مسلم. جنائز: ٢٢٤٢ – ٢٢٤٤. أبو داود. جنائز: ٣٢٢٦ ، ٣٢٢٥. ترمذي. جنائز: ١٠٤٩. نسائي. جنائز: ٢٠٣٠.

جابیر (خودای لێ خۆش بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) نەهی کردووە لە گەچکاریکردنی گۆڕو لە دانیشتن لە سەری و لە دروستکردنی خانوو لەسەری (م/د/ت/ن) گفتەی تیرمیذی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) جڵەوگیری دەکا لە گەچکاریکردنی گۆڕو لە نووسین لەسەری و لە دروستکردنی گومەزو خانوو لە سەری و لە شێلان و پێ لێ نانی.

١١٤٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لأَنْ يَجْلِسَ أَحَدُكُمْ عَلَى جَمْرَةٍ فَتُحْرِقَ ثِيَابَهُ فَتَخْلُصَ إِلَى جِلْدِهِ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَجْلِسَ عَلَى قَبْرٍ. رَوَاهُ مسلم وأبُو داود والنسائي[٢].

لە ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئەگەر لەسەر پشکۆیێ ئاگری سوور دابنیشن و جلەکانتان بسووتێنێ و بگاتە پێستتان و چزەی لێ هەڵبستێنێ هێشتا ئەمەتان باشترە لەوە کە لەسەر گۆڕێ دابنیشن (م/د/ن).

## ٢٢٣) گواستنەوەی مردوو، وە هەروا هەڵدانەوەی گۆڕ، ئەگەر لەبەر پێویستی بێ دروستن: (يجوز نقل الميت كما يجوز نبش القبر للحاجة)

١١٤١- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: دُفِنَ مَعَ أَبِي رَجُلٌ فَلَمْ تَطِبْ نَفْسِي حَتَّى أَخْرَجْتُهُ فَجَعَلْتُهُ فِي قَبْرٍ عَلَى حِدَةٍ. رَوَاهُ البخاري والنسائي وأبو داود: فَأَخْرَجْتُهُ بَعْدَ سِتَّةِ أَشْهُرٍ، فَمَا أَنْكَرْتُ مِنْهُ شَيْئًا إِلاَّ شُعَيْرَاتٍ كُنَّ فِي لِحْيَتِهِ مِمَّا يَلِي الأَرْضَ[١].

جابیر (خوای لێ رازی بێ) گوتی: باوکم لە غەزای ئوحوددا شەهید بوو پیاوێکی تر لەگەڵ باوکما لەیەك گۆڕدا نێژرابوون، جا دڵم بەرایی نەدا تا لەشەکەیم دەرهێناو لە گۆڕێکی سەربەخۆدا ناشتمەوە (ب/ن/د = بوخاری و نەسائی و ئەبو داوود) ئەبو داوود (خودا لێی خۆش بێ) ئەمەشی پترە: لەپاش

---

(٢) مسلم. جنائز: ٢٢٤٥ تقدم تخريجه بمثل الحديث الذى قبله (الحديث ٢٢٤٢).

(١) بخاري. جنائز: ١٣٥٢.

شەش مانگ کاتێ کە لاشەکەیم دەرهێنا هیچ تێك نەچووبوو هەروەك خۆی مابوو، تەنیا چەن موویەکی ریشی نەبێ کە لە دیوی زەویەکەوە بوون.

١١٤٢- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَدِينَةَ وَأُمِرَ بِبِنَا الْمَسْجِدِ فَقَالَ: يَا بَنِي النَّجَّارِ ثَامِنُونِي بِحَائِطِكُمْ هَذَا فَقَالُوا: لاَ وَاللهِ لاَ نَطْلُبُ ثَمَنَهُ إِلاَّ إِلَى اللهِ، فَأَمرَ بُقبُورِ الْمُشْرِكِينَ فَنُبِشَتْ، ثُمَّ بِالْخَرِبِ فَسُوِّيَتْ، وَبِالنَّخْلِ فَقُطِعَ ، فَصَفُّوا النَّخْلَ قِبْلَةَ الْمَسْجِدِ، وَجَعَلُوا عِضَادَتَيْهِ الْحِجَارَةَ، وَجَعَلُوا يَنْقُلُونَ الصَّخْرَ، وَهُمْ يَرْتَجِزُونَ، وَالنَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَعَهُمْ وَهُوَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ لاَ خَيْرَ إِلاَّ خَيْرُ الآخِرَةِ فَاغْفِرْ لِلأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرَةِ. رواه الثلاثة(٢)

ئەنەس (رەزای خودای لێبێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) کە هات بۆ مەدینەو فەرمانی پێ کرا بە دروستکردنی مزگەوتەکە فەرمووی: ئەی بەنی نەجار! ئەم باخەی خۆتانم پێ بفرۆشن و نرخەکەیم پێ بڵێن؟ گوتیان: نە بەخوا بە فرۆشتن نایدەین، بەڵام بە خۆڕایی پێشکەشی دەکەین بە خوداو پێغەمبەری خوداو بەهاکەیمان هەر لە خودا دەوێ! جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمانیدا گۆڕی بتپەرستەکانیان هەڵتەکاندو چاڵایی شوێن گۆڕەکانیان پڕ کردەوەو دارخورماکانیان بڕی و لەلای رووگە (قیبلە)ی مزگەوتەکەوە ریزیان کردن و هەردوو لاشیپانی دەرگاکەشیان لە تاشەبەرد دروست کرد، کاتێ کە تلە بەردەکانیان دەگواستەوە سۆزیان دەکردو پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) لەگەڵیانا سۆزی دەکردو دەیفەرموو:

اللَّهُمَّ لاَ خَيْرَ إِلاَّ خَيْرُ الآخِرَةِ فَاغْفِرْ لِلأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرَةِ

واتە: پەروەردگارا! باش ئەوەیە لەدوا رۆژا باش بێ، جا چاوی خێرت لە یاریدەدەران و کۆچەران بێ (ش/د).

---

(٢) بخاري. مناقب: ٣٧٩٥. مسلم. جهاد: ٤٦٤٧ — ٤٦٥٢.

١١٤٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ أللهُ عَنْهَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) قَالَ: كَسْرُ عَظْمِ الْمَيِّتِ كَكَسْرِهِ حَيًّا. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ وابن ماجه[٣].

عائیشه (خوای لێ رازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: شكاندنی ئێسكی مردوو وەك ئەوە وایە كە لە حاڵی ژیانیا بیشكێنی (د/ماجه-سند صالح).

١١٤٤- عَنْ عَبْدَ اللّٰهِ بْنَ عَمْرٍو (رَضيَ أللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَى الطَّائِفِ فَمَرَرْنَا بِقَبْرٍ فَقَالَ: رَسُولُ اللّٰهِ (صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) هَـذَا قَبْرُ أَبِى رِغَالٍ وَكَانَ بِهَذَا الْحَرَمِ يَدْفَعُ عَنْهُ فَلَمَّا خَرَجَ أَصَابَتْهُ النِّقْمَةُ الَّتِى أَصَابَتْ قَوْمَهُ بِهَذَا الْمَكَانِ فَدُفِنَ فِيهِ وَآيَةُ ذَلِكَ أَنَّهُ دُفِنَ مَعَهُ غُصْنٌ مِنْ ذَهَبٍ إِنْ أَنْتُمْ نَبَشْتُمْ عَنْهُ أَصَبْتُمُوهُ مَعَهُ فَابْتَدَرَهُ النَّاسُ فَاسْتَخْرَجُوا الْغُصْنَ. رَوَاهُ أبو داود[٤].

عەبدوڵڵای كوڕی عەمر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: لە خزمەتی حەزرەتدا (درودی خوای لەسەربێ) دەرچووین بۆ طائیف، لەڕێ دامان بەلای گۆڕێكا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئەمە گۆڕی ئەوبوریغالە، تا لەحەرەم (بەست)ی مەككەدا بوو حەرەم دەیپاراست، بەڵام كە لەخاكی حەرەم دەردەچێ لەم شوێنەدا گرفتاری هەمان تۆڵەو سزا دەبێ كە لەوەوپێش تووشی هۆزەكەی بوو بوو، جا لێرەدا نێژرا، وە نیشانەی (راستی) ئەم (داستان)ەش ئەمەیە داردەستێكی زێڕی لە قەبرەكەدا لەگەڵدا نێژراوە، ئەگەر گۆڕەكەی هەڵبدەنەوە لە لایا دەیدۆزنەوە جا خەڵكەكە پەلاماری گۆڕەكەیان داو شیشە زێڕەكەیان لێ دەرهێنا! (د-سند صالح).

---

(٣) بسند صالح (شرحه).

(٤) بسند صالح (شرحه).

## ٢٢٤) بەشی شەشەم: پرسیارو وەڵامی ناو گۆڕو سزای گۆڕ:
## (الفصل السادس: في سؤال القبر وعذابه)

١١٤٥- عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا أُقْعِدَ الْمُؤْمِنُ فِي قَبْرِهِ أُتِيَ، ثُمَّ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ ( يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ) فيالْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ[1].

بەراء (خوای لێ ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: موسوڵمان كاتێ دەینێژن و خەڵكەكە بەجێی دەهێڵن لە گۆڕەكەیا دایدەنیشێنن و دوو فریشتە (كە ناویان نەكیرو مونكەرە) بۆ تاقی كردنەوە دێنە سەری و لێی دەپرسن: خوات كێیە، پێغەمبەرت كێیە، لەسەرچی ئاینێكی؟ و ئەویش خودای گەورە تەوفیقی دەداو دەڵێ:

{أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ}.

شایەتی دەدەم كە هەر خودا خودایەو خودای ترنیەو موحەممەد پێغەمبەری خودایە، خودای من ئەڵلایەو پێغەمبەرم موحەممەدە جا مەبەست لەم ئایەتە ئەم پرسیارو وەڵامەیە، كە خودا لە قورئانا دەفەرموێ:

{يُثَبِّتُ اللّهُ الَّذِينَ آمَنُواْ بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ - ١٤/٢٧}.

واتە: خودای گەورە بەهۆی ئەم وتارە دامەزراوە جوانەوە كە وشەی: {لا أَلهَ إِلاَّ أللّٰهُ مُحَمَّدَاً رَسُولُ أللّٰهِ}یە.

موسوڵمان ڕزگار دەكاو دایدەمەزرێنێ لە دنیاو قیامەتدا.

١١٤٦- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الْعَبْدُ إِذَا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ، وَتُوُلِّيَ عَنْهُ أَصْحَابُهُ حَتَّى إِنَّهُ لَيَسْمَعُ قَرْعَ نِعَالِهِمْ ، أَتَاهُ مَلَكَانِ فَيَقْعُدَانِهِ فَيَقُولاَنِ: لَهُ مَا كُنْتَ تَقُولُ فِي هَذَا الرَّجُلِ مُحَمَّدٍ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَأَمَّا الْمُؤْمِنُ فَيَقُولُ: أَشْهَدُ أَنَّهُ عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ. فَيُقَالُ انْظُرْ إِلَى مَقْعَدِكَ مِنَ النَّارِ، قَدْ

(١) بخاري. جنائز: ١٣٧٤. مسلم. الجنة ونعمها: ٧١٤٨ ، ٧١٤٩.

أَبْدَلَكَ اللَّهُ بِهِ مَقْعَدًا مِنَ الْجَنَّةِ فَيَرَاهُمَا جَمِيعًا، وَأَمَّـا الْكَـافِرُ وَالْمُنَـافِقُ فَيُقَـالُ أَلاَ دَرَيْتَ وَلاَ تَلَيْتَ وَيُضْرَبُ بِمَطَارِقَ مِنْ حَدِيدٍ ضَرْبَةً، فَيَصِيحُ صَيْحَةً يَـسْمَعُهَا مَـنْ يَلِيهِ إِلاَّ الثَّقَلَيْنِ. رَوَاهُمَا الخمسة[٢].

ئەنـەس (خوای لێ رازی بێ) گـوتی: پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەربێ) دەفـەرموێ: بەنـدە کاتـێ دای دەنـێن لـەناو گۆڕەکەیـداو هاورێکـانی بـەرەودوا دەگەڕێنـەوە هێشتا گـوێی لـە چـرپەی کەوشـەکانیانە کـە دوو فریـشتە کـەناویان نـەکیرو مونکـەرە دەگەنــە ســەری و دای دەنیــشێنن و پێــی دەڵــێن: بــاوەڕت چــییە دەربـارەی ئـەم پیـاوە؟ واتـە: بـاوەڕت چـیە دەربـارەی موحەممـەد (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: جا ئەوەی موسوڵمانبێ پێی دەڵێ: ئاگادارم کە ئـەم پیـاوە بەندەو پێغەمبەری خودایە، ئەوجا دەگوترێ پێـی: ئا ئـەوە جێگـەی تـۆ بـوو لەناو ئاگری دۆزەخدا سەیریکە خودا بۆی گۆڕیویتەوە بـەو شـوێنە خۆشـە لـە بەهەشـتا، جـا ئـەویش هـەردوو جێگەکـە بـە چـاوی خـۆی دەبینـێ حـەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: بەڵام بێبڕوا یا فەرمووی: (بەڵام ناپاك مونافیق = دوو روو) کـە هـەمان پرسـیاری لێ دەکـەن دەڵـێ: ئاگـام لـە هـیچ نیـە، ئەوەنـدە هەیـە سـەیری دەمـی خـەڵکم کـردووە، ئـەوان چـییان گوتـووە ئـەوەم گوتـووە! ئەوجا دەڵێن: دەك هەر نەزانیت! ئیتر یەك تـۆپزی ئاسـنینی لێ دەدەن، ئەوسا یەك قیژە دەکـا هەرچـی لـە دەورو بەریـەتی دەیبیسـتێ، مـرۆڤ و جنۆکـە نـەبێ، ئەو دوو تاقمە نایبیستن! (ش/د/ت/ن).

١١٤٧- عَنْ أَسْمَاءَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: إِنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حَمِدَ اللهَ وَأَثْنى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ: مَا مِنْ شَيْءٍ لَمْ أَكُنْ أُرِيتُهُ إِلاَّ رَأَيْتُهُ فِي مَقَامِي هَـذِهِ حَتَّـى الْجَنَّةَ وَالنَّارَ، فَأُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّكُمْ تُفْتَنُونَ فِي قُبُورِكُمْ ، مِثْلَ أَوْ قَرِيبًا مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ ، يُقَالُ مَا عِلْمُكَ بِهَذَا الرَّجُلِ فَأَمَّا الْمُؤْمِنُ أَوِ الْمُوقِنُ فَيَقُـولُ هُـوَ مُحَمَّـدٌ رَسُولُ اللَّهِ جَاءَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى ، فَأَجَبْنَا وَاتَّبَعْنَا ، هُوَ مُحَمَّدٌ. ثَلاَثًا ، فَيُقَالُ نَمْ

---

(٢) بخاري. جنائز: ١٣٣٨ ، ١٣٧٤. مسلم. الجنه ونعيمها: ٧١٤٨. نسائي. جنائز: ٢٠٤٩.

صَالِحًا ، قَدْ عَلِمْنَا إِنْ كُنْتَ لَمُوقِنًا بِهِ ، وَأَمَّا الْمُنَافِقُ أَوِ الْمُرْتَابُ فَيَقُولُ لاَ أَدْرِى ، سَمِعْتُ النَّاسَ يَقُولُونَ شَيْئًا فَقُلْتُهُ. رَوَاهُ الشيخان والنسائي[٣].

**ئەسماء (خوای لێ رازی بێ) گوتی: لە دوانەكەی نوێژی رۆژ گیرانەكەدا پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) سوپاس و ستایش و وەسپێكی جوانی خودای گەورەی كردو فەرمووی: ئەوەشی نەم دیبوو لەم شوێن و مەقامەدا دیتم، هەتا بەهەشت و دۆزەخیشم دیتن! وەسرووشم بۆ هات: كە ئێوە (هەركەسێ لە گۆڕی خۆیدا) تاقی دەكرێنەوە وەك تاقیكردنەوەیێ كە لەسەر دەمی جەجاڵە كوێرەی جادووگەردا روودەدات فاطیمە گوتی: ئەسماء یاوای گوت یا گوتی: فەرمووی: لە چەشنی تاقیكردنەوەی جەجاڵە كوێرەی جادووگەر. دەگوترێ: چی لە بارەی ئەم پیاوەوە دەزانێ؟ جا ئەوەی بڕوادارو موسوڵمان بێ یا فەرمووی: ئەوەی موسوڵمان و خاوەن باوەڕو خاوەن متمانەبێ دەڵێ: ئەمە موحەممەدە پێغەمبەرو فرستادەی خوایە، بەڵگەی رۆشن و رێگەی راستی نیشان داوین: بۆیە ئێمەش باوەڕمان پێ هێناوەو شوێنی كەوتووین، سێ جار لەسەر یەك دەڵێ: ئەمە موحەممەدە، جا ئەوجا پێی دەڵێن: بخەوە خەوی خێرت بێ، ئێمە خۆشمان باش دەمانزانی كە تۆ بەچاكی باوەڕت پێی هەیە فەرمووی: بەڵام ئەوەشی ناپاك بێ یا فەرمووی: بەڵام ئەوەشی بەدگومان و دوو دڵبێ دەڵێ: نازانم، چاوم لە دەمی خەڵك بووە" ئەوان چییان گوتووە منیش گوتوومە! (ش/ن).**

١١٤٨- عَنْ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا مَاتَ عُرِضَ عَلَيْهِ مَقْعَدُهُ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ ، إِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ فَمِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَمِنْ أَهْلِ النَّارِ ، فَيُقَالُ هَذَا مَقْعَدُكَ حَتَّى يَبْعَثَكَ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. رَوَاهُ الخمسة إِلاَّ أبا داود[٤].

---

(٣) بخاري. علم: ٨٦ ، ١٨٤ ، ٩٢٢ ، ١٠٥٣ ، ١٠٥٤ ، ١٠٦١ ، ١٢٣٥ ، ١٣٧٣ ، ٢٥١٩ ، ٢٥٢٠ ، ٧٢٨٧. مسلم. كسوف: ٢١٠٠.

(٤) بخاري. جنائز: ١٣٧٩ ، ٣٢٤ ، ٦٥١٥. مسلم: الجنه ونعيمها: ٧١٤٠. نسائي. جنائز: ٢٠٧١.

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئێوە كاتێ دەمرن بەیانیان و ئێواران، هەر كەسەتان جێگەی خۆی پیشان دەدرێ، جا ئەگەر بەهەشتی بێ ئەوا جێگەی خۆی لە بەهەشتا دەبینێ، وە ئەگەر دۆزەخی بێ ئەوا جێگەی خۆی لە دۆزەخا دەبینێ، وە پێی دەڵێن: ئەمە جێگەتە لە رۆژی قیامەتا، كە خودا زیندووت دەكاتەوە دێیتە ئێرە (ش/ت/ن).

١١٤٩- ➡ (ب - ١ ز - ٢٣ ژمارە: ٣/١٦٥).[٥]

١١٥٠- وللشيخين والنسائي: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَدْعُو: اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ وَمِنْ عَذَابِ النَّارِ. وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا الْمَمَاتِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيْحِ الدَجَّالِ[٦].

هەمیشە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئەم نزایەی دەكرد:

{اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ وَمِنْ عَذَابِ النَّارِ. وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيْحِ الدَجَّالِ}.

خودایە! پەنا دەگرم بە تۆ لە سزای گۆڕو لە سزای ئاگری دۆزەخ و لە فیتنەو ئاژاوەی ژیان و مردن و لەفیتنەو ئاژاوەی جەجاڵە كۆرەی هەلاتباز (ش/ن).

١١٥١- عَنْ هَانِيءٍ مَوْلَى عُثْمَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ عُثْمَانُ إِذَا وَقَفَ عَلَى قَبْرٍ بَكَى حَتَّى يَبُلَّ لِحْيَتَهُ فَقِيلَ لَهُ: تُذْكَرُ الْجَنَّةُ وَالنَّارُ فَلاَ تَبْكِي وَتَبْكِي مِنْ هَذَا فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِنَّ الْقَبْرَ أَوَّلُ مَنَازِلِ الآخِرَةِ، فَإِنْ نَجَا مِنْهُ فَمَا بَعْدَهُ أَيْسَرُ مِنْهُ، وَإِنْ لَمْ يَنْجُ مِنْهُ فَمَا بَعْدَهُ أَشَدُّ مِنْهُ قَالَ: وَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مَا رَأَيْتُ مَنْظَرًا قَطُّ إِلاَّ وَالْقَبْرُ أَفْظَعُ مِنْهُ. رَوَاهُ الترمذي[٧].

---

(٥) تقدم تخريجه بمثل الحديث (٣/١٦٥).

(٦) مسلم. مساجد: ١٣٢٤. أبو داود. صلاة: ٩٨٣. نسائي. سهو: ١٣٠٩.

(٧) بسند حسن (شرحه).

هانی نۆکەری عوسمان (خوای لێ رازی بێ) گوتی: جاران عوسمان کە لە سەرگۆڕ دەوەستا ئەوەندە دەگریا تا ریشی بەفرمێسك تەڕ دەبوو، پێیان گوت: بۆ کەباس و یادی بەهەشت و دۆزەخ دەکەیت ناگریت کەچی بۆ ئەمە دەگریت! گوتی: چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: گۆڕیەکەم هەواری دوا رۆژە، ئەوەی لەوێ رزگاری ببێ ئیتر لە قۆناغەکانی پاشتر ئاسانتر رزگاری دەبێ، خۆ ئەگەر لەوێ رزگاری نەبێ ئەوا لە قوناغەکانی دواتر خراپتر گیرۆدە دەبێ! گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەشی فەرموو: هەرگیزاو هەرگیز دیمەنم نەدیوە کە وەك گۆڕ سامناك و سامدارو بەسامبێ! (ت/س/ح).

**١١٥٢**- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: نَفْسُ الْمُؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِهِ حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ. رَوَاهُ الترمذي وابن ماجه وأحمد[٨].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: گیانی موسوڵمان (لەپاش مردنی) بەندو گیرۆدەی ئەو قەرزەیە کە لەسەریەتی هەروا دەمێنێ و پایەی بەرزی بەرێزی خۆی لێ قەدەغەیە تا قەرزەکەی بۆ دەدەنەوە (ت/ماجە/ئەحمەد-س/ح).

**١١٥٣**- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) سَمِعَ صَوْتًا مِنْ قَبْرٍ فَقَالَ: مَتَى مَاتَ هَذَا؟ فَقَالُوا: مَاتَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَسُرَّ بِذَلِكَ وَقَالَ: لَوْلاَ أَنْ لاَ تَدَافَنُوا لَدَعَوْتُ اللَّهَ أَنْ يُسْمِعَكُمْ عَذَابَ الْقَبْرِ. رَوَاهُ النسائيُّ ومسلمٌ[٩].

ئەنەس (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) گوێی لێ بوو، گۆڕێ دەنگی لێوە دەهات، فەرمووی (دروودی خوای لەسەربێ): ئەمە کەی مردووە؟ گوتیان: دەمێکە لە سەردەمی نەزانیدا، لەپێش هاتنی ئیسلامدا مردووە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) بەم وەڵامە شادمان بوو، فەرمووی:

---

(٨) بسند حسن (شرحه).

(٩) مسلم. الجنة. ونعيمها: ٧١٤٢ ، ٧١٤٣.

مەبادا لاشەی یەكتری نەنێژن، ئەگینا داوام لەخودا دەكرد كە كارێكی وای بكردایە كە گوێتان لە سزاو ئازاری ناو گۆڕ بوایە! (ن/م).

١١٥٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضيَ اللهُ عَنهمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: هَذَا الَّذِي تَحَرَّكَ لَهُ الْعَرْشُ، وَفُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ السَّمَاءِ، وَشَهِدَهُ سَبْعُونَ أَلْفًا مِنَ الْمَلَائِكَةِ لَقَدْ ضُمَّ ضَمَّةً ثُمَّ فُرِّجَ عَنْهُ. رَوَاهُ النسائي هنا والشيخان في الفضائل[10].

ئیبنو عومەر (خوایان لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: ئا ئەم سەعدی كوڕی موعاذە كە بارەگای خودا بۆیهاتە جمو جووڵو خرۆشو دەرگاكانی ئاسمانی بۆ خرانە سەرپشتو حەفتا هەزار فریشتە هاتنە دیدەنیو دیاری، لەكاتی سەرەمەرگیداو لەكاتی بەرێكردنی تەرمەكەیدا، ئا ئەم سەعدە كە ئەمە پلەو پایەیەتی لەلای خودا، لەگەڵ ئەوەشا گۆڕەوشارێكی وەها وەها درا كە پەراسووی راستو چەپی تێك پەڕاند لە پاشا قوتاری بوو (ن/ش).

## ٢٢٥) نزای راگیركردن لەسەر ئیمانو تەڵقین: (الدعاء بالتثبيت والتلقين)

١١٥٥- عَنْ عُثْمَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا فَرَغَ مِنْ دَفْنِ الْمَيِّتِ وَقَفَ عَلَيْهِ فَقَالَ: اسْتَغْفِرُوا لأَخِيكُمْ وَسَلُوا لَهُ بِالتَّثْبِيتَ فَإِنَّهُ الآنَ يُسْأَلُ. رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ والبزّار والحاكم وصحّحه[1].

عوسمان (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) كەلێ دەبۆوە لە ناشتنی مردوو لەلای گۆڕەكەیا رادەوەستاو دەیفەرموو: بپاڕێنەوە بۆ ئەم برایەتانو داوای دامەزرانو راگیركردن لەسەر ئیمانو باوەڕی بۆ بكەن چونكە ئێستا كە فریشتە دێنە لایو پرسیاری لێ دەكەن خودات كێیە، پێغەمبەرت كێیە، ئایینت چییە؟ (د/بەززار/حاكم بە صەحیحی داناوە).

---

(١٠) بخاري. مناقب: ٣٨٠٣. مسلم. فضائل: ٦٢٩٦.

(١) صحيح عنه الحاكم.

١١٥٦- عَنْ أَبِي أُمامَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: إِذَا مُتُّ فَاصْنَعُوا بِي كَما أَمَرَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: إِذَا مَاتَ أَحَدٌ مِنْ إِخْوانِكُمْ فَسوَّيْتُمُ التُّرابَ عَلى قَبْرِهِ، فَلْيَقُمْ أَحَدُكُمْ عَلى رَأْسِ قَبْرِهِ ثُمَّ لِيَقُلْ: يَا فُلانُ ابنُ فُلانَة، فَإِنَّهُ يَسْمَعُه وَلاَ يَجِيبُ، ثُمَّ يَقُولُ: يَا فُلاَنُ بْنُ فُلاَنَة فَإِنَّهُ يَسْتوي قَاعِداً، ثُمَّ يَقُولُ: يَا فُلاَنُ ابْنُ فُلاَنَةَ، فَإِنَّهُ يَقُولُ: أَرْشَدْنَا يَرحَمُكَ اللهُ، وَلَكِنْ لاَ تَشْعُرونَ فَلْيَقُلْ: اذْكُرْ ما خَرَجْتَ عَلَيْهِ مِنَ الدُّنيا شَهادَةِ أَنْ لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدَه وَرَسُولُهُ، وَأَنَّك رَضَيْتُ بِاللهِ رَبَّاً، وَبِالإِسْلاَم دِيناً، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيَاً، وَبِالْقُرْآن إماماً، فَإِنَّ مُنْكَراً وَنَكِيراً يَأْخُذُ كُلُّ وَاحِدٍ بِيَدِ صَاحِبِهِ وَيَقُولُ: انْطَلِقْ بِنا مَا يَقْعَدَنَا عِنْدَ مِنْ لُقِّنَ حُجَّتَهُ؟ فَقَالَ: رَجُلٌ: يَا رِسُولَ اللهِ فَإِنْ لَمْ يَعْرِفْ أُمَّهُ قَالَ: يَنْسَبَهُ إِلى أُمّه حَوَّاء يَا فُلاَنَ بْنَ حَوَّاءٍ. رَوَاهُ الطبراني والحنبلي في الشافي، وقال الحافظ: إسناده صالح نقل الحديث من غاية المأمول شرح تاج الأصول[٢].

ئەبو ئومامە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: كە مردم وەك پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: ئاوام لێ بكەن، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: كاتێ برایەكی موسوڵمانتان دەمرێ، لەپاش ئەوەی كە بەخاكتان سپارد با یەكێكتان لەسەر گۆڕەكەی هەڵبسێتەوەو بڵێ: ئەی فیساری كوڕی فیسارە ژن! لەم كاتەدا مردووەكە گوێی لێیەتی بەلاّم وەلاّم ناداتەوە، جا دیسان بڵێتەوە: ئەی فیساری كوڕی فیسارە ژن! ئینجا مردووەكە لە گۆڕەكەیدا رێك دادەنیشێ، جا دیسانەوە بڵێتەوە: ئەی فیساری كوڕی فیسارە ژن![١] ئینجا مردووەكە دەڵێ: بەر سۆزو رەحمەتی خودا كەوی، ئادەی رینموونی و رابەریمان بكە، بەلاّم ئێوە هەست بەمانە ناكەن، ئەوجا با بڵێ:

{اذْكُرْ ما خَرَجْتَ عَلَيْهِ مِنَ الدُّنيا شَهادَةِ أَنْ لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدَه وَرَسُولُهُ، وَأَنَّك رَضَيْتُ بِاللهِ رَبَّاً، وَبِالإِسْلاَم دِيناً، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيَاً، وَبِالْقُرْآن إماماً}.

---

(٢) صالح الإسناد عند الحافظ.

[١] گریمان مردووەكە ناوی نەریمانەو دایكی ناوی ریحانە، تەڵقینخوێن دەڵێ: ئەی نەریمانی كوڕی ریحان! یاخود مردووەكە ژنەو ناوی ژیانەو دایكی ناوی جەیرانە لەم حاڵەدا تەڵقینخوێن دەڵێ: ئەی ژیانی كچی جەیران! - وەرگێر

ئەو پەیمانەی کە تا لە جیهان دەرچووی لە سەری بووی لە یادت نەچێ و لە بیرت بێ، کە ئەویش ئەمەیە: شایەتی دەدەم کە هەر خودا خودایەو خودای تر نیەو موحەممەد بەندەو پێغەمبەرو فرستادەی خودایە، وە خودام بە هەقەو ئایینی ئیسلامم بە هەقەو موحەممەد پێغەمبەرم بەهەقەو قورئانم بەهەقەو قورئان پێشەوامە. ئەوجا نەکیرو مونکەر دەستی یەکتری دەگرن و دەڵێن: با بڕۆین بۆ بە خۆڕایی لای ئەمە دانیشین، ئەمە وەڵامی خۆی خراوەتە سەرزاری و قەواڵەی خۆی لە گەڵیەتی پیاوێکیش گوتی: ئەی پێغەمبەر خودا! ئەی ئەگەر تەڵقینخوێن ناوی دایکی مردووەکەی نەزانی چۆن؟ فەرمووی: با بەناوی دایکە حەواوە بانگی بکاو بڵێ: ئەی فیساری کوڕی حەوا! (طەبەرانی/ حەنبەلی – حافظ دەڵێ: ئیسنادی ئەم حەدیثە صالحە. نەقڵ کراوە لە غایەتولمەئموولەوە).

## ٢٢٦) بەشی حەوتەم: باسی پرسەو سەر خۆشی کردن و دیدەنی و سەردانی گۆڕو گۆڕستان:

## (الفصل السابع: في التعزية وزيارة القبور)

١١٥٧– عَنْ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَرْسَلَتِ ابْنَةُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَيْهِ إِنَّ ابْنًا لِي قُبِضَ فَائْتِنَا، فَأَرْسَلَ يُقْرِئُ السَّلاَمَ وَيَقُولُ: إِنَّ لِلَّهِ مَا أَخَذَ وَلَهُ مَا أَعْطَى وَكُلٌّ عِنْدَهُ بِأَجَلٍ مُسَمًّى، فَلْتَصْبِرْ وَلْتَحْتَسِبْ، فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ تُقْسِمُ عَلَيْهِ لَيَأْتِيَنَّهَا، فَقَامَ وَمَعَهُ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ وَمُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ وَرِجَالٌ، فَرُفِعَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الصَّبِيُّ وَنَفْسُهُ تَتَقَعْقَعُ كَأَنَّهَا شَنٌّ، فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ، فَقَالَ: سَعْدٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا هَذَا؟ فَقَالَ: هَذِهِ رَحْمَةٌ جَعَلَهَا اللَّهُ فِي قُلُوبِ عِبَادِهِ، وَإِنَّمَا يَرْحَمُ اللَّهُ مِنْ عِبَادِهِ الرُّحَمَاءَ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ الترمذي[1].

---

(١) بخاري. جنائز: ١٢٨٤ ، ٥٦٥٥ ، ٦٦٠٢ ، ٦٦٥٥ ، ٧٣٧٧ ، ٧٤٤٨. مسلم. جنائز: ٢١٣٢. أبو داود. جنائز: ٣١٢٥. نسائي. جنائز: ١٨٦٧.

ئوسامەی کوڕی زەید (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: کچێکی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) ناردی بە شوێن باوکیا: کەوا کوڕەکەم گیان دەدا، تەشریفت بێنە بۆ لامان، پێغەمبەریش (خوای لێ ڕازی بێ) بەڕابەرەکەدا سلاوی بۆ ناردو فەرمووی: پێی بڵێ: ئەوەی خودا دەیدا بە بەندەی خۆی تا ماوەیەك و لەپاشا دەیباتەوە بۆ خەزینەی خۆی هی خۆیەتی، وە هەروا ئەوەشی کە خودا دەیبەخشێ بە بەندەی خۆی تاسەر هەر هی خۆیەتی وە هەموو شتێکیش لەلای خودا ماوەیەکی دیاری کراوی هەیەو کە ئاکامی هات ئیتر پاش و پێشی بۆ نیەو ماوەی بەسەر دەچێ! کەوابوو پێی بڵێ: با صەبرو ئارام بگرێ ساغ لەبەر ڕەزای خودای گەورە بەلان دیسانەوە کچەکەی ناردیەوە بە شوێنیاو سوێندی لێ خوارد کە دەبێ هەر تەشریف بێنێ بۆ لای، پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەربێ) هەڵسا لەگەڵ سەعدی کوڕی عوبادەو موعاذی کوڕی جەبەل و ئوبەیی کوڕی کەعب و زەیدی کوڕی ثابیت و چەند پیاوێکی تردا چوون بۆ لای، کە مناڵەکەیان هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) گیانی دەداو هەناسەی سوار بوو بوو، وەك کوندەیێ کە بی ژەنی دەهات و دەچوو، جا هۆن هۆن فرمێسك بە چاوی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەربێ) هاتە خوارەوە، سەعدیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم گریانە چییە؟ فەرمووی: ئەمە سۆزو ڕەحمەتە خودا دەیخاتە دڵی بەندەکانی خۆیەوە، وە خودای گەورە لەناو بەندەکانی خۆیدا تەنیا ڕەحم بەوانەیان دەکا، کە بەڕەحم و میهرەبانن! (ش/د/ن).

١١٥٨- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِى بَكْرٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمْ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لِيُعَزِّ الْمُسْلِمِينَ فِي مَصَائِبِهِمُ الْمُصِيبَةُ بِي. رَوَاهُ الإمام مالك[٢].

عەبدوڵلای کوڕی جەعفەر (خودا لێیان ڕازی بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەربێ) دەفەرموێ: کاتێ مۆسوڵمانان تووشی وەیێ، دەردێ، بەلایێ، قۆرتێ،

(٢) سكت عنه الشارح.

دەبن با فەرامۆشی خۆیان بەو كۆست كەوتنە بدەنەوە كە بەهۆی مەرگی منەوە لێیان كەوتووە! (ئیمامی مالیك – ڕەزای خودای لەسەربێ).

١١٥٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ (رَضِيَ أللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: لَمَّا جَاءَ نَعْيُ جَعْفَرٍ قَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) اصْنَعُوا لأَهْلِ جَعْفَرٍ طَعَامًا فَإِنَّهُ قَدْ جَاءَهُمْ مَا يَشْغَلُهُمْ. رَوَاهُ الترمذي وابن ماجه والحاكم[٣].

عەبدوڵڵای كوڕی جەعفەر (خودا لێیان رازی بێ) گوتی: كە پەیامی مەرگی جەعفەر گەیشت بە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: نان دروست بكەن، بۆ خێزانەكەی جەعفەر، چونكە ئەوان تووشی خەمو خەفەت بوونو نایان پەرژێتە سەر نانو ئاو (ت/د–سند صالح).

١١٦٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ أللهُ تَعَالَى عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: مَنْ عَزَّى مُصَابًا فَلَهُ مِثْلُ أَجْرِهِ. رَوَاهُ الترمذي وابن ماجه والحاكم[٤].

عەبدوڵڵا (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: هەر كەسێ سەر خۆشی لە گرفتارێ بكا بەقەد ئەو پاداشی بۆ هەیە (ت/ماجە/حاكم–سند ضعيف).

١١٦١- ولابن ماجه (كما هو في الشرح): مَا مِنْ مُؤْمِنٍ يُعَزِّي أَخَاهُ بِمُصِيبَةٍ إِلاَّ كَسَاهُ اللَّهُ سُبْحَانَهُ مِنْ حُلَلِ الْكَرَامَةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ[٥].

وەك لە شەرەحەكەدا لەم باسەدا نووسراوە دەڵێ: ئیبنو ماجە (ڕەحمەتی خودای لەسەر بێ) ریوایەتی كردووە كە حەزرەت (درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی: هەر موسوڵمانێ لە هۆی گرفتاریو موصیبەتێكەوە سەرخۆشی بكا لە برای موسوڵمانی، مسۆگەر كە خودای گەورە لە ڕۆژی قیامەتا دەستێ بەرگی لە كاڵای رووسووریو سەربەرزی لەبەر دەكا (غایەتولمەئموول).

---

(٣) بسند صحيح (شرحه).

(٤) بسند ضعيف (شرحه).

(٥) سكت عنه الشارح.

## ٢٢٧) دیدەنیو سەردانی گۆڕو گۆڕستانو نزای خێرو پاڕانەوە بۆ مردووی گۆڕستان: (زيارة القبور والدعاء لاهلها)

١١٦٢- عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ عَنْ أَبِيهِ (رَضيَ اللهُ عَنهُمَا) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: قَدْ كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ فَقَدْ أُذِنَ لِمُحَمَّدٍ فِي زِيَارَةِ قَبْرِ أُمِّهِ فَزُورُوهَا فَإِنَّهَا تُذَكِّرُ الآخِرَةَ. رَوَاهُ الخمسة إلاَّ البخاري واللفظ للترمذي[1].

سولەیمانی کوڕی بورەیدە (خودایان لێ ڕازی بێ) لە باوکیەوە لە پێغەمبەرەوە دەفەرموێ (درودی خوای لەسەربێ) لە مەوپێش جاران نەهیم لێ دەکردن لە دیدەنی گۆڕستان، بەڵان ئەوا ڕێگەی من دراوە کە دیدەنی گۆڕی دایکم بکەم، کە وابوو ئێوەش لەمەو دوا دیدەنی گۆڕستان بکەن، چونکە دیمەنی گۆڕو گۆڕستان یادی قیامەت تازە دەکاتەوە! (ت/م/د/ن).

١١٦٣- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنها) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: أَتَانِي جِبْرِيلُ فَقَالَ: إِنَّ رَبَّكَ يَأْمُرُكَ أَنْ تَأْتِيَ أَهْلَ الْبَقِيعِ فَتَسْتَغْفِرَ لَهُمْ قَالَتْ: قُلْتُ كَيْفَ أَقُولُ لَهُمْ يا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)؟ قَالَ: قُولِي السَّلاَمُ عَلَى أَهْلِ الدِّيَارِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ وَيَرْحَمُ اللَّهُ الْمُسْتَقْدِمِينَ مِنَّا وَالْمُسْتَأْخِرِينَ وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِكُمْ لَلاَحِقُونَ. وفي رواية: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ أَهْلَ الدِّيَارِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِكُمْ لَلاَحِقُونَ، أَسْأَلُ اللهَ لَنَا وَلَكُمُ الْعَافِيَةَ. رَوَاهُ مسلم[2].

عائیشە (خوای لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی: جوبرائیل هات بۆ لام فەرمووی: پەروەردگارت فەرمانت پێ دەکا کە بچیت بۆ لای گۆڕنشینەکانی گۆڕستانی بەقیعو بۆشیان بپاڕێیتەوەو داوای لێ خۆشبوونیان بۆ بکەی، عائیشە گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر چووم بۆ سەردانی مردووان پێیان بڵێم چی؟ فەرمووی: بڵێ:

---

(١) مسلم. جنائز: ٢٢٥٧ ، ٥٠٨٦ ، ٥١٧٥ ، ٥١٧٧. أبو داود. أشربة: ٣٦٨٩. نسائي. جنائز: ٢٠٣١ ، ٤٤٤١ ، ٥٦٦٨ ، ٥٦٦٩.

(٢) مسلم. جنائز: ٢٢٥٢.

{السَّلاَمُ عَلَى أَهْلِ الدِّيَارِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ وَيَرْحَمُ اللّٰهُ الْمُسْتَقْدِمِينَ مِنَّا وَالْمُسْتَأْخِرِينَ وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللّٰهُ بَكُمْ للاَحِقُونَ}.

سلاو لە خەڵكی ئەم خانییانە، لە موسوڵمانو خاوەن ئیمانیان، وەرەحمەتی خودا لە پێشینانو پاشینانمان، ئێمەش (خوا یاربێ) هاكا نیشتین پێتانەوەو هاتین بۆ لاتان! لە گێڕانەوەیەكا:

{السَّلاَمُ عَلَى أَهْلِ الدِّيَارِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللّٰهُ بَكُمْ للاَحِقُونَ، أَسْأَلُ اللهَ لَنَا وَلَكُمُ العَافِيَةَ}.

سلاوتان لێ بێ ئەی دانیشتوانی ئەم خانەیانە، لە موسوڵمانو خاوەن باوەڕتان، ئێمەش (خوا یاربێ) هاكا پێتانەوە نیشتینو هاتین بۆ لاتان، داوای ئاسوودەییو خێرو خۆشی لە خودا دەكەم، بۆ خۆشمانو بۆ ئێوەش (م).

١١٦٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَتَى الْمَقْبُرَةَ فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللّٰهُ بِكُمْ لاَحِقُونَ. رَوَاهُ أحمد ومسلمٌ وأبو داود والنسائي[٣].

➡ (ب – ز – ٩ ذمارة: ٦٩/٩) (واتە: ئەم فەرموودەیە لە پێشەوە ڕۆیشت لە بەرگی یەكەما لە زنجیرە نۆدا ژمارە ٦٩/٩ وە ژمارەی فەرموودەكە لەو زنجیرەدا نۆیە، بەلاّم لە سەرەتای كتێبەكەوە -٦٩).

١١٦٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: مَرَّ رَسُولُ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِقُبُورِ الْمَدِينَةِ، فَأَقْبَلَ عَلَيْهِمْ بِوَجْهِهِ فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ يَا أَهْلَ الْقُبُورِ يَغْفِرُ اللّٰهُ لَنَا وَلَكُمْ أَنْتُمْ سَلَفُنَا وَنَحْنُ بِالأَثَرِ. رَوَاهُ الترمذي[٤].

ئیبنو عەبباس (خودایان لێ ڕازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) لەلای گۆڕستانەكەی مەدینەوە تێ پەڕی، ڕووی تێكردنو فەرمووی:

{السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ يَا أَهْلَ الْقُبُورِ يَغْفِرُ اللّٰهُ لَنَا وَلَكُمْ أَنْتُمْ سَلَفُنَا وَنَحْنُ بِالأَثَرِ}.

---

(٣) راجع رقم: ٦٩/٩.

(٤) بسند حسن (شرحه).

دروود لە ئێوە ئەی دانیشتوانی ئەم گۆڕستانە! خودا لە ئێمەش و لە ئێوەش خۆش بێ، ئێوە پێشینەو پێشڕەوی ئێمەن و بەشوێن ئێوەدا وا ئێمەیش دێین! (ت–س/ح = تیرمیذی. سند حسن).

١١٦٦– وَعَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لَعَنَ اللَّهُ زَائِرَاتِ الْقُبُورِ وَالْمُتَّخِذِينَ عَلَيْهَا الْمَسَاجِدَ وَالسُّرُجَ. رَوَاهُ أصحاب السُّنن[٥].

دیسان گوتی: پێغەمبەر (درووی خودای لێبێ) فەرمووی: نەفرین و لەعنەتی خودا لەو ژنانە بێ کە دەچن بۆ سەردانی سەر قەبران و لەوێ دەیکەن بەبێ شەرعی و شین و شەپۆڕو ناشوکری، وە نەفرین و لەعنەتی خودا لەو کەسانەش بێ کە مزگەوت لەسەر گۆڕ دروست دەکەن، وە لەو کەسانەش بێ کە چرای لەسەر دادەنێن! (د/ت/ن–س/ص= ئەبو داوود، تیرمیذی، نەسائی. سند صحیح).

## ٢٢٨) سەردانی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەربێ) لە گۆڕی دایکی (بەر رەحمەتی خودا کەوێ): (زيارة النبي ﷺ قبر أمه)

١١٦٧– عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: زَارَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَبْرَ أُمِّهِ، فَبَكَى وَأَبْكَى مَنْ حَوْلَهُ، فَقَالَ: اسْتَأْذَنْتُ رَبِّي فِي أَنْ أَسْتَغْفِرَ لَهَا فَلَمْ يُؤْذَنْ لِي وَاسْتَأْذَنْتُهُ فِي أَنْ أَزُورَ قَبْرَهَا فَأُذِنَ لِي فَزُورُوا الْقُبُورَ فَإِنَّهَا تُذَكِّرُ الْمَوْتَ. رَوَاهُ مسلمٌ وأبو داود والنسائي[١].

ئەبو هورەیرە (خوای لێ رازی بێ) گوتی: پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەربێ) رۆیشت بۆ سەردانی گۆڕی دایکی، لەوێ گریاو ئەو کەسانەشی لە دەوری بوون هێنانیە گریان، جا فەرمووی: داوام لە خودا کرد کە رێگەم بدات بۆ دایکم بپاڕێمەوە بەڵام رێگەی ئەوەی نەدام، وە داوام لێکرد کە دیدەنی گۆڕەکەی بکەم بۆ ئەمە رێگەی دام، جا ئێوەش دیدەنی گۆڕستان بکەن، چونکە یادی مردن تازە، دەکاتەوە (م/د/ن).

---

(٥) بسند صحيح (شرحه).

(١) مسلم. جنائز: ٢٢٥٥. أبو داود. جنائز: ٣٢٣٤.

## ٢٢٩) پاشەکیو پایانیٚ: مردوو سوود لە کردەوەی کەسێکی تر وەردەگرێت: (خاتمة: ينتفع الميت بعمل غيره)

١١٦٨- عَنْ عَائِشَةَ (رَضيَ اللهُ عَنْها) أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أُمِّيَ افْتُلِتَتْ نَفْسَهَا وَلَمْ تُوصِ وَأَظُنُّهَا لَوْ تَكَلَّمَتْ تَصَدَّقَتْ، أَفَلَهَا أَجْرٌ إِنْ تَصَدَّقْتُ عَنْهَا؟ قَالَ: نَعَمْ. رَوَاهُ الشيخان والنسائي[1].

**عائیشە** (رەزای خودای لەسەربێ) **گوتی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت** (دروودی خوای لەسەربێ) **گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! دایکم لە ناکاو مرد، فریانەکەوت کە راسپێریو وەصییەت بکا، تا خێری بۆ بکەین وەها دەزانم ئەگەر مەودای قسەکردنی ببوایە خێرێکی بڕیار دەدا بۆ خۆی، جا ئایا خێری دەگا ئەگەر من لە جیاتی خۆی خێری بۆ بکەم؟ فەرمووی: بەڵێ خێری دەگا (ش/ن).**

١١٦٩- عَنْ ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَ: تُوُفِّيَتْ أُمُّ سَعْدِ بنِ عُبَادَةَ وَهْوَ غَائِبٌ عَنْهَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أُمِّي تُوُفِّيَتْ وَأَنَا غَائِبٌ عَنْهَا، أَيَنْفَعُهَا شَيْءٌ إِنْ تَصَدَّقْتُ بِهِ عَنْهَا؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَإِنِّي أُشْهِدُكَ أَنَّ حَائِطِي الْمِخْرَافَ صَدَقَةٌ عَنْهَا. رَوَاهُ البخاري والترمذي والنسائي[2].

**ئیبنو عەبباس** (خوایان لیٚ رازی بیٚ) **گوتی: سەعدی کوڕی عوبادە کاتیٚ دایکی دەمریٚ، خۆی لە دیاری نابیٚ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! کە دایکم مرد خۆم بە دیاریەوە نەبووم جا ئایا ئەگەر ئێستا من شتێکی بۆ بکەم بەخێر سوودی دەبیٚ بۆی؟ فەرمووی: بەڵیٚ، گوتی: دە تۆ بە شایەتبە کەوا ئەو باخەم کرد بە خێر بۆی (ب/ت/ن).**

---

(١) بخاري. هدية للمشركين: ٢٦٢٠ ، ٣١٨٣ ، ٥٩٧٨ ، ٥٩٧٩. مسلم. زكاة: ٢٣٢٠ — ٢٣٢٣.

(٢) بخاري. وصايا: ٢٧٦٢.

١١٧٠- عَنْ سَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ إِنَّ أُمَّ سَعْدٍ مَاتَتْ فَأَيُّ الصَّدَقَةِ أَفْضَلُ قَالَ: الْمَاءُ، قَالَ: فَحَفَرَ بِئْرًا وَقَالَ: هَذِهِ لأُمِّ سَعْدٍ. رَوَاهُ أَبُو داود وأحمد والنسائيُّ وزاد: فَتِلْكَ سِقَايَةُ سَعْدٍ بِالْمَدِينَةِ. والله أعلم[٣].

سەعدی كوڕی عوبادە (خودای لێ رازی بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! دایكم مردووە كام خێرە خێر ترە تا بۆی بكەم بە خێر؟ فەرمووی: ئاو.. گوتی: ئەویش بیرێكی لێ داو گوتی: ئەمە وەقف بێ بۆ گیانی دایكم (د/ئەحەمەد/ن). واتە: ئەبو داوودو ئیمامی ئەحمەدو نەسائی ئەم حەدیثەیان ریوایەت كردووە) نەسائی ئەمەشی لێ پتر كردووە: جا ئەو كارێزی سەعدە تا ئێستاش لە مەدینە ماوەو خەڵك ئاوی لێ دەخۆنەوە.

١١٧١- ← (ب – ١ ز – ١٩ ژمارە: ١٣٤/٢).

١١٧٢- ← (ب – ١ ز – ٢٢٥ ژمارە: ١١٥٥/١).

١١٧٣- ← (ب– ١ ز– ٢٢٧ ژمارە: ١١٦٥/٤).

١١٧٤- ← (ب – ١ ز – ٢٢٤ ژمارە: ١١٥٢/٨).

دانەر (پڕ گۆڕەكەی لە نوور بێ) دەڵێ: ژمارەی فەرموودەكان لە سەرەتای نامەی نوێژەوە هەتا ئێرە (٨٧٥) هەشت سەدو حەفتاو پێنج فەرموودەن. وە لە كۆتایی نامەی پاكی و خاوێنیشدا ئەوە بوو فەرمووی: ژمارەی فەرموودەكان لە سەرەتای نامەكەوە واتە: لە سەرەتای ئەم بەرگەوە هەتا ئێرە (٣٣٠) سێ سەدو سی فەرموودەیە. كەواتە بەم پێیە ژمارەی حەدیثەكان لە سەرەتای ئەم بەرگەوە هەتا كۆتایی سەرپاك دەكەنە ٣٣٠ + ٨٧٥ = ١٢٠٥ هەزارو دوو سەدو پێنج حەدیث.

---

(٣) سكت عنه الشارح (مترجم).

به یارمەتی خودای گەورەو مەزن دەستم کرد بە تەرجەمەی ئەم نامە بەرێزو پیرۆزە لە (١٩٧٤/١/٢٠)، وە تەواوم کرد (بەهەر پێنج بەرگەکەیەوە) لە رۆژی (١٩٧٨/٩/١٩). ئەمڕۆکەش کە یەک شەممەیە، (٥)ی رەمەزانی ساڵی (١٤٠٧) کۆچییە بە رێکەوتی (١٩٨٧/٥/٣) لە نووسینی پاکنووسی بەرگی یەکەم بوومەوە.

{غَفِرَ اللهُ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِسَائِرِ الْمُسْلِمِينَ، وَآخِرُ دَعْوَانا أَنِ الْحَمْدُ لِله رِبّ الْعَالَمِينَ}.

وەرگێڕ

نوری فارس حەمە خان حەسەن

کەرکووک – مستشفى كركوك العسكري

بسم الله الرحمن الرحيم

سوپاسی بێ پایان بۆ خودای گەورەو میهرەبان! بە دەستی خۆم لە پاکنووس و هەڵبژێری ئەم چاپە نوێیە بوومەوە، وە ئەم جارە بەپێی تەوانا فەرموودەکانم لە پەراوێزدا تەخریج کردووە، وە بۆ ئەم تەخریجە بەهرەم لەم سورچاوانە وەرگرتووە:

١) غاية المأمول، شرح التاج الجامع للأصول.

٢) مختصر صحیحی بوخاری، ناسراوە بە تەجریدی بوخاری، تەرجەمە کوردییەکەی.

٣) فتح الباري شەرحی صەحیحی بوخاری.

٤) بە تایبەتی لە تەخریجەکانی مامۆستا (شێخ خلیل مأمون شیحا) کە لەناو شەرحی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیم کردوویەتی (دار المعرفە. بیروت – لبنان – الطبعة الثانية عشر ، سنة ١٤٢٧ ه ٢٠٠٦ م).

٥) هەر فەرموودەیێ ژمارەی فەرموودەکەت لە بوخاریدا بەپێی تەرقیم و تەسەلسولی فتح الباري _دار الفكر – بن باز) دۆزییەوە، ئیتر بە ئاسانی لە تەجریدی بوخاریدا، تەرجەمە کوردییەکەی دەدۆزیتەوە، چونکە ژمارەی فەرموودەکە لە هەردوولا یەك شتەو نەگۆڕە. لەخوا داوا دەکەم کە بە ئاسانی و بە زوویی هەموو بەرگەکانی تری تاجول ئوصول، ئاوا پوختو تەخریج کراو بە زوویی چاپ بکرێتەوەو بەندەیش بەشداری بکەم لەو شانازی و سەربەرزییەدا.

نوری فارس حەمە خان

سلێمانی کوردستان، ماڵی خۆمان

٢٠٠٧/٢/١٢

# فهرس المواضيع

## بە پشتیوانی خوا بەرگی یەکەم تەواو بوو

## بەرگی دووەم بە (کتاب الزکاة) دەست پێدەکات

